# بارودۆخی سیاسی کوردستان

(1946-1880)

موجتەبا بورزوویی

وەرگێڕانی لە فارسی یەوە:

نازناز محەممەد عەبدولقادر

یوسف خزرچووپان سۆران عەلیپوور

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
mukriyani@yahoo.com

# بــــارودۆخــى

# سياسيى كـــــوردستان

## (1946-1880)

موجتەبا بورزوويى

وەرگێڕانى لەفارسييەوە

نازناز محەممەد عەبدولقادر

يوسف خزر چووپان

سۆران عەليپوور

كوردستان — هەولێر
٢٠٠٥

ناونیشانی کتێبی لێوەرگیردراو:
مجتبی برزوی
اوضاع سیاسی کردستان
( از سال ۱۳۵۸-۱۳۲۵ ه. ش )
تهران – نشر فکرنو
چاپ اول: ۱۳۷۸ ( ۱۹۹۹ ز )

ناوی کتێب: بارودۆخی سیاسیی کوردستان (۱۸۸۰-۱۹٤٦

- نووسەر: موجتەبا بورزوویی
- وەرگێرانی لە فارسییەوە: نازناز محەممەد عەبدولقادر
یوسف خزر چووپان سۆران عەلیپوور
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- تیراژ: ۱۰۰۰ دانە
- ژمارەی سپاردن: (۳۲۱)
-- چاپی یەکەم
- نرخ: ٥٠٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە
زنجیرەی کتێب – ۱۸ – (۱۲۱)

ناونیشان
دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com
ژمارەی تەلەفۆن: 2260311
www.mukiryani.com

# باروودۆخی سیاسیی کوردستان

## (1880-1946)

موجتەبا بورزوویی

وەرگێڕانی لەفارسییەوە

نازناز محەممەد عەبدولقادر

یوسف خزر چووپان　　سۆران عەلیپوور

کوردستان — هەولێر

٢٠٠٥

ناونیشانی کتێبی لێوەرگێردراو:
مجتبی برزوی
اوضاع سیاسی کردستان
( از سال ۱۳۵۸-۱۳۲۵ ه. ش )
تهران – نشر فکرنو
چاپ اول: ۱۳۷۸ ( ۱۹۹۹ ز )

**ناوی کتێب: بارودۆخی سیاسیی کوردستان (۱۸۸۰-۱۹٤٦**

- نووسەر: موجتەبا بورزوویی
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: نازناز محەممەد عەبدولقادر
یوسف خزر چووپان سۆران عەلیپوور
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- تیراژ: ۱۰۰۰ دانە
- ژمارەی سپاردن: (۳۲۱)
-- چاپی یەکەم
- نرخ: ۵۰۰۰ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە
زنجیرەی کتێب – ۱۸ – (۱۲۱)

ناونیشان
دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com
ژمارەی تەلەفۆن: 2260311
www.mukiryani.com

# پێرست



## بەشی یەکەم.

# بەشی دووهەم



# بەشی سێیەم

## بەشی چوارەم:

## بەشی پێنجەم:

# پێشەکیی وەرگێڕەکان

بارودۆخی سیاسیی کوردستان، بەرهەمی موجتەبای بەرزوویییە لە بواری مێژووی گەلی کورد لە ئێراندا و تاوتوێکردنی بەشێکی هەستیار و ئالۆزی مێژووی کوردە لە بەشێکی خاکەکەی دا، سەردەمانێك کە بە سەرەتای وەرچەرخانێکی گەورە لە رابردووی ئەو نەتەوەیە دادەنرێ و رێبەرایەتیکردنی جوولانەوە کوردییەکان دوای بە کردەوە لەبەریەك هەڵوەشانی میرنیشینە کوردییەکان دەکەوێتە دەستی شێخەکان و بنەماڵە ئایینییەکان، یان سەرەتای پێوەندی گرتنی کوردە لەگەڵ دیاردە جۆراوجۆرەکانی مۆدێرنە، کە یەکێك لەوانە ناسیۆنالیزمە و بە پێی هێندێك روانگەش شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بە باوکی ناسیۆنالیزمی کوردی دادەنرێ، نووسەریش لە شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵاوە دەست پێدەکاو بە لێکدانەوەی فاکتەرەکانی رووخانی کۆماری کوردستان لە مهاباد، کۆتایی بە لێکۆڵینەوەکەی دەهێنێ، ئەو دەیهەوێ وەڵامی چەند پرسیارێکی دەسکەوێ کە لە پێشەکی دەقە فارسییەکەدا هاتوون .

١- سێ رووداوی گرینگی مێژووی کوردەکانی ئێران، واتە شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، شۆڕشی سمکۆ و سەرهەڵدانی کۆماری مهاباد"بە وتەی نووسەر"تا چ رادەیەك هەڵقوڵاوی ناسیۆنالیزمی کوردین؟

٢- چ هۆکارێك بووە هۆی سەرهەڵدانی ستەمی نەتەوەیی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی رەزا شادا؟

٣- ئایا هەلومەرجی شیاوی کۆمەڵایەتی بۆ گەشەکردنی ناسیۆنالیزمی کوردی لە ئێراندا هەبووە؟

بێ ئەوەی کە بمانهەوێ خوێنەر بخەینە نێو بازنەی چەند بریارێکی پێش وەختەوە، بەڵام بە پێویستمان زانی کە بە شێوەیەکی گشتی سەبارەت بە نێوەرۆکی کتێبەکە چەند سەرنجێك بخەینە روو:"بارودۆخی سیاسیی کوردستان"وەك هەر کتێبێکی دیکە، هەڵگری کۆمەڵێك خاڵی لاوازو بە هێزە، نووسەر توانیویەتی هەڵسەنگاندنێکی بابەتیانەی رووداوەکان بکاو دەرەنجامی باشیش بە دەستەوە بدا، کەڵکی لە گەلێك سەرچاوەی جیاواز وەرگرتووەو تا رادەیەکی باش هەلومەرجی دەرکەوتنی رووداوەکانی ناسیوەو لە هێندێك بواریشدا زانیاری نوێ دەدا بە خوێنەر، لەوانەیە هەر ئەوەش وای لێکردبێ کە بە کۆمەڵێك دەرەنجامی جیاواز بگا بە بەراوردکردن لەگەڵ ئەو لێکۆڵینەوانەی کە پێشتر لەو بوارەدا نووسراون، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی ئەو بارودۆخەی کە کتێبەکەی تێدا نووسراوە، تێبینی ئەوە دەکرێ کە نووسەر خۆی لە نووسینی زۆر راستی مێژوویی بواردوە و بۆ ئەوەی (خوانەخواستە دڵی دەسەڵات

نەیەشێنیٚ) هێندێك ڕووداوی بۆ ئاقاری جیاواز لەوەی کە هەیە بردووە. هەوڵێکی زۆری داوە تا هەرچەشنە مۆرکێکی ناسیۆنالیزم لە بزووتنەوەو ڕاپەڕینە کوردییەکان بسڕێتەوەو بە دژکردەوەیەکی ئایینی یا خێلەکی بەرانبەر بە کردەوی کاربەدەستانی حکوومەتی نێوەندی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا پاساویان بدا و سەرکردەکانیشیان وەك کەسانێکی خێڵەکی فیۆدال، کە بیر لە پلەوپایە دەکەنەوە(لە پێوەندی لەگەڵ سمکۆی شکاك دا)یان وەك کەسانێکی توندڕەو کە لە ژێر کاریگەری هێزە دەرەکییەکان دان (لە پێوەندی لەگەڵ قازی محەممەد دا)، بناسێنیٚ.

لە لایەکی دیکەشەوە کێشەی کورد لە ئێراندا وەك کێشەیەکی فەرهەنگی دەخاتەڕوو، نەك کێشەیەکی نەتەوەیی و بەو بیانووەی کە کوردستانی ڕۆژهەڵات پێوەندییەکی دێرینەی کولتووری و مێژوویی و کۆمەڵایەتیی لەگەڵ قەوارەیەکی سیاسیی بە نێوی ئێراندا هەیە، دەیهەویٚ ڕاپەڕین و بزووتنەوە کوردییەکان لە لایەنی نەتەوەیی دابڕیٚ و کوردەکان وەك کەمینەیەکی وەفادار بە نێوەند بناسێنیٚ.

بێشك لە پێشەکییەکی ئەوتۆدا نە دەکریٚ هەموو تێبینییەکان و سەرنجەکانمان لە سەر نێوەرۆکی کتێبەکە بخەینە ڕوو و نە دەشمانهەویٚ ئەو کارە بکەین، چونکە دواکەس خوێنەرە کە بڕیاری خۆی لە سەر نێوەرۆکی کتێبەکە دەدا. ئێمە وەك وەرگێڕانی کتێبەکە ئەوپەری ئەمانەتمان لە وەرگێڕانی دەقە فارسییەکە بۆ سەر زمانی کوردی لەبەرچاوگرتووە و لە کاتی پێویستیشدا بۆ ئاگاداربوون لە حەقیقەتی ڕووداوەکان بۆ سەرچاوەی جیاوازیش گەڕاوینەتەوە، هێندە ماوە بڵێین کە بەشی یەکەم و دووهەمی کتێبەکە لە لایەن نازناز محەممەد عەبدولقادرەوە و بەشی سێیەم و چوارەم لە لایەن یوسف خزر چووپان و بەشی پێنجەمیش لە لایەن سۆران عەلیپوورەوە وەرگێڕدراون و هەر کەم و کوریەکیش لە وەرگێرانەکەدا هەبیٚ ئێمە لێی بەرپرسیارین. خوازیاری ئەوەین کە ئەو کارە هاوبەشەش کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردی پڕ بکاتەوە و خزمەتێکی سادەش بیٚ بە خوێنەران و ئۆگرانی زانستی مێژوو. جێگەی خۆیەتی کە ئەوپەری ڕێز و قەدردانی خۆمان بە هەموو ئەو هاوڕێ‌ ئازیز و لایەنانە بڵێین کە لە وەرگێرانی ئەو کتێبەدا هاوکاریان کردین و بە بیٚ یارمەتی و ڕێنوێنییەکانیان ئەو بەرهەمە ڕووناکی بە خۆیەوە نەدەدی.

**وەرگێڕەکان**

**١٥/مەی/٢٠٠٤ی زایینی**

# پێشەکی نووسەر

گرنگی کوردستان و شوێنگەکەی لە جوگرافیای سیاسیی ئێراندا، چ لە روانگەی تەواوەتی (یەکپارچەیی) خاکی وڵات و پارێزگاریکردن لە یەکیەتی نەتەوەیی گەلانی ئێرانی و چ لە روانگەی رێکخستنی سیاسەتە ناوچەییەکان و پێکهێنانی پەیوەندی لەگەڵ دراوسێکانی وەك تورکیە و عێراق ، شتێکی ڕوون و ئاشکرایە. وڵاتەکەمان ، ئێران، هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی بەردەوام وەك ئیمپراتۆریەتێکی فرە گەلی بوونی هەبووە و بەو شێوەیە درێژەی بە ژیانی خۆی وەك یەکەیەکی سیاسیی داوە. ئێران لەو لایەنەوە وێکچوونی هەیە لەگەڵ یەکە سیاسییەکانی رۆژهەڵات، ئیمپراتۆریەتی چین ، نیمچە کیشوەری هند و ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش لە رابردوودا بەو شێوەیە بوونە و ئەوەی لە ئەوان بەجێماوە، سیفەتی فرە گەلی لە بابەت ئەوانیشەوە هەر راستە. پێکدادانی رۆژهەڵاتی گۆی زەوی و شارستانیەتی رۆژئاوا، بوو بە هۆی ئەوەی کە ئاسۆی نوێ لەبەرچاوی رۆژهەڵاتییەکان بکرێتەوەو بەدوای ئەو رووداوەدا، رۆژهەڵات لەگەڵ سیمبۆلی سیاسیی و ئابوورییە نوێیەکان، گۆڕانکاری و بەرەوپێشەوەچوونە سەرسوڕهێنەرە هزری، کۆمەڵایەتی و کولتووری و زانستییەکان ئاشنا بوو کە بە دەسکەوتی شارستانیەتی رۆژئاوا، دەژمێردران.

مەسەلەی کەمە نەتەوایەتی و ئایینییەکان و داواکاری مافەکانیان بە شێوەی ئێستا، لەو بابەتانەن کە بۆ یەکەمجار رۆژئاواییەکان هێنایانە بەرباس و پێشینەی پەیدابوون و باسکردنی دەگەڕێتەوە بۆ دیاردەی ناسیۆنالیزم یان نەتەوەپەروەری، کە ئەوەش هەر لە رۆژئاواوە روویدا. ئەو دیاردە نوێیە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەو رۆڵەی کە لە لاوازکردنی مەسیحییەت و پێشکەوتن و ئازادی نەتەوەکانی ئەوروپایی هەیبووە، لە لایەن ئەوروپییەکانەوە وەك گورزێك بۆ بێ تواناکردنی وڵاتانی رۆژهەڵات بەکارهاتووەو زۆرجار دەسەڵاتدارانی رۆژئاوا، بەهێنانە پێشی مافی کەمەنەتەوەکان، یان بە واتایەکی دیکە پێویستی پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندی ئەوان، زیانی زۆریان لە وڵاتانی رۆژهەڵات داوە و بە واتایەکی دیکە ئەو مەسەلەیە بۆتە خاڵێکی لاوازی ئەو وڵاتانە. مەسەلەی کورد لەو نێوەدا یەکێك لە نموونە دیار و زیندووەکانە کە لەسەرەوە قسەی لێ کرا. مەبەست لە هەڵبژاردنی ئەو بابەتە لەو کتێبەدا هەوڵدانێکی هەرچەند بچووك و کەمە لە میانەی تیشك خستنەسەر لایەنە نادیارو دژبەیەکەکان کە لە

بەرهەمی مێـژوونووس و لێکۆڵـەرەوەکانی مێـژووی کوردەکـانی ئێرانـدا بەرچـاو دەکـەوێ. لـە نووسینی مێژووی کوردەکان دوو تاقم زیاتر لە ئەوانی دیکە چالاك بوونە. مێژوونووسانی رۆژئاوا و ناسیۆنالیستەکانی کورد، لەبـەر ئـەوەی تـاقمی دووەمـیش تـا رادەیـەکی زۆر کەوتوونەتـە ژێـر کاریگەری بیروبۆچوونی تاقمی یەکەم، هەر بۆیە رووی قسەی ئێمە لەگەڵ تاقمی یەکەم دەبێ. ئەو تاقمە لە مێژوونووسان لە بەرهەمەکانی خۆیـان لـە گۆشـەنیگایەکەوە دەڕواننـە هـەموو ناوچـە کوردنشینەکان، ئەوە لە حالێکدایە کە کوردستانی ئێران لە هەموو روانگەیەکەوە جیاوازی لەگەڵ ناوچەکانی دیکەی کوردنشین لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا هەیـە. هۆیـەکانی ئـەو جیـاوازی و یـەك نەبوونە هەر ئەو شتانەیە کە مێژوونووسـە قـین لـە دڵـەکانی رۆژئـاوا بەئەنقەسـت وەبەرچـاویان نەگرتووە. ئەو مێژوونووسانە سەرەتا باس لە دابەشکردنی کوردستان بەسـەر ئێـران و عوسمـانی و پاشان دەست بەسەرداگرتنی لە لایەن چوار ولاتی عێراق، سووریە، تورکیە و ئێراندا دەکەن. وەکـو ئـەوەی کـە بلێـی کوردسـتان یەکەیـەکی سیاسـیی سـەربەخۆیە بـە لایـەن و تایبەتمەندییـە جیاکارییەکانی خۆی لە بەرانبەر ولاتانی دراوسێی خۆیدا. هیچ ئاماژەیەك بـەو واقیعیـە ناکرێـت کە هەموو ولاتی کوردستان بەشێك بوویێت لـە ئێرانـی گـەورە و تـەنیا شکسـتە یـەك لـە دوای یەکەکانی سیاسیی و سوپایی، ئەو ناوچانەیان لە هەیکەلی ئەو ولاتە جیا کردبێتەوە.

لە زەمینەی تاوتوێکردنی ماهییەتی رەگەزی و زمانی کوردەکانیشدا، ناڕاستی و بە ئەنقەسـت کاری مێژوونووسە رۆژئاواییەکان ڕوون و ئاشکرایە. لە حالێکدا کە پەیوەندی لە نێـوان زمـانی کوردی لەگەڵ زمانەکانی فارسی کۆن، ئاڤێستایی، فارسی میانە یـان پەهلـەویی ئەشـکانی و پەهلەوی ساسانی بە تەواوی دیارە، دیسان دەبینین کـە رۆژئاواییـەکان بـە نکـوڵی کـردن لـەم واقیعیەتە ڕوونە، پێیان وایە کە زمانی کوردی لە سانسکریت نزیکترە و کوردەکان نەك لەگـەڵ فارسەکان، بەڵکو لەگەڵ هندییەکان بەیەك رەگەز دادەنێن و بەو شێوەیە ناڕاسـتەوخۆ مێـژوو و کولتووری ئێران تەنیا بە فارسەکان دەبەستنەوە و رۆڵی خەڵکی کورد لە پێکهێنـانی مێـژووی کولتووری ئێرانی و هاوبەشیان لەو پرۆسەیەدا وەبەرچاو ناگرن.

لە پانتایی گەڕان و تاوتوێکردنە مێژووییەکاندا، بارودۆخ لەوەش خراپترە. هیچ کەس لـە خـۆی ناپرسێ بە راستی بۆچی لە کوردستانی ئێران، پەنجا ساڵ درەنگتر لـە ناوچـە کوردنشـینەکانی تورکیە و عێراق، حیزبێکی سیاسیی پێك هات کـە ئامـانجی ناسـیۆنالیزمی کـوردی هـەبوو و رۆڵی حیزبە کوردییەکانی دراوسێ و گۆڕانکارییە سیاسیی و نێودەوڵەتییەکانی ناوچەکە، واتـە

هۆکاری دەرەکی تا چ رادەیەك کاریگەری هەبوو لە دوورکەوتنەوەی کوردەکانی ئێران لە ناسیۆنالیزمی ئێرانی و هەڵبژاردنی ناسیۆنالیزمی کوردی؟

دەزانین کە ناسیۆنالیزمی کورد لە رەهەندە کولتووری و سیاسییەکەی خۆیدا، دیاردەیەکە پەیوەستە بە کوردستانی عوسمانی کە لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا پەیدا بووە، کە پرۆسەیەکی سروشتی جیابوونەوەی کوردەکان لە تورکەکانە لە پانتایی رەگەزی، زمانی، کولتووری و کۆمەڵایەتیدا و هەروەها دژە کردەوەیەکە لە بەرانبەر سیاسەتە توندوتیژەکانی (بابی عالی) بە نیسبەت نەتەوەی کوردو لە لایەکی دیکە بە سیاسەتی ناوەندگەرایی ئەوان دەژمێردرێ. سەدەی نۆزدەهەم گەواهی شۆڕشە بەردەوامەکانی کوردەکانی عوسمانی بوو لە حاڵێکدا، لەوکاتدا کوردستانی ئێران بە تەواوەتی ئارام بوو و کوردەکانی ئێران سەرەڕای جیاوازی ئایینزا، وەفاداربوون بە رژێمی قاجارەکان. هۆیەکانی ئەو جیاوازییە لە هەڵسوکەوت و رەفتاردا دەبێ چی بێ؟

بێگومان کۆمەڵگای کوردیی ئێران و دەوڵەت و کۆمەڵگای ئێران، کۆمەڵە تایبەتمەندییەکیان هەبوو کە بە پشتبەستن بە ئەوان پەیوەندییەکی ساغ و پەسەندکراو لە نێوان کورد و فارسدا پێك دەهات و ئەوەش شتێك بوو کە دەوڵەت و کۆمەڵگای تورکی لەو تایبەتمەندییانە بێبەش بوو. لە بابەت کوردستانی ئێرانەوە دەبێ بنەمایەکی دیار قەبووڵ بکەین ئەویش ئەوەیە کە ئەو وڵاتە پێکهاتەیەکی یەکپارچەی نەبووەو لە دوو بەشی جیاواز لە یەك پێك هاتووە: ناوچەکانی کوردنشینی ئازەربایجان یان کوردستانی باکوور و ویلایەتی ئەردەلان (ویلایەتی کوردستان) یان کوردستانی باشوور و ئەوەش خاڵێکە کە مێژوونووسە رۆژئاواییەکان بە تەواوەتی هیچ گرنگیان نەداوەتێ. کوردستانی باکوور هەر لە کۆنەوە ناوەندی عەشیرەت و کوردستانی باشووریش شوێنگەی شارنشین و جووتیارە نیشتەجێیەکانی کورد بەژماردێ و هەر ئەو جیاوازییە لە شێوەی ژیاندا، سەرەتای بوونی جیاوازی لە رەفتاری سیاسیی و کۆمەڵایەتی و هەروەها ئاراستەگەرایی کولتووری دانیشتوانی ئەو دووناوچەیە پێك دەهێنێ. بوونی دژایەتی و دوولایەنی تەواو لە نێوان ئازەرییە شیعەکان و کوردە سونییەکان لە هەموو زەمینەکاندا لەوانە وەك زمان ، ئاینزا، شێوەی ژیان، کولتوور و شێوەی بیرکردنەوە و تا رادەیەك بێبەشکردنی کوردەکان لە هاوبەشی لە دەسەڵاتدا، بۆتە هۆی ئەوەی کە هەموو کات جۆرێك بەرگ و بەربەست کۆمەڵگای کوردەکانی باکوور لە دەوڵەتی ئێران جیا بکاتەوەو هاندان و کەڵك وەرگرتنی دەوڵەتی عوسمانیش ئەو مەودایەی زیاتر کردووە. بەڵام لە بەرانبەردا، ویلایەتی

کوردستان یان کوردستانی باشوور بەهۆی هاوبەشی رەگەزی خۆجێیی لە دەسەڵاتدا و دراوسێیەتی خەڵکی ئەو ناوچەیە لەگەڵ کوردە شیعە مەزهەبەکان کە دەمارگیری ئاینزاییان زۆر کەمترە لە شیعە ئازەرییەکان، بوونی پەیوەندی کولتووری، کۆمەڵایەتی و ئابووری لە نێوان ئەو ناوچەیە لەگەڵ ناوچەکانی دیکەی ئێراندا، کوردەکانی باشووری لە دەوڵەت و کۆمەڵگا و کولتووری ئێرانی نزیك کردبۆوە. بەڵام ناوچە کوردنشینەکانی ئێران سەرەڕای نەبوونی پێکهاتەی هاوشێوە، بە گشتی هەتا هاتنە سەرکاری رەزاخان بە ناسیۆنالیزمی ئێرانی وەفاداربوون، بەڵام لە سەردەمی پەهلەویداو بەهۆی پەیدابوونی دیاردەیەك بەناوی چەوساندنەوەی نەتەوایەتی، بەشی کوردنشینی ئازەربایجان وردە وردە بوو بە پێگەی ناسیۆنالیزمی کورد لە ئێراندا و هەڵبەتە ئەوەش بەهاوکاری هزری و سیاسیی حیزبە کوردییەکانی دراوسێ بە ئەنجام گەیشت. نەتەوەپەروەری کوردەکان دەرکەوتەی جیابوونەوەی تەواوی زمان، چارەنووسی مێژوویی و کولتووری کوردەکانە لەگەڵ تورك و عەرەبەکان و لە لایەنی زەمانییەوە دژەکردەوەیە کە بەرانبەر پەیدابوونی ناسیۆنالیزمی تورك و پان تورکیزمی تورکە لاوەکان. یەکێك لە ئامانجەکانی ئەم کتێبە پەیدابوونی وەڵامە بۆ ئەو پرسیارانەی خوارەوە:

- چ هۆکارێك هەبوو بۆ پەیدابوونی چەوساندنەوەی نەتەوەیی لە سەردەمی رەزا شادا؟

- سێ رووداوی سەرەکی مێژووی کوردەکانی ئێران، یان راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵا، شۆڕشی سمکۆ و دەرکەوتنی کۆماری مەهاباد تا چ رادەیەك لە نەتەوەپەروەری کوردەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو؟

- ئایا زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی بەربڵاو بۆ سەرهەڵدانی نەتەوەپەروەری لە ئێراندا هەبووە یان نا؟

ئەو پرسیارانە وای لە نووسەر کرد کە هەوڵی خوێندنەوەو تاوتوێکردنی بارودۆخی کوردستان بدات لە رێگای لێکۆڵینەوە لە بارەی راپەڕینەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا، و سمکۆ و پێك هێنانی کۆماری مەهاباد..

دەبێ دان بەوەدابنرێ کە نووسینی ئەم کتێبە لە سەرەتادا، بە لەبەرچاوگرتنی لە دەستدا نەبوونی سەرچاوەو بەڵگەی فارسی بە شێوەیەکی پێویست وای نیشان دەدا کە کارێکی بێ ئاکام و جێگای نائومێدییە، بەڵام بەهۆی دەست پێ ڕاگەیشتن بە سەرچاوەی کوردی و لاتینی و هەروەها تێپەڕبوونی کات و خوێندنەوەی زیاتر و گێڕانەوەو یادداشتەکانی کەسانێکی بە ئاگای وەك بەڕێز ئاغای یەحیا سادق وەزیری و هەمیشە زیندوو داریووشی فروهەر، ورد وردە کارەکان

دەچوونە پێش و تا رادەیەك بوو بە هۆی روونبوونەوەی مێژووی کوردستان لە ماوەی ساڵەکانی (١٧٨٩ تا ١٩٤٦ ز).

لێرەدا پێویستە سوپاسی هاوکاری بەرپرسانی دپارتمانی مێژوویی دامەزراوی تۆژینەوەی زانستە مرۆییەکان، بە تایبەت ئاغای عەبدولڕەزا ئازادگان، کارمەندانی کتێبخانەی بەشی تۆژینەوە، رێکخراوی بەڵگەنامەکانی میللی ئێران، مامۆستایانی بەڕێز، ئاغایان ناسر تەکمیل همایون، عەلی ئەسغەر موسەدەق و فەرهنگ رجایی بە خاتری هاوکاری و رێنوێنییەکانیان بکەین. لە بابەت سەرچاوە کوردی و لاتینییەکانیش خۆم بە قەرزدار و منەتباری مامۆستای بەڕێز ئاغای وەهابی وەلی و دۆستانی خۆشەویستم ئاغای کاوە گلکارو ئیستفان کترین دەزانم. هەروەها زۆر سوپاسی وەرگێڕ و نووسەری بە تواناو گەورەی کورد بەڕێز ئاغای ئیبراهیم یوونسی دەکەم کە کاری دژواری نووسینی پێشەکی، دووبارە خوێندنەوەو پێداچوونەوەی ناوەڕۆك و راستکردنەوەو هەروەها وەبیرهێنانەوەی هەندێك لە خاڵەکانی بەڕوویەکی کراوە قەبووڵ کرد.

لە کۆتاییدا سوپاسی دۆستی خۆشەویستم حەمید شوکری دەکەم کە دەرفەتی چاپی ئەم کتێبەی رەخساند و دڵنیام بێ هاوکاری ئەو خۆشەویستانە ئەو کارە بە ئەنجام نەدەگەیشت.

لێرەدا پێویستە باسێکی کورت لە بارەی ئەو سەرچاوانەوە بکرێ کە لەو کتێبەدا کەڵکیان لێ وەرگیراوە:

جیا لەو سەرچاوە دەستی یەکەم و بە بایەخانەی کە لە بارەی مێژووی کوردەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە گشتی و کوردەکانی ئێران بە تایبەتی نووسراون، کەڵك لە هەندێك بەڵگەنامەی تایبەت بەو ماددەیەی کە بابەتی کتێبەکەشە وەرگیراوە. هەروەها سوود لە بیرەوەری گوتراوەی ئەو کەسانەی کە لەو کاتیدا ژیاون یاخود لە کەسانی دیکەیان بیستووە، وەگیراوە.

لە خوارەوە ئاماژە بە هەندێك لەو سەرچاوانە دەدرێت کە کەڵکیان لێ وەرگیراوە.

**ـ بەڵگەنامە نوێ و چاپ نەکراوەکان و بەڵگەنامە بڵاوکراوەکان**

لە نووسینی ئەم کتێبەدا سەرەڕای سەرچاوەی دەستی یەکەم و پەیوەندیدار بە راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ و سمکۆ و سەرهەڵدانی کۆماری مەهاباد، کەڵك لە هەندێك بەڵگەنامەی ئەو سەردەمیش وەرگیراوە کە ئێستا لەبەر دەست دایە. بە تایبەت بەڵگەنامەکانی تایبەت بە رێکخراوی بەڵگەکانی میللی ئێران کە بابەتەکانی بەشی ٣ و ٥ تا رادەیەك لەسەر بنەمای ئەوان نووسراوە. کۆی ئەو بەڵگەنامانە، نامە و راپۆرتەکانی بەرپرسانی دەوڵەتی و سەرۆك عەشیرەتەکان و سەرۆکی کوردەکان لە خۆ دەگرێت. لە هەندێك لەو راپۆرتانەدا زانیاری بە کەڵك لە بارەی ماهییەتی کردەوەکان و ئامانجی ئیسماعیل ئاغای شکاك (سمکۆ) و هۆکاری سەرهەڵدانی ناڕەزایەتی کوردەکان بە نیسبەت شێوەی هەڵسوکەوتی بەڕێوەبەرایەتی رژێمی پەهلەوی لە ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجاندا، چۆنیەتی کەڵك وەرگرتنی قازی محەمەد لەو ناڕەزایەتیانە و ئاراستە کردنی ئەوان بە شێوەی ناڕەزایەتییەکی گشتگیر بە دژی دەوڵەتی ناوەندی بە دەستەوە دەدا. بەڵام بەڵگەنامە چاپکراوەکان تایبەتن بە راپۆرتەکانی نێردراوانی وەزارەتی دەرەوەو، نێردراوانی کۆمسیۆنی دیاریکردنی سنوور، کارمەندانی گومرگ و وەزارەتی دارایی، نامەکانی شێخ عوبەیدوڵلاّ و هەروەها راپۆرتەکانی دیپلۆماتەکانی رووسیە. کە لە کتێبی بەڵگەنامە و سەنەدی سیاسیی ئێران و عوسمانی لە ٦ بەرگدا، نامە و راپۆرتەکانی ئەمیر نیزامی گەروسی بۆ ناسرئەلدین شاو بەڵگەنامەکانی مێژووی شۆڕشی کوردەکان لە ساڵی ١٨٨٠ی ز، نووسینی دوکتۆر جەلیل جاسم جەلیل- دا دەست دەکەون.

### - سەرچاوە چاپكراوەكان

ئەو دەستە لە سەرچاوەكان لەگەڵ ئەو بەڵگەنامانەی کە باسکران، زانیاری بەسوود و گرنگ لە بارەی ئەو سێ رووداوەی کە ئێمە مەبەستمانن، بەدەستەوە دەدەن و لە واقیعدا ئەو بەڵگانەی کە باسیان لێ کرا تەواوکەری زانیارییەکانی ئەو سەرچاوانەن. هەندێك لەو سەرچاوانە وەك راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلا شەمزینی هاوچەرخی ناسرەدین شای قاجار، لە نووسینی غوریانسی ئەرمەنی، یان کۆماری کوردەکان لە ساڵی ١٩٤٦ز. نووسینی ویلیام ئیگلتۆن و باس و وەسفی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەو راپەڕینانە دەکەن. لەو بەرهەمانە دەکرێ ئاماژە بە نووسینەکانی مێژوونووس و کوردناسی بەناوبانگی رووسی وەك خالفین، مینۆرسکی و دوکتۆر جەلیل بکەین کە بە پشتبەستن بە بەڵگە و راپۆرتەکانی وەزارەتی دەرەوەی رووسیەی تیزاری و رۆژنامە و راپۆرتەکانی ئەرکانی وەزارەتی جەنگی رووسیە لە قەفقازدا ئامادەو کۆکراونەتەوە. بە یارمەتی ئەو سەرچاوانە دەتوانرێ لە لایەنە سیاسی و ئامانجەکانی شێخ عوبەیدوڵلا و هاندانی عوسمانی لە نێوان عەشیرەتە کوردەکانی ئازەربایجان و پێگەی کوردەکانی ئێران لە شەڕی یەکەمداو هەروەها لە هۆیەکانی بەهێزبوونی سمکۆ بگەین. هەڵبەت سەرچاوەی پلە دووەمی وەك مێژووی دەستورییەتی (مەشروتە) ئێران، نووسینی سەید ئەحمەد کسرەوی و کوردەکان (the Kurds)[١] بەرهەمی تیمسار حەسەن ئەرفەع کە کۆمەڵێك زانیاری تا رادەیەکی گرنگ و گشتی لە هەندێك بابەت دا باس دەکەن گرنگی خۆیان هەیە.

و کۆمەڵێکی دیکە لە بەرهەمە چاپکراوەکان هەنە کە دەکرێ بە سەرچاوەی کلاسیکی مێژووی کورد و کوردستان نێودێر بکرێن کە لەو نێوەدا کتێبی جووڵانەوەی نەتەوایەتی کورد، بەرهەمی کریس کۆچیرا، کوردەکان و کوردستان، بەرهەمی درك کینان، کورد و کوردستان[٢] ( Les Kurdes et le Kurdistan) بەرهەمی چەند دانەرێك (کە بۆ کەڵك وەرگرتن لە بەشی تایبەت بە ئێران لە سەرچاوەی سەرەکی کەڵك وەرگیرا) ، کاروانێك لە شەهیدانی کوردستان نووسینی کەریم حیسامی، ناو ببەین، هەروەها لە وتار و گۆڤاری فەرانسەوی وەك جیهانی ئیسلام[٣] (Le Monde Musalman) و رۆژهەلات[٤] ( Lotient) و رۆژنامە فارسییەکان وەك رێبەر، باختەر، ئیتلاعات کەڵك وەرگیراوە.

لەو نێوەدا چەند کتێبێك هەیە کە بە نیسبەت ئەوانی دیکە گرنگی زیاتریان هەیە، لێرەدا هەندێك لەوان بۆ ناسین دەخرێنە روو:

ا) راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ شەمزینی لە سەردەمی ناسرەدین شای قاجار نووسینی ئەسکەندەر غوریانسی ئەرمەنی. دانەر، وەرگێڕی زمانی فەڕانسەوی و راوێژکاری دەوڵەتی ئێران لە پێشانگای پاریس لە ساڵی ۱۸۷۸ز. کەسێکە کە لە نزیکەوە شایەدی راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ بووەو نووسراوەکانی بەهایەکی بەرچاو لە رووداونووسی بە خۆیەوە دەبینێ. لەناو بابەتەکانی کتێبی غوریانس باروودۆخی ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجان، هەڵە و خەتاکانی دەسەڵاتدارانی ئازەری، ئامانج و دەسەڵاتخوازی شێخ عوبەیدوڵلاّ، ناڕەزایی سەرکردە کوردەکان لە دەوڵەتی ئێران و چۆنیەتی راپەڕین و هۆیەکانی تێکشانی روون دەبێتەوە. لەو بەرهەمەدا هیچ باس لە دەست تێوەردانی عوسمانی و بەریتانیا ناکرێ بەو شێوەی باسکرا. بابەتەکانی ئەو کتێبە بە کەمێك دەسکارییەوە لە کتێبی مێژوو جوگرافیای دارا سەڵتەنەی تەورێز، نووسینی شازادە نادر میرزادە، هێنراوەتەوە لەبەر ئەوەی کە نوسخەی سەرەکی لەبەردەستدابوو لەو کەڵك وەرنەگیرا.

ب) ریسالەی راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ لەژێرناوی مێژووی ئەفشار، نووسینی عەلی خانی ئەفشار، یەکێك لە بەرگریکەرانی ورمێ لە رۆژەکانی هێرشی موریدانی شێخ عوبەیدوڵلاّ بۆ ئەو شارە، وەك سەرچاوەکەی سەرەوە باس لە هاندەری سیاسیی ئاینزایی و لایەنەکانی ناڕەزایەتی راپەڕینی شێخ دەکا و تایبەتمەندی گرنگی ئەو سەرچاوەیە تاوتوێکردنی بەربڵاوی رۆڵی کۆنسولی ئینگلیز و دکتۆر کوکران موژدەدەری ئەمریکایی لە بزاوتنی رێبەری کوردەکان و هاندانی خەڵك بۆ بەدەستەوەدانی شاری ورمێ بۆ شۆڕشگێرانە. لەو بەرهەمەدا بە تێروتەسەلی باس لە تایبەتمەندییە ئاینزایەکانی راپەڕینی شێخ و ئامانجەکانی لە پەرەپێدانی دەمارگیری کوردەکان دەکا.

ج) شۆڕشی کوردەکان لە ساڵی ۱۸۸۰ز." شۆڕشی کوردەکانی ساڵی ۱۸۸۰ز"کە لە واقیعدا نامەی دوکتۆرای نوسەری کورد، دوکتۆر جەلیل جاسم جەلیلە، لە رووسییەوە وەرگێڕدراوەتە سەر کوردی. دکتۆر جەلیل بە پشتبەستن بە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی رووسیە، بەریتانیاو نامەکانی شێخ عوبەیدوڵلاّ بۆ دەوڵەت و کەسایەتییە ئەورووپییەکان هەوڵ دەدا ئەو وەك یەکەم هەنگاوی کوردەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بۆ پێك هێنانی کوردستانی گەورە بناسێنێ. دانەر لەو نێوەدا باس لە نەبوونی زەمینەی راپەڕین لە ناو کوردەکانی ئێران دەکا و هەوڵ دەدا لایەنی ناڕەزایی جووڵانەوەی شێخ عوبەیدوڵلاّ وەبەرچاو نەگرێ و لە بەرانبەردا قاییل بە جۆرێك نەتەوە خوازی بۆ ئەو راپەڕینە بێ. ئامانجی دوکتۆر جەلیل لە دانانی ئەو کتێبە سەلماندنی شوناسی سەربەخۆخوازانە و ناسیۆنالیستی بۆ راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّیە.

د) مەسەلەی کورد لە ساڵەکانی ١٨٩٠- ١٩١٧ "کێشەی کورد ".١٨٩٠- ١٩١٧" بەرهەمی پڕبایەخی کوردناسی گەورەی رووس (م. س لازاریف)ە کە لە دووبەرگ دا نووسراوە، تاوتۆی بارودۆخی سیاسیی، ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکا.

دەست تێوەردانی عوسمانی لە کاروباری رۆژئاوای ئازەربایجان، نەخشەدانانی تورکە لاوەکان بۆ داگیرکردنی بەشە سونی نشینەکانی ئەو ویلایەتە، بارودۆخی گشتی عەشیرەتە کوردەکان لە ئازەربایجاندا، لە دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم هەتا دوو دەیەی سەرەتای سەدەی بیستەم، پێگەی سمکۆ و چۆنیەتی بەهێزبوونی ئەو لە ماوەی شەڕدا، سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کورد لە عوسمانی و هەروەها تاوتوێکردنی بارودۆخی کوردەکان لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا بابەت گەلی کتێبە ٧٠٠ لاپەڕەییەکەی لازاریفن، کە نووسەر کەڵکی لە وەرگێڕانە کوردییەکەی وەرگرتووە. دانەری رووس زۆر بە زیرەکییەوە هەوڵی داوە بوونی ناڕەوای رووسەکان لە ئازەربایجاندا، بە هۆکاری ئارامی، پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و گەشەکردنی بازرگانی ئەو ناوچەیە دابنێ و خۆی لە قەبووڵ کردنی ئەو حەقیقەتە دەبوێری کە رووسیە یەکێك بووە لە هۆکارەکانی قەیران و پشێوی لەو بەشەدا.

ه) بارودۆخی ئێران لە شەڕی یەکەم یان مێژووی رەزاییە، بەرهەمی محەممەد تەمەدن، لەو بەرهەمەدا، بارودۆخی ورمێ لە کاتی شەڕ، کاریگەربوونی سمکۆ بە دروشمە جیاخوازییەکانی مەسیحییەکانی ئاشووری یان چۆنیەتی بەهێزبوونی ئەو (سمکۆ) لەو بێ سەروبەرییەی کە لە شەڕی گەورەوە سەرچاوەی گرتبوو، پەیوەندی سەرۆك عەشیرەتی شکاك لەگەڵ لایەنگرانی شێخ محەممەدی خیابانی و کاریگەری دروشمی ناوچەگەرایی (Regionalism) ئەو بەسەر هێزی کوردەکانی ئازەربایجان، لەو بابەتانەیە کە سەرنجی دراوەتێ. هەروەها تەمەدن کۆمەڵە بابەتێکی سەرنج ڕاکێش دەدا بە خوێنەر لە بابەت یەکەم رۆژنامەی کوردی کە لە لایەن دەست و پێوەندەکانی سمکۆوە دەردەچوو.

و) کۆماری کوردەکان لە ساڵی ١٩٤٦ (The Kurdish Republic in 1946) نووسینی ویلیام ئیگلتۆنە.

ئەو بەرهەمە، زانیارییەکی تەواو و کامڵ لە بارەی سەرهەڵدانی کۆماری مەهاباد بەدەستەوە دەدا. هەلومەرج و چۆنیەتی دامەزراندنی یەکەم حیزبی سیاسیی کوردەکانی ئێران، بارودۆخی ناوچە کوردنشینەکان لە کاتی هاتنی رووسەکان بۆ ئێران، پێگەی عەشیرەتەکان، سەفەری

وەفدی کوردەکان بۆ یەکیەتی سۆڤیەت، هەلومەرجی لەسەر پێ راوەستانی کۆماری مەهاباد و پەیوەندی لەگەڵ ئازەربایجان، یەکیەتی سۆڤیەت و دەوڵەتی ناوەندی، ئەو چاکسازیانەی لە ماوەی دەسەڵاتی قازی محەممەد دا ئەنجام دراون و هۆیەکانی رووخانی، ئەوانە بابەت گەلێکن بە شێوەیەکی بەربڵاو و تێروتەسەل لەو بەرهەمەدا باسکراون. ئیگلتۆن هەوڵ دەدا کە دامەزراندنی کۆماری مەهاباد بە دەرەنجامی هەوڵ و کۆششی خەباتکارانی کورد بناسێنێ و رۆڵی یەکیەتی سۆڤیەت لەو رووداوەدا کەم رەنگ نیشان بدا. هەروەها ئیگلتۆن هیچ گرنگی بە هۆکاری ناوخۆیی رووخانی حکوومەتی قازی محەممەد نادا و بە باشی تاوتوێی کاریگەری هەوڵەکانی قەوام ئەلسەلتەنە لە لاوازکردنی کۆڵەکەکانی حکوومەتی مەهاباد دا ناکا.

- **کتێبی یادداشتەکان:**

لە بارەی شێوەی ژیانی سیاسیی، ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردەکانی ئێران سەرچاوەی سەربەخۆ هەڵبەت جیا لەو بەرهەمانەی کە کوردەکان خۆیان نووسیویانە، لە زمانی فارسیدا بوونی نییە، بەڵام زانیاری زۆر بە شێوەی بەربڵاو لە ناو لاپەڕی کتێبی بیرەوەرییە فارسییەکاندا هەیە کە کۆکردنەوەو لە تەنیشت یەکدانانیان، یارمەتیمان دەدا تا گۆشە تاریکەکانی مێژووی کورد رووناك بێتەوە. سەرەڕای ئەوانە، دەبێ ئاماژە بە زنجیرە کتێبێکی بیرەوەری کوردی بکرێ کە لە لایەن کۆمەڵە کەسێکی چالاکی سیاسیی کوردی عێراقی نووسراون و ئەو بابەتگەلەی ئەوان دەربارەی بارودۆخی کوردستانی ئێران نووسیویانە زۆر گرینگە. لێرەدا هەندێك لەو سەرچاوانە دەناسێنین.

ا) باس و حاڵی عەباس میرزای ملك ئارا. لەبەر ئەوەی کە دایکی ئەو شازادەیەی قاجار کوردو لە موریدانی شێخ تەهای باوکی شێخ عوبەیدوڵڵا بووە، هەر لەبەر ئەوەش شێخ عوبەیدوڵڵا لە کاتی داگیرکردنی سابڵاغی موکریدا، نامەیەکی بۆ نارد کە ئەوکات لە تاران دادەنیشت و پێشنیاری لێ کرد کە حوکمڕانی ناوچە داگیرکراوەکان بەدەستەوە بگرێ بەڵام عەباس میرزا کە دەیزانی توانای سەرکەوتنی شێخ زۆر کەمە، نامەکە و هەڵگرانی نامەکەی دایە دەست ناسرەدین شا، ملك ئارا باس لە زوڵم و دەستدرێژی کاربەدەستانی ئازەری دەکا و بەو جۆرەی کە خۆی ئاماژەی پێداوە لە وەسف و باسکردنی رووداوی راپەڕینی شێخ کەڵکی لە ناوەڕۆکی کتێبی غوریانس وەرگرتووە.

ب) خەباتی گەلی کورد لە یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی (خەباتی گەلی کورد لە یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی)دا.

ئەحمەد تەقی یەکێك بووە لە هەوڵدەران و چالاکانی سیاسیی کورد و ئەندامی کۆمەڵەی تورکی لە دوای ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی. هەروەها ئەو بە ئاماژەی کۆمەڵەی تورکیە لە ساڵەکانی دەیەی بیستی زایینی، هاوکاری لەگەڵ مستەفا کەماڵ و دارودەستەکەی کردووەو بەوهۆیەوە پەیوەندی دەری نێوان سمکۆ و کەماڵییەکان بووە. ئەو زانیارییانەی کە ئەو لە بابەت پەیوەندی سمکۆ لەگەڵ کەماڵییەکان، ئینگلیزەکان، رووسەکان و شێخ مەحموود، بەدەستەوەی دەدا بۆ ئاشنابوون لەگەڵ ماهییەتی راپەڕینی سمکۆ و هۆیەکانی یارمەتیدانی بێگانە بەو و هەروەها ناسینی ئامانجی کۆتایی ئەو سەرکردە شکاکە، زۆر سوودمەندو بەکەڵکە.

ج) یادداشت ـ بەرهەمی رەفیق حیلمی لە خەباتگێرانی کوردی عێراقی و خەڵکی سلێمانییە کە لە سێ بەرگدا چاپکراوە. رەفیق حیلمی لە ساڵەکانی دوای شەڕی یەکەم، یەکێك لە هاوڕێیانی شێخ مەحموودی بەرزنجی بووەو لە رۆژنامەی "دەنگی کوردستان" دا، وتاری دەنووسی . ئەو شایەدی وتووێژی نێوان سمکۆ و شێخ مەحموود لە سلێمانیدا بووەو باس لە هۆکاری سەرنەکەوتنیان دەکا لە پێکهێنانی چالاکییەکی هاوبەشدا و بەهۆی هاوبەشیکردنی لە راسپاردەیەکی سیاسیدا، باسێکی زیندوو لەسەر بارودۆخی شارەکانی تەورێز و رەزاییە(ورمێ)و هەروەها ئەو زەرەرو زیانانەی کە لە لایەن سمکۆ وە بە ناوچەکانی رۆژئاوای باشووری ورمێ گەیشتووە، دەدا بە دەستەوە.

د) یادداشتەکان ـ نووسینی عەبدوڵلا ئەحمەد رەسوڵ پشدەرییە کە دوو بەرگە و بەرگی یەکەمی تایبەتە بە رووداوەکانی ئێران و کۆماری مەهاباد و بەرگی دووەم تایبەتە بە شۆڕشی کوردەکانی عێراق. عەبدوڵلا پشدەری خەباتگێڕی کوردی عێراقی لە سەرەتادا ئەندامی حیزبی هیواو پاشان بوو بە ئەندامی حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق و لەو کاتەی کە کۆماری مەهاباد لەوپەڕی دەسەڵاتدا بووە لە ئێران بووەو لە شەڕی پێشمەرگەکانی دیموکرات لەگەڵ سوپای شاهەنشاهی لە بەرەکانی سەردەشتدا، بەشداری کردووە.

بیرەوەرییەکانی ئەو لە چەند لایەنەوە گرینگن: یەکەم ئەوەی کە ئەو لە روانگەی کوردێکی عێراقی دەڕوانێتە مەسەلەکان و دوای پێداهەڵگوتن و ستایشی قازی محەممەدو حیزبی دیموکرات، هەروەها رەخنە لە شێوەی رەفتاریشیان دەگرێ. دووەم: لە بابەت پێکهاتەی کابینەی

قازی محەممەدو بارودۆخی عەشیرەتەکان، پێگەی بازرگانیان، هەڵسوکەوت و ئامانجی یەکیەتی سۆڤیەت، چاکسازییەکانی قازی محەممەد و گرنگتر لە هەموویان یۆتۆپیست خوازی توندی قازی محەممەد بۆ پێکهێنانی کوردستانی گەورە، زانیاری باش و جێگای سەرنج باس دەکا، کە لە هیچ کام لە سەرچاوە فارسی و لاتینییەکان دا ئاماژەیان پێ نەدراوە. پاشان پشدەری نیشان دەدا کە چۆن قازی ناچار بوو چاوپۆشی لە ئیدەی کوردستانی گەورە بکا و روو لە دروشمی دیمۆکراسی بۆ ئێران و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بکا. پشدەری ئەوە دەسەلمێنێ کە هەندێك لە عەشیرەتەکانی ئێران و تەنانەت عەشیرەتەکانی عێراقیش دژایەتی کۆماری مەهابادیان دەکردو هاوکاری دەوڵەتی ئێرانیان دەکرد.

# بنەماڵەی ئەردەلان بەر لە فەرمانڕەوایی قاجارەکان

ناوچەکانی کوردنشینی ئێران بەر لە هاتنی قاجارەکان بۆ سەر شانۆی فەرمانڕەوایی وڵات، لەژێر دەسەڵاتی دوو بنەماڵەی کورد، بەڕێوە دەچوون: بنەماڵەی موکری لە ناوچەی ئازەربایجان و بنەماڵەی ئەردەلان لە میرنشینی ئەردەلان یا کوردستان. بەرینایی قەلەمڕەوی میرانی ئەردەلان کە "والی"یان پێ دەگوتن، جاروبار لە میرنشینی کوردستان تێدەپەڕی و سەرانسەری کوردستانی عێراقی ئەمڕۆ و شارەکانی موسڵ و کەرکووکیشی دەگرتە خۆ، بەڵام لەگەڵ بەدەرکەوتنی بنەماڵەی فەرمانڕەوایی بابان لە کوردستانی عوسمانی و هەروەها لەگەڵ بەرفراوانبوونی دەسەڵاتی رامیاری سوپایی دەوڵەتی عوسمانی لەو ناوچەیەدا، وردە وردە بەشەکانی رۆژئاوای قەلەمڕەوی والیانی ئەردەلانی لێ جیابۆوە.

بەپێی نووسینەکانی مێژوونووسان دەردەکەوێ کە بنەماڵەی ئەردەلان بەلایەنی کەمی لە نیوەی دووهەمی سەدەی شەشەمی کۆچی، فەرمانڕەوایی هەندێ لە ناوچەکانی کوردنشینی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان دەستپێکردبێ.

عەلی ئەکبەری وەقایع نگار بڕوای وایە کە میرانی ئەردەلان لە سەرەتادا لە شاری موسڵ نیشتەجێبوون و لە ساڵی ٥٤٦ی کۆچی ١١٢٥ز بۆ ناوچەی شارەزوور هاتوون و قەڵای "زەڵم" ناوەندی فەرمانڕەواییان بووە و لە دواییدا ناوچەکانی سەقز، سیاهکوه و عەلی شەکریشیان خستۆتە سەر ناوچەکانی ژێر قەلەمڕەوی خۆیان.[1]

نووسەری "توحفەی ناسری" لە یادکردنی بارودۆخی میرانی ئەردەلان و بنەچەکەیان دا دەنووسێ:

"سەبارەت بە بنەچەکەی میرانی ئەردەلان و سەرەتای فەرمانڕەواییان بیروبۆچوونی جۆراوجۆر هەیە، هەندێك دەیانگەڕێننەوە بۆ (حەمەد بەنی مەروان) و هەندێکیتریش بۆ خەسرەوی ئاشەوان کە بە یارمەتیی ئەبو موسلم مروزی لە سەردەمی (سەفاح ئەبو ئەلعەباس ئەحمەد عەباسی) بەسەر کوردستاندا زاڵ بووە و بەم شێوەیە بە بنەماڵەی ئەردەلان ناوزەد کران و هەندێکی تریش گوتوویانە کە هەر ئەو خەسرەو ناوە بەهۆی کوشتنی یەزدگورد پاشای ئێران، پلەیەکی گەورەی پێدراوە و لەو کاتەوەیە کە فەرمانڕەوایی بەنی ئەردەلان دەستیپێکردووە...".[2]

خاوەنی تەزکیرەی حەدیقە (ئەمان ئیلاهی) لەم بارەیەوە نووسیویەتی:

"میرانی ئەردەلان پشتبەپشت، پتر لە هەشت سەد ساڵە خاوەنی میرایەتی و فەرمانڕەوایین، بنەچەکەیان بۆ ئەردەشێری بابەکان دەگەڕێتەوە."[۳]

ئاماژەکردن بە هەبوونی بنەماڵەی فەرمانڕەوای ئەردەلان بۆ یەکەم جار بۆ سەدەی شەشەمی کۆچی دەگەڕێتەوەو پێشینەی ئەم بنەماڵەیە بەر لەم سەدەیە پتر شێوەی ئەفسانەیی بەخۆوە گرتووەو بەڵگەی مێژوویی نییە، بە پێی ئەم ئەفسانانە هەروەکو پیشەی ئێرانیانی پاش ئیسلامو بۆ ئەوەی شەرعییەت بە فەرمانڕەوایی ئەردەلان بدەن، بنەچەکەیان بۆ ساسانیان و ئەردەشێری بابەکان دەگەڕێننەوە.

لە سەدەی نۆیەمی کۆچی، عوسمانییەکان ناوچەکانی شاربازێر تا هەولێر و کۆیە، هەریر، ئامێدی و ڕەواندزیان لە میرنشینی ئەردەلان جیاکردەوە، بەڵام تووشی هیچ شەڕێك نەبوونو لە ساڵی ۸٦۲ی کۆچی، مەئموون بەگ میری ئەردەلان سەرلەنوێ ئەو ناوچانەی لە دەوڵەتی عوسمانی سەندەوە.[٤]

ململانێو ڕکەبەری نێوان میرانی ئەردەلان و دەوڵەتی عوسمانی کە زۆربەی کات شەڕی خوێناوی لەگەڵدابوو، بووە هۆی ئەوەی لە کاتی سەرهەڵدانی سەفەوییان، ئەو میرە کوردانە پشتیوانی لە بابی عالی نەکەن و لایەنگری سەفەوییان بن. لەسەردەمی حکوومەتی شا تەهماسب، سورخاب بەگی میری ئەردەلان، ملکەچ بوونی خۆی لە ئاست دەوڵەتی ئێران ڕادەگەیەنێ و شا لە بەرانبەردا بەرگری لە میر دەکا، ئەو کاتەی کە لەگەڵ ڕۆستەم پاشای تورك تووشی ناکۆکی دەبن. سورخاب بەگ لە ڕەوتی ملکەچ بوونی لە ئاست شای ئێرانێ هێندە چووە پێش کە بێجگە لە هاوکاری نەکردن لەگەڵ برا یاخیبووەکەی شا بە ناوی ئەلقاس میرزا کە هانای بۆ دەوڵەتی عوسمانی بردبوو، دەستگیریشی دەکاو دەیداتە دەست شا تەهماسب و لە سۆنگەی ئەو خزمەتە شا ساڵانە هەزار تمەنی لە خەزێنە بۆ بڕیەوە.[٥]

بەم شێوەیە، پێشینەی دوژمنکاری نێوان میرانی ئەردەلان و عوسمانی وایکرد کە ئەردەلان لە سەفەوی نزیك بێتەوە.

بەڵام دەبێ بزانرێ کە هەرکات لاوازی دەکەوتە ناو دەزگای دەسەڵاتدارەتیی سەفەوی، عوسمانییەکانیش هەوڵی خۆ نزیککردنەوەیان لە میرانی ئەردەلان بەکاردەهێناو هانیان دەدان بۆ

یاخیبوون. لایەنگریەتی تەیمورخانی میری ئەردەلان لە سولتان سلێمانی بە دەسەلات و سالانە وەرگرتنی سەد هەزار ئاقچە لەو، نموونەیەك بوو. وەقایع نگاری کوردستانی، رادەگەیەنێ کە هەلۆخانی میری ئەردەلان کە دوای تەیموورخان دێ، بۆ پاراستنی هەلکەوت و پێگەی خۆی لەگەلْ هەر دوو دەولەتی ئێران و عوسمانی خۆی گونجاندبوو.(٦)

هەلۆخان هاوکات لەگەلْ هاتنە سەرتەختی پاشایەتی شا ئیسماعیلی دووەم، دەسەلاتدارەتی دەگرتە دەست. نووسەری (سیرەی ئەکراد) بەهێزبوونی هەلۆخان لە لاوازی دەولەتی ئێراندا دەبینێتەوە کە لەدوای مردنی شا تەهماسب، ئێران تووشی بێسەروبەریی لە کاری فەرمانڕەوایی بوو و لەم بارەیەوە دەنووسێ:

"هەلۆخان... هێندە لە کاری سەرکردایەتی (میرایەتی) بەهێز بوو کە گوێی بە دەسەلاتدارەتیی شای ئێران نەدەدا کە شا ئیسماعیل بوو. شا ئیسماعیلیش نەیدەتوانی بەرپەرچی ئەم کارەی هەلۆخان بداتەوە، کەواتە هەلۆخان ڕۆژبەرۆژ لە دەستڕۆیی، بەهێزتر دەبوو و تا نزیك هەمەدان و کرماشانی خستە ژێر رکێفی خۆی."(٧)

بەلام دوای ئەوە کە شا عەباس هاتە سەر تەختی شایەتی "... سەلتەنەتی ئێران بووژایەوەو سوپایەکی گەورەی بۆ لادانی هەلۆخان رەوانە کردو سەرکەوتووانەش گەڕانەوە."(٨)

شا عەباس بۆ لادان و پالنانی هەلۆخان تەنیا بەمە نەوەستا کە سوپایەکی قزلباشی بۆ سەر میر رەوانە بکا بەلکو خوشکی خۆشی بە ناوی سەیدە بە یگمیشیدا بە کوڕی هەلۆخان ـ خان ئەحمەد خان ـ کە وەك نەریتی بارمتەگیری لەو کاتەدا دوو سالْ لە ئیسفەهان رایگرتبوو. هەنگاوی دواتر ئەوە بوو کە خان ئەحمەدخان بە زۆری خۆی کرد بە میری ئەردەلان و باوکی لە میرایەتی لادا. هەلۆخان وەك فەرمانڕەوایەکی سوننەی دلْ پیس بوو لە ئاست شیعە و دژی هاتنی قزلباش بۆ قەلەمڕەوی خۆی بوو و لەو بڕوایە دابوو کە تەنیا دەبێ سەرانە بە شا بدرێو هیچی دیکە. نووسەری (سیرەی ئەکراد)دەلێ: هەلۆخان لەسەر ئایینی ئیسلام و ئایینزایی سوننەت و جەماعەت بوو. دەمارگیرییەکی تەواوی بەرانبەر بە ئایینزای شیعەی دوازدە ئیمامی هەبوو و هەرگیز نەیدەهێشت ئەوان دەسەلاتدارەتی ناوچەکەی وەئەستۆ بگرن. کاتێ ئاگادار بۆوە کە خان ئەحمەدخان خوشکی شای مارە کردەوەو ژمارەیەك قزلباشی لەگەلْ خۆی هێناوە گوتی: "انا لله و انا الیە راجعون، هێندەی پێناچێ کە شیعە لە کوردستان دەستڕۆ دەبن."(٩)

خان ئەحمەدخان خزمەتی چاکی لە دەوڵەتی سەفەویدا ئەنجام دا، لەوانــە ســەرکوتکردنی خێڵــە یاخیبووەکانی موکری و فیدراسیۆنی ئێلەکانی بلباس، داگیرکردنی قەڵای رەوانــدزو بەشـداریی کاریگەر لە داگیرکردنی بەغدا، دەکرێ ئاماژەی پێبکرێ. دانانی ئەو وەك میر، یەکەم نموونــەی خۆتێهەڵقورتاندنی شایەکانی ســەفەوییە لــە دانــان و لادانــی میرانــی ئــەردەلان. دوای خــان ئەحمەدخان، سلێمان خانی کوڕی جێی گرتەوە کــە لــە ســاڵی ١٠٤٦ی کۆچــی ١٦٢٥ز شــاری سنەی بنیات ناوە کە سەردەمی فەرمانڕەواییەکەی پتر بــە ململانــێ و شــەڕی نێــوان ئــەوان و میرانــی بابــان بەســەر چــوو کــە بنەماڵەیــەکی کــوردو لــە ژێــر دەســەڵاتی عوسمانییــەکان و فەرمانڕەوای کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی بوون. لێرە بەم لاوە هۆکــارێکی تــر، میرانــی کوردی ئەردەلانی لە دەوڵەتی ئێران نزیکتر کردەوە کە ئەویش دوژمنکارییەکانی نێوان ئەوان و میرانی بابان بوو، چونکە بابانەکان بە چاوی تەماحکاری دەیانڕوانیە وڵاتی ئەرەدەلانەکان.

نووسەری (تەزکیرەی حلول) لە بارەی پێگە و هەڵکەوتی میرانی ئەردەلان لە دەزگای سەفەوی‌دا دەنووسێ کە میرانی ئەردەلان "میرانی دوور لە دەوڵەت خانە" یا "میرانی سنوور" بــوون کــە بەشێك بوون لە چــوار ویلایــەتی عەرەبســتان، گورجســتان، بــەختیاری و کوردســتان، مــیری ئەردەلان لەناویاندا پلەی سێیەمی هەبوو.[١٠] ئەو لــە کــاتی تــاج لەســەرنانی شــای ســەفەوی لەتەك میرانی تر ئامادە دەبوو و شمشێری شای هەڵدەگرت و پلەیەکی بەرزی هەبوو.

دەوڵــەتی ســەفەوی مەبەســتی لــە بەهاوبــەش کردنــی میرانــی ئــەردەلان لــە دەســەڵاتداریدا و ئەسپاردنی هەندێ بەرپرسیاریەتی بەوان، ئەوە بوو کــە نــەهێڵێ حکوومــەتێکی ســەربەخۆ لــە نێوان ئێران و عوسمانییەکان ساز بکەن‌و جگە لەمە هەلومــەرجی پێویســت بــۆ بڵاوکردنــەوەی فەرهەنگ، زمان و ئەدەبیاتی فارسی لە نێو توێژی دەیرۆو پیاوانی ئایینی و ئــەدیبانی کــورد لەم سەردەمەدا بەرچاودەکەوێ و ناوچەکانی کوردنشین پتر لە هەر سەردەمێکی تر، پێوەنــدییان دەگەڵ دەوڵەتی ئێرانێ سازکرد و لە چوارچێوەی ئەم وڵاتەدا جێیان گرتــەوە. هاوکــات لەگــەڵ، دارمانی شایانی سەفەوی و دەسەڵاتدارەتیی ئەفغانەکان لــە ئیســفەهان، فــەرمانڕەوای بابــان، خانەپاشا، شاری سنەی داگیر کرد.

نووسەری(سیرەی ئەکراد) بارودۆخی فەرمانڕەوایانی ئەردەلان لەم ســەردەمەدا شــی دەکاتــەوە: "بەم پێیە کە بێ سەرەوبەرەیی کــەوتبووە وڵات و دەســتڕۆیی ئەفغانــەکان، کــەس دەروەســتی خانەپاشا نەهات و نەیانتوانی پێشی پێبگرن."[١١]

بەم شێوەیە فەرمانڕەوایانی ئەردەلان بە شێوەیەکی کاتی، دەسەڵات لە دەستیان هاتەوە دەرو بۆ وەرگرتنەوەی، ڕوویان لە دەوڵەتی تازە پێگرتووی ئەفشار کرد. سەرەنجام نادر بە پێی خواستی ئەردەلانەکان، پەلاماری فەرمانڕەوای بابانی داو بێ شەڕ بابانەکان هەڵاتن. عەباس قولی خان دووبارە بوو بە میری ئەردەلان. عەبدولقادر بابانی ئاماژە بەم خاڵە دەکا کە شا تەهماسبی سێیەم لەسەر پێشنیاری نادر، عەباس قولی خانی ئەردەلانی کرد بە میرو بە پێی وتەی ئەو: "دووبارە چرای ئەردەلان داگیرساوە".[١٢] بەم جۆرە بوو کە دەوڵەتی ئێران، میرانی ئەردەلانی خستە سەرکاری دەسەڵاتدارەتی و کۆتایی بە دابڕانی دە ساڵەی ئەوان لە دەسەڵاتدارەتی هێنا. ئەم گۆڕانکارییانە بوونە هۆی ئەوەی کە بنەماڵەی ئەردەلان لەمەولا شەرعییەتی فەرمانڕەوایی خۆیان لە دەوڵەتی ئێران بخوازن و پتر لە جاران ملکەچی فەرمانەکانی سیستمی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ئێران بن و وەفادار بمێننەوە.

هەڵبەت دوابەدوای ئەم جۆرە جووڵانەوەیەی ئەردەلانەکان لە ئاست فەرمانڕەوایی ئێران، کۆمەڵگەی کوردیش پتر پێخۆش بوونی خۆی بۆ پێوەندی بەرفرەوانتر لەگەڵ نەتەوەی فارس هەست پێدەکردو لە بەراوردکردن لەگەڵ سەردەمی بەر لە سەفەویان میرنشینی ئەردەلان پێوەندیی نزیکتری بە زمانی فارسی و فەرهەنگی ئێرانی سازکرد. ئەردەلانەکان لە گەمارۆدانی کەرکووك، یارمەتی نادرشایان داو ئەوان دوای میر سوبحان وێردیخان کوڕی عەباس قولی خان لە شەڕی ئێرانو هیند و داغستان بەشدار بوون.

دەبێ بزانرێ کە بێجگە لە بەرژەوەندی و سوودی رامیاری، پێویستییەکانی هاوبەشی ئابووریش، بنەماڵەی ئەردەلانی وا لێکرد کە سیاسەتی هاوتەریب لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەتی ئێران بگرێتە بەر، بە جۆرێك کە فەرمانڕەوایی ناوەند، لە بەرانبەر وەفاداری میران و هەڵگرتنی هەندێ بەرپرسیاریەتی لە قازانجی ئەوان، تیول و زەوی پێ دەبەخشین و میرەکانیش بێجگە لە سەرانە، ژمارەیەك هێزی خێڵایەتی یا بنەچەیان دەدا بە دەوڵەت.

لە سەرتاسەری سەردەمی دەسەڵاتدارەتی زنجیرە شایەتی زەندەکان، میرانی ئەردەلان بێ سێو دوو ملکەچی فەرمانڕەوایی ناوەند بوون و تەنانەت لە شەڕەکانی کەریم خان لەگەڵ پاشای بەغدا لە خزمەتی شا دا بوون، بەڵام دوای مەرگی کەریم خان، بۆ میرانی کورد روون بۆوە کە زوو یا درەنگ، خێلی قاجار دەسەڵات وەدەست دەهێنێ، هەر بۆیەش خەسرەوخانی میری ئەردەلان ئەنجوومەنێکی راوێژکاری لەگەڵ پیاوماقووڵانی کورد بۆ شیکردنەوەی بارودۆخ، ساز داو پاش وتوویژ بڕیاردرا کە پشتیوانی لە ئاغا محەممەدخان بکرێ نەك جەعفەرخانی زەند.(١٣)

میری ئەردەلان کەوتە شەڕ لەگەڵ جەعفەرخانی زەندو لەم شەڕە جەعفەر خان شکستی هێناو خەسرەوخان دیلەکان و کەلوپەلی بەدەست هاتووی شەڕی بۆ خانی قاجار لە مازەندەران ناردو خانی قاجاریش لە راست ئەم کردەوەیە، پاداشی دایەوەو ناوچەی سنقرو کلیایی خستە سەر قەلەمڕەوی میر. نووسەری (تاریخی محمدی) باسی ملکەچی تەواوی میر لە فەرمانڕەوایی قاجارو هەلآیسانی شەڕێکی دیکە لەدژی جەعفەرخان دەکا.(١٤)

لەمەولا شایەکانی قاجار راستەوخۆ لە دانان و لادانی میرانی ئەردەلان دەستیان دەڕواو ئەمەش لە سیاسەتی ئاغا محەممەدخان، سەبارەت بە یەکپارچەکردنی ئێران سەرچاوە دەگرێ. نووسەری (تاریخی محمدی) دوای شیکردنەوەی گەشتی ئاغا محەممەدخان بۆ هەمەدان لە ساڵی ١٢٠٢ لە بارەی مانەوەی دووبارەی خەسرەوخانی والی لەسەر فەرمانی شای قاجار، ئاوا دەنووسێ: "دوای ئەوەی خەسرەوخان ـ میری کوردستان ـ کە پێشتر خزمەتی شای کردبوو هەروەکو ئاماژەی پێکرا، لە دوورەوە رێورەسمی ملکەچ بوون نیشان دەدا، کە ئەمە کردەوەیەکی ناپەسندو دژ بە رای پیرۆزی ئەو کەڵەپیاوە بوو، حەزرەتی شا بڕیاری دا کە لەم سەفەرەدا تەمبێی بکاو لەو کاتە کە شاو سوپایەکەی گەیشتنە هەمەدان، لوتف عەلیخان مامی میر بە دەست و دیارییەوە هاتە خزمەت شا لە بارەگاکەی و لەبەری پاڕایەوە کە لێی خۆش بێ‌و چاوپۆشی لەم یاخیگەرییەی میر بکا و داوای تەمەن درێژی بۆ کردو بەڵێنی پێدا هەر کە دوای گەڕانەوەی شا بۆ تارانی پایتەخت، ملوانکەی ملکەچی لە مل دەکاو دەبێتە بەندەی گوێڕایەڵی شا." بەم شێوەیە بەهۆی بەڵێنی لوتف عەلیخان فەرمانی میرایەتی و دیاری و ئەسپ و ژمارەی میرایەتی بۆ حاسڵ کراو گەڕایەوە.(١٥)

له سەردەمی فەتحعەلی شای قاجار، میری کوردستان کوڕی خەسرەوخان بوو کە ناوی ئەمانولڵاخان بوو و لە سەردەمی ئەو شەڕو ناکۆکی لە نێوان ئەندامانی بنەماڵەی ئەردەلان دەستی پێکردو ئەو زۆربەی کەسوکاری دەوروبەری خۆی کوشت. کەسوکاری کوژراوان روویان لە تارانێ کردو سکالاّیان گەیاندە شاو داوای یارمەتییان لێکرد، بەلاّم میر بە دانی هەندێ پارەو پووڵ بە شاو سەرنج راکێشانی بۆ لای خۆی، نەیارانی تریش وەك میرزا ئەحمەدی وەزیرو سەیدانی ئاغازەمائیشی کوشت.

ئەم رووداوانە بوونە هۆی ئەوەی کە شا نوێنەرگەلێ بۆ شیکردنەوەی بارودۆخی کوردستان رەوانە بکاو ئەو هەلومەرجە وای کرد کە بازنەی دەسەلاّتدارەتیی دەوڵەتی ئێران بەسەر ناوچەکانی کوردستان و دەست تێوەردانیان لە کاروباری کوردستان بەرفرەوانتر بێ.

هەر لەم کاتەدابوو کە میرانی ئەردەلان بۆ پتەوکردنی هەڵکەوتی خۆیان لە ناو ئێرانداو لە دژی عوسمانییەکان، دەستیان کرد بە زەماوەندی سیاسیی لەگەڵ بنەماڵەی قاجار دا. یەکەم زەماوەندی سیاسیی ئەو کاتە لە نێوان خەسرەوخانی کوڕی ئەمانولڵاخان و حوسنی جەمال بەیگم کچی فەتحعەلی شا بوو کە پاشان بە "والیە" ناوی دەرکردو ماوەیەك فەرمانڕەوایی کوردستانی لەئەستۆ گرت. نووسەری (تاریخی عەزدی) لەبارەی ئامانجی پێوەندیی نێوان بنەماڵەی قاجارو بنەماڵەی ئەردەلان دەنووسێ:

"ئەمانولڵاخان" میری کوردستان بۆ داخوازی والیە خوشکی شوعاع ئەلسولتەنە دەستبەکار بوو. خەسرەوخانیش زۆر جوان بوو و ئەمانولڵاخان باوکی (خەسرەوخان) ئامانجی ئەم زەماوەندەی بۆ شیکردەوە کە دەمەوێ بەهۆی ئەم پێوەندییەوە، لە شا نزیك ببمەوە بۆ ئەوەی دەستدرێژییەکانی دراوسێیەکان بۆ سەر نیشتمان کورت بکرێتەوەو هەڵکەوتی میرایەتیی من بپارێزرێ.[١٦]

ئەم زەماوەندانە زیاتر میرانی ئەردەلانی لە دەوڵەتی ئێران نێزیك کردەوە، چونکە شازادە خانمەکانی قاجاری لە کاروباری کوردستان دەستیان دەڕۆیی و لە دانان و لادانی میرەکان، کاریگەر بوون. بۆ وێنە حوسن جەمال بەیگم کە بە والیە ناوبانگی دەرکرد، پاش مردنی خەسرەوخان کاروباری میرنشینەکەی لە ئەستۆ گرت تاکو جێگری میر بگاتە تەمەنی یاسایی خۆی و لەبەر لێهاتوویی لەم کارەدا بە والیە ناوبانگی دەرکرد. والیە بریکاری حکوومەت بوو و لە هەڵبژاردنی نوێنەری میرنشین (وکیل ولایت) کە کاروباری کردەیی (ئیجرایی) لەبەردەستدابوو، دەستی دەڕۆیی.[١٧]

بالاّدەستی رامیاری ئەوەندە بوو کە توانی گلەیی لە کردەوەی رەزا قولی خانی میر بکاو ببێتە هۆی لە کار لادانی و دانانی ئەمانولاّخانی دووەم لە لایەن محەممەد شاوە بۆ حاکمی کوردستان. پاش ماوەیەك لە دوای تێپەرینی ئەم رووداوە، هاوسەری رەزا قولی خان بە ناوی شازادە تویاخانم کچی نایب ئەلسولتەنە عەباس میرزا ، لە چەند رێگاوە شای وروژاند تاکو دووبارە میرایەتی بە شووەکەی بدرێتەوە. نووسەری (سیرەی ئەکراد) دەنووسێ کە والیە خانم ئەو رۆژگارەی کە ئاغاخان نووری بۆ کاشان دوور خرایەوە، لە تاران یارمەتیی کەسوکاری داو بۆیە پاش ئەوەی کە ئاغاخان بوو بە سەرەك وەزیر (صدارت) میری کوردستان نێوانی لەگەڵ خۆش بوو.

لە دواییدا، یەکێ لە کچانی خەسرەوخانی میر بە ناوی هوماخانم بوو بە هاوسەری ناسرەدین شا. ئەنجامی ئەو پێوەندییە ژن و ژنخوازییە رامیارییەش، خۆتێهەڵکوتانی کاریگەرانەی ئەندامانی بنەماڵەی قاجاری لە بەرێوەبردنی کوردستان و زەمینەخۆشکردن بوو بۆ لادانی میرانی ئەردەلان لە دەسەلاّتدارەتی و هاتنە پێشی لێپرسراوانی بیانی لە میرنشینییەکەو یارمەتی پرۆسەی بە ناوەندی کردنی دەسەلاّتدارەتیی قاجارەکانی دا لە رێگەی بە قاجاری کردنی ناوچەکانی خۆجێیی. بەم پێیە لە لایەك بەستنەوەی بنەماڵەی ئەردەلان بە بنەماڵەی شایەکان بووە هۆی ئەوەی کە دەسترۆیی خۆجێیان لەکیس چوو، بەلاّم لە دامودەزگای دەوڵەتی پلەی دیکەیان بەدەسهێناو دەسەلاّتیان بە شێوەیەکی تر پاراست.

## مەیلی میرانی ئەردەلان بەرەو فەرهەنگی ئێرانی

## هەڵکەوتی ئەوان لە گۆڕەپانی رامیاری ئێراندا

لەسەردەمی قاجاردا لە ئەنجامی پەرەسەندنی پێوەندیی نێوان میران و فەرمانڕەوایی ئێران دوای سەفەوییەکان، رۆژبەڕۆژ میران پتر بەرەو ئاینزای شیعی دەچوون.

نووسەری (سیرەی ئەکراد) بە ڕاشکاوی دەڵێ کە خەسرەوخان میری هاوچەرخی ئاغا محەممەدخانی قاجار "لەسەر رێبازی ئاینزای شیعی بووەو خان دەروێشیش نازناوی بوو."[١٨]

ئەمانوڵاخانی دووەمیش حەزێکی زۆری لە ئاست ئاینزای شیعی و زمانی فارسی هەبوو و بۆ خۆی بە زمانی فارسی هۆنراوەی هەبوو. بەپێی نووسینی نووسەری (سیرەی ئەکراد) ئەم میرە "بە تەواوەی بەسەر هۆنراوەو پەخشانی فارسیدا زاڵ بوو و لە سەرەتای کار حەزی لە ئاخاوتنی دەروێشانەو سۆفیگەری هەبوو، لە دواییدا خۆی لێ کشاندنەوەو رێبازی دەستەی شێخیەی کرد بە دروشمی سەرەکی خۆی و لەگەڵ ئەو دەستەیە کەوتە ئاخاوتن‌و ڕاگۆڕینەوە. نوێنەری ناردە خزمەت حاجی محەممەد کەریم خانی قاجاری سەرۆکی ئەم دەستەیەو فێری حوکمەکانی ئاینزاییەکە بوو و جاروبار مەلا عەبدولسەمەدی هەمەدانی جێگری (خەلیفە) حاجی ناوبراوی بۆ سنە بانگهێشت دەکرد. سەرەنجام لەسەر هەمان بیروبڕوا بەرەو جیهانەکەی تر چوو."[١٩]

لایەنگریەتیی غولام شاخانی میری هاوچەرخی ناسرەدین شا بۆ سەر رێبازی شیعی بووە هۆی دڵەڕاوکێی زانایانی سوننەی سنەو بە هاندانی ئەوان هەندێ لە خەڵکی هەڵچوون و بازاڕیان تاڵان کرد کە لە ئەنجامدا میر بە توندی سەرکوتیان دەکاو شێخ عەبدولقادر لەزانایانی گەورەی شار پەنای بۆ ناو خاکی عوسمانی بردو میر بۆ تەمبێ‌کردنی خەڵکی، هەشتا هەزار تومەنی لە خەڵکی شار سەند (وەك قەرەبووی زیانەکان) کە ئەم شەڕە بە شەڕی کاروانەکە بەناوبانگە.[٢٠]

ئەم لایەنگریانە بووە هۆی ئەوەی کە هەندێ لە ئەندامانی بنەماڵەی ئەردەلان رێبازی شیعی هەڵبژێرن کە لە بچمە هەرە دیارەکانی لقی شیعی، (فەفرولمەلیك)ی ئەردەلانە کە لە وەزیرانی ناسرەدین شاو حاجی (عز ئەلممالیك)ی ئەردەلان لە وەزیرانی سەردەمی قاجاری و پەهلەوییە.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم لە سۆنگەی پێداگرتنی یاسایی بابی عالی بۆ دانانی فەرمانبەرو لێپرسراو لە جیاتی میرانی کوردی لە کوردستانی عوسمانی، بنەماڵەی بابان بەرەو

ئێران هەڵکشـان و مـەحموود پاشـای بابـان کـوڕی عەبـدوڵڕەحمان پاشـا، زیـاتر حـەزی لـە نزیکبوونەوەی کۆشکی شای ئێران بوو.

نووسەری (سیرەی ئەکراد) لەم بارەیەوە نووسیویەتی: "مـەحموود پاشـا لەسـەر قسـەی بـاوکی هەردەم بیروڕاو سەرنجی بەرەو ئێـران بـوو و لـە خزمـەتکارانی جێگـری شـا، عـەباس مـیرزا دەژمێردرێ، هەر بە یەکجاری لە ملکەچی عوسمانی دابڕاو بـەرەو کۆشـکی دەوڵـەتی ئێـران و نزیکی جێگری شا، عەباس میرزا خزی کە چەندین ساڵ بەم شێوەیە مایەوە.(٢١)

هەڵکشانی بابانییەکان بەرەو ئێران، پێوەندیی ئەردەلانەکانی بە ئێران پتەوتر دەکـردو پـتر لـە جاران بەرانبەر عوسمانی دەوەستان. میری ئەردەلان زۆربەی کات لە شەڕی ناوخۆیی یان دەرەکی پێویست بوو کە ژمارەیەك شەڕکەری خێڵەکی یا بنیچە لەبەر دەستی شا دابنێ.

نووسەری (توحفەی ناسری) لە بارەی رۆڵی هۆزەکانی کورد لە گەمارۆی هەراش و بەشـدارییان لەم شەڕە لە سەردەمی محەممەد شای قاجاری دەنووسێ:

"بەکورتی پاش ماوەیەك ئەفغانەکانی ئەبدالی هەراش، ئاڵای یاخیگەریان شەکاندەوەو دمبکی سەربەخۆیی خوازییان کوتا، شای ئێران محەممەد شای شەڕکەر فەرمانی دا کە سوپا لە هەر چوار لای ئێران کۆبکرێتەوەو بۆخۆشی بەرەو گۆڕەپانی شـەڕ بەڕێکـەوت ،لەوانـەش (٥٠٠) سـواری ئازاو بەناوبانگی لە کوردستان رەوانە کرابوون و رەزا قولی خان بە پێی پێشـنیاری (فـەرجوڵڵا وەزیر) (٥٠٠) سوارەی زرێپۆشی لە لاوانی خوێنگەرم و دلێرانی مەشـق پێکـراو هەڵبـژاردەی هۆزەکان و بەگزادەکانی شا، بە سەرکردایەتی نەجەف قولی خان و (میرزا ئەبو محەممەد) بـرازای وەزیر، رەوانەی دەرباری کۆشکی شا کران و لەگەڵ هاتنیان بۆ نـاو تـاران ئـەم (٥٠٠) سـوارە چەکدارە کە هەموو لەشیان ئاسن و پۆڵابوو بەو پەڕی شکۆداری و هەیبەتەوە لەبەردەم خەڵکی تێپەڕین و لە نێو سەربازانی سەرکەوتووی ئێرانـی بـە شـێوەیەکی جیـاواز دیـاربوون و بوونـە مایەی رێزلێنان و ئێرەیی پێهاتنەوەو سوێ بوونەوەی ئەوانی ترو محەممەد پاشا لەم چاکەکاری و خزمەتکاری و لێهاتوویەی میرو سەرکردەکانی کوردستان پتر لـە جـاران رەزامەنـد بـوو و بـۆ پادداشتی ئەم چاکەکارییە، خوشکە بەڕێزەکەی خۆی، تویا خانمی لە رەزا قولی خان مـارەکردو شازادە والیەی راسپارد بۆ ئەوەی لە نەبوونی ئەو (شا) هەرکاتێ کە پێی بـاش بـوو بـووك بـۆ کوردستان بگوازێتەوە."(٢٢)

لە سەردەمی سەرۆك وەزیر، میرزا تەقی خانی ئەمیر، بەشـە چـەکدارانی بنیچـەیی کوردسـتان

زیادی کردو گەیشتە هەزار سەربازو غولام شا خانی میر لەم سەربازانە فەوجێکی دروستکرد و سەرکردەو ئەفسەری بۆ دانان. ئەمیر بۆ چاودێریکردن و شیکردنەوەی بارودۆخی فەوجی کوردستان فەوجی ناوبراوی لە تەك میر لە کوردستانەوە بۆ ئیسفەهان بانگهێشت کرد تاکو لە گەشتی ناسرەدین شا بۆ ئەم ناوچەیە لە گەڵیدابێ.

خاوەنی (حەدیقەی ناسریە) دەنووسێ کە ئەمیر کەبیر، سەرەڕای دەربڕینی ڕەزامەندیی خۆی لە میری کوردستان و کارەکانی، میر لە دڵەوە ئاغاخانی نوری خۆش دەویست کە ئەو کاتی بە (ئیعتماد ئەلدەولە) بەناوبانگ بوو کە لە سۆنگەی ئەم پێوەندییە خۆشەویستییە دوولایەنە بوو وای کرد کە ئاقاخان لە سەردەمی سەرەك وەزیری خۆی، هەوڵی بەهێزکردنی میری داو سەربەخۆیی تەواوی لە فەرمانڕەوایی پێ بەخشیبوو.(٢٣)

لە ساڵی ١٢٧٥ی کۆچی ناسرەدین شای قاجار بە سەردان هاتە میرنشینی کوردستان و بۆی دەرکەوت کە خەڵکی لە کردەوەی میرو سیاسەتی ئەو ناڕازین و بەم جۆرەی کە نووسەری (سیرەی ئەکراد) نووسیویەتی نەیارانی میر سەردەستەی ئەم ناڕازییانە بوون و بەر لە گەشتی ناسرەدین شا بۆ کوردستان چەند "... نامەیەکیان بۆ شای شکۆدار نووسی و لە ڕەوشتی بەدی میر، هاوار هاواریان بوو."(٢٤)

ئەسەدوڵڵا بەگی وەکیل و عەلی محەممەد بەگی وەزیری میریش سکاڵایان بردە بەردەم شا. ئەمە نیشان دەدا کە پیاوانی کارگێڕی خۆجێیی کوردستان، شەرعییەتی خۆیان و فەرمانڕەواییە ناوچەییەکەی خۆیان لە دەوڵەتی ناوەندی و خودی شا داوا دەکردو هەرگیز یەك چینی سیاسیی بەتوانای کورد بە یەکگرتوویی و یەك پارچە لە بەرانبەر فەرمانڕەوایی ناوەندیدا سەری هەڵنەدا. بەهەر حاڵ شا میری وەلاناو لە باتیان نەجەف قولی خانی ئەردەلانی دامەزراند.

ئەمە بە دەستپێکی دەست تێوەردانی فەرمانڕەوایی ناوەندی لە کاروباری کوردستان دەژمێردرێ و یەك دەیە دواتر،مامی شا، فەرهاد میرزا، (موعتەمەد ئەلدەولە) بووە فەرمانڕەوای کوردستان. لادانی بنەماڵەی ئەردەلان لە فەرمانڕەوایی کوردستان بە مانای هەوڵی دەوڵەتی قاجاری بۆ بێبەشکردنی سەرکردەکانی کورد لە دەسەڵاتداریەتیی پێشتریان نەبوو و لە ڕاستیدا لە پێویستی و ناچارییەوە سەرچاوەی دەگرت. یەکەم خەڵکی کوردستان لە شێوازی بەڕێوەبردنی وڵات لە میرەکان ناڕازی بوون و دووەمیان عوسمانییەکان هۆزەکانی هەورامان و جافیان لە دژی ئێران دەورووژاند کە ئەردەلان دەسەڵاتیان بەسەر ئەم هۆزە

یاخیبووانەدا نەدەشکا. نووسەری (سیرەی ئەکراد) لەم بارەیەوە نووسیویەتی: چونکە شای مەزن هەردەم گەرەکی بوو سنوور و سامانی ناوچەکە پارێزراو بێ و لە کرداری میری رەحمەتی (ئەمانوڵاخان کە بۆ جاری دووەم بوو بە میر) زویر بوو، ناچار بوو کە شازادە (موعتەمد ئەلدەولە) فەرهاد میرزای مامی خۆی کە لە رادەبەدەر ئازاو دلێر و کارامە بوو، بکاتە فەرمانڕەوای ئەم ناوچەیە...". [٢٥]

شا لەوە دەترسا کە یاخیگەری و سەرپێچی هۆزەکانی هەورامان کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم دەستیپێکردبوو، زەمینەیەك بۆ خۆ تێهەڵقورتانی عوسمانی لە کوردستان بهێنێتەدی و ئاشکرا بوو کە میرانی ئەردەلان نەیاندەتوانی دەروەستی ئەم گرفتە بن و بە پێی وتەی نووسەری (سیرەی ئەکراد) هۆزەکانی هەورامی "ئازارو زیانێکی زۆریان بە گوندەکانی دەوروبەر دەگەیاندو میر هەرچەندە تەقەلای دەکرد کە سزایان بدا نەیتوانی، بۆیە لە ماوەی پازدە ساڵان سەربەخۆیی تەواویان وەرگرت کە سەرکوتکردنیان سانا نەبوو، میریش ناچار تەکبیری لێکردن."[٢٦]

(موعتەمد ئەلدەولە) بە هاوکاری هۆزەکانی تری کوردستان، هەورامییەکانی بەوپەڕی توندی سەرکوتکرد و سەرکردە راپەڕیوەکان ناچاربوون هانا وەبەر مەزهەر پاشای پارێزگاری سلێمانی ببەن. پشتیوانی پاشا عالی لە حەسەن سوڵتان و سەعید سوڵتانی هەورامی نیشان دەدا کە دەوڵەتی عوسمانی لە هیچ دەرفەتێك بازی نەدا بۆ ئەوەی کەڵك لە کوردی نارازی وەربگرێ و بە دژی دەوڵەتی ئێران بیانوروژێنێ. جافەکان هۆزێکی کۆچەری بوون کە هەموو ساڵێ دەهاتنە کوێستانەکانی کوردستانی ئێران و جووتیارانیان دەخستە ژێر گوشاری خۆیانو سەرو ماڵ و سامانیان تالان دەکردن. لە ساڵی ١٢٨٩ی کۆچی ١٨٦٨ز محەممەد پاشای جاف داوای لە شای ئێران کرد کە بهێڵێ هۆزەکەی لە ئێران نیشتەجێ بن، بەڵام (موعتەمد ئەلدەولە) دژایەتیی ئەم داوایەی کردو گوتی بەو مەرجە دەتوانێ جافەکان قبووڵ بکا کە واز لە ژیانی کۆچەری بێنن و بن بە جووتیارو لە یەك شوێن دامەزرێن، بەڵام ئەم پێشنیارە لە لایەن جافەکان رەتکرایەوەو لە ئەنجامدا دەوڵەتی ئێران داواکاری ئەوانی قبووڵ نەکرد.[٢٧]

لادانی میرانی کورد لە حکوومەتی کوردستان و دانانی لێپرسراوانی بیانی نەبووە هۆی راپەڕین و یاخیگەریی خەڵکی کورد، کوردەکان بە چاکی ملکەچی فەرمانڕەوایی (موعتەمد ئەلدەولە) بوون و بە یەکێ لە باشترین سەردەمەکانی ئاسایش و ئارامی کوردستان یادی دەکەنەوە.

وەقایع نگاری کوردستانی لەم بارەیەوە نووسیویەتی: "شازادە موعتەمد ئەلدەولە هەقی لەسەر خەڵکی کوردستان هەیە، سێ هەقی گەورەی سەلماند. لە راستیدا ناوی کوردو کوردستانی زیندو و تازە هێشتەوە. یەکێ لەم هەقانە لەناوبردنی هەورامییەکان بوو چونکە هەورامییەکان دەستڕۆییان دەکرد بەسەر دوورو نزیك و بەسەر ناوچەکە دا زاڵ بوون. هەروەها لەلای خاکی دەوڵەتی عوسمانیش تا ڕۆخ شاری سلێمانی، بێ سێ و دوو لەژێر حوکمی ئەوان دابوو و لەلای دەوڵەتی ئێرانیش تا نزیك شاری سنە، کاروبار لە دەست هەورامییەکان بوو و بابەتێکی وا گرنگ لە لایەن سنووردارران لە دەوڵەتی ئێران دەشاردرایەوەو لێپرسراوانی دەوڵەتیان ئاگادار نەکردەوە، تا وای لێهات شازادەی گەورە لە بنوڕیشەوە هەڵیقەندن. هەقێکی تری ئەم شازادە مەزنە، لابردنی دەستی ستەمکارانەی گێرەشێوێنانی دەرو دراوسێی کوردستان بوو. هەقێکی تری ئەم شازادە هێژایە، لەناوبردنی خێڵی جاف بوو کە لە راستیدا لەناوبردنی ئەوان و لابردنی نەگبەتییەکانی ئەوان لە کوردستان کارێکی ئەستەم بوو."(٢٨) بەپێی رێککەوتننامەکانی ئێران و عوسمانی هەر هۆزێك کە لە خاکی یەکێ لە دوو وڵات نیشتەجێ بن دەبێ سەرانە بە حکوومەتی ئەوێندەر بدەن، بەڵام هۆزی جاف نە تەنیا سەرانەیان نەدەدا، بەڵکو گشت گوندو کێڵگەکانیان لە سنوور تا سێ فەرسەخی سنە وێران و تاڵان دەکرد. سەرکوتکردنی جافەکان لە ساڵی ١٢٨٦ی کۆچی ١٨٦٥ز ئەنجام درا کە سەرکردەی هۆزەکانی کوردی ئێرانیش لەم شەڕەدا بەشداربوون. نووسەری حەدیقەی ناسریە دەنووسێ: " موعتەمد ئەلدەولە هەموو ٥٠٠ سەربازی بۆ پاراستنی بارودۆخی ناوچەی هەورامانی دەناردو حکوومەتداری ئەوێی بە یەکێ لە کوردەکانی سنە سپارد، ئەم سیاسەتە بۆ ماوەی دە ساڵان درێژەی کێشاو لە سێبەریدا خەڵکی کوردستان بەوپەڕی ئارامی ژیانیان بەسەر برد."(٢٩)

بێجگە لە دامەزراندنی کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی، ڕکابەری و دژایەتیی نێوان هۆزە نیوەکۆچەری هەورامی و هۆزەکانی کۆچەری جاف لەگەڵ جووتیارانی نیشتەجێی میرنشینی کوردستان کە بە مەبەستی داگیرکردنی زەوییە پڕپیت و بەرەکەت و لەوەڕگاکانی ناوچەکە، دەبووە هۆی نزیکبوونەوەی زەویداران و دەرەبەگی ناوچەکە و دەوڵەتی ناوەندی و پێویستیی ئامادەبوونی کارگێڕی سیستمی قاجاری لەو شوێنانە پتەوتر دەکرد.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی ئەردەلان، بەڕێوەبردنی کوردستان بەهۆی دامەزراوی وەزارەتو وەکالەت ئەنجام دەدرا کە بەهۆی یەك وەزیرو یەك وەکیل لەژێر چاوەدێریی میر سەرپەرشتی دەکرا.

وەزیر پتر بەرپرس بوو لە ڕێکخستنی پێوەندییەکانی میرنشین لەگەڵ حکوومەتی ناوەندیو وەکیل بەرپرسی ڕێکخستنی پێوەندییەکانی ناوخۆیی و وەرگرتنی سەرانە بوو و هەڵبەت جاروبار گشت ئەو کارانە بەهۆی وەزیر یا وەکیل ئەنجام دەدراو بە واتەیەکی تر سنووری ئەرکەکانیان زۆر روون و دیارنەبوو. لادانی میری ئەردەلان بە مانای وەلانانی گشت توخمە کوردییەکان لە کاری بەڕێوەبردنی کوردستان نەبوو، بە واتایەکی تر دامەزراوەکانی وەزاریو وەکالەتی میرنشینیو فەرمانبەرانی خۆجێیی درێژەیان بە بوونی خۆیان دا. نووسەری (توحفەی ناسری) ئاماژە بەم خاڵە دەکا کە " لە دەورانی حکوومەتی موعتەمد ئەلدەولە و شازادەکانی دیکەی قاجار، بەڕێوەبردنی شارۆچکەکان جگە لە سنە لە ئەستۆی خودی کوردەکان بوو، بۆ وێنە لەسەردەمی موعتەمد ئەلدەولە کاروباری خێڵەکان لە دەست حەوت کەسی کوردی دەوروبەری شازادە بوو و حکوومەتی سێزدە شارو شارۆچکەی کوردستان لەگەڵ کاروباری کەمینەکانی مەسیحی و جوولەکە، کاروباری پاراستنی شاری سنە لە ئەستۆی کوردەکان بوو."(٣٠) لەمەودوا هەمیشە حکوومەتی کوردستان دەدرا بە یەکێك لە شازادەکانی قاجاری و ئەم ناوچەیە بە تەواوەتی ملکەچی دەوڵەتی ناوەندی بوو و لەم بارەیەوە لەگەڵ ناوچەکانی کوردنشینی ئازەربایجان جیاواز بوو، بوونی کاریگەرانەی دەوڵەتی ناوەند لەمیرنشینی کوردستان و رادەی بەرزی بەشداری گەورە پیاوانی ئەم ناوچەیە لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆجێیی ناوچەکە هێندە بەرچاو بوو کە دەوڵەتی عوسمانی هەرگیز نەیتوانی وەك ئازەربایجان لە ئەگەری نارەزایەتیی کوردەکان یا جیاوازیی ئایینیان لەگەڵ خەڵکی ناوەندی ئێران بەمەبەستی بەرفراوانکردنی دەسەڵاتداریەتیی خۆیان و گوشار خستنە سەر دەوڵەت سوود وەربگرن.

ناسرەدین شا بە لەبەرچاو گرتنی کاریگەری وتەی زانایانی ئایینی کوردو گرنگییان لە مێشكو دەروونی خەڵکی ناوچەکە، هەوڵی دا بە سەریاندا زاڵ بێ و بە بەخشینی نازناوی (شێخ ئەلئیسلام)و هەڵبژاردنی یەکێك لە زانایان بۆ وەرگرتنی ئەم پلەیە، خۆی لە کاروبارەکان هەڵقورتێنێ، هەر بۆیەش لەپاش گەشتی ناسرەدین شا بۆ کوردستان لە ساڵی ١٢٧٥ی کۆچی ١٨٥٤ز (شێخ ئەلئیسلام)و موفتی "کوردستانات": هەموو دەم بەهۆی شایەکانی قاجاری هەڵدەبژێردران. بەم پێیە هەنگاوێکی تر بۆ پتەوکردن و سەقامگیری هەلکەوت و توانستی دەوڵەتی ناوەندی لە کوردستان هاوێژراو سیستمی قاجاری لەگەڵ بەرەسمی قبووڵ کردنی رۆڵی کوردەکان لە بەڕێوەبردنی کاروباری نێوخۆیی، زاڵ بوون و کاریگەریی خۆیان لە ناوچەکەدا پاراست.

## هێزەکانی موکری:

تۆژینەوە لە بارەی بارودۆخی ڕامیاری - کۆمەڵایەتی ناوچەکانی کوردنشینی ئازەربایجان نیشان دەدات کە لە زووەوە جۆرە جیاوازییەك لە شێوەی ژیانی ڕامیاری - کۆمەڵایەتی - ئابووری کوردەکانی ئەم ناوچەیە و خەڵکانی میرنشینی کوردستان هەبووە. لە کاتێکدا کە لە سەدەی نۆزدەهەمی زایینی توێژێکی شارنشینی لە شارەکانی سنە و سەقز سەریهەڵدەدا، کوردی ئازەربایجان زیاتر هۆزگەلێکی کۆچەرو نیوە کۆچەربوون کە شوێنی نیشتەجێ بوونیان بە ناوچەیەکی خێڵەکی حسێب دەکرا، لەم سەردەمەدا میرنشینی کوردستان لە ڕووی گەشەکردنی پێوەندی زەویداری باو لە ئێراندا، پێشکەوتووتر بوو و زەویداری گەورە پێی گرتبوو. بەڵام کوردستانی باکوور لە سۆنگەی چڕبوونەوەی دانیشتوانی خێڵەکی کوردو نەبوونی شاری گەورە، ئابووری بەستراو و شوانکارەیی (شبانی) هەبوو.

شارۆچکەکانی مەهاباد، شنۆ، سەردەشت، نەغەدەو بۆکان لە سەرەتادا بوون بە بازاڕێك بۆ ساغکردنەوەی کەلوپەل و بەروبوومی کشتوکاڵی هۆزەکانی نیشتەجێ لە کوردستانی باکوور کە پەیتا پەیتا گەورە بوونو بوونە شار بەم شێوەیە کە کوردستانی باکوور لەبەر هەبوونی زنجیرە چیای بەرز و سیستمی ئابووری شوانکارەیی پێوەندییەکی بازرگانی بەرچاوی لەگەڵ ناوەندی ئابووری ئەوکاتی ئێران وەك تاران، ئیسفەهان، شیرازو تەورێز نەبوو.

گەورەترین خێڵەکانی کوردی ئێران وەك مەنگوڕ، مامەش، زەرزا، گەورك، پیران، سوێسنی، بەگزادە، ئالان، دێبوکری، شکاك و جەلالی لە ناوچەی کوردنشینی ئازەربایجان نیشتەجێبوون. لە ڕووی جوگرافییەوە شوێنی ژیانی ئەم گروپانەی کوردی لەبەر چیای بەرزو ڕێگای دژوار شێوازێکی تایبەتی ژیانیان بەسەر داسەپابوو کە لە ئەنجامدا کرداری سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردەکانی ئەم ناوچەیە لە مێژووی ئێران و ئازەربایجان و کوردەکانی ئێران، گرنگییەکی تایبەتی هەیە. بەشێکیش لە کوردستانی باکوور لە سەردەمی دەسەڵاتدارەتیی سەفەوییەکان بوو بە شانۆی سەرەکی شەڕی نێوان ئێران و عوسمانی. چونکە ڕووبەڕووبوونەوەی شیعە - سووننە لەم شەڕانە بە هۆکاری بنچینەیی دوژمنایەتی و قینی نێوان تۆخمەکانی ئێرانی و تورك دەژمێردرا، کوردەکان و ئازەرییەکانی ئەم ناوچەیەش بوون بە میراتگری کۆمەڵێك دەمارگرژی زۆر کە هەمیشە وەك سنوورێکی نادیار لە نێوان دوو کۆمەڵگەی کورد و تورك کاری دەکردو هەبوونی کەمینەیەکی مەسیحی ئاشووریو ئەرمەنیش، ڕەهەندی تری بەم دەمارگرژییە دەبەخشی.

خێڵەکانی موکری لە کۆتایی سەدەی نۆیەمی کۆچی و هاوکات لەگەڵ بزووتنەوەی شێخەکانی سەفەوی، لە کوردستانی عوسمانی و میزۆپۆتامیای باکوور (دوورگەی ئیبن عومەر) لە سووریە هاتنەوە ئێران. نووسەری (سیرەی ئەکراد) لەو بڕوایە دایە کە یەکەم جار کەسێك لە بنەماڵەی پاشاکانی بابان بەناوی بابامیر ناوچەی ئێستای موکریانی لە ئازەرییەکان سەندو وردە وردە منداڵەکانی ئەو لەم ناوچەیە حکوومەت دەکەنو لەو کاتەوە، موکرییەکان هەردەم سەربە دەوڵەتی عەجەم بوون.(١)

هۆزەکانی موکری لە سەردەمی رووبەڕووبوونەوەی قزڵباشەکان و تورکەکانی عوسمانی، لای ئێران و هەندێ جاریش لای (بابی عالی)یان دەگرت و گرنگترین رووداوی ئەم سەردەمە خۆڕاگری یەکێ لە سەرکردەکانی موکری بوو بە ناوی میرەبەگ کە بە خانی لەپ زێڕین بەناوبانگەو لە بەرانبەر قزڵباش لە قەڵای دمدم شەڕ دەکا، کوردی ئێران و تورکیە بیرەوەری ئازایەتی ئەویان کرد بە بەیت و بالۆرەو هۆنراوەی رازاوەو بەم شێوەیە یادیان زیندوو هێشتەوە. میری کورد بەر لە سەرپێچی کردن، لەگەڵ قزڵباش یەکبوون و شا عەباس کە میرمحەممەدی لەپ زێڕینی (کە دەستی لە جەنگی تورکەکان بڕابۆوە) "... کەوتە بەرچاو، ئاوڕی لێ داوەو کردی بە میری خێڵەکانی دەشتی تەرگەوەڕ بە نازناوی خان، گەورەی کردو لە راستیدا ئەیالەتی ورمێ و شنۆشی پێبەخشی و وەستایانی زێڕینگەر، دەست و باسکێکی لە زێڕی سوور درستکراو و بە گەوهەرو مرواری نەخشراویان بۆ ساز کرد."(٢)

شا عەباس رێگەی پێدا کە لەپ زێڕین قەڵایەك لە دۆڵی قاسملوو ناوچەی مەرگەوەر ساز بکا کە بە دمدم بەناوبانگەو لەبەر قایمی و سەختی قەڵاکە، لەپ زێڕین و سەرکردەکانی تری کورد لە دژی ئێران راپەڕین و داوای یارمەتیشیان لە (بابی عالی)" کرد، بەڵام سوڵتان هیچ یارمەتییەکی نەدانو سوپای قزڵباش دوای چەند شەڕێکی گەرم، بە دژوارییەکی زۆر قەڵایان وێران کردو سەر لەبەری راپەڕیوەکانیشیان کوشت و گیانی بەرگری شەڕکەرانی کوردو توندوتیژی لە رادەبەدەری قزڵباشەکان لە هۆنراوەو سترانی کوردی موکریان هەر مایەوەو لە شوێنێکی ترو رووداوێکی دیکەشدا لە ئەنجامی یاخیگەری دەستەیەکی دیکە لە خێڵەکانی موکری، زۆربەی شەڕکەرانی و سەرکردەکانی خێڵەکانی کوردی کوژران. ئەم دوو رووداوە لەگەڵ دەمارگرژی ئایینی و رق و قینی زۆر لە نێوان نەتەوەی کورد و ئازەر، گەشتێکی پڕ لە دوژمنکاریو بێ بڕوایی لە ناو کوردەکانی باکوور بەرانبەر بە دەوڵەتی ئێران و تورکە ئازەرییەکان ساز کردو دوای رووخانی سەفەوی، خێڵەکانی ئازەری وەك ئەفشار، قراچەداغیو شقاقییەکان لە سەرکوتکردنی خێڵەکانی موکری دەوریان هەبوو و بیرەوەری

تێك چڕژانیان لەگەڵ شیعر و یاخود بەپێی وتەی کوردەکان "عەجەمی رافزی" ساڵانێکی دوورو درێژ لە نێو خەڵکی کورد مایەوە.

بەو چەشنە کە لە دەقی مێژووی ئەفشار واتە سەرەکیترین سەرچاوەی مێژووی خێڵە ئازەرییەکانی رۆژئاوا ساڵانی دوای رووخانی سەفەوی دەبینرێ، لە سەردەمی لاوازی و دارمانی ئێران دوای هەڵوەشانەوەی حکوومەتی سەفەوی و زاڵبوونی ئەفغانەکان تا شەڕەکانی ناوخۆیی و پەلاماری عوسمانییەکان، خێڵەکانی ئازەری توانیان خێڵەکانی کوردی تا سەردەمی بەدەرکەوتنی قاجارەکان و یەکگرتنی دووبارەی ئێران بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان و نەهێڵن ناوچەکانی کوردنشینی ئازەربایجان بە خاکی عوسمانی بلکێندرێ.

## بنەماڵەی موکری و کوردستانی باکوور لە سەردەمی قاجارەکاندا:

پاش یەکگرتنەوەی دووبارەی ناوچە جۆربەجۆرەکانی ئێران و سەرهەڵدانی سیستمێکی بەهێزو دەسترۆ لەسەر دەستی ئاغا محەمەدخانی قاجار لە سەرەتای سەدەی سێزدەی کۆچیدا، هۆزەکانی موکریش وەك ئەردەلانەکان تێبینی هەلومەرجی نوێیان کردو چوون بەرەو خزمەتی قاجارەکان، سەرۆکی موکری لەم کاتەدا، بوداق خان کوڕی شێخ عەلی خانی موکری بوو یەکەمین جووڵەی سیاسی ئەو، بەشداری لە سەرکوتکردنی سادق خانی شقاقی رەقیب و دوژمنی قاجارەکان بوو.

بەر لە سەرۆکایەتی بوداق خان، هۆزی دومبوڵی فەرمانڕەوای سابڵاغ (مەهابادی ئێستا) یان دەکرد کە هۆزێکی کورد، بەڵام شیعە بوون. موکریان ئەوکات بە ئەندامێکی فیدراسیۆنی هۆزی تورکی ئەفشار حسێب دەکرا. پاش کوشتنی ئەحمەدخانی دومبوڵی حاکمی ساباڵغ لە شەڕە ناوخۆییەکان، محەممەد قولی خانی بیگلەر بەگی فیدراسیۆنی ئەفشار، حکوومەتی ئەو شارەی لە ساڵی ١٢٠١ی کۆچی بە بوداق خان سپارد.(٣)

بەو شێوەیەی کە نووسەری کورتە مێژووی مەهاباد دەنووسێ، فیدراسیۆنی بڵباس بریتی بووە لە خێڵەکانی کوردی عوسمانی کە لە سەرەتای سەدەی دوازدەهەمی کۆچی، لە خاکی عوسمانییەکانەوە بەرەو ئازەربایجان کۆچیان کردووەو هۆزەکانی دێبوکریش لە کۆتای سەدەی دوازدەهەم لە دیاریەکرەوە هاتنە ناو ئێران. ئەم دوو هۆزە کوردە هەمیشە لەگەڵ موکریان

لەسەر پاوان کردنی لەوەڕگەو زەوی پڕپیتی سابلاغ لە ناوچەی موکریان لە ململانێ دابوون.[٤]

ناوچەی لاجان هەمیشە حوکمی موکری بووەو بلباسەکانی دانیشتووی ئەوێندەرێ، ساڵانە بڕە پارەیەکیان وەك مافی لەوەڕ دەدا بە موکریان. بەڵام لە ساڵی ١٢٠١ی کۆچی ١٧٨٠ز ئەم بڕە پارەیەیان نەداو بیگلەر بەگی ئەفشار سەرەڕای خزمایەتی خوێنی لەگەڵ قەرەنی ئاغای سەرکردەی بلباسان، فیدراسیۆنی ناوبراوی سەرکوتکرد کە بوداق خانیش لەم شەڕەدا بەشدار بوو و لە ئەنجامی ئەو لێهاتووییەی کە لە خۆی نیشاندا، کەوتە بەردڵی بیگلەر بەگی ئەفشارو بەم شێوەیە حکوومەتداری ئەو لەسەر ناوچەی سابلاغ ـ موکری پتر لە جاران جێگیر بوو.

نووسەری مێژووی ئەفشار دوای ئاماژەکردن بە بڕواو دڵنیابوونی زۆری بیگلەر بەگی ئەفشار لە راست بوداق خان هەستی ئێرەیی پێهاتنەوەی خانەکانی کوردی و تورکی ئازەربایجانی لە دژی ئەو ورووژاندو یەکێ لە سەرکردەکانی کورد بە ناوی ئەفراسیاب سوڵتان زەرزا، کە هاودەمی هەمیشەیی بیگلەر بەگی ئەفشار بوو لە ئەنجامی ئیرەیی و قین کە لە ئاست سەرکردەی موکریانی هەبوو، بە بوختان و خراپ حاڵی کردن، بووە هۆی ئەوەی کە بیگلەر بەگی ئەفشار ئەمری کوێر کردنی بوداق خان دەربکا.[٥]

هۆزەکانی ئازەربایجان، رۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە شەڕەکانی ئێران و رووسیاو لە ئەنجامی هەلومەرجی شەڕدا، گشت هۆزەکانی کورد، چ بە خۆشی و چ بە ناخۆشی ناچاربوون ملکەچی فەرمانڕەوایی ناوەندی بن لە دابینکردنی هێزی شەڕکەر (بنیچە)و دانی سەرانە لە کاتی خۆی و لەم بارەیەوە چاوەڕوانییەکانی عەباس میرزای جێگری شاو دەوڵەتی ناوەندی لە لایەن کوردەکانەوە هاتەدی.

تا رادەیەك کە (بابی عالی) نەیتوانی دوای شکانی سوپای ئێران لە دەوڵەتی رووس، کوردەکان بوروژێنێ و سوودیان لێ وەرگرێ. بەڵام لایەنگری بوداق خانی موکری لە حکوومەتی قاجارو هاوکاریکردنی لەگەڵ کاربەدەستانی قاجاری ئەوەبوو کە دەیویست بە پشتبەستن بەمە بتوانێ نەیارانی پەهێزی خۆی وەك فیدراسیۆنی بلباس و کۆمەڵە خێڵەکانی دێبوکری لە ناو بەرێ یان هیچ نەبێ بیانخاتە ژێر دەستی خۆی و لەم رێگایەوە لەوەڕو کێلگەی بە پیت و بەرەکەتی دێبوکریان بکاتە موڵکی موکریان. سەرکردەی موکریان ئاگاداری ئەم راستییە بوو کە حکوومەتی قاجار لەو کاتو ساتەدا ئامادەیە فەرمانڕەوایی سابلاغ بداتە دەست کوردان و بۆیەش هەوڵی دا لە رێگەی هاوکاری کردنی لەگەڵ فیدراسیۆنی ئەفشارو خزمەتکردنی جێگری

شا، عەباس میرزا، هێزو دەسترۆیی سیاسی و ئابووری ناوچەی موکریان هی خودی موکریان بێ.

دوای بوداق خان کە لە ساڵی ١٢٣٨ی کۆچی ١٨١٧ز مرد، بەڕێوەبەرایەتیی سابلاغ بۆ ماوەیەك درا بە ئیبراهیم خانی باکۆیی، بەڵام لە ساڵی ١٢٤١ ١٨٢٠ز بە فەرمانی جێگری پاشا، عەبدوڵڵا خانی کوڕی بوداق خان وەك حاکمی ئەو شارە دەستبەکار بوو. خزمەتی بەرچاوی عەبدوڵڵا خانی موکری لە راست دەوڵەتی ئێران لەو ساڵانەی کە شەڕ لە نێوان ئێران و رووسیە و ئێران هرات، لە ئارادا بوو، بووە هۆی ئەوەی کە شا و جێگری شا، بە چاوی رێزەوە سەیری بکەن. هەر بۆیەش عەبدوڵڵا خانی بەهۆی هەڵکەوتی سیاسیی خۆی، عەباس و ئاغای سەرکردەی دێبوکریان کوشتو شەڕ لە نێوان دوو هۆزی موکری و دێبوکری دەستیپێکرد.[٦]

دوابەدوای ئەم رووداوە، عەبدوڵڵا خان، بۆ تاران بانگێشت کراو لەسەر کار لادراو دەستبەسەر کرا. بەڵام دوو ساڵ دواتر لە لایەن شازادە قارەمان میرزا حاکمی ئازەربایجان، پلەی پێشووی خۆی وەدەست هێنایەوەو سەرۆکی خێڵانی دێبوکری کەوتنە بەندیخانە. لەم سەردەمەدا، ناوچەی کوردنشین بوو بە شانۆی ململانێ و رکابەریی نێوان موکریان و دێبوکریان، کە لە ئاکامدا موکریان زۆربەی موڵکەکانی لە دەستدا.[٧]

ئەم رووداوانە بوونە هۆی ئەوەی کە بنەماڵەی موکری و بە تایبەتی عەبدوڵڵا خان نزیکەی سەد ساڵێك لە کۆشکی قاجاری نزیك ببنەوەو هاوکارییان دەگەڵ بکەن و ئەندامانی ئەم خێزانە بە شێوەیەکی میراتگری خۆیان بە پێشترزانی بۆ بەڕێوەبردنی شاری سابلاغ و ناوچەکانی دەوروبەری‌و خەڵکی کوردیش لە شێوازی حکوومەتی ئەوان رەزامەندبوون.

## زەماوەندە سیاسییەکان و بەشداری کوردان لە دەسەڵاتدا

پێوەندی دەوڵەتی قاجار لەگەڵ کوردانی ئازەربایجان تەنیا لە بنەماڵەی موکریدا کورت نەدەکرایەوە، بەڵکو کوردەکانی دانیشتووی چەهریقیش لە سەردەمی محەممەد شا بەرپرسی بەڕێوەبردنی بەشێك لە ئازەربایجان بوون. دەرەبەگی کوردانی چەهریق بەناوی یەحیاخان، لە سەرەتا دا ناوچەکانی سۆماو برادۆستی بەڕێوەدەبرد، چونکە خوشکی دایکی شازادە عەباس میرزا مەلیك ئاراو یەکێ لە کچانی خێزانی محەممەد شای قاجار بوو، وردە وردە لە دەزگای قاجاری بەرەو پێشەوە دەچوو. لە نێوان ساڵەکانی ١٢٥٠ تا ١٢٦٠ی کۆچی ١٨٢٩-١٨٣٩ز

شازادە مەلیك قاسم میرزا حاکمی ورمێ بوو و کە لە بارەی وەرگرتنی سەرانە لەگەڵ یەحیاخان تووشی کێشە بوو، شای ئاگادارکردەوەو شا وەڵامی دایەوە: "لە بارەی یەحیاخانی ئاغای کوردان، مامی دەبێ گوێ لە داواکارییەکانی ئەو بگرێو لە خۆی رازی بکا نەك شکایەت و گلەیی لێ بکا."(٨)

شا لەم کێشەیەی نێوان مامی خۆی و ئاغای کوردان لای ئاغای گرت و ئاشکرایە کە بێجگە لە لەبەرچاوگرتنی خزمایەتی، بەرژەوەندیی سیاسی و پێویستی سەرنجراکێشانی رەزامەندی کوردەکانیش، لە بڕیارەکانیدا دەوری هەبوو، جگە لەمە حاجی میرزا ئاغای سەدری ئەعزەمیش پشتیوانی لە یەحیاخان دەکرد. سەرەنجام لە سۆنگەی زێدەبوونی کێشە و ناکۆکی نێوان مامی شاو یەحیاخان، شا مامی لە کار لاداو ئاغای کوردانی بە حاکمی ورمێ دانا. نووسەری (تاریخی ئەفشار) لە بارەی رۆڵی خوشکی و کچی یەحیاخان لەوەدەست هێنانی حکوومەتی ورمێدا دەنووسێ:

"لەم ساڵەش ١٢٦٠ی کۆچی ١٨٣٩ز یەحیاخانی چەهریقی ئاغای کورد، کە بۆ پایتەخت بانگهێشت کرابوو، بەهۆی پشتیوانی حاجی میرزا ئاغا و بەهۆی پشتیوانی خوشکی و کچەکەی کە خێزانی حەزرەتی شابوون، کراسی حوکمڕانی ورمێ و سەڵماسی پۆشی و شادومان بەرەو شوێنی مەبەست گەڕایەوە."(٩)

یەکێ لە کارەکانی یەحیاخان سەرکوتکردنی خێڵە یاخیبووەکانی ناوچەی سۆمایو برادۆست و هەڵقەندنی نۆکەندێك بۆ شاری ورمێ ـ یە کە دوای ئەو کۆتایی پێهات.

فەرمانڕەوایی یەحیاخان لە ورمێ، ئەمە دەسەلمێنێ کە زەماوەندی سیاسیی رۆڵێکی کاریگەرانەی هەبووە لە نزیکبوونەوەی کورد لە کۆشکی شاو دەسەڵاتدارێتی. هەندێ جار، شای قاجار لەگەڵ سەرکردەیەکی خێڵ یا دەرەبەگێکی گەورە کە سەرۆکی فیدراسیۆنی چەند خێڵ بوو، پێوەندی خزمایەتی ساز دەکرد و لە رێگەی ئەوەوە کۆنترۆڵی دەوڵەتی ناوەندی لەسەر ناوچەکانی کوردنشین سەقامگیر دەکرد. یەحیاخان لە ساڵی ١٢٦٤ی کۆچی ١٨٤٣ز لە دوای مردنی محەممەد شاو بەهۆی ئەو خزمایەتییەی لەگەڵ شازادە عەباس میرزا مەلیك ئارای هەبوو لە حکوومەتی ورمێ و سەلماس لادرا. حەزی بنەماڵە گەورەکانی کورد بۆ ئەوەی پشکدار بن لە دەسەڵاتدارێتی سیستمی قاجاری زۆر بوو، چونکە ئەوان پێویستیان بە سەرچاوەیەکی پشتیوانی لە دەرەوی چوارچێوەی کۆمەڵگەی کوردی هەبوو بۆ ئەوەی لە وتووێژو و ناکۆکییەکانی

خێڵەکیانەی نێوان خۆیان، سوودی لێ وەربگرن. بۆ نموونە بنەماڵەی موکری بە پشتبەستن بە شای قاجار توانی بۆ ماوەیەك بەسەر نەیارانیان واتە بلباس و دێبوکری دا زاڵ بن. دانانی حاکمی کوردی لە ئازەربایجان و کوردستان کۆمەڵێك ئاکامی لێکەوتەوە:

یەکەم: ڕووبەڕووبوونەوەی دوو توخمی شیعە و سوننەی کەم دەکردەوەو نەتەوەی کورد و ئازەر لە ناویەك سیستمی هاوتەریب دا دەبوون لەگەڵ سیاسەتەکان، دووەم: دەوڵەتی عوسمانی ئەگەری کەڵك وەرگرتن لە هەستی ئایینی کوردەکانی لە کیس دەچوو و سێیەم باج و سەرانە سەندنی پاسەوانی لە سنوور و دابینکردنی هێزی بنیچە یا سەربازی خێڵەکی لەسەر دەستی حاکمێکی کورد سەری دەگرت، هەڵبەت کوردەکان لە ئاست دەوڵەتی ناوەندی ملکەچ و گوێڕایەڵی پتریان لە خۆ نیشان دەدا. گەورەترین کەسایەتی کورد لە ئازەربایجان کە چووە ناو کۆشکی ناسرەدین شا، عەزیز خانی سەردار لە ئەندامانی بنەماڵەی موکرییە. عەزیز خان ڕۆلەی محەممەد سوڵتانی موکری لە ساڵی ١٢٠٧ی کۆچی ١٧٨٦ز لە سەردەشت لەدایك بوو و دوای تێپەڕاندنی ڕۆژگاری هەژاری و بزری لە تەك برایەکەی فەرەج خان چووە تەورێز. نووسەری پەرتووکی تاریخ و جوگرافیای دارولسەلتەنەی تەورێز لە بارەی هاتنی عەزیز خان بۆ ناو شانۆی رامیاری دەنووسێ: " عەزیز خان دەستخەتێکی خۆشی هەبوو و زمانێکی لوس. چووە ناو ئەنجوومەنی وەزیران. دەوروبەری حەزیان لە ئاخافتنەکانی بوو. وای لێهات وردە وردە ناسراو لە کابینەی یەکەمی شای شەڕکەر (غازی)دا لە فەوجی شەشەمی تەورێز، پلەی جێگریان پێ سپارد. لە شەڕی هەرات ئامادەی مەیدانی شەڕ بوو و بە فەرمانی شا چووە شاری بەندهرا و چاوی بە محەممەد خان و کامەرانی ئەفغان کەوت، دوای ئەوە پتر بەدەرکەوت تاکو فەوجی چوارەمی تەورێزیان پێدا و بوو بە سەرهەنگ و لە کۆتایی ڕۆژگاری محەممەد شا لە شیراز، فەوجی چوارەمی لە ژێردەستدابوو. هەرکە شا ئەمری خوای بەجێ هێنا، شیرازییەکان دژی حوسێن خان نیزامولدەولە ڕاپەڕین و بوو بە شەڕیان، کە عەزیز خان ڕاپەڕیوەکانی سەرکوتکرد و خزمەتێکی چاکی دەوڵەتی کرد.(١٠)

عەزیز خان بەو شێوەیەی کە بۆ نووسەری تاریخ و جوگرافیای دارولسەڵتەنەی گێڕاوەتەوە لە سەرەتای حکوومەتی ناسرەدین شا نامەیەکی لە ئەمیر کەبیر بە دەست دەگا و تێیدا نووسرابوو: " عەزیز وەرە تا عەزیزت بکەم (واتە تا ڕێزت لێ بنێم و بەرزت بکەمەوە)"(١١) ئاغای کورد دوای گەیشتنی ئەم نامەیە بەرەو تاران چوو و لە لایەن ئەمیر کەبیر پلەی یاوەری گشتی سەربازەکانی ئێرانی پێ بەخشرا، لە ڕاستیدا بوو بە جێگری سوپایی ئەمیر کەبیر و لە

دواییدا بوو بە زاوای ئەمیر کە جێگەی شانازی بوو. دوای ڕاپەڕینی بابییەکان لە شاری زەنجان، ئەمیر، عەزیز خانی بۆ سەرکوتکردنی ئەوان ڕەوانە کرد، دوای ئەوە کردی بە نوێنەری ئێران بۆ سەردانی رووسیە و ئاخافتن لەگەڵ جێگری قەیسەری رووسیە لە ئێرەوان. پاش لادانی ئەمیر کەبیر، بە سەرکردەی گشتی سوپای ئێران و بەرپرسی کاروباری (دارولفنون) هەڵبژێردرا. بەپێی نووسینی مەهدی بامداد، پیلانگێڕی میرزا ئاغا خانی نوری کە حەزی دەکرد گشت کاربەدەستانی سەردەمی ئەمیر کەبیر بەلاوە بنێ، توانی لە ئەنجامدا سەرکردەی گشتی سوپا بە لاوەنێ و شا بێ هیچ هۆکارێك گشت پلە و نازناوەکانی لێستاندەوەو رەوانەی سەردەشتی کردەوە.[١٢] نادر میرزاش ئاماژە بە وتەکانی میرزا فەزلولای وەزیری سوپا و برای میرزا ئاغا خانی نوری دەکا کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆی لە تەورێز بە فەرمانی براکەی، سەرکردەی گشتی عەزیز خان، لە سەردەشتەوە بانگهێشت دەکا بۆ ئەوەی لە بارەی کاروباری سەرانەی سەردەشت وەڵامبداتەوە. بەڵام وەزیری سوپا نە تەنیا هیچی لە عەزیز خان نەویست، بەڵکو یارمەتی عەزیز خانی دا بۆ ئەوەی نەخۆشییەکەی چارەسەر بکا. وەزیری سوپا لە وەڵامی خەسرەوخان (یەکێ لە خزمانی نادر میرزا)دا کە شایەدی ئەم دیدارە بووە گوتبووی: ئەو برا گۆڕبەگۆڕەی من(میرزا ئاغا خانی نوری) لەگەڵ ئەو پیاوە دا دوژمنەو بە خوێنی تینووە ، منی راسپارد هەر کە گەیشتە تەورێز، عەزیزخان بانگ بکەو بە توندوتیژی لەگەڵی بجوولێوەو بەهەق یا ناهەق پارەو پوڵی لێ بستێنە بەناوی باجی سەردەشت و مەهێڵە نە شەو نە رۆژ ئاسوودە بێ، بەڵکو غیرەتی ئەم کردەوە هەڵنەگرێ و نەتوانێ دان بەخۆیدابگرێ یا لە حەژمەتان بمرێ یا ژەهرێك بخوا و خۆی رزگار بکاو من لە دڵەڕاوکێ رزگارم بێت. ئەوە باش بوو کە شا لە ژێرەوە خۆشی دەویست، بیستوومە کە بە دزی یەك دووجار نامەی بۆ نوسیووە. لەوەی دەترسم کە لەناکاو بانگهێشتی بکا، ئەو کاتەی هەموو کارەکەمان لە ناو دەچێ، ناچاربووم بەسەرەخۆم نەهێنم و بانگهێشتی بکەم و ئەو توندوتیژیەی کە بەکاریشم هێنا بۆ بەرژەوەندی بوو و بە نهێنی ئەوم لە خۆم دڵنیا کردەوە. ئەگەر ئەو بەم نەخۆشیە مردبووایە، ناوی من ناشیرین دەبوو و شاش رقی لە من هەڵدەگرت".[١٣]

پیلانەکانی سەرەك وەزیران بۆ بێ دەسەڵات کردنی عەزیز خان بەمە کۆتایی پێ نەهات، بەڵکو بوختانی ئەوەی خستەپاڵی کە لە وروژاندنی شاهسەوەنەکان و کوردی هەورامی لە راپەڕینیان دژی دەوڵەتی ئێران و جیاکردنەوەی کوردستان دا، دەستی هەیە. بەڵام ئەم بوختانانە هیچ بنەمایەکی راستیان نەبوو، چونکە هەموو ئاواتی عەزیز خان ئازەربایجان بوو و نادر میرزاش

ئاماژە بەم بابەتە دەکا:"دوای ماوەیەك ناسرەدین شا بۆ لای خۆی بانگی کرد. هاتە لای. لاواندیەوەو حوکمڕانی مازەندەرانی پێدا. هەرهەمان ڕۆژ کە ئەم پلەیەی پێ بەخشرا پلەکەی گۆڕا بوو بە پێشکاری ئازەربایجان کە ئەمە دوا ئاواتی ئەو بوو."(١٤) بامدادیش لەم بڕوایەدایە کە ئەوپەڕی ئاواتەکانی عەزیز خان حکوومەتی ئازەربایجان بوو.(١٥) دوای لادانی میرزا ئاغا خانی سەرەك وەزیر، ناسرەدین شا دووبارە گشت مەنسەبەکانی پێشووی عەزیز خانی بۆ گەڕاندەوەو لە ساڵی ١٢٦٧ کۆچی ١٨٤٦ز بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنی وەزیران. عەزیز خان ماوەیەك پلەی پێشکاری ئازەربایجان و ئەتابەیگی موزەفەرەدین میرزای جێگری شای پێدرا و دووبارە لە ساڵی ١٢٨٤ی کۆچی ١٨٦٣ز بوو بە وەزیری جەنگ. عەزیز خان نە تەنیا دەسەڵاتی خۆی و بنەماڵەکەی خۆی بەرزکردەوە، بەڵکو ڕۆڵی بەرچاوی بینی لەوەی کە کوردی تریش بێنە ناو دامودەزگای دەوڵەتی. نووسەری (سیرەی ئەکراد) لەم بارەیەوە دەنووسێ: " چونکە عەزیز خان سەرداری گشتی کە سەر بە خێڵی موکری بوو لە لای شا ڕێزی تایبەتی هەبوو گەیشتە جۆرەها پلە و مەنسەبی بەرز، کە ئەمە بووە هۆی بووژانەوەی باری ژیانی خەڵکی ناوچەکەی خۆی کە لەژێر تیشکی پشتیوانی ئەو هەندێکیان پلە و مەنسەبی دەوڵەتیان وەدەست هێنا. ئاغا و دەرەبەگی بابا میری ملکەچی بوون، بە ویژدانەوە دەبێ بگوترێ کە لەوەتی عەزیز خان بە دەرکەوتووە تا ئێستاکە ماوەی بیست و دووساڵە جیاوازییەکی زۆر لە ژیانی موکری دەبیندرێ کە پێشتر لەوپەڕی هەژاری و دەست کورتیدا دەژیان".(١٦)

بەم شێوەیە کە عەزیز خان لە دەزگای قاجاری پێشکەوتووە، بۆمان دەردەکەوێ کە جیاوازی ئاینزایی هەرگیز نەبووەتە لەمپەڕ لە ڕێگەی پێشکەوتنی توخمی کورد و بەشداریان لە بەڕێوەبردنی کاروبار. دوژمنایەتی میرزا ئاغا خانی سەرەك وەزیر لە سۆنگەی کوردبوون یا سوننەبوونی عەزیز خان نەبوو، بەڵکو ترسی لە پڕبایەخ و هێزابوونی عەزیز خان لە لای شا هەبوو کە ئەمە وای لێدەکرد قینی لێ هەڵگرێ. ناسرەدین شا عەزیز خانی خۆش دەویست و هەموو دەم، بەچاوی ڕێز سەیری لێهاتوویی و لێوەشاوەیی ئەوی دەکرد. نادر میرزا سەبارەت بە هەڵکەوتی عەزیز خان دوای لە ناوچوونی ئەمیر کەبیر دەڵێ: عەزیز خان یاوەری گشت سوپای ئێران بوو تا ئەو ڕۆژەی کە میرزا تەقی خان لە کار لادرا و هێندەی پێ نەچوو کە شا ئەوی دووبارە بەناوی فەرماندەی گشتی سوپا ناو هێنا و جێگە و پێگەی بەرز بۆوەو گەیشتە ئەستێرەکانی ناهید و کەیوان".(١٧) هەروەها دەڵێ دوژمنکاری ئاغا خانی نووری لەگەڵ عەزیز خان لەوەیەوە هاتبوو : کە لە ڕاپۆرتچینەکان و بوختانکەرانی کۆشك، بیستبووی کە شا زۆری

خۆش دەویٚ، بۆیە دەترسا کە ئەو بەرز بکاتـەوە".(۱۸) عـەزیز خـان بێجگـە لـە ئازەربایجـان دەیویست بەسەر ناوچەی بانە و سەقزیشدا زاڵ بیٚ و بۆیـە رکابـەری لەگـەڵ میرانـی ئـەردەلان دەکرد. ئەم رکابەرییە لە سەردەمی سەفەوییەوە دەستی پیٚکرد و دوای عەزیز خـانیش درێـژەی کێشا. نووسەری (توحفەی ناسری) دەڵـیٚ: عـەزیز خـانی مـوکری لـە سـەردەمی حکوومـەتی عەزیزوڵلاٚ خانی دووەم لەسەر میرنشینی کوردستان، بـیٚ ئـەوەی عـەزیزوڵلاٚ پیٚـی خـۆش بـیٚ، حاکمێکی بۆ بانە دەست نیشان کرد کە میر بە لاوەی ناو لەم کارەش پشـتی بـە ئـەمیر کـەبیر گەرم بوو و هەروەها دەڵیٚ :" عەزیز خان هەردەم هەوڵی تێکدانی کاروبـاری مـیری دەدا و لـە خزمەت ئەمیر کەبیر بە جۆرەها شێوە لە دژی دەجووڵایەوە".(۱۹)

بەڵام هەوڵەکانی کاریگەرنەبوون، چونکە ئەمیر کەبیر دەیتوانی نێوەنجیگەری نێوان میرو عەزیز خان بکا، بەڵام لە سەرەتای سەدەی بیستەم نەوەی عەزیز خـان بـەناوی محەمـەد حوسـێن خـان توانی شاری بانە داگیربکات و لە جیاتیان سەیفەدین خـانی سـەقزی، حـاکمی دەسـت نیشـان کراوی خۆی لەو شارە وەك پیاوی حکوومەت دابمەزرێنیٚ.(۲۰) لە پێداچوونەوەی ژیانی رامیـاری دوو بنەماڵەی موکری و ئەردەلان بۆمان دەردەکەویٚ کە جیاوازی ئاینزایی نەبووە بە لەمپەڕ لە رێگەی نزیکایـەتی و هاوکارییـان لەگـەڵ سیسـتمی قاجـاری و ئـەوان لـە ئاسـت رەوتـی بـە ناوەنـدیکردنی دەوڵـەتی ناوەنـدی نەتـەنیا رانەوەسـتان، بـەڵکو خۆیـان بـوون بـە یـەکیٚ لـە جێبەجێکەرانی کاروباری ئەم سیستمە. لەم پێداچوونەوە و وردبوونەوەیەدا خاڵێکی ترمـان بـۆ دەردەکەویٚ و ئەویش نارێکی و جۆربەجۆری تانوپۆی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کورد لەو سەردەمی دایە. بەشی کوردنشینی ئازەربایجان وەك مەڵبەندی سەرەکی هۆزەکانی کوردی لەگەڵ میرنشـینی کوردستان یان ئەردەلان کە مەڵبەندی ژیانی جووتیـارانی نیشـتەجێبوو بـۆ زەویـدارانی گـەورە و شارنشین لە دژایەتی دابوو و لە ئەنجامدا هەمیشـە جۆرێـك رکابـەری نێـوان کـوردانی بـاکوور و باشوور لە ئارادابوو کە یەکیٚ لە دیاردە زەقەکانی، لایەنگری باکوورییەکان بۆ لای عوسمانییـەکان و لایەنگری باشووریەکان بۆ دەوڵەتی ئێران بوو و جیاوازی لە بۆچوونەکان بە نۆرەی خـۆی دەبـووە هۆی دەسەڵاتدارێتی و زاڵ بوونی پتری قاجارییەکان لەسەر کۆمەڵگەی کوردی.

تا ئەو کاتەی کە کوردەکان لەسەر چارەنووسی خۆیان زاڵ بوون، هیچ ناڕەزاییەك کە بەرچاو بیٚ، ساز نەبوو، بەڵام دانانی حوکمڕانی تورك لـە بـاکووری کوردسـتان، ئەوپـەڕی سـتەمکاری لـە سەرانەسەندن و ورووژاندنی عوسمانی، زەمینەی رەخساند بۆ یاخیگەری و ناڕەزایی. کزی دۆخی سیاسی سوپایی و دارایی ئێران لە ئەنجامی ناکـارابوونی سیسـتمی حکوومـەتی رۆژهـەڵاتی ،

وردەوردە کاریگەری نێگەتیڤی خۆی بە شێوەی جۆربەجۆر لەیەك دوو دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم نیشاندا کە گرنگترین ئەنجامی، راپەڕینی شێخ عوبەیدڵڵای نەهری بوو. لاوازی هەمە لایەنەی دەوڵەتی ئێران لەم کاتەدا بووە هۆکارێك بۆ ئەوەی کە دەوڵەتی ناوەندی، توانایی چاودێری و کۆنترۆلی لەسەر ناوچەکانی دوور لە ناوەند، لەدەست بدا و هەر حوکمڕانێك بەپێی شێوازو دڵخوازی خۆی ناوچەکە بەڕێوە ببا. لادانی میرانی ئەردەلان و بێدەنگی و رەزامەندی خەڵکی، ئەوە دەسەلمێنی کە بنەماڵەکانی خۆجێی کوردی پێوەندییەکی بەرفراوانیان لەسەر بنچینەی فەرهەنگ و زمان و ئەدەب و ئاین لەگەڵ کوردەکان ساز نەکردووە و لە راستیدا کۆمەڵگەی کوردی ئەوانیان تەنیا بۆ پاراستنی باری لە ئارادابووی ئەو کاتی قبوڵ کردووەو ئەگەر بێتو کەسێك جگە لە میری کورد، حکوومەتیان بۆ بەڕێوە ببا و بتوانێ بارودۆخ بپارێزێ و نەهێڵێ بێسەروبەری و ئاژاوە روویدا، ئەوا لەبەرچاوی ئەوان شیاوی پەسندکردنە. هەر بۆیەش فەرهاد میرزا (موعتەمد ئەلدەوڵە) دوابەدوای سەرکوتکردنی هۆزەکانی جاف و هەورامی کە زیانیان بە بەرژەوەندییەکانی زەویدارانی کورد دەگەیاند، کەوتە بەردڵی جەماوەر و توانی کارگەلێ خاس لە ماوەی یەك دەیەی حوکمڕانی خۆی لە ئاست میرنشینی ئەنجام بدا. کەواتە سەربەخۆیی کاتی میرانی ئەردەلان یا دەرەبەگی موکریان، کە لە لاوازی دەوڵەتی ناوەندییەوە (بە هەر هۆیەك کە هەیە) سەرچاوەی گرتووەو بە مانای سەربەخۆیی فەرهەنگی و سیاسی کۆمەڵگەی کورد لە ئێران حسێب ناکرێ و ئەم گوتەی ریچ دیپلۆمات و بازرگانی ئینگلیزی ناکرێ پەسەند بێ کە گوتبووی (میری ئەردەلان لە ساڵی ١٨٢٠ز بە تەواوەتی سەربەخۆیە لە تاران و لە قەڵەمڕەوی خۆی دامودەزگای پاشایەتی دامەزراندووە).[٢١]

بۆ پاشایەتی، میری کورد دەبێ نەتەوەی خۆی لەگەڵ دابێ تاکو بتوانی حکوومەتەکەی لەسەر زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسیی هاوچەشن بنیات بنێ، کەچی دەبینین دوای چەندین سەدە بەردەوامی ژیانی حکوومەتی ئەردەلان، کاتێ کە ناسرەدین شا بۆ سەرکوتکردنی شێخ عوبەیدڵڵا بڕیاری دا، عەلی ئەکبەر خانی (وەکیلو لمەلیك) یەکێ لە ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە بکاتە حکوومەتداری ناوچەی کوردستان، خەڵکی سنە لە تێلێگرافخانەی شار مانیان گرت و بەپێی نووسینی (توحفەی ناسری) لە تێلێگرافدا بۆ شا رایانگەیاند کە : لە راست حکوومەتی بنەماڵەی ئەردەلان، لەوپەڕی بێزاری و ڕق لێبوونەوەداین).[٢٢]

بەم شێوەیە نەویستنی خۆیان لە راست ئەردەلان نیشان دا. بەم شێوەیە لە سۆنگەی سەقامگیری دیسپلین و هێمنی بە درێژایی یەك دەیە بەهۆی (موعتەمد ئەلدەوڵە) پێخۆش

نەبوونی خەڵکی کورد لە راست بنەماڵەی ئەردەلان و پێشگیری لە هاتنی هۆزەکانی عوسمانی بۆ میرنشینی کوردستان و سەرکوتکردنیان، لە دوابیدا سەرەڕای کزبوونی دەسەڵاتداریتی ئێران، نە هۆزەکان و نە دەوڵەتی عوسمانی نەیانتوانی راپەڕین یان گێرەشێوێنی لە ناوچەکەدا بنێنەوە، بەڵام لە ئازەربایجان کار بە چەشنێکی تر بوو. لێرەدا دژایەتی ئاینزایی، سیمایەکی سیاسیی بەخۆوە گرتبوو و لە سۆنگەی دراوسێیەتی عوسمانیدا، قینی ئایینی هەر زیندوو مابۆوەو ئێستا کە ئێران لاواز بوو، ئاینزا ئامرازێك بوو بۆ زێدەخوازییەکانی بابی عالی. (کەسرەوی) لە بارەی رۆڵی ئاینزایی لە رووداوەکانی ئازەبایجان و کاریگەری لەسەر کورد دەنووسێ :(چیرۆکی سوننە و شیعە کە لە رۆژگاری شا ئیسماعیل و سوڵتان سەلیمەوە رەنگی سیاسیی بە خۆوە گرتووە، نێوان دوو جەماوەری ئێرانی و عوسمانی بۆتە هەوێنی دوژمنکاری و قینەکان و هەمیشە زەینەکانی بەخۆی خەریك کردووە، لە ئازەربایجان توندتر بوو تا شوێنەکانی تر).(٢٣)

ئەم قینانە و دابونەریتی ئاینزایی پێشاندانی شیعەکان وەك بەجێ هێنانی رێورەسمی عاشورا، سەروکەللەکانی کارەساتی کەربەلا، نزیکترین گروپی سوننە واتە کوردەکانی دەوروژاند. کەسرەوی لە بارەی کەلێنی ئاینزایی نێوان کورد و ئازەری و دەمارگرژی ئاینزایی تورکەکانی ئازەربایجان نووسیویەتی: گشت ئەم کارانە و بڕواکانی ئازەربایجان لە شوێنەکانی تر پتر بوو. دەروێشانی " تەبەرایی" کە لە سەردەمی سەفەوییەکان سەریان هەڵدابوو و دەکەوتنە بەر پێی ئەسپی وەزیران و ئەمیران یان لە نێو خەڵکیدا دەوەستان و بە خراپە باسیان لە پیاوانی مێژوویی سەرەتای ئیسلام دەکرد، تا ئەو رۆژگارە هەر مابوون و هەندێکیان لەوان هێشتا بەناوی "لەعنەت چی" بەرچاو دەکەون. ئازەربایجان کە بە کوردستان لکێندراوەو هێشتا بەشێکی کوردنشینە، کە زیانێکی گەورەتری لێکەوتەوەو ئەویش زێدەبوونی قینی کوردی سوننە بوو".(٢٤)

نووسینەکانی کەسرەوی کە لە رووی رووداونووسییەوە بەهایەکی بەڵگەداری پێوە دیارە، دەسەلمێنێ کە هۆکارێکی کۆمەڵایەتی بەهێز واتە ئاینزا، کوردەکانی ئازەربایجانی خستە بەرانبەر ئازەربایجان و هۆکاری نەتەوەیی واتە جیاوازی زمان، هەرچەندە زۆریش کاریگەر نەبوو، بەڵام بەهەرحاڵ بۆ دوورکەوتنەوەی ئەم دوو نەتەوە بایەخێکی تایبەتی هەبوو. لە پاشان لەگەڵ رووخانی رژێمی قاجار، سەرهەڵدانی ستەمی نەتەوایەتی لە سەردەمی پەهلەوی، سەرهەڵدانی سیستمی خۆبەڕێوەبردنی (خودمختار) و سەربەخۆ لە یەکیەتی سۆڤیەت و هاتنە کایەی ناسیۆنالیزمی رامیاری و فەرهەنگی کورد لە عێراق و تورکیە، هۆکاری زمان رۆڵێکی

پڕپایەختری لە جیاکردنەوەی نەتەوەی کورد لە نەتەوەکانی تری ئێرانی پەیدا کرد، بەڵام لە سەردەمی قاجار تەنیا ئاینزا لەم بارەیەوە کاریگەر بوو.

(کۆرزن) لە بارەی کاریگەری ئاینزای نێوان کوردی ئێرانی و عوسمانی دەنووسێ: ( ریشەی کێشەی کوردەکان لە ئێران هەرکات کە قووت بێتەوە، قینی نێوان شیعە و سوننەیە و بنچینەی کێشەی کورد لە عوسمانی ، رق و قین و ناکۆکی نێوان موسڵمان و مەسیحییە، بەڵام دەبێ بزاندرێ کە هەندێ لە کوردەکانی ئێران لە سەر رێبازی ئاینزای شیعەن).(٢٥)

لە ئازەربایجان تەنیا رکاربەری نێوان شیعە و سوننە گرنگ نەبوو و هۆکارێکی تر کوردەکانی بەرەو پشێوی دەبرد کە هەمان نیشتەجێبوونی نزیك بە پەنجا هەزار مەسیحی و ئەرمەنی و ئاشووری لە ناوچەکانی ورمێ، سەلْماس، خوێ و تاڕادەیەك لە سابلاغ بوو.

هۆزە یاخیبووەکانی کورد پەلاماری ئەم "کافران" و"رافزیان"ەی دراوسێیان دەداو سەروەت و سامانیان بە تالان دەبردن. دەوڵەتی عوسمانیش ئەم دژە مەسیحی و دژە شیعەیان پەرەپێدەدا. لەم رووەوە هەرکات کەسایەتی کوردی وەك یەحیا خانی چەهریقی و عەزیز خانی موکری کە بەرێوەبەری ناوچەکەیان لە ئەستۆ بوو، بێ سێ و دوو، هێمنی لە ناوچەکە سەقامگیر دەبوو، چونکە ملکەچی کوردان لە بەرپرسێکی کورد مسۆگەر بوو، بەڵام لەوەی کە بەرپرسێکی ئازەری حوکمڕانی بکا، بەدڵیان نەبوو. کاربەدەستانی ئازەری لە سۆنگەی نەبوونی پرۆگرامێکی رێك و راست لە رووی سەرانەسەندن لە ئێرانی ئەو کاتی، تەماحکاری و ویستەکانی تاکەکەسی خۆیان لە کۆکردنەوەی سەرانە بەکاردەهێنا و سیستەمی سەرانەسەندن لە ناوچەکانی کوردنشین ( بە تایبەتی لە ئازەربایجان) زۆر بوو. کاردانەوەی ئەم هەڵانە و خۆسەپاندنی بە زۆری وایکرد خێڵە دلێرو شەڕکەرەکانی کورد تووشی جۆرە بێ بڕواییەك بن لە ئاست سیستمی قاجاری و یاخیبن. ئەم لاسارییە لە ئازەربایجان زیاتر بوو، چونکە خێڵەکانی ئەوێ ماوەیەکی ساڵیان لە خاکی عوسمانی بەسەردەبرد و تابیعەتی هەردوو دەوڵەتیان هەبوو کە ئەمە ئەگەری یاساشکاندن و لاساری و ملکەچ نەبوونی لە بەرانبەر دەوڵەتی ئێران دەخولقاند کە هەڵبەتە لەم رێگەیەوە لە پشتیوانی هۆزەکانی ئەو بەر سنوور و دەوڵەتی عوسمانیش بەهرەمەندبوون. توندوتیژی و ستەمکاری حوکمڕانانی ورمێ، سابلاغ و شنۆ لەسەر ئاغا و دەبەرەگی کوردی، لەیەك دەیەی بەر لە ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدڵلا، زەمینەیەکی گونجاوی بۆ پەرەسەندنی رەشبینی و ناڕەزایی کوردانی لە دەوڵەتی ناوەندی رەخساند و وایکرد کە شێخ عوبەیدڵلا بتوانێ

ڕاپەڕینێك بە مەبەستی ناڕەزایی لەم بارودۆخە بەرپا بکا. بەڵام لە ویلایەتی کوردستان، شیعە هاوسێیەکەیان خۆیان کوردبوون و دەمارگرژی ئاینزایی ئەوان بە ئەندازەی دەمارگرژی خەڵکی ئازەربایجان نەبوو. نەبوونی جیاوازی زمانی نێوان کوردانی شیعە و سوننە، پێوەندی سوننەکان لەگەڵ بازرگانی شیعە لە سنە و هەبوونی گیانی لێبوردن و چاوپۆشی بەرانبەر ئەوان لە لایەن کۆمەڵگەی کوردیەوەو میرانی ئەردەلان، نە تەنیا بووە هۆی بڵاوبوونەوەی شیعە لە بەشەکانی تری باشووری ئەو میرنشینە، بەڵکو یارمەتی هەماهەنگی و هاوچەشنی ئەم ناوچەیەی دا لەگەڵ بەشەکانی تری وڵات (ئێران) بۆیە شێخ عوبەیدوڵڵا تەنیا لە ئازەربایجان گوێگری بۆ ئامانجەکانی خۆی دۆزیەوە. بە تێکڕایی دەکرێ جۆرە جیاوازی و ناهاوچەشنی نێوان ناوچەکانی کوردنشینی ئازەربایجان و میرنشینی کوردستان لە گشت زەمینەکان هەست پێبکرێ. ئەم مەسەلەیە تەنانەت لە بارەی دەمارگرژی ئایینیش دەستی هەیە. بە تێکڕا ئەم هۆکارانە ناوچەکانی کوردنشینی ئازەربایجان یا کوردستانی باکووری گۆڕی بۆ مەڵبەندی ناڕەزایی نەتەوەیی کوردەکان لە ساڵانی داهاتوودا.

## - بنەماڵەی شێخ عوبەیدوڵڵا:

شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری کە شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینانی یا شەمدینانی پێ دەڵێن، یەکێ لە گەورەترین رابەرانی ئایینی کورد و یەکێ لە پیرانی تەریقەتی بەناوبانگی نەقشبەندی لە نیوەی دووەمی سەدەی سێزدەهەمی کۆچی لە کوردستانی عوسمانی بووە، باب و باپیرانی شێخ کە بە سەیدانی نەهری بەناوبانگ بوون، لە ناوچەی هەکاری بۆ ناوچەی نەهری کە "نۆچە"شی پێ دەڵێن، کۆچیان کردووە. تۆژەری رووسی باسیل نیکتین لە بارەی پێشینەی بنەماڵەی شێخ عوبەیدوڵڵا لە پەرتووکی کورد و کوردستان دا دەنووسێ:

"میرەکانی شەمدینان تا سەردەمی شێخ عوبەیدوڵڵا (ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم) لەسەر ئەو ناوچەیە (نەهری) حکوومەتیان کردووە، بەڵام لەو مێژووە بەولاوە، دەسەڵات بۆ بنەماڵەی شێخەکان کە بە سەیدانی نەهری بەناوبانگن، گواسترایەوە. ئەم شێخانە، لە سەرەتادا تەنیا سەرکردەی ئایینی کوردستان بوون، بەڵام لە دواییدا زۆربەیان دەسەڵاتی دونیاییان بەدەستەوە گرت. شێخەکان توانیان دەربەگی هۆزی زەرزاش کە دەسترۆییەکی سەیری لە ناوچەی شەمدینان هەبوو لەبەرچاوی بەرپرسانی عوسمانی بخەن و ناویان بزرێنن).[1]

(مارتین ڤان برۆنسن)یش لە پەرتووکی بەنرخی خۆی بەناوی "ئاغا، شێخ و دەوڵەت" لە بارەی سەیدانی نەهری و چۆنیەتی گەیشتنیان بە دەسەڵاتدارێتی دەنووسێ:

"لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، شێخەکانی نەهری و حوکمڕانی میرنشینی بچووکی شەمدینان تا ماوەیەك دووقۆڵی واتە دوو حکوومەتی ناوچەی باشووری هەکارییان بەڕێوە دەبرد. سەید تەها (باوکی شێخ عوبەیدوڵڵا) بە ورووژاندنی هەستی ئاینزایی کوردان و هاندانیان لە دژی مەسیحییەکان، بوو بە کەسایەتییەکی مەزن لە میرنشینی بۆتان. ئەو دوای بەندکردنی بەدرخان بەگ (میری راپەڕیوی کورد) بۆ ناوچەی نەهری کە میرنشینی مووسا بەگی میری شەمدینی بوو، هەڵات. لە ساڵی ١٨٤٩ی زایینی، میری شەمدینان هەڵسوکەوتی سست و لاوازی لە بەرانبەر سەید تەها هەبوو و بە ئاشکرا دەسترۆیی خۆی لە دەسدابوو".[2]

بەم شێوەیە سەیدانی نەهری کە لە سەرەتای کۆچی خۆیان بۆ شەمدینان، هەڵکەوتێکی کزولاوازیان هەبوو، پەیتاپەیتا لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی موریدانیان، پتر بەرەو ئەوە هەڵکشان کە دەسەڵاتی سیاسیی و ئابووری پتر وەچەنگ بهێنن و هەوڵەکانیان ئاراستەی ئەم بوارانە کرد و خۆیان لە کۆشکی ئێران و عوسمانی نزیك دەکردەوەو هەروەها توانیان زەویدارانی خۆجێی و

میرە کوردەکان کە زۆربەیان سەرۆکی کۆمەڵێك هۆزبوون لەسەر ڕێگای خۆیان لابەرن. شێخەکانی نەهری لە ڕێگەی ورووژاندنی هەست و دەمارگرژی ئایینی موریدانی کوردی خۆیان لە دژی مەسیحییەکان واتە ئەرمەنییەکان و نەستوورییەکانی دانیشتووی ڕۆژهەڵاتی عوسمانی، توانیان هێزی کورد کۆبکەنەوە و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بوون بە ڕابەری ئەخلاقی کوردەکان کە هەر ئەم بابەتە بووە هۆی ئەوەی کە لەبەر چاوی کاربەدەستانی ئێرانی و تورك، ڕێزو بایەخ و بەهایان زیاتر بێ و بواری بۆ ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە ڕەخساند کە لە کاروباری سیاسیی و نائایینی کوردان و دەوڵەتانی ئێران و عوسمانی پتر کاریگەر بن. بەناوبانگترین کەسی نێو سەیدانی نەهری لە نیوەی سەدەی سێزدەهەمی کۆچی سەید تەها یا شێخ تەهایە کە مێژوونووسی رووسی خالفین ئەوی بە گەورەترین و دەستڕۆترین ڕابەری ئایینی کوردانی ئێرانی و عوسمانی دەزانی". (٣)

شێخ تەها هاوچەرخی محەممەد شای قاجاربوو و جێی سەرنجی تایبەتی ئەو بوو. شازادە عەباس میرزای مەلیك ئارا لە بارەی خۆشەویستی محەممەد شا لە ڕاست سەید تەها و پێوەندی ئەو لەگەڵ کۆشکی ئێرانیدا لە بیرەوەرییەکانی خۆی نووسیویەتی:

" تەها لە گەورە پیاوانی نەقشبەندی کە ڕەحمەتی محەممەد شا، خوا لێی خۆش بێ زۆر زۆر ئاگای لێ بوو و چەندین گوند وتیول و زەوی و خەرجی تەکیەشی بۆ بڕیبۆوەو هەموو ساڵێك کۆمەڵێك دیاری بۆ ڕەوانە دەکرد و لە نێو کوردان قسەی ئەو یەکاویەك بوو و زۆرجار بانگهێشتی منی دەکرد و تەندروستی و پاراستنی منی بەلاوە گرنگ بوو و دایکم لە تەریقەتدا موریدی ئەو بوو". (٤)

هۆکاری گرنگی و سەرنجی شای قاجار تەنیا لەبەر پێوەندی تاکەکەسی ئەو لە ڕاست دەروێش و سۆفیانە نەبوو، بەڵکو پتر بزوێنەری سیاسیی لە ئارادابوو. شا و کاربەدەستانی دەوڵەت چاك دەیانزانی کە ئەم پیری تەریقەتی نەقشبەندییە، موریدێکی بێ ئەژماری لە هەردوو لای سنوورەوە هەیە کە وەك گەورە زەویدارێك، بە شێوەیەکی پراکتیك حوکمڕانی ناوچەی نوچە یا نەهری ناو خاکی عوسمانی وەك ناوچەیەکی زۆر نزیك لە ئێران لەبەر دەستییەتی و لە سۆنگەی ئاسانی پێوەندی لەگەڵ هۆزەکانی ئەم بەرو ئەو بەری سنوور و پێوەندی پتەو کە لەگەڵ بابی عالی سازکردبوو، دەبێ هۆشیارانە لەگەڵی ڕووبەڕوو ببنەوە. هۆزەکانی موریدی شێخ نیوەی ساڵیان لە خاکی ئێران و نیوەکەی تریان لە خاکی عوسمانی بەسەر دەبرد و هیچ ئاستەنگێك بۆ

بڕینی ئەم پێوەندییەیان لەگەڵ پیرانی تەریقەتی نەقشبەندی لە ئارادا نەبوو. عەلی ئەفشاریش لە بارەی بایەخ پێدانی محەممەد شا بە سەید تەها دەنووسێ: شێخ تەها جاروبار بەرەو تاران و تەورێز هەڵدەکشاو خۆی لە کاربەدەستانی کۆشك و دەوڵەتی شاهەنشاهی نزیك دەکردەوەو بە واسیتەی نۆکەرانی بەردەم دەرگای شای مەزن، ببوو بە خاوەنی موچەیەکی (٥٠٠) تومانی کە پێنج گوندی ناوچەی مەرگەوەڕی کردە تیولی خۆی و بوو بە پاشماوەخۆری دەوڵەتی ئێران، بەڵام هەرگیز پیێ لە بەختی خۆی نەناو نان و نمەکی شای لەبەرچاو بوو و بۆیەش بەرپرسانی دەوڵەتی هەمیشە لایەنگری بوون و ئاگاداری بارودۆخی بوون".(٥)

روون و ئاشکرایە کە محەممەد شا لەبەر دەستڕۆیی سیاسیی شێخ تەها لای ئەوی دەگرت و دەیزانی کە شێخ دەتوانێ هۆزگەلی کورد لە رووی سیاسییەوە بخاتە ژێر رکێفی خۆی یاخود وا بکا کە لە دژی بابی عالی و تارانی بوەستێ و یاخیگەری بکەن، بۆیە نەیدەویست کە تورکەکان وەك ئامرازێك لە دژی بەرژەوەندییەکانی ئێرانی کەڵکی لێ وەرگرن. تەنانەت دەوڵەتی رووسیەی قەیسەری ـ یش لە دەستڕۆیی ئایینی شێخ تەها و پێوەندی ئەو لەگەڵ رابەری راپەڕیوانی داغستانی شێخ شامیل، دەترسا. شێخ تەها لە نێو کوردانی قەفقاز و شێخ شامیل لە نێو کوردانی رۆژئاوای ئازەربایجان موریدێکی زۆری هەبوو و بێجگە لەمە، ئەوانیش لە نێوان خۆیاندا پێوەندییەکی پتەویان هەبوو. لە بارەی ئەم دوو شێخە لە راپۆرتی و.ن. خانیکۆف کۆنسولی رووسیە لە تەورێز بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە لە ساڵی ١٨٤٦ز هاتووە:" شێخ شامیل موریدانێکی زۆری لە نێو کوردان هەیە بۆ وێنە سەید تەها کە دە هەزار موریدی هەیە هەموو دەم نێوانی لەگەڵ شێخی داغستانی خۆش بووە. شامیل نامە و دیاری بۆ شێخ تەها و دەرەبەگی کورد بەناوی کەریم خان رواندزی دەنێرێ. نوێنەری شامیل بە ناوی حەسەن کە ناوی حاجی مورتەزای لە خۆی ناوە، بە فەرمانی ئەو لە گوندەکانی کوردنشینی شنۆ و دەوروبەری سەفەر دەکا".(٦)

خالفین بە پشتبەستن بە زانیاری و راپۆرتەکانی کۆنسولی رووس لە ئازەربایجان و ویلایەتی رۆژهەڵاتی عوسمانی بەم جۆرە ئەنجامگیری دەکا:"کە دەستڕۆیی و توانستی شێخەکانی وەك شامیل و سەید تەها ئەفەندی، رووسەکانی بە تایبەتی لە شەڕی کریمە تووشی ترس و دڵەڕاوکێ کردووە، ئەوان دەخوازن لە بارەی شێخ تەها و موریدانی زانیاری پتریان هەبێ".(٧)

پڕبایەخ بوون و دەستڕۆیی شێخ تەها پتر لە کاروباری ئایینی بەکاردەهات و ئەو زۆر حەزی لە

کاروباری دونیایی نەبوو و هەمیشە بۆ لاوازکردنی میرەکانی شەمدینان، سەرکردەکانی هێزی زەرزاو مەسیحییەکانی نەستووری و ئەرمەنی هەوڵی دەدا و لە لایەنی سیاسییەوە پێوەندییەکی گەرمی لەگەڵ شێخ شامیلی داغستانی هەبوو. ئەو رۆژگار لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم دەوڵەتانی ئێران و عوسمانی خەریکی جەنگ لەگەڵ ئیمپراتۆری رووسیە بوون و هەڵبەت رابەرانی ئاینزایی وەك شێخ تەها زیاتر بۆ پاراستنی کیانی ئیسلام لە بەرانبەر هێرشی دەوڵەتانی کۆلۆنیالیستی ئەوروپی هەوڵ دەدەن و ئەم هەلکەوتە هانی دەدان کە دوو دەوڵەتی ئیسلامی بەهێز بکەن. کوردەکانی ئێران لەم کاتەدا بە تەواوی بە دەوڵەتی ئێرانی وەفاداربوون و بە دڵنیاییەوە شێخ تەها لە خولقاندی ئەم تەناهییە بە لایەنی کەمی لە باکووری کوردستان کاریگەر بوو. بەڵام لە عوسمانیدا، وردە وردە راپەڕینی میران و زەویدارانی کورد لە دژی بابی عالی پەرەی دەسەند کە ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشاندەری جیاوازی بۆچوونی شێخ تەها بوو لەگەڵ زەویدارانی کورد لە ئاست بابی عالی. بەربلاوی قەڵەمڕەو و رادەی سەربەخۆیی و هێزی رامیاری و سوپایی میرنشینانی بابان، بەدرخانی و رەواندز زۆر لەهی میرانی ئەردەلان و دەرەبەگەکانی موکری لە ئێران زیاتر بوو، چونکە دەوڵەتی عوسمانی لەو کاتی سەرقاڵی زێدەو بەربلاوکردنی دەسەڵاتدارێتی خۆی و بە تورك کردنی کوردستان بوو، هەڵبەت لە نێوان ئەو دەوڵەت و حوکمڕانانەی کورد کە میراتگری زنجیرە کۆن و نیمچە سەربەخۆکانبوون، پێککەوتن و شەڕ دەخولقا، لە حاڵەتێکدا، کە لە ئێران هەلکەوتێکی وا لە ئارادانەبوو.

لەم کاتەدا لە دەوڵەتی عوسمانی، تەنیا شێخ تەها بێدەنگەی لێ کردبوو، بەڵام حوکمڕانانی میراتبەری کورد وەك میر ئەحمەدی حوکمڕانی رەواندز، بەدرخان بەگی حوکمڕانی بۆتان و یەزدانشێری برازای ئەو هەرکامەیان جیاجیا لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی شەڕیان کرد، ئەوەی کە بە دڵنیاییەوە دەکرێ لە بارەی شێخ بگوترێ، ئەوەیە کە ئەو زیاتر وەك رابەرێکی ئایینی دەجووڵایەوە و زۆر حەزی لە کاروباری دونیایی نەدەکرد.

## ـ ناکۆکی شێخ عوبەیدوڵڵا لەگەڵ دەوڵەتی ئێران

پاش مردنی شێخ تەها، عوبەیدوڵڵا میراتبەری سامانێکی زۆروزەوەند و ناوبانگێکی مەزنی باوکی بوو و خێرا بازنەی دەسەڵاتی خۆی بەرفراوان کرد. عوبەیدوڵڵا لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم جێی شێخ تەهای گرتەوە و هەنگاونانی بەرەو وەدەست هێنانی دەسەڵاتی زیاتر لە رۆژگارێکی تایبەت هاتە دی.

لە دەوڵەتی عوسمانیدا، بنەماڵە زەویدارەکان و هۆزەکانی کورد لە بەرانبەر سیاسەتی بە ناوەند کردنی بابی عالی وەستان و جیاوازی زمان و فەرهەنگی کورد و تورك ئەم ئاگرەی خۆشتر دەکرد. سوڵتان داکۆکی کرد لە جیاتی میرە میراتبەرەکانی کورد، پاشای تورکی خۆی بۆ حوکمڕانی ناوچەکانی کوردنشینی ئیمپراتۆری دابنێ. بنەماڵەکانی زەویداری کورد زۆربەی جیاوکی رامیاری و ئابووری خۆیان لە کیس دەچوو و لە جیاتیان پیرانی تەریقەتی نەقشبەندی و قادری و زانایانی ئایینی، نە تەنیا دەسترۆیی خۆیان دەپاراست، بەڵکو بەپێی وتەی کریس کۆچیرا "بوون بە چینێکی نوێ لە رابەران کە دەسترۆیی زیادیان وای لێ کردن کە ببن بە ئەلتەرناتیڤی میرانی بزر بوو و پێویستیان پێ هەبوون."(٨)

پاش شکانەکانی ئێران و عوسمانی لە زنجیرە شەڕێك لەگەڵ رووسیا، بنەمای هەردوو وڵات سست ببوو و کاربەدەستانی هەردوو دەوڵەت ناچاربوون رادەی سەرانە و باج پتر بکەن و ئەمە بە تایبەتی لە ئێران کە قەرەبووی شکستی دەداوە بە سەنپترزبورگە، زیاد هەست پێ دەکرا. لە کوردستانی باکوور و لە میرنشینی کوردستان وردە وردە حوکمڕانانی بیانی دادەمەزران بە تایبەتی لە نێو ئازەرییەکان هەڵدەبژێردران. هەڵبەت هەندێ ناوچە جاروبار لەژێر دەسەڵاتی میری موکری بوو، دەبێ جیا بکرێتەوە. لە باکوور لە سۆنگەی رکابەری و دژایەتی ئایینی نێوان ئازەر و کورد، فەرمانبەری ئازەری زۆربەی جاران گوشاری دەخستە سەر هۆزەکان و گەندەڵی دارایی تا دەهات زیاتر بلاودەبۆوە، بەلام لە ناوچەکانی کوردنشینی عوسمانیش، گەندەڵی و توندوتیژی و زێدەڕۆیی لە سەرانەسەندن لە لایەن کاربەدەستانی سوپایی و کارگێڕی تورك، خەڵکی کوردی زۆر بە توندی لە بابی عالی ناڕازی کرد. لەم بەینەدا شێخ عوبەیدوڵلاّ سوودی وەرگرت لە بۆشایی دەوڵەتی خۆجێی کە لە ئەنجامی وەلانانی میرە کوردەکان ساز ببوو لە ماوەیەکی کورت بوو بە رابەرێکی ئایینی و زەویدارێکی گەورە. دوکتۆر جەلیلی جاسم جەلیل لەم بارەیەوە دەنووسێ: "بناڤو دەنگی و هەڵکەوتی بەرزی شێخ عوبەیدوڵلاّ گەیشتە ئەو رادەیە کە موسڵمانانی (عوسمانی) دوای سوڵتان و شەریفی مەککە ئەویان بە پیرۆزترین کەس دەزانی. هەزاران کورد ئەویان بە نوێنەری خوا دەزانی و ئامادە بوون بێ دوودڵی بەدوای کەون و لە فەرمانی دابن".(٩)

لۆرد کرزۆنیش لە بارەی دەسەلات و رادەی خۆشەویستی شێخ عوبەیدوڵلاّ لە ناو کوردان دەنووسێ:" ناوبانگی پیرۆزی و کارزانی ئەو لە هەموو شوێنێك بلاّو بۆوە بە شێوەیەك کە وردە وردە بە چاوی رێبەری نەتەوەی کورد بۆیان دەڕوانی."(١٠) لە لایەك ژمارەی موریدەکانی شێخ

زۆر بوون و لە لایەکی تر ئەو ئێستا تەنیا داڵدە و پەناگەی کوردە ناڕازیبووەکان لە سیستەمی کاربەدەستانی تورکی دەژمێردری".

کرزۆن لە بارەی دەسەڵات و دەسترۆیی شێخ لە نێو موریدەکان نووسیویەتی:"ئەو کەم و زۆر دامودەزگا و شێوازی پاشایەتی دامەزراندن و رۆژانە لەدیوەخانەکەی خۆی میوانداری لە (٥٠٠ تا ١٠٠٠) کەس دەکرد و لە بەڕێوەبردنی کاروبار بەوپەڕی دەسەڵات و سام و شکۆداری دەجووڵایەوەو لە راستیدا شایەکی بچووك لە نێو کوردان حسێب دەکرێ".[١١]

شێخ پیاوێکی سادە، دڵنیا بەخۆ و زۆر دەمارگرژ لە راست ئایین کە لە بەرتیل خۆری بێزار بوو و ئەو جۆرە کە د. جەلیل بە پشتبەستن بە زانیاری کۆنسولەکانی رووس و بەریتانیا لە ئێران و عوسمانی دەسەلمێنێ کە خەڵکی کورد بە تایبەتی لە عوسمانیدا، ئەویان بە رزگارکەری خۆیان دەزانی و نازناوی "باوك"یان پێ دابوو.[١٢]

دەوڵەتی ئێران لەوەی کە دەیدی شێخێکی کورد کە بە شێوەیەکی رەسمی سەربە عوسمانی بوو لە نزیك سنوورەکانی ئازەربایجان هێزێکی ئایینی و سیاسیی بەربڵاوی پەیدا کردووە و هۆزە ئازاکانی کورد لەو ناوچەیە ئامادەی فیداکردنی گیانی خۆیانن بۆ ئەو، تووشی دڵەڕاوکێیەکی زۆر بوو و بۆیە هەوڵی دا بەر لە هەموو شتێك تەنیا بیانگەی ئەو بۆ هاموشۆکردن کە بۆ ناو خاکی ئێران کە گوندە تیولییەکانی باوکی بوو، بەبێ دەنگی لێی بسێنێتەوە.

لە درێژەی ئەم پلانە، (یوسف خان شجاع ئەلدەولە) حاکمی ورمێ لە ساڵی ١٢٩٠ك ١٨٦٩ز کە داوای سەرانەی لە موریدانی کرد و کاتێ ئەوان گوێیان بەم داواکارییە نەدا، گوندە تیولییەکانی شێخیان ئاگر تێ بەرداو پەنجا کەسیان لە موریدانی ئەو کوشت. ئاکامی ئەم کارە لە هەموو لایەکیەوە هەڵەیەکی گەورە بوو، بووە هۆی یاخیگەری هۆزەکانی سەرسنوور و دەست تێوەردانی عوسمانی لەم کێشەیە. شێخ عوبەیدوڵلا بەر لە هەر کارێك نوێنەری خۆی سەید حەسەن سابلاغی بۆ راگەیاندنی ئەم رووداوەو سکاڵاکردن بۆ تاران نارد و کاربەدەستانی ئاگادارکردەوە کە کاتی خۆی محەممەد شا ئەم گوندانەی لە باشووری ورمێ بە شێخ تەها داوە و سەبارەت بە سەرانەش لە خەڵکی دانیشتووی ئەم گوندانە لێیان خۆش بووە، بەڵام لە تاران هیچ بایەخێك بە مافی شێخ نەدرا.[١٣]

ئێستا دەوڵەتی عوسمانی بیانوویەکی باشی وەچەنگ کەوتبوو بۆ ورووژاندنی خێڵە کوردییەکان لە دژی دەوڵەتانی ئێران و بێگومان کەڵك وەرگرتن لە دەسترۆیی ئایینی شێخ و ئەو غەدرەی

کە لێی کراوە، کاریگەری لە موریدانی شێخ دەکرد. گوشاری سەختی دیپلۆماسی بابی عالی بۆ وەرگرتنەوەی مافەکانی شێخ و بەرگری جیدیانە و دڵسۆزانەی تورکەکان لە بەرژەوەندییەکانی شێخ، هۆکار و هەنجەتێکی باش بوو بۆ حکوومەتی عوسمانی، چونکە لە لایەك کۆتایی بە دوژمنکاری شێخ و سوڵتان دەهات و لە لایەکی تر هەر هەمان دوژمنکاری ئاراستەی بەرژەوەندییەکانی ئێران دەکرد. شێخ عوبەیدوڵڵا پاش بیستنی وەڵامی نێگەتیڤی تاران، سەبارەت بە سزادانی ئەوانەی کوشتاری (٥٠) کەس لە موریدانیان کردبوو، هۆزەکانی کوردی عوسمانیان وروژاند تا پەلاماری خاکی ئێران بدەن و پاشایەتی تورکیش دەستی هۆزەکانیان لەم بارەیەوە ئاوەڵە کرد و هاوتەریب لەگەڵ ئەم کارانە گوشاری دیپلۆماسی ئیستانبۆل بۆ سەر تاران بۆ ناردنی گروپێکی لێکۆڵینەوە لە گوندەکانی شێخ زیاتر بوو و سەرەنجام لە مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٢٩١ك (١٨٧٠)ز دەوڵەتی ئێران کاربەدەستی خۆی ئاغا میر سادقی بۆ لێکۆڵینەوە بەرەو ناوچەکە رەوانە کرد.

ئاغا میر سادق لە راپۆرتی خۆی بۆ یوسف خان راوێژکاری وەزیران، رادەگەیەنێ کە حاکمی ئازەربایجان دەسەلمێنێ کە شێخ عوبەیدوڵڵا فەرمانێکی موعتەبەری لە محەممەد شاوە لەبەر دەستە کە نیشاندەری خاوەندارێتی بێ سێ و دووی ئەو گوندانەیە و ستەمی لێ کراوە. ئەو هەروەها سەبارەت بە ئامانجی حاکمی ورمێ لە کوشتاری موریدانی بێ گوناهی شێخ بەم شێوەیە دەدوێ:" واپێدەچێ کە سەرچاوەی ئەم شەڕە لەوەوە هاتبێ کە (ئەمیر ئەلئومەرا ئەلعوزام شوجاع ئەلدەولە) بە تەما بووە کە هەر چۆنێك بێت ئەو چەند پارچە گوندە لە دەست جەنابی شێخی موعەزەم ئیلەیهی دەربهێنێ و ئەوەی راستی بێت ئەو کۆمەڵە موڵکە دەوڵەتییە کە (ئەمیر ئەلئومەرا ئەلنیزام شوجاع ئەلدەولە) لە سنووردا لەم ماوە کەمەیە کۆیکردۆتەوە، لە توانایی هیچ کەسێ لە پیاوانی دەوڵەتدا نییە..".

ئەوا ئێستا ئەم پرسیارە دێتە ئارا کە ئایا (شوجاع ئەلدەولە) حاکمی ورمێ بە فەرمانی دەوڵەتی ناوەندی ئەو گوندانەی شێخی داگیرکردووەو داوای سەرانەشی لە خەڵك کردووە؟ یان بەپێی ئارەزووی خۆی ئەم کارەی کردووە؟ وەڵام هەرچی بێ ئەمە گومانی تێدا نییە کە دەوڵەتی ئێران بۆخۆی پێی خۆش بوو کە پێوەندییەکانی ماددی و مەعنەوی شێخ عوبەیدوڵڵا لە ناو خاکی ئێران بپچڕێ و هەر بۆیەش وەزارەتی دەرەوە قەرەبووی زیانەکانی شێخی کردبۆوەو هەر حاشای لە خاوەندارێتی ئەو گوندانەی شێخی کردو تەنانەت پێی لێ هەڵبڕی لە ساڵی (١٢٩٢ ك ١٨٧١ز)ەوە داوای سەرانەی ئەم سێ ساڵەی پێشتری لە شێخ کرد.[١٤]

وەستانی ئێران بەرانبەر بە داخوازییەکانی شێخ عوبەیدوڵلا و بابی عالی بووە هۆی ئەوەی کە هۆزەکانی کوردی عوسمانی پەلاماری خاکی ئێران بدەن و زیان بە شاری شنۆ و گوندەکانی دەوروبەری بگەیەنن، داوێنی ئەم پەلامارانە کە بە لایەنی کەمی حەوت هەزار سوار و پیادەی کورد تێیدا بەشداربوو، هێندە زۆر بوو کە بووە هۆی وەستانی کارەکانی کۆمیسیۆنی هاوبەشی سنوور دیاریکردنی نێوان ئێران و عوسمانی.

لە مانگی رەجەبی ساڵی ١٢٩٣ ك (١٨٧٢)ز وەزارەتی دەرەوەی ئێران زۆر بە توندی نارەزایی لە دژی دەوڵەتی عوسمانی دەربڕی و رایگەیاند: هێرشی حەوت هەزار سوارەو پیادەی کورد لە خاکی عوسمانییەوە بۆ شنۆ بێ رەزامەندی کاربەدەستانی سنووریی عوسمانی سەر ناگرێ."[١٥]

دوا بەدوای ئەم پەلامارانە دەوڵەتی ئێران بە راشکاوی رایگەیاند کە ئیتر هەرگیز ئەم ملکانە بە شێخ ناداتەوە. بەهەرحاڵ جەنگی دیپلۆماتیکی ئێران و عوسمانی هەروا بێ ئاکام مایەوەو بەدەستپێکردنی شەڕی نێوان رووس و عوسمانی لە ساڵی ١٨٧٧ز کەوتە ژێر تیشکی ئەم رووداوە گرنگە و بە شێوەیەکی کاتی لەبیر کرا.

شێخ عوبەیدوڵلا چالاکانە لە شەڕی رووس و عوسمانی بەشداریکرد، چونکە پابەندنەبوون و دەمارگرژی لە ئاست ئایین وای لێکرد کە رۆڵێکی چالاکانە لەم رووداوە ببینێ، بێجگە لەمەش چ بیەوێ و چ نەیەوێ، هۆزەکانی کوردی هەر دەکەوتنە نێو گۆڕەپانی شەڕەوە، چونکە وارسکە (غەریزە)ی سروشتی ئەوان بۆ تالان و بڕۆ و وەدەست هێنانی دەسکەوتی شەڕ و چەکی چاك، سەرەنجام ئەوانی بەرەو شەڕ دەبرد و لە بەرژەوەندی شێخ دابوو کە بە لایەنی کەم رابەرایەتی کوردەکان لە ئەستۆ بگرێ.

نووسەری ئەرمەنی ئەسکەندەر غوریانس کە خاوەنی پەرتووکی" شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلا شەمزینی لە سەردەمی ناسرەدین شادا"یە و سەرچاوەی سەرەکی فارسییە لە بارەی ئەم رووداوە، سەبارەت بە بزوێنەری بەشداربوونی شێخ لە شەڕی رووسیە بڕوای وایە "کاتی جەنگی رووس و عوسمانی ، شێخ عوبەیدوڵلا وەکو گورگی رۆژی هەور، نێچیرێکی زۆری کەوتە بەرچاوی و لەگەڵ کوڕەکەی شێخ سدیق و هەندێ لە شێخەکانی تر لە بایەزید دەستی بەشەڕ کرد و سەرکەوتنی وەدەست هێنا و کەوتە جێی سەرنجی عوسمانی".[١٦]

ئەم کارانەی ئەو نیشانەی ملکەچی و گوێڕایەڵی لە سوڵتانی عوسمانی نەبوو، بەڵکو بەپێی وتەی غوریانس" ئەو و مووریدانی هیچ کات نە لایەنگری دەوڵەتی عوسمانی بوون و نە ملکەچی تەواو بوون".[١٧]

مێژوونووسی رووس .ن. ئا. خالفین بێجگە لە هەڵپەرستی خودی شێخ، وورووژاندنی ئینگلیزەکان لە بەشداری کاریگەرانەی ئەو لە شەڕدا، دەزانێ و لەم بارەیەوە دەنووسێ: لە یەکەم رۆژەکانی شەڕ، سوڵتان داوای یارمەتی لە پیاو ماقووڵانی کورد کرد و شێخ عوبەیدوڵلاّ پێش هەمووان بەخۆی و سێ سەد سوارە بەرەو بەرەی شەڕ چوو و بە ئەوانی تریشی راسپارد کە بەدوای ئەودا بێن. هەروەها بەریتانیا بە مەبەستی بەرگری لە عوسمانی زۆربەی سەرەك کوردەکانی بۆ شەڕی رووسیە بە پارە چاوی دەنووساندن.(١٨)

هەرچەندە کوردەکان نەیانتوانی خزمەتێکی ئەوتۆ لە بەرەی شەڕ لە قازانجی سوڵتان پێشکەش بکەن، بەڵام لە کۆتایی شەڕدا بە دەسکەوتێکی زۆر و تفەنگی مارتینی بەرەو خاکی خۆیان گەڕانەوە. بۆ یەکەم جار لە رووداوێکی سیاسیی ـ سوپایی، موریدانی شێخ عوبەیدوڵلاّ کەوتنە ژێر فەرمانی ئەو و، دەوری ئەو یەك رابەری جێگر بوو. ئەو بەرلەوە رابەری مەعنەوی کوردان بوو، بەڵام ئەوا ئێستا ببوو بە رابەرێکی سیاسیش. بە درێژایی شەڕ سەرەك هۆزەکان دەهاتنە خزمەت شێخ و دەوڵەتی عوسمانیش وەك رابەری کورد لەگەڵیدا هەڵسوکەوتی دەکرد ئەم کۆمەڵە رووداوە وای کرد ئەو ببێ بە رابەرێکی هەڵپەرست کە ئامانجی دووردرێژی هەبوو. نووسەری ئەرمەنی غوریانس ئاماژە بەم خاڵە دەکات کە "دوای کۆتایی شەڕی رووس و عوسمانی، شێخ کۆمەڵێك تالانکاری ئەنجامدا، پارەی کۆکردەوە، دەوڵەتی پێکهێناو ناوبانگی دەرکرد و کەوتە خەیاڵی دووردرێژەوە".(١٩)

کریس کۆچیراش دەنووسێ: هەرچەندە شێخ لە جەنگی رووسەکان شکستی هێناو بە دەستی ئاوەڵە گەڕایەوە ماڵ، بەڵام ئەوە نەبووە ئاستەنگ کە بە زوویی وەك " سەرۆکی خەڵکی کورد" نەناسرێ.(٢٠) بەهەرحاڵ لە پشتەوەی ئەم شەڕە، دەرفەت بۆ شێخ رەخسا تا رادەی خۆشەویستی و دەسەڵاتی ئەخلاقی خۆی لەسەر موریدان و سەرەك هۆزەکان و کەسایەتییەکانی کورد تاقی بکاتەوە کە زۆربەیان لە رۆژهەڵاتی تورکیە خڕ ببوونەوەو چاو ببڕێتە ئایندەی دوور.

## راپەڕینی کوردانی عوسمانی

لە ساڵی ١٨٧٨ز جەنگی رووس و عوسمانی کە ساڵێکی خایاند، کۆتایی پێ هات و گەلانی ژێر دەستەی ئیمپراتۆری تورکیە لەگەڵ دەرەنجامەکانی ئەم شەڕە رووبەڕووبوونەوە، بەڵام بارودۆخی کوردان لە گەلانی دیکە خراپتر بوو، چونکە یەکێ لە بەرەکانی شەڕ، لە ناو خاکی ئەوان بوو و

زیانێکی زۆر بەر کێڵگەکانیان کەوت، بابی عالی بۆ قەرەبووی کەموکووڕیەکانی دارایی خۆی، رادەی سەرانەی بەرزکردەوە. خالفین دەنووسێ کە تەنیا لە دانیشتوانی کوردی ئەرزەڕۆم و هەکاری نزیکەی (٤) ملیۆن پیاستەر سەرانە وەرگیرا.[٢١] دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی دا سەرانەی ساڵی داهاتوو لە هەمان ساڵ وەربگرێ و بۆ نموونە لە ناوچەی "باش قەلا" ئەم سیاسەتە بەکارهێندرا [٢٢] ئەمە لە دۆخێکدابوو کە هەم رادەی سەرانە بەرزکرا بۆوە و هەم ماوەی وەرگرتنەکەش کورت کرابۆوە. پەیتا پەیتا گرانی و رێگری رۆژهەلاتی عوسمانی گرتەوە. سوپاییان و فەرمانبەرانی کارگێڕی عوسمانیش بێ ئەوەی سەرنج بدەنە دەستکورتی و هەژاری خەڵك، بێ بەزەییانە رووتیان دەکردنەوەو هەرچی هەیانبوو لێیان دەسەندن کە جیابوو لەو سەرانەی کە دەوڵەت بۆیانی بڕیبۆوە. هۆکاری ئەم کارەی ئەوان ئاشکرا بوو، جاری وابوو چەندین مانگ بەسەردەچوو لەبەر بەتاڵانبوونی گەنجینەی دەوڵەت، موچە بە فەرمانبەری کارگێڕی و سوپایی نەدەدرا و ئیتر هەر کەسێك خەمی خۆی لەپێش بوو.[٢٣] لە دواییدا وشکە ساڵی سیمای ناشیرینی خۆی نیشان دا و سەرتاسەری کوردستانی عوسمانی و رۆژئاوای ئازەربایجانی ئێران تووشی بێ بارانی و نەبوونی بەرووبووم هات. رۆژنامەی مشاك چاپی تفلیس، بەپێی نووسینی د. جەلیل هەر رۆژەو هەواڵی برسیەتی خەڵکی لەم ناوچە یان ئەو ناوچانەی عوسمانی و ئێرانی بڵاو دەکردەوە و وەك کارەساتێك باسی لە هەژاری و برسیەتی ئەرمەنی و کوردەکان باس دەکرد.[٢٤]

لە ناوچەکانی کوردنشینی ئێران بە تایبەتی لە خۆی، سابلاغ، سنە، ورمێ و ناوچەکانی تر، برسیەتی برستی لە خەڵکی بڕیبوو و بەپێی ئەوەی رۆژنامەی ئەرمەنی مشاك لە هەمان ساڵ واتە (١٨٧٨)ز دەنووسێ "خەڵك لەبەر تینی برسیەتی گەیشتبووە رادەی هاری و ئیتر یاسایان نەدەناسی .. ئەوان پەلاماری عەمباری گەنم و جۆیان دەداو لە گوللەی پاسەوانانیش نەدەترسان".[٢٥]

کوردەکان راپەڕین، کوڕانی بەدرخان بەگ واتە عوسمان بەگ و حەسەن بەگ کە ئەفسەری سوپای عوسمانی بوون، سەرکردایەتی راپەڕینیان دەکرد. ناوچەکانی هەکاری، بۆتان، بادینان، سێرت، ئەرزەڕۆم و دیاربەکر بوون بە شانۆی بەریەککەوتنی کورد و سەربازی تورك.

راپەڕین بە رواڵەت ئامانجی نارەزایی دەربڕین بوو، بەڵام خالفین ئامازە بەم خاڵە دەکا کە بنەماڵە کۆنەکانی کورد بۆ گەڕانەوەی دەسەڵاتی پێشتریان، بە ئارەزووی خۆیان لەم شەڕە

بەشدار بوون. ئەو بەلگەی بۆ سەلماندنی ئەم وتەیە، راپۆرتی بالیۆزی ئەو کاتی رووسی"ئابرمیلەر"ە کە پێیوابوو " کوردەکان ئیتر لە سەربەخۆیی پێشوویان بێبەشن ، ئەو سەربەخۆییەی کە لە سەردەمی بەدرخانییەکان لێی بەهرەمەندبوون، کەواتە ئێستا راپەڕیون تا دەسەلات و هێزی رابردوویان دووبارە بەدەست بهێننەوە". (٢٦)

لە سەرەتای کاردا، کوردەکان چاك بەرەو پێشەوەچوون و عوسمان بەگ نازناوی میری بۆخۆی هەلبژارد واتە لە خوتبەی نوێژی هەینی لە مزگەوتەکان ناوی ئەو لەگەلّ ناوی سولتان دەهات. ئەم راپەڕینە کە ئامانجی جودایی لە دەولەتی عوسمانی نەبوو، خێرا لە نێو بردرا و شێخ عوبەیدوللا کە لەم کاتەدا تەمەنی (٥٠) سالّ بوو، هیچ یارمەتییەکی کوڕانی بەدرخانی نەدا، چونکە نەیدەویست بەدوای کەس بکەوێ. گرنگی راپەڕینی سالّی (١٨٧٨)ز کوردەکانی عوسمانی لەوەدایە کە وای کرد شێخ عوبەیدوللا بکەوێتە خۆی و راپەڕینێکی جیاواز لە دژی بابی عالی بەرپا بکا.

ئەو لەم سالانە بە گەورەترین رابەری ئایینی کورد و گەورەترین زەویدار لە رۆژهەلاتی عوسمانی دەژمێردرا و بەپێی نووسینی د. جەلیل خاوەنی پتر لە دووسەد گوندی گەورەو بچووك بوو. (٢٧) باری نەگونجاو و ناخۆشی کوردان، بیانگەیەکی باش بوو بۆ شێخ عوبەیدوللا تاکو لەمەودوا پتر خۆی لە کێشەکانی خەلکی وەربدا، بۆیە دوای سەرکوتکردنی راپەڕین، نوێنەرێکی بۆ لای سولتان لە ئیستانبۆل نارد و هەڕەشەی کرد کە ئەگەر باری کوردان چاك نەکرێ ئەوا خۆی و موریدانی روو لە خاکی ئێران دەکەن. سولتان کە لە ئەگەری سوودوەرگرتنی ئێران لە نارەزایی کوردان دەترسا، بە پەلە موفتی شاری وان و سامح پاشای فەرماندەی هێزەکانی رۆژهەلاتی بۆ وتووێژ بۆ لای ئەو نارد. شێخ موریدێکی زۆری لە رۆژئاوای ئازەربایجان هەبوو و تۆڕی پڕۆپاگەندەیەکی بەربلاوی سازدابوو و بە سانایی دەیتوانی موریدانی خۆی ببزوێنێ. سەرکۆنسولی رووسیە موسیو کریبیل لە سالّی (١٨٧٩) دەولەتی خۆی ئاگادارکردەوە کە جێگرانی شێخ (خەلیفە) لە سالّی (١٨٧٩) بەردەوام بۆ خاکی ئێران هاتوون و کوردانی ئەم ناوچەیەیان وروژاندووە. (٢٨) سولتان لەوە دەترسا کە ئەم هێزە گەورەیە بەهۆی ئێرانییەکان لە دژی بەرژەوەندییەکانی عوسمانی بەکاربهێندرێ بۆیە بۆ سەرنج راکێشانی شێخ دەستی بە جموجوولّ کرد، بەلام وتووێژی رابەری کوردان و نوێنەرانی ئەو نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك . شێخ لەم کاتەدا هەولّی دا خۆی لە رووسیە نزیك بکاتەوە، بەلام بەپێی نووسینی خالفین کۆنسولی رووسیە لە ((وان)) بەناوی کامساراکان وەلامی پۆزەتیڤی پێ نەداوە، چونکە وەزارەتی دەرەوەی

رووسیە لەو بڕوایەدا بوو کە ئەم رابەرە ئایینییەی کورد هەر بە کوردستانی عوسمانی ناوەستێ و زوو یا درەنگ پەلاماری ناوچەکانی کوردنشینی ئێرانیش دەداو ئەمە لە بەرژەوەندی رووسیە دا نییە.(٢٩)

بەم شێوەیە شێخ عوبەیدوڵڵا لە کۆتایی ساڵی (١٨٧٩)ز خۆی تەیارکرد بۆ شۆڕش دژی سوڵتانی عوسمانی و بۆیەش سەرکردەی هۆزەکانی کوردی بۆ بارەگای خۆیان لە ناوچەی نەهری بانگهێشت کرد. نزیکەی (٢٠٠ ) کەس لە سەرکردەکانی هۆزی کوردانی عوسمانی و چەندین زانای ئایینی پایەبەرز بۆ لای شێخ بەڕێکەوتن و شێخ لە یەکەم کۆبوونەوەی ئەم پیاو ماقوولانە باس لە پێویستی پێکهێنانی میرنشینێکی کوردی کرد و رایگەیاند کە رابەرایەتی و بەڕێوەبردنی کوردان بەمافی خۆی دەزانێ.(٣٠)

شێخ عوبەیدوڵڵا لە یەکەم دانیشتنی سەرکردە کوردەکان ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بەکارهێنا بۆ ئەوەی سەبارەت بە بیروڕایەکانی، قەناعەتیان پێ بهێنێ و لە کۆتاییدا رێککەوتن کە لە سەرەتادا بەرانبەر بە تورکی عوسمانی شەڕ رابگەیندرێ و پاش سەرکەوتنی بەرەو ئێرانیش شۆڕ ببنەوە و لەوێشدا شۆڕش بکەن.

خالفین لە بارەی پلانی چالاکییەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا لە یەکەم کۆبوونەوەی سەرکردەکانی کورد دەنووسێ: " بەم شێوەیە بڕیاردرا کە کوردی مامەش و مەنگوڕ لە سنووری ئێران بێنە رێزی فەرمانی حاجی شێخ سدیقی کوڕی گەورەی شێخ، رەواندز داگیر بکەن و لەوێوە بەرەو بەغدا هێرش بەرن. عەبدولقادری کوڕی دووەمی شێخیش ئەرکی داگیرکردنی موسڵ و ئامێدی پێ سپێردرا و داگیرکردنی شاری وانیش کەوتە ئەستۆی خودی شێخ."(٣١)

گومان لەوەدا نییە کە شێخ لەم کاتەدا تەنیا بیری لە رزگاربوونەوەو خەبات لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی و داگیرکەرانی تورکی دەکردەوە کە لە ناوەوەڕا بەسەر نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا زاڵبوون، بۆیە لە پشتیوانی نەیارانی بیانی سوڵتان کە تورک نەبوون وەك فەرحان پاشا رابەری عەرەبی موسڵ بەهرەوەند بوو و بەپێی نووسینەکانی خالفین ئەم سیاسەتوانە عەرەبە بەڵێنی بە شێخدا کە لەکاتی هێرشی کوردان بۆ سەر موسڵ یارمەتیان دەدا.(٣٢)

بەڵام ئەنجامەکانی دیاریکراوی یەکەم کۆبوونەوەی سەرکردە کوردەکان هەرگیز نەهاتە دی و لە دانیشتنێکی نوێ کە لە مانگی ئابی ١٨٨٠ز بۆ یەکەم جار پلانی هێرش بۆ سەر ئێران داڕێژرا و بە فەرمانی شێخ دوو سوپا بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانە ئامادەکران. سوپای یەکەم لەژێر

فەرمانـدەیی عەبـدولقادر دەبوایـە شـاری تـەوریزیان داگیرکردبایـە و سـوپای دووەم لـەژێر فەرماندەیی کوڕەکەی تری شێخ محەممەد سدیق داگیرکردنی شارەکانی ورمێ، خۆی و سەلّماسی پێ سپێردرا. هۆکاری ئەم راگۆڕین و هەڵوێست وەرگرتنەی نوێ دەبێ چی بووبێ؟ بۆچـی شـێخ عوبەیدوڵلاّ و سەرکردە کوردەکانی زۆربـەی بەشـەکانی کوردنشـینی خـاکی عوسمانیـان بـەجێ هێشت و بەشی بچووکتریان بۆ پێکهێنانی میرنشینی کوردی هەڵبژارد؟ بەڵگەکان نیشان دەدەن کـە پیـاوانی بـەریتانیا و عوسمـانی رای شـێخ و سـەرکردەکانی لایـەنگری ئـەویان گـۆڕی. مێژوونووسی رووس خالفین ئاماژە بە راپـۆرتی بـاڵیۆزی ئـەوکاتی رووسـیە لـە ئێـران بـەناوی زینوویف دەنووسێ کە ئینگلیزەکان لە نزیکەوە پێوەندیان بە شێخەوە هەبوو و وتووێژیان لەگەڵ دەکرد. زینوویف وەزیـری دەرەوەی رووسـیەی ئاگـاداركردبۆوە کـە جموجـۆڵی دیپلۆماتـەکاتی بەریتانی بە ئاگاداری و رەزامەندی بابی عالی جێبەجێ دەکرێ و " چ ئیستانبۆڵ و چ تاران لـەم راستییە ئاگادارن بەریتانیا لە شۆڕش دەستی هەیە و ئەو وڵاتەیە کە هەوەسی یەك پارچەکردنی ناوچەکانی کوردنشینی خستۆتە مێشکی شێخ عوبەیدوڵلاّ ".(٣٣)

ئەم وتەیەی باڵیۆزی رووسیە زۆریش لە راستی دوورنەبوو و وڵاتانی عوسمانی و بـەریتانیا یـەك یەك هەوڵی ئەوەیان هەبوو کە شێخ واز لـە رووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ بـابی عـالی بهـێنێ. د. جەلیل لە بارەی ئەم رووداوەوە دەڵێ: لە دەسپێکی دانیشتنی شەمدینان چـەند سـەرکردەیەکی هۆزەکان کە عوسمانی بە پارەکڕیبوونی، ئەم کێشەیان خستەڕوو کە باشـتر وایـە هێـزی کـوردە یـەکگرتووەکان لـە دژی ئەرمـەن و مەسـیحییەکانی تـری دانیشـتووی (ل٦٣) عوسمـانی بەکاربهێنن. ئەم پێشنیارە بۆیـە هاتـە ئـارا کـە دوای شـەڕی رووس و عوسمـانی (لـە سـاڵی ١٨٧٧)بەنـدی شەسـت و یـەکی پـەیمانی بـەرلین ئامـاژە بـە خودموختـاری (ئوتۆنـومی) ئەرمەنییـەکان دەکـا و کاربەدەسـتانی عوسمـانی وا نیشـان دەدەن کـە گوایـە جێبـەجێکردنی ناوەڕۆکی بەندی یادکراو لە زیانی خەڵکی کورددا دەبێ."(٣٤) دەوڵەتی عوسمانی لە نێـوان دوو دانیشتنی کوردەکان، نوێنەر و کاربەدەستانی شارەزا بەکاروباری ئەوانی بۆ ناوچەکە نـاردو بـە فەرمانی سوڵتان سامع پاشا کە زۆر چاك ئاشنایەتی بە کوردان هەبوو و بەکربەگی راوێـژکاری، بۆ گۆڕینی بیروڕای شێخ و سەرکردەکانی شەمدینان بەرەو ناوچەکە بەڕێ کەوتن. د. جەلیل بـە پشتبەستن بە بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوەی رووسیەی تزاری دەسەلمێنێ کە نوێنـەرانی سـوڵتان بەر لە وتووێژ لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵلاّ، چەند چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵ سـەرکردەکانی گـەورەی کورد ئەنجام داوە. لە سۆنگەی ئەمەوە کاتی کردنەوەی کۆبوونەوەی شەمدینان " ئەم سـەرکردە

کوردانه له لایەن عوسمانییەکان" پێشنیاریان کرد که ئەرمەنیان بە دەستی کورد سەرکوت بکرێن، بەڵام شێخ دژی ئەم رایە بوو و گوتی لەبەر دوو هۆ لەگەڵ ئەم رایە نییە: لە سەرەتا ئەگەر بێتو ئەم پلانە سەربگرێ، کورد دەبێتە ئامرازی دەستی ئەستانبۆڵ دوای سەرکوتکردنی ئەرمەنیان هیچ بە بەر کوردان ناکەوێ. دووەم دەوڵەتە ئەوروپییەکان دژی ئەم کارەی کوردەکان دەوەستن و لە ئایندەدا یارمەتی ئازادی کوردان نادەن.(٣٥) د. جەلیل هەروەها دەڵێ کە شێخ بۆی دەرکەوتبوو کە سەرکردەکانی کورد ئامادە نین ملکەچی فەرمانی شێخ بن لە دژی عوسمانی و لە لایەکی تر شەڕ لەگەڵ ئەرمەنیان لە بەرژەوەندی کورددا نییە، کەواتە بێ ئەوەی لە دڵەوە پێی خۆش بێ، خۆی تەیارکرد بۆ هێرش بۆ سەر ئێران.(٣٦)

دەبێ بزانین کە شێخ تەنیا لە لایەن سوڵتانەوە لەژێر گوشار نەبوو، بەڵکو دەوڵەتی بەریتانیاش بۆ هێرش بۆ سەر ئێران رەزامەند بوو.

پێوەندی نێوان شێخ و دیپلۆماتەکانی بەریتانی بۆ ساڵانی شەڕی رووسیە و عوسمانی دەگەڕێتەوە، لە گەرمەی شەڕدا مستێر راسن کۆنسولی ئینگلیز لە پاش قەڵا بە مەبەستی قەناعەت پێهێنانی سەرکردە کوردەکان و شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ بەشداری لە شەڕ لەگەڵ رووسیە چاوپێکەوتن و ئاخافتنێکی تێروتەسەلی ئەنجام دا. لە دواییدا مستێر کلایتون کاپیتانی سوپای بەریتانیا و راوێژکاری سوپای عوسمانی ساڵێك دوای شەڕ واتە لە ساڵی (١٨٧٩) دەستیپێکرد بە کۆمەڵێك گەشتی رامیاری لە رۆژهەڵاتی عوسمانی و دوای ئەوەی چاوی بە شێخ عوبەیدوڵڵا کەوت بەپێی نووسینەکانی کامساراکان کۆنسولی رووسیە لە شاری وان " کاروانێك چەك و تەقەمەنی بەریتانی بە ناو یارمەتی خۆراك بۆ نەهێشتنی برسییەتی و قاتی و قڕی بۆ ناوچەی شێخ نێردرا".(٣٧)

بەم شێوەیە کوردەکانی عوسمانی لە پلانی راپەڕینی سەرتاسەری لەدژی بابی عالی چاویان پۆشی و لە باتیان بەهۆی وەدەست هێنانی دڵنیایی لە پشتیوانی رامیاری عوسمانی و بەهرەمەندی لە چەکی ئینگلیزی ئامادەی شەڕ لەگەڵ ئێران بوون.

دەوڵەتی بەریتانیا وەك بەرگریکەرێك و هاوپەیمانی سەرەکی عوسمانی لە بەرانبەر رووسیەی قەیسەری و هەروەها وەك دەسەڵاتدارێکی کولۆنیالیست کە لە سەدەی نۆزدەهەم بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری بەرفراوانی لە عوسمانی هەبوو، هەڵبەت لە ئاست رووداوەکانی ئەو وڵاتە هەستیاربوو. دیپلۆماتەکانی بەریتانی لەگەڵ ئاشنایی بە گرنگی و هەڵکەوتی کوردەکان لە هاوکێشە سوپاییەکانی نێوان رووسیە و عوسمانی، زانیارییەکی تەواویان هەبوو لە جموجۆلی هۆزەکانی کوردی عوسمانی و لەبەر ئەمەش بوار رەخساندنی شێخ بۆ هاندانی کوردان بۆ راپەڕین لە دژی بابی عالی لە بەرچاوی دیپلۆماسییەتی بەریتانیا ون نەبوو. کاربەدەستانی بەریتانی بەدرێژایی جەنگی (١٨٧٧)ز ی رووس و عوسمانی لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵڵا پێوەندیان هەبوو و ئاشناییان هەبوو سەبارەت بە بۆچوون و شێوازی بیرکردنەوەی لەم جووڵانەوەو رەفتاری تورکان لە کوردستاندا. خالفین لە بارەی پێوەندی بەریتانیا و کوردەکان دەنووسێ:"بەریتانیا بڕیاری دا کە پشتی کوردەکان بگرێ و بە یارمەتی ئەوان جێ پێی خۆی لە ئاسیای بچووك سەقامگیر بکا ، تاکو لە داهاتوودا لەشەڕ (دژ بە رووسیە) کەڵکیان لێ وەربگرێ".[١] بەم جۆرە ئینگلیزەکان دەستڕۆترین کەسی کوردستانی عوسمانیان بۆ لای خۆیان راکێشا ـ شێخ عوبەیدوڵڵا ـ ئەم زەویدارو زانا ئایینییەی کورد، هەروەکو تۆژەری رووس تروتیر بڕوای وایە وەك " گونجاوترین کەس بۆ جێبەجێکردنی ئەم پیلانە هەڵبژێردراو بڕیاریان دا کە لە پاکی و راستی ئەو بە خراپە سوود وەربگرن".[٢] مەبەستی تروتیر لە پیلان، گۆڕینی رای شێخ بۆ راپەڕینی لە دژی ئێرانە. ئینگلیزەکان بڕیاری شێخ عوبەیدوڵڵا و سەرکردەی هۆزەکانیان لە راپەڕینی دژی سوڵتان گۆڕی و بۆیەش مستێر کلایتون کۆنسولی بەریتانیا لە شاری وان لەگەڵ خودی شێخ عوبەیدوڵڵا کەوتە ئاخافتن. بەپێی نووسینی د. جەلیل پێشوازییەکی گەرم لە دیپلۆماتی ئینگلیزی کرا و دووجار چاوپێکەوتن و وتووێژ سەبارەت بە بارودۆخی ناوچەکە لە نێوانیان ئەنجام درا.[٣]

یەکەم دیدار کورت و تەنیا مەبەست ئاشنایی و ناسینی یەکتر بوو، بەڵام چاوپێکەوتنی دووەم، زۆربەی کێشەکان لەوانە نارەزایی کوردان و ئەگەری هەڵسان و راپەڕینی ئەوان لە دژی دەوڵەتی عوسمانی هاتە باسکردن و لێکۆڵینەوە. کلایتون بە راشکاوی بە شێخی راگەیاند کە دەوڵەتی بەریتانیا لەگەڵ حکوومەتی عوسمانی پێوەندییەکی زۆر نزیك و پڕ بایەخی دامەزراندووە و ئامادەیە لەگەڵ هەر پشێوی و رووداوێك کە بۆ ئەو وڵاتە جێی مەترسی بێ، رووبەڕووبێتەوە،

ئەو لە دواییدا لە کۆبوونەوەی سەرکردە کوردەکانیش بەشداربوو و بەپێی وتەی خۆی لەگەڵ زۆربەی سەرکردەکانی ئەم "کۆنگرە"یە ئاخافتنی ئەنجام دا.[٤]

بێگومان هەڕەشە و وروژاندنی دیپلۆماتی بەریتانی بووە هۆی ئەوەی کە رای شێخ و سەرکردەکانی دیکەی کورد بگۆڕێ و بڕیارەکانی دانیشتنی یەکەمی کوردان کە تایبەت بە راپەڕینی ناو عوسمانی بوو، لەبیرکراو بۆ یەکەم جار ئەگەری هێرش بۆ سەر ئێران لە لایەن کوردەکانی عوسمانی خرایە بەردەم لێکۆڵینەوەو کاربەدەستی بەریتانیش پشتیوانی خۆی لەم بڕیارە نیشان دا.

ئینگلیزەکان نەیاندەویست هاوپەیمانی خۆیان ( عوسمانی)، لە بەرانبەر رووس بەبێ دەسەڵاتی ببینن، بۆیە دەیانویست راپەڕینی براوەی شێخ بۆ کوردستانی ئێران بڕوێنن و لەم بارەیەوە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی هاوهەڵویست بوون. سەرەنجام شێخ عوبەیدوڵلا بەپشتبەستن بە بەڵێنەکانی بەریتانیا کە تیایدا ناردنی چەك بۆ موریدەکانی بوو، بڕیاریدا پەلاماری ئێران بدا و هەنووکە دڵنیا بوو بەوەی کە شێخ ئیتر مەترسی لەسەر بابی عالی نییە. کەمێك بەر لە هێرشی کوردان بۆ سەر خاکی ئێران، مستێر ئابوت کۆنسولی بەریتانیا لە تەورێز، تامسۆنی بالیۆزی ئەو وڵاتەی لە تاران ئاگادارکردەوە کە شێخ توانیویەتی" بەشێکی گەورەی هۆزی شکاك کە پێشتر دۆست و جێگای متمانەی شای ئێران بوو، بەرەو خۆی راکێشێ.[٥] ئەم مەسەلەیە نیشان دەدات کە ئابوت بە تەواوەتی ئاگای لە رەوتی گۆڕانکارییەکانی کوردستانی عوسمانی بوو. هاوکات لەگەڵ دەست پێکردنی هێرشەکانی کوردان بۆ سەر ئازەربایجان چالاکییەکانی ئابوت زیاتر بوو و بە بیانووی ئەوەی کە بەشێکی ناو قەڵەمڕەوی کارە پێ سپێردراوەکانی ئەوە، لە گەرمەی شەڕ بە پەلەپرووزێ بۆ ئەو ناوچەیە چوو و چاوی بە شێخ و کوڕەکەی عەبدولقادر کەوت. شێخ عوبەیدوڵلا لە کاتی دیتنی ئابوت خەریکی گەمارۆدانی ورمێ بوو. کاربەدەستێکی تەورێز لە راپۆرتی خۆی بۆ وەزارەتی دەرەوە لە ساڵی (١٢٩٧) ١٨٧٦ز کە باس لە کارەکانی کۆنسولی بەریتانیا دەکا دەنووسێ: گەورەم، جیفرەی! بروسکەکەتان بیندرا کە باس لە شێخ عوبەیدوڵلا و کوڕەکانی و پێوەندی نهێنی ئەوان لەگەڵ بیانیدا کرابوو. بۆ پشتگیری ئەم نووسینەی جەنابت نامەیەکی لە جەنابی میرزا هاشم خانی بەرپرسی ورمێ پێگەیشتووە کە ئەسڵەکەی بۆ جەنابت دەنێرم. بارودۆخی جەنابی مسیو ئابوت کۆنسولی جەنەراڵی بەریتانی لە ورمێش بۆ جەنابت شی دەکرێتەوەو دەردەکەوێ کە ئەم کارانەی ئەمرۆ دەکرێ لە پێشەوە پلانی بۆ دارێژراوەو تەنانەت پێشتر ناوی ئەو کەسانە دراوە کە بەرپرسن لە کۆکردنەوەی ئازوقە. بەندەی گیان فیدا وێڕای نووسینی ئەم زانیارییانە بۆ جەنابی میرزا هاشم

خان و ئاگادارکردنەوەی، داکۆکی دەکەم کە بە دزی و بە ئاشکرا بە شێوەیەکی هۆشیارانە و وریایانە ئاگاداری جووڵانەوە و رەفتاری کۆنسولی جەنەڕاڵی ناوبراو بن..."(٦)

عەلی خانی ئەفشار کە لە سەردەمی گەمارۆدانی ورمێ لەو شارە بووەو یەکێ بووە لە بەرگری کەران بە راشکاوی دەڵێت کە کۆنسول ئابوت سووربوو لەسەر ئەوەی کە (ئیقبال ئەلدەولە)، ورمێ بداتە دەست شێخ عوبەیدوڵلاَ و وای بۆ دەچوو کە" ئێوە بەسێ هەزار کەسی بێ ئەزموونی شەڕ و قەڵایەکی وێران و تێکشکاو توانایی خۆراگریتان لە بەرانبەر بەسێ هەزار سوپای شێخ نابێ و جەنگ و خۆراگریتان هەرگیز لە بەرژەوەندی دەوڵەت و میللەتدا نییە و لەوانەشە خۆراگریتان ببێتە هۆی ئەوە کە ورمێش وەك میاندواو لە ژیان بێبەش بکرێ".(٧)
بەڵام حاکمی ورمێ ئەم کارەی نەکرد و بە لەبەر چاوگرتنی پێوەندی نێوان کۆنسولی بەریتانیا و شێخ عوبەیدوڵلاَ بە هۆی ئەوەوە (کۆنسول) داوای لە رابەری کوردان کرد کە بۆ ماوەیەك دەرفەتی پێ بدەن تاکو خەڵکی لە بارەی مەرجەکانی خۆوەدەستدانەوە یا خۆڕاگری پتر بڕیاربدەن، بەڵام ئابوت هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئێرانییەکان شارەکە وەدەست بدەن، عەلی خانی ئەفشار لەم بارەیەوە نووسیویەتی: کۆنسول کە بە ئاشکرا لایەنگری شێخ و کارەکانی ئەوە بوو لە وەڵامی (ئیقبال ئەلدەولە) گوتی : بەرگری و شەڕی ئێوەش لەگەڵ شێخ دا بەرژەوەندی تێدا نییە و باشتر وایە کە بەوەدەستدانی شار خۆتان لە ئەنجامی ترسناکی شەڕ لەگەڵ ئەو رزگار بکەن".(٨) کۆنسولی بەریتانیا لە هەوڵەکانیدا بۆ بێهێزکردنی دەوڵەتی ئێران و خستنە مەترسی سەرتاسەری وڵات، بە تەنیا نەبوو، بەڵکو قەشەو بڵاوکەرانی (مسیۆنێر) ئایینی ئەوروپی و ئەمریکی دانیشتووی ورمێش لەم رێگایەدا یارمەتیان دەدان لە نێویاندا چالاکترین کەس پزیشکێکی ئەمریکا بەناوی د. کوکران بوو کە جارێکیان گیانی شێخ عوبەیدوڵلاَی لە مردن رزگارکردبوو و لەگەڵ کوڕەکەشی عەبدولقادر نێوانی زۆر خۆش بوو. شێخ سەرەڕای پێوەندی لەگەڵ دوکتۆر کوکران و کۆنسولی ئابوت بەر لە هوروژمی بۆ سەر ئێران، نامەی بۆ پزیشکی ئەمریکی دەنارد و تێیدا رەخنەی لە دەوڵەتی ئێران و عوسمانی دەگرت و داوای لێ دەکرد کە سەرنجی دیپلۆماتی ئینگلیزی بۆ بارودۆخی کورد رابکێشێ. لە یەکێك لەم نامانە شێخ عوبەیدوڵلاَ بە د. کوکران دەنووسێ:" لە ئێوە داواکارم کە کۆنسولی بەریتانیا لە تەورێز ئاگادار بکەنەوە کە تا بکرێ بارودۆخی کوردستان بخاتە ژێر سەرنجی خۆی، بەهۆی ئەم کارەوە چاکتر و ئاسانتر سەر لە بارودۆخەکە دەر دەکا، بۆ ئەم مەبەستە حاجی ئیسماعیل دەنێرمە لاتان تا هەلومەرج و هەڵکەوتی بارودۆخەکە بۆ ئێوە روون بکاتەوە."(٩)

د. کوکرانیش وای کرد و ئەم کارە لە کاتی گەمارۆدانی ورمێ روویدا. کاتێ کە ئابوت چاوی بە حاکمی ورمێ کەوت کە پزیشکی ئەمریکیشی لەگەڵدا بوو و ئەویش لە کاتی وتووێژدا پێشنیاری بە حاکمی ورمێ کرد کە شار لەدەست شێخدا بێت. عەلی ئەفشار سەبارەت بە رۆڵی د. کوکران نووسیویەتی:" جەنابی دوکتۆریش کە وەك کۆنسول بەتەمای ترساندنی حاکم بوو، گوتی ئێوە دەزانن کە هەر ئێستا سێ هەزار سوپای لە نێو لەشکری شێخ دایە و ئەمە هەمان لەشکرە کە هێزی دەوڵەتی لەبناو و مەراغە تێکشکاندووە، من چونکە خۆم بە هاوشاری ئێوە دەزانم!!! دەمەوێ هاوڕا لەگەڵ جەنابی کۆنسول رێگر بین لە رەشەکوژی و تالآن و برۆ".(١٠) کۆنسولی بەریتانیا لە دواییدا هەوڵیدا مەسیحییەکانی ورمێ بخاتە بەرانبەری موسڵمانان و بۆ ئەم مەبەستە چاوی بە ئەمانوئیل کلودیك جێگری (خەلیفە) کاتولیکەکانی ورمێ کەوت و پێشنیاری پێ دا کە لە ئەرمەنیان داوابکا ئاڵای بەریتانیا لەسەر بانیماڵەکانیان بچەقێنن تاکو لە پەلامارەکانی کورد ئاسوودە بن. ئەفشار لەم بارەیەوە دەنووسێ:" جێگر (خەلیفە)ی ئەرمەنیان لە وەڵامی کۆنسولی ئینگلیز گوتی ئێوە باشتر وایە لە جیاتی داوای خۆوەدەستدان و دڵسووتان بەحاڵی ئەرمەنیان، وا بکەن ئەم بڕوایە گەندەڵە لە مێشکی شێخ بێتە دەرو بیری پاشایەتی لە زەینی دەربهێنن تاکو بەخۆڕایی نەبێتە هۆی کوشت و کوشتاری خەڵکی بێ گوناه... ئەو وەڵامە راشکاو و توندە هیچ دەرفەتی ئاخافتنی بۆ کۆنسول بەجێنەهێشت و ئەو وەك مارێکی بریندار لەلای خەلیفە گەڕایەوە."(١١) حەزی شێخ عوبەیدوڵلآ بۆ زانیاری دان بە کۆنسولی ئینگلیزی سەبارەت بە ئامانجەکانی خۆی و بارودۆخی کوردستان ئەوە دەگەێنێ کە یەکەم: ئەوەیە کە میستێر ئابوت لەسەر داواکاری دەوڵەتەکەی خۆی لە تەورێزەوە بەرەو ناوچەی رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ چوو و دووەم ئەوەیە کە شێخیش لە پێشەوە ئامادەی وتووێژ لەگەڵ ئەو دیپلۆماتەی بەریتانی بوو. بێگومان ئینگلیزەکان هەندێ بەڵێنیان بە شێخ دابوو لەوانە کە ئەوان لە دەسترۆیی دیپلۆماسیانەی خۆیان بۆ خستنەڕووی پێشنیارەکانی ئەو لە بەردەم کاربەدەستانی ئێرانی درێغی ناکەن و ئەم کارەش بەهۆی تامسون باڵیۆزی بەریتانیا لە تاران و بەهۆی ئابوت لە ورمێ سەری دەگرت. بە پێچەوانەی ئەوەی د. جەلیل رادەگەینێ شێخ لەگەڵ نوێنەرانی گشت وڵاتانی ئەوروپی پێوەندی نەبوو و تەنیا لەگەڵ مستێر ئابوت نێوانی خۆش بوو. پێوەندی نێوان کوکران و کۆنسولی بەریتانی لە تەورێز و هەماهەنگی شێخ لەگەڵیاندا، هاوڕایی و دڵنیایی و متمانەی دوولایەنە دەگەیەنێ کە کۆمەڵێك فاکتەر ئەمەی پێك هێناوە. بە راست شێخ لە راپۆرتی بەش بەشی کارەکانی خۆی بۆ کۆنسولی بەریتانیا چ

مەبەستێکی هەبوو؟ ئاشکرایە کە شێخ بیروڕای وابوو کە بەریتانیا دەتوانێ لە پێکهێنانی میرنشینی کورد، یارمەتی بدا، هەروەکو کە بەپێی وتەی کەنداڵ لە کێشەی میسر و یۆنان ئەمە ڕووی دابوو.[١٢] بەڵام بەریتانیا بیری لە دوور ڕاگرتنی شێخ لە عوسمانی دەکردەوەو حەزی دەکرد لە قومارێکی سیاسیی سوپایی لە ئێراندا بۆ سەروشوێن بکرێ. ئەو کاتەی کە ئابوت لە ورمێ بوو، شێخ نوێنەری خۆی، خەلیفە سەید محەممەدی بۆ لای ئەوی ناردو بەهۆی ئەوەوە نارەزایی خۆی و سەرکردەی هۆزەکانی تری لە ستەمکاری کاربەدەستانی ئێرانی و بە تایبەتی حاکمی ورمێ ڕاگەیاند. ئابوت لە ڕاپۆرتی خۆی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دەنووسێ: شێخ بەتەمایە کە خۆی هۆزە سەربزێوە یاخیبووەکانی ئێران و عوسمانی سەرکوت بکا تا هەنجەتێك بۆ خۆتێهەڵقوتانی ئەم دوو دەوڵەتە لە چارەنووسی کوردان نەمێنێتەوە. شێخ تەنیا شتێکی دەوێ و ئەویش پشتیوانی روحی دەوڵەتانی ئەورووپییە لە کوردەکان و دەڵێ ئەگەر نەیتوانی حکوومەتێکی چەسپاو و بەهێز لە کوردستان دابمەزرێنێ ئەوا ئامادەیە لە بەرانبەر نوێنەرانی وڵاتانی ئەورووپی دادگایی بکرێ."[١٣] ئابوت لەگەڵ ئەوەی کە وەڵامی خەلیفە سەید محەممەدی دابووەوە کە گوایە دوژمنایەتی نێوان کورد و ئێران بۆ ئەو و ڵاتەکەی هیچ بایەخێکی نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەشتێکی کرد بۆ ناوچەکانی تەرگەوەڕ، شنۆ و سلدوز و بەپێی نووسینی د. جەلیل مەبەستی ئەو لەم کارە ئەوە بوو تاکو لە بارودۆخی کوردانی ئەو ناوچانە ئاگادار بێ و بتوانێ لە بارەی ئایندەیانەوە بگاتە ئاکامێك".[١٤] کۆنسول ئابوت دوای بێ ئەنجامی لە هاندانی حاکمی ورمێ و خەڵکی شار بۆ وەدەست دانی شار لە بەرانبەر کوردەکان، بۆ لای شێخ چوو و لەگەڵی کەوتە ئاخافتن. بەڵام هەرزوو لەگەڵ سیمونی ئەرمەنی کە ڕاوێژکارو جێی متمانەی شێخ عوبەیدوڵلا بوو بەرەو شار گەڕایەوە. عەلی خانی ئەفشار لە بارەی مەبەستی کۆنسول لە گەڕانەوەی بەرەو شار و کاردانەوەی خەڵکی لە ئاست کردەوەکانی ئەو نووسیویەتی: کۆنسولی بەریتانیا جارێکی تر بە مەبەستی تۆقاندنی خەڵك و ساردکردنەوەی بەرگری کاران لە خەبات لەتەك سیمون ناوێکی ئەرمەنی کە جێی متمانەو ڕێنوێنی کاری شێخ عوبەیدوڵلا بوو بە تەمای هاتنە ناو شاربوون و چونکە خەڵکی دەیانزانی کە مەبەستی ئەم هاموشۆیانە چییە بێ ئەوەی کە لە (ئیقبال ئەلدەولە) روخسەت وەربگرن بەر لەوەی ئەو (کۆنسولی بەریتانیا) و سیمونی ئەرمەنییان کەپێ بنێنە ناوشار دەستڕێژیان لێ کردن، هەڵبەت بە شێوەیەکی وا تەقەیان لێکرا کە جەنابی کۆنسول نەپێکرێ و ئەو کە بارودۆخەکەی وا بینی بێ ئەوەی بچێتە ناو شار، گەڕایەوە".[١٥]حاکمی ورمێ لەوە دەترسا کە تەقەکردن لە گیانی کۆنسول گرفتی بۆ

ساز بکا، پەیامی بە یەکێ لە قەشەکانی ورمێ ڕەوانە کرد کە کۆنسول هان بدا ناوچەکە بەجێ بهێڵێ و بەپێی نووسینی نووسەری ئەرمەنی، " ئیقبال ئەلدەولە" هەواڵی بۆ مۆسیۆ لۆمان نارد کە مانەوەی کۆنسول لەو کاتەدا لە شاری ورمێ مەسلەحەت نییە. بە بیروبڕوای خەڵکی شار هێرشی شێخ بۆ سەر شار بە هاندانی کۆنسولی ئینگلیز ئەنجام دەدرێ کەواتە مەسلەحەت لەوەدا نییە کە کۆنسولی ناوبراو لە شار هەڵقەنێ نەوەك ڕووداوێکی نالەبار بقەومێ، ئەو کاتە دەبێتە هۆکاری وتووێژ لە نێوان هەردوو دەوڵەت و من بەرپرسی دەبم".(١٦)

ئابوت پاش ئەم ڕووداوە بەرەو ئۆردووگای شێخ چوو و لە لایەن ئەو نامەیەکی بۆ عەبدولقادر برد کە ئەوکاتی لە سابلاغ بوو، عەبدولقادریش سەدو پەنجا سوارەی بۆ پاراستنی گیانی کۆنسولی بەریتانی ئامادەکرد و هەمزە ئاغاشی کردە شارەزا و چاوساغی ئەو بۆ سەفەر بەرەو بناو. ئابوت دوای هاتنە ناو بناو، یەکسەر بەرەو ئۆردووگای هێزەکانی ئێران چوو و چاوی بە سەرکردەکانی سوپایی کەوت و ئەوانی بۆ هێرش بۆ سەر دوژمن هان دا و ژمارەی لەشکری کوردەکانی بۆ فەرماندەکانی ئێرانی باسکرد. هۆی ئەم گۆڕینە لە سیاسەتی ئەو چی بوو؟ لە دەسپێکی ڕاپەڕین، بەریتانیا کاردانەوەیەکی ڕەسمی پارێزگارانەی لەخۆی نواند. بەپێی نووسینی د. جەلیل، ناسرەدین شا لە سەرەتای ڕاپەڕینی شێخ چاوی بە ئابوت باڵیۆزی بەریتانیا لە تاران کەوت و خوازیاری گوشار و ناڕەزایی دەربڕینی بەریتانیا دژی عوسمانی بوو تا کوردەکان بوەستێنێ، چونکە ئەگەر بێتو ڕاپەڕیوەکان سەرکەوتنیان وەدی هێنابا، ڕووسیە بە بیانگەی پشتیوانی لە خەڵکی ڕووسی ئەوێ و بێ دەسەڵاتی ئێرانی لە پاراستنی گیان و ماڵیان، دەستی لە کاروباری ئێران وەردەدا. شا لە لاساری و ئاوڕنەدانەوەی بەریتانییەکان لەم بارەیەوە گلەیی هەبوو.(١٧) بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی کات، ئابوت بۆی دەرکەوت کە یەکگرتوویی و هەماهەنگی نێوان سەرکردەی هۆزەکان لە ئارادانییە و ئەگەری سەرکەوتنی شێخ زۆر کەمە و لە لایەکی تر ڕووسەکان هێزێکیان لە سنوور چڕ کردۆتەوە و ئەم ڕووداوە بێگومان دەبێتە هۆی تێکچوونی پتری پێوەندی نێوان ڕووسیە و عوسمانی، بێجگە لەمە ڕاپەڕینی شێخ لەژێر کاریگەری خوو و ڕەفتاری کاوڵکارانەی هۆزەکان لە شێوازی ناڕەزابوون و دژە ستەمکاری یەکەم، دەرچووەو لایەنی ئایینی بەخۆی گرتبوو. ڕەشەکوژی خەڵکی میاندواو هەرچەندە بێ ئاگاداری شێخ ئەنجام درا، بەڵام وەك خۆکوژی سیاسیی ئەو بوو.

هەنووکە تورکەکان بیانگەیەکی تەواویان بۆ تەمبێ کردنی ئەو وەدەست هێنابوو. کۆنسولی ئینگلیز لە شاری وان لە هەمان کاتدا نووسی:" دوورنییە کاربەدەستانی عوسمانی لە بێ مرادی شێخ لە ئێران (لە راستیدا لە لاوازی ئەو) سوود وەربگرن و ئەوی لە خاکی عوسمانی لە نێو بەرن".[١٨]

کەواتە راگۆڕینی ئابوت و خۆگەیاندنی بۆ ناو لەشکری ئێران لەمەوە هات کە بۆ لاچوونی ئەو دیپلۆماتە ئینگلیزییە، شێخ هیچ شانسێکی بۆ بردنەوە نەبوو و دەبوا وازی لێ بهێنێ و تاکو بۆ خۆی باری شکستی خۆی هەڵگرێ. لە ئەنجامدا تورکەکان سەرەتا هاتن ئەویان خستە ژێر چاودێری خۆیان و لە کۆتاییدا بۆ مەککە دووریان خستەوە تا ئەو کاتەی کە مرد. ئەو ژمارە سەرکردەی هۆزەکانیشی کە لە دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئێران چووبوون، زۆر بە توندی سزا دران. وەرسووڕانی ئابوت بەرەو دەوڵەتی ئێران ئەوە دەسەلمێنێ کە ئیدی پشتیوانی کردن لە شێخ لە قازانجی بەریتانیا نییە و دەبێ وازی لێ بهێندرێ و بەرەڵلای بکەن. گۆڕینی شوێنی راپەڕین لە عوسمانی بۆ ئێران لە لایەن شێخ عوبەیدوڵڵاوە، دابینکردنی چەکی پێشکەوتوو وەك تفەنگی مۆدیلی هێزی مارتین بۆ کوردان بەر لە هێرشی شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ خاکی ئێران، گەشتی سیاسیی کۆنسولی بەریتانیا لە گشت ناوچەکانی شەڕ، داکۆکی و پێ داگرتنی ئەو بۆ وەدەستدانی شاری ورمێ بە شێخ، هەوڵەکانی پزیشکی ئەمریکا لە بەرژەوەندی کوردەکان و دادگایی نەکردنی شێخ عوبەیدوڵڵا بە شێوەیەکی رەسمی، کۆمەڵێك کاربوون کە دەوڵەتی بەریتانیا پێوەی هات. بەڵام ئامانجی ئەو وڵاتە لەم کارە چی بوو؟

یەکەم: بێ هێزکردنی هەڵکەوتی رووسیە لە رووی سیاسیی لە ئێران و زیان گەیاندن بە یەکێ لە بنکە گرینگەکانی بەرژەوەندیی ئابووری ئەو وڵاتە لە ئێران واتە ئازەربایجان. دووەم بێهێزکردنی ئێران و گوشار خستنە سەر فەرمانڕەوایی قاجار بۆ بەخشینی جیاوك لە بواری سیاسیی و ئابووری پتر بۆ بەریتانیا. سێیەم لاوازکردنی عوسمانی بۆ گێڕانی رۆڵێکی گرنگتر لە کاروباری سیاسیی و ئابووری ئەو وڵاتە. کریس کۆچێرا لە بارەی کاریگەری جموجۆلی شێخ دەنووسێ: هێرشی "شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ ئێران بووە هۆی دەست تێوەردانی زل هێزەکانی ئەورووپی بە تایبەتی بەریتانیای گەورە و فەرەنسا لە کاروباری عوسمانی".[١٩] دوای ئەوەی کە شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ عوسمانی هەڵات، ئەویان بۆ ئەستانبۆڵ هەنارد، بەڵام لەوێ هەڵات و هەوڵی دا پشتیوانی ئێران یا رووسیە بۆ لای خۆی رابکێشێ و راپەڕینێکی نوێ لە خاکی عوسمانی بەرپا بکا. تورکەکان تا بەر لە هەڵاتنی شێخ لە ئەستانبۆڵ هەوڵیان دا بە گوشار خستنە سەر ئێران لە رێگەی دپلۆماسییەوە سەرلەنوێ مولکەکان بۆ شێخ بگەڕێننەوە، بەڵام ئێستا بەپێی نووسینی د. جەلیل "

سولّتان متمانەی بە موحسن خان بالّیوّزی ئیّراندا کە لەمەودوا شیّخ بوّ جیّگایەکی دوور لە ولاّتانی عەرەبی دەنیّریّ."[٢٠] بەم شیّوەیە شیّخ عوبەیدوللاّ بوّی دەرکەوت کە گشت یارمەتییەکانی عوسمانی (لە ململانیّی لەگەلّ ئیّران) سەرچاوە وەردەگریّ و بابی عالی داخوازییەکانی ئەو ناهیّنیّتە دی. سولّتان سەردەمانیّك شیّخ عوبەیدوللاّی بە "شای کوردستانی ئیّران" ناو بردو بەم شیّوەیە دوورویی خوّی نیشان دا بوو بەپیّی نووسینی نیکوّلاس لە سەرەتای شوّرِش " دادەوەریّکی تورك (یان لەوانەیە مەلایەکی کوّشکی عوسمانی بووبیّ) کە بوّ دیتنی شیّخ هاتبوو، ، نامەیەکی نیشانی ئەو کەسانە دەدا کە پیّیان خوّش بوو ببینن، کە سولّتانی عوسمانی بوّ ئەم کەسایەتیە (شیّخ) نووسیبوی و تیّیدا وا ناوی بردبوو کە گوایە ئەویش سولّتانیّکە لە رووی ریّز و پلەوپایە وەك ئەو وایە. رەنگە نامەکە ساختە بیّ، بەلاّم هیچ گرنگ نەبوو چونکە لەبەر چاوی شیّخ، وەك پیاویّکی ئاییینی بوّی دەرکەوت کە ئەم نازناوە لەم ساتە ناسکەی راپەرِیندا گەورەترین دیاری سولّتانی تورك حسیّب دەکریّ." [٢١] هیچ شتیّ بە ئەندازەی ئەم ورووژاندنانە وەك ئەم نامە و ویّنەی ئەو نامەیە لە سەرەتای راپەرِین نەیدەتوانی دلّنیایی بە شیّخ بدا و هەستی هەلّپەرستی ئەوی دەبزواند، بەلاّم ئیّستیّ کە شیّخ دەیبینی تورکەکان دوای فریودانی ئەو و تووشکردنی لە رووداویّکی بیّ ئەنجام و بەرهەم، برِیاریان داوە ریّ لە چالاکییەکانی بگرن و لیّرەبوو کە برِیاریدا لە سیاسەتی دەولّەتی ئیّران پشتیوانی بکا و رووی کردە ئەم دەولّەتە. دووسالّ دوای راپەرِینی کوردان کاربەدەستی وەزارەتی دەرەوەی ئیّران لە بەغدا لە راپوّرتی روّژی (١٦)ی شوالی ١٢٩٩ك ١٨٧٨ز خوّی بوّ وەزارەتی دەرەوە نووسی: ئیمرِوّکە روّژی( ١٦)ی مانگی شوالی موکەرِەم کاروانی سەلماس لە لای سەلماس هات لە نیّو خەلّکی ئیّرانیدا دەیانگوت کە شیّخ لە ریّگەی خوّیدا، دەگەیشتە سەرکردەی هەر هوّزیّك یان خیّلّیّکی کورد، دەیگوت کە کاروانی ئیّرانیان بیّرەدا تیّدەپەرِن، ریّزیان لیّ بنیّن و ئازاریان نەدەن، هەرچی بیّ دوّستمانن، هەرچی هەیە لە بەخت و تیّگەیشتن و فامی ئیّرانیانە، منیش بە هەلّە چووبووم".[٢٢] شیّخ ئەم قسانەی دوای هەلاّتنی لە ئەستانبوّلّ، باس کردبوون. دوای دووحەفتە کاربەدەستی ورمیّ بوّ وەزارەتی دەرەوەی نووسی:" بە ساقەی سەری پیروّزت، لە ماوەی هاتنی جەنابی شیّخ عوبەیدوللاّ زوّر کەرِەت پیاویّکی تایبەت بوّ لای غولامی توّ هاتووە و راپوّرت دەدەن کە شیّخ عوبەیدوللاّ ئیّمەی ناردووە، وا بکەن کە بەندەکانی حەزرەتی ئەمیر نیزام لەگەلّ ئەو نەرم بن، ئەویش بە سویّندخواردن دلّنیاییان پیّ دەدا کە لە ماوەیەکی کەم لە ئەرزەرِوّم بەو لاوە هەمووی بخاتە ژیّر دەسەلاّتی ئیّران و بەغداش بە مولّکەکانی ئیّرانەوە

دەلکێنێ و خۆیشی پاش دڵنیاکردنەوەی لە شاری ورمێ نیشتەجێ دەبێ و بۆ گیان فیدایی دەوڵەتی بەرز دریغی ناکا. شەوی رابردوو پیاوی تایبەتی شێخ جەمال کوڕی ژنی شێخ عوبەیدوڵلاّ هاتە لای غولامی تۆ (مەبەستی خۆیەتی) هەر هەمان پەیامی پێشووی پێمان دا". [٢٣]

بەڵام دەوڵەتی ئێران وەڵامی نێگەتیڤی بە پێشنیاری شێخ داو رایگەیاند کە متمانەی پێ نییە. دوای شکستی شێخ و گەڕانەوەی بۆ خاکی عوسمانی لە ساڵی(١٢٩٧)ك ١٨٧٦ز هەروەکو بە رەسمی راگەیاندرا، سەر کۆنسولی بەریتانیا لە بەغدا بۆ حەسانەوەو ڕاو و لە راستیدا بۆ وەرگرتنی زانیاری لە بارەی ئەنجامەکانی راپەڕینی کوردان، بۆ ناوچەی کوردنشینی عوسمانی سەفەری کرد و لەگەڵ هۆزەکانی کوردی کەوتە ئاخافتن. بەپێی نووسینی خالفین گەشتی سەر کۆنسول پلودین، سێ مانگی خایاند و بەپێی راپۆرتی ئابرگارد سەرکۆنسولی رووسیە لە تاران بۆ وەزارەتی دەرەوەی رووسیە، پلودین بە نهێنی لە ناوچەکانی کوردنشین کۆمەڵێك نامەی لە بارەی بارودۆخی کوردەکان بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لە لەندەن نارد. [٢٤] دەوڵەتی بەریتانیا کە دەیدی لە ئەنجامی شکستی راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ، ئێران و رووسیە لە یەکتر نزیك بووینەوەو شێخیش دڵی رەنجاوە لە فرت و فێڵی دەوڵەتی عوسمانی، سازو تەیارە بۆ راپەڕین دژ بە بابی عالی و رووی لە ئێران کردووە، بەلەز داوای لە بابی عالی کرد کە بەر لەوەی شێخ راپەڕینێکی تر دەست پێبکا، بیگرێ و دووری بخاتەوە. تەنانەت بەر لە هەڵاتنی شێخ مستێر گوشین بالیوزی بەریتانیا لە ئەستانبوڵ بە ئاشکرا لە بەرپرسانی عوسمانی داوای کردبوو تا بە سزای خۆی بگەیەنن یا وەدەست ئێرانی بدەن. [٢٥] ئێستا شێخ عوبەیدوڵلاّ بە تەواوەتی بەرانبەری عوسمانی وەستاوە و بەرژەوەندییەکانی ئەو دەوڵەتەی خستۆتە ژێر هەڕەشەکانی خۆی و ئەم بارە وەك هەبوونی مەترسییەکی شاراوەیە بۆ عوسمانی کە هاوپەیمانی بەریتانیایە لە بەرانبەر رووسیە و ئەمە بەدڵی پیاوانی دەوڵەتی بەریتانیا نەبوو و هەر لەبەر ئەمەش بابی عالی سەرەنجام دوای داواکارییەکان و راسپاردەکانی ئەوان، شێخی بۆ عەرەبستان دوور خستەوە.

له بەشی پێشوو بینیمان کە چۆن کاربەدەستانی عوسمانی و بەریتانیا قەناعەتیان بە شێخ عوبەیدوڵلاّ و سەرکردەکانی کورد هێنا کە لە جیاتی هەڵکردنی ئاگری راپەڕین لە خاکی عوسمانی، بۆ ئەم مەبەستە (ئێران) هەڵبژێرن. بەڵام دەبێ بزانین کە بۆچی شێخ رۆژئاوای ئازەربایجانی بۆ بەرپاکردنی راپەڕینی خۆی هەڵبژارد. وەڵامی ئەو پرسیارە ئاسانە، چونکە لەگەڵ ئەوەی موریدانی شێخ لە ویلایەتی کوردستان کۆببوونەوە، هەبوونی ململانێ و رکابەری نێوان ئازەرییەکان و کوردەکان و نارەزایی بەربڵاوی هۆزەکانی کورد لە ستەمی سەرانەسەندن و بێ دڵنیایی ئەوان بە تورکانی ئازەری لە بەشی کوردنشینی ئازەربایجان، ئەو ناوچەیەی لە هەموو روویەکەوە بۆ ئامانجەکانی راپەڕین گونجاو کردبوو.

دەوڵەتی ئێرانیش بە هەڵگرتنی هەندێ هەنگاوی هەڵە، رەوتی راپەڕینەکەی خێراتر و تیژتر کرد بەم جۆرە کە لە حوزەیرانی ١٨٨٠ز (ئیقبال ئەلدەولە) حاکمی ورمێ و جێگری (شوجاع ئەلدەولە) داوای لە شێخ عەبدولقادر کرد کە یەکێ لە کوڕانی شێخ عوبەیدوڵلاّیە، بۆ کۆکردنەوەی سەرانەی ناوچەی سۆمای ، بەڵام ئەو لە بەجێهێنانی ئەم کارە خۆی بواردبوو، لە دواییدا حاکم داوای لە عەلی خان یەکێ لە مڵکدارانی گەورەی ناوچەکە کرد کە ئەم کارە جێبەجێ بکا و ئەویش کوڕەکەی بۆ ئەنجامی ئەو کارە رەوانە کرد، بەڵام بەپێی نووسینی د. جەلیل شێخ عوبەیدوڵلاّ هەڕەشەی شەڕ لە هۆزی عەلی خان دەکا و لە ئەنجامدا کوڕی عەلی خان پەنا بۆ شێخ دەبا.[١]

دەوڵەتی ئێران بەم کارانەی، شێخی لە خۆی کردە دوژمن و هاوتەریب لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئەم ناکۆکییانە، حکومەتی عوسمانی لە راستیدا بۆ لاوازکردنی ئێران و

رووسیە و لە رواڵەتدا بۆ بەرگری لە مافەکانی پیاو ماقووڵێکی خۆی، تارانی خستە ژێر گوشار، کە کاربەدەستانی ئێرانی بە رەسمی داوای لێبوردن لە شێخ بکەن و قەرەبووی زیانەکانی بۆ بکەنەوە.

تا ئێرە تەنیا بەرژەوەندی دارایی شێخ وەك زەویدارێکی گەورە کەوتبووە مەترسی، بەڵام کاتێ کە کاربەدەستانی کاروبار، لە ئێران رێگای سەفەریان بۆ ناوچەی کوردنشینی ئازەربایجان گرت و سنوورەکانیان لەسەر داخست، شێخ هەستیکرد کە ئێرانییەکان بەتەمان پێوەندی ئەو و کۆمەڵە موریدەکەی بپچڕێنن، کارێك کە ئەگەر سەری بگرتایە بە مانای لەنێوچوونی دەسترۆیی سیاسیی و ئایینی شێخ بوو لە هەردوو دیوی سنوور. کەواتە لە ئەنجامی

سیاسەتێکی تەواو هەڵەی دەوڵەتی ئێران و گوێ پێ نەدان بە هەستیاری و گرنگی هەڵکەوتی ئەم رابەرە ئایینییەی کورد، ناوبراو خۆی بۆ رووبەڕووبوونەوە ئامادەکرد و چاوەڕوانی دەرفەت بوو. دەرفەتی گونجاو و بیانوویەك کە شێخ عوبەیدوڵلاّ نەهری بە دوای دەگەڕا لە نیوەی ساڵی ( ١٢٩٧ )ك ١٨٧٦ز لە ئەنجامی تەماحکاری حاکمی سابلاّغ و بێ ئاگایی موزەفەرەدین میرزا حاکمی تەورێز زوو وەدەست هات و هەلومەرجی رەخساند کە شێخی ناچارکرد خۆی تێهەڵکوتێنێ. سەربردە وابوو کە یەکێ لە ئەندامانی بنەماڵەی شاو نەوەی فەتح عەلیشا بەناوی شازادە لوتف عەلی میرزا کە ماوەیەك کێشکچی باشی موزەفەرەدین میرزای جێگری شا بوو و بە ئاغا شازادە بەناوبانگ بوو، ماوەیەکی کورت دوای دانانی بۆ حکوومەتی سابلاّغی موکری، گشت سەرکردەو زەویدارانی موکری بۆ ناوەندی حکوومەتەکەی بانگهێشت کرد و بە هەنجەتی ئەوەی کە بەروبوومی ئەو ساڵی چاك هاتووە، لەهەر کامەیان بڕە پارەیەك بە هەڕەشە یا ئەشکەنجە وەردەگرێ و لەم ناوە سەرۆکی هۆزی مەنگوڕ بەناوی هەمزە ئاغا نەك لە ئاست ئەم سەرانەسەندنە لاسار دەبێ ، بەڵکو لە ناو بارەگاکەی حاکمی سابلاّغ تەقە لە حاکم دەکا و ژمارەیەك لە پاسەوانان و سەربازان بە دەستی خۆی دەکوژێ و ناچار داوای یارمەتی لە شێخ دەکا. هەمزە ئاغا بە هۆی سەرپێچی و نافەرمانی لە ئاست دەوڵەتی ئێراندا، بەردەوام لە دووی بوون و ماوەیەکی زۆر لە ئەستانبوڵ و بەغداش بەند کرا.[٢] عەلی خانی ئەفشار لە بارەی پێشینەی چەوتی هەمزە ئاغا نوسیوویەتی: رابردوویەکەی پڕ لە یاخیگەری و سەرکێشی و تالانکاری، بەردەوام لە گیانی خۆی دەترسا و هەردەم چاوەڕوانی ئەوەبوو کە تۆڵەی خۆپەرستی و پەلامارەکانی خۆی ببینێتەوە، بۆیە چونکە پێشتر ئاگاداری بیروڕای شێخ عوبەیدوڵلاّ بوو و لە رابردوویشدا پێوەندی نزیکیان لەگەڵ یەکتر هەبووە لە سابلاّغ چەند کەس لە پاسەوانانی حکوومەتی دەکوژێ و بەرەو لای شێخ هەڵدێ و دەبێتە سەرداری سەربازەکانی ئەو."[٣]

بە پێی نووسینەکانی دانەری ئەرمەنی ئەسکەندەر غۆریانس، شێخ چەندین جار نامەی بۆ هەمزە ئاغا نووسی و ئەوی بۆ لای خۆی بانگهێشت کرد بەڵام هەمزە ئاغا مەیلی لەسەر نەبوو بەڵام دوای ئەم رووداوە" لە هەردوو لاوە ئامرازی پێویست و دەرفەتی گونجاو رێکەوت و یەکگرتنی خەیاڵی هەردووکیان هاتە دی".[٤]

شێخ عوبەیدوڵلاّ هەر لەگەڵ ئاگاداری لە تێکهەڵپڕژانی هەمزە ئاغا و حاکمی سابلاّغ، یەکسەر سوارەی خۆی بۆ یارمەتی ئەو هەنارد و هاوکات لەگەڵ ئەو خەلیفەکانی شێخ جەنگێکی ڕەوانیان لە دژی دەوڵەتی ئێران دەستپێکرد. پڕۆپاگەندەی خەلیفە و پیاوانی شێخ بەر لە گەیشتنی

هێزەکانی هەمزە ئاغا هێندە کاریگەربوو کە وێڕای پێ داگرتنی سەرکردەی هێزەکانی دەوڵەتی و پیاو ماقووڵانی کورد بۆ وەستان لە بەرانبەر دوژمن، حاکمی مەهاباد شاری بەجێهێشت و بەرەو میاندواو هەڵات. سەرکردەی هۆزەکان و پیاو ماقوڵانی کوردی ناوچەکە دوودڵ بوون لەوەی بەرەو لای شێخ بچن و حەزیشیان نەدەکرد لە خزمەت دەوڵەتی قاجاردا بن، بەڵام چونکە جەماوەر بە گشتی و زۆربەی زەویدارانی گەورەش موریدی شێخ بوون، ناچار دەستی هاوکاریان بۆ درێژ کرد، بەڵام هەندێکیان لەم سەرکردانە وەك محەممەد ئاغای سەرکردەی هۆزی مامەش بە وەرگرتنی هەندێ دیاری لە عەبدولقادری کوڕی شێخ هاتە ڕیزی هاوپەیمانێتی لەگەڵ شێخ.(٥)

میرزا ئەحمەد مونشی جێگری شا بۆ ئەوەی جێگر ئاگادار نەبێتەوە، وەڵامی نامەکانی حاکمی سابڵاغی نەدەداوەو لە ئەنجامدا ئومێدی هیچ جۆرە یارمەتیی و ئالوگۆڕێك لە لایەن تەورێزەوە نەدەکرا. ئەم هەلومەرجە جۆرە بۆشاییەکی سیاسیی و سوپایی لە سابڵاغ و دەوروبەری دا پێك هێنابوو و لەوانەیە بە هۆی دوژمنکاری نێوان حاکمانی خۆجێیی ورمێ، خۆی و ماکۆ، چاوەڕوانی یارمەتی و پێشگرتن لە هێرشەکانی موریدانی شێخ، لە لایەن ئەوانیشەوە نەدەکرا. کەواتە بوارێکی ڕەخساو بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی شێخ هاتە کایەوەو وردە وردە گشت سەرکردەو پیاو ماقووڵانی کورد بوونە هاوپەیمانی کوڕی شێخ. خووی بێ دیسیپلینی لە نێو هۆزەکان زوو ئەوەی نیشاندا کە رامکردنیان کارێکی دژوار دەبێ و چوونە ناو ناوچەی ئازەرینشین ، تالان و بردن و کوشتنی خەڵکی بێتاوانی لێ دەکەوێتەوە. غوریانس کە لەکاتی گەمارۆدانی سابڵاغ بەهۆی هۆزەکان لەوێ بووە دەنووسێ: کۆنترۆڵی ئەم لەشکرە رێگرە نە لە دەسەڵاتی شێخ زادە بوو نە لە تاقەتی هەمزە ئاغا."(٦) بەپێی وتەی ئەو بێجگە لەو کەسانەی کە بۆ ناڕەزایەتی لە ستەمکاری کاربەدەستانی دەوڵەت هاتبوونە ریزی سوپای شێخ هەندێکیان بە هیوای تالان و لە خۆشی دەسکەوت هاتبوونە ریزی شێخ. مینۆرسکی لەم بارەیەوە نووسیویەتی: تالان و برۆ لە هەمان دەسپێکی کار لە تایبەتمەندییەکانی ئەم راپەڕینە بوو. ژمارەیەکی بەرچاو لە ئێرانییەکان بە کوشت چوون و زیانێکی دارایی گەورەیان بەرکەوت.(٧) هۆزە کوردەکان و موریدانی شێخ لە دەست ئەو چووبوونە دەر و بەم شێوەیە ئامانجەکانی رابەری کورد کە بە پلەی یەکەم دامەزراندنی میرنشینی کورد و هەروەها وەدەست هێنانی هەندێ ئیمتیاز لە دەوڵەتی ناوەندی لە بەرژەوەندی کورد دابوو، بۆ ئەوان بوو بە شتێکی بێ مانا و ئەوان لەژێر کاریگەری دوو فاکتەری ئایین و بەشداری لە تالان و بڕۆی ماڵ و سەروەتی ئازەرییەکان وەدوای کەوتن. لە راستیدا گرفتی سەرەکی شێخ شیکردنەوەو و تێگەیاندنی ئامانجەکانی راپەڕین بۆ هۆزەکان بوو و نابێ والێك بدرێتەوە کە ئەو تەنیا لە گۆڕەپانی شەڕ تووشی دژواری و گرفتی بوو.

له پەرتووکی "ڕاپەڕینی مەلا خەلیل و ڕەتکردنەوەی فـەرمانی ڕەزاخـان"دا، چـەند بەشـێك لـە مەسنەوییەکی کوردی هاتووە کە لە بارەی ڕاپەڕینی شێخ عوبەیـدوڵڵا و جووڵانـەوەی هۆزەکـانی ژێر فەرمانی ئەو هۆنراوەتەوە. لەم هۆنراوەیەدا ئاماژە بە فـەرمانی شـێخ کـراوە بـۆ تـاڵانکردنی میاندواو و ڕەشەکوژی دانیشتووانی (عەجەم)ی ئەوێ، ئاگر تێبەردانی شار، تاڵانکردنی سـەروەتی خەڵکی و بازاڕیەکان بەهۆی هۆزەکان و مامەڵەی ناشرینی خـەڵکی بـەرەڵلا و شـوان و گاوانـانی کورد لەم دەڤەرەدا و لەوێدا بە ڕاشکاوی ڕادەگەیەنن کە هەمزە ئاغا بەرپرسیار بـووە لـە هێـرش کردنەسەر میاندواو.(٨) دوای داگیرکردنی سابڵاغی موکری، عەبدولقادر کوڕی شێخ حەزی دەکـرد بۆ ناوچەی هەوشار و سەقز هێـرش بکـا، بـەڵام دانیشـتووانانی کـوردی لادێیـەکانی دەوروبـەری مەراغە داوای یارمەتیان لێ کرد و ئەو بڕیاری دا هاوکاریان بکا.(٩) هـەر ئـەم گـۆڕینی ئامانجـە ئەوە نیشان دەدا کە شێخ پلانێکی تایبەتی بۆ بەرەوپێشچوونی ڕاپەڕین لەبەرچـاو نـەبووە و لـە دوای ڕووداو دەڕوا. لە مەسنەوییەکی کوردی داکە لە لایەن شاعیرێکی نەناسراوەوە هۆنراوەتـەوە، وتراوە کە شێخ تەمای داگیرکردنی گشت ناوچەکانی کوردنشینی ئازەربایجانی هەبوو.(١٠) لەوانەیە لە بارەی ئەو شوێنانەی کە لەبەرچاویان بووە بیگرن، شـێخ عوبەیـدوڵڵا و کوڕەکـەی عەبـدولقادر هـاوڕا نـەبووبن. بەهــەرحاڵ لـە ڕۆژی هـەینی( ٢٥ شـوال ١٢٩٧)ك ١٨٧٦ز هـەمزە ئاغـا و عەبدولقادر بۆ میاندواو هێرشیان برد و هۆزە یاخیبووەکان مزگەوت و ماڵی خەڵکیان سـووتاند و بازاڕی شاریان تاڵانکرد. بەپێی ڕاپۆرتی بەرپرسـێکی سـابلاغی بـۆ وەزارەتـی دەرەوە لـە سـاڵی (١٢٩٨)ك ١٨٧٧ز سێ هەزار و پێـنج سـەد کـەس لـەم ڕووداوە کـوژران.(١١) بـەڵام غوریـانس ژمارەی کوژراوەکان بە (٨٥٠) کەس دەزانێ و هەروەها درێژەی پێ دەدا کە تاڵان و بـڕۆ هێنـدە بەرفرەوان و زیادبوو کە بێجگە لە کوردان، خەڵکی بێ سەروبەرو بەرەڵلای تورکیش جلی کوردیـان لەبەر کردووە لە تاڵانەکان بەشدار دەبوون.(١٢) هێـرش بـۆ میانـدواو کـە ناوەنـدێکی سـوپایی و ئابووری نەبوو، نیشان دەدا کە شێخ بە چاکی بەسەر موریدانیدا زاڵ نییە ئـەو، لـەو سـەردەمەدا هێشتا لە سنوور نیشتەجێبوو و ڕەشەکوژییەکان لەسەر داوای ئەو سەری نـەگرت، بـەڵام نکـوڵی لەمە ناکرێ کە ئەم ڕووداوە کاریگەری خراپی لەسەر ڕاپەڕین هەبوو. لە لایەك ڕاپەڕین شێوازێکی ئایینی ڕووتی بەخۆیەوە گرت و شیعەی ئازەری لە دژی کوردان هان دا و لە لایەکی تر دەرەبـەگی ئێران شەڕیان دەکرد، بەڵام پاش ئەمە، دوژمنی ئەوان خەڵکی ئازەربایجان بوو. بەگزادەی کـوردی دەیانگوت ئەمە چ باسەو چ بارێکە؟ ئەم کوشت و کوشتارە بە کـام ئـایین ڕەوایـە؟ چـونکە شـێخ زادەکان بەڵێنیان بە خەڵکی دابوو کە ئامانجی سەرەکی ئەوان چاکسازی کاروباری موسڵمانانە تـا خەڵکی لە دەست درێژی دەوڵەتی ئێران ڕزگار بکەن و جیاوگ و تەناهی بۆیـان وەدەسـت بهێـنن، بەڵام ئێستا ئەوەی نەدەبیندرا لە نێو لەشکری هەمزە ئاغـا، ئەمـە بـوو و هـەروەها وایـان لێـك

دەداوە کە لە رۆژی رەش و نسکۆشدا هۆزەکان بەرەو چیاکان یا خاکی عوسمانی هەڵدێن، بەڵام ئەوان ناتوانن لە موڵکەکانیان دوور بکەنەوە کە تەنیا هۆکاری بژێوی و ژیانیانە و لە ئەنجامدا لەژێر پێی تۆڵەسەندنەوەی سوپای ئێران دەپلیشێنەوە.(١٣) سوپای هەمزە ئاغا بە ئومێدی تاڵانکردنی گوندەکانی ئازەربایجان لە بەریەك بڵاوبوو و هەندێ لە سەرکردەی هۆزەکان وەك گولابی ئاغا سەرکردەی هۆزی دێبوکری و قادر ئاغا پەنایان بۆ سوپای ئەمیر نیزام گەروسی برد، چونکە لەگەڵ فەرمانی غەزا (شەڕی ئیسلام)ی شێخ نەبوون. ئیمامی نوێژی هەینی خەڵکی وروژاند کە شەڕ لە دژی ئازەرییەکان بکەن، بەڵام مەلا عەبدوڵڵا مەلای دێبوکریان فەرمانی غەزا لە ئاست ئەو موسڵمانانەی کە نوێژ دەکەن و کتابیان هەیە، بە شتێکی بێ پایەی ئایینی لەقەڵەمدا.(١٤) عەبدولقادر و هەمزە ئاغا لە بیست و هەشتەمی مانگی زی قەعدەی ساڵی (١٢٩٧ کۆچی ـ ١٨٧٦ز) بۆ شاری بناب هێرشیان کرد، بەڵام لەبەر خۆڕاگری خەڵك و هێزەکانی دەوڵەتی و هەوڵەکانی مەلا عەلی قازیی شار شکستیان هێنا. لە ئەنجامی ئەم شکستە هەندێ لە سەرەك هۆزەکان، سوپای شێخیان بەجێ هێشت و خان بابا خان حاکمی ساباڵاغ داندراو لە لایەن ئەو ، پەنای بۆ سوپای ئێران برد. لەم دەمەدا شێخ لەگەڵ کوڕەکەی دیکەی محەممەد سدیق شاری ورمێی گەمارۆ دابوو و هەوڵی دەدا خەڵکی شار ناچار بکا خۆیان بەدەستەوەبدەن. گەمارۆی شار لە پازدەی زی قەعدەی حەرام دەستیپێکرد. "شێخ نامەگەلێکی بۆ ئەمیر جەمالەدین ئاغا شێخ ئەلئەسلاحی ورمێ و میرزا حوسێن ئاغا موجتەهیدی ئەوکاتی نارد و رایگەیاند لەبەر لادانی دەستی ستەم لەسەر هۆزەکان، راپەڕیوە و ئامانجی کۆتایی ئەو تەورێزە، کەواتە لە خەڵکی داواکارەکە شار بەدەستەوە بدەن تاکو زیانیان پێ نەگا".(١٥)

بەڵام زانایانی ئایینی و خەڵکی بڕیاری بەرگریان دابوو تا ئەو کاتەی کە (ئیقبال ئەلدەولە) بگەڕێتەوە حاکمی شار کە ئەو کاتی لە دەرەوەی شار بوو. شێخ چەند رۆژێك ماوەی بە خەڵکدا و لەم ماوەیەدا چەندین نامە لە نێوان ئەو و ئیقبال ئەلدەولە ئاڵوگۆڕ کرا، کە بۆ ناوشار گەڕابۆوە، شێخ داخوازی خۆی نەهێنا گۆڕێ کە بنیاتنانی میرنشینیکی سەربەخۆ بوو، بەڵکو تەنیا باسی لە لابردنی دەستی ستەم لەسەر هۆزەکان و زێدەڕۆیی کاربەدەستان کردبوو.(١٦)

لە ماوەی گەمارۆی ورمێ مستێر ئابوت کۆنسولی بەریتانیا لە تەورێز بە بیانووی ئەوەی کە کاروباری ورمێش بەشێکە لەو کارانەی کە پێی راسپێردراوە و پێویستە پێی رابگا، هاتە ناوچەکەو پاش دیتنی شێخ، چووە دیداری حاکم و هەوڵی دا هانی بدات بۆ ئەوەی شار وەدەست بدا، بەڵام بە ئاکام نەگەیشت و دوای ئەوەی کە خەڵکی شار تەقەیان لێکرد، چووە ساباڵاغ و ماوەیەك لەلای عەبدولقادر مایەوە.

شێخ عوبەیدوڵلاّ هەوڵی دا شازادە عەباس میرزا مەلـەك ئـاراش بەگـەڵ خـۆی بخـا. بـەم مەبەسـتە نامەیەکی بۆ نووسی و بەڵێنی حکومەتی پێدا. بەڵام شازادە نامە و ئەوانەی نامەیان هێنابوو دەداتە دەست ناسرەدین شاو لە هاوکاری شێخ خۆی دەبوێرێ.(١٧) لە کۆتاییدا شێخ بـە (ئیقبـال ئەلدەولـە)ی دۆڕاند و پەیتا پەیتا هێزەکانی ئێران لە تاران، ماکۆ و گـروس بـەرەو ورمـێ و سـابلاّغ بەرێکـەوتن. کوڕانی شێخ لەشەڕ لەگەڵ ئەم هێزانە خراپ شکستیان هێنا و شێخ ناچار بوو پەنا بۆ خاکی عوسمـانی بەرێ. بەم شێوەیە راپەڕینی شێخ دوای خوێن رشتنێکی زۆر، بێ ئاکام کۆتایی هات.

بەڵام کاریگەری تا ماوەیەکی درێژ لە ناوچەکەدا هەرمابوو. ئەنجامی ئەم راپەڕینە یارمەتی بەزیاترو کردنەوەی هەستی نەتەوایەتی کوردی نەکرد، بەڵکو لە هاوژینی نێوان شـیعە و سـوننە کاریگـەری خراپی هەبوو و دوژمنایەتی نێوان ئەم دوو گروپە ئاینزاییە بۆ ساڵانی ساڵ درێژەی خایاند.

دەکرێ بگوترێ کە بزووتنەوەی شێخ تەمای سەربەخۆیی نەتەوەیی، ئاییینی هەبووە، چونکە تـەنیا پاڵپشتی هەستی ئاییینی کورد بوو. ئەمە دەسـەلمێنێ کـە کۆمەلگـەی ئێرانـی هێشـتا ئەوەنـدە توانای هەبوو کە یەکگرتوویی میللی خۆی بپارێزێ. بەڵگەیەکی تـری بـەهێز بـۆ سـەلماندنی ئـەم بۆچوونە لە ئارادایە و ئەویش شێوەی رووبەڕووبوونەوەی کوردەکانی ویلایـەتی کوردسـتان لەگـەڵ ئەم راپەڕینەیە.

**- ویلایەتی کوردستان و راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ:**

ئاشنایەتی وکاریگەری راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ لەسەر کوردانی میرنشینی ئەردەلان بۆ ناسـینی نـاوەڕۆکی ئـەم راپەڕینـە و ئامانجـەکانی رێبـەری ئـەم راپەڕینـە فـرە گرنگـە. ئەگـەر هاتبـاو کاردانەوەیەکی پۆزەتیڤ لە لایەن کوردەکانی ئەم ویلایەتە کرابا بۆ بانگەشەی شێخ بـۆ بەشـداری لە راپەڕین، دەیتوانی گێروگرفتی گەورەتری بۆ دەوڵەتی ئێران بخولقاندبا.

بنەماڵە ئەریستوکراتەکانی خۆجێی ویلایەتی کوردستان لەم کاتەدا هاریکاری دەولـەتی ئێرانیـان دەکرد و شارەکانی سەقز و بانە و مەریوان لەژێر فەرمانڕەوایی بنەماڵەی کورددا بوو.

دوای داگیرکردنی سابلاّغ یەکێ لە کوڕانی شێخ چەند نامەیەکی بۆ حاکمانی بانە و سـەقز نـارد و داوای لێ کردن کە ئەوانیش بە خۆیان و هێزیانەوە بێنە ریزی سوپای شێخ و ئەگەر وابکـەن شـێخ رێزیان لێ دەگرێ و ئەگەر وانەکەن، سزا دەدرێـن. ئـەم زانیاریانـەی حـاکمی کوردسـتان شـازادە ئەبوئەلفەتح میرزا موئەیەد ئەلدەولـە لـە بروسـکەیەکدا بـۆ وەزارەتـی دەرەوەی نـارد و خسـتیە بەرچاوی دەوڵەت.

کاربەدەستی کوردستان دوای شیکردنەوەی چالاکییەکانی کوڕی شێخ داوای هێزێکی بە توانایان کرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕاپەڕیوان و نووسی" بڕیارێك دەربکرێ کە لە کاردا دڵنیایی هەبێ، فتنەکە گەورەیە و شێخەکانی ئەم ناوچەیە زۆربەیان موریدن و ئامادەیی لە هەر ڕوویەکەوە پێویستە". (١٨)

لە ویلایەتی کوردستان گرژی نێوان شیعە و سوننە وەك ئازەربایجان زۆر نەبوو و کوردانی ئەم ناوچەیە لەگەڵ نەتەوەیەکی تر کە بە سەریاندا زاڵ بن، ڕووبەڕوو نەبوون، چونکە بەڕێوەبردنی کاروبار لە دەست خۆیان بوو و زەمینەیەکی ڕەخساو لە ئارادا نەبوو بۆ ئەوەی خەڵکی بیانەوێ دژی دەوڵەت یا شیعەکان ڕاپەڕن. بەڵام نکۆڵی لەوە ناکرێ کە لە نێوان پیاوانی ئایینی و شێخەکانی تەریقەتی قادریی و نەقشبەندییدا خەڵکێکی دەمارگرژ هەبوون.

د. جەلیل دەنووسێ: دوای کەوتنی سابلاغ ئیمام و خەتیبی مزگەوت لە سنە فتوایدا کە سوننە لە دژی شیعە بۆ جیهاد هەڵسن. (١٩) هەرچەند ئەم هەواڵە لە سەرچاوەکانی فارسی داکۆکی لێ نەکراوە، بەڵام لە جۆری ڕەوتی ڕووداوەکان را دەردەکەوێ کە ئەگەر ڕاستیش بێ کاردانەوەیەکی ئەوتۆی نەبووە.

تەنانەت خۆی د. جەلیلیش لەو بڕوایە دایە کە ئەم کردەوەیە بووە هۆی توندوتیژی دەمارگرژی ئایینی و بێهێزکردنی لایەنەکانی میللی ڕاپەڕین و ورووژاندنی شیعە و هیچ سوودێکی بۆ شێخ نەبوو. (٢٠) خاڵێکی گرنگ کە دەبێ ئاماژەی پێ بکرێ ئەوەیە کە لە ویلایەتی کوردستان میران و گەورە پیاوانی کورد بە تەواوەتی وەفاداری دەوڵەتی ناوەند بوون و شێخ تەنانەت نەیتوانی یەك دانە لەم دەرەبەگ و کەسایەتی کوردی ئەم ویلایەتە بکاتە هاوپەیمانی خۆی کە بە ئاشکرا بەرگری لێ بکا.

عەلی ئەکبەر وەقایع نیگاری کوردستانی دەنووسێ کە هاوکات لەگەڵ ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵا عەلی ئەکبەرخان (شەرەف ئەلمولك) لە ئەندامانی بنەماڵەی ئەردەلان و حاکمی پێشووی جوانڕۆ لە تاران ژیانی دەبردە سەر لە وەڵامی پرسیاری شا کە شێخ عوبەیدوڵڵا کێیە و کاری چییە؟(شەرەف ئەلمولك) کە هەردەم چاوەڕوانی دەرفەتێکی ئاوایی بوو، بە حەزرەتی گەورەی ڕایگەیاند کە ئەمە کەسێکی دەروێشەو لە ئەنجامی زیادکێشانی چرسی کەوتۆتە دالغە و خەیاڵی خاو و هەرکاتێ کە سەرچاوەی پاشایەتی بیەوێ کە ئاوڕێکی بە ڕەحمەت لە بەندە بداتەوە، بە لەشکری کوردستانەوە بێ ئەوەی کە زیان بە دەوڵەت بگا سوپاکەی پەرت و بڵاو دەکەم و ئەویش بە یاری خواو بەخت و یەقبالی شاهەنشا، دەکەم و دەیهێنم و با بە سزای کارەکانی خۆی بگا..."(٢١)

شا فەرمانی حکوومەتی کوردستانی بەناوی ئەو دەرکرد و فەرماندەیی فەوجی سەرکەوتووی پێدا، بەڵام خەڵکی سنە لە دژی ئەم دامەزراندنە لە تێلگرافخانەی شار مانیان گرت و لە ئاست حکوومەتی (شەرەف ئەلمولك) نارەزابوون. نووسەری (حەدیقەی ناسریە)، موشیری دیوان، (ئەسەف ئەلدەولە) و پیاوانی شازادە (حیسام ئەلسەلتەنە) بە بزوێنەری خەلکی دەزانی.[٢٢] بەلام نووسەری (تحفەی ناسری) دەنووسێ، هاندەری سەرەکی ئەم نارەزاییە میرزا عەلی نەقی ئەسەف و موشیری دیوان بوون.

ئەوەی لێرە گرنگە و پێویستە بگوترێ ئەمەیە کە خەلکی سنە هیچ دلبەندییەکیان لە ئاست فەرمانرەوایی ئەردەلان لە خۆ دەرنەبری و بە راشکاوی رایانگەیاند کە: لە فەرمانرەوایی ئەردەلان، ئەوپەری ترس و بێزاریمان هەیە ئەگەر فەرمانرەوایی (شەرەف ئەلمولك) بۆ پاراستنی سنووری کوردستانە، گشت ناوداران و جەماوەر بە ئەرکی سەرشانمان دەزانین کە ویلایەتی کوردستان بەوپەری تەناهی بپارێزین، هەر کاتێك شێخ عوبەیدوڵلا و موریدەکانی پێیان خستە سەرخاکی کوردستان لەخۆ رادەبینین کە دەریان بکەین..."[٢٣]

بەم شێوەیە خانەدانی کوردستانی خواروو پێشانیان دا کە پاراستنی دەسەلاتداریتی خۆیان لە هاوکاری لەگەلێ رژێمی قاجار دەبیننەوە و حەز ناکەن بەدوای شێخ عوبەیدوڵلا و ئامانجەکانی بکەون. بێگومان ئەگەر نارەزایی قوولێ و رەگدار لە کوردستانی باشوور لە ئارادابا، راپەرینی شێخ چاکترین دەرفەت بوو بۆ ئەوەی وەلامیان پێ داباوە و هۆکاری بێدەنگی زانایانی سوننەی سنە لە ئاست ئەم رووداوەش لە نەبوونی بوار و زەمینەی کۆمەلایەتی رامیاری بۆ هەلکردنی راپەرینی هەمە لایەنەی کوردی سەرچاوەی وەردەگرت.

هەنووکە دەکرێ بگوترێ کە لە رۆژئاوای ئازەربایجان نارەزایی دەرەبەگ و سەرکردەی هۆزەکان بواری دا بە دەمارگرژی ئایینی تاکو زیاتر پەرە بە راپەرین بدەن نەوەك بە تەنیا پرۆپاگەندەی ئایینی نەیدەتوانی راپەرینێکی بەم بەربلاویە بەرپا بکا. بەم شێوەیە کوردستانی باشوور لە یەکەم شێواوی و نائارامییەکانی کوردەکانی ئێران لە سەدەی نۆزدەهەم وەفاداری خۆیان بۆ دەولەتی ناوەند دەربری و بەم چەشنە جیاوازبوونی خۆیان لە کوردستانی باکوور نواند و سەلماندیان کە راپەرینی شێخ عوبەیدوڵلا پێگەیەکی کۆمەلایەتی بەرفراوانی لە نێو کوردەکانی باشووردا نەبووە.

ئامانجە بنەڕەتییەکانی شێخ عوبەیدوڵلا لەبەرپاکردنی ڕاپەڕینێکی چەکدارانە لە دژی دەوڵەتی ئێران چ بوو؟ ئایا شێخ دەیویست دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێنی یاخود بە یارمەتی شەڕ و کۆکردنەوەی هۆزەکانی هەولێ دا ,کە لە گوشاری کاربەدەستانی قاجاری بەرانبەر بە کورد کەم بکاتەوە و کۆتایی بە ستەمکاری سەرانەسەندن لە لایەن فەرمانبەرانی ئێرانی بە تایبەتی فەرمانبەرانی تورك لە ئازەربایجان بهێنێ؟ ئایا شێخ بەڵێنەکانی بابی عالی و دیپلۆماتەکانی بەریتانی سەبارەت بە پێکهێنانی میرنشینییەکی کورد لەسەر دەستی ئەو و سەرکردەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی بەهەند هەڵگرتبوو؟ ئایا ناسیۆنالیزمی کوردی لە یەکەم بزاڤی سیاسیی بەشێکی کوردانی دانیشتووی ئێران هیچ ڕۆڵێکی دەبینی؟ ئایا شێخ عوبەیدوڵلا تەنیا زەویدارێك و پیاوێکی ئایینی ناڕازی کورد بوو یا وەك بەکرێ گیراوێکی بابی عالی و بەریتانییەکان دەجووڵایەوە؟ دۆزینەوەی وەڵامێکی دروست بۆ ئەم پرسیارانە، ئێمە لەگەڵ ئامانج و نییەتی ڕاستەقینەی ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلا ئاشنا دەکا. لە ڕێگەی تاوتوێکردنی کردەوەی سەرکردە هاوپەیمانەکان لەگەڵ شێخدا، دەکرێ بڵێین کە گرنگترین لایەنی ئەو ڕاپەڕینە، دەربڕینی ناڕەزایی بوو بەرانبەر بەو ستەمکاریانەی کە لە لایەن فەرمانبەرە نێردراوەکانی ناوەند یا تەورێزەوە دژی سەرکردە و پیاو ماقووڵانی کوردستانی باکوور سەپێنرابوو و کاردانەوەی توندی ئەوان بەرانبەر بەم بارودۆخە بە مانای خستنەژێر پرسیاری شەرعییەت و کارایی دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی ئێران بوو.

ئەسکەندەر غوریانس کە لە کاتی ڕاپەڕین لە ناوچەکە بووە، ئاماژە بە ئاخافتنی خۆی و ئیبراهیم خانی سەرەك هۆزی زەرزاو حاکمی پێشووی شنۆ دەکا و هانی دەدا تاکو هاوکاری شێخ نەکا، و هۆی پێوەندی کردنی لەگەڵ شێخ دەپرسێ و سەرەك هۆزی زەرزا لە وەڵامدا دەڵێ:" ئەو ستەمەی کە من لە حاکمی ورمێ (موعین ئەلدەولە) و کوڕەکەی ئەو حاکمی شنۆم دیوە چۆن لە یادم دەچێ. ئێوە منتان لە تەورێز دیوە کە دوای لادانی (موعین ئەلدەولە) چەندە سکاڵا و گلەییم کرد لەو ستەم و ناڕەوا جووڵانەوەی شازادەو بەبەڵگە قسەی خۆم بە کاربەدەستانی ئازەربایجان سەلماند کە شازادە بڕی دوازدە هەزار تومانی بە خۆڕایی لە ئێمە سەند، هەموویان تێگەیشتن کە لە سەر حەقم، بەڵام کەسیان دەنگیان لێوە نەهات و هیچ هەولێکیان نەدا بۆ وەلانانی ئەو ستەمە لەسەر من. لەم ڕووەوە تۆڵە، جەرگی منی ئاور تێبەرداو منی بەرەو یاخیگەری و دوژمنایەتی برد". (١)

هۆیەکانی هانابردنی هەمزە ئاغای سەرەك هۆزی مەنگوڕیش بۆ لای شێخ عوبەیدوڵلاّ ئەوە بوو کە حاکمی سابڵاغ لە ساڵی( ١٢٩٧ ك ـ ١٨٧٦ز) بە بیانووی ئەوەی کە بەروبوومی ئەو ساڵی زەویدارانی کورد فرەوان بوو، پێی داگرت لەوەی کە دەبێت هەمزە ئاغا و سەرکردەکانی تری موکری نیوەی داهاتی ئەو ساڵیان، بەو بدەن. حاکمی مەهاباد بێجگە لە سەرکردەو زەویدارانی گەورە، خەڵکی ئاسایشی خستە ژێر گوشار و سەرەڕای تالانکردنی سامانیان، گاڵتەی بە بیروباوەڕی ئایینیان دەکرد. نووسەری ئەرمەنی لە بارەی رەفتاری خراپی ئەم شازادە قاجاریە لە ئاست خەڵکی مەهاباد دا دەنووسێ:" میرزا تەقی خانی مونشی حاکمی سابلاّغ لە ساڵانی وشکە ساڵیدا کە لەبەرچاوگرتنی باری گوزەرانی جووتیاران و خەڵکی هەژار لە هەموو شت پێویستتر بوو، کەچی پیاوانی حکومەتیان لە بەیانییەوە تا شەو لەناو بازاڕ بلاّوکردەوە بۆ راوڕووت کردنی خەڵکی.(٢)

وەستانی شێخ لە ئاست ستەمکاری و گەندەڵکاری فەرمانبەران و پیاوانی دەوڵەتی قاجار لە راستیدا یەکەم بزوێنەرو پاڵ پێوەنەری بزاڤی شێخ عوبەیدوڵلاّ بوو و لە نێو هۆکاری جۆراوجۆری دروستکەری راپەڕینی وەك هەڵپەرستی سیاسیی بۆ دامەزراندنی میرنشینی کوردی، دەمارگرژی ئایینی و وروژاندنی عوسمانی و بەریتانیا بایەخێکی پتری هەبوو و پیشاندەری نارەزایی و هەڵسانی چینی زەویداری کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لە بەرانبەر گەشەکردنی و پەرەسەندنی رۆژ بە رۆژ پتری دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتی ئێران و عوسمانی و ستەمکاری سەرانەسەندن بوو. شێخ لە ساڵی راپەڕیندا، دووسەد دێی هەبوو و هاوپەیمانە سەرەکییەکانی ئەو زەویدارە گەورانە بوون کە وەك خۆی لە بەرانبەر گوشاری سەرانە وەرگرانی عوسمانی، بەرژەوەندییەکانیان کەوتبووە مەترسییەوە.

شێخ لە نامەیەکدا بۆ د. کوکران پزیشکی ئەمریکی لە (٢٥ سپتامبر ساڵی ١٨٨٠) بارودۆخی کوردانی لە ئاست فەرمانبەرانی ئێراندا ئاوا شیکردۆتەوە:" بێگومان بیستووتە کە چۆن چەند ساڵ لەمەوبەر ( شوجاع ئەلدەولە) فەرمانی دەرکرد تاکو چەند جووتیارێکی من بکوژن بێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان هەبێ و دوابەدوای ئەو سەد هەزار تومەن زەرەریان پێ گەیاندم.. جگە لەمە هێندەیان لە فەرەج ئەڵلاّخان کوڕی حاجی خانیدا کە یەکێ لە سەرکردەکانی شنۆ بوو، تا گیانی دەرچوو.

ساڵی رابردووش (موعین ئەلدەولە) ئیبراهیم خان و عەبدوڵلاّ خانی گرت و لەم دووانە کە خەڵکی شنۆ بوون بڕی بیست هەزار تومەن وەرگیراو لە ئەنجامدا هەردووکیان ماڵ وێرانبوون و بێجگە لەمە سێ ژنیان لەم خێزانە رفاند..... شیکردنەوەی ئەم هەموو ستەمکارییە کە لە راست ئێمەی کورد ئەنجام دراوە لەم نامەیەدا نانووسرێ... بۆیە تکات لێ دەکەم کە سەرنجی کۆنسولی بەریتانیا لە تەورێز رابکێشی بۆ لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە لە بارودۆخی ناوچەکانی کوردنشین."(٣)

ئەسکەندەر غوریانسیش دەنووسێ کە شێخ لە ڕۆژانی گەمارۆی ورمێ لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ خەلیفە کلوزیل ئوسقوفی کاتولیکەکانی دانیشتووی ئەو شارە، ئاماژەی بە هەندێ لەوانە کرد کە لەگەڵیدا بوون و گوتی:"ئەوانە کە دەبینی هەرکامەیان سەرداروو سەرکردەی هۆزێکی گەورە بوون، هێندەیان دەست درێژی و زۆرداری لەم ساڵەدا لە دەوڵەتی عوسمانی بینیوە، بەو ڕادەیە نابووت و زەلیل بوون و بەوپەڕی بێ هیوایی و نەکبەتی ژیان دەبەنەسەر و دەبێ تۆڵەیان لێ‌بکەمەوە، گشت زانایان و خەلیفەکان کە لە بەردەم شێخ بوون، پشتگیری خۆیان لەم قسانەی شێخ نیشان دا".[٤]

لایەنی نارەزایی ڕاپەڕینەکە بە ڕادەیەك توند بوو کە بە پێی ڕاپۆرتی ئەمیر نیزام گەڕووسی، کە وەزیری بەرژەوەندی گشتی حاکمی ئازەربایجان بوو دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە، تەنانەت عەشیرەی تورك و شیعە مەزهەبی قەراپاپاق لە سەرەتای بڵێسە سەندنی ئاگری ڕاپەڕین بە هەموو حەشیمەتی خۆیانەوە چوونە پاڵ شێخ عوبەیدوڵڵاو بەو شێوەیە نارەزایی خۆیان لە دەوڵەتی ئێران ڕاگەیاند.[٥]

ئەمیر نیزام لە ڕاپۆرتەکانی تری خۆی، لایەنە جۆراوجۆرەکانی دەست درێژی و زۆرداری دیوان سالاری (پیاوانی دەوڵەت) ئازەری و فارسی لە ڕاست کورداندا شی دەکاتەوەو دەسەلمێنێ کە خەڵکی کورد نە تەنیا لە لایەن کاربەدەستانی دەوڵەت لەژێر گوشار دان، بەڵکو لە لایەن زەویدارانی ئازەریشەوە ڕووبەڕووی قین و توندوتیژی دەبنەوەو بەپێی وتەی ئەو:

" نایەکسانی و کوشت و کوشتار و تالانی یەك لەدوای یەکی لە لایەن خەڵکی میاندوئاو و ناوچەکانی دەوروبەری مەراغە و هەندێ لە هۆزەکان بەرانبەر بە دێهاتی موکری ڕوودەدا، بووە هۆی ڕوودانی پشێوی و گرژی نێوان کورد و تورك و ئەو بە ئاشکراو هەندێك جار بە تەوابع ئاماژە بەمە دەکا کە کاربەدەستانی دەوڵەت و دەرەبەگی ئازەربایجان تۆمەتبار دەکا لە سازدانی بارێکی پڕ لە هەڵچوون و نەبوونی ئاسایش لەو ناوچەیە، شا ئاگادار دەکاتەوە کە نەهێڵێ چیتر دەستدرێژی حاکمان و زەویدارانی ئازەری بۆ سەر ماڵ و گیانی کوردانی موکری درێژە بکێشێ تاکو تەناهی لە ناوچەکە سەقامگیر بێ.[٦]

ئەم وتانە نیشان دەری ئەوەن کە شێخ عوبەیدوڵڵا پارێزگاروو بەرگریکارێکی بەتین و گوڕی چینی زەویداری کورد بووە و نابێ لەبیر بکرێ کە یەکێ لە بزوێنەرەکانی تاکە کەسی ئەو لە دژایەتی دەوڵەتی ئێران، سووربوونی کاربەدەستانی ئێرانی بوو بۆ دەست بەسەر داگرتنی موڵکەکان و سەرانەسەندن بوو لە دێهاتە تیولییەکانی.

گەندەڵکاری کاربەدەستانی دەوڵەت و هەبوونی ستەمکاری سەرانەسەندن هێندە ئاشکرابوو کە دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕین و لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ لە لایەن کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەو ئەمیر

نیزامی گروس سەبارەت بە هۆکارەکانی ئەم رووداوە ئەنجام درا، دەوڵەتی ئێرانی گەیشتە ئەم دەرەنجامە کە تەماحکاری کاربەدەستانی دەوڵەت بۆ وەدەست هێنانی دەرامەتی ناشەرعی لە رێگەی راوڕووت کردنی کوردان بووەتە هۆی نارەزابوونیان و هاوکاری کردنیان لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵلا و خەڵکی کوردی ئازەربایجان لە داخی دەردی خۆیان دەگەڵ شێخ کەوتن، هەر بۆیەش دوای هەرەس هێنانی راپەڕین، بەرپرسان بە ناسرەدین شایان راسپارد کە خەڵکی کوردی بەشداربووی راپەڕین سزا نەدرێن کە ئەم سزایە بە "سزای رووڕەش" بەناوبانگ بوو چونکە ئەمە بەمانای سزادانی خەڵکی بێ تاوانی کێشەکەیە و دەبێتە هۆی زیادبوونی بێ سەروبەری و نارەزایی لە ناوچەکە.

لەگەڵ رەچاوکردنی بابەتەکەی سەرەوە دەبێ بگوترێ نەبوونی بەشداری کوردەکانی باکوور لە بەرێوەبردنی خۆی، ستەمکاری لە باج و سەرانەسەندن و بە زۆر خۆسەپاندنی کاربەدەستانی ئازەری و سووربونیان لەسەر راوڕووت کردنی سامانی خەڵکی کورد بووە هۆی ئەوەی کە شێخ عوبەیدوڵلا بە چاکترین شێوە لەم هەلومەرجە کەلك وەرگرێ.

راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلا لەبەر چاوی کوردەکانی ئازەربایجان نارەزایی دەربڕین بوو بە سیاسەتەکانی دەوڵەتی ناوەند و تەورێزو لە راستیدا هۆشیارکردنەوەیەك بوو لە ئاست کردەوەکانی سیستمی قاجاری. ئەم رووداوە هەوێنی جیاوازی نێوان کوردستانی باشوور و کوردستانی باکووری بۆ یەکەم جار لە مێژووی قاجاری نیشان داو سەلماندی کە کوردستانی باکوور ئەم بوارەی هەیە کە ببێتە مەڵبەندی نارەزایی کوردان لە دەوڵەتی ناوەندی ئێران.

بزوێنەرێکی تری راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلا پێوەندی بە ئایینەوە هەبوو و ئەو وەك رابەری یەکێ لە ئاینزایەکانی چوارینەی ئەهلی سوننە، هۆکارێکی فرەی بۆ رووبەرووبوونەوەی لەگەڵ دەوڵەتی شیعەی قاجاری هەبوو و جگە لەمە لەگەڵ ورووژاندنی هەستی کوردانی دەمارگرژ دەیتوانی کۆیان بکاتەوە بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەتی، شێخ بۆ جێبەجێکردنی یاسای ئایینی مکوڕ بوو و لەم بارەیەوە نەك تەنیا لە ئاست شیعیان، بەڵکو بەرانبەر بە سوڵتانی عوسمانیش ناقایل بوو و رەفتاری ئەوی بە پێچەوانەی ئایینی ئیسلام لە قەڵەم دەدا. خالفین دەنووسێ: کە شێخ لە چاوپێکەوتنی موفتی شاری وان کە وەك نوێنەری سوڵتان بۆ دیداری شێخ هاتبوو، بێزاری خۆی لە لاساری کاربەدەستانی تورك لە ئاست شەریعەتی ئیسلام راگەیاند و سوڵتانی عوسمانی تۆمەتبارکرد بەوەی کە ئاگای لە کردەوەی ژێردەستانی خۆی نییە.(٧)

دانەری نامەی راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلا رای ئەوەیە کە بۆچوونی ئایینی شێخ ئامرازێك بوو بۆ وەدەست هێنانی دەسەڵات و بەرفرەکردنی دەستڕۆیی خۆی لە نێو خەڵکی و هۆزی کورددا.

ئەو لەم بارەیەوە دەنووسێت:"شێخ عوبەیدوڵڵا هەندێك جار كەسێكی لە تەنیشت گلكۆی شێخ تەها دامەزراندبوو كە بە جلی سپی لە بەرانبەر گۆڕی باوكی دادەنیشت و پرسیاری دەكرد و وەڵامی دەداوەو بۆ ورووژاندنی خەڵكی ڕەش و رووت دەیگوت، شێخ تەها دەڵێ دەبێ ڕاپەڕی و هۆزەكان كۆبكەیتەوە و لە ئێران ببی بە خاوەن تاج و تەخت و ڕافزییەكان لە ڕەگ و ریشەوە هەڵقەنی و ڕێبازی هەق بگریە پێش و حوكمی خواو پێغەمبەر بەجێ بگەیەنێ، ئینجا ڕاگەیەندراوێكی جیهادی نووسی و لە سەرانسەری وڵات بڵاوی كردەوە كە: " شێخی پێشوو زارەكی بە كوشت و كوشتاری ڕافزییەكان ڕەزامەندەو خوێن و ماڵیانی حەلال كردوەو مزگێنی حكوومەت و بەهەشتی پێ داون".[8]

دانەری نامەی شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵا لە دواییدا وا لێك دەداتەوە كە بەكارهێنانی ئایین لە لایەن شێخەوە بۆ ئەوە بووە كە وەك "سەفەویان و ئیسماعیلی ڕەحمەتی بەرماڵ و تەزبێحی بە تەختی شایەتی گۆڕیەوەو دەهۆڵی دەسپێكی سەڵتەنەتی كوتا".[9] بەڵام دژە شیعەیی بوونی شێخ تەنیا لە خزمەت هەڵپەرستی ئەو دانەبوو و سەرەڕای ئەوەی كە ڕەخنەی لە بابی عالی هەبوو، لە بەر پشتبەستنی بە عوسمانی بە درێژایی ڕاپەڕین لە دەمارگرژی ئایینی كوردان بۆ وەدەست هێنانی هەندێ جیاوگ لە دەوڵەتی ئێرانی لە بەرژەوەندی عوسمانیان كەڵكی وەرگرت.

ئیبراهیم سەفائی بەپێی بەڵگەكانی وەزارەتی دەرەوە نیشان دەدا كە بێجگە لە پیاوانی دەوڵەت و سوپایی عوسمانی شێخ عوبەیدوڵڵا لە پشتیوانی شێخ ئەبولهودا مەلای دەستڕۆی كۆشكی عوسمانیش بەهرەمەند بوو و هەر ئەم خاڵە دەسەلمێنێ كە دژە شیعەیی ئەو بە دڵی ئەوان بووە و پشتیوانیان لێ كردووە.[10]

وردبوونەوە لە ناوەڕۆكی ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵا ئەوە نیشان دەدا كە ڕزگاربوونی كۆمەڵگەی سوننی لە سەرپەرشتیاری حكوومەتێكی شیعی لە دیدوبۆچوونی شێخ بایەخێكی زۆری هەبوو و ئامانج و نیازی سەرەكی ڕاپەڕین بنیاتنانی میرنشینی كوردی سەربە عوسمانی لەسەر دوو بنچینەی بنەڕەتی ئایین و نەتەوەی كوردی پێكهاتووە.

ئەمە بە مانای ئەوەبوو كە لە دیدی ڕابەرایەتی ڕاپەڕین، ئایین لە سەرووی نەتەوەی كوردە، بەڵام ئایا كوردانی ئازەربایجانیش هەر هەمان بۆچوونیان سەبارەت بە پێگەی ئایین لەم ڕووداوە هەبووە؟

ئاشكرایە لە دیدی ئەوان تەنیا ئایین گرنگ بووەو نەتەوایەتی كورد هیچ جێگایەكی لە ئاسۆی هزری ئەوان نەبووەو، هەر لەبەر ئەوەش بوو لایەنی ئایینی ڕاپەڕین لایەنی نەتەوەیی خستە ژێر تیشكی خۆی و ناوەڕۆكێكی نەتەوایەتی ئایینی بە كێشەكە بەخشی. ڕاستە شێخ لە كۆنگرەی یەكەمی سەركردەكانی

کورد لە شەمدینان مەخسەدیان راپەڕین لە دژی عوسمانی بوو، بەڵام ئەم بزووتنەوەی ئەو بە مانای پچڕانی گشت داوەکانی پێوەندی نێوان کورد و تورك نەبوو، بەڵکو بۆ جێبەجێکردنی هەندێ چاکسازی و بەخشینی هەندێ ماف بە کوردان لەسەر دەستی بابی عالی. شێخ لە ساڵانی بەرلە راپەڕین ئەو کاتی کە تازە تووشی ناکۆکی بوو لەگەڵ دەوڵەتی ئێران لەسەر موڵك و میراتی شێخ تەها، لە پشتیوانی هەمە لایەنەی دەوڵەتی عوسمانی بەهرەمەند بوو و مسۆگەر بوو کە میرنشینیە داهاتووەکەی لە زۆر بوارەوە دەکەوتە ژێر پشتیوانی و چاودێری بابی عالی و شێخیش ئەم رۆڵ دیتنەی تورکانی لەم بارەیەوە قبووڵ بوو. ئیبراهیم سەفائی بە پشتبەستن بە بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوە لەم بارەیەوە دەنووسێ:"شێخ عوبەیدوڵڵا بەرلە هێرش بۆ سنوورەکانی ئازەربایجانی رۆژئاوا پێشنیارێکی بەهۆی دەوڵەتی عوسمانی بۆ دەوڵەتی ئێرانی هەنارد کە بریتیی بوو لە:

١ـ کوردستان حوکمڕانی خۆجێیی هەبێ.
٢ـ بەشێك لە سەرانەی کوردستان بۆ خەڵك بەکاربهێندرێ.
٣ـ سەربازی کوردستان لە کوردستان خزمەت بکاو و لە کاتی پێویست بە رەزامەندی دەوڵەتی ئێران یارمەتی دەوڵەتی عوسمانی بدا.
٤ـ هاموشۆی نێوان کوردستان و خەڵکی عوسمانی ئازاد و بێ پاسپۆرت بێ.[١١]

مێژوونووسی کورد د. بلەچ شێرکۆ سەربە بنەماڵەی بەدرخان لە بارەی دوا ئامانجی شێخ و رۆڵی حکوومەتی عوسمانی لە راپەڕینی ئەودا دەنووسێ: " لە ساڵی (١٨٨٠) شێخ عوبەیدوڵڵا لە ناوچەی شەمدینان راپەڕینێکی گەورەی ساز کردووە.

ئەو داواکاری سەربەخۆیی نێوخۆیی کوردستان لەژێر چاودێری تورکان دا بوو".[١٢] مینۆرسکیش بڕوای وایە راپەڕینی ساڵی ١٨٨٠ (لە راپەڕینەکانی تری کوردان) جیاوازە و ئامانجی وەدەست هێنانی سەربەخۆیی بوو.[١٣]

هەڵبەت شێخ هێندە هەڵپەرست بوو کە خۆی هەڵگرتبوو ببێ بە گەورەی میرنشینیەکە و لە راپۆرتیی حاکمی سابڵاغ بۆ وەزارەتی دەرەوە ئاماژە بە ئامانجە هەڵپەرستانەکانی دەکا.[١٤] هەرچەندە غوریانسی ئەرمەنی بە ئاشکرا باس لە ئامانجەکانی شێخ ناکا، بەڵام لەم لاو ئەولا ئاماژە بەقسەکانی ئەو سەبارەت بە دامەزراندنی دەوڵەت، هەرێم گرتن، لەناوبردنی ستەمی عەجەمان، چاندنی نەمامی ئازادی و داگیرکردنی ئێران و توران و رای وایە کە توانایی و کەرەستەی شێخ بۆ پێکهێنانی سیستمی پاشایەتی لە کوردستان لە کورتیدایە.[١٥]

له چاوپێخشاندنێکی گشتی له بارەی ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینی، دەبێ بگوترێ کە دوای دەستپێکردنی لایەنی ئایینی و جیهادی دژە شیعەیی بۆ گشت خەڵکی کورد ماناو بایەخی پتری هەبوو له لایەنه ناڕەزاییه نەتەوایەتییەکەی و خەڵکی کورد له جیاتی ئاشنایی و ناسینی ئامانجی بنەڕەتی شێخ، واته بنیاتنانی میرنشینی کورد، کەوته ژێر کاریگەری دروشمی بێلایەنی ئایینی ڕاپەڕین و بانگەشەی جیهادی زانایانی توندڕەوی سوننەی وەك ئیمام و خەتیبی مزگەوتی مەهاباد و ئەمە ئەو شتەبوو کە بزووتنەوەکەی له شێوازی نەتەوایەتی دەرهێنا کە بەریتانیا و عوسمانی پلانیان بۆ دارشتبوو.

بە خەستتر بوونی ڕەنگی لایەنی ئایینی ڕاپەڕین، ئیتر نەدەکرا کە ئەم دیاردەیه بە بزاڤێکی ڕامیاری له قەڵەم بدرێ، چونکه هێزی کۆمەڵایەتی پشتیوانی ئەو تەنیا ئاین بە شێوەیەکی کاریگەری دەبزواند و له کۆتاییدا ناوەڕۆکی سەربەخۆخوازانەی نەتەوەیی ئایینی دەگرتە خۆ.

مێژوونووسانی ڕۆژئاوا وەك مینورسکی، باسیل نیکتین و کریس کۆچیرا هەوڵ دەدەن بسەلمێنن کە شێخ عوبەیدوڵڵا باوکی ناسیۆنالیزمی کوردە له ئێران، بەڵام هیچ بەڵگەیەك له دەست نییه کە شێخ بەرگری کردبێ له کولتوورو زمانی کوردی، بە واتایەکی تر ئەو لەگەڵ پاراستنی بیروبڕواکانی له ئاست دەوڵەتی عوسمانی خوازیاری پچڕان و جیاکردنەوەی کوردستانی ئێران لەژێر نیزامی شیعی قاجاریدابوو و ناڕەزایی و کارەکانی ئەو بووە هۆی کەلێنێکی قووڵ له نێوان کوردی سوننه و ئازەری شیعە.

ئەگەر ڕاپەڕین پشتی بە بنچینەی جیاوازییەکانی مێژوویی نەتەوەیی و زمانی کوردەکان و ئێرانییەکان و تورکەکان دەبەست و پشتی بە بابی عالی گەرم نەدەکرد، ئەوا قبووڵی ئەم وتەیە ئاسانتر دەبوو کە شێخ له دامەزرێنەرانی ناسیۆنالیزمی کوردە.

له لایەکی تر دەبێ بزاندرێ کە تەقەلای شێخ بۆ دابڕینی کوردستان له زەمینەیەکی سیاسیی - کۆمەڵایەتی پتەو و بەرفرەوان دانەمەزرابوو و بەشە هەرە زۆرەکەی ناوچەکانی کوردنشینی ئێران پشتیوانیان لەم هەنگاوە نەکرد. ئەگەر دەبینن کە شێخ توانی له سەرەتای کار، کۆمەڵێك گوێگری دەسترۆی وەك هەمزە ئاغای پەیدا کرد، ئەوا بە هۆی هەڵەکانی دەوڵەتی ئێران بوو کە له جیاتی سوودوەرگرتن له توخمی کوردی بۆ بەڕێوەبەرایەتی ڕۆژئاوای ئازەربایجان، تەنیا له تورك سوودی وەردەگرت و چونکه ئەوان هیچ ڕێزیکیان بۆ هەست و نەست و بڕوا ئایینەکانی کورد دانەدەناو بە چاوی یەکسانی مامەڵەیان لەگەڵ نەدەکردن، هەڵبەت بوار بۆ ڕاپەڕین و یاخیگەری هۆزە دلێرەکانی کورد دەرەخسێ و ئەگەر له هەلومەرجێکی گونجاودا، کوردی ئازەربایجانی وەك خەڵکی کوردستانی باشوور له چارەنووسی خۆیاندا بەشداربن، بێگومان له ئاست دەوڵەتی ئێرانیدا وەفاداردەبوون.

مێژوونووس و کوردناسی بەناوبانگی رووسی لازاریف کە دێت و لە راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ و ناوەڕۆکی راپەڕینەکە ورد دەبێتەوەو هەڵیدەسەنگێنێ رای دەردەبڕێ کە: " هۆکاری بنەڕەتی بە ئاکام نەگەیشتنی راپەڕینی کوردان لە سەدەی نۆزدەهەم ئەوە بوو کە ئەم راپەڕینانە لەسەر بناغەیەکی رامیاری ـ کۆمەلاّیەتی ـ ئابووری دانەدەمەزران ئەم هۆکارانە لە مەرجە بنچینەییەکانی سەرکەوتنی هەر راپەڕینێ دەژمێردرێن و نەبوونی ئەم هەلومەرجە دەبێتە هۆی ئەوەی کە کوردەکان نەتوانن لە دەوروبەری بیروڕایەکی ناسیۆنالیستی گرد ببنەوەو یەك بگرن".(١٦)

بەم شێوەیە دەرکەوت کە هەستی نەتەوایەتی کوردی لەم قۆناغەدا هیچ رۆڵێکی لە سازبوونی راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ نەبینی، چونکە ئەوکاتی هێشتا دیاردەیەکی ئاوایی نەخولڤابوو. هەوڵەکانی شێخ عوبەیدوڵلاّ لە راستای پچڕاندنی کوردستانی ئێران ئەوە دەسەلمێنێ کە فیوداڵی کوردی عوسمانی بۆ سوودوەرگرتن لە بێهێزی دەوڵەتی ئێران و ورووژاندنی عوسمانی و بەریتانیا بۆ دامەزراندنی میرنشینی کوردی لەژێر پارێزگاری بابی عالی و نیشاندەری نارەزایی کوردانی باکوور لە ئاست سیاسەتەکانی دەوڵەتی ناوەند بوو. راپەڕینی شێخ دەسکەوتێکی تایبەتی لە بواری سیاسیی وەدەست نەهێنا. بەلاّم لە توندکردنی دوژمنایەتی ئاینزایی لە نێوان کورد و تورك و دروستکردنی کەلێن لە نێوان شیعە و سوننە لە ئازەربایجان کاریگەربوو و لە راستیدا بواری بۆ خۆتێهەڵقورتاندنی عوسمانی رەخساند کە دەست لە کاروباری کوردی باکوور و راپەڕینی سمکۆ وەر بدا.

# دەرەنجام

لەوەی کە گوترا بۆمان دەرکەوت کە بنەماڵەی ئەردەلان بۆ خۆپارێزی لە دەست درێژییەکانی دەوڵەتی عوسمانی و  راوەستان بەرانبەر بە بابان کە بەتەمای بەرفرەکردنی قەلەمڕەوی ژێر دەسەڵاتییان بوون، خۆیان لە دەوڵەتی سەفەوی نزیککردەوە سەرەڕای جیاوازی ئاینزای هەردوولا، دڵبەندی کوردان لە راست کولتوورو شارستانیەتی ئێرانی، زەماوەندە سیاسییەکانی لەگەڵ شازادەکانی قاجاری، و ناکۆکی ناوخۆیی نێوان ئەندامانی خێزانی ئەردەلان هەلومەرجێکی لە باری رەخساند بۆ ئەوەی قاجارەکان دەست بخەنە نێو کوردستان. فەرمانڕەوایی میراتبەری و چەند سەدساڵەی ئەردەلانەکان لە کوردستان نەیتواتی کولتوورێکی کوردی جیاواز لە کولتووری ئێرانی، ساز بکا بۆیەش لادانی حوکمڕانانی ئەم بنەماڵەیە بەهۆی ناسرەدین شای قاجار لە ناوەڕاستی حکوومەتەکەی نەبووە هۆی نارەزایی دەربڕینی کوردان و ئەوان بە چاکی ملکەچی حوکمڕانانی بیانی دەبوون. لە ئازەربایجانیش بنەماڵەی موکری بۆ ئەوەی پشکدار بێ لە دەسەڵات و چونکە پێویستی بە پشتیوانی سەرچاوەیەکی بیانی هەبوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی لە بەرانبەر نەیارانی خۆجێی، بەرەو دەوڵەتی قاجار هەڵکشاو بەم شێوەیە رێگەیەکی بۆ دەزگای قاجاری کردەوە شێوەی جووڵانەوەو مامەڵەی دەوڵەتی ئێران لەگەڵ بنەماڵەکانی ئەردەلان موکری ئەوە دەسەلمێنێ کە لە ئێرانی سەدەی نۆزدەهەم هیچ لەمپەرێك لەسەر رێگەی پشکداری کوردان لە دەسەڵاتدا لە ئارادانەبوو و دەوڵەتی قاجار بە ئەندازەی پێویست گیانی لێبوردن و گونجاندنی هەبوو لە راست گەلانی ئێرانی. لەگەڵ ئەوەش قاجارەکان هاوتەریب لەگەڵ رۆحی لێبوردن، سیاسەتی بە"ناوەندکردنی"یان درێژەپێدا و ئەم راستییە لەگەڵ زەماوەندی سیاسیی و پێوەندی بنەماڵەی پاشایەتی و بنەماڵە دەستڕۆکانی کورد لە خاڵە پۆزەتیڤەکانی ئاوڕدانەوەی دەوڵەتی قاجاری بۆ دابینکردن و مەحکوم کردنی یەکگرتوویی میللی ئێران دەژمێردرێ و لە چەشنی خۆیدا سیاسەتێکی سەرکەوتوو بووە. بەڵام فەرمانڕەوایی ئێران لەم بارەیەوە هەندێ خاڵی لاوازو هەڵەشی هەبوو کە لەوانە دانانی کاربەدەستانی بیانی و ستەمکار بۆ سەرانەسەندن لەبەشی کوردنشینی ئازەربایجان دا بوو، کە هەڵبەت شێوازێکی بەردەوام و هەمیشەیی نەبوو بەڵام بەهەرحاڵ زەمینەیەکی لە باری بۆ راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵا ئامادەکرد لە بارەی ناوەڕۆکی راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵا دەبێ بگوترێ کە راپەڕین بە پلەی یەکەم لە ئەنجامی توندی سەرانەسەندن و گوشار و ئازاری کاربەدەستانی ئێرانی بەرانبەر بە کوردانی ئازەربایجان و لە دواییدا دەمارگرژی ئایینی، پلەپەرستی و هاندانی عوسمانی و بەریتانیا بۆ بەدیهێنانی ئەم بابەتە کاریگەر بوو.

بەریتانیا و عوسمانی سەرکەوتن لەوەی کە نەهێڵن راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ لە خاکی عوسمانی سەربگرێ و ئەویان گواستەوە بۆ خاکی ئێران. هۆکارەکانی شکست و نەهامەتی راپەڕینی شێخ رەگ و ریشەی دەگەڕایەوە بۆ نەبوونی یەکگرتوویی و یەك پارچەیی هۆزەکان و نائاگاییان لە ئامانجی شێخ، شێوەی ئاین بەخۆوەگرتنی راپەڕین و هاوکاری نەکردنی خەلکی ویلایەتی کوردستان لەگەڵ راپەڕیوەکان.

خالّی گرنگ ئەوەیە کە ئەم راپەڕینە یارمەتی نەدا لە دروستبوونی هەستی ناسیۆنالیستی و بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری رامیاری کوردان لە دژی ئێران و هەستی ئایینی ئەوان، ئەویش تەنها لە ئازەربایجان، توندترکرد بە تێکڕایی ناوەڕۆکی راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ لە چوارچێوەی راپەڕینێك کە خۆی سەربەخۆخوازانەی نەتەوەیی ئایینی هەبووە جێی خۆیەتی کە لێی بکۆڵدرێتەوە.

ئەوەی کە زەمینەی پێویستی بۆ راپەڕینی شێخ لە ئازەربایجان سازکردبوو، پێوەندی بەوە هەبوو کە هەست و نەستی کوردانی ئازەربایجان و خەلکی کوردستان لێك جیاواز بوون کە ئەمە یەکێ لە تایبەتمەندی کۆمەلگەی کوردی ئێرانی ئەوسا بوو. لە ئازەربایجان کوردەکان لە سۆنگەی جیاوازی لە زمان لەگەڵ ئازەرییەکان و هەبوونی دەمارگرژی توندی ئایینی نێوان شیعە و سوننە، بێبەشبوونیان لە دەسەلاّتدا، بە تایبەتی لە کۆتایی چاخی قاجارەکان، وروژاندنی عوسمانی و بەرە بەرە سست بوونی دەوڵەتی ناوەندی، وای کرد راپەڕین بەرانبەر بە دەوڵەتی ئێران قوت ببێتەوە و پێوەندی توندو تۆڵی خەلکی ئەم ناوە لەگەڵ کۆمەلگەی کوردانی عوسمانی ئەم حالّەتەی بەرچاوتر دەکرد.

بەلاّم لە ویلایەتی کوردستان لەبەر بەڕێوەبردنی ناوچەکە بەدەست خودی کوردان و بەشدارییان لە دەسەلاّت، دراوسێیەتیان لەگەڵ کوردانی شیعە کە دەمارگرژی ئەوان زۆر لە هی تورکانی ئازەربایجان کەمتر بوو و هەروەها پێشکەوتووتر بوونی پێوەندییە ئابوورییەکان لە کوردستانی باشوور و گەشەکردنی زەویداری و پێوەندی بەربلاّوی بازرگانی و دراوی لەگەڵ ناوەندی ئێران جۆرە هەستێکی وەفاداری و هاوکاری لەگەڵ نەتەوەکانی تری ئێرانی لە ئارادابوو کە بووە هۆی لایەنگری خەلکی ئەم ویلایەتە بۆ زمانی فارسی و کولتووری ئێرانی. بە شێوەیەکی گشتی دەبێ بگوترێ کە کۆمەلگەی کوردی ئێران لە سەردەمی قاجار پێکهاتەیەکی یەك پارچەی نەبوو و بەشی باشووری لە زۆربەی بوارەکان لە کولتووری کۆمەلگە و دەوڵەتی ئێران نزیکتر بوو تابەشی باکوور.

# بەشی دووەم

## بارودۆخی رامیاری ناوچە کوردییەکانی ئێران لە راپەڕینی ((شێخ عوبەیدوڵڵا))وە تا شۆڕشی سمکۆ

## دەروازە

لەم بەشەدا هەوڵمان داوە کە لەو ئالوگۆڕ و رووداوانەی کە دوای راپەڕینەکەی شێخ عوبەیدوڵلاّ لە کوردستاندا روویان داوە بکۆڵینەوە، دنەدانی دەوڵەتی عوسمانی لە نێو کوردەکانی ئازەربایجاندا بۆ بەدەسهێنانی جیاوگی ئەرزی لە ئێران، شۆڕشی دەستووری لە ئێران و هەڵوێستی کوردەکان لە ئاست ئەو رووداوە دا، دەرکەوتنی ناسیۆنالیزمی کوردی لە دەوڵەتی عوسمانیدا، هەڵایسانی جەنگی جیهانی یەکەم و پەرچەکرداری جیاوازی کوردەکانی باشوور و باکوور لەبەرانبەر بانگەوازی جیهادی عوسمانیو ئەنجامەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی نێوان رووس و عوسمانی کە کوردستانی باکووری کرد بە یەکێك لە مەیدانە سەرەکییەکانی شەڕ، لەو بابەتانەن کە لەو بەشەدا تاوتوێیان دەکەین. ئەو باسانەش رێگە بۆ ناسینی فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی راپەڕینەکەی سمکۆ لە باکووری کوردستانی ئێراندا خۆش دەکەن.

# زەمینەی پشێوی هۆزەکانی کورد لە ئازەربایجاندا

سەردەمی دوای راپەڕینی شێخ عوبەیدوللاّ بۆ کوردی ئێران بە مانای دەسپێکی سەردەمێکی نویّ نەبوو و لە سۆنگەی بەرفرەوان نەبوونی سنوورەکانی راپەڕین، نزیکەی زۆرینەی کۆمەڵگەی کوردی لە ئاست ئەودا کاردانەوەیەکی نێگەتیڤیان هەبوو و بێجگە لەمە لەبەر گەشە نەکردنی پێوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کوردستانی باکوور، پیّ بە پیّ لە ناوچەکانی تری ئێران، کاریگەری رامیاری ئەم رووداوە بێجگە لە لایەنە ئایینییەکەی، زۆر کەم بوو. لەم سەردەمەدا دەوڵەتی ئێران تا رادەیەك هەستی بە هەڵەی خۆی کردبوو و هەوڵی دەدا وەك رابردوو سوود لە کارمەندی کوردی وەربگریّ بۆ بەڕێوەبردنی بەشە کوردییەکەی ئازەربایجان و دانانی ئەمیر نیزام گروسی وەك کوردێك بۆ حکوومەتی ئەم ناوچەیە دوای کۆتایی هاتنی گێرەشوێنییەکەی شێخ و دانانی (سەیفەدین خانی موکری) لە نەوەکانی عەزیز خانی سەردار بۆ حکوومەتی سابلاّغ و بۆکان، نیشانەی گۆڕینی سیاسەتیان بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا گەندەڵی و ستەمکاری باج سەندن هەروەکو جاران بەرچاو بوو و کۆمەڵە هۆکارێك کە ببووە ناقایلی کوردی ئازەربایجان لە دەوڵەتی ناوەند و تورکی ئازەری وەکو خۆی هەرمابوو و بە شێوەی یەکیّ لە هۆکارەکانی جیاوازی هەلکەوتی کوردی باکوور لە کوردی باشوور خۆی دەنوێنیّ. لە ساڵی ١٨٨٧ز، ١٣٠٤ ك. کاتیّ کە هۆزەکانی ناوچەی سەردەشت لەگەڵ ئەمیر جهانسوز حاکمی ورمیّ لەسەر مەبلەغی سەرانە تێك ئالان، (عزەتوللاّ خان) حاکمی ئەویّ لە ترس هێرش هۆزی بەگ زادە بۆ سابلاّغ هەلات. هۆزی ناوبراو، (سەیفەدین خانی موکری) ئاگادار کردەوە کە ئەو سەرانەی کە حاکمی سەردەشت لێی سەندوون، لەسەر بنەمای یاسا نییە، بۆیە میری موکری ئەوی لە کار لاداو بە پێی نووسینی خالفین فەرمانبەرێکی لێهاتووی کورد بەناوی ئەحمەد بەگی موکری لە باتی ئەو بۆ حکوومەتی سەردەشت دامەزرا.[١]

(سەیفەدین خان) حاکمێك بوو کە خەڵکی کورد خۆشیان دەویست و لە سەردەمی ئەو ئارامی لە ناوچەی موکریان دابینکراو هۆزەکان ملکەچی دەوڵەتی ناوەندبوون، کۆرزن لە بارەی ئەم حاکمەی کورد دەنووسیّ:" سابلاّغ کە ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی پازدە هەزار کەسە، پایتەختی کوردی ئازەربایجانە، حاکمێکی کورد لەوێدا فەرمانڕەوایی دەکا (ئەو سەربە والی

تەورێزە) خاوەنی ئەم پلەیە ئێستا (سەیفەدین خان) پیاوێکی چاك پەروەردە کراوە لەگەڵ هەندێ شارەزایی لە زمانی فەرەنسیدا".[٢]

خالفین سەردەمی حکوومەتی سەیفەدین خانی موکری لە دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بە سەردەمێکی پڕ لە ئارامی و گوێڕایەڵی کوردی ئێران بە تایبەتی لە ئازەربایجان دەزانێ و بە راشکاوی رادەگەیەنێ کە ناڕەزایی زەق و بەرچاو لەم سەردەمەدا لە ئارادا نەبووە.[٣]

هەنووکە دەبێ ببینین کە ئەم ئارامی و تەناهییە لە چییەوە هاتووە؟ ئەم بارە بە پلەی یەکەم لە ئەنجامی سەرکوتکردنی سەرکردەکان و سەرەك خێڵەکان لە رەوەندی راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ و زیاتربوونی چاودێری دەوڵەتی ناوەندی لە موکریان بوو. جگە لەمە بۆشایی رابەرێکی ئایینی و دەستڕۆ لە نێو خەڵکی زۆر بە خەستی هەست پێ دەکرا و دوای شێخ عوبەیدوڵلاّ کەسێك نەبوو کە بتوانێ وەك ئەو موریدانی تەریقەتی نەقشبەندی کۆبکاتەوە. ئەمەش یەکێ لە هۆکارەکانی ئارامی کوردەکان بوو. بەڵام هۆکاری سەرەکی دەگەڕایەوە بۆ پێداچوونەوەی دەوڵەتی ناوەند لە دامەزراندنی فەرمانبەرانی ئازەری لە بەشی کوردی ئازەربایجان و بە مسۆگەری گەڕاندنەوەی دەسەڵات و ئیعتباری پێشووی بنەماڵەی موکریان لە بەڕێوەبردنی ناوچەی سابلاّغ، واتە دڵی موکریان لە سەقامگیری بارودۆخ زۆر کاریگەر بوو و واپێدەچوو کە دەوڵەتی ئێران دووبارە توانیویەتی زەمینەی نائارامی و ناڕەزایی لە ناوچەکانی کوردی لە نێو بباو دەسەڵات و ئابڕوی خۆی لەوێدا دووبارە پەیدا بکا.

بەڵام ئەم ئامادەبیانە بۆ پاراستنی تەناهی لە کوردستانی ئازەربایجان بە بەردەوامی کاریگەر نەبوو و لە سەرەتای سەدەی بیستەم شاهیدی یاخیگەری گروپێکی تایبەت لە هۆزەکانین، ئەو هۆزانەی کە جێ نشینگە و ژینگەی ئەوان زۆر نزیك سنوری عوسمانی بوو، ئەو هۆزە جۆربەجۆرانەی کە نزیکەی نیو سەدە لەو دیو سنوری ئێران و لە ناو خاکی عوسمانی دەیانبردەسەر. یاخیگەری و هەڵچوونی ئەم دەستە هۆزە کە هاوتەریب لەگەڵ لاوازی دەوڵەتەکانی قاجار رەهەندی بەربلاّوی پەیدا دەکرد، پاڵنەر و هۆکارێکی دەرەکی هەبوو و کە لە بنەڕەتدا بۆ ناکۆکییەکانی سنووری ئێران و عوسمانی دەگەڕایەوە.تورك بۆ وەدەست هێنانی خاکی پتر، هۆزگەلی نزیك بە سنوری هان دەدا کە یاخیگەری بنوێنن.و ئەو قەیرانەی کە لەم هەلومەرجە دروست بوو نزیکەی بیست و پێنج ساڵ درێژەی خایاند و نموونەی زەقی ئەو راپەڕینی سمکۆیە کە سەرەڕای بەشداری پتری هۆزەکانی موکری، جڵەوی کارو رابەرایەتی یاخیگەرانی بێزار لە ناوەند لەدەست هۆزی سەر سنووری شکاکدا بوو.

پێشینەی ناکۆکییەکانی سنووری ئێران و عوسمانی بۆ سەردەمی سەفەویان دەگەڕێتەوەو لە سەردەمی قاجاریش کێشەکەیان یەکلا نەکرابۆوە. لەژێر تیشکی ئەم ناکۆکییانە بوو کە هۆزەکانی نیشتەجێ بە درێژایی سنووری هەردوو دەوڵەت، بایەخێکی پترییان وەدەست هێنا، چونکە هەرکامەو لەو وڵاتانە هەوڵیان دەدا سەرنجی سەرەك هۆزە جۆربەجۆرەکانی ئەم خێڵانە بۆلای خۆیان رابکێشن و لە هێزی سوپایی ئەوان لە دژی دراوسێی خۆیان کەڵك وەربگرن. لە بەرانبەردا، هۆزەکانیش هەوڵیان دەدا بە کەڵك وەرگرتن لە دوژمنایەتی ئێران و عوسمانی بە هیچ کامەیان سەرانە و سەربازی بنیچە نەدەن و بەم جۆرە شێوەی ژیانی کۆنی خۆیان بپارێزن و ملکەچی یاسای دەوڵەتان نەبن.

نادیاربوونی سنوورەکان ئەم حاڵەتەی توند دەکرد و کۆمەڵێك ئەنجامی لێ دەکەوتەوە کە کرزن بەم شێوەیە دەیهێنێتە بەرچاو:"لە ئەنجامی ئەوەی هەر بنەماڵەیەك رەگەزنامەیەکی تێکەڵی هەردوو وڵاتی هەبوو و کێشەی سنووریش یەکلا نەکرابۆوە، ناکۆکی نێوان ئێران و عوسمانی سەرلەنوێ دەست پێدەکاتەوە، کوردەکان لە هەر دوولای سنوور خانوو و ماڵیان هەیە و هەرکات کە بیانەوێ یا مەبەستیان بێ بۆ کاروکاسبی یاخود ئەگەر لە خاکی یەکێ لە وڵاتەکان تاوانێکییان ئەنجام دەدا، ئەوا لە ترسی سزادانیان، بۆ خاکی وڵاتەکەی دیکەی هەڵدەهاتن و گشت رێ و رەسمی سەندنی باج و سەربازی یا گرتنی تاوانباران، پووچ دەبۆوە، چونکە زۆر بە خێرایی دەیانتوانی بۆ ئەو دیو کۆچ بکەن..."(٤)

نووسەری پەرتووکی (مسائل مرزی ایران و عراق) یش لە بارەی هەڵکەوتی هۆزەکان لە پێوەندی ئێران و عوسمانی دەنووسێ:" لەم سەردەمەدا ناکۆکی نێوان ئێران و عوسمانی چەند شێوازێکی گشتی هەبوو. لەوانە بەریەککەوتنی هۆزەکان و تیرەکانی سەرسنوور و پشتیوانی شازادەکانی ئێرانی لە هەندێ لەم سەرکردانە، پەنابەربوونی حاکمانی شارەکانی دەوروبەر (کە زۆربەی کات دەوڵەتی ئێران بەپێی بەرژەوەندی خۆی دایمەزراندبوون) بۆ کۆشکی ئێران و خراپ مامەڵەکردنی عوسمانیان لەگەڵ زیارەتکەرو موسافیرانی ئێرانی و هەروەها بەخشینی پەنابەرێتی بە شازادەی ئێرانی هەڵاتوو لەدەست کۆشکی دەربار کە زۆربەی وەخت لە شارەکانی دەوروبەر دژی دەوڵەت چالاکییان دەنواند".(٥)

دەبێ خاڵێك بۆسەر ئەم بابەتە زێدەبکرێ و ئەویش بەستراوەیی ئابووری و بژێوی هۆزەکانی سەرسنوور بوو بە یاساکانی دەوڵەتی عوسمانی، چونکە هەر هۆزێك ماوەیەکی لە نێوخاکی ئەو وڵاتە دا دەبردەسەر، چونکە بەپێی رێککەوتننامەی ئەرزەڕۆمی یەکەم کە لە ساڵی (١٢٣٨ )ك

(١٨٢٣)ز بەسترابوو هەڵکەوتی خێڵ و هۆزەکانی دوو وڵاتی بە چاکی روون نەکردبۆوە بڕیاردرا کە ئەگەر سەبارەت بە کوێستان و گەرمیان کردنی ئەم هۆزانە، ناکۆکییەك هاتە ئارا، نوێنەرانی هەردوو دەوڵەت بە وتووێژ یەکلای بکەنەوە، چونکە هەردوو وڵات بۆ لاوازکردنی یەکتری هۆزەکانی لای بەرانبەریان بە بەڵێن و وادەی جۆربەجۆر بۆلای خۆیان رادەکێشاو هانیان دەدان کە وڵاتەکەی بەرانبەر بەجێ بهێڵن بۆیە بڕیاردرا کە لەمەو دوا" ئەو هۆز و خێڵانەی کە لە عوسمانییەوە بۆ ئێران یا لە ئێران بۆ عوسمانی تێدەپەڕن وەرنەگیرێن و پشتیان نەگرن".[٦]

بەم جۆرە کێشەی گەرمیان و کوێستانی هۆزەکان یەکلا نەکراوە بەڵام لە رێککەوتننامەی (١٦ی جەمادی دووەم ١٢٦٣ك) (١٨٤٢ز) نێوان محەممەد شاو سوڵتان عەبدولحەمید هەوڵ درا کە بە لایەنی کەمی رەگەزنامەی هۆزەکان یەکلا بکرێتەوەو لە سنوور بازگەی سوپایی دابمەزرێنن و ئەو هۆزانەی کە رەگەزنامەیان دیارە بە زۆرەکی لە ناوچەی خۆی نیشتەجێ بکرێن و ئەو هۆزانەی کە رەگەزنامەیان نییە با بۆ خۆیان سەرپشك بن لە هەڵبژاردنی رەگەزنامە.[٧]

بەڵام عوسمانییەکان نە تەنیا بەپێی ئەم رێککەوتننامەیە نەجووڵانەوە، بەڵکو دەستیان کرد بە هاندانی هۆزەکان و خەڵکی سەردەشت و چەهریق، سۆما و لاجان و وروژاندنی هەستی ئایینی ئەوان، هەوڵیان دا وا لە ئێران بکەن کە هەندێ جیاوگ بدا بە بابی عالی. لە حاڵەتێکدا کە دەوڵەتی ئێران سووربوو لەسەر فەرمانڕەوایی خۆی بەسەر (محەمەرەو زەهاو)دا. وێدەچوو کە عوسمانییەکان لە ترسی پەرەسەندنی هێزو دەستڕۆیی رووسیە لە ئازەربایجان، هەوڵیاندا کە راکێشانی سەرەك هۆزەکانی سوننی کورد بۆ لای خۆیان، ناوچە کوێستانیەکەی رۆژئاواو باشووری ئەم ویلایەتە بکەن بە هی خۆیان کە وەك دیوارێکی سروشتی بوو بۆ پاراستنی بەشی رۆژهەڵاتی عوسمانی لە بەرانبەر سوپای رووس، و داواکاری حکوومەتەکانی تورك بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بۆ سەلماندنی ئەوەی ناوچەی چەهریق، قوتورو ئاگری داغ (ئارارات) هی عوسمانییە، رەگ و ریشەکەی بۆ ئەم راستییە دەگەڕایەوە.

لە ئاست ئامانجی فراوانکردنی قەلەمڕەویان دا، بابی عالی دوابەدوای فریودانی خەڵکی کوردی ناوچەکە بە بەخشینی بەڵێن و لێبووردنی سەرانە سەندن یان بەخشینی حکوومەتی ئەو ناوچەیە بۆ سەرەك هۆزەکانی ئەوێ، هەوڵی دەدا لە کاتی چالاکییەکانی کۆمۆسیونی دیاریکردنی سنوور، خەڵکی ناوچەکەی وا لێدەکرد واز لە رەگەزنامەی ئێرانی بهێنن. میرزا جەعفەر خانی (مشیر الدولە) سەرەك شاندی ئێرانی لە کۆمسیونی دیاریکردنی سنوور لە ساڵی (١٢٦٨ك) (١٨٧٤ز) باس لە پڕۆپاگەندەی عوسمانی دەکا لە نێو کوردەکان و دەنووسێ سەرۆك شاندی

عوسمانی دەروێش پاشا سەرەڕای ئامادەیی شاندی ئێران لەوێدا، دانیشتوویی ناوچەکانی سەردەشت، چەهریق، سومای و ...هتد هان دەدا کە رەگەزنامەی عوسمانی وەربگرن، لەو نامانەی کە کوردەکان بەر لە هاتنی کاربەدەستانی ئێرانی بۆ ناوچەکە بۆ میرزا جەعفەر خان (مشیرالدولە) ناردویانە، بۆمان دەردەکەوێ کە تورکەکان تا چ رادەیەك هەوڵیان داوە ئەم ناوچانە لە جەستەی ئێران جیابکەنەوە. موشیر ئەلدەوڵە نامەی خەڵکی سەردەشت، چەهریق و برادۆستی لە نامەی سەرحەدی خۆی هێناوە. لە نامەی خەڵکی چەهریق کە بۆ (موشیر ئەلدەوڵە) نووسیویانە دەخوێننەوە:" نووسراوی عەریزەی خەڵکی چەهریق کە لە بەرواری مانگی (شەوالی ساڵی ١٢٨٦) (١٨٦٥ز) بۆ بەندەی گیان فیدا نووسراوە:

ئەم رۆژانە کە هەواڵی هاتنی جەنابی دەروێش پاشا بۆ ئەم ناوچەیە گەیشت، (عەبدولهادی) بەڕێوەبەری باشقلان (باش قەلا راستە) و عومەر ئاغا رەزکی، پیاویان بۆ ئەم لاو ئەو لای ناردووە کە خەڵکی چەهریق هان بدەن بە بەڵێنی دە ساڵ لێبوردنی باج سەندن، تاکو خەڵکی لەرێ لابدەن و هەروەها خەڵکی "دریك" ئاش باتاڵ و شپیرانیش بەڵێنی لێبوردنی دە ساڵەیان لە سەرانە پێدراوە، قایمقامی قوتور، (عەبدولقادر) ناوێکی بۆ لای خەڵکی دریك ناردووە و ئێمەی ورووژاندووە کە وەرن و بڵێن ئەم ناوچەیە خاکی دەوڵەتی رۆمە و پێوەندی بە ئێرانەوە نییە و کاغەز بنووسن و بن بە هاوولاتی عوسمانی و هەروەها بە دووردرێژی مەلا محەممەد شپیرانی ئاگادارکردۆتەوە کە (عەبدولهادی) بەڕێوەبەری باشقلان لەو وەختەی کە بەرەو باشقلان دەهات، هاتبووە دێهاتی شپیران و هەندێ قسەی کردووە کە شپیران بەدەست و دیاری لە پاشا دەسێنم و دەیدەم بە ئێوە، تەنیا ئێوە عەریزە بدەن کە ئێمە خەڵکی عوسمانین و ئێران بە زۆرداری دەستی بەسەر ئێمە دا گرتووە.. چونکە ئێمەی بچووکتان سەربە دەوڵەتی ئێرانین پێویست بوو کە جەنابتان ئاگادار بکەمەوە."(٨)

بەو شێوەیە هاندانەکانی عوسمانی لە ناوچە سنوورییەکان. هۆکارێکی کاریگەربوو، کە کوردەکانی بەگژ ئێران دا دەکرد و بابەتی دیاریکردنی سنوور، هەمیشە دەبووە هۆی سەرهەڵدانی ئالۆزی لە نێوان ئێران و عوسمانی داو لە ساڵی ١٢٦٣ك (١٨٤٢ز) کۆمسیۆنی دیاریکردنی سنوور لە نوێنەرانی ئێران، رووسیە، عوسمانی و ئینگلستان بۆ دیاریکردنی هێڵی سنووری هەردوو ولات کەوتە کارو بەلام ئەو هەولانە بەهۆی کارشکێنییەکانی عوسمانی بێ ئاکام مایەوە. ئەوەی کە کاری کۆمسیۆنەکەی دژوارتر دەکرد و نێوانی ئێرانی و عوسمانی ناخۆشتر دەکرد. مەسەلەی قتوور بوو، بابی عالی پێی دادەگرت کە قتوور سەر بە عوسمانییە، لە حالێکدا کە لە پەیماننامەکانی یەکەم و دووهەمی ئەرزەرۆمدا، ئینگلستان، رووسیە و

تەنانەت خودی عوسمانیش ئەو ناوچەیان بە بەشێك لە ئێران لە قەڵەم دابوو، ئینگلستان دوای کوژرانی ئەمیر کەبیر بەڵێن و دانپێنانەکەی خۆی لە بیرکردو پشتی عوسمانی گرت، بەڵام رووسیە پێی لەسەر ئێرانی بوونی ئەو ناوچەیە دادەگرت، چونکە لە رووی گرنگی ستراتیژییەوە زیانی بۆ سنپترزبۆرگ نەبوو. (٩)

لە لایەکی دیکەوە بابی عالی دەیزانی کە بە هەبوونی رووسیە دەستوەردان لە سنووری جوگرافیایی ئێران. بێ هوودەیە بەتایبەتی دوای شکستی تورکەکان لە شەڕەکانی کر (١٨٥٤ـ ١٨٥٦ز) و شەڕەکانی (١٨٧٧ـ ١٨٨٨ز). ئەو ئەگەرە بە تەواوی لەناوچووبوو، بۆیە بەدوای رێگە چارەیەکی دیکەدا دەگەڕا کە لە پێکهێنانی نێوەندێکی قەیران خولقێن لە بەشی کوردنشینی ئازەربایجاندا خۆی دەدیتەوە، لە تەنیشت ئەو هەنگاوەوە تورکەکان ویستیان وێڕای سەرکوتکردنی شۆڕشی کوردانی بەشی رۆژهەڵاتی وڵاتەکەی، سەرۆك عەشیرەت و شەڕکەرەکانیشیان لە چوارچێوەی سوپایەکی سوارە بە ناوی «سوپای حەمیدییە» بخاتە خزمەت بابی عالییەوە.

نووسەرانی کتێبی «کوردەکان» لەو بڕوایەدان کە دامەزرانی سوپای حەمیدییە لە ساڵی ١٨٩٠ز، بۆ بەرەنگاری کردنی کوردە شۆڕشگێرەکانی ئەرزەرۆم، باکووری بەتلیس و وان، سەرکوتی ئەرمەنەکان کە بزووتنەوەی ئازادیخوازی نەتەوەییان بە لوتکە گەیشتبوو و سەرەنجام بۆ تێکەڵ کردنی هۆز و زەوییەکانی کورد لە سیستەمی فەرمانڕەوایی دامەزراوە.(١٠)

سوپای حەمیەیە لەسەر بنەمای سیستەمی خێڵەکی بنیادنرابوو و بەهۆی ناکۆکی نێوان سەرۆکی یەکە جیاوازەکانی ئەو سوپایە، خەڵکانی ئەرمەنی سنووری عوسمانی و ئێرانی دەکەوتنە بەر پەلاماری کوردەکان و لەبەر ئەوەش کە چاودێرییەکی ورد بەسەر شێوەی رەفتار و هەڵسوکەوتی ئەو سوپایە لە لایەن «بابی عالی»یەوە لە ئارادا نەبوو. سنووربەزێنی هۆزەکانی ئەودیو بۆ خاکی ئێران شتێکی ئاسایی بوو، لازاریف روونی دەکاتەوە کە یەکەکانی سوپای حەمیەیە لە داگیرکردنی ناوچەکانی کوردستانی ئێران وەك سابلاغ موکری لە ساڵەکانی ١٩٠٥، ١٩٠٧ و ١٩٠٨ رۆڵی سەرەکیان گێراوە.(١١)

بەدڵنیایەوە کەڵك وەرگرتن لە کوردەکانی عوسمانی بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی ئێران لە رۆژئاوای ئازەربایجان بۆ سەرنج راکێشانی هۆزەکانی کوردی ئێرانی، ئەنجام دەدرا و لە درێژ ماوەدا دەیتوانی هۆزەکانی شکاك، جەلالی، موکری و....... بخاتە خزمەت سیاسەت و بەرژەوەندییەکانی عوسمانی.

# سەرهەڵدانی پشێوی لە ئازەربایجانی

# رۆژئاواو وروورژاندنی عوسمانییەکان

کردەوەی فەرمانبەرانی دەوڵەتی ئێران لە ئازەربایجان و جۆری مامەڵەکردنیان لەگەڵ خەڵکی کورد هەمیشە لەبەرچاوی کارمەندانی دەوڵەتی عوسمانی بوو و کاربەدەستانی تورك هەوڵیان دەدا بێجگە لە وروورژاندنی هۆزەکانی سنوور، لە ئاست ئەو کەسانەی کە تووشی دڵڕەقی و غەدرکردنی ئێرانیان بوون ئەوپەڕی سوودی لێ وەربگرن. لە ئازەربایجان یەکێ لە رێگاکانی راگرتنی هۆزە کوردەکان ئەوە بوو کە سەرەك خێڵەکان لەسەریان بوو لە رۆژی دیاریکراو بۆیان بچنە تەورێزو لە بارەگای حکوومەت ئامادە بن و وەفاداری خۆیان لە راست دەوڵەتی ئێران رابگەیێنن.

هەرکات هۆزێك خۆی لەم کارە لادەدا، دەوڵەت دڵی لێ پیس دەکردو هەوڵی دەدا هۆکاری یاخیگەرییەکەی سەرودەر بکا، کاربەدەستی تەورێز لە راپۆرتی دووەمی (صفر ١٣١٨ك) ١٨٩٧ز خۆی وەزارەتی دەرەوە ئاگادار دەکاتەوە کە سەرەك هۆزەکانی پیران و مامەش بۆ ناوەندی حکوومەت لە تەورێز نەهاتوون و رەفتاریان نیشاندەری سەرپێچییە، ئەو لە دواییدا خوازیاری گوشارخستنە سەر ئەم دوو هۆزە دەبێ تاکو لەم یاخیگەرییە دەست هەڵگرن![١٢] ئاکامی ئەم یاخیگەریانە لە بەرژەوەندی عوسمانیاندا بوو. هەرکە کاربەدەستانی تورك لە یاخیگەری سەرەك هۆزێك ئاگاداردەبوون، ئەو هۆزەیان بۆ ناو خاکی خۆیان دەبرد و دایاندەمەزراندو بە شێوەیەکی نارەسمی دەستیان ئاوەڵادەکرد لە تاڵانکردنی سامانی ئێرانیان. بۆیە بەیەکەوە کۆچکردنی هۆزێکی کوردی بۆ خاکی دەوڵەتی عوسمانی هەرگیز بە دڵی دەوڵەتی ئێران نەبوو و هەوڵ دەدرا رێی پێ بگرن. کاربەدەستی خۆی لە رۆژی (١٨ی صفر ١٣٢١ك ١٩٠٠ز) لە راپۆرتێك بۆ وەزارەتی دەرەوە بارودۆخی هۆزی حەیدەرانلو وا شی دەکاتەوە: "٧٠٠ خێزانی حەیدەرانلو لە چاڵدێرانەوە بەڕێکەوتوون.. دەیانەوێ بچنە نێو خاکی عوسمانی، خەڵکی چاڵدێران ترساون.. خزمەتکارتان بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت ناچارە بە راشکاوی راستییەکان بڵێ. چوونی حەیدەرانلو لە بەرژەوەندی دەوڵەتدا نییە، ئاورێکی بە بەزەییانەیان لێ بدەنەوەو دەستی ستەمیان لەسەر لابەرن بۆ ئەوەی نیشتمانیان جێ نەهێڵن، ئەمە لە بەرژەوەندی دەوڵەت و میللەتە."[١٣] بەڵام تورك توانی هۆزی حەیدەرانلو بۆ ئەو بەری سنوور بەرێ و بێجگە لەمە هۆزی مەنگوڕیشی بۆ ئەو بەری سنوور راکێشاو سەرۆکیان بایەزید ئاغا لە لایەن سوڵتانی عوسمانییەوە نازناوی پاشایی وەرگرت. نیکولاس دەنووسێ کە بایەزید ئاغا دوای ئەوەی کە رووی لە تاران وەرگێڕا، پلەی (ئیلخان) گەورەی

خێلاتی کوردی لێ سەندرایەوە کە پێشتر هەیبوو ، لەتەك (٥٠٠ )خێزانی هۆزی خۆی بەرەو ئەوبەری سنوور بەرێکەوت.

نیکولاس لە بارەی رۆلی گەورەی خێلاتی کورد (ئیلخان) دەنووسی: دەولەتی ئێران لە نێو بەهێزترین سەرکردەی کورد کەسێك هەلدەبژێرێ تا کاروباری ناوچەکە رێکبخا و سەرانە کۆ بکاتەوە. ئەم سەرکردەیە رێز و بایەخێکی تایبەتی دەبوو، چونکە دوای گەیشتن بەم پلەیە زۆر زوو دەبوو بە دەسترۆترین و دەولەمەندترین کەسی ناوچە".[١٤] سەرەك هۆزەکان یا (ئیلخانی کوردان) لە سالی (١٩٠٣ ز ١٢٨٢ هەتاوی) بایەزید ئاغا بوو و هەرکە زانی لە تاران "باپیری ئاغا" کوری هەمزە ئاغای مەنگوری راپەریوی بەناوبانگ کە یارمەتی شێخ عوبەیدوللای دابوو، لە جیاتی ئەویان داناوە و کە دیتی دەولەتی ئێران کوری خاینێکی لەو پێ باشتر بووە، بەرەو دەولەتی عوسمانی وەرچەرخاو ئەوان پلەی پاشاییان پێ بەخشی و موچەی مانگانەیان بۆ بریوە. نیکولاس دەلێ کە بایەزید ئاغا هەر زوو پێشنیاری بە بابی عالیدا کە هێرش بەرێتە سەر ئازەربایجان و"لە بەرانبەر ئەو جیاوگانەی کە عوسمانییەکان لێیان دا، خێرا لەتەك محەممەد ئاغا سەرەك خێلی شکاك پێشنیاریان بە والی موسل -دا کە هەنووکە ناوچەی لاهیجان (لاجان) دەتوانێ ببێ بەهی تورکان و دەبێ هەرچی زووتر داگیر بکرێ."[١٥] زوو دەولەتی عوسمانی ئەو ناوچەیەی داگیر کردو بێجگە لە سەرکردەکانی شکاك و مەنگور و حەیدەرانلو کوردانی شێخ عوبەیدوللاش بۆ شێواندنی ناوچەکە رەوانەکران. دوای گێرەشێوێنی شێخ عوبەیدوللا، کوردەکانی بۆ حجاز دوور خرابوونەوە، بەلام لەگەل یەك لانەکردنەوەی ناکۆکی سنووری و ئەرزی نێوان ئێران و عوسمانی، تورکەکان لە سالی ١٨٩٣ رێگەیان پێ دان کە بگەرێنەوە کوردستان. لە سەرەتادا (مەحەمەد سدیق) بۆ نەهری گەرایەوە و لە دواییدا (عەبدولقادر) لە رێگەی رووسیە و ماکو بۆ کوردستانی ئێرانێ هات. هەر زوو ئەم دوو شێخە دەسترۆیی خۆیان لە نێو موریدانی پێشووی باوکیان بلاو کردەوە. میرزا موسا خان نوێنەری ئێران لە کۆموسیونی دیاری خستنی سنوور، بۆ وەزارەتی دەرەوە، رادەی خۆشەویستی ئەوان لە ناو هۆزگەل بەم جۆرە شی دەکاتەوە:" رادەی دەسترۆیی و هێزو دەسەلاتی شێخ سدیق ئەفەندی برای ناوبراو لە سەرتاسەری خاکی کوردستان هێندەیە کە ملکەچ بوون و گوێرایەلی هۆزەکان تێپەریوە و گەیشتۆتە گیان فیداکردن و دەسەلاتی بەسەر هەموو کارێکدا دەشکێ".[١٦]

کاربەدەستی ورمێش لە راپۆرتی (زی حەجەی ١٣٢٠ ك) ١٨٩٩ز دەولەتی ئێران ئاگادار دەکاتەوە:" هۆزەکانی سنووری ئێرانی بەپێی بیروبروای خۆیان، شێخی ناوبراو بە قوتبی بازنەی ئیرشاد دەزانێ و ملکەچ بوون لە ئاست ئەودا بە ئەرکی ئایینی خۆیان دەزانن".[١٧] کورانی شێخ عوبەیدوللا بۆ عوسمانییەکان خۆی لە خۆیدا مەترسی بوون و ئەو دەولەتە دەیویست بە وروژاندنی ئەوان لە دژی

ئێران دوو ئۆین (لە سەر دوو پەت یاری بکەن) بکا. (محەممەد سدیق) هەرکە گەیشتە ئێران لە ڕێگەی نەهری گوندەکانی سنوورو شاری شنۆی تالآنکرد و دەستی دەکرد بە دروستکردنی قەلآی جەنگی و ئەو لەم کارانەدا بە ئاشکرا یارمەتی لە سوارەی سوپای حەمیدییە وەرگرت. (ئیعتیماد ئەلسەلتەنە) سەبارەت بە کاردانەوەی کارەکانی شێخ سدیق لە تاران و بێ دەسەلآتی دەولەتی ئێران لە ڕێگە پێ گرتنی دەنووسێ:" دوو سێ ڕۆژێکە هزری جەنابتان گۆڕاوە. ئەوەی دیارە عوسمانییەکان، کوڕانی شێخ عوبەیدوللآیان ڕەوانە کردووە کە بچێتە بێگچەی سەرسنووری خۆی کە شوێنی نیشتەجێبوونی شێخ عوبەیدوللآ بوو و سوارە کۆ بکاتەوە. ئاشکرایە کە کوڕی شێخ عوبەیدوللآ گەرەکی بێ لەسەر سنوور سوارە کۆ بکاتەوە، بەو زولم و دەست درێژیەی کە لە لایەن حوکمڕانانی ئێرانی ڕەش و ڕووتە دەکرێ، زۆربەیان بە تایبەتی ئەوانەی سوننین کۆ دەکاتەوەو دەچنە نێو خاکی عوسمانی و لە خزمەت دەولەتی عوسمان دا دەبن.

ئەم چەند ڕۆژە بە هەزار دەردەسەری و پاڕانەوە لە ئاست شارژدافر، عوسمانی بە شێوەیەکی کاتی ئەم کارەی دواخست تا بزانین دوایی چی دەبێ". [١٨]

کوڕانی شێخ هەندێ داواکارییان هەبوو کە گرنگترینیان ئەوانە بوون:

١ـ سووربوون لە داگیرکردنی دووبارەی مولکی باوکیان کە ئێستا بۆتە مولکی خالسەی دەولەتی.

٢ـ گوشار خستنە سەر دەولەتی ئێران بۆ بەخشینی ڕەگەزنامەی ئێرانی بە مەبەستی ئامادەبوونی بەردەوامیان لە ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجان. لازاریف باس لە داکۆکی ناسرەدین شا دەکا بۆ سوود وەرگرتن لە ڕووسەکان کە بە زەبری دەسەلآتداریتیان ڕێگە نەدەن بە عوسمانی کە یارمەتی کوڕانی شێخ بدات و دەنووسێ: شا لە ڕێگەی بالیوزخانەی دەولەتی خۆی لە ڕووسیە داوای یارمەتی کرد لە ئەلکساندری سێیەم قەیسەری ڕووسیە. [١٩] گوشاری ڕووسیە تەنیا لە ماوەیەکی کورتخایەندا کاریگەر دەبوو و بە زوویی ئەستانبول بە بیانووی پەلامارەکانی خۆبەختکەرانی ئەرمەنی لە خاکی دەولەتی ئێران و ڕووسیە بۆ سەر خاکی عوسمانی، کوڕانی شێخ عوبەیدوللآی بۆ سەر سنووری ئازەربایجان ڕەوانە کرد.

دەولەتی عوسمانی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم تووشی گرفتارێك بەناوی ناسیونالیزمی ئەرمەنی بۆوە کە بەشی زۆری بودجەی ناوچەکانی ڕۆژهەلآتی ئەو ولآتەی قووت دەدا و تەنیا چارە کە بەرپرسانی ئەو ولآتە بۆ کپ کردنی ناڕەزایی ئەرمەنیان بیریان لێ کردبۆوە، پێکهێنانی سوپای حەمیدییە، ڕەشەکوژی ئەرمەنیان و کەلك وەرگرتن لە هۆیەکانی سەرکوتکردن وەك شێخ و دەرەبەگی کورد و وروژاندنی دەمارگرژی ئایینی ئەوان لە دژی مەسیحییەکان کورت کرابۆوە. لەم کاتەدا پارتەکانی

ئەرمەنی هنچاك (دامەزراندنی لە ساڵی ١٨٨٧ز) و داشناك (دامەزراندنی ساڵی ١٨٩٠) بەرگرییەکی چەکدارانەیان لە دژی بەرژەوەندی بابی عالی سازدابوو.[٢٠] کوڕانی شێخ عوبەیدوڵڵا بە فیتی عوسمانیان مەسیحیان و ئەرمەنییەکانی ئێرانیان کردە ئامانجی هێزەکانیان و دانیشتووانانی مەسیحی نزیك سنوور لە رووی گیانی و ماڵییەوە کەوتنە بەر هەرەشەی کورد و ئەمە بووە هۆی دڵەڕاوکێی روسیە و دەست تێوەردانی لە ناوچەکە. بالیۆزی رووسیە لە ئێران لە نامەیەکدا بۆ وەزیری دەرەوە لە (٢٦ ژیحجە ١٣٢١)ك ١٩٠٠ز ئاماژە بەم مەسەلەیە دەکا و نووسیویەتی:"واپێدەچێ کە لەم دەمەیدا شێخ سدیق هەندێ هەنگاو دەنێ لەوانە لە شوێنێك بەناوی سۆمای برادۆست قەلایەکی نوێ سازکردوە و کردوویەتی بەجێی نیشتەجێبوونی کەس و کاری خۆی و چەك و تفاقی بە خەڵکی گوندی سوسەنی ئاوا لە ناوچەی مەرگەوەڕ داوە و پەلاماری مەسیحییەکانی دانیشتوی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕی داوە و لەگەڵ حاکمی وان نێوانی خۆشە کە لە رێگەی ئەوەوە تفەنگێکی زۆری لە لایەن عوسمانییەکانەوە پێ بەخشراوە".[٢١]

(مەحەمەد سدیق) لە ناوچەکانی سرو، جرمی بیدکار، بناردو ساردیکیش چەند قەلایەکی سازکردووە و دەیەوێ بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی رۆژئاوای ساباڵغی موکری سوودیان لێ وەربگرێ. دەوڵەتی عوسمانی لە ناکۆکییەکانی نێوخۆیی و شەڕەکانی نێوان هۆزەکانی کوردیش سوود وەردەگرێ و هەوڵی داوە لە رێگەی شێواندنی پێوەندی کوردان بەیەکەوە ئارامی لە هێلەکانی سنووری بشێوێنن و هەندێ جاریش لە هۆزە ئێرانییەکانی سەربە عوسمانیش کەلك وەربگرێ بۆ سەرکوتکردنی هۆزە یاخیبووەکانی کورد لە ناو خاکی عوسمانی و لەو کاتانەدا دەوڵەتی ئێرانیش لای ئەو هۆزەکانی دەگرت کە ببوون بە قوربانی و لە ناو خاکی خۆی جێی دەکردنەوە.

چارەنووسی هۆزی مەنگوڕ و بایەزید ئاغا سەرۆکی ئەو هۆزەو رۆڵی ئەو لە سەرکوتکردنی هۆزی پشدەر نموونەی ئەو سیاسەتەیە. عەبدوڵڵا پشدەری لە شیکردنەوەی مێژووی خێلاتی پشدەری دەنووسێ لە ساڵانی کۆتایی پاشایەتی ناسرەدین شا، دوای ئەوەی کە هۆزی پشدەر ناقایل بوونی خۆیان لە بەرانبەر حاکمی نێردراوی تورك دەربڕی کە بۆ بەڕێوەبردنی قەلادزێ ناوەندی پشدەر هاتبوو، و دوای ئەوەی کە دووگیانفیدای کوڕی حاکمی نێردراوی سوڵتانیان کوشت، دەوڵەتی عوسمانی لە تەك مەنگوڕەکانی ژێر فەرمانی بایەزید ئاغا پشدەرییەکانی بەزاند و ئەوان بە وەرگرتنی مۆڵەت لە موزەفەرەدین میرزای جێگری شا دوو ساڵ لە سەردەشت نیشتەجێبوون تاکو سوڵتان فەرمانی لێبووردنی گشتی دەرکرد و هۆزەکانی پشدەر بۆ عوسمانی گەڕانەوە.[٢٢]

لازاریفیش هەڵکەوتی هۆزەکان و دژایەتیان لەگەڵ یەکتری و زێدەڕۆیی عوسمانییەکان لێك گرێ دەدا و دەنووسی: زۆربەی هۆزەکانی کورد ( زیاتر دانیشتوانانی رۆژئاوا و باشووری گۆلی ورمێ) وەك شکاك،

هەرکی و بەگزادە نیوەی ساڵی لە خاکی عوسمانی بەسەر دەبەن و زۆربەی زەویدارانی کورد وەك شێخی شەمدینان و شێخ ئامین تاوان لەو بەرەی سنوور زەویوزاری کشتوکاڵیان هەبوو. هەموو دەم لە نێوان ئەم هۆزانە لەسەر لەوەڕگە ناکۆکی و دژایەتی لە ئارادابوو و بۆ عوسمانی زۆر سانا بوو کە ئەم هۆزانە بە گژ ئێرانەوە بنێ. تورك لە کۆنەوە کوردی لە دژی ئێران دەوروژاند. لە ساڵی (١٩٠٤) پارەو چەکی تاهر پاشا والی وان لە نێوان سەرەك هۆزی کوردەکانی ئێران لەوانە شێخ (مەحەمەد سدیق) دابەشکرا تا باری موکریان بشڵەژێنێ."[٢٣]

عوسمانییەکان لە هەنجەت دەگەڕان بۆ ئەوەی هێز بۆ ناو خاکی ئێران بنێرن و بۆ نموونە بەڕێوەبردنی گومرکی تەمەرچین یەك لەوانە بوو. بەپێی نووسینی نیکۆلاس کارەکانی کارمەندێکی بەلژیکی گومرگی ئێران و هەروەها کارەکانی یەك لە شێخەکانی عوسمانی بیانوییەکی باش بوو بۆ ئەوەی هێزی سەربازی تورك دەست درێژی بکاتە سەر خاکی ئێران. لە ساڵی ١٩٠٥ کارمەندێکی بەڕێوەبەرایەتی گومرگی سابلاغ بەناوی مسیو لولو (Leleu) سەردانی ناوچەی لاهیجان (لاجان)ی نزیك سنووری کرد.

بەروبوومی ئاژەڵی و کشتوکاڵی ئەم ناوچەیە بۆ خاکی عوسمانی دەنێردران و بێجگە لەمە، موریدانی شێخ کەماڵ کە لە شێخەکانی بەناوبانگی نەقشبەندییە بوو، هەموو ساڵێ بۆ زیارەتی ئەو لە ئێرانەوە بۆ ئەو دیوی سنوور دەچوون و دەوڵەتی ئێران لە ڕێگەی مۆرکردنی پاسپۆرتی زیارەتکەرانی خەڵکی تەمەرچین و لاهیجان پارەیەکی چاکیان وەدەست دەهێنا، کارمەندی بەلژیکی بایەخ و داهاتی ئەم ناوچەیەی بۆ دەرکەوتبوو، فەرمانی دەرکرد کە ساختومانێکی نوێ بۆ گومرگ لە لاهیجان ساز بکرێ.[٢٤] لە لایەکی تر کە شێخ کەماڵ حەزی نەکرد موریدانی سەرانەیەکی وا گران بدەن، هاتە ناو خاکی ئێران و لە تەمەرچین خێوەتی هەڵداو ڕەگەزنامەی ئێرانی دەرکرد. تورکەکان کە تەمەرچینیان بە خاکی خۆ دەزانی، تووشی دڵەڕاوکێ بوون چونکە (رشید ئەملەلیك) بەرپرسی ئێرانی بە چاکی زانیاری بەسەر دابەشکاری سنووری ئێران و عوسمانی لە ناوچەی سابلاغ هەبوو، ئەم بارەی قۆزتەوە و تەمەرچینی بە بەشێك لە خاکی ئێران لە قەڵەم دابوو. حاکمی تورکی رواندز رایگەیاند کە ساختومانی گومرگی کاول دەکا و لە مانگی سپتامبر ساڵی (١٩٠٥) گشت نووسینگەکانی گومرکی ئێران بە درێژایی سنووری لەگەڵ عوسمانی کەوتە بەر هێرشی سوارەی سوپای حەمیدییە، پیاوانی شێخ (مەحەمەد سدیق) و هۆزی پشدەر. تورکەکان لە لاجان نووسینگەی گومرگی خۆیان کردەوە و جەندرمەی تورك ناوچەکانی سەردەشت، بانە، سۆمای و برادۆست و پەسوەیان داگیرکرد. هۆزەکانی کوردی ئازەربایجان دوای ئەوەی کە بینیان سابلاغ بە دەستی سوارەی حەمیدییە دەستی بەسەردا گیرا ئەم دەرفەتەیان قۆزتەوە.

لە سۆنگەی بێ سەروبەری و پشێوی و جەنگی نێوخۆیی کە لە ئەنجامی شۆڕشی دەستووری (مەشروتە) هاتە کایەوە و هەروەها لەژێر کاریگەری پڕۆپاگەندەی کارمەندانی تورك، بەرەبەرە دەستیان بەسەر بزێوی کرد و ڕاپەڕین و دەوڵەتی ئێرانی تا کودەتای (١٢٩٩هەتاوی) ١٩٢٠ز و دەسەڵات بەدەست گرتنی ڕەزا خان، نەیتوانی ئەم ڕاپەڕینانە کپ بکا کە لە چوارچێوەی ڕاپەڕینی سمکۆ چڕ ببۆوە. کارمەندان و دیپلۆماتی عوسمانی لە ناوچەکانی کوردی ئازەربایجان بێجگە لە ئەرکە ئاساییەکانی خۆیان، دەمارگرژی و لایەنگری ئایینی خەڵکی سوننەی کوردیان توندتر دەکرد. لازاریف بە سوودوەرگرتن لە بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوەی رووسیەی قەیسەری، کردەوەی دیپلۆماتەکانی عوسمانی هەڵدەسەنگێنێ، دەنووسێ:" کونسولەکانی عوسمانی لە کوردستانی ئێران زۆر چوست و چالاك بوون و بە بەردەوامی هاموشۆی سەرکردەو پیاو ماقووڵانی کوردیان دەکرد و هەروەها لەگەڵ ڕابەرانی ئایینی واتە پیاوانی ئایینی و موجاهیدانی ئایینی پێوەندیان زۆر خۆش بوو". (٢٥)

لەگەڵ ئەمەشدا، ئامادەبوون و زاڵبوونی تورکەکانی عوسمانی لە هەندێ بەشی خاکی ئێران لە ساڵی (١٢٨٣ـ١٢٨٩هەتاوی) (١٩٠٤ـ١٩١٠ز) نەیتوانی قەناعەت بە دانیشتوانانی نیشتەجێبوو و گوندەکان بهێنێ کە واز لە ڕەگەزنامەی ئێرانی خۆیان بهێنن و ببن بە خەڵکی عوسمانی. هۆکاری ئەم پێخۆش نەبوونە تەنیا لەبەر گەندەڵی و توندوتیژی ڕادەبەدەری فەرمانبەرانی تورك بوو. تورکەکان لە ساڵی (١٢٨٧) ١٩٠٨ز خەڵکی پتر لە (٢٠) لادێی دەوروبەری ساباڵاغیان ناچارکرد کە بە نووسین داوای تابیعییەتی عوسمانی بکەن، ئەم ڕاستییە لە زمانی یەکێ لە کوردەکانی ئەوێ لە ساڵی (١٩٠٨) بۆ چرکاسۆف کونسولی رووسیە گێڕدراوەتەوە.

دیپلۆماتەکانی رووس لە ڕاپۆرتێکدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی رووسیە دەنووسێ گەندەڵکاری و ستەمکاری کاربەدەستانی عوسمانی کەمتر لە هاوکوفە ئێرانییەکان نییە، و سوپاییانی تورك لە ڕاست خەڵکی کوردی ناوچەی داگیرکراو ستەمکارانە ڕەفتار دەکەن. ئەو دەڵێ:" دانیشتووانی ئەم ناوچەیە (ساباڵاغ) و تەنانەت کوردەکانیش لە عوسمانی نارازین و خۆیان بە ئێرانی دەزانن". (٢٦)

کەواتە دەبێ بگوترێ کە دوو توێژ لە کوردستان لەبەرچاوی دەوڵەتی عوسمانیدابوون:" سەرکردەی هۆزەکان و ڕابەرانی ئایینی. سەرەك هۆزەکان لەبەر ئەو دەسترۆیییەی کە لە ناو هۆزەکاندا هەبوو و لەبەر ئەوەی کۆمەڵێك سوارەو شەرکەری کوردیان لەژێر فەرمانی خۆیان هەبوو، و پیاوانی ئایینی لە سۆنگەی توانایی لە سازدانی ناکۆکی نێوان جەماوەری سوننی و شیعەو ورووژاندنیان لە دژی دەوڵەت و کۆمەڵگەی ئێرانی، جێگای بایەخ بوون.

# سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی کورد لە کوردستانی عوسمانی

هۆکاری هێرشەکانی عوسمانی بۆ سەر خاکی ئێران و لەژێرپێنانی مافی حوکمڕانێتی ئەو وڵاتە چی بوو؟ بۆچی تورك هەر بە ئێجگاری رەوشی ئاشتییانەی یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکان و پشتبەستن بە راوبۆچوونی کۆمۆسیونی دیاری خستنی سنووریان بەلاوە ناو روویان لە چەك کرد؟

وەڵامەکەی دەبێ لە کاردانەوەی دەسەڵاتدارێتی عوسمانی لە ئاست رووداوەکانی ئێران و گۆڕانکارییەکانی ناوەوەی کۆمەڵگەی عوسمانی بدۆزرێتەوە. عوسمانی لە دەیەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم رووبەڕووی تەوژمی گۆرانکاری و جموجۆڵی چاکخوازان و نوێخوازانی تورك ببۆوە، ئەوانەی کە بۆیان دەرکەوتبوو کە ئیمپراتۆری لە حاڵەتی ئاوزینگدانە بەدوای رێگە چارە دەگەڕان بۆ رزگاری ئەو لە چوارچێوەی ئۆرگان و رێکخراوی نهێنیێ و هەندێ جار بە ئاشکرا هەوڵیان دەدا و لە ئەنجامدا هەوڵی ئەم هێزانە بە بەرهەم گەیی و شۆڕشی (تورکانی لاو) هاتە کایەوە.

بەر لەوەی کە چاکخوازانی عوسمانی شۆڕشی خۆیان بە بەرهەم بگەیەنن خەباتکەران و شۆڕشگێرانی کوردیش خەریکی ئەوە بوون کە دیاردەی نەتەوایەتی کوردی رێك بخەن و فۆرمی پێبدەن و هەندێ هەنگاوی گرنگیان لەم بارەیەوە هەڵێنابوو و نەوەی میرەکان، شێخەکان و زەویدارانی پێشووی کورد، کاکڵەی سەرەکی یەکەم نەتەوەپەروەرانی کوردیان پێك دەهێنا. کریس کۆچیرا پێرستێکی تەواو لەم رابەرە تازانە دەداتە دەست کە جێی رابەرە کۆنەکانی پێشوویان گرتبۆوە و دەگاتە ئەم ئەنجامە کە " ئەم بەدرخانە و نەوەکانی میرانی سۆران و بابان و شێخ عوبەیدوڵلاّ ـ عەبدولقادر کوری تەها شەمزینان ـ و دوو جەنەراڵی بە ئەسڵ کورد بەناوی شەریف پاشا و لوتفی پاشا و چەند پیاوێکی دەوڵەمەند و گەورەی دیاربەکر ناوکی رابەرانی ناسیونالیستی کوردیان پێك دەهێنا و پاش ماوەیەك زلهێزان کاریان دەکەوێتە لای ئەم دەستەیە".[١]

نووسەرانی پەرتووکی (کوردەکان) لە بارەی چالاکی سیاسیی ئەم دەستە لە رابەرانی کورد دەنووسن تا پەیابوونی "شۆڕش" تورکەکانی لاو، پێشڕەوانی بزووتنەوەی میللی کورد لە نێو پارت و گروپی جۆراوجۆر پەراکەندە بوون. هەندێ لەوانە کە چالاکانە دەوریان دەبینی "ئیتحاد و تەرەقی" بوون. لە نیسانی ١٨٩٨ مەدحەت بەدرخان بەگ یەکەم گۆڤاری کوردی بەناوی "کوردستان" بڵاوکردەوە. زەوینە و زمانی گۆڤارەکە کە بە دووزمانی کوردی و تورکی بڵاودەکرایەوە، زیاتر کولتووری و

پەروەردەیی بوو وەلێ بۆ بزووتنەوەی میللی کوردیش ئامرازێکی باش بوو و لاپەڕەکانی مینبەری نەتەوەییەکانی کورد بوو".[٢]

تورکانی لاو لە سالّی (١٩٠٨) دەسەلاّتیان بەدەست گرت و دوای ئەوەی کە بەلێنی جۆراو جۆریان بە گەلانی ژێردەسەلاّتی ئیمپراتۆری عوسمانی دا وەك پێدانی مافەکانیان و ئازادی مەدەنی و ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عوسمانی، یاسایەکی بنەڕەتیان گەلاّلە کردو سەردەمی ئازادییەکی مام ناوەندی بۆ تورکان و گەلانی دیکە هاتە ئارا کە نووسەرانی پەرتووکی (کوردەکان) ناویان لێناوە بەهاری تورکانی لاو.[٣]

لەژێر تیشکی ئەم ئازادییە کورتخایەنە بەلاّم نیڤارەدا، ژمارەی گروپەکانی کوردی پەرەی سەند و رادەی چالاکی سیاسیی و کولتووری ئەوان، گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. ئەمیر عەلی بەدرخان بەگ، جەنەرال شەریف پاشا و شیخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوللاّ کە ئێستا ئیتر سەرۆکی سەنای عوسمانی، کۆمەلّەی "تەعالی و تەرەقی کوردستان" یان پێك هێنا کە گۆڤاری تورکی بەناوی "کورد تەعاونی و تەرەقی گازتس" کە سەرنووسەرەکەی جەمیل بەگ بوو، بلاّودەکردەوە. نووسەرانی "کوردەکان" ئەم گۆڤارە بە مەلّبەندی وتووێژی توندو جیدی سەبارەت بە مەسەلەی کولتوور و زمانی کوردی و یەکگرتوویی میللی کورد دەزانن و باس لە پێشوازی گەرمی کوردانی دانیشتووی ئەستانبوڵ دەکا.[٤] دوای کۆمەلّەی (تەعالی و تەرەقی کوردستان) کۆمیتەیەك بەناوی "کومیتەی کورد" بۆ بلاّوکردنەوەی زانست دروست بوو کە مێژووی دامەزراندنی ئەو بۆ پاییزی (١٩٠٨) دەگەڕێتەوە. شێخ عەبدولقادر خێرا لە کۆمەلّەی (تەعالی و تەرەقی) جیا بۆوەو گۆڤارێکی بەناوی "هەتاوی کورد" بلاّوکردەوە. درك کینان هەوڵ و هەنگاوەکانی ئەم دەستە لە رابەرانی کورد واتە مندالّە بەگەکان و شێخەکانی پێشوو پەسند دەکا، بەلاّم بڕوای وایە کە ئەوانە وەك "هەوێنی"نەتەوایەتی کورد بوون و بەم شێوەیە لە گرنگی رۆلّی ئەوان لە خولّقاندن و پێکهاتنی نەتەوایەتی تا رادەیەك کەم دەکاتەوە.[٥]

بەلاّم نووسەرانی "کوردەکان" نیشان دەدەن کە خەباتگێڕان و خوێندەوارانی لاو لە ناوەندی شارەکانی وەك تبلیس و دیاربەکرو موش و ئەرزنجان و موسڵ یانەی کوردیان دامەزراند و بۆ وێنە یانەی موش لەگەڵ زۆربەی هۆزەکانی ویلایەت لە پێوەندی دابوو و کاتێ کە یانەی ناوبراو لە کۆتایی سالّی (١٩٠٨) کرایەوە (٧٠٠) ئەندامی هەبوو، بەلاّم لە ماوەی چەند مانگێك ژمارەی ئەندامانی گەیشتە چەند هەزار کەس.[٦] بەم شێوەیە دەبێ بگوترێ کە ناسیونالیزمی کولتووری

کوردی، کورد به درێژایی ساڵی (١٩٠٨) و به کەڵك وەرگرتن له بەهاری تورکانی لاو، گەشەسەندنێکی بەرچاوی کردبوو و لەگەڵ ئەوەی که کوردەکان هێشتا داواکاری سیاسیی فرەیان نەبوو و لەبەر هەستی ئایینی زۆر، کۆمەڵگەی کورد هێشتا بەچاوی دایك ، وڵات (Metropole) سەیری عوسمانی ئیسلامی دەکرد لەگەڵ ئەوەش"پەرلەمانێکی نوێ له قوستەنتینییه کرابۆوه که بۆ پێوەندی سیاسیی نێوان کوردەکان و عوسمانی هەنگاوی جیدی هەڵنەهێنا، ئەم کاره وەك رابردوو بەهۆی (مانۆڕ)ی دیپلوماتیك دەستی پێدەکرد و به شەڕی سوپایی کۆتایی پێدەهات". [٧]

مێژوونووسی کورد رەمزی قەزار لەو بڕوایه دایه که داخوازییەکانی گەلانی ئیسلامی ناو عوسمانی له ئاست گەلانی مەسیحی ژێردەستی عوسمانی کەمتر بوو و "بزووتنەوەی کورد لەتەك بزووتنەوەی گەلی عەرەب کاتێ دەست پێدەکا که له کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم دابوو. ئەم بزووتنەوه له سەرەتا بزووتنەوەیەکی کولتووری بوو". [٨]

بزووتنەوەی کوردانی عوسمانی له ساڵی (١٩٠٨) هەرچی بوو، چ کولتووری و چ سیاسیی، تورکانی لاو چیتر بەرگری درێژەپێدانی چالاکییەکان و هەبوونی ئەوانیان نەدەگرت، بۆیه بەدوای راپەڕینی لایەنگرانی سوڵتانی له پاش (١٩٠٩) و له رەوەندی سەرکوتکردنی ئەوان، بیانگەیەکی پێویست بۆ لێدانی بزووتنەوەی کورد هاته دەستیان. ئەوەی وای کرد که تورکانی لاو بەرانبەر به کورد توندی بنوێنن پەرەسەندنی بڕواکانی پان تورکیستی و تۆرانیگەری پچڕاوی ناو ئەو گروپه و زێدەبوونی داواکاری گەلانی ژێردەستەی عوسمانی له رەوەندی ئازادی یەك ساڵه و راپەڕینی ئیبراهیم پاشا سەرۆکی هۆزی میلان له رۆژهەڵاتی تورکیه بوو و مسۆگەر به پێرەوەچوونی کورد بەرەو ئەو دروشمانەی که گروپه سیاسییەکانی کورد دەیانهێنا ئارا، دڵپیسی تورکانی لاو بەرانبەر به مەترسی کێشەی کورد پتر له جاران زیاتر دەکرد، ئیبراهیم پاشا سەرۆکی هۆزی میلان یا تورك گوتەنی "میلی" که کەوتبووه ناوچەی شارۆیران (دیاربەکر و حەلەب). ئێم. وایدمێن دەنووسێ که ئیبراهیم پاشا تا رادەیەکی زۆر سەربەخۆیی خۆی دابینکرد و له ساڵی (١٩٠٨) به ئاشکرا یاسای بنەڕەتی (یاسای دەستووری) رەت کردەوەو بەرانبەری وەستا، بەڵام تورکانی لاو شەڕیان لەگەڵ کرد تاکو سەرەنجام له کێوەکانی (عەبدولعەزیز) کوژرا. [٩]

تورکانی لاو پێشتر له چوارچێوەی رێکخراوێك بەناوی (کۆمیتەی ئیتحاد و تەرەقی) توانیبوویان کورد و عەرەب بخەنه خزمەتی ئەو دروشمانەی که هەڵیانگرتبوو که رەنگ و بۆی پان ئیسلامی هەبوو، بەڵام هەنووکه که وەختی بەخشینی مافەکانیان هاتبوو دروشمی پان ئیسلامیزمیان بەلاوه

نابوو و باسی تۆرانیگەریان دەکرد. لە ئاست ئەم سیاسەتە کە رابەرانی "کۆمیتەی ئیتحاد و تەرەقی"بەلێنیان دابوو و ئەم بەلێنەیان خستە ژێر پێیان و دەست دەکەن بە سیاسەتی بەتورک کردنی کورد و گشت یانەو رۆژنامە و گۆڤار و قوتابخانەکانی کوردی دادەخەن".(١٠)

ئەمین عالی بەدرخان و شەریف پاشا ئەمری مەرگیان بۆ دەبڕێتەوە، بەدرخانییەکان بە دڵخوازی خۆیان، خۆیان دوور دەخەنەوە، بەندیخانەکان پڕ دەبێ لە خەباتگێڕانی کورد، ژمارەیەك خەباتی نهێنی دەست پێدەکەن، لە دەرسیم و سلێمانیە کوردەکان رادەپەڕن و شێخ مەحمود بەرزنجی داوا دەکا کە بە تەواوەتی دامودەزگای بەڕێوەبەرایەتی عوسمانی، لە ناوچەی بابان کۆ بکرێتەوەو ناوچەکە بەجێ بهێڵن و لەم قۆناغەدا لە لایەن شەڕکەرانی زێباری و بارزانی پشتیوانی لێ دەکرێ.(١١)

کەواتە دەبینین کە بە پێچەوانەی رای کینان و رەمزی قەزاز چالاکی نەتەوەپەرستەکانی کوردی عوسمانی لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەم تەنیا کولتووری نەبوو و رەنگی سیاسیشی هەبوو و دەنا هیچ هۆکارێك لە ئارادا نەبوو کە تورکانی لاو لە راست ئەو داوایانە دا کاردانەوەیەکی توند و خەست بنوێنن. ئینجا دەکرێ تێبگەین کە بۆچی تورکانی لاو هێندە سووربوون لەسەر داگیرکردنی ناوچەکانی رۆژئاوای باشووری گۆلی ورمێ و بۆ ئەم مەبەستە هەڕەشەیان لە داگیرکردنی سابلاغ دەکرد، ئەوان لە راستیدا بەهۆی ئەم هێرشانە دەیانویست هەستی نەتەوایەتی کوردی تازە لە خەو راپەڕیوی ئیمپراتۆری عوسمانی بۆ ماوەیەك کپ بکەن و بەم شێوەیە لە دەست چارەسەری کێشەکانی نێوخۆیی کۆمەڵگەی تورکیە خۆ رزگار بکەن، هەرخۆی لە خۆیدا سەرهەڵدانی هەستی تۆرانیگەری لە ناو تورکانی لاو لە بێ توانایی دەسەڵاتدارێتی عوسمانی بۆ چارەسەری قەیرانەکان لە هەموو بوارێکەوە، هاتبووە ئارا.

داگیرکردنی سابلاغ هەندێ هۆکاری دیکەشی هەبوو لەوانە هەوڵی عوسمانی بۆ لاوازکردنی دەستڕۆیی رووسیە لە ئازەربایجان و سیاسەتی محەممەد علی شای ئێران لە پێخۆش بوونی کردنەوەی دەستی تورکان لە ئازەربایجان و بێ هێزکردنی لایەنگرانی خوازیاری دەستووری، بەڵام هۆکاری سەرەکی هەمان دژایەتی کردنی کورد و فرەوان خوازی ئاشکرای تورك بوو.

(وایدمێن) دەنووسێ کە بزوێنەری تورك بۆ داگیرکردنی سابلاغ لە ساڵی (١٩٠٥) کەڵك وەرگرتن بوو لە سەرقاڵ بوونی رووسەکان لە شەڕی رۆژهەڵاتی دوور.(١٢) بەڵام کەسرەوی باس لە رەفتاری محەممەد علی شا دەکا کە بە ئەنقەست چاوپۆشی لە بزووتنەوەی کوردەکان لە سابلاغ دەکرد، هەروەها دەنووسێ کە دەوڵەت و شا هێزیان نەنارد بۆ یارمەتی فەرمانفەرما حاکمی نوێی

ئازەربایجان کە سەرقاڵی شەڕی کوردانی لایەنگری عوسمانی بوو، بەم پێیە پشتگیری کارەکانی تورکی کرد. ئەو باس لە گوشار خستنەسەر شا لە لایەن پەرلەمان دەکا کە داوای لێ دەکەن لەگەڵ هێزی تورك ڕووبەڕوو بێتەوە و دەنووسێ" لەم ناوە فەرمانفەرما و خەڵکی سابلاغ چاوەڕوان بوون لە تەورێز یا تاران یارمەتی بنێردرێ، بەڵام بیست ڕۆژ تێپەڕی و بێجگە لە دەستەیەکی کەم لە شاهسون کەس نەهات.

محەممەد عەلی شا ڕۆژی پاش دانیشتنی بیست و دووەمین لە مانگی بەفرانبار خۆی هێناو برد و بەرەو تەلەگرافخانەی دەربار چوو و بروسکەی بۆ سەرکردەی خێڵەکان و سەرۆکی هێزی سوارەی ئازەربایجان کرد کە بەلەز یارمەتی فەرمانفەرما بدەن، بەڵام کارەکەی چونکە ریاکاری تێدابوو، هیچ سەری نەگرت. لە لایەکی تر دەوڵەت مامەڵەیەکی فێڵاوی گرتبووە بەر، وای دەگوت:"عوسمانییەکان چونکە ئاگاداری نامەی شەڕیان نەناردووە، نابێ شەڕیان لەگەڵ بکەین و تەنیا دەبێ خێڵە یاخی بووەکان سەرکوت بکەین" فەرمانفەرماش لەسەری کرابوو کە بێجگە لە کورد شەڕ لەگەڵ کەسی تر نەکا.(١٣)

بەڵام پێنەدەچوو کە تورکەکان تەنیا بە ئاماژەی شای زۆرداری قاجاری و بە مەبەستی گێرەشێوێنی و سازکردنی ئاستەنگ لەسەر ڕێی دەستوورخوازانی ئێرانی هەڵسابن بە داگیرکردنی سابلاغی موکری. لازاریف لەو بڕوایە دایە کە ئەوەی پاڵ بە عوسمانییەوە دەنێ بۆ هێرشی یەك بەدوای یەکی بۆ سەر خاکی دراوسێیەکەی ئێران، ئەوەبوو کە دەیویست لە ڕێگایەکی ئاسان و کەم زیان واتە داگیرکردنی قوژبنێك لە خاکی بێگانە چەند ڕۆژێك لە بارودۆخی شێواو و قەیرانەکانی خۆی هەڵێ و هاوتەریب لەگەڵ ئەوەش کێشەی کورد لە خاکی خۆی چارەسەر بکا.

لازاریف بە پشتبەستن بە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیە نیشان دەدا کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٠٨ لە ئەستانبۆل بڕیاردرا کە" کێشەی کورد بۆ ئێران بگوازرێتەوە، تاکو کورد دەست لە خەباتی خۆی دژی دەوڵەتی عوسمانی هەڵگرێ و تێیان بگەیەنێ کە لە کۆتایی هێرش بۆ سەر ئێران بەشێك لە دەستکەوتی شەڕ دەدرێتە کوردەکان".(١٤)

لەوانەیە بکرێ بگوترێ کە تورکانی لاو بە تەمای زیندووکردنەوەی پلانی سوڵتان عەبدولحەمید لە ڕەوەندی ڕاپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلا بوون و دەیانویست بە داگیرکردنی ئەو ناوچانەی کە خەڵکەکەی لەسەر ڕێبازی سوننە بوون لە ئازەربایجان، قەڵەمڕەوێکی تایبەت بۆ کوردەکان ساز بکەن و بەم شێوەیە ناسیۆنالیستانی کورد هێمن بکەنەوە. بەهەرحاڵ ناسیونالیزمی کورد لە دەیەی یەکەمی

سەدەی بیست لە کوردستانی عوسمانی بە دەرکەوت و کوردی عوسمانی بە پێکهێنانی پارت و گروپ و بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەی کوردی لە سیستمی دەستووری عوسمانی داواکاری مافەکانی خەڵکی کوردیان دەکرد. بەڵام تورکانی لاو کەوتنە سەرکوتکردنی کوردان لە بەرانبەردا نەتەوەپەروەرانی کورد خەباتی خۆیان خەستتر کرد و لەگەڵ میللەتانی عەرەب و ئەرمەن یەکیان گرت و هەروەها هەوڵیان دا جموجۆڵێك بخەنە نێو کوردی ئێرانی.

# کوردانی ئازەربایجان و هەوڵەکانی

## ناسیونالیستانی کوردی عوسمانی بۆ پڕۆپاگەندەی بیروڕای خۆیان لە ئێران

کوردانی عوسمانی پاش سەرکوتکردنی ساڵی (١٩٠٩) و گرتن و لە سێدارەدان و دوورخستنەوەی خەباتگێڕانی کورد بۆیان دەرکەوت کە ئەو پارت و ڕێکخراوەی دایانمەزراندوون تا چەندە لە بەرانبەر تورکانی لاو کزو لاوازن و تا چ رادەیەك پێوەندی ئەم پارتانە لەگەڵ خەڵکیدا کەمە. لەوەی کە ئەم بزاقە تەنیا لە چوارچێوەی کوردستانی عوسمانیدا دەجووڵایەوە، ببوو بە خاڵێکی لاوازی ئەم بزاقە. لە تۆڵەی ئەم کەموکووڕیانە، پێوەندی لە نێوان کوردی عوسمانی و نوێنەرانی گەلانی عەرەب و ئەرمەنی دەست پێکرا و بەپێی نووسینی نوسەرانی پەرتووکی (کوردەکان) لەم ئان و ساتەی چالاکی نهێنی، زنجیرەیەك پێوەندی نێوان تێکۆشەرانی کوردو نەتەوە ئەرمەنییەکان و عەرەب لە خەباتی هاوبەش دژی دیکتاتوری "ئیتحادیون" ساز بوو. ناسیۆنالیستانی کورد پشتگیری و هاوڕایی خۆیان دەربڕی لە ئاست راپەڕینی عەرەب کە لەم بەینەدا لە یەمەن و عێراقی عەرەب (بەغداو بەسرە) و جیل و جزیرە لە (سوریە) سەری هەڵدابوو و هەندێ نوێنەری رابەری راپەڕیوانی یەمەن واتە ئیمام یەحیا شێخ سەعید بۆ کۆکردنەوەی پیتاك بۆ بزاڤەکەیان هاتبووە کوردستان.[١٥]

لازاریف ئاماژە بە چاوپێکەوتنە نهێنییەکانی سەرکردە کوردەکانی عوسمانی لەگەڵ حەسەن پاشا و شێخ سەعید یەحیا نوێنەرانی راپەڕینی یەمەن لە ساڵی (١٩١١) لە شاری موش دەکات و هەروەها لەسەری دەڕوات کە کورد بۆ راپەڕیوانی یەمەن پارە کۆ دەکاتەوە.[١٦]

شان بە شانی ئەم چالاکیانە، سەرنجی ناسیۆنالیستی کوردی عوسمانی بەرەو کوردستانی ئێران وەرچەرخا. بێ توانایی زۆری سیستمی قاجار، بەربڵاوی خێڵ و هۆزگەلی کورد و ئەگەری یارمەتی رووسیە بە خەباتگێڕانی کورد لە ئاست قسەکەیان، عوسمانی بۆ پڕۆپاگەندەکردنی ناسیۆنالیزمی کوردی لە نێو کوردانی ئەو دیوی سنوور هان دەدا. خەباتگێڕانی کوردی ئازەربایجان بۆ مەبەستی خۆیان، ئازەربایجانیان هەڵبژاردو بۆیان مسۆگەر بوو کە پڕۆپاگەندەی ناسیۆنالیزمی کوردی لە میرنشینی کوردستان کە زۆر بەخەستی لە رووی سیاسیی و ئابوورییەوە پێوەندی خۆش بوو لەگەڵ ناوچەکانی دیکەی وڵاتی ئێران، هیچ سوودێك نابینن و لە تۆڵەی ئەو، ناوچە خێڵەکییەکانی

ڕۆژئاواو باشووری دەریاچەی ورمێ جێگایەکی گونجاو بۆ ئامانجەکانی ئەوان حسێب دەکرێ. لەمەودوا بینەری هەوڵە بەرفرەکانی کەسایەتی وەك (عەبدولڕەزاق بەدرخان، شێخ عەبدولقادر و سەید تەها) لە نێو کوردانی ئازەربایجان دەبین. ئەم سەرکردانەی کورد هەوڵیان دەدا کە سەرنجی رووسیەی قەیسەری بۆ هاریکاری لە پلانەکانیان راکێشن، بەڵام رووسیە لە سۆنگەی ئەوەی کە دەترسا لەوەی ناوچەکە پتر تووشی قەیران و شێواوی بێ و لە ترسی ئەوەی کە تورکانی لاو و دەوڵەتی ئەلمانیا سوود لەو بارودۆخە شێواوە وەربگرن، وەڵامەکەی نێگەتیڤ بوو.

(عەبدولڕەزاق) بۆ بەرەو پێشەوەبردنی مەبەستەکانی خۆی توانی پشتیوانی مورتەزا قولی خان سەرداری ماکو و سمکۆ سەرۆکی خێڵی شکاك بۆ نەخشەکانی خۆی رابکێشێ و چالاکی خۆی لەسەر بنەمای سێ تایبەتمەندی، ناوچەی کوردنشین و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەلومەرجی رامیاری ئێران و وڵاتانی عوسمانی و رووسیەی قەیسەری ئەو کاتی، دەستپێکرد کە پلانەکە بەم شێوەیە بوو:

١ـ بەربڵاوی هۆز و خێڵەکانی کورد و پێویستی یەکگرتنیان.

٢ـ بێ توانایی و سستی دەوڵەتی ئێران و عوسمانی و پێشێل کردنی مافەکانی کوردی ژێر دەسەڵاتیان.

٣ـ هەبوونی راستییەکی سیاسی ـ سوپایی بەناوی ئیمپراتۆری رووسیە لە رۆژهەڵاتی نزیك کە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی جیا لە دەوڵەتانی عوسمانی و ئێرانی هەبوو.

(عەبدولڕەزاق) بەرلە هاتنی بۆ ناو خاکی ئێران، هەندێ ئاخافتنی لەگەڵ جێگری کونسولی رووسیە لە شاری وان سازدا و لەوانە گوتی:" هەموو شتمان تەیارکردووە، چاوەڕوانین لەم رۆژانە موسا بەگ (یەکێ لە سەرکردەکانی کورد لە عوسمانی) نیشتمانپەروەری گەورەی کورد بۆ وان بێ. موسا بەگ بەرلە من دەچێتە ئێران. لە دواییدا من لە وانەوە بۆ ئێران دەڕۆم و لەوێدا لە حکوومەتی ئێران دەخوازم کە حکوومەتی کوردستانم پێ ببەخشێ و لە بڕی ئەمەدا بەڵێنیان دەدەمێ کە تورك لە خاکی ئێران ڕاوبنێم و دەریان بکەم. ناسر ئەلملیك دەناسم و نێوانمان لەگەڵ یەکتری خۆشە. ئومێد دەکەم کە ئێرانییەکان بێ ئەوەی بیانوییەك بیننەوە، داواکاری من بهێننە دی و ئەگەر لە رێگەی ئاشتی داواکاری من نەهێننە دی ئەوا بە هێزی چەك، سەلماس و ورمێ داگیر دەکەم و ئەگەر چوومە پێش ئەوا بروسکەیەك کە نیشاندەری ملکەچی بێ بۆ شا دەنێرم و مەبەستی خۆمی کە دەرکردنی سوپای تورکە لە خاکی ئێران، بۆ روون دەکەمەوە.[١٧]

ئەو پاش چوونە ناو خاکی ئێران کەوتە وتوویژ لەگەڵ سەرداری ماکۆ و سمکۆ و بەرلە چوونی بۆ ناوچەی قوتوور بۆ کۆکردنەوەی هێز داوای یارمەتی لە رووسیە کرد و بارودۆخی ناوچەکەی بۆ دیپلۆماتەکانی ئەو وڵاتەی بەم شێوەیە شیکردەوە:

" ئێستا (ساڵی ١٩١٠ ز) لەگەڵ سمکۆ بریارمان داوە، دیلمان داگیر بکەین و لە دەوڵەتی ئێران بخوازین من بکاتە حاکمی ورمێ و چاودێری سنوور. سەرداری ماکو هاورایە لەگەڵ من و بەم شێوەیە وەفاداری و نییەتی پاکمان لە راست رووسیە رادەگەیەنین". (١٨)

بەڵام وەزیری دەرەوەی روسیە نیرانۆف دژی پلانی (عەبدولرەزاق) وەستا و ئەم پلانەی بە دەسپێکی شێواوترکردنی بارودۆخی ناوچەکانی باشوور و رۆژئاوای ئازەربایجان هەڵسەنگاندبوو. جگە لەمە کونسولی عوسمانی لە ورمێ، زۆر زوو ئاگاداری چالاکییەکانی عەبدولرەزاق بۆوەو لە چەندایەتی و چۆنایەتی پلانەکەش وەئاگا هاتەوە، چونکە ئەم دەرەبەگەی کورد بێجگە لە رابردووی سیاسیی، کەسێکی لە ئەستانبۆل کوشتبوو و وەك تاوانبارێك لە دوای بوون بیگرن، بۆیە دەوڵەتی عوسمانی داوای لە ئێران کرد کە بیگرێ و بیداتەوە عوسمانی و عەبدولرەزاق گیانی کەوتە مەترسی، بۆ رووسیە هەڵات و لە ناو کۆشکی قەیسەر پلەی پەردەداری پێ درا. (١٩)

سیاسەتوانانی رووس سەرنجیان دابووە ئەم خاڵە کە کۆمەڵگەی کوردی ئێران، ئامادەی وەرگرتنی ناسیۆنالیستی کوردەکانی عوسمانی نین و بە تایبەتی لە ئازەربایجان کە بەرێوەبردنی کاروباری کوردان لە دەست سەرەك خێلەکانە، تەنانەت سەرەرای کەلێن لە نێوان ئازەرو کورد، لە سۆنگەی پێوەندی پتەوی نێوان سەرەك هۆزەکان و دەوڵەتی ئێران هیچ کەس حازر نابێ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد کە لەوانەیە لە پشتیوانی رووسیە بێبەش بێ و ببێتە ئامانجی بەردەوامی هەرەشەکانی عوسمانی، خۆی بخاتە مەترسییەوە.

جگە لەمە ناسیۆنالیستەکانی کورد توانای سازکردنی پێوەندی بەربلاویان لەگەڵ جەماوەری کوردی نەبوو، تەنیا گوێیان بۆ سەرکردە مەزاج رەنگاورەنگەکانی خێلەکان شل دەکرد و بێجگە لەوەی زانیارییەکی ئەوتۆیان لە ئەزموونی کاری رێکخراوەیی و خەباتی کۆمەڵایەتی نەبوو.

توێژەری رووس لازاریف لە کاتی هەڵسەنگاندنی یەکەم چینی نەتەوەی کورد لەم کاتەداو رادەی پێوەندیان لەگەڵ خەڵکیدا دەنووسێ:" کردارو جموجۆلی یەکەم گرووپی نەتەوەییەکانی کورد لەو

ڕۆژگاریدا، دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم لەگەڵ ئەوەی لە دوورەوە رواڵەتێکی پێشکەوتووی هەبوو، بەڵام لە رووی کاریگەر بوون و باڵادەست بوونی لەسەر خەڵك و جەماوەری کوردی زۆر بەرچاو نەبوو".[٢٠] بە ئاکام نەگەیشتنی کوردی عوسمانی لە وروژاندن و راپەڕاندنی کوردی ئازەربایجان ئەوە دەسەلمێنێ کە نێوانی کورد و تورك و نارەزایی کوردان لە دەوڵەتی ناوەندی هێشتا وا قووڵ و جیدی نەبووە کە ببێتە هۆی خولقاندنی ورەی روبەڕووبونەوەو دژایەتی هەمە لایەنە لە دژی ئێران و ناسیۆنالیزمی ئێرانی، لە نێو کورداندا.

# پێکهێنانی ئەنجوومەنەکان

ناوچەکانی کوردنشینی ئێران بەرەبەری شۆڕشی دەستووری، ئابووری کشتوکاڵی هەبوو و بێجگە لە سنە و کرماشان، شاری گەورەتری تێدا بەرچاو نەکەوت کە تێیدا چینی مامناوەندی شارنشینی لێ سەرهەڵبداو ساز ببێ و لێرەش وەك ناوچەکانی تری ئێران، زەویدارانی گەورە و خانەدانانی ناوچەکە لەگەڵ سیستمی قاجاری بەرژەوەندی هاوبەشیان هەبوو و مسۆگەربوو کە دژی هەر جۆرە گۆڕینێك بوون لە پێکهاتە و ستراکتۆری دەسەڵاتدارێتی و چاکسازی سیاسیی و کۆمەڵایەتی، لەوەڕا کە لە کوردستان ژمارەی شارنشین زۆر کەمتر بوو لە هۆزەکان و لادێکان، تەنیا بازاڕییەکان دڵبەندی خۆیان لە ئاست شۆڕشی دەستووری و پەیامەکەی کە بە یاسایی بوونی کۆمەڵگە بوو، نیشان دا و لێرەش وەك شارەکانی تری ئێران، زانایانی ئایینی رۆڵی سەرکردایەتی دەستوورخوازانیان لە ئەستۆ گرتبوو. هەڵگرتنی لە هەمان سەرەتادا پێدەچوو کە دروشمی ئازادیخوازی لە کوردستان لەگەڵ کۆمەڵێك ئاستەنگی گرنگ رووبەڕوو دەبێتەوە، چونکە کۆمەڵگەی کورد لەو کاتیدا پێوەندی کۆمەڵایەتی خۆی تەنانەت لە شارەکانیشدا لەسەر پێوەندی خوێنی و خێڵەکی دامەزراندوە، چونکە چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵگە ئاراستە سیاسییەکانیان دەسنیشان دەکرد، ئەگەری هێنانی هزری نوێی کە داکۆکی لە گۆڕانکاری بناغەیی لە زۆر لایەنی ژیاندا دەکرد بە راستی کارێکی دژوار بوو و دەبوو خانەدانان و پیاوە گەورەکان پشتیگری خۆیان لێ دەربڕیبا. د. عەباس وەلی لە کاتی توێژینەوەی هۆکارەکانی بەشدارنەبوونی کوردان بە شێوەیەکی بەرفرەوان لە شۆڕشی دەستووریدا دەڵێ کە چینی سەرەوە چینی بازرگانانی کۆنی کوردی لەبەر هەبوونی پێوەندی بازرگانی لەگەڵ رووسیەی قەیسەری و عوسمانی، ئاگای لە هزری چاکسازی و پێشکەوتن و کولتووری نوێخوازی هەبوو، بەڵام ژمارەی وان بۆ گۆڕانکاری بەرچاو لە ستراکتۆری کولتووری ژیانی شاری لە شارەکانی کوردستانی ئێران، کەم و کز بوو و لەسەری دەڕوا کە کۆمەڵگەی کوردی ئێران بە پێچەوانەی عوسمانی چینی رۆشنبیری لائیکی (عەلمانی) نەبوو.(١)

بەڵام حەمید موئمنی هۆکارگەلی ئابووری بە تەنیا لەم بارەیەوە بە کاریگەر دەزانێ و لەو بڕوایەدایە کە چونکە کوردستان شتومەکی بۆ دەرەوە نەدەنارد و لە رووی هێنانی شتومەکیش زۆر بەکەمی پشتی بە دەرەوە بەستبوو و لە ئەنجامی هەژاریدا خەڵکیش پێویستیان بە بەرهەمی بەکاربەر نەبوو،

هەر بۆیە پێوەندی هزری و گۆڕانکاری ریشەیی لە بواری کولتووری. ئەزموون نەکردووەو هەڵبەت خەڵکی لەبەر ئەم هۆکارانە لە ئاست شۆڕشی دەستووری لاسار بوون.(٢)

تان و پۆی خێڵەکی کۆمەڵگە تەنیا لە شاری سنە چینی بورژوازی کوردی سەری هەڵدابوو و هەروەها هەبوونی کەموکووڕی لە سیستمی زەویداری ناوچەکە و ئاڵوگۆڕێکی کەمی بازرگانی نێوان کوردستان و بەشەکانی تری ئێران بێجگە لە سنە، لە پێشنەکەوتنی بیری کوردی کاریگەر بوو، بەڵام زانایانی کورد وەك هاوتای شیعەیان لە گۆرانکاری سەردەمی دەستوورییەت بە شێوەیەك چالاك بە دەرکەوتن و لە پاڵ بازاڕیان یەکەم ئەنجوومەنی ئازادیخوازیان پێك هێنا. یەکێ لە رووخسارە ناسراوەکانی نێو دەستووریخوازانی کورد لەو سەردەمی، زانایەکی گەورە بە ناوی شێخ محەممەدی مەردۆخ بوو کە بە دامەزرێنەری یەکەم ئەنجوومەنی سنە حسێب دەکرێ. نووسینەکانی ئەو لە بارەی رووداوەکانی شۆڕشی دەستووری، بەهایەکی بەرچاویان لە گێڕانەوەی رووداوەکان دا هەیە.

مەردۆخ لە بارەی دەرکەوتنی یەکەمین ئەنجوومەنەکانی کوردستان دەنووسێ:" دوای لادانی وەزیری هومایون ، رۆژی هەینی (نۆیەمی موحەڕەم ١٣٢٥ك) ١٩٠٩ز، بروسکەی حکوومەتی ئیسماعیل خانی سیقە ئەلمەلیك گەیشت.

رۆژی پێنج شەممە یازدەی رەبیع ئەلئەول هاتە کوردستان. سیقە ئەلمەلیك بە رواڵەت لە لایەن دەوڵەتەوە، حکوومەتی پێك هێنا. وەلێ لە ناوەوە لە لایەن نەتەوەپەروەرەکان و لایەنگرانی دەستوورییەت راسپێردرابوو کە خەڵکی کوردستان بە بارودۆخی دەستوورییەت بناسێنێ و ئەو ناوچەیە بکا بە پاشکۆی هێزەکانی نەتەوەیی.(٣) سیقە ئەلمەلیك لە هەر دەرفەتێك پێویستی و رەنگی سەقامگیری سیستمی دەستووری دەخستە روو و خەڵکی سنەی لەگەڵ ئامانجەکانی شۆڕش ئاشنا دەکرد، بەڵام واپێدەچوو کە لە نێو کوردی دانیشتووی تارانیش لایەنگرانی دەستووری هەبوون و مەردۆخ بە راشکاوی دەڵێ کە بەر لە وتووێژی لەگەڵ سیقە ئەلمەلیك لە لایەن کوردانی دانیشتووی تاران پێشنیاری ئەوەی پێدابوو کە لە کوردستان ئەنجوومەنی میللی پێکبهێنن.(٤)

پێخۆش بوونی کوردانی دانیشتووی ناوەند سەبارەت بە پێکهێنانی ئەنجوومەن لەوەوە دەهات کە بازرگانان و بازاڕیانی کورد پتر لایەنگری ئەوە بوون کە سیستمێکی میللی و فەرمانڕەوایی یاسا بەرقەرار بێ و لە یەکەم هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی (دار ئەلشوورا) کە لە ناوەڕاستی (شەعبانی ١٣٢٤) کۆتایی پێهات، (ئەمین ئەلتوجاری کوردستانی) وەك نوێنەری کوردستان و ئەندامێکی چینی پیشەگەرەکان هەڵبژێردرا.(٥) هەڵبژاردنی ئەو، ئەوە دەسەلمێنێ کە خانەدانانی ناوچەیی نەیانتوانیوە

ئەو کەسەی کە لەبەرچاویان گرتبوو، بۆ ئەنجوومەن بنێرن و هەروەها ئەوەش دووپات دەکاتەوە کە بازرگانان هێندە هەستی خۆگونجاندن و بڕوا بە دەستووریان لەلا دروست ببوو کە توانیویانە لە چینی خۆیان نوێنەرێك بەناوی گشت میللەتی کورد بۆ ئەنجوومەنی راوێژکاری بنێرن.

بەهەرحاڵ یەك مانگ دوای وتووێژی سیقە ئەلمەلیك حاکمی سنەو و شێخ محەممەد مەردۆخ، یەکەم ئەنجوومەنی دەستووریخوازانی ئەو شارە بە ناوی ئەنجوومەنی (سەداقەت) پێك هێندرا و پتر ئەندام و لایەنگرانی بریتی بوون لە چینی بازاڕی و بازرگان، پیاوانی ئایینی و چینی مام ناوەندی شار. مەردۆخ ئاماژە بەم خاڵە دەکا کە ئەنجوومەنی سەداقەت و چالاکییەکانی لەگەڵ دژایەتی ئاشکرای خانەدانانی ناوچەیی و زەویداران و سەرەك خێڵەکان رووبەڕووبۆوەو خەڵکێکی دەسترۆی وەك میرزا یوسف مشیری دیوان، پێشکاری حکوومەت رایگەیاند کە راسپێردراوانی دەوڵەت و چینەکانی تری کوردستان دەبێ ملکەچی فەرمانەکانی شا بن بە گوێبیستی بەیت و باڵۆرەی سەید و مەلا و بازاڕی.[٦] مشیری دیوان لەگەڵ خانەدانانی تری ناوچەکە وەك ئاسف کوردستانی، دەستەی چەکدارایان پێکهێنا بۆ ئەوەی ئەنجوومەنی سەداقەت بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و دەستووریخوازانیش سەرکوت بکەن، بەڵام چونکە حاکمی کوردستان بۆ خۆی دەستووری خوازبوو، نەیانتوانی کارێکی ئەوتۆ ئەنجام بدەن. مەردۆخ لە پەرتووکی خۆی هەوڵدەدا کە گۆڕانکارییەکانی دەستوورییەت لە سنە بە هەوڵ و هیمەتی خۆی لە قەڵەم بدا، بەڵام یەحیا سادق وەزیری لەو بڕوایە دایە کە بازاڕیانی شار بە تایبەتی پیاوێکی بناقودەنگی وەك حاجی شاهباز لە پێکهێنانی ئەنجوومەنەکان رۆڵی گرنگتریان لە ئەستۆ بووە.[٧] هەڵبژاردنی بازرگانێك نەك پیاوێکی ئایینی بۆ نوێنەرایەتی کوردستان لە ئەنجوومەنی راوێژکاری لەوانەیە پشتگیرییەك بێ لە وتەی یەحیا سادق، بەڵام دەبێ بزاندرێ کە رۆڵی شێخ محەممەد مەردۆخ لەم رووداوانە بای خۆی گرنگی هەبووە.

سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی سەداقەت لە ئەستۆی شێخ محەممەد مەردۆخ بووە و کەسایەتی ئەو وەك پیاوێکی ئایینی بەرچاوی کوردستان و مامۆستا و خەتیبی گەورەی سنە، بێگومان لە گەشەکردنی ئەنجوومەن یارمەتی داوە. لە یەکەمین بڵاوکراوەی ئەم ئەنجوومەنە لە بارەی گرنگی دەستوورییەت، والێك دراوەتەوە کە دەوڵەتی دەستووری لەگەڵ بنچینەکانی ئیسلام دەگونجێ و وڵاتی ئێران پێویستی پێی هەیە و پێکهێنانی ئەنجوومەنی راوێژکاری، زەرروورەتێکی نکوڵی لێ نەکراوی هەیە کە ئامانجی سەرەکی ئەو جێبەجێکردنی هەندێ مادە و رێسایە بۆ کەمکردنەوەو کۆنترۆڵی دەسەڵاتەکانی شا کە بە گشتی پێی دەگوترێ یاسا.[٨]

• ئەنجومەن لە بڵاوکراوەکانی خۆی هەوڵی دەدا نیشان بدا کە ئیسلام و دەستوورییەت بە یەکەوە گونجانیان هەیە و هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە لایەنگرانی دیکتاتۆری لە کوردستان وایان نیشان دەدا کە پێڕەوانی ڕێبازی سوننە وەك لە ئایەتی (اطیعوالله و اطیعو الرسول و اولی الامر منکم) دەبێ تەنیا ملکەچی شا بن و دەستوورییەت دژی ئەم بنچینە ئیسلامییەیە. لەگەڵ ڕیزبەندی لایەنگران و دژایەتی شۆڕشی دەستووری وەك سەرهەڵدانی ئاشکراو زەقی ناسیونالیزمی ئێرانی لە سەدەی بیستەم دەبینین کە کورد هەوڵی نەدا بەجیا داوای مافەکانی خۆی بکا، بەڵکو بە تەواوەتی لە خزمەت ناسیۆنالیزمی ئێرانی بوون یان وەفادار بە شا مانەوەو لە هەردوو حاڵەتدا سەلماندیان کە بەشێکن لە نەتەوەی ئێرانی و ئەگەرچی ناوەڕۆکی قەومی کوردیان هەیە، بەڵام ناوەڕۆکی میللی خۆیان لە ئێرانی بوون دەدۆزنەوە. چارەنووسی هاوبەشی کورد و نەتەوەکانی تری ئێرانی بە درێژایی هەزاران ساڵ، ناوەڕۆکی میللی ئەوانی سەقامگیر کردبوو و دەستوورییەت نیشانی دەدا کە کوردبوون هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ ئێرانی بوون نییە.

لێرەدا دەکرێ بگوترێ کە زەمینەخۆشکردن و تەکبیرداڕشتنی سیستمی قاجاری بۆ دروستکردنی یەکیەتی میللی بە درێژایی شۆڕشی دەستووری تاقیکراوەو گەیشتە ئەو راستییە و سەلمێندرا کە یەکەم شەپۆلی نەتەوایەتیی مۆدێرن نەیتوانی هزروبۆچوونی کورد لە ئاست ئێرانی بوونیان و هەبوونی ناوەڕۆکی میللی ئێتنوسەکانی ئێرانی بگۆڕێ، کەچی لە هەمان کاتدا، شۆڕشی دەستووری عوسمانی، زەمینەخۆشکەرێکە بۆ کوردەکانی ئەوێ کە داوای گەیشتنیان بە مافەکانیان بکەن و هەستی ناسیۆنالیستی کوردی لەناویان چەکەرەی کردو پتەوی کرد. هەروەها ئەم ڕووداوە نیشانی دا کە ئەزموونی سەرنەکەوتووانەی تورکانی عوسمانی لە پێکهێنانی یەکیەتی میللی، بەشداری نەکردنی کوردان لەگەڵ تورکان لە چارەنووسی ئیمپراتۆری بۆ ماوەیەکی دووروردرێژ (پێوەندی کورد و تورك لە شەش سەدە کەمتر بوو) بێبەش بوونی کورد لە دەسەلات، توندوتیژی حاکمانی تورك و بەسەنتەرکردنی دەسەلات لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە زۆر توندبوو.

لە سەدەی نۆزدەهەم، سوڵتانی عوسمانی واتە گەورەترین ئیمپراتۆری ئاسیا، لەبەرچاوی خانەدانانی کورد، وەك داگیرکەرێکی بەهێز وابوو کە بەسەریاندا زاڵ بووە.(٩) لە هەموو جێگایەکی کوردستانی عوسمانی تورك، بە بێگانە دەژمێردرا بۆ نموونە (جان ویشارد) پزیشکی ئەمریکی لە ساڵی (١٨٩١) لە ڕێگای کوردستانی عوسمانی هاتە ناو خاکی ئێران لە بارەی یەکێ لە میرانی کورد کە دەوڵەتی عوسمانی هەڵسەنگاندووە دەنووسێ:" ئەگەرچی ناوچەی ئەو بەشێك لە خاکی عوسمانی بوو، بەڵام هەرکات ئەو دەوڵەتە ویستبووی بە تەواوەتی دەست بەسەر ناوچەکەی دابگرێ، سەر نەکەوتبوو،

چونکه له راستیدا له سەرانسەری کوردستان، تورك وەك میوان قبوولّ کرابوون."[١٠] کەچی دەبیندریّ له ناوچه کوردییەکانی ئیّران له هەمان کاتدا که دەولّەتی ناوەندی هەولّدەدا دەسەلاّتی پتری بەسەریاندابشکیّ، هیچ گرفتیّکی نەبوو له ریّگەی دەسەلاّتداریّتییەکەی بەسەر ئەم ناوچانەدا و لەم بارەیەوە خۆڕاگری و دژایەتی کورد نەبیندراو هەرگیز نارِەزاییەك له لایەن ئەوانەی بەرانبەر بە شاو دەولّەتی ناوەند نەبیندرا، تەنانەت له رۆژئاوای ئازەربایجان که سەردەمیّکی پڕ له تەنگژەی تاقیکردبۆوەو راپەڕینی شیّخ عوبەیدولّلاّی تیّدا روودابوو. به پیّچەوانەی ئەوەی (ریچارد کاتم) له پەرتووکی خۆی "ناسیۆنالیزم له ئیّراندا" نووسیوویەتی[١١] هەولّەکانی شیّخ عوبەیدولّلاّ نەبووە هۆی گەشەکردنی هەست و وشیاری "کوردبوون" بەمانای ئیّرانی نەبوون له لایەن کوردی ئیّرانییەوە، بەلّکو پتر وشیاری "سوننی بوون"ی لەلای ئەوان بەهیّز کرد ئەویش تەنیا له ئازەربایجان. هەرچەندە ئەو بۆچوونەی ئەو له بارەی کوردانی عوسمانی تا رادەیەك بە راست دەزاندریّ. ئەگەر بارودۆخ بەو شیّوەیە بوویّ که (کاتم) باسی دەکا دەبوایە بینەری کۆمەلّیّك چالاکی توندی کوردی رۆژئاوای ئازەربایجان له شۆڕشی دەستووری بووباین، کەچی وانەبوو. بیّجگە له ئەنجوومەنی سەداقەت، ئەنجوومەنەکانی کریّکاران، حەقیقەت، (ئخوت) و سەلاّحیەتیش له ویلایەتی کوردستان پیّك هیّندرا که گشتیان چالاکی رەسمیان هەبوو، بەلاّم رۆلّیان له ئاست ئەنجوومەنی سەداقەت کالّ بوو. له شاری سەقز ئەنجوومەنیّك دروستبوو لەژیّر چاودیّری شاعیر، خۆشنووس و دادوەری بەناوبانگ مەلا محەممەدی کەریم که نازناوی "کەوسەر"ی وەرگرتبوو و رۆلّی بەرچاوی بینی له هاندانی خەلّکی سەقز بۆ ئەوەی پیّوەندی بکەن بە ئەنجوومەن و هاریکاری دەستووریخوازان بکەن.(١٢) هەروەها له شاری سابلاّغ قازی فەتاح مامی باوکی قازی مەحەمەد ئەنجوومەنی دەستووریخوازانی بۆ ئەو شارە دامەزراند.

رەنگ بیّ سەرکردەی خیّلّەکان بە پیّوەندی کردنیان بە ریزەکانی هیّزی دیکتاتۆر، له هەولّی کپکردنی هەستی ئازادیخوازانەی دەستووریخوازانی ناوچەکەش بووبن، چونکە ئامانج و دروشمە میللییەکان بە دلّی ئەوان نەبوو و هەڕەشەی له دەسەلاّتداریّتی ئەوان دەکرد بە هەرحالّ کارایی ئەنجوومەنەکانی کوردستان زۆر بەرچاو نەبوو و وزەی داهیّنان و کار و بڕیار سەبارەت بە دەستوورییەت، لەگەلّ ئالّۆزبوونی پتری بارودۆخ، کەوتە دەستی توخمەکانی دەسەلاّتخواز و زەویدارانی گەورەو هەرکە (محەممەد علی شا) و دیکتاتۆری بچووك دەسەلاّتی گرتە دەست و چالاکی ئازادیخوازانەی کوردیش تووشی کزی و لاوازی بوو.

بەلاّم له ناوچەکانی کوردنشینی ئازەربایجانی رۆژئاوا که مەلّبەندی سەرەکی هۆزەکانی کورد بوو، سیّبەری سەرکردەی خیّلّەکان لەسەر چارەنووسی سیاسی خەلّك خەستتر بوو تاکو کوردستانی باشوور،

و تەنانەت دەستووریخوازی کوردیش لە ئاست بەرژەوەندی و سوودی ئەوان دەهاتە ئارا. کەسرەوی کە سەبارەت بە کورد گەش بین نییە لەم بارەیەوە دەنووسیّ:"کورد کە زۆربەیان تالآنچی و مرۆڤکوژبوون و لە گوندەکانیان کۆڕو کۆبوونەوەیان دەکرد بیّ ئەوەی مانای دەستوورییەت بزانن و بیّ ئەوەی جۆرە کردارێکی تر بنوێنن، بالۆرەی دەستووریخوازی و یەکیەتی و یەکگرتنیان لێدەداو برووسکەیان بۆ تەوریّز و شوێنەکانی تر دەنارد".(١٣) ئەو هەروەها ئاماژە بەم خالّە دەکا کە سەرکردەکانی هۆزەکانی کورد لەژێرەوە پێوەندییان لەگەلّ دیکتاتۆری هەبوو و لایەنگری کوردانی جەلالی و ماکۆ لە دەستوورییەت بە فیتی (عزەتوللاّ خان سالار موکەڕەم) خوارزای (مورتەزا قولیخان) سەرداری ماکۆ بوو و هیچ بنەمایەکی پتەوی نەبوو و لە راستیشدا هەر وای لێهات، چونکە دوای گەڕانەوەی سەرداری ماکۆ لە قەفقازو داخستنی ئەنجوومەن لە ئەنجامی دوژمنایەتی (محەممەد علی شا) لە راست دەستوورییەتدا، کوردانی ماکۆ و چەهریق و موکریان لە دژی ئازادیخوازان و دەستوورییەتخوازان هاتنە نێو شەڕ و خزمەتەکانی هۆزی شکاك بۆ سەرداری ماکۆ بووە هۆی سەرکوتکردنی تەواوی ئەنجوومەنی خۆی.

لە کوردستانی باشوور هاوکات لەگەلّ بۆردومانی ئەنجوومەن و سەرکوتکردنی ئازادیخوازان، (محەممەد عەلی شا) (سیقە ئەلمەلیك)ی لادا و شازادە (زەفەر ئەلمولکی) کردە حاکمی ئەویّ. مەردۆخ دەنووسیّ یەکەم کاری حاکمی نویّ نانەوەی ناکۆکی لە نێوان ئازادیخوازانی سنە بوو کە بووە هۆی داخستنی ئەنجوومەنەکان.(١٤) مەردۆخ پاش ئەم رووداوە بۆ تاران چوو و دوابەدوای کەوتنی شا و سەقامگیری سیستمی دەستووری شۆڕشگێر، ئازادیخوازانی کورد لە چوارچێوەی رێکخراوی "پێشکەوتن و سیڤیلیزاسیۆن" کۆبوونەوە. ئەم رێکخراوە پتر لە دوو هەزار ئەندامی هەبوو و لە یەکەم بلاّوکراوەی خۆیدا، چاوەڕوانییەکانی کوردیان لە دەستوورییەت راگەیاند.

ئەوەی لەم بلاّوکراوەیە بایەخی هەبوو، ئەوەیە کە کورد خۆی بە بەشێك لە میللەتی ئێران دەزانیّ و خوازیاری چاکسازییە لە هەموو روویەکەوە بە مەبەستی هاتنەدی دروشمەکانی شۆڕشی دەستووری و جیاوگێکی تایبەتی بۆ کۆمەلّەی کوردی داوا نەکرد.(١٥) کاتیّ کە زانایانی ئایینی ولاّت لە مانگی (زی حەجەی ١٣٢٧ ك) ١٩٠٦ز داوایان لە خەلّکی کرد کە بۆ نارەزایی لە دژی بوونی هێزی رووس لە ئێران رێوڕەسمی جەژنی نەورۆز بەرپا نەکەن، رێکخراوی (تەرەقی) پشتگیری لیّ کردن و ئامادەیی خۆی بۆ شەڕی رووسەکان راگەیاند.(١٦) رێکخراوی (تەرەقی) بە ئەریّ وەلاّمی تەلەگرافی زانا ئایینییەکانی دایەوەو ئامادەیی خۆی بۆ شەڕ لەگەلّ رووسەکان راگەیاند و چاوەدێری حکوومەتداری کاربەدەستانی دەولّەتیان دەکرد و سووربوون لەسەر دامەزراندنی پێکهاتەی دادوەری کوردستان (تشکیلات عدلیە کردستان)، لە ئەنجامی ئەم پێداگرتنەی رێکخراوی (تەرەقی) دادگایی دادوەری کە بریتی بوون لە

دادگای سەرەتایی مافەکان، دادگای سەرەتایی سزاو دادگای بازرگانی لە شاری سنە پێك هات.(١٧) بەم جۆرە کوردەکان نیشانیان دا کە لە هەلومەرجی ئاسایی ئامادەی خزمەتکردنن لە ئاست سیستمی دەستوورییەت و حەز دەکەن لە دەستکەوتەکانی دەستورییەتیش بەهرەمەند بن. هۆکاری پێداگرتنی رێکخراوی (تەرەقی) بۆ دامەزراندنی دادگاکانی دادوەری ئەوەبوو کە ئاسفی دیوان بە وەرگرتنی برێك بەرتیل لە سەرکردەکانی هۆزی چواردۆلی کە تۆمەتی دزینی سامانی بازرگانیان لەسەربوو، دەیویست بەرەلایان بکا. ئەندامانی رێکخراوەکە هەولیان دەدا دادگایەکی یاسایی رێکبخرێ و دەست تێوەردانی پیاوانی دەسرۆی ناوچەکە نەهێلێ. لە ئەنجامدا سەرکردەکانی هۆزی چواردۆلی درانە دادگاو بە تۆمەتبار لە قەلەم دران و دادوەری لەسەری سەپاندن کە زیانەکانی بازرگانان قەرەبوو بکەنەوە.(١٨)

## سالار ئەلدەولە و هۆزەکانی کورد بەرانبەر بە دەستوورییەت

هەللای سالار ئەلدەولە و بەرنگاربوونەوەی ئەو لە راست حکوومەتی دەستوورییەت، دەرەنجامی سروشتی بارودۆخی تێکەڵ و پێکەڵی رووبەڕووبوونەوەی ئازادیخوازان و دیکتاتۆری بچووك بوو، هەلپەرستی شازادەکانی قاجار و وورووژاندنی هێزەکانی بیانی بوو. (سالار ئەلدەولە) هەر لەو کاتی کە (محەممەد عەلی شا) لەسەر حوکم بوو لە ساڵی ١٢٨٦هەتاوی (١٩٠٧ز) هەوڵی دا لەتەك ژمارەیەك هۆزگەلی کورد و لوڕ تاران داگیر بکەن و بۆ ئەم مەبەستە بەخۆی و هێزەکەیەوە لە مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵ لە کرماشانەوە بەرەو پایتەخت بەرێکەوت، بەلام لە نزیکی نەهاوەند تووشی شکست و نەهامەتی بوو و بە نەمانی شا بۆ ئەوروپا دوور خرایەوە.

کەسرەوی دەڵێت کە (سالار ئەلدەولە) بە فرت و فێڵ و درۆ توانی هۆزەکانی کورد و لوڕ وەدوای خۆی بخاو بە بیانوی ئەوەی کە دەستوورییەت لە مەترسیدایە رووبەڕووی دەولەتیان بکا.(١٩) د. مەلەك زادەش پشتگیری لەم وتەیەی کەسرەوی دەکا کە ئەم شازادە قاجارییە لە بەرانبەر هۆزەکان وای نیشان دا کە بۆ بەرگری لە دەستوورییەت و رزگاری ئەو بەرەو پایتەخت بەڕێ کەوتووە و " ئەم هێزانەی کە هاوپەیمانی ئەو بوون کە بینیان شاو ئەنجوومەن لە دژی ئەوون، دەستیان شل بۆوەو لە ئەنجامدا محەممەد عەلی شا کە بۆ کپکردنی ئاژاوەی (ئیقبال ئەلسەڵتەنە و رەحیم خان) بچووکترین

هەنگاوی نەهاوێشت، دەستەیەکی سەربازی ڕێکخست و بۆ سەرکوتکردنی (سالار ئەلدەولە)ی هەنارد".[٢٠]

شازادەی قاجار لەگەڵ ئەوەی کە (محەممەد عەلی شا) هێشتا شا بوو، ڕاپەڕی، دوای لادانی بەهۆی تێکۆشەران و ئازادیخوازان یەکسەر لە ئەورووپاوە بەرەو عوسمانی چوو و لە بەغدا نیشتەجێ بوو تاکو لە وێوە چالاکی بنوێنێ بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی یاسایی دەستوورییەت و پێوەندی کردن بە سەرەك خێڵەکان دەست پێ بکا.

لەساڵی (١٩١١ز) شێخ محەممەد مەردۆخ لە لایەن قوتبی خۆی شێخ حوسامەدین نقشبەندی بۆ کوردستانی عوسمانی بانگهێشت کرا، چونکە یەکێك بوو لە خەلیفە هەرە جێ بڕواپێکراوەکانی، قوتبی خۆی لەوێ بیستی کە شازادە (سالار ئەلدەولە) ڕەزامەندی سەرکردەکانی کوردی عوسمانی و دەوڵەتانی ڕووسیە و عوسمانی بۆ ڕووخانی دەوڵەتی تارانێ وەدەست هێناوە و پێویستە کە مەردۆخ، موریدانی کوردی ئەو لە ناو خاکی ئێراندا بۆ یارمەتیدانی شازادەی قاجاری (یاخی بوو) قەناعەت پێ بێنێ.[٢١]

ئاشکرایە کە پێشینەی هاوکاری (شێخ محەممەد مردۆخ) و دیکتاتۆری بچووك سەرنجی شازادەی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو، ئەو هەنووکە دەیویست کە خەتیبی گەورەی سنە بخاتە ناو تەوەری یەکگرتنی هۆزەکانی لایەنگری خۆی لە ئێران و دوور نییە کە مەردۆخ لە خودی عوسمانی چاوی بە (سالار ئەلدەولە) کەوتبێ، چونکە پاش ماوەیەکی کەم لە گەڕانەوەی مردۆخ بۆ سنە، ئاژاوەی سالار ئەلدەولە دەستیپێکرد و ئەو ڕۆڵێکی گەورەی لە یارمەتیدانی شازادە بینی.

مەردۆخ دەڵێ کە دوای گەڕانەوەی بۆ ئێران، یەکسەر بروسکەیەکی بۆ (قەوام ئەلسەڵتەنە) ی وەزیری ناوخۆ ناردووە و لە کارەکان و ئامانجە گومانا وییەکانی سالار ئەلدەولە هوشیاری کردۆتەوە، بەڵام چونکە قەوام بابەتەکەی بە هەند هەڵنەگرتووە، لە ئەنجامدا دەوڵەتی ئێران نەیتوانیوە بەرلە ڕاپەڕینی شازادە کارێکی وابکا کێشەکە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی.[٢٢]

ئەم وتەیەی مەردۆخ ئاسان نییە قبووڵ بکرێ ،چونکە ئەو پێوەندییەکی چڕوپڕی لەگەڵ شازادە (سالار ئەلدەولە) هەبوو و دژوارە کە قبووڵ بکەین کە ئەو بەرژەوەندی دەوڵەتی لەبەرچاو گرتبێ، چونکە دوای هێرشی شازادە بۆ سەر شاری سنە، ئەو تەنیا کەسێك بوو کە لە شار مایەوەو زۆربەی خانەدانان و بازاڕیانی بەجێ و ڕێی شار و پیاوانی ئایینی بۆ هەمەدان هەڵاتن. لە ئاژاوەی (سالار ئەلدەولە)، دەوڵەتانی ڕووسیە و عوسمانی دەستیان تێدا هەبوو. بەکرێ گیراوی ڕووس کە پێوەندی

هەبوو بە شازادەی راپەڕیو، موجەلل ئەلسولتان لەو کەسانەی ناو دەربار بوو کە لە ئاست (مەحەمەد عەلی) شا وەفادار بوو. (د.مەلەك زادە) لەو بڕوایە دایە کە دوای سەرکوتکردنی هێزەکانی (مەحەمەد عەلی شا) لە رەمەزانی ١٩١١ز لە لایەن شۆڕشگێران گشت ئومێد و تەمای رووسەکان و دیکتاتۆرییەکانی لایەنگری شای لادراو، (سالار ئەلدەولە) بوو و لە پێناو سەرکەوتنی لە هیچ جۆرە هاریکاریکارییەك درێغیان نەدەکرد.[٢٣]

مێژوونووس و کوردناسی بەناوبانگی رووسی (م. س لازاریف) لە کاتی لێکۆڵینەوەی ئاژاوەکەی (سالار ئەلدەولە) بۆ ئەوەی رووسیە بە پیاوچاك لە قەڵەم بدا، هیچ باسی یارمەتی ئاشکرای دارایی و تەقەمەنی و رامیاری ئەو وڵاتە لە ئاست شای لادراو و برایەکەی و هەروەها رۆڵی سەنپترزبۆرگ لەو کوشت و کوشتارەی کە ئەوان ئەنجامیان داوە ناکا و بە پێچەوانە تا پێی کراوە دەوڵەتی عوسمانی و تورکانی لاوی لە هاندان و چەکدارکردنی شاو (سالار ئەلدەولە)دا بە تاوانبار لە قەڵەم داوە. ئەو لە بارەی نیازی تورکەکان لەم رووداوانە دەنووسێ:" لە راستیدا تورکیە لە هەمان سەرەتای بەدەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، رەوتێکی دوژمنکارانەی بە خۆوە گرت و ئەم هەڵوێست وەرگرتنە لە سەردەمی تورکانی لاو بێ ئەوەی گۆڕانکارییەکی تێدا بکەن، مایەوە. کۆنەپەرستی تورك کە هەڵسابوو بە دژایەتی کردنی شۆڕشی ئێرانی دراوسێ، نەك تەنیا دژی دیمۆکراسی بوون و نەیاندەویست کە بیروبڕوای شۆڕشگێڕانەی ئێران کار لەسەر تورکیە بکا، بەڵکو لە بۆچوونی ئەوان، ئەگەر شۆڕشی ئێران بەر بگرێ، سیاسەتی داگیرکارانەیان لە کوردستانی ئێران نەزۆك دەبێ و لەگەڵ لەمپەڕێکی گەورە رووبەڕوو دەبنەوە. ئەوەی کە پتر لە هەموو شارێك تورکیەی تووشی دڵەڕاوکێ کردبوو، ئەو هەوڵانە بوو کە ئەنجوومەنە شۆڕشگێڕەکان لە کوردستان و ئازەربایجان نواندیان، ئەو ئەنجوومەنانەی کە توانیبوویان، ئارامی و ئاسایش لەو ناوچانە دابین بکەن و بەوپەڕی توانایی لە بەرانبەر سیستمی رزیوی شایەتی بوەستن.[٢٤] هەر چەندە رای لازاریف لە بارەی چاوەڕوانییەکانی تورکانی لاو لە یارمەتی دانیان لە( سالار ئەلدەولە) راستە، بەڵام ئەم راستیانە بە مانای ئەوە نییە کە رووسیە هیچ دەست تێوەردانێکی لە راپەڕینی سالار ئەلدەولە نەکردووە. لە سەرتاسەری بەهاری ساڵی (١٩١١ ـ ١٣٢٩)ك (سالار ئەلدەولە) لە کوردستانی ئێران و عوسمانی سەرقاڵی گەشت و سەرلێدان و وتووێژ لەگەڵ سەرکردەی هۆزەکان بوو و بۆ شای لادراو کە بڕیاربوو لە رێگەی باکوری ئێران و لە رێگەی رووسیە بەرێ بکەوێ، هاوپەیمانانی بۆ پەیدا بکا و بۆ ئەم مەبەستە، بڕێك پارەی بە سەرکردەکانی کوردی عوسمانی دەدا. (ئەلویریف)دیپلۆماسی رووس لە راپۆرتی خۆی بۆ وەزارەتی دەرەوەی رووسیە لە کۆتایی بەهاری ساڵی (١٩١١) ئاوا دەنووسێ:" ئەو کاتەی کە (سالار

ئەلدەوڵە) لە تورکیە بوو لە ڕێگەی "ئاشخان" ناوێك کە سەرکردەی گروپی داشناك لە شاری وان بوو، لەگەڵ ئەندامانی پارتی (ئیتحاد و تەرەقی) هاتە ئاخافتن، هەندێ پارەی لە بەردەست ئەوان داناو ئەوانی بۆ پڕۆپاگەندەکردن لە نێو کوردی ئێرانی نارد تاکو بەم شێوەیە کوردستان و ئازەربایجان بۆ لای خۆی رابکێشێ. شازادە لە سەرەتای گەشتەکەی چووە ناوچەکانی سڵدوزو سابلاغ و لەوێدا لەگەڵ گەورە بەرپرسانی سوپای داگیرکەری تورك و بەکرێگیراوانیان و سەرکردەکانی کوردی ناوچەکە وتووێژی کرد". (٢٥)

تەنانەت شێخ (عەبدولقادر) ناسیۆنالیستی بەناوبانگی کوردیش بەڵێنی دا لەکاتی پێویست یارمەتی شازادە بدا. بەپێی نووسینی مەردۆخ بڕیاری شازادە بۆ هێرش بۆ سەر سنە بووە هۆی ترس و دڵەڕاوکێی ئازادیخوازان و بازاڕیان و دەستەیەك لە خانەدانانی ناوچەکە لەوانە ئاسفی دیوان، مشیری دیوان و ئەمانوللاخان وەکیل ئەلمەلیك بۆ هەمەدان هەلاتن، بەلام خودی مەردۆخ لە شار مایەوە. (٢٦)

بەرەبەرە هۆزەکانی کوردی موکری، جاف، کەلهوڕو لوڕ لەگەڵ (سالار ئەلدەوڵە) کەوتن و ژمارەیان لە (٣٠) هەزار کەس تێپەڕی. ئەوەی پاڵی نا بە هۆزەکان کە یارمەتی شازادە بدەن، لە ئۆگریان بەتالان و بڕۆ و وەفاداریان بە شا وەك تەنیا بنەمایەکی دەسەلاتداریێتی کلاسیك لە ڕۆژهەلاتی گۆی زەوی و دژایەتی کردنی نوێخوازی و مۆدێرنیتە و بەڵێنی (سالار ئەلدەوڵە) کە ئەوانیش لە دەسەلاتداریێتیدا بەشدار دەکا، کورت دەبۆوە. مەردۆخ لە بارەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ (سالار ئەلدەوڵە) دوای کەوتنی سنە دەنووسێ: هەر کە چاومان بە یەکتر کەوت، قورئانێکی بچووکی لە باخەڵی بوو دەریهێنا و گوتی: بە هەقی ئەو قورئانە، ئەگەر من سەربکەوم ئەوا ئێوەش لەو چارەنووسەی کە من و براکەم دێتە پێشمان (دەسەلاتداریێتی) بەشدار دەبن، ئێوەش سوێندم بۆ بخۆن کە خیانەتم لێ نەکەن و دەستووریەت لە مێشکی خۆتان دەربهێنن". (٢٧)

بەم شێوەیە دەبینین کە بە پێچەوانەی بۆچوونی کەسرەوی و (د. مەلەك زادە)، تەنیا پێوەندی خزمایەتی نەبووە هۆی هاوکاری سەرکردەکانی کورد و شازادەی قاجاری، بێگومان پشتیوانی دارایی و تەقەمەنی تورکانی لاو، پڕۆپاگەندەی بەربلاوی ناسیۆنالیستانی کوردی عوسمانی لە خولقاندنی ئەم ڕووداوە زۆر کاریگەر بووە و هاوپەیمانێتی و پشتیوانی کردنی ناسیۆنالیستانی وەك شێخ عەبدولقادر و ئەندامانی پارتی (ئیتحاد و تەرەقی) لە ئاست شازادەی ڕاپەڕیو، هۆکارگەلێکی گرنگتر لە خزم و خزمایەتییەکی سادە بوو.

درك کینان لەو بڕوایە دایە کە هاوکاری و وەفاداری کورد لەگەڵ (سالار ئەلدەولە) لەوەوە هات کە کورد دژی نوێخوازی بوو و هەروەکو هۆزەکانی کوردی تورکیە دژی نوێخوازی تورکانی لاو بوون و لەگەڵ یەکتری هەڵیان نەکرد و لە ئێرانیش دەستوورییەت بە ئادگارێکی ناشیرین، نیشانی کورد درابوو.[٢٨]

شازادە سالار ئەلدەولە پاش هاتنی بۆ ناو خاکی ئێران و گرتنی شارەکانی سنە و کرماشان و هەورامان و دوای دڵنیابوون لە پشتیوانی بەرفرەوانی کورد و لوڕ، پتر لە رووسیە نزیك بۆوە، چونکە هەستی دەکرد کە تورکانی لاو دوای ئەوەی کە دەرفەتیان پێدا بە کەیفی خۆی لە ناوچەکە راپەڕین بکا، ئەوا دوای تەنگژەکە لە سوپای تورك داوای یارمەتی بکا کە بە درێژایی سنوورەکانی رۆژئاواو بەرانبەر بە کوردستان و کرماشان هێزیان دابەزیبوو. بەڵام (سالار ئەلدەولە) گوێی بە داواکارییەکانی تورك نەداو داوای لێ نەکردن کە بێنە ناو خاکی ئێران و تەنانەت بەپێی راپۆرتی دیپلۆماتەکانی رووس" داوای لە کوردەکان کرد کە نەهێڵن تورك بێتە ناو خاکی ئێران و لە هەمان کاتدا داوای لە رووسیە کرد کە سوود لە هێزی خۆی وەربگرێ بۆ چۆل کردنی خاکی ئێران لە سوپای تورك و دەرکردنیان لە کوردستان".[٢٩] پێدەچێ کە تورکانی لاو دوای ئەوەی هەندێ یارمەتیان بۆ شازادە سالار ئەلدەولە نارد، ئەو هەقەیان بە خۆیاندا کە خۆ لە کاروباری ناوچەکانی کوردنشین هەڵقورتێنن تا ئەو جێیە کە (سالار ئەلدەولە) خۆی هەستیکرد کە ئاسایشی خاکی ئێران بە جیدی لە ژێر هەڕەشەی تورك دایە. لە نامەیەکی ناڕەزایی (سالار ئەلدەولە) کە بۆ بالیۆزی دەولەتی عوسمانی لە رۆژی (٢٠ی موحەڕەم ١٣٣٠)ك ١٩٠٩ز هاتووە:" کێشەی کردەوەکانی شەهبەندەری کوردستان (مەحموود موخلس)، کە لە رۆژی هاتنی بۆ کوردستان بێ سەروبەری لەم ناوچەیە سازکردووەو خۆی لە کۆمەڵێك کار وەردەدا بێ ئەوەی کە پێوەندی بەو هەبێ و خەڵکەکەی بۆ شەهبەندەرخانە بانگهێشت کردووە و بۆتە هۆی تێکچوونی شیرازەی وڵات و سەیر و سەمەرە ئەوەیە کە شەهبەندەرخانە، دار و زنجیر و فەلاقە بەکاردەهێنێ، گوێ لە قسەکانی حکوومەتی خۆجێی ناگرێ و بە تاقی تەنیا فەرمانڕەوایەکی سەربەخۆی دامەزراندووە کە دژی یاسای شارستانیەتە. هەروەها لەو ناوچانەی سنووری کە بۆتە کێشەی نێوان دوو دەوڵەت و سەربازی تورکی لێ دابەزیوە، هەموو رۆژ ئاژاوەیەك دەنێنەوە کە دەبێتە هۆی دەردەسەری بۆ هەردوولا. هەورەها دەرەبەگی سەقز کە بەرەو ساوە بەڕێ کەوتوون و گێرەشێوێنی لەوێ دەکەن کە دوای ئەوە ئێمە ڕاومان نان، هەڵاتن و دوای گەڕانەوەیان بۆ سەقز و بانە کە مولکی رەهای دەوڵەتی بەرزی ئێرانە، هانا بۆ بەرپرسێکی

سەربازی دەبەن کە لەوێیە ، (٢٥) سەرباز بۆ سەقز دەهێنن کە ئاشکرایە ئەم کارە چەندە دژی یاسای نێو نەتەوەیی و رێسای دابو نەریتی دراوسێیەتییە.(٣٠)

یاخیبوونی (سالار ئەلدەولە) بێجگە لە وێرانی ، کاولکاری، خوێنرشتن و لاوازکردنی دەوڵەتی ئێران و دەستڕۆیی بیانی لە کاروباری ناوخۆیی وڵات هیچ ئەنجامێکی تری لێ نەکەوتەوە و بێگومان سەرکردە کورتبینەکانی هۆزەکانی کورد لە بەرپابوونی ئەم بەڵایانە، لە هەمووان تاوانبارترن، چونکە سەلماندیان کە لە لایەنگری دیکتاتۆریدا ماددەیەکی خاوی سیاسین کە بۆیان هەیە بۆ هەر لایەك رابکێشرێن.

ئەم هەڵانەی هۆزەکان گران بەسەر کوردستاندا شکایەوە، چونکە لـە ئـەنجامی چـەکداربوونیان بـە چەکی تازە و مودێرن، ئاسایش لە ناوچەکانی کوردستان هەڵگیرا و ئابوورییەکەشی لە پەلوپۆ کەوت بە شێوەیەك وشکە ساڵییەکی ترسناکی ساڵانی( ١٩٠٩ و ١٩١٠ز) بووە هۆی مردنی ژمارەیـەکی زۆری کورد. لەم هەلومەرجەدا، دەستوورییەت، سەرنج و جوانی خۆی لە دەستدا و بووە هاوکێشەی بێ سەروبەری و دابەزینی سیاسیی و کۆمەڵایەتی و حاکمانی وەك (زەفەرولمولك) و (سەردار یەحیا) کە لە ساڵانی ١٩٠٠ تا ١٩١٢ز بەرپرسی بەڕێوەبردنی کوردستان بوون، هیچ کارێکیان نەکرد جگە لە ئاڵۆزترکردنی بارەکە، چونکە خانەدانان و زەویـدارانی گـەورەی خـۆجێی ئامـادە نـەبوون هـیچ جیاوگێك بە خەڵکی بدەن. لە وشکە ساڵی گەورەی بەر لە جەنگی جیهانی زۆر لە کوردان گیانیـان لە دەستدا کەچی عەمباری زەویدارانی گەورە لێوڕێژ بوو لە گەنم، بەڵام خاوەنـەکانیان ئاوڕیـان لـە برسییەکان نەدەدایەوە. لە ئەنجامدا بارودۆخی کوردستانی باشوور تووشی قـەیرانێکی هەمەلایەنـە بوو کە بەرپابوونی جەنگی جیهانی قەیرانەکەی خەستترکرد و دیاربوو کە لە هەلومەرجێکی ئـاوایی ئەم ویلایەتە نەیدەتوانی ببێتە مەڵبەندی ناسیۆنالیزمی کورد.

جەنگی جیهانی یەکەم کوردی ئێران و عوسمانی بە شێوەیەکی فراوان لە رووی بزووتنەوەو جموجـۆڵی سیاسیی و سوپایی ورووژاند و لاپەڕەیەکی نوێی لە مێژووی ناوچەکانی کوردستان کـردەوە، بـەڵام کاریگەری لەسەر کوردی عوسمانی زۆر زیاتر بوو، چونکە کەش و هـەوای سیاسـیی و کۆمەڵایـەتی ئێران لە بەرە بەری سەرهەڵدانی شەڕ هیچ لە بارودۆخی ئیمپڕاتۆری عوسمانی نەدەچوو. لـەو وڵاتـی تورکانی لاو پاش سەرکوتکردنی راپەڕینی لایەنگرانی سوڵتان لـە سـاڵی (١٩٠٩) پـتر لـە جـاران هەستی تۆرانیچییەتیان بڵاوکردەوە و یەکگرتنێکی سێ کۆچکەییان کە بریتی بوو لە ئەنوەر پاشـا، تەلعەت پاشا و جەمال پاشا پێك هێنا، کە هەوڵی سەرەکیان بۆ دامەزراندنی ئیمپڕاتـۆری تـۆرانی گەورەو نزیکبوونەوەیان لە ئیمپڕاتۆری ئەڵمانی بوو و لەژێر تیشکی ئەم سیاسەتە بوو کە یەکگرتنی سێ کۆچکەیی، لە ساڵی (١٩١٤) بە نهێنی پەیمانی سوپایی لەگەڵ ئاڵمان دا واژۆ کرد.

بەپێی نووسینی کەندال یەکگرتنی سێ کۆچکە بە هیوای دەست بەسەرداگرتنی ئەو تۆرانەی کە لـە خەیاڵی خۆیان دروستیان کردبوو، واتە هەر وڵاتێك کە تورکی تێدا نیشتەجێیە، هاتە شەڕ و لـەژێر پەردەی شەر دا"پتر لە یەك ملیۆن ئەرمەنی و ٧٠٠٠٠٠ کوردیان بە کوشتدا".[١]

رێکخراو و پارتە کوردییەکان لە سۆنگەی کەشوهەوای تۆقاندن و داپلۆسین نەیانتوانی خەڵکی کورد بۆ بەشدارنەبوون لە شەڕ هانبدەن تەنانەت هەندێ لە ناسیۆنالیستانی کورد وەك عەبدولقادری کوری شێخ عوبەیدوڵلا کە ئەو کاتی سەرکردەی سەنای عوسمانی بـوو، ناچـار بـوو قـازانجی تورکـانی لاو بێنێتە دی لە مەیدانی شەر. کەندال لە بارەی رووهێنانی کوردی عوسمانی بـۆ شـەڕ و بانگهێشـتی جیهادی سـوڵتان دەنووسـێ:" زۆربـەیان وەڵامـی ئـەرێیان بـە بانگهێشـتی خەلیفـە داوە، بـەڵام هەنـدێکیان، بـە تایبـەتی هۆزەکـانی باشـووری کوردسـتان و دانیشـتووانی دەرسیم خۆیـان لـە بەشداریکردنی شەڕ بوارد. ژمارەیەك لە هۆزەکانی باکوور بە شێوەیەکی پراکتیکی لە پـاڵ سـوپای رووسیە شەڕی عوسمانیان کرد.[٢] بەڵام کاریگەری راگەیاندنی جیهاد لە لایەن سوڵتان کە بە رواڵەت خەلیفەی موسڵمانان حسێب دەکرا، پشتیوانی شێخ و زانایانی ئایینی کورد لەم راگەیاندنە و حەزی شەڕکەرانی هۆزەکان بۆ وەدەسهێنانی دەسکەوتی شەڕ و چەکی پێشـکەوتووتر، کوردەکـانی وا لـێ کرد کە چ بیانەوێ و چ نەیانەوێ بکەونە شەڕ و بـەپێی نووسـینی لازاریـف سـوپای حەمیدییـە و هۆزەکانی نزیك لە سنووری رووسیە یەکەم دەستەی کورد بوون کە تەنانـەت بەرلـە دەسـتپێکردنی شەڕ کەوتنە کوشتاری خەڵکی رووسـیە و تـاڵانکردنی سەروەتیان.[٣] بـەڵام لـە ئێرانـی ئێمـەدا،

بارودۆخ بە شێوەیەکی تر بوو، لە لایەك دەوڵەتی ناوەندی بە شێوەیەکی رەسمی بێ لایەنی خۆی ڕاگەیاند و باڵە پارێزگارەکانیش پشتیووانیان لێ دەکرد، لە لایەکی تر باڵی توندڕەو و شۆڕشگێڕ، خوازیاری بەشداری ئێران لەشەڕ بوون و یەکگرتنیان لەگەڵ عوسمانی و ئاڵمان بە دەرفەتێکی مێژوویی دەزانی بۆ کۆتایی هێنان بە بوونی ناشەرعی دەوڵەتانی رووسیە و بەریتانیا لە وڵات و خۆتێهەڵقورتانی نارەوای ئەوان لە کاروباری نێوخۆدا. لایەنگرانی ئەم شێوازە بیرکردنەوەیە رەوەندی کۆچکردنی هێنا ئارا. هەندێ لە کەسایەتی ناوداری ئێرانی، بەر لە شەڕیش حەزیان دەکرد هاوکاری لەگەڵ ئاڵمان سازبکەن بە تایبەتی هەرچەندە کە دەسترۆیی ئەو وڵاتە لە عوسمانی زێدەتر دەبوو. بەپێی نووسینی لازاریف "مورتەزا قولی خان سەرداری ماکۆ کە لە بەرەبەری شەڕی یەکەمی جیهانی خۆی لە رووسیە دوور خستبۆوە، لە هەمان ساڵی (١٩١٣) چووە بەرلین و لەوێدا بە یارمەتی ( نایب ئەلسەڵتەنە)ی ئێران (ناسر ئەلمەلیك) کە ئەوکاتی لە ئاڵمان بوو، لەگەڵ لێپرسراوانی ئەڵمانی کەوتە ئاخافتن".(٤) لە ویلایەتی کوردستان هەندێ کەسایەتی کورد وەك (شێخ محەممەد مەردۆخ، عزولمەمالیك ئەردەلان و عەباس خان سەردار رەشید) لەگەڵ کۆچبەران کەوتن. مەردۆخ کە یەکێ بوو لە پیاوانی ئایینی پایەبەرزی کوردستان لە ساڵی ١٣٣٣ك ١٩١٢ز بۆ نارەزایی شێوەی فەرمانڕەوایی سەردار محیی لە کوردستان چووبووە تاران. دوای وتووێژ لەگەڵ دەستەکانی لایەنگری یەکگرتن لەگەڵ ئاڵمان، بەڵێنی هاوکاری پێدان و (عزولمەمالیك)یش لەتەك کۆچبەران چووە قوم. ماوەیەکی کەم دوای ئەم رووداوانە (عزولمەمالیك) لە دەوڵەتی کاتی پۆستی وەزارەتی سوودی گشتی و بازرگانی وەدەست هێنا و شێخ محەممەد مەردۆخیش لە ساڵی (١٣٣٤)ك ١٩١٣ز لە شاری سنە رۆژنامەی (نیدای ئیتحاد)ی بڵاوکردەوە و هاوکاری لەگەڵ ئەم گۆرانکاریانەی (عەباس خان سەردار رەشید کوردستانی) هێزی کۆدەکردەوە بۆ شەڕ لەگەڵ رووسەکان.(٥)

لەهەمان سەرەتای شەڕ، جیاوازی نێوان بەشی کوردنشینی ئازەربایجان و ویلایەتی کوردستان خۆی نیشان دا: لە کوردستانی باشوور بەشداری سەرکردەی هۆزەکان و کەسایەتی میللی و ئاینزای کورد لە شەڕی گەورە دا، شان بەشانی گۆڕانکارییەکانی ناوخۆی ئێران و هەست بە بەرپرسیارێتی ئەوان لە ئاست پاراستنی خاك و بەرژەوەندی ئێران و راوەستان لە بەرانبەر بانگهێشتەکەی ناسیۆنالیستانی لایەنگرانی یەکگرتن لەگەڵ ئاڵمان دا، خۆی نیشانیدا بەڵام لە ئازەربایجان کاردانەوەی کورد لە ئاست شەڕدا تا رادەیەك لەژێر چاودێری دەوڵەتی عوسمانی و تەنانەت سەربەخۆ لە چالاکییەکانی سوپای ئەو دەوڵەتە بەرچاو دەکەوت، هەرچەندە پاڵنەری هۆزەکان و دانیشتوانی شاری سابلاغ جیاوازبوو لە ئەوانی تر کە لە جێگەی خۆی باسی لێوە دەکرێ.

بۆچوونەکانی ویلهلم لیتن کۆنسولگەری ئاڵمان لە تەوریز لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانی دەسەلمێنێ کە رووسەکان کەمێك دوای هاتنی عوسمانی بۆ ناو شەڕ، لەبەر ئەوەی کە لە هاوکاری و یەکگرتنی کوردی ئازەربایجان و عوسمانییەکان دڵنیابوون، تەنانەت بەر لە جموجۆڵی سوپایی کورد و عوسمانییەکان دەستیان کرد بە گرتنی سەرکردە و بازرگانەکانی کورد و عوسمانییەکانی ناو شاری تەوریز.(٦)

دیپلۆماتی رووس و. ویدنسکی کەمێك بەر لە دەستپێکردنی شەڕ بۆ وەزارەتی دەرەوەی رووسیە ئاگاداری کردبۆوە کە "کاربەدەستانی تورك لە ناوچەکانی سنووری لەژێر چاودێری والی وان بەنهێنی لەگەڵ زۆربەی کوردانی ناوچەی ورمێ پێوەندیان سازکردبوو و بەڵێنیان دا کە کەلوپەلی شەڕ و تەقەمەنییەکی بەرچاویان پێبدەن تاکو لەو شەڕەی کە بێگومان لەگەڵ رووسیە تووش دەبێ پشتیوانی لە تورکیە بکەن".(٧) نیکتین کونسولی ئەوکاتی رووسیە لە ورمێش لە بارەی هۆکاری یەکەمی هاتنی کورد بۆ ناو شەڕ دەنووسێ:"پەلاماری کورد زیاتر بۆ ئەو راگەیاندنەی جیهاد دەگەڕایەوە کە لە لایەن تورکەکان بڵاوکرابووەوە. بەهۆی ئەم جیهادە بوو کە کوردەکان راپەڕین و لە زستانی ساڵی (١٩١٤-١٩١٥) وەك لافاو بەرەو دەشتی پڕخێر و بێری ورمێ شۆڕ بوونەوە." (٨) بەڵام بەپێی بۆچوونی کەسرەوی هۆکارە سەرەکییەکانی بەشداری کورد لە شەڕ بۆ ئەو رکابەری و قینە کۆنە دەگەڕایەوە کە لە نێوان ئەوان و مەسیحییەکاندایە، ئێستا بەهۆی رووسەکان چەکدارکرابوون و حەزی هۆزەکانی کورد بۆ تاڵان و بڕۆی هاوسێیەکانی دەگەڕایەوە. ئەو لەم بارەیەوە دەنووسێ:" لە دەوروبەری ورمێ جگە لە چیرۆکی رووس و عوسمانی، چیرۆکی کورد و ئاشووری ببووە هۆی گرفتێکی دیکە. کورد لە تاڵان و بڕۆ راهاتبوو و هەمیشە چاوەڕوانی دەرفەتێك بوو کە بەرێ کەون و هەر گوندێك کە کەوتە سەرڕێگایان، تاڵانی بکەن. ئاسووریش کە ساڵەهای ساڵ لەژێر دەست مسیونێرە ئەمریکییەکان و فەرەنسییەکان، رق و قینیان لە ئاست موسڵمانان هەڵگرتبوو و دوای هاتنی رووس بۆ ئێران، خۆیان پێوە نووساندن و ئامادەبوون بۆ هەر زیان گەیاندنێك بە ئێران کە لەو کاتەدا رووسەکان تفەنگ و کەلوپەلی شەڕیان پێدابوون".(٩)

(ریچارد کاتم) بایەخی راگەیاندنی جیهاد بە کەمتر دەزانێ لەو رقەی کورد لە بوونی سوپای رووسیە لە ناوچەکەدا هەیبوو دەنووسێ:" لەگەڵ ئەوەیی کە کوردی ئێران هەنجەتێکی باش بوون بۆ پڕۆپاگەندەی تورکیە لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، بەڵام ئەو رقەی کە لە ساڵی (١٢٨٨)هەتاوی ١٩٠٩ز لە سۆنگەی داگیرکردنی ئازەربایجان لە لایەن رووسەکان هەڵیان گرتبوو، زۆر کاریگەرتر بوو لە پڕۆپاگەندەی راگەیاندنی جیهاد کە سوڵتان دەری کردبوو بێجگە لەمە، بانگهێشت کردنی

تورکیەی عوسمانی بۆ ئەوەی گوندەکانی ئەرمەنی و ئاسوری نشینی تورکیە و ئێرانیش) تالآن بکەن، شتێکی سەرنجڕاکێش و بەدڵیان بوو".[١٠] لیپتنیش کە لە بەرەبەری شەڕدا بۆ تەورێز لە کونسولگەری ئەمریکا خۆی حەشاردابوو ئاماژە بەم خاڵە دەکا کە هاوکات لەگەڵ پێش وەچوونی سوپای تورك بەرەو ناوەندی ئازەربایجان "دڵەڕاوکێیەکی قووڵ لە نێوان خەڵکی مەسیحی لە تەورێز دەبیندرا. چیرۆکی ترسناکیش لە بارەی توندوتیژی کوردەکان بڵاو دەکرایەوە".[١١] لە مانگەکانی یەکەمی شەڕ ژمارەیەك لە زانایانی ئایینی موفتی کوردستانی عوسمانی بە رێکوپێکی هاتنە رۆژئاوای ئازەربایجان و خەڵکی کوردی ئەم ناوچانەیان بانگهێشت دەکرد بۆ جیهاد و غەزا لە بەرانبەر مەسیحییە کافرەکاندا، تەنانەت نایبان ئەفسەری ئەڵمانی نامەیەکی لە زانایانی شیعەی کەربەلا هێنابوو بۆ کوردە سوننییەکانی ورمێ کە لە نامەیەکدا داوایان لە کورد کردووە واز لە جیاوازی ئاینزایی بهێنن و لەگەڵ شیعەکان یەکگرن و لە بەرانبەر کافران بوەستن.[١٢] چەند پیاوێکی ئایینی کورد کونسولی عوسمانی لە ورمێ یارمەتی نایبانیان دەدا لەو هەولانەی کە دەیدا. ئەم هەولانە بە تێکڕایی بۆ رووسیە جێی مەترسی و زیان بوو، چونکە ئەم ولاتە بەر لە شەڕ هیچ بایەخێکی بە کێشەی کورد نەدەدا و داواکارییەکانی پیاوە چالاکەکانی کوردی عوسمانی بە هەند هەڵنەگرت کە داوایان لێکرد دەورێکی بنچینەیی لە چارەنووسی کورد ببینێ، ئێستاش دەبینین کە هێزو وزەی جەنگی و هەستی کورد لە خزمەت عوسمانیدایە، بۆیە هەوڵی دا زەرەر لە نیوە بگەڕێننەوە و پلانێك دابڕێژێ بۆ ئەوەی کورد لە خۆی نزیك بکاتەوە. لازاریف لە بارەی ئەم پلانە دەنووسێ:" وەزارەتی جەنگی قەفقاز (K.B.O) لە سەرەتای شەڕ، (٢٥) هەزار تفەنگ و (١٢) ملیۆن فیشەك و (٢٠ تا ٢٥) هەزار رۆبل بۆ بەرپاکردنی راپەڕینی کورد و ئەرمەن و ئاسووری، تەرخان کرد. ئیسماعیل ئاغای شکاك، سەرۆکی هۆزی زەرزا لە ئێران و (شێخ عەبدولقادر، عەبدولڕەزاق بەدرخان) و سەرکردەکانی تری کوردی عوسمانی ئامادەیی خۆیان بۆ بەشداری لەم پلانە، راگەیاند.[١٣] نیکتینیش وێڕای دانپیانانی بە بوونی ئەم پلانە دەنووسێ:" ناوی هەندێ لە سەرکردەکانی کورد کە ئێمە لەم ناوچانە وتووێژ و دانیشتنمان لەگەڵ کردوون بەم شێوەیەی خوارەوە: بەدرخان بەگ و گورگین بەگ زادەدەشت، بارو خالۆ و تەیمور ئاغای شکاك ـ عەبدوللا بەگ و بەگ خانی بنار،کەریم خان و پیر بەگی هەرکی، سلێمان خانی مەنسور ئەلمەمالیك زەرزا خەڵکی شنۆ ـ هەمزە سلمان مامەش ـ سەرکردەکانی موکری لە دەوروبەری بۆکان و عەلی خان کوڕی سەرداری موکری کە تورك کوشتیان.[١٤]

ئاشکرایە کە رووسیە دەیویست وا بکا کە لە رقی کورد بەرانبەر بە رووسیە کەم بکاتەوەو ئامانجی دووەمی سیاسەتمەداری رووس لە یەکگرتنیان لەگەڵ کورددا ئەوە بوو کە بە راکێشانی کۆمەڵگەی کوردی بۆ ژێر دەسترۆیی سیاسیی خۆی، ئەگەر هاتوو عوسمانی لەشەڕ تووشی شکست بوو ئەوا جێ پێیەکی پتەو دوای شەڕ بۆ خۆی دابین بکا لە دابەشکارییەکەی خاکی عوسمانیدا. کەنداڵ لەم بارەیەوە دەنووسێ:" رووسیەی قەیسەری (لە سەردەمی شەڕدا) لە هەمان کات کە بەڵێنی ناردنی یارمەتی داراییەکی زۆری بە بزووتنەوەی میللی کورد دەدا، بە شێوەیەکی پراکتیکی هەوڵی دا بۆ ئەوەی کوردستان بەخۆیەوە بلکێنێ. رووسەکانیش وەك زل هێزەکانی تری ئیستعماری وەك بەریتانیا و فەرەنسا کە لە هەوڵەکانی خۆیان بە مەبەستی بەرینترکردنی قەلەمڕەوی خۆیان و ئیستعمار کەڵکیان وەرگرت لە ناودارانی کورد و تورك و عەرەب و ئەرمەنی و بۆ گەیشتن بە ئامانجیان وەك ئامرازێك سوودیان لە کورد وەدەگرت.(١٥) بەڵام هەبوون ئەو کوردانەش کە بایەخیان بە فەتوای جیهادو راگەیاندنی شەڕ نەدا و دژی وەستان، ئەم دژایەتییە لە سەرەتادا لە کوردستانی عوسمانی دەستیپێکرد و لە دوای گەیشتە ئێرانیش، نیکتیین لەم بارەیەوە دەنووسێ:

" سلێمان خانی مەنسور ئەلمەمالیك ئەنجامی کارەکانی کوردی ئێرانی لە بەشداریکردنی جیهاد دا لێك دابۆوە، تاکە کەسێك بوو کە کاتێ تورکەکان لەم دەڤەرە نیشتەجێبوون، نەچووە سەلماس... مەسەلەی جیهاد بەهۆی شێخ و مەشایخ و موریدەکانیان زۆر زوو لە کوردستان بڵاو بۆوە. تەنیا یەکێ لە شێخەکان بەناوی شێخ بابا کە لە دەوروبەری سابلاغ خەریکی (زوهد و تەقوا) بوو لای کوردان جێگەی رێزو حورمەت بوو، دژایەتی راگەیاندنی جیهادی کرد و تورکەکان لە زستانی ١٥-١٩١٦ هەر لە سۆنگەی ئەم دژایەتییەی ئەو و خۆشەویستی و دلۆڤانی ئەو لە ئاست مەسیحییەکاندا، لە سێدارەیاندا.

شێخ بابا ئەم جیهادەی بە پێچەوانەی یاسا و رێسای ئیسلامی دەزانی و لەبەر ئەو ئاکامانەی کە لێی دەکەوتەوە، لەسەری رازی نەبوو. هەروەها هەندێ لە کوردان بێجگە لەوەی کە بڕوایان بەم بانگەشەی جیهاد نەبوو، بەڵکو دژی داگیرکاری خاکی ئێران بوون کە ئێران پێشووتر بێلایەنی خۆی راگەیاندبوو لەوانە حاکمی پێشووی سابلاغ سەیف ئەلسەڵتەنە سەرداری موکری، محمد خانی حاکمی بانە، مەحەمەد حوسێن خان و سەیفەدین خانی سەقزی دەبێ ئاماژەیان پێ بکرێ. دوکتۆر (کەماڵ مەزهەر ئەحمەد) لە بارەی کاردانەوەی پیاوە سوپاییەکانی تورك لە ئاست کوردانی دژ بە عوسمانی دەنووسێ:

" جەندرمەی تورك زۆر بە توندی دژەكانیان سەركوت دەكرد. بۆ نموونە تەنیا لە یەكێ لە ناوچەكانی كوردستانی ئێران دوو سەرداری دژی خۆیان ( مەحەمەد حوسێن خان و سەیفەدین خانی سەقز)یان لە سێدارە داو بۆ ترساندنی خەڵكی ئەم دەڤەرە چەند رۆژێك تەرمەكانیان هەر بە دارەوە بوو". (١٧)

پلانی رووسەكان بۆ سەرنجراكێشانی كوردان كاریگەر نەبوو و تەنانەت (عەبدولقادر و سمكۆ)ش پەیمانی خۆیان لەگەڵ ئەوان پشتگوێ خست و هێرشیان بردە سەر یەكەی سوپای رووس. ئەم هێرشانە كاتێ خەستتر بوون كە توركەكان چەك و تفاقیان لەبەر دەستی دەرەبەگی كورد دانا و مەلایەكانیش پڕۆپاگەندەی جیهادیان دەكرد لە خزمەت عوسمانییەكان بۆ ئەوەی هەستی ئایینی خەڵكی كورد ببزوێنن.

لە نێو بەڵگەكانی وەزارەتی جەنگ و دەرەوەی رووسییەی قەیسەری بۆمان دەردەكەوێ كە ئەم مەلایانە هەمیشە لە تەك هێزی تورك بوون و لە راستیدا رۆڵی پێوەندی رامیاری ـ واتەییان لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و موسڵمانانی كورد دەبینی، بۆ نموونە دەكرێ ئاماژە بە پڕپایەخترینی ئەوان واتە (شێخ عەبدوڵلا جەلالەدین) بكرێ كە بەرپرسی كاروباری جەنگی بوو و هەر ئەویش بوو كە حوكمی جیهادی سوڵتانی عوسمانی بە كوردەكانی باكوور راگەیاند و لەگەڵ ئەمەش (٢٥٠) سندوق چەك و تفاقی لە نێو خەڵكی سابلاغی موكری دابەشكرد.(١٨) بە درێژایی دوو ساڵی یەكەمی جەنگ، هەوڵی بەردەوامی رووسیە بۆ نزیكبوونەوە و یەككگرتنیان لەگەڵ كورد لە ئارادابوو، بەڵام ئەنجامێكی ئەوتۆی نەبوو.

باسیل نیكتین لە بارەی ئەم دەست پێشخەرییانەی كاربەدەستانی رووس لەم بارەیەوە دەنووسێ: " وەك بیستوومە لە ناوچەی چالاكییەكانی جەنەراڵ باراتۆف (فەرماندەی هێزی رووس لە خاكی ئێران) رێككەوتنامەگەلێك لەگەڵ كوردان بەستراوە، بەڵام بە ئەنجامی چاك نەگەیشتوون، هیچ بەڵێنی ئەوان جێی بڕوا نییە، خودی منیش لە ورمێ ئەم هەڵانەم كردووە، (بەڵام هەر كە بۆم دەركەوت كە هەر جۆرە رێككەوتنێك لەگەڵ كوردان كارێكی بە خۆڕایی و بێ ئەنجامە، خۆم بە وردبوونەوە لە بارودۆخی كوردستان و زمانی كوردی خەریك كرد ".(١٩)

لە وەڵامی ئەم پرسیارە كە بۆچی سەرانی كورد و رووس نەیانتوانی رێك بكەون و هاوكاری یەكتر بكەن، بۆ ئەم هەلومەرجە گشتییە دەگەڕێتەوە كە ئازەربایجان بە تورك و كوردەوە لە سەردەمی شۆڕشی مەشرووتە تووشی سیاسەتی ناڕەوا و پەلاماردەری رووسەكانی نیشتەجێی ناوچەكە بوون و

ئەوە زەمینەی لەباری بۆ رەخساندنی پێوەندی و هاوکاری نێوان رووس و کوردی تەنانەت بەر لە جەنگیش لەنێو بردبوو. هەرچەندە لە سەدەی نۆزدەهەم ژمارەیەك لە کوردان لە جەنگی رووس و عوسمانی، لە خزمەت رووسەکان بوون لەوانە فەوجی سوارەی کورد کە بریتی بوو لە( ٤٠٠) سوارە لە جەنگی (١٨٢٩)ز، فەوجی سوارەی فارس و ئێرەوان لە شەڕی کریمە (قرم) کە گشتیان کورد بوون، هەروەها میلیشیای کورد کە پێکهاتبوو لە( ١٣٠٠) سەرباز لە شەڕی (١٨٧٧ـ١٨٧٨) لە دژی عوسمانی بە سەرکردایەتی هەندێ جەنەراڵی کورد وەك ( جەعفەر ئاغا و عەلی ئەشرەف شەمس ئەلدینۆف) بەشداربوون.[٢٠] بە لەبەرچاوگرتنی رەهەندە جۆراوجۆرەکانی ئەم پرسە دەکرێ بگەینە ئەم ئەنجامە کە زۆربەی سەرکردە کوردەکان کە بەدوای هەل دەگەڕان بۆ بەرژەوەندی خۆیان، پێیان ناخۆش نەبوو لەگەڵ دەوڵەتی رووسیە رێك بکەون و تەنیا ئاستەنگ لەسەر رێگەیان دژایەتی کردنی پیاوانی ئایینی کورد و خەڵکی کوردی دانیشتووی شارەکان و ترسیان لە تۆڵەسەندنەوەی سەربازانی تورك بوو.

خاڵی گرنگ لێرەدا ئەمەیە کە لەگەڵ پەرەسەندنی شەڕ، گوشاری تورکانی لاو لەسەر کوردان بۆ رەشبگیری و بەسەربازکردنیان لە لایەك و پێشڕەوی رووسەکان لە ناو خاکی عوسمانی لە ساڵی ( ١٩١٦)، وای لە ناسیۆنالیستانی کوردی عوسمانی کرد کە رێکخراوێکی سیاسیی لە ئازەربایجان ساز بکەن کە ناکرێ بە یەکەم پارتی کوردی لە ئێران حسێب بکرێ، چونکە بەڕێوەبەرانی سەرەکی ئەم پارتە( شێخ عەبدولقادر کوری شێخ عوبەیدوڵڵا) و نەوەی ئەو سەید تەها ئەفەندی و سەرانی تر، کوردانی تابیعی عوسمانی بوون. رێکخراوی ناوبراو زیاتر لە یەك ئەلقەی سیاسیی کەم جموجۆڵ دەچوو کە کردەوەکانیان زۆر سەرکەوتوو نەبوو.

نیکتین لە بارەی ناکامی ئەم دەزگا سیاسییە کە بەناوی (جەمعیەی ئیستخلاسی کوردستان )(کۆمەڵەی رزگاری کوردستان) و کۆمیتەی ئازادی کوردستان بەناوبانگە دەنووسێ: " رۆژێك لە ورمێ کوردێك هاتە دیتنی من کە لە لایەن کۆمیتەی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان رەوانە کرابوو و نامەیەکی کۆمیتەی ناوبراوی بۆ من هێنابوو کە ناوەڕۆکەکەی ئازادیخوازی و سەربەخۆیی کوردستان بوو و بابەتی تێدا بوو لە دژی تورکەکان و لەگەڵ ئەوەی کە سەرۆکی کۆمیتە کەسێکی دەستڕۆ و بە دەسەڵاتی کورد بوو، بەڵام بە ئامانجیان نەگەیشتن.[٢١]

ئەم سەرکردە دەستڕۆیە هەمان سەید تەهای ئەفەندی بوو کە نیکتین لە کتێبەکەی کورد و کوردستانی خۆیدا بە راشکاوی ناوی دەهێنێ. (لازاریف)یش ئاماژە بەم مەسەلەیە دەکات و

دەنووسێ:" لە سەرەتای جەنگی جیهانی یەکەم، کۆمەڵەی " ئیستخلاسی کوردستان" لە ئێران سازبوو. ئامانجی سەرەکی ئەم ڕێکخراوە یەکگرتنی گشت ناوچەکانی کوردنشین و دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردی بوو."[٢٢] ئەویش وەك نیکتین لە هەڵسەنگاندنی خۆی بایەخێکی ئەوتۆ بەم پارتە نادات و لە بارەیەوە دەڵێت:" بەڵام ئەم حزبە لە رووی کارکرد و کاریگەری بەسەر خەڵکی کورددا، لەم ئاستە دا نەبوو کە بایەخی پێ بدرێ".[٢٣] بەڵام کوردەکان لە رۆژئاوای ئازەربایجان دەستیان کرد بە هاتنە ناو شەڕ، چونکە لەوێدا دەستەکانی موجاهیدی مەشروتەخوازی ئازەری کە لە ئەنجامی گوشاری حاکمی رووسیە لە ناوچەکە هانای بۆ عوسمانی بردبوو و هەر لەگەڵ پێکدادانی سنوورپارێزانی رووسیە و عوسمانی لە سنوور تێپەڕین و لەتەك کوردان هورووژمیان بردە سەر یەکەی سەربازی رووسەکان.

کەسرەوی لەم بارەیەوە دەنووسێ:

" لە ئازەربایجان هەروەکو باسمان کرد جەنگ لە دوولاوە دەستیپێکرد، یەکیان لە سنووری بازرگان، لە ورمێ و ئەویتریان لە سنووری بانە و لە سابلاغەوە و لە هەردوو جێگادا موجاهیدانی ئێرانی و کوردان پێشڕەو بوون و عوسمانییەکان لە دواوەی ئەوان بوون.[٢٤] بەپێی نووسراوی کونسولی ئەو کاتی ئەڵمانیا لیتن ، وا لێك دەدرێتەوە کە بەشی هەرە زۆری هێزەکانی ژێر فەرمانی موختار بەگی شەمخال، فەرمانەدەی عوسمانییەکان، کە لە هەشتەمی کانونی دووەمی ( ١٩١٥) تەورێزیان داگیرکرد، ئەو کوردانە بوون کە جلی کوردیان لەبەربوو و ژمارەیەکی کەم لە عەرەب و تورك لەتەکیاندا بوون.[٢٥] خەڵکی تەورێز بەدەست و دیاری بەخێرهاتنی شەڕکەرانی کوردیان کرد و پاراستنی نووسینگەی کونسولی ئەڵمانیا بە کوردەکان سپێردرا. دیپلۆماتی ئەڵمانی کە سەرسام بوو بەو سام و هەیبەتەی شەڕکەرانی کورد، لە بارەی ئەوان وای بۆ دەچێ:

" ئەم سەرکردە کوردانە پیاوگەلێ بەسام بوون کە ئەگەر کەسێ بۆ یەکەم جار یەکێ لەوانی دەدی، هەستی دەکرد کە لەگەڵ پاشایەك رووبەڕووبۆتەوە، هەیبەت و شکۆداری شاهانەیان هەبوو، ئەوان بە پێچەوانەی گشت خەڵکی رۆژهەڵات، چاو لە چاوی مرۆڤ دەنێن و پیاوانە دەستت دەگوشن. کوردەکان دەبێ هەمان کاردوش (کاردۆخ)ی کۆن بن کە (گەزنەفۆن) باسی لێوە کردبوون. ئایا ئەوان هەمان رەگەزی باڵا نین کە لە کێوەکانی کوردستان نیشتەجێبوون؟ من هیچ کات ئەو هەموو جوانی و شکۆداریەتییە پیاوانەیەی کە لەوان دا کۆبۆوە، نەمبینیوە. بینینی ئەوان لەو رۆژی لەژێر وێنەی قەیسەر، ئەو هەستەی لای من وروژاند کە ئەوان خوێن و رەگەزێکی رەسەنیان هەیە. ئەندامی

لەشیان ناسك، قاچیان باریك، دەست و بازووی بەهێز، چاوێکی تیژ، بەژنێکی زراڤ، قسە لەڕوو و بەجەرگ، ئەوان هەموو ئەم تایبەتمەندیانەیان هەبوو".[٢٦] ئەو دان بەوەدا دەنێ کە هۆزگەلی کورد هەرگیز ماڵ و سامانی خەڵکی تەورێزیان تاڵان نەکرد، ئامادەیی پڕ لە سەرکەوتنی کوردان لە تەورێز زۆری نەخایاند و لەدوا ڕۆژەکانی مانگی کانوونی دووەمی ١٩١٥، پاشەکشەی ئەوان بەرەو میاندواو و سابلاغ دەستپێکرد. لیتن کە لەم پاشەکشەیە لەگەڵ ئەفسەرانی تورك و کوردەکان بووە، وێرای شیکردنەوەی بارودۆخ و بابەتگەلێ سەرنجراکێش سەبارەت بە بنەماڵەی قازییەکان، تاوانی شکست دەخاتە ئەستۆی عوسمانییەکان و باس لە نارێکی ڕێکخستنی سوپاو نەبوونی چەك و تفاق و نەبوونی ئامادەیی و لاوازی هێزەکان دەکا و کەلێن و ناکۆکی بیروڕا لە نێوان میرزا فەتاحی قازی و کوردەکانی تر لەگەڵ ئەفسەرانی عوسمانی لە بارەی چۆنیەتی درێژەدان بە جەنگ لە بەرچاوی ئەو بزر نەبوو.[٢٧] عوسمانییەکان حەزیان دەکرد بە تەواوەتی دەڤەرەکە چۆل بکەن و کوردەکان خوازیاری پێکهێنانی هێلێکی بەرگری لە میاندواو بوون و بێجگە لەمە سەبارەت بە دابەشکردنی چەك لە نێوان عوسمانییەکان و کوردەکان جیاوازی و ناتەبایی زۆر لە بیروڕا هەبوو، بە جۆرێك کە لە مەهاباد ئەفسەرانی پلە بەرزی تورك وەك حلمی بەگ و فەوزی بەگ کەوتنە بەرهێرشی کوردان و نەك تەنیا چەکەکانی خودی خۆیان لە کیس چوو، بەڵکو ناچار کران کە ژمارەیەکی زۆر تفەنگ و تفاق لە نێو هۆزە جۆرەبەجۆرەکان بە یەکسانی دابەش بکەن.

ئەم هەلومەرجە، هەڵسەنگاندنی نیکیتین دەسەلمێنێ کە لە بیرەوەرییەکانی خۆی باسی لێوە کردووە: "بنەمای پێوەندی تورك و کورد لە سەردەمی شەڕ پتەو نەبوو و خەڵکی تێگەیشتوو لێی دڵنیا نەبوون[٢٨]". وەستانی ئازایانەی کوردان لە ئاست دوژمن بێ ئەوەی یارمەتییەکی جیدی لە عوسمانییەکان وەربگرێ تا ساڵی ١٩١٦ درێژەی خایاند.

لە دواییدا قەزاقەکانی سیبیریایی کە بە دراگۆن بەناوبانگ بوون، هەشت هەزار کەس لە خەڵکی مەهاباد و هەموو دانیشتووانی شنۆیان قەتڵ و عام کرد و بەپێی نووسینی د. کەماڵ مەزهەر ئەحمەد رابەری خۆڕاگر میرزا فەتاحی قازی کە تافی لاوێتی و پیری خۆی لە ڕێگەی خزمەت بە خەڵکی ناوچەکە بەسەربردبوو (بۆیە دوژمنانی خەڵقی کورد تینوی خوێنی ئەو بوون) تا دوا فیشەك شەڕی کرد و لە دواییدا لە سەنگەر هاتە دەر و بە دوژمنی گوت: ئێستا دەتوانن لەسەر لاشەی من و کوڕەکەم تێپەڕن و شارەکەم داگیر بکەن، حەڤدە گوللە بە سینگی ئەو کەوتبوو.[٢٩]

میرزا فەتاحی قازی بە مانەوەی لە تەنیشت خەڵکەکەی خۆی و وەستانی لە بەرانبەر بە دوژمن تا دوا دڵۆپەی خوێنی، هەڵکەوتی بنەماڵەی قازییەکانی لە ناو هزری کوردەکان پتر لە جاران پتەو و سەقامگیر کرد.

ساڵداتەکان و قەزاقەکانی رووس لە کۆتایی جەنگ، ماڵی قازی فەتاح، بازاڕی شاری مەهاباد و کتێبخانەی سەیف ئەلقوزات مهابادی، شاعیر و مەلای خزمی قازی فەتاح کە پتر لە هەشت هەزار بەرگ کتێبی دەستنووس و دانسقەی هەبوو، ئاگر تێبەردا. بە جورئەتەوە دەکرێ بگوترێ کە دلێرانەترین خۆڕاگری خەڵکی ئێران لە بەرانبەر رووس و ئینگلیزەکان لە سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەم، بۆ کورد و تەنگستانییەکان لە باشووری ئێران دەگەڕێتەوە. ئەو گۆڕانکارییە سەرەکییەی کە لە ئەنجامی جەنگ لە کوردستانی باکوور روویدا، پێوەندی هەبوو بە زێدەبوونی رۆڵی بنەماڵەی قازییەکانی مەهاباد لە کاروباری سیاسیی ناوچەکە. دوای شکستی رووسەکان لە سەرەتای ساڵی (١٩١٥) لە هێزەکانی هاوبەشی کورد و تورک، لەسەر ڕای ئەفسەرانی تورک و لە سۆنگەی دەستڕۆیی قازییەکان لە نێو خەڵکیدا، فەرمانڕەوایی دوو شاری میاندواو و مەهاباد درایە میرزا فەتاح و ئامۆزاکەی قازی عەلی و کاروباری رێکخستنی بەرخۆدان لە بەرانبەر دوژمن، بەڕێوەبردنی خەڵك و بەرپرسیارێتی حکوومەتی، بەجێ گەیاندنی رۆڵی پێوەندی نێوان عوسمانی و جەنگاوەرانی کورد، بە ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە سپێردرا. بنەماڵەی قازییەکان لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، زۆربەیان پیاوانی ئایینی و شارنشینانێك بوون کە خاوەنداری مامناوەندی بوون لە گوندەکانی دەوروبەری مەهاباد کە چالاکی رۆشنبیرانە، ئەوانی کردبوو بە بەشێك لە چینی ناوەند و پێشکەوتووی شارنشین. کاتێ بەشداری ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە لە بەڕێوەبردنی ناوچەکە پڕبایەختر دەردەکەوێ کە بزانین گەورە سەرۆك هۆزەکانی وەك سمکۆ، قەرەنی ئاغای مامەش و عەلی خانی دیبوکری، بە خۆیان و ئەو هۆزانەی کە لەگەڵیاندا یەکیان گرتبوو، هەر کامەیان نێوان دوو تا پێنج هەزار شەڕکەریان لە ژێردەست بوو، بەڵام هێشتاش رۆڵی سیاسیی ئەوان بە بەراورد لەگەڵ قازییەکان زۆر کز بوو. شیکردنەوەی هەڵسوکەوتی قازییەکان چەندین خاڵی گرنگی مێژوویی کوردی باکوورمان (لە ئێران) بۆ رۆشن دەکاتەوە کە بریتین لە:

١ـ پەرەسەندنی سیاسیی مەهاباد لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە رێگەی پەروەردەکردنی چینی مامناوەندی شارنشین دەستیپێکرد کە خوازیاری پتر بەشداریکردن بوون لە کاروباری سیاسیی و تا رادەیەك کە هەلومەرج بواری دەدا لە چوارچێوەی دەسکەوتەکانی بنەماڵەی قازییەکان لە سەردەمی شەڕ ئەو خاڵە دابینکرا.

٢ـ قازییەکان ئەوکاتەی کە حوکمڕانی شارەکانی میاندواو و مەهابادیان لە ئەستۆ گرت، یەکەم هەنگاویان هاویشت لە گۆڕینی بالانسی هێزەکانی نێوان هۆزەکان و شارنشینانی کوردستانی باکوور و لابردنی بالا دەستی کلاسیکی سەرکردەی هۆزەکان کە لە سەردەمی حکوومەتی ڕەزا شا و دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ.ك و حزبی دیمۆکرات و کۆماری مەهاباد ئەم ڕاستییە دەسەلمێندرێ و شێوازێکی تەواو و جیدی بەخۆیەوە دەگرێ.

٣ـ لە ناوچەکانی کوردنشینی ئێران بە پێچەوانەی کوردستانی عوسمانی، جەنگی جیهانی یەکەم ناسیۆنالیزمی عەشیرەتی دروست نەکرد یاخود بەهێزی نەکرد، بەلام هەلکەوتی سیاسیی، کۆمەلایەتی پیاوانی ئایینی کوردی، بە تایبەتی لە کوردستانی باکوور پتر لە جاران پتەو کرد.

زێدەبوونی ڕۆڵی قازییەکان و شێخ محەممەد مەردۆخ لە کێشەکانی سەردەمی جەنگ نموونەی ئاشکرای ئەم ڕاستیەیە.

٤ـ گوێ لە مستبوونی خەلکی مەهاباد و کوردانی دەڤەری موکریان لە قازییەکان، بووە هۆی ئەوەی کە بنچینەیەکی مەعنەوی و روحی دابمەزرێ بۆ دەسترۆیی ئەوان لە دەیەکانی دوایی لە نێو کوردانی باکوور بە تایبەتی مەهاباد کە کارکردی وردو بەجێی چەندین کەسی کاریگەر وبە کولتووری دیکەی ئەم بنەماڵەیە وەك سەیف ئەلقوزات و قازی محەممەد، بەلگەی ئەم ڕاستییەیە.

٥ـ کوردانی ئازەربایجان و بە تایبەتی قازییەکان، لە شەڕیاندا لەگەل ڕووسەکان لە ڕووی ڕوحییەوە بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە ئێران و تەنانەت عوسمانی دەجوولێنەوەو بە درێژایی شەڕ جگە لەوەی کە زەمینەی هاوکاری و دۆستایەتی نێوان کورد و ئازەری نەهاتە دی، بەلکو بەپێی نووسراوی بینەری ڕووداوەکان "لیتن" هەندێ دەستەی چەکداری ئازەری و لایەنگرانی حاکمی پێشووی ئیستبداد، سەمەدخانی (شوجاع ئەلدەولە)، بۆ خۆشیرین کردن لە ڕاست ڕووسەکان، پەلاماری دواوەی سوپای کورد و تورکیان دەدا، بۆیە پیاوانی فەتاح قازی بەرلە پاشەکشەکردنیان لە میاندواو، بارەگەی حکوومەتی ئەوێیان سووتاند.[٣٠] لە ڕاستیدا دەستوور ڕاستینی ئازەری لە شانۆی سیاسەت ون ببوون. ئەم جۆرە ڕووداوانە دەبووە هۆی ئەوەی کە کوردەکان پتر لە جاران خۆیان تەنیا و جیا لە ئازەربایجان هەست پێ بکەن، و بە شێوەیەکی گشتی درزی کۆنی نێوان کورد و ئازەری لە ئەنجامی جەنگ قولتر بۆوە. لیتن کۆنسولی ئەلمانیا لە بارەی چاوپێکەوتنی خۆی و قازییەکان و دانوستانیان لە شاری مەهاباد دەنووسێ کە لە بارەگای حکوومەتی شار سەرکردەکانی کوردی ناسی و ئەوان بریتی بوون لە قازی عەلی حاکمی سابلاغ و ئامۆزای قازی فەتاح، قازی عەلی برای قازی فەتاح،

گوتاربێژی نوێژی هەینی، کوڕی مامی قازی فەتاح و هتد... قازی عەلی خەتیبی نوێژی هەینی هاتە دیتنی من و پێی گوتم کە برایەکەی میرزا جەوادخان قازی کە دانیشتووی بەرلین، شار لۆتنبورك، شەقامی موهزن، پلاکی ژمارە چل و حەوتە، سەرنووسەری (دبیر) سەفارەتی ئێران لە بەرلینەو داوای لێکردن کە نامەیەکی بۆ بەرم، رەزامەند بووم... ئەو لەگەڵ من باسی لە ویستەکانی کورد کردو داوای کرد کە تەك برایەکەی ئەم داواکارییە بگەیێنێتە دەوڵەتی ئەڵمانیا.(٣١) تەنانەت ئەو باسی لەوە کرد کە هۆزگەلی کورد حەز دەکا پێوەندی راستەوخۆی لەگەڵ ئەڵمانیا هەبێ و گوتی" کوڕی حاجی ئیلخانی کە لە سەرکردەکانی کورد بوو و پتر لە پێنج هەزار سوارەی لەژێر دەست دابوو، هاتەلام و سڵاوی باوکی بەمن راگەیاند و گوتی کە ئامادەیە ئەگەر بتوانێ بچێتە ژێر سێبەری پشتیوانی ئەڵمانیا، ببێتە بەرپرسێك لە کۆنسولیەت و لایەنی جێی بڕوای دەوڵەتی ئەڵمانیا لە مەهاباد و گشت کەسانی هۆزی خۆی (هۆزی بەناوبانگی موکری) بخاتە ژێردەست ئەڵمانیاو کاربەدەستانی ئەڵمانیا".(٣٢)

بەم شێوەیە خەلکی موکریان لەژێر سەرکردایەتی قازی فەتاح کە بەپێی نووسینی لیتن" شانازی ئەوەی بەرکەوتبوو کە ببێتە سەرکردەی کوردان و فەرمانڕەواو جێ بڕوای تورکەکان و دەسەڵاتێکی بێ سنووری هەبوو لە سابلاغەوە تا میاندواو."(٣٣) بۆ یەکەم جار بە شێوەیەکی نارەسمی بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەکانی کوردنشینی بۆ ماوەیەکی کورت، کەوتە دەستی و ئەم رووداوە وەك ئەزموونێکی رامیاری، لە ماوەیەکی درێژخایەن بووە هۆی ئەوەی کە کوردانی باکوور چاوی تێ ببڕن و کاریان بۆ بکا.

گۆڕانکارییەکی تر کە لە ئەنجامی جەنگ هاتە کایەوە، لابردنی دەسەڵاتی بنەماڵەی موکری بوو کە ئەم بنەماڵەیە تەنیا هۆزی رامیاری کورد بوون کە هەمیشە لەتەك حکوومەتی ناوەندی، لە سەرتاسەری سەردەمی حکوومەتی قاجارەکان، بەوپەڕی دڵسۆزی و جیدییەوە خزمەتی ئێرانیان کردبوو کە بەهۆی لە سێدارەدانی (مەحەمەد حوسێن خانی سەیف ئەلسەڵتەنە) سەرداری موکری و کوڕەکەی عەلی خان لەسەر دەستی عوسمانییەکان، کۆتایی بە دەسەڵاتدارییان هات.

سەیف ئەلسەڵتەنە بەر لە دەستپێکردنی جەنگی گەورە، پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ ئەلکساندر کۆنسولی رووس لە مەهاباد سازکردبوو و گوایە هەر لەبەر ئەم هۆکارە، هەلکەوتی خۆی لە ناوچەکە سەقامگیرکردبوو، هەوڵی دا سەقزیش بخاتە سەر ناوچەی قەڵەمڕەوی خۆی و ماوەیەکیش لەم کارەی سەرکەوتوو بوو.(٣٤)

به دڵنیاییەوە بنەماڵەی قازییەکان و سەرەك هۆزەکانی موکری، بە ڕەزامەندی و دڵخۆشـی سـەیری لەناوچوونی هێزو دەسەڵاتی عەزیز خانیان کردووە، چونکە دیارە گۆڕەپان بۆ ئەوان چۆڵ بووە.

ئەنجامێکی تری جەنگی جیهانی لە کوردستانی باکوور بریتی بوو لە هاتن و پەنابەری و ئاکنجی بوونی نەستوورییەکانی ژێردەستی عوسمانی لە ورمێ و دەوروبەری. وردە وردە ژمارەی ئەم مەسیحیانە لە ناوچەکە زیادی دەکرد و لە ساڵی ١٩١٦ بەدواوە، سەرانی ئەوان بە پشتیوانی یارمەتی دارایی و سوپای رووسیە، وێڕای پێکهێنانی سوپایەکی کارامە، بیریان لە دابڕاندنی ئازەربایجان و پێکهێنانی کۆمارێکی سەربەخۆ کردەوەو لەم ناوە هۆزی شکاکیشیان بۆ لای خۆیان راکێشا.

کارکردی ئەم جیاخوازانە، هەستی خۆدوورخستنەوەی کوردانیان لە حکوومەتی ناوەندی، پتر کرد و بووە هۆی سەرهەڵدانی هەندێ رووداو کە کاویگەری لە سەر شۆڕشی سمکۆ هەبوو کە لە بەندی دواتر ئاماژەی پێدەکەین، بەڵام لە ویلایەتی کوردستان، سوپای رووس لە (جەمادی دووەم ساڵی ١٣٣٤ ه.ق) ١٩١٣ز شاری سنەی داگیرکرد و جەنەراڵ باراتۆف فەرماندەی هێزی هێرشبەری بیانی، سەرەك هۆزەکانی لە "دادانە" کۆکردەوەو شورایەکی یەکگرتووی هۆزی پێك هێنا. رووسیە پتر خوازیاربوو کوردانی باشوور بەگەڵ خۆی بخا یاخود بە لایەنی کەم لەبێ لایەنی ئەوان دڵنیا بێت. شێخ محەمەد مەردۆخ دەڵێ کە تورکان لە کاردانەوەیان بەرانبەر بەم هێرشەی رووسیە، دەستیان کرد بە دروستکردنی یەکێتییەکی هۆزی نوێ لە کوردان بە یارمەتی شێخ مەحموود بەرزنجی یەکێ لە سەرانی دەسترۆی سلێمانی و ئامادەیی کونسولی رووسیە لە سنە، لە ماڵی مەحمود خانی کانی سانانی لە هەورامان.(٣٥) ئەمە یەکەمین جموجۆلی سیاسیی شێخ محموود لە نێو کوردانی ئێران بوو و دوور نییە کە بناغەی هاوکاری نێوان ئەو و سەرانی هەورامان واتە جەعفەر ڵهوتی و مەحموود خانی کانی سانانی هەر لەم ساڵانەی جەنگ بنیات نرابێ. دەوڵەتی عوسمانی حەزی دەکرد کە لە ویلایەتی کوردستان، تەنیا لەگەڵ کوردان کار بکا، بۆیە تا بۆی لوابا رێگر دەبوو لە سەقامگیری هێزو دەسەڵاتی دەوڵەتی کاتی لەم ویلایەتە. هەر لەبەر ئەمەش، کاتێ (نیزام ئەلسەڵتەنە) ی مافی سەرۆکی لیژنەی دەوڵەتی کاتی، حکوومەتی کوردستانی بە (موشیر ئەلسەڵتەنە) سپارد، سەردار رەشیدی کوردستانی کە بەم دواییە بیجاری لە رووسەکان وەرگرتبۆوە، لەم هەواڵە نیگەران بوو و بەپێی نووسینی مەردۆخ، تەتەرێکی بۆ هەمەدان بۆ لای عەلی ئیحسان پاشای فەرمانـدەی هێزی تورك ناردو نارەزایی خۆی لە دانانی (موشیر ئەلسەڵتەنە) دەربڕی و سکاڵای لە (نیزام ئەلسەڵتەنە) کرد، لە ئەنجامدا (موشیر ئەلسەڵتەنە) دوای هاتنی بۆ سنە لە حەوتی مانگی سەفەری ١٣٣٥ ه.

ق ١٩١٤ز بۆی دەرکەوت کە ناتوانێ کاروبار هەڵسووڕێنێ بە تایبەتی دوای هاتنی سێ هەزار سەربازی عوسمانی بە دوازدە دانە تۆپەوە بۆ ناو شار، لێرەدا هەستی بە لاوازی خۆی کرد.[٣٦]

لە ئەنجامدا لەژێر گوشاری عوسمانییەکان و پێداگرتنی کوردان، حکوومەتی کوردستان درایە سەردار رەشید. شێخ محەممەد مەردۆخ ئەم دانانەی سەردار رەشید دەگەڕێنێتەوە بۆ هەوڵی خۆی و حاجی عزالممالکی ئەردەلان و دەنووسێ: " ئەو بارودۆخە خێلەکیە و هاتنی سوپای بیانیم بینی، بۆم دەرکەوت کە پەرچەم و بۆینباغ (ئەفەندیاتی) ناتوانێ حکوومەت بکا، بەڵکو شەڕکەر و تفەنگ (هێز) دەرەقەتی ئەم بارودۆخە دێن، بۆیە بڕیارم دا کە سەردار رەشیدی بگەڕێنمەوە بۆ حکوومەت، بۆ ئەم مەبەستە چوومە کرماشان، (نیزام ئەلسەڵتەنە) م لەم رەوشە ئاگادار کردەوە. جەنابی (حاجی عزولمالیك) کە خەزێنەداری دەوڵەتی کرماشان خزمی سەرداریش بوو، پێشووتر ئاگادارم کردبووەوە. لە کۆتاییدا سەردار بۆ کرماشان بانگ کرا... لە سەرەتای (رەبیعولئەول) فەرمانی حکوومەتی کوردستان بۆ سەردار دەرچوو و (موشیر ئەلسەڵتەنە) لادرا".[٣٧]

بەڵام (حاجی عزولمالیك)ی ئەردەلان کە لە دەوڵەتی کاتی، وەزیری سوودەکانی گشتی و بازرگانی بوو، لە بیرەوەرییەکانی خۆی ئاماژە بەم خاڵانە دەکا کە ئەو پێی خۆش بووە کە مامی خۆی حاجی سەردار (موکەڕەم ئەلمەلیك) حکوومەتی کوردستان لە ئەستۆ بگرێت نەك سەردار رەشید، بەڵام دەوڵەتی کاتی ئەمی هەڵبژاردو گوێی بەڕای ئەو نەدا.[٣٨] ئەم رووداوە ئەوە دەسەلمێنێ کە کوردانی باشوور وێڕای وەفاداری و خۆشەویستییان بۆ ئێران، پێیان خۆش بوو کەسایەتی کوردی ناوچەکە، کوردستان بەڕێوەبەرن و لەم ناوە تورکەکانیش پشتیوانیان لێ دەکردن، چونکە دەوڵەتی عوسمانی گەرەکی بوو کە لە ناوچە سوننەنشینەکان، لەگەڵ کاربەدەستانی سوننە مامەڵە بکا، لە لایەکی تر حەزی دەکرد کە دەوڵەتی کاتی بێ هێز بکا و بیخاتە ژێر تیشکی سیاسەتەکانی خۆی.

(عزولمالیك) لە کۆچەران بوو و خزمەتێکی بەرچاوی بە دەوڵەتی کاتی کردبوو. ئەوبوو کە کاروباری دارایی دەوڵەتی کاتی رێکخستەوە و توانی بە سوودوەرگرتن لە دەستڕۆیی و ئیعتباری خۆی لە ناوچەی کوردستان، سەربازانی فەوجی (زەفەر) (فەوجی کوردستان لە سەردەمی قاجار) لە ماوەیەکی کەم کۆیکاتەوە و بینێرێتە کرماشان. ئەو ئەوکاتەی کە بۆ عوسمانی کۆچی کرد، لەگەڵ ناسیۆنالیستانی کوردی ئەوێ رووبەڕوو دەبێتەوەو لەم بارەیەوە دەنووسێ:" لە ئەستەمبوڵ، کوردانی عوسمانی وەجاغێکی کوردی (بە تورکی کورد ئەجاقی) لە بەرانبەر تورك ئاجاقی، پێکهێنابوو، کە بەهۆی جەنابی ئیحتشام ئەلسەڵتەنە بالیۆزی گەورە، داوایان لێ کردم کە بچمەناو رێکخراوەکەیان،

من پێم گوتن ئەگەر بەندێك لە پەیڕەو و پرۆگرامیان زێدە بکەن، واتە ئەگەر ئەوەی کە کوردستانی عوسمانییە بە ئێران بلکێندرێ، دەچمە ناو ڕێکخراوی (ئەجاق کوردی)، ئەوەك بانگەشەی سەربەخۆیی کورد پێویست ناکا، چونکە کوردان لە ڕەگەزی پاکی ئێرانین و هەر بەشێك کە لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆکارو شەڕ لە ئێران جیا بۆتەوە، دەبێت بە ئێران بلکێندرێتەوە کە نیشتمانی سەرەکییەو ببێتە بەشێکی دانەبڕاوی ئێران و کاتێ (کوردانی عوسمانی) پێشنیاری منیان ڕەتکردەوە، منیش نەچوومە ناو ڕێکخراوەکەیان". (٣٩)

ئەمە ڕووبەڕووبوونەوەی یەکێ لە گەورە پیاوان و ئەرستیوکراتەکانی ویلایەتی کوردستانە لە سەردەمی بێ دەسەلاتی ئێران لە ئاست مەسەلەی سەربەخۆیی ناوچە کوردنشینەکان و پێکهێنانی کوردستانی گەورە، ئەمە داکۆکی کردنە لەوەی کە کوردانی باشوور ئارەزوومەندن لە چوارچێوەی خاکی ئێران دابن و هەروەها ئەمە ئەو ڕاستییە دەردەخا کە کوردانی ئێران لەم کاتەدا بە تەواوەتی چووینە ناو ناسیۆنالیزمی مودێرنی ئێرانی کە دەسکەوتی مەشروتە بوو و ئامادەبوون بە بەخشینی گیانی خۆیان بیپارێزن. لەم ماوەیەدا، هەستی نەتەوایەتی کوردی لە کوردستانی ئێران لە ئارادانەبوو و بیروبۆچوونیان وابوو کە هەموو گەلانی دانیشتووی ئێران، ئێرانی حسێب دەکرێن. لە مانگی (شەوالی ١٣٣٥) ك.ق ١٩١٤ز کۆمیتەی سزادان بەهۆی یەکێ لە ئەندامەکانی خۆی کە کوردبوو بەناوی (بهادور ئەلسەڵتەنە) ی بانەیی (حاج زەمان خان) کە لەمەوپێش سەرۆکی نەزمیە (نظمیة)ی شاری سنە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سەردار محیی بوو، نامەیەکی لەگەڵ سێ بڵاوکراوەی کۆمیتەی بۆ شێخ محەممەد مەردۆخ نارد و داوای لێکرد کە لقی کوردستانی کۆمیتەی سزادان لەژێر چاودێری ئەو پێکبهێندرێ، بەڵام شێخ دژایەتی ئەم پێشنیارەی کرد، چونکە زەمینە لەبار نەبوو بۆ گەشەکردنی کۆمیتە لە کوردستان و کارکردنی ئەوی بێ ئاکام دەزانی. (٤٠) ئەم کارە ئەوە دەنوێنێ کە کوردان چالاکانە لە کاروباری سیاسیی ئێران بەشداری دەکەن و بایەخ بە بەرژەوەندی وڵات دەدەن، بەڵام ڕووسەکان دوای شکستی عوسمانی دووبارە هەوڵیان دا کە کورد لەناو " یەکێتی" گەلێ گرد بکەنەوەو لە خزمەت خۆیان بەکاریان بهێنن.

عەبدوڵڵا ناهید بە کوردەکانی سەقز سەربە هۆزی فەیزوڵڵابەگی کە لە سەردەمی شەڕ لە نزیکەوە بینەری کردەوەکانی ڕووسەکان بووە دەڵێ:" ڕووسەکان لە شەڕدا زۆر گرنگیان دەدا بە ئازووقە داکردن و بێ لایەن بوونی کورد، بۆ ئەم مەبەستە جەنەڕاڵ نەزەرۆف فەرمانەدەی هێزەکانی ڕووس هەوڵی دا کە ئەمە لە دەرەبەگەکانی کورد لە ناوچەی سەقز و بۆکان بگەیێنێ، بەڵام ئەنجامی نەبوو". (٤١)

هەروەها رووسەکان، حاجی وەهاب خانیان کردە حاکمی سەقز، کە لەگەڵ برایەکەی بەناوی (جەلال ئەلسەڵتەنە) ئازووقەی پێویستیان بۆ ئەوان دابین دەکرد. پاش دارشتنی پلانی سایکس ـ بیکۆ کە بەپێی ئەم پلانە چارەنووسی ئیمپراتۆری عوسمانی و داهاتوی گەلانی ئەرمەن، تورك، کوردو عەرەب دیاری دەکرا، (هەڵبەت بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی هەرسێ وڵاتی رووسیە، فەرەنسە و بەریتانیا) پڕۆپاگەندەی رووسەکان لە ساڵی (١٩١٧) بۆ راکێشانی سەرنجی کوردان بۆ لای خۆیان، زێدەتر بوو.

رووسەکان کە بینیان هێزی بەریتانیا عێراقیان داگیرکردووە، دەیویست رۆژئاوای ئێران بپارێزن لە دەستڕۆیی ئینگلیزەکان، بۆیە هەوڵیان دا تا بکرێ کورد لە خۆیان نزیك بکەنەوە. لازاریف لەم بارەیەوە دەنووسێ کە (زاخار چنکو) ئەفسەری سیاسیی سوپای رووسیە لە سەرەتای ساڵی (١٩١٧) لەگەڵ سەرانی کورد لە کوردستان و کرماشان چاوپێکەوتنی کرد و هەوڵی دا کە رازیان بکا لەوەی هاوکاری لەگەڵ دەوڵەتی رووسیە بکەن، کە هەمان کات بوو مینۆرسکی داوای کرد لە وەزارەتی دەرەوەی رووسیە بۆ ئەوەی کە بەڵێنی ئۆتۆنۆمی بدرێتە کوردی ئێران، کە وەزیری دەرەوە رەزامەندی خۆی دەربڕی.[٤٢] لە مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵ رێککەوتنامەی دۆستایەتی رووسیە و سەرکردە هۆزەکان بە ئامادەیی زاخار چنکو و نوێنەری جەنەڕاڵ باراتۆف فەرماندەی گشتی هێزەکانی رووسیە لە ئێران واژۆکرا. سەردار رەشید یەکێ لە واژۆکەرانی ئەم رێککەوتنامەیە بوو و کوردەکانی هەورامان، مەریوان و کرماشان بەڵێنیان دا کە ئازووقەی سوپای رووسیە دابین بکەن.[٤٣] بەڵام کوردەکان هەر بە زوویی بەندەکانی رێککەوتنامەیان لەژێر پێ ناو پەلاماری یەکەکانی رووسییان دا. پیاوانی سوپای رووس لە تاران خوازیاری لەناوبردنی کورد بوون، بەڵام وەزارەتی دەرەوەی رووسیە دژی ئەم کارە بوو و بە پێی وتەی گولنیشۆف، کۆنسولی رووسیە لە ماکۆ، وا چاکتر بوو کە ئاو و نان بە کوردەکان بدرابایە، چونکە ئەو سیاسەتە نوێیە پتر دەسکەوتی دەبوو و کەسایەتی رووسیەی بەرز دەکردەوە.[٤٤] بەم شێوەیە سیاسەتی ئیستعماری رووسیەی قەیسەری لە دەستەمۆکردنی کوردان و وروژاندنیان لە دژی دەوڵەتی ناوەندیی ئێران بێ ئاکام مایەوەو، هەمدیسان پێویستی کەلك وەرگرتن لە هێز دژی کورد هەست پێدەکرا.

# دەرەنجام

ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجان، دوای سەرکوتکردنی راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلاّ، ئارام بوون. نەبوونی سەرکردایەتییەکی بەهێزی ئایینی، نەبوونی یەکگرتوییەکی پتەو لە نێوان هۆزەکان و بایەخدانی دەوڵەتی ناوەند بە بارودۆخی ئەم ناوچانە، لە دوادەیەی سەدەی نۆزدەهەم لە رێگەی دانانی فەرمانڕەوایانی کورد لە سابڵاغی موکری، بووە هۆی سەقامگیری هێمنایەتی لە ناوچەکە. لەم سەردەمەدا، ناکۆکی سنووری ئێران و عوسمانی چارەسەرنەکرابوو و بابی عالی بە لەبەرچاوگرتنی لاوازی زۆری دەوڵەتی ئێران، هەوڵی دەدا هەندێ پارچە لە خاکی دراوسێ دا ببڕێ و لە سۆنگەی دژایەتی کردنی رووسیە لەم بارەیەوە، بەرپرسانی تورك هەوڵیان دەدا لە رێگەی وروژاندنی هۆزەکانی کورد لە ئازەربایجان ئەم پلانەیان سەربگرێ. لە ویلایەتی کوردستان زەمینەیەکی لە بار بۆ ئامانجەکانی تورکان لە ئارادابوو و ئەم راستییە نیشانەدەری جیاوازی کوردستانی باکوور لە کوردستانی باشوورە لەم سەردەمەدا.

دەست پێشخەرییەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ وروژاندنی هۆزە کوردییەکان بریتی بوون لە :

١ـ راکێشانی هۆزە یاخیبووەکان لە دەوڵەتی ئێران و کۆچدانیان بۆ ناو قەلەمڕەوی عوسمانی لە نزیك سنوور.

٢ـ ساز و تەیارکردنی هۆزە یاخیبووەکان بە چەك و پارە بۆ ئەوەی پەلاماری گوندنشینانی ئازەری سەرسنوور بدەن.

٣ـ بەخشینی پارە و چەك بە هۆزە کوردییەکانی ناو خاکی ئێران.

٤ـ کەڵك وەرگرتن لە هۆزە یاخیبووەکانی کوردی ئێران بۆ سەرکوتکردنی هۆزە یاخیبووەکانی کورد لە ناو خاکی عوسمانی.

٥ـ پڕۆپاگەندەی سیاسیی و ئایینی بەربڵاوی دیپلۆماتە عوسمانییەکان، لە نێو سەرەك هۆز و پیاوانی ئایینی کوردی ئازەربایجان.

٦- پەلاماری سوپایی بۆ سەر خاکی ئێران بە کەڵك وەرگرتن لە سوپای حەمیدییە، کە کورد بەشێکی سەرەکی ئەم سوپایە بوو و، ئەمە دەبووە هۆی ئەوەی کە هۆزە کوردەکان بە سانایی هاوکاری لەگەڵ بکەن.

ئەم سیاسەتەی عوسمانییەکان، هەمیشە کوردەکانی ئازەربایجانی بەرانبەر بە تەوریز و دەوڵەتی ناوەند رادەگرت و، چەکداربوونی هۆزە کوردەکان، هاوتەریب بوو لەگەڵ لاوازی دەوڵەتی قاجار. بێ سەروبەری و شەڕی ناوەخۆی دوای مەشروتە، وای لە کوردەکان کرد کە بتوانن لە کاریگەری حکوومەتی ناوەند دەربکەونەوە، پاشانیش جەنگی جیهانی یەکەم ئەم بارودۆخەی توندتر کرد. بەڵام سەبارەت بە مەشروتە و کاردانەوەی کوردەکان لە ئاست ئەم دیاردەیە، تەنیا لە کوردستانی باشوور جۆرە وەڵامدانەوەیەکی ئەرێیی لە ئارادابوو کە ئەویش زۆر بەرچاو نەبوو. بەڵام خاڵی زۆر گرنگ لە هەڵسەنگاندنی مامەڵەی کورد لەگەڵ مەشروتە، ئەوە بوو کە کوردی ئێران بە پێچەوانەی کوردی عوسمانی، کەوتە خزمەتی ناسیۆنالیزمی ئێرانی و دیاردەیەك بەناوی ناسیۆنالیزمی کورد لێرە نەخولقا، بە واتەیەکی تر حکوومەتی قاجار، سەرەڕای بێ دەسەڵاتیەکی زۆر، توانی یەکگرتووی نەتەوایەتی ئێران بەردەوام بپارێزێ. یارمەتی دانی هۆزە کوردییەکان بە سالار ئەلدەولە، بە مەبەستی دەسەڵاتی پتر و پشکداری لە دەسکەوتی شەڕ و لەوانەیە دژایەتی کردن بووبێت لەگەڵ بیری نوێ. بەڵام ناسیۆنالیزمی کوردی کە لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە عوسمانی سەری هەڵدا، نەیتوانی سەرنجی کوردی ئێران بۆ لای خۆی رابکێشێ.

جەنگی جیهانی یەکەم، بووە هۆی زێدەبوونی بیروڕای سەربەخۆ خوازانەی کوردی عوسمانی، بەڵام ئەم کاردانەوەیە لە ئێران بەدی نەکرا. چەکداربوونی هۆزە کوردییەکان لە رەوەندی جەنگ و بێ توانایی دەوڵەتی ئێران، زەمینەی رەخساند بۆ گەشەکردنی حەزی دوورکەوتنەوە لە حکوومەتی ناوەندی (لامەرکەزیەت) لە لایەن دەرەبەگی گەورە کە دیارترین نموونە، راپەڕینی سمکۆ بوو. ئەم ئارەزووانە لەژێر کاریگەری مەشروتە سەری هەڵدابوو و هەستی نەتەوایەتی کوردی هێشتا رۆڵی تێدا نەگێڕابوو. ئەنجامێکی تری جەنگی گەورە، قوڵتربوونەوەی جیاوازییەکانی نێوان کوردستانی باکوور و کوردستانی باشوور بوو.

# پەراوێزەکان

## بەندی یەکەم

١ـ خەبات لە رێی کوردستان دا، ن.ا.خالفین، وەرگێڕ لە روسیەوە جەلال تەقی (سلێمانی چاپخانەی قیام، ١٩٧١) ل ٢١٢.

٢ـ ایران و قضیەو ایران، لرد جورج ناتانیل کرزن، ترجمەو غ.وحید مازندرانی (تهران، بنگاه ترجمە و نشر کتاب، ١٣٤٩) ٢ مجلد ـ جلد دوم ـ ص ٧٠٤.

٣ـ خەبات لە رێی کوردستان دا ـ ل ٢١٣.

٤ـ ایران و قضیە ایران ـ کرزن ـ ج ٢ـ ل ٧٠٣.

٥ـ مسائل مرزی ایران و عراق و تأثیر ان در مناسبات دو کشور ـ دکتر آزمیدخت مشایخ فریدونی (تهران، امیر کبیر، ١٣٦٩) ص ٣٣.

٦ـ همان مأخذ ـ فصل چهارم قرارداد اول ارزروم ژیل کتاب ـ صص ٢١٩ ـ ٢١٧.

٧ـ همان ـ فصل هشتم از متن قرارداد دوم ارزروم در سال ١٢٦٣ هـ.ق ژیل کتاب ـ ل ٢٢١ ـ ٢٢٠.

٨ـ رسالەو تحقیقات سرحدیە ـ میرزا سید جعفر خان مهندس باشی (موشیر ئەلدەوڵە) ـ بە اهتمام مشیری (تهران، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران) صص ١٧١ و ١٧٠.

٩ـ مسائل مرزی ایران و عراق ل ٧٢ ـ ٦٨.

١٠ـ کردها ـ ل ٦٩ ـ ٦٧.

١١ـ کێشەی کورد ـ ج ١ ـ ل ١٩٤.

١٢ـ گزیدە اسناد سیاسی ایران و عثمانی ـ ج ٤ ـ سند شمارە ٦٥٩ ـ ص ١٤٥.

١٣ـ همان مأخذ ـ سند شمارە ٧١٤ ـ ل ٢٦٦.

14- La Revue du monde muslman – les Kurds persans et invasion Ottomane, Nicolas. A.L.M.2[em]. Année – October 1908.N10.P 202 .

15- Ibid – P203 .

١٦ـ گزیده اسناد سیاسی ایران و عثمانی ـ ج ٤ـ سند شمارەو ٨٠٥ ـ ص ٥٣٦.

١٧ـ همان مأخذ ـ سند شماره ٨١٥ ـ ل ٥٦٠.

١٨ـ روزنامەو خاطرات اعتماد السلطنه (سالهای ١٣١٣ ـ ١٢٩٢ هـ.ق) به اهتمام ایرج افشار (تهران، امیرکبیر، ١٣٤٥) ص ٩٧٥.

١٩ـ کێشەی کورد ـ ج ١ ـ ل ٩٧٥.

٢٠ـ کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهان دا ـ دوکتۆر کەماڵ مەزهەر ئەحمەد (بەغدا، کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٥) ل ١٢٤.

٢١ـ گزیده اسناد سیاسی ایران و عثمانی ـ ج ٤ ـ سند شماره ٨٢١ ـ ل ٥٧٣.

٢٢ـ یادداشتەکانم ـ عبدالله احمد رەسولی پشدەری ـ ٢بەش، بەشی یەکەم (بەغدا، وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن، ١٩٩٢) ل ٢٢ ـ ٢٠.

٢٣ـ کێشەی کورد ـ ج ١ـ ل ٢٠١.

24- Nicolas. A.L.M, op.cit PP 205 – 206 .

25- Ibid – PP 206 – 207 .

٢٦ـ کێشەی کورد ـ ج ١ ـ ل ٢٠٦ و ٢٠٥.

## بەندی دووهەم:

١ـ جنبش ملی کرد ـ کریس کوچرا ـ ترجمەو ابراهیم یونسی (تهران، نگاه، ١٣٧٣) صص ٣١ ـ ٢٧.

ـ کردها ـ گروهی از مؤلفان ـ ترجمه‌و ابراهیم یونسی (تهران، روزبهان، ۱۳۷۲) چاپ دوم ـ صص ۷۰ ـ ٦۹.

ـ همان مأخذ ـ ص ۷۰.

ـ همان جا.

ـ کردها و کردستان ـ درك کینان ـ ترجمه‌و ابراهیم یونسی (تهران، انتشارات نگاه، ۱۳۷۲) صص ۷۳ ـ ۷۲.

ـ همان مأخز ـ ص ۷۳.

ـ همان.

ـ بزووتنه‌وه‌ی سیاسی‌و رۆشنبیری کورد له کۆتایی چه‌رخی نۆزده‌هه‌مه‌وه هه‌تا ناوه‌ڕاستی چه‌رخی بیست.
مزی قزاز (سلێمانی، چاپخانه‌ی ژین، ۱۹۷۱) ل ۲۳ و ۲۲.

ـ کرد در دائره المعارف اسلام ـ ترجمه اسماعیل فتاح قاضی ـ (ارومیه انتشارات صلاح الدین ایوبی، ۱۳٦۷)
ص ۱۰٤.

ـ جنبش ملی کرد ـ ص ۳۱.

ـ کردها ـ جمعی از مؤلفان ـ صص ۷۲ ـ ۷۱.

ـ کرد در دائره‌المعارف اسلام، ترجمه‌و اسماعیل فتاح قاضی ـ ص ۱۰۵.

ـ تاریخ مشروطهء ایران ـ سید احمد کسروی ـ چاپ ۱۳ (تهران، امیرکبیر، ۲۵۳٦) صص ٥٤۲ ـ ٥۳۹.

ـ کێشه‌ی کورد ـ ج ۱ـ صص ۱۹٥ ـ ۱۹٤.

ـ کردها ـ ص ۷۲.

ـ کێشه‌ی کورد ـ ج ۱ ـ ص ۲٤۱.

ـ همان مأخذ ـ صص ۲٥٤ ـ ۲٤۹.

ـ همان مأخذ ـ ص ۲٥۲.

ـ جنبش ملی کرد ـ ص ۳۰.

ـ کێشه‌ی کورد ـ ج ۱ـ ص ۲۲٥.

## بەندی سێیەم:

1- La Revue du people Mediterrane'ens.n 68 - 69. Juillet. December, 1994 – Les Kurds et les etas – Genese et stracture du nationalisme kurd en IRAN – le Dr Abbas Vali – P 149 .

٢ـ دربارەو مبارزات کردستان ـ حمید مؤمنی (تهران، شباهنگ، ١٣٥٨) ص ٢٥.

٣ـ تاریخ کرد و کردستان و توابع یا تاریخ مردوخ ـ محمد مردوخ کردستانی ـ ٢ جلد (سنندج ـ غریقی، ١٣٥٠) ج ٢ ـ ص ٢٣٨.

٤ـ همان جا.

٥ـ تاریخ مشروطهء ایران ـ احمد کسروی ـ چاپ سیزدهم (تهران، امیرکبیر، ٢٥٣٦) ص ١٦٨.

٦ـ تاریخ کرد و کردستان و توابع یا تاریخ مردوخ ـ ج ٢ ـ ص ٢٣٨.

٧ـ مصاحبه با یحیی صادق وزیری ـ دیماه ١٣٧٤.

٨ـ تاریخ کرد و کردستان و توابع . . . ج ٢ ـ ص ٢٤٢.

٩ـ جنبش ملی کرد ـ کریس کوچرا ـ ص ٢١.

١٠ـ بیست سال در ایران ـ دکتر جان ویشارد ـ ترجمەو علی پیرنیا (تهران، نوین، ١٣٦٣) صص ٤٨ و ٤٩.

١١ـ ناسیونالیسم در ایران ـ ریچارد کاتم ـ ترجمەو فرشته سرلك (تهران، نشر گفتار، ١٣٧١) ـ چاپ دوم ـ ص ١٠٩.

١٢ـ نظری به کردستان و دیداری با شعرای کرد ـ خالد خاکی (تهران، انتشارات شرق، ٢٥٣٦)

١٣ـ تاریخ مشروطهء ایران ـ ص ٢٤٩.

١٤ـ تاریخ کرد و کردستان و توابع . . . ج ٢ ـ ص ٢٧٤.

١٥ـ همان مأخذ ـ صص ٢٧٣ ـ ٢٦٩.

١٦ـ همان ـ ص ٢٧٤.

١٧ـ همان ـ صص ٢٧٥ و ٢٧٦.

١٨ـ همان ـ ص ٢٧٧.

١٩ـ تاريخ مشروطهء ايران ـ كسروى ـ صص ٣٦٩ ـ ٣٦٧.

٢٠ـ تاريخ انقلاب مشروطيت ايران ـ دكتر مهدى ملك زاده ـ ٧ جلد ـ جلد سوم ـ چاپ چهارم (تهران، انتشارات علمى ـ ١٣٧٣) ص ٤٨٠.

٢١ـ تاريخ كرد و كردستان و توابع . . . ج ٢ـ ص ٢٧٨.

٢٢ـ همان جا.

٢٣ـ تاريخ انقلاب مشروطيت ايران، دكتر مهدى ملك زاده، ج ٧ ـ ص ١٤٥٣.

٢٤ـ كێشەی كورد ـ ج ١ ـ صص ٢٩١ ـ ٢٩٠.

٢٥ـ كێشەی كورد ـ صص ٢٩٢ ـ ٢٩١.

٢٦ـ تاريخ كرد و كردستان و توابع ـ ج ٢ ـ ص ٢٧٩.

٢٧ـ همان مأخذ ـ ص ٢٨٠.

٢٨ـ كردها و كردستان ـ درك كينان، ترجمەو ابراهيم يونسى (تهران، انتشارات نگاه، ١٣٧٢) ص ١١٣.

٢٩ـ كێشەی كورد ـ ج ٢ـ ص ٢٤٩.

٣٠ـ اسناد و مكاتبات تاريخى ايران (قاجاريه) از ١٣١٣ تا ١٣٣٢ هـ.ق. دكتر محمد رضا نصيرى ـ ٤ جلد ـ جلد چهارم ـ سند شمارەو ٧١. صص ١٦٥ ـ ١٦٣.

## بەندی چوارەم:

١ـ كردها ـ ص ٧٤.

٢ـ همان جا.

٣ـ كێشەی كورد ـ ج ٢ ـ ص ٥٠٧.

٤ـ همان مأخذ ـ ص ٥٦٠.

٥ـ تاريخ كرد و كردستان يا تاريخ مردوخ ـ ج ٢ ـ ص ٣٢٦.

٦ـ خاطرات لیتن سرکنسول آلمان در تبریز در اثنای جنگ جهانی اول ـ ویلهلم لیتن ـ ترجمه‌و دکتر پرویز صدری (تهران، انتشارات ایرانشهر، ۱۳٦۸) ص ٦۳.

۷ـ کێشه‌ی کورد ـ م س. لازاریف ـ ج ۲ ـ ص ٥٦۰.

۸ـ ایرانی که من شناخته‌ام یا خاطرات ب.نیکیتین کنسول سابق روسیه در ایران ـ ترجمه‌و علی محمد فروشی (تهران، انتشارات معرفت، ۱۳۲۹) صص ۲۳۲ و ۲۳۰.

۹ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ احمد کسروی ـ چاپ دهم ـ (تهران، امیرکبیر، ۱۳۷۱) ص ٥٥۹.

۱۰ـ ناسیونالیسم در ایران ـ ریچارد کاتم ـ ص ۱۱۲.

۱۱ـ خاطرات لیتن ـ ویلهلم لیتن ـ ص ۱۱۱.

۱۲ـ کێشه‌ی کورد ـ م.س.لازاریف ـ ج ۲ ـ ص ٥٦۰.

۱۳ـ همان مأخذ ـ ص ٥٦۸.

۱٤ـ ایرانی که من شناخته‌ام ـ ب.نیکیتین ـ ص ۲۳۲.

۱٥ـ کردها ـ گروهی از نویسندگان ـ ص ۷٤.

۱٦ـ ایرانی که من شناخته‌ام ـ صص ۲۳۳ ـ ۲۳۲.

۱۷ـ کوردستان له ساڵه‌کانی شه‌ڕی یه‌که‌می جیهان دا، ص ٦۱.

۱۸ـ کێشه‌ی کورد ـ ج ۲ ـ ص ٥۹٤.

۱۹ـ ایرانی که من شناخته‌ام ـ ص ۲۳۰.

۲۰ـ کورد ـ مینۆرسکی ـ حه‌مه سه‌عید حه‌مه که‌ریم، کردویه‌تی به کوردی (عێراق، زانکۆی سه‌لاحه‌ددین، ۱۹۸٤) صص ۱۷٥ ـ ۱۷٤.

۲۱ـ ایرانی که من شناخته‌ام ـ ب.نیکیتین ـ ص ۲۳۰.

۲۲ـ کێشه‌ی کورد ـ م.س.لازاریف ـ ج ۱ ـ ص ۲۲٥.

۲۳ـ همان جا.

۲٤ـ تاریخ هیجده ساله‌و آذربایجان ـ سید احمد کسروی ـ ص ٦۰۰.

٢٥ـ خاطرات ليتن ـ ويلهلم ليتن، صص ١١٨ ـ ١١٦.

٢٦ـ همان مأخذ ـ صص ١١٨ ـ ١١٧.

٢٧ـ همان مأخذ ـ صص ١٤٨ ـ ١٤٠.

٢٨ـ ايرانى كه من شناختهام ـ ب.نيكيتين ـ صص ٢٣٤ ـ ٢٣٣.

٢٩ـ كوردستان له ساڵهكانى شهڕى يهكهمى جيهانى دا. دوكتۆر كهماڵ مهزههر ئهحمهد ـ ص ٦٣.

٣٠ـ خاطرات ليتن ـ ويلهلم ليتن ـ صص ١٤٥ ـ ١٤٣.

٣١ـ همان مأخذ ـ ص ١٤٦.

٣٢ـ همان مأخذ ـ ص ١٤٧.

٣٣ـ همان ـ ص ١٤٢.

٣٤ـ خاطرات من ـ عبدالله ناهيد ـ صص ٤٦ ـ ٣٠.

٣٥ـ تاريخ كرد و كردستان يا تاريخ مردوخ ـ ج ٢ ـ ص ٣٢٨.

٣٦ـ تاريخ كرد و كردستان ـ ج ٢ـ ص ٣٣٢.

٣٧ـ همان مأخذ ـ ص ٣٣٣.

٣٨ـ اولين قيام مقدس ملى در جنگ بين المللى اول با خاطرةهاى آقاى حسين سميعى (اديب السلطنه) و آقاى امان الله اردلان (حاج عزالممالك)، چاپ اول (تهران، انتشارات ابن سينا، ١٣٣٢) ص٩٢.

٣٩ـ همان مأخذ ـ ص ١١١.

٤٠ـ تاريخ كرد و كردستان يا تاريخ مردوخ ـ ص ٣٣٧ ـ ج ٢.

٤١ـ خاطرات من ـ عبدالله ناهيد ـ ص ٧١.

٤٢ـ كێشهى كورد ـ ج ٢ ـ صص ٦٥٧ ـ ٦٥٦.

٤٣ـ همان مأخذ ـ ص ٦٥٧.

٤٤ـ همان مأخذ ـ ص ٦٦٠.

# دەروازە

بەشی سێیەم لە راپەڕینی هۆزی شکاك بە سەرکردایەتی ئیسماعیل ئاغای شکاك دەکۆڵێتەوە کە تێیدا باس لە کوشتنی جەعفەر ئاغای شکاك و چۆنیەتی گەیشتنی سمکۆ (ئیسماعیل ئاغا) بە دەسەڵات، کاریگەری جەنگی جیهانی یەکەم لەسەر کارەکانی ئەو، جیاخوازی مەسیحییەکان لە ورمێ، ناوچەگەرێتی شێخ محەممەدی خیابانی و کاریگەری لەسەر کوردانی ئازەربایجان، تاڵان و داگیرکردنی شار و گوندەکانی دەوروبەری دەریاچەی ورمێ لەسەر دەستی هۆزە کوردییەکان، نەبوونی ئاسایش، وەستانی باری ئابووری و کوشتاری یەك لە دوای یەکتری و ئاکامەکانی دەکرێ و هەروەها لەو بەشەدا لە هەوڵی کوردانی نیشتمانپەروەری عێراق و تورکیە بۆ گشتگیرکردنی راپەڕینی سمکۆ بۆ ئەوەی بگاتە وڵاتەکەیان و کەڵك وەرگرتنی سیاسی تورکیە و بەریتانیا لە کوردان، دەکۆڵدرێتەوە. لەم بەشە نیشان دەدرێ کە راپەڕینی سمکۆ مۆرکێکی (Tribalism) دەرەبەگی پێوە دیاربووە و لە چوارچێوەی خێڵایەتییەکی تەواو دا ئەنجام دراوە.

# بەندی یەکەم

## زەمینەکانی راپەڕینی سمکۆ

# هۆزی شکاك لە سەردەمی قاجار

خێڵی شکاك یەکێکە لە خێڵە گەورەکانی کورد، کە شوێنی سەرهەڵدان و قەڵەمڕەوی یەکەمیان لە ئاسیای بچووك و دەڤەری ئیمپراتۆری عوسمانی بووە. هۆزگەلی جۆراوجۆر لەم خێڵە گەورەیە هاوکات لەگەڵ حکوومەتی قەرەقۆینلووەکان لە رۆژهەڵاتی ئاناتولی لە سەدەی نۆیەمی کۆچی، تا سەرەتای پێگرتنی دەوڵەتی سەفەوی لە سەدەی دەیەمی کۆچی، پەیتاپەیتا بەرەو ئێران کۆچیان کردووە.

هۆزگەلی شکاك دوای هاتنیان بۆ ناو ئازەربایجان لە ناوچەکانی هەشترود، گەمرود، سەراب و قوریچای، لە زنجیرە چیای سەهەند تا میانە، ئاکنجی بوون و لە دواییدا لە سەردەمی شا عەبباس، دەستەیەك لەوان بۆ بەرپەرچدانەوەی پەلاماری ئۆزبەکەکان بۆ ناوچە جۆربەجۆرەکانی خوراسان و لەوانە قوچان کۆچ دران.[1]

ئەو دەستەیە لە هۆزگەلی شکاك کە نێردراونە ناو شیعەکان و ئازەرییەکان، زمانی تورکی و ئاینزای شیعیان هەڵبژارد، بەڵام ژمارەیەکی کەمیان لە ناوچەکانی نزیك سنووری عوسمانی واتە ناوچەی باشووری ماکو، چەهریق، سۆمای و برادۆست، قوتور، سەلماس و ناوچەکانی دیکە نیشتەجێبوون و هەم زمانی کوردی و هەم ئاینزای خۆیان پاراست (تەنیا شکاکەکان لە ناو کوردان لەسەر رێبازی حەنەفین) ئەم پاراستنەش لەوە هاتووە کە لە ناو کوردی هاوزمان و هاوئایینی خۆیاندا دەژیان.

هۆزی شکاك لە سەردەمی سەفەوی و ئەفشاری و زەندییەکان،بە تەواوەتی لە ئاست دەوڵەتی ئێران وەفاداربوون و لە راپەڕینی کوردی موکری و شەڕی بەناوبانگی قەڵای (دمدم) لایەنگری حکوومەتی سەفەوی و شا عەبباسیان کرد.[2]

بەڵام لە سەردەمی قاجار، هۆزی شکاك بە کەڵك وەرگرتن لە لاوازی ئێران، لە شەڕی دە ساڵە کە لەگەڵ رووسیەی قەیسەری کردیان، وردە وردە بەرەو یاخیبوون هەنگاویان دەهاویشت. دوای ئەمە، دەبینین کە شکاکەکان لەگەڵ هۆزەکانی تری کورد و ئازەری و دەوڵەتی قاجار، پێکدادانیان دەستی پێکرد.

یەکەم راپەڕینی بەرچاوی خێڵی شکاك، لە یاخیبوونی ئیسماعیل ئاغای سەرەك خێڵ، دەستی پێکرد کە لە ساڵی ١٢٢٢ ك.ق (١٨٠١ز) لە سەردەمی جەنگی ئێران و رووس روویدا.

ئیسماعیل ئاغا لەسەر چیای بناب نازلو قەڵایەکی پتەوی سازکردو، هەوڵیدا بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری خۆیدا زاڵ بێ. پیاوانی ئەو هەندێ لە گوندەکانی دەوروبەری قەڵای بناب نازلویان تاڵانکرد و لە ئەنجامدا بیگلەربەیگی ئەفشار لە ورمێ، بەناوی (حوسێن قولی خان) پلانی کوشتنی دارێشت و لەم پلانەدا سەرکەوتوو بوو.[٣] هەروەکو لە نووسراوەکانی نووسەری مێژووی ئەفشار دەردەکەوێت، ئیسماعیل ئاغا لە سۆنگەی خزمەتی بەرچاو، کە لە جەنگ لەگەڵ رووسیە ئەنجامی دابوو لە خزمەت عەبباس میرزای( نایب ئەلسەڵتەنە) کەوتە بەر دڵی فەتح عەلی شا و یەکێ لە کچەکانی خۆی دابووە کوڕی گەورەی عەسکەرخانی ئەفشار، ئەمانە بوونە هۆی ئێرەیی هاتنەوەی بیگلەربەیگی و ئاغاکانی تری ئەفشار و لە کۆتاییدا بووە قوربانی ئەم ململانێی ناوچەگەرییەی نێوان ئازەری و کورد.

خاڵی گرنگ لەم ناوەدا ئەوەیە کە هۆزی شکاك مامەڵەیەکی تایبەتیان لەگەڵ دەوڵەتی قاجار دەکرد و لە شەڕی درێژخایەنی فیدراسیۆنی بلباس واتە هۆزی مەنگوڕ، مامەش، زەرزا، هەرکی پیران و بەگزادە لەگەڵ هێزی دەوڵەتدا، هەرگیز خۆی تێهەڵنەدەقورتاند. راپەڕینی دووەمی هۆزگەلی شکاك لە ساڵی ١٢٧٤ ك.ق ١٨٥٣ز بە سەرکردایەتی عەلی ئاغا شکفتی کە سەرەك خێڵی شکاك بوو، رووی دا. هەرچەندە نووسەری مێژووی ئەفشار، هەروەکو راهاتووە ئاغای کورد تاوانبار دەکا بە یاخیگەری، تاڵانکردنی شتومەکی بازرگانان لە قوشچی و قولنجی و سەرانە نەدانی سۆمای، بەڵام ئاشکرایە کە دەستەویەخەبوونی ئەو لەگەڵ دەوڵەتدا لە ئەنجامی ململانێ بووە لەگەڵ بیوك خانی سەرهەنگ کە سوربوو لەوەی کە داهاتی گوندی هوسێن لە سۆمای بۆ خۆی تۆمار بکا.[٤] بەهەرحاڵ عەلی ئاغا لە رەوتی ئەو شەڕانەی کە روویدا، بە دیل دەگیرێ و دەخرێتە بەندیخانە و لە ساڵی ١٢٩٧ ك.ق ١٨٧٦ز ئازاد دەکرێ و لە تاران بۆ ئازەربایجان دەگەڕێتەوە. عەلی ئاغا " کاربەدەستانی حکوومەتی لە ملکەچی خێڵەکەی و گەیاندنی باج و سەرانە دڵنیا کردەوە، بوو بە سەرەك خێل و بۆ سۆمای و برادۆست گەڕایەوە".[٥] بەڵام ئەو دووبارە راپەڕی و ئەمجارەیان بە شێوەیەکی وا هۆزی شکاك سەرکوتکرا، کە نەیتوانی لە راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵلا رۆڵی کاریگەر ببینێ.

دوای عەلی ئاغا، سەرکردایەتی خێڵی شکاك گەیشتە محەممەد ئاغای باوکی سمکۆ. سەردەمی سەرکردایەتی خۆی، پڕبوو لە سەرپێچی، سەربزێوی، نەدانی باج و سەرانە و تاڵان و بڕۆ و پێوەندی گوماناوی نێوان ئەم خێڵە و دەوڵەتی عوسمانی.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمی زایینی و سەرەتای سەدەی بیستەم، گۆڕانکارییەکی گەورە لە ئازەربایجان ڕوویدا، کە لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکارییە، ستراکتۆری خێڵ و سیستەمی هۆزایەتی لە نێو هۆزگەلی ئازەری تا ڕادەیەکی زۆر لە نێو چوو و زۆربەی کەسانی خێڵی دومبولی، ئەفشار، ماکۆیی و هتد... لە گوندەکانی دەوروبەری ئازەربایجان نیشتەجێکران، بەڵام لە بەرانبەر ئەمەدا، هۆزگەلی جەلالی، میلان، دێبوکری و فیدراسیۆنی بلباس، هەروەکو جاران سیستەمی خێڵایەتییان پاراست و لە ئەنجامدا بالانسی هێزە سیاسییەکان و سوپاییەکانی پێشوو لە نێو هۆزگەلی ئازەری و کورد کە پتر ئازەرییەکان زاڵ بوون، لە نێو چوو.

ئەم گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی ـ ئابوورییە، کاتێ ڕوویدا کە دەوڵەتی قاجاریش تووشی لاوازی سەربازی و ڕامیاری هاتبوو، هەروەها دەسترۆیی ڕووسیە لە ئازەربایجان زیاتر ببوو و، هەڕەشەی پتری عوسمانی دەبووە هۆی دەسەڵاتدارێتی هۆزە کوردییەکان و دەسپێکی یاخیبوونیان بوو لە دەوڵەتی ناوەند، بەرلەمە یاخیگەری هۆزگەلی کورد بەهۆی خێڵە ئازەرییەکان، بێ خۆتێهەڵقورتانی تاران و تەنانەت تەورێز، سەرکوت دەکرا، بەڵام وردە وردە ئەم حاڵەتە لەناو چوو و خێڵە کوردەکانی ئازەربایجان، بەرەبەرە لە بەرانبەر دەوڵەتی ناوەند وەستان کە لە ڕاپەڕینی سمکۆ گەیشتە چلەپۆپە. هەر ئەم کاتە بوو کە دەوڵەتی عوسمانی دەستی بە سوودوەرگرتن لە خێڵاتی کوردی کرد لە بەرژەوەندی خۆی و وروژاندنیان لە دژی بەرژەوەندی ئێران.

کەسرەوی لە بارەی خێڵی شکاك لە( تاریخی مەشروتەی ئێران) دەڵێ: "سەرەك هۆزەکان هەرکات بە هەڵیان زانیبایە، بەرانبەر بە دەوڵەتی ناوەند دەوەستان و تالان و بڕۆیان دەست پێدەکرد. هەر لەم کاتانە، سەرەك هۆزەکان و کوڕەکەی جەعفەر ئاغا، دەستی کردبوو بە سەرپێچی لە ڕاست دەوڵەتی ئێران و لە تالان و پەلامار نەدەوەستان".(٦)

نیکۆلاسیش کە بەچاوی خۆی مامەڵەی شکاکەکانی لە ساڵی (١٩٠٨) لەگەڵ مەسیحییەکان بینیوە و هەروەها سکاڵای کردووە لە تالان و بڕۆی ئەوان لە دۆڵی ئالباغ ، دەنووسێ: " شکاکەکان بەوپەڕی پەستییەوە، لە ڕێگەی تالان و بڕۆ ژیان دەبەنە سەرو هەندێ جاریش ئاژەڵ بەخێو دەکەن. سەرانی شکاك هەندێ گوندیان لەژێر دەستدابوو کە گوندییەکان زۆر بە چاکی کاریان لەسەر زەوییەکان دەکرد و سوودیان بە سەرکردەکان دەگەیاند، ئەم کوردە نیشتەجێ بووانە، پێشووتر بێ ئازاربوون، بەڵام دوای پێوەندیان لەگەڵ شکاکەکان، فێری دزی و تالان بوون."(٧)

بەپێی راپۆرتی کۆمیسیۆنی دیاریکردنی سنوور لە رێکەوتی ١٣١٨ک.ق ١٨٩٧ز سەربزێوی محەممەد ئاغا لە چەهریق لەم ساڵەدا رەهەندی بەربڵاوتری بەخۆیەوە دی. میرزا موسا خان سەرۆکی کۆمیسیۆنی دیاریکردنی سنوور، پێشنیاری بە دەوڵەت کرد کە دوو کوڕی ئەو وەك بارمتە لە کۆشکی شادا بهێڵنەوە، بۆ ئەوەی دەمکوت بکرێن.(٨) لە راپۆرتێکی تر هەر لەم زاتە، ئاماژە بە تەقەلاّی محەممەد ئاغاو کوڕەکانی دەکا بۆ ئەوەی بەسەر گوندەکانی چەهریق زاڵ ببێ کە پتر لە شەست گوند بوو، تێیدا هاتووە: " پەنجا و سێ دانە گوند لەم گوندانەی ناوبراو، لە سایەی بەرێوەبردنی چاکی شکاکەکان، ئەم ئایەتەی قورئانی لەسەر راستە کە دەڵێت:" وجعلنا عاليها سافلها" و خەلکی ئەم حەوت دێیەکەی تریش دەبێ بتوانن باج و سەرانەی پێویست بدەن و خەرجی محەممەد ئاغا و کوڕەکەشی بکەوێتە ئەستۆی ئەوان... ".(٩)

سەرۆکی کۆمیسیۆنی سنوورەکان، لە دواییدا باس لە ناکۆکی نێوان جەعفەر ئاغا و باوکی و برایەکانی تری دەکا و دەنووسێ:" جەعفەر ئاغا، بە ئاشکرا هەڕەشەی کوشتنی لە باوك و برایەکانی دەکرد".(١٠) جەعفەر ئاغا، لەم کاتەدا بە جیدیەتی تەواو، هەوڵی دەدا تا خۆی دەسەلاّت لە ناو هۆز وەرگرێ و باوکی لە خۆتێهەڵکوتانی کاروباری خێڵ و ناوچەکە دوور رابگرێ، هەر لەبەر ئەمەش لەگەڵ شازادە ئیمام قولی میرزا حاکمی ورمێ، پێوەندییەکی نزیکی دامەزراند و لەهەمان کاتدا لە عوسمانیش نزیك بۆوە. (ئەرفەع ئەلدەوڵە) بالیۆزی ئێران لە ئەستەمبوڵ، باس لە پێوەندی نزیکی جەعفەر ئاغا و جواد بەگی قایمقامی قەزای حەمیدییە دەکا و بە دەوڵەت رادەسپێرێ کە هۆزی شکاك سەرکوت بکا.(١١) لە کۆی ئەم راپۆرتانە، وا بەدەردەکەوێ کە نەبوونی ئیرادەی سیاسی و هێزی تەواو لە تاران و تێکدەرییەکانی عوسمانی، ببووە ئاستەنگ لە رێگەی هێور راگرتنی شکاك لە ئاست دەوڵەتی ئێراندا. جگە لەمانە، شکاکەکان هەمیشە دەیانتوانی لە نێو کاربەدەستانی دەوڵەت لە تەورێز و ورمێ کەسانێك بکڕن، هەروەکو لە گەشتی یەکەمی (موزەفەرەدین شا) بۆ ئەورووپا، پلانی کوشتنی محەممەد ئاغا دارێژرا، بەلاّم ئەو دەست پێشخەری کرد و پەنای بۆ ناو ئاخوری شا لە تەورێز برد و " کاربەدەستانی گەورەی دەوڵەت ئەویان لە چەهریق هێشتەوە".(١٢)

بەم جۆرە هۆزی شکاك، وردە وردە بووە خاوەنی دەسەلاّتێکی سیاسی و سوپایی بەرچاو، کە ئاسایشی ناوچە سنوورییەکانی لە سەردەمی مەشروتە، رووبەڕووی کۆمەڵێك مەترسی کردەوە، بە شێوەیەکی وا کە دەوڵەتی ئێران بە چاکی نەدەزانی لەگەڵیدا تووشی شەڕ ببێ.

# کوشتنی جەعفەر ئاغا و ئەنجامەکانی

لە نێوان ساڵانی ١٣١٨ تا ١٣٢٣ک.ق ١٨٩٧-١٩٠٢ز لە ئەنجامی ململانێی ناوخۆیی خێڵایەتی کەسایەتییەکی بەهێز لە نێو خێڵی شکاك بەدەرکەوت، کە هەمان جەعفەر ئاغا کوڕی گەورەی محەممەد ئاغا بوو. ئەو لە کاتێکدا کە باوکی هێشتا زیندوو بوو و بە پێچەوانەی نەریتی خێڵ جۆراوجۆرەکانی شکاك، کە سەرکردەی خۆیان لە ڕێگەی ڕاوێژکاری و هەڵبژاردن لە نێوان تیرەی عەبدوئی و هۆزی پساغادا هەڵدەبژارد، بە زۆری خۆی وەك سەرەك خێڵ ڕاگەیاند. وەرگرتنی دەسەڵات لە لایەن جەعفەر ئاغا، پەلاماری شکاکی بۆ سەر دراوسێیەکان زێدەکرد و هێز و توانستی سوپایی ئەندامانی ئەم خێڵە زێتر بوو. زاڵبوونی جەعفەر ئاغا لەسەر ناوچەی سنووری ئێران و عوسمانی، وای کرد کە رووسیەش بە چاوی بایەخەوە سەیری جەعفەر ئاغا بکا. هەر بۆیەش لە ساڵی (١٨٨٩)، ئەو و( عەبدولڕەزاق بەدرخان) و سەید تەها نەوەی شێخ عوبەیدڵڵایان بۆ رووسیە بانگهێشتکرد و دوای بەخشینی هەندێ دیاری پێیان، کارێکی واکرا کە بتوانن چاویان بە قەیسەر نیکولای دووەم بکەوێ.(١٣)

راستی ئەم هەواڵە زاندراو نییە و مینۆرسکی و لازاریف باسیان نەکردووە و رەنگە ئیگلتۆن لەسەر زاری کوردان و قسەی دەوروبەرەکانی جەعفەر ئاغا و سەید تەها، لەم هەواڵە دوابێ.

مینۆرسکی کە جەعفەر ئاغای بەر لە کوشتنی لە تەورێز بینی بوو، دەنووسێ دەوڵەتی ئێران بۆ دەستەمۆکردنی جەعفەر ئاغا، کردی بە سنوورداری ئێران لە بەشێکی سنوورەکانی عوسمانی دامەزراند، بەڵام ئاغای کورد پاش ماوەیەکی کورت دووبارە دەستیکرد بە ڕووتکردنەوەی دەوڵەمەندانی ناوچەکە.(١٤)

مینۆرسکی دەڵێ کە جەعفەر ئاغا بازرگانان و دەوڵەمەندانی ناوچەکەی تاڵان دەکرد و دەسکەوتەکانی بە هەژاران دەبەخشی، بۆیە لە نێو خەڵکی هەژاردا خۆشەویست بوو، بەڵام جگە لەمە کە ئەم دەرەبەگە کوردە دوای مردنی بوو بە تۆخمێکی دیار لە ناو خەڵکیدا (مینۆرسکی پێنج ساڵ پاش مردنی جەعفەر ئاغا لەگەڵ خەڵکی خێڵەکەی و زێدەکەی وتووێژی کرد)، ئەم راستییە کە ئەو ئاسایشی ناوچەکەی شێواندبوو و دەوڵەتی هەراسان کردبوو، ئەمە دەسەلمێنێ کە هۆکارگەلێ پتەو و گرنگ، بە لایەنی کەمی لە دیدی دەوڵەتەوە، بۆ کۆنترۆڵی ئەو بە هەر شێوەیەك کە بکرێت، لە ئارادابووە.(١٥)

هەرحاڵ بە فەرمانی (محەممەد عەلی میرزا) جێگری شا کە ئەو ساڵی واتە ١٢٨٤ ه.ش
١٩٠ز لە تاران بوو، فەرمانڕەوای تەورێز، (نظام السلطنه) مافی بە فرت و فێڵ جەعفەر
غای بۆ تەورێز راکێشا.

ساڵی ١٣٢٣ ه.ق لە سۆنگەی ناکۆکی و پێکەوتنی دانیشتووانی تورك و ئەرمەنی قەفقاز،
وەندی ئەرمەن و خەڵکی تەورێز تاریك بوو و شار کەوتە ناو قەیران. نظام السلطنه بەرواڵەت بۆ
راستنی ئاسایش لە سەرەك خێڵی شکاك داوای یارمەتی کرد و بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەو قورئانێکی
ۆر کرد و بۆی رەوانە کرد. پاش ماوەیەکی کەم جەعفەر ئاغا لە بارەگەی حکوومەت لە تەورێز
وژرا. عوسمانییەکان یەکسەر لەم هەڵەیەی دەوڵەتی ئێران کەڵکیان وەرگرت و خێڵی شکاکیان لە
رمەت بەرژەوەندی خۆیان بەکارهێنا.

رفەع ئەلدەولە بالیۆزی ئەوکاتی ئێران لە ئەستەمبوڵ لە بارەی کەڵك وەرگرتنی دەوڵەتی عوسمانی
م رووداوە دەنووسێ محەممەد ئاغا دوای کوژرانی کوڕەکەی هاتە ئەستەمبوڵ و لە چاوپێکەوتنی
ولتان لە قەسری یەلدیز خوازیاری ئەوە بوو کە دەوڵەتی عوسمانی هۆزی شکاك بۆ تۆڵە سەندنەوە
دەوڵەتی ئێران یارمەتی بدا و تورکەکانیش لە بەرانبەر ئەمەدا پلەی پاشایی و هەندێ پارەو
ەکیان پێدا.[١٦] (ارفع الدوله)و کەسرەوی هەردووکیان باس لەوە دەکەن کە لە ئەنجامی نارەزایەتی
وڵەتی ئێران تورکەکان پلەی پاشاییان لە محەممەد ئاغا سەندەوەو لە یارمەتیدانی
شگەزبوونەوە.[١٧] بەڵام لازاریف بە پشتبەستن بە بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوەی رووسیە، وێڕای
نان بەوەی کە محەممەد ئاغا و سوڵتان لە ئەستەمبوڵ یەکتریان بینیوە هەروەها دەسەلمێنێ کە
رکەکان نەك دەستیان لە یارمەتیدانی ئەو هەڵنەگرت، بەڵکو بە لەز بەرەو سنووریان رەوانە کرد و
و " دەستیکرد بە پڕۆپاگەندە بۆ عوسمانییەکان و پیاوەکانی ئەو توانیان سەرەك هۆزەکانی
امەش و مەنگوڕ بە پارەوپول بکڕن و وایان لێ بکەن کە خەلافەتی سوڵتانی عوسمانی قبوڵ
کەن.[١٨] بەم شێوەیە خراپی لە سیاسەتی حکوومەتی قاجاری لە کوشتنی جەعفەر ئاغا، هەم
مینەی لە باری رەخساند بۆ سوپای تورك لە رۆژئاوای ئازەربایجان لە ساڵی ١٢٨٦ ه.ش
١٩٠١)ز و هەم هۆزە سەرەکییەکانی فیدراسیونی بڵباس واتە مەنگور و مامەش و هۆزەکانی
کاك پتر بکەونە خزمەتی سیاسەت و بەرژەوەندییەکانی عوسمانی. یەکێ لە ئەنجامە نەرێکانی
رشتنی جەعفەر ئاغا، بریندارکردنی هەستی ئایینی کوردەکان بوو، ئەوان وای بۆ دەچوون کە
وان بوونەتە قوربانی دوژمنایەتی شیعەکان (بە وتەی کوردەکان، عەجەم) و سوننەکان و هەڵبەت
م هەستە لای ئەوان دروست دەبوو کە فارس و ئازەری غەدریان لێدەکەن. ئاشکرایە کە ئەم جۆرە

بۆچوونە تەنیا لە نێو کوردی ئازەربایجان ڕاست بوو و بابەتێکی لەمێژینە بوو، بەڵام لە ویلایەتی کوردستان لەبەر دراوسێیەتی و پێکەوە ژیانی کوردە سوننەکان و کوردە شیعەکان ئەم حاڵەتە لە ئارادانەبوو. نیکتین لەگەڵ گێڕانەوەی لاوکێکی کوردی کە بۆ جوانەمەرگێتی جەعفەر ئاغا گوتراوە، کاردانەوەی شکاکەکانی بۆ کوشتنی ئاغای گەورەی کورد نیشان دەدا. لەم لاوکە وا هاتووە: "نەخۆشی تاعون لە سەیرانە، هێڤی خوازم بچێتە ناو ماڵی شازادەی جێگری ئێران. ئەو نامەیەکی بۆ باوکی گوڵزار (کچی جەعفەر ئاغا) نووسی بەم جۆرە " وەرە بۆ لای من" لەوەی کە ئەو پێراریش بۆ خۆی شایەك بوو، ئەو ساڵی لە خاکی عەجەمستان مایەوە، ئەی لاو تۆ، چقڵی چاوی دوژمنانی، تۆ پاشای ڕاستینی بیابانی.. لە تەورێزی بە قورگیراو جەژن و ئاهەنگە و مزگێنییان بە سەیدانی کەربەلاش داوە". (١٩)

لەوانە گرنگترین ئەنجامی کوشتنی سەرەك خێڵی شکاك، دروستبوونی بیانگەیەك بۆ سمکۆ بوو کە بۆ سەندنەوەی خوێنی برایەکەی ڕاپەڕێ و بۆ ماوەی پتر لە دوو دەیە ڕۆژئاوای ئازەربایجان نوقمی پشێوی بکات. هەڵبەت ڕەفتاری سمکۆ لە ساڵانی دواتر سەلماندی کە مردنی جەعفەر ئاغا تەنیا بیانگەیەك بوو بۆ بەربڵاوترکردنی دەسەڵاتی تاکەکەی خۆی و دوای ئەوەی کە ڕاپەڕین گەیشتە پۆپەی خۆ، ئەم بیانگەیەش لەبیرکرا. لەوەی کە جەعفەر ئاغا لە نێو کوردان بچمێکی سیاسی تایبەتی نەبوو، چونکە لە سەرەوەی هەرەمی خێڵیدابوو، ناکرێ وا بیر بکرێتەوە کە پێوەندییەك لە نێوان ئەو و شارنشینان و گوندییەکانی کورد هەبوو بێ، بە دڵنیاییەوە دەکرێ بگوترێ کە کاردانەوەی سیاسی مردنی ئەو، جیا لە کاریگەری ئایینی کە دەیتوانی بە شێوەیەکی گشتی لەسەر کوردی ئازەربایجانی هەبوایە، تەنیا لەسەر توخمە خێڵەکییەکان هەبوو. مسۆگەرە، دوای ئەمە خێڵە کوردییەکان لە دەوڵەتی قاجار دوورکەوتنەوەو لە یەکتر نزیك بوونەوەو لە دواییدا بێ توانایی تەواوی دەوڵەت لە ئەنجامی نەبوونی ئاسایش دوای مەشروتە و جەنگی گەورە بووە هۆی سەرهەڵدانی فیدراسیونی گەورە لە نێو هۆزە کوردییەکان کە بەهێزترین سەرکردایەتی لە ئەستۆی سمکۆ دابوو.

# هاتنی سمکۆ بۆ شانۆی سیاسی ئازەربایجان

پاش مردنی جەعفەر ئاغا تا ماوەیەکی زۆر هۆزی شکاك لە سنووری عوسمانی بەسەر برد و محەممەد ئاغاش کۆچی دوایی کرد. لە ئەنجامدا ئیسماعیل ئاغا کوڕی دووەمی ئەو کە لە نێو کوردان بە سمکۆ بەناوبانگ بوو، بۆ بە سەرەك عەشیرەت. شکاکەکان بە درێژایی سالانی ١٩٠٦، ١٩٠٧ز.ش بینەری پێکەوتنی دەستووریخوازان و لایەنگرانی ئیستبداد بوون و هەروەها یارمەتی عوسمانییەکانیان دەدا، بۆ نموونە لە پەلاماری سوپای عوسمانی بۆ ناوچەی "وزنە" لە سالی (١٩٠٧) بێجگە لە هەشت گوردان (فەوج ) تورك و حەوت گوردان حەمیدییە کە لە موسل نێردرابوون، هۆزگەلی شکاك، پیران و بەگزادەش بەشداربوون.[٢٠] بەلام هۆزی شکاك نەیدەویست کە تەنیا پشت بە عوسمانی ببەستێ و پێشتر پێشنیاری سولتانی عوسمانی رەتکردبۆوە کە تابعییەتی عوسمانی و ئاکنجیبوونی لە خاکی ئەو ولاتە بوو.[٢١] بەلام هاتنە سەر تەختی محەممەد عەلی شا، هەلومەرجێکی نوێ بۆ سەرتاسەری ولات بە تایبەتی ئازەربایجان رەخساند کە لە ئەنجامی دوژمنایەتی لایەنگرانی شا یاخود ئیستبداد بوو لەگەل دەستوری خوازان کە لە ناو چوونی دەسکەوتەکانی شۆرش و دووبارە بنیاتنانەوەی سیستمی ئیستبدادی (سەرەڕۆیی) لەگەل خۆی هێنا.

خەلکێکی وەك (عەین ئەلدەولە)، ئەتابەك، (ئیقبال ئەلسەلتەنە) ی ماکۆیی و ئەوانی دیکە کە سەروەری حکوومەتی یاسا و سەرهەلدانی پەرلەمانیان لە بەرژەوەندی و دەسەلاتی سیاسیی خۆیان نەدەزانی، وردە وردە بە فەرمانی شا و هەرکامەیان بە شێوەی تایبەتی خۆی، قۆلی لێ هەلکرد کە ستراکتۆرەکان و بنکەکانی ئازادیخوازان لە نێو بەرن.

ئیقبال ئەلسەلتەنە بۆ لە باربردنی مەشروتەخوازانی ماکۆ و خۆی، داوای یارمەتی لە هۆزی کوردی جەلالی، میلان و حەیدەر کرد کە بە هاریکاری ئەوان توانی شاری ماکو لە (جەمادی یەکەم ١٣٢٥ ك.ق) داگیر و ئامادەی هێرش بۆ سەر ئازادیخوازانی خۆی بوو. کوردانی یەکگرتوو لەگەل سەرداری ماکۆ دەستیانکرد بە تالانکردنی ناوچەکانی دەوروبەری شاری خۆی و یەکەم هێزی نێردراو لە لایەن ئەنجوومەنی ئەو شارە لە مانگی رەجەبی ١٣٢٥ ك.ق تێك شکێندران. کەسرەوی وا دەنوێنێ کە سەرداری ماکۆ لەسەر راسپاردەی ئەتابەك، بەرهەلستکارانی سەرکوت دەکرد.[٢٢] لەم کێشمەکێشە، هۆزی شکاك بەشداربوون و لە نزیکەوە چاودێری بارودۆخیان دەکرد. لە ئەنجامدا دوای زنجیرەیەك پێکەوتنی پەرشوبلاو جەنگی ئەسلی نێوان موجاهیدانی خۆی (دەستووریخوازان) و

سەرداری ماکۆ لە ڕێکەوتی ٤ی شەعبانی ١٣٢٥ك.ق (   ز) لە گوندی سوکمن ئاباد ڕوویدا. نووسەری مێژووی خۆی باس لە بەشداری سمکۆ لە شەڕەکان دەکا و دەنووسێ:

"ئیسماعیل ئاغا لە گەرما و گەرمی شەڕی سوکمن ئاباد بێ ئەوەی کەس ئاگادار بکاتەوە یان لە پێشەوە روخسەت وەربگرێ بەخۆی و سێ سەد سوارە هاتە ناو گۆڕەپانی شەڕ و سوپای ماکۆ و کوردەکان بەهۆی پشتیوانی لێ کردنی ئەو و سوارەکانی، وزەیان هاتەوە بەر و موجاهیدانیان تێك شکاند. سەردار بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم چاکەی ئیسماعیل ئاغا، گوندی قوتوری پێ بەخشی، بەڵام ئیسماعیل ئاغا پاش نیشتەجێبوونی لە قوتور، هەمدیسان دانەدەمەزراو دێیەکانی دەوروبەری خۆی تاڵان دەکرد".[٢٣]

ئەنجوومەنی تەورێز کە لە ناو کاودانەی خۆی پەرێشان بوو، شاندێکی شەش کەسی بۆ ناوچەکە هەنارد تاکو دانوستان و دیالۆگ لە نێوان سەردار و ئازادیخوازان ئەنجام بدات. لە ئاشتی نامەیەك کە لە نێوان هەردوولای شەڕ واژۆکرا، سەرداری ماکۆ بەڵێنی دا کە کوردەکان لە تێکدانی کێڵگەکان و تاڵانی دێهاتەکان بوەستێنێ، هەروەها چونکە دەوڵەت هێزی تەواوی بۆ سەرکوتکردنی سمکۆی لەژێر دەستدانەبوو، بۆیە بەپێی بۆچوونی ئەم شاندە وا بڕیاردرا کە دڵی سمکۆ رابگرن و بە شێوەیەکی فەرمی قوتوری پێ ببەخشن بەو مەرجە کە چیتر خۆی تاڵان نەکا و ئەو کەلوپەلەی کە تاڵانی کردبوو، بۆ خاوەنەکانی بگەڕێنێتەوەو ئیقبال ئەلسەلتەنە راستی بەڵێنی سمکۆ مسۆگەر بکا و بەم چەشنە بوو کە ئیسماعیل لە ئەنجامی سەربزێوی خۆی، حکوومەتی قوتوری وەدەست هێنا.[٢٤]

ئەم رووداوە سەلماندی کە سمکۆ چاك ئاگاداری پێکهاتەی هێزەکانی ناوچەکەیەو هەروەها چاك لە کات و سات ئاگاداربوو و لەگەڵ ئەو لایەنە رێککەوت کە زۆرترین سوودی بۆ ئەو هەبوو، قوتور گرنگترین ناوچەی ستراتیژی بە درێژایی سنووری ئێران و عوسمانی و رووسیە لە ئازەربایجان حسێب دەکرا و لە راستیدا کلیلی ناوچەکە بوو و هەر بۆیەش دوای زاڵبوونی سمکۆ بەسەر بەشێکی ئەم سنوورانە، پێشنیاریان پێ دا کە تابعییەتی عوسمانی قبوڵ بکا.[٢٥] گرنگی ستراتیژی سەربازی قوتور بۆ رووسیە هێندە جیدی و جێی هەڵوەستەکردن بوو کە ئەو وڵاتە لە گشت رێککەوتنامە سیاسییەکانی خۆی لەگەڵ عوسمانی و بەریتانیا لە فەرمانڕەوایی ئێران بەسەر ئەم ناوچەیە بەرگری دەکرد و هەڵبەت لەم نێوەدا بەدوای بەرژەوەندی خۆیدا بوو. هەر لەبەر ئەمەش بوو لە پەیمانی سان ستیفانۆ کە لە (شوباتی ١٨٧٨) بەسترا و هەروەها لە رێککەوتنامەکانی رووسیە و بەریتانیا کە لە

ساڵی (١٨٧٨) لە لەندەن واژۆکرا و بەندی شەستەم لە پەیمانی بەرلین، بە ئاشکراو راشکاوی رادەگەیێنێ کە قوتور بەشێکی خاکی ئێرانە.(٢٦) جەنگی سوکمن ئاباد، سێ دەسکەوتی سەرەکی بۆ سمکۆ هێنایەدی:" یەکەم وەدەست هێنانی قوتور، دووەم فەرمانڕەوایی فەرمی بەسەر ئەم ناوچەیە، سێیەم بەرزبوونەوەی رێز و حورمەتی ئەو لەبەر چاوی رووس و عوسمانی هاوکات لەگەڵ یەکتریدا. عوسمانی لە ساڵی ١٣٢٥ ك.ق ەوە کە سمکۆ بوو بە فەرمانڕەوایی قوتور، بەردەوام هەوڵیدا کە ئەو ناوچەیە وەدەست بێنێ، بەڵام خاڵی گرنگ ئەمە بوو کە کاردانەوەی سەرەك خێڵی شکاك لە ئاست پێشنیاری عوسمانی کە داوای لێدەکرد رەگەزنامەی ئەو وڵاتی وەربگرێ لە بەرانبەر فەرمانڕەوایی هەمیشەیی ئەو بەسەر قوتور و بەخشینی لەدانی باج، بەڵام وەڵامی ئەو هەمیشە نێگەتیڤ بوو لەبەر ئەمە لە ساڵی (١٩١٢) بە چریکۆف کۆنسولی رووسیە لە ورمێی راگەیاند کە "بەردەوام خزمەتکاری راستین و یاسایی ئێران دەمێنێتەوەو حەز ناکا لەسەر ویستی تورکەکان پەیمانێك ببەستێ". (٢٧)

سمکۆ لەم ساڵانەدا قەڵایەکی قایمی لە چەهریق بنیاتنا کە بۆ ماوەیەکی زۆر بارەگەی سەرەکی و دیوەخانی ئەو بوو. لە هەڵسەنگاندنی رەفتاری سمکۆ و گوێ پێنەدان بە بانگهێشتەکانی عوسمانی لەم ساڵانەدا، دەگەینە خاڵێکی بنەڕەتی کە یارمەتی ئێمە دەدا لە ناسینی ئامانج و ناوەڕۆکی یاخیگەرییەکانی ئەو. سمکۆ لە ناوچەی خۆیدا خوازیاری دەسەڵات بوو و هەرگیز داواکاری دابڕاندنی کوردستان و وەدەست هێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد نەبوو، ئەو هەرگیز نکۆڵی لە تابیعییەتی دەوڵەتی ئێران نەکرد و هەمیشە خۆی بە سنووورداری ئێران دەزانی. ئێستا ئەم پرسیارە دێتە پێش کە ئەگەر ئاوایە، بۆچی سمکۆ پاش جەنگی گەورە هەوڵیدا ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆی بەرفرەتر بکا و چۆن کوشتار و تاڵانی خەڵکی ئازەربایجانی دەکرد بە کورد و ئازەرییەوە؟ وەڵام ئەمەیە کە بارودۆخی ئازەربایجان دوای جەنگی یەکەم بە تەواوەتی لەگەڵ ئەو کاتەی کە سمکۆ پێی لە ناو سیاسەت نا، جیابوو و هەوڵەکانی جیاخوازانەی مەسیحییەکان بۆ پێکهێنانی وڵاتێکی ئاسووری لە رۆژئاوای ئازەربایجان، نەبوونی ئامادەیی دەوڵەتی ناوەند لەو ناوچەیە، بزاڤی خیابانی کە لەسەر بنەمای ناوچەگەری وەستابوو، زێدەکردنی بزووتنەوەکانی دوورکەوتنەوە لە ناوەند (لامەرکەزییەت) بەهۆی بەریتانیا لە ئێران، زێدەخوازی قەڵەمڕەو لە لایەن تورکەکان و لە هەمووی گرنگتر پڕۆپاگەندەی رێکخراو و کۆمەڵە نەتەوەییەکانی کورد لە تورکیە و عێراق، گشتی هۆکارگەلێك بوون کە سەرەك خێڵی شکاکی هان دەدا کە ئەویش بیر لە دابڕاندنی کوردستان لە ئێران بکاتەوە، بەڵام ئەو هیچ کات ئەم مەسەلەیەی بە هەند هەڵنەگرت چ بە دروشم چ لە پراکتیکدا و تەنیا گۆڕانکارییەکی

کەمی لە خواستی یەکەمی خۆیدا کە ئەویش بریتی بوو لە بەرفرەکردنی چوارچێوەی جوگرافیایی ئەم ئۆتۆتۆمییە بۆ ناوچەکانی تری ئازەربایجان. خاڵی سەیر لێرەدایە کە ئەو پتر پێی خۆش بوو بەرەو رۆژهەڵاتی ئازەربایجان و ناوجەرگەی ناوچە ئازەرییەکان پێشرەوی بکا و هیچ پاڵنەرێك نەبوو بۆ ئەوەی بەسەر ناوچە کوردییەکانی باشوردا زاڵ بێ.

# سمكۆ و جەنگی جیهانی یەکەم

هاوکات لەگەڵ دەسپێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم، کوردەکانی ئێرانیش لەژێر کاریگەری پاڵنەری ئایینی و لە سۆنگەی وەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسیی و سوپایی پتر بە لایەنگری عوسمانی هاتنە ناو شەڕ. سمکۆش بۆ بەشداری لەم رووداوە گرنگە کۆمەڵێك هۆکاری هەبوو، یەکەم: ئەو ئیتر نەیدەتوانی وەك رابردوو لە رکابەرێتی رووسیە و عوسمانی بۆ چاودێریان بەسەر ناوچەی قوتور، کەڵك وەربگرێ و لەبەر شەڕ ناچاربوو یەك لەوان هەڵبژێری و پاڵ بە ئەوی تر وەنێ. دووەم، پاڵنەری ئایینی خەڵکی شکاك: ئەوی ناچار دەکرد کە هاوکاری تورکەکان بکا. بەڵام دەبێ بزاندرێ کە سەرۆکی شکاکەکان ملکەچی رایەکانی یەکیەتی ئیسلامی عوسمانییەکان نەببوو. سێیەم ئەوە بوو کە سمکۆ بەدوای چەك کۆکردنەوە بوو بۆ ئەوەی ئاواتە دوور و نزیکەکانی خۆی لە ئایندە بهێنێتەدی و هەلومەرجی شەڕ ئەم بوارەی بۆ دەرەخساند و ئەویش وەك گشت سەرەك هۆزەکانی ئەوسا، بێ سەروبەری و پشێوی وەك دیاردەیەکی شەڕ، دەرفەتێکی گونجاوی دەڕەخساند بۆ ئەوەی سامانی خەڵك تاڵان بکەن و تەنانەت دەست بەسەر زەوییە کشتوکاڵییەکانی خەڵکی مەسیحی رۆژئاوای ئازەربایجان دابگرێ و بیری لە دەرکردنیشیان دەکردەوە لەو ویلایەتە. ساڵانی دوای شەڕو ئەو کاتەی سمکۆ لەو پەڕی دەسەڵاتدارێتیدابوو، ئەو کوردانەی لەژێر فەرمانی ئەودابوون زۆربەی ئەرمەنی و نەستورییەکانیان لە ناوچەکانی تەرگەوەڕ مەرگەوەڕ و سەڵماس دەردەکرد و دەستی بەسەر زەوییەکانیان دادەگرت. ئەوەی لە سەرەتای شەڕ، سمکۆی واڵێکرد هاوکاری عوسمانییەکان بکا، پێشڕەوی خێرای ئەوان و داگیرکاری تەورێز و ورمێ بە دەستی سوپای تورك بوو. کەسرەوی و برونەیسن ئاماژە بەم خاڵە دەکەن کە کوردەکان تەنانەت بەر لە هاتنی سوپای تورك، پەلاماری هێزی رووسیان داوە کە لە خاکی ئێران دایان کوتابوو و بۆ تاڵانکردنی سەروەت و دارایی و ئاسوور و ئەرمەنی دراوسێیان.[1] هێرشیان کردە سەر لە (کانوونی دووەمی ساڵی (١٩١٥) هاوکات لەگەڵ پاشەکشەی هێزی رووس لە سەلماس و قوتور، سمکۆ بە ئاشکرا لای تورکەکانی گرت و نزیك بە هەزار کەسی لە مەسیحییەکان کوشت. لازاریف ئاماژە بەمە دەکا کە هێرشی سمکۆ بۆ سەر سوپای رووس لە غەفڵەتی ئەنجامدرا و چاوەڕوان نەدەکرا، هەروەها سەرەك خێڵی شکاك سەرەڕای پێوەندی لەگەڵ کاربەدەستانی رووس و ناردنی نامە بۆ کۆنسولی رووس لە خۆی، بەنهێنی لەگەڵ تورك پێوەندی سازکردبوو، بۆیە دوای داگیرکردنی دووبارەی شاری خۆی

له مانگی مارسی ١٩١٥ له لایەن سالّداتەکانی رووس، سمکۆ دەگیرێ و رەوانەی تفلیس دەکرێ.[٢] نووسەری مێژووی خۆی له بارەی هۆکاری گرتنی سمکۆ له لایەن رووسەکانەوە ئاوا دەنووسێ:

" رووسەکان دوای هاتنیان بۆ ناو خاکی ئێران، له هەموو شوێنێك پشتیوانیان دەکرد له موستەبیدان و لایەنگرانی حکوومەتی ئیستیبدادی، ئیسماعیل ئاغاش یەکێ لەوانە بوو کە بە ئاشکرا لە سەرکوتکردنی دەستووریخوازان بەشداربوو، لەم روانگەوە ببووە بابەتی بەرچاوی رووسەکان. بەلّام بە شێوەیەکی گشتی ئیسماعیل ئاغا پیاوێکی یاخی و ئازاد بوو کە بە ئاسانی نەدەچووە ژێر بار و فەرمانی رووسەکان، بۆیە رووسەکان بە پێویستیان زانی کە گوێ راکێشانێکی دەوێ و بە هەر شێوەیەك بوو گرتیان و بردیان بۆ تفلیس و پاش ماوەیەك بەرەلّایان کرد و بە بەلّێن و هەرەشە و دەم چەورکردن بۆ لای خۆیان راکێشا و ئیسماعیل ئاغا گفتی پێ دان کە دژایەتیان نەکا و دوای گەرانەوەی لە تفلیس، لە خۆی نیشتەجێبوو.[٣] ئاغاسی لە لێکۆلّینەوەی خۆی ئاماژە بە هاوکاری سمکۆ لەگەلّ تورك ناکا، ئەو کاتەی کە بەرەو ئازەربایجان هاتن یاخود لە کوشتاری مەسیحییەکانی سەلماسدا، بەلّام پێیوایە کە لە پێشەوە پێوەندی لەگەلّ رووسەکان هەبووە. بێجگە لە سمکۆ سەرکردە کوردەکانی دەوروبەری خۆی، سەلماس و ماکۆ و (عەبدولرەزاق بەدرخان)یش کە لە کەسایەتییە چوست و چالاکەکانی عوسمانی بوون، رووسەکان دەیانگرن و بۆ تفلیس دەیاننێرن. ئەم کارەی رووسەکان بۆ پێکانی دوو ئامانج بوو: دەستەمۆکردن و خاوکردنەوەی دوژمنایەتی هۆزەکانی کورد لە ئاست رووسیە و پێکهێنانی بەرەیەکی کوردی لە دژی عوسمانی کە بریاروابوو سەرکردایەتی سیاسی ئەو بەرەیە لە ئەستۆی (عەبدولرەزاق بەدرخان) و رابەرایەتی سوپایی ئەو لە ئەستۆی سمکۆ دابێ، بەلّام رووسەکان لەبەر کۆمەلّێك هۆی جۆر بەجۆر وازیان لەم پلانە هێنا.

بێگومان ئازادی سمکۆ لە سەرەتای سالّی (١٩١٦) و گەرانەوەی بۆ سەلماس لە ئەنجامی ئەو زەمانەتە بوو کە ئەو بە فەرمانداەی هێزی رووسیە لە قەفقاز دای بوو. مەهدی ئاغاسی نووسەری مێژووی خۆی بە راشکاوی دەلّێ سمکۆ دوای گەرانەوەی لە رووسیە، بوو بە لایەنگری رووسیە و گفتیدا کە دژایەتیان نەکا.[٤]

کەمێك دوای هاتنی سەرەك هۆزی شکاك جەنەرالّی رووس چرنوزوبۆف داوای لێکرد کە چەکی شەرکەرانی ژێر فەرمانی خۆی بداتە دەست ئەو، بەلّام سمکۆ هەولّی دا پەنا بۆ ناو خاکی

عوسمانی بەرێ کە ئەمە لە زیانی رووسەکان بوو، بۆیە بەهەر شێوەیەك بوو لەم کارە دووریان خستەوە. سمکۆ رایگەیاند کە خوازیاری فەرمانڕەوایی ناوچەی سۆمای و برادۆستە و ئەگەر دەوڵەتی رووسیە بەپێی ئەو دەسترۆیییە کە لە ئێران هەیەتی بتوانێ قەناعەت بە ئێران بکا کە ئەم جیاوگەی پێ ببەخشن، ئەوا ملکەچی سیاسەتی رووس دەبێ. بەپێی نووسینی لازاریف، داوای سمکۆ لە لایەن گرسائۆف کۆنسولی رووسیە لە خۆی و نیکتین کۆنسولی رووسیە لە ورمێ قبووڵ نەکرا، چونکە هەردوو دیپلۆمات ئاگاداربوون کە تا چ رادەیەکی زۆر خەڵکی سۆمای و برادۆست رقیان لە سمکۆیە.(٥) بەڵام باڵیۆزخانەی رووسیە لە تاران سوربوو لەسەر ئەوەی کە هەندێ جیاوك بدرێتە سمکۆ و لەم بارەیەوە گوشاری خستە سەر ئەحمەد شاو دەوڵەتی ئێران و لە (ئەیلولی ١٩١٦) ئەحمەد شا فەرمانڕەوایی سۆمای و برادۆستی بە شێوەیەکی فەرمی دا بە سمکۆ.(٦) بەم شێوەیە لە ناوەڕاستی جەنگی گەورە لە قازانجی یەکێ لە دوو لایەنی شەڕ، وازی لە بزوتی سوپای هێناو پاش ئەوەی هەندێك ناوچەی تری خستە سەر قەڵەمڕەوی خۆی، چاوەڕوانی داهاتوو بوو.

سمکۆ بە درێژایی شەڕ پتر بەدوای هەل دەگەڕا لە بەرژەوەندی خۆی، بەڵام خەڵکی مەهاباد بە سەرکردایەتی میرزا فەتاحی قازی، قارەمانانە بەرگریان دەکرد لە بەرانبەر پەلاماردەرانی رووس، ئەگەر بەراورد بکەین، دەبینین کە سەرۆکی شکاك هیچ پەرۆشی چارەنووسی کوردان نەبوو و لەگەڵ سوپایەك هاوکاری دەکرد کە هەشت هەزار کەس خەڵکی مەهابادی قەتلوعام کردبوو و لە باتی یارمەتیدانی خەڵکی و بەرگریکردن لێیان، پتر بیری لە پاراستنی هەڵکەوتی خۆی دەکردەوە! روانینێکی خێرا بە بەشداری هۆزەکانی موکری لە شەڕ لەگەڵ رووسیە، راستگۆیی و دڵسۆزی ئەوان نیشان دەدا و سمکۆش رێگەی خۆی هەم لە هۆزەکان و هەم لە شارنشینانی کورد جیاکردبۆوە.(٧) دەرەبەگی شکاك بە درێژایی شەڕ، باڵانسی نێوان رووسیە و عوسمانی لە ناوچەکەی خۆی پاراستبوو و لە هەموو دەرفەتێك هەڵدەقۆزیەوەو بە ئاشکرایی هەوڵی دەدا کە هەموو دەرگاکان لەسەر خۆی بەکراوەیی بەجێ بێڵێ و پاش دەرچوونی رووسەکان لە ئێران توانی چەك و تفاقێکی باش لە ساڵداتەکانی کوردستان بکڕێ و بێجگە لەمە یەکەکانی رووس لە باکووری کوردستانیش، تفاقی خۆیان لەوانە، ژمارەیەك تۆپی گەڕۆکیان پێ فرۆشت.(٨) هەروەها هێزە نیمچە چەکدارییەکانی کوردی عێراق و تورکیە لە خزمەت هێزەکانی عوسمانی دوای کۆتایی شەڕ، چەکەکانی خۆیان لەژێر دەستی سمکۆ دانا۔ کارێك کە بێگومان بێ پرس و رەزامەندی فەرماندەی تورکەکان ئەنجام نەدراوە.

بەهەرحاڵ سمکۆ لە ئەنجامی ڕووداوەکانی دەرهاویشتەی جەنگ، بوو بە دەسەڵاتێکی چەکداری سەرەکی لە ڕۆژئاوای ئازەربایجان و لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە لە نێو زریانی جەنگ بەهێزتر لە پێشووش سەری وەدەرنا:

١- زۆر بە جیدی خۆی دەپاراست لەوەی دەستە و یەخەی لایەنەکانی شەڕ نەبێ، واتە ڕووسیە یان عوسمانی.

٢- بەرزبوونەوەی ئاستی دارایی هۆزی شکاك لە ئەنجامی تاڵانی مەسیحییەکان، ئازەرییەکان و کوردەکانی نیشتەجێبوو و دەستی بەسەر داهاتی ناوچەکانی سۆمای و برادۆست داگرت ئەو کاتەی کە لە سەرەتای شەڕ بوو بە فەرمانڕەوای ئەوێ.

٣- لە کۆتایی شەڕدا، چەکێکی جۆراوجۆری زۆری لە ڕووس و عوسمانی بەدەستکەوت، بە سوك و قورسەوە.

٤- پشتیوانی نەکردنی ئەو لە خەڵکی شار و گوند، وای لێکرد کە هێزەکانی وەك خۆی بمێنێتەوە.

٥- ململانێی لەگەڵ مەسیحییەکان و دەرپەڕاندنیان لە ناوچەی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا کە لە قازانجی ئەو کۆتایی هات.

٦- لە کۆتایی شەڕدا، ژمارەیەك لە ئەفسەرانی تورك لە سوپای عوسمانی هاتنە ریزی سوپای سمکۆ و خزمەتێکی شایانیان پێشکەش کرد.

٧- زێدەبوونی دوو ناوچەی سۆمای و برادۆست بەسەر قەڵەمڕەوەکەی بە شێوەیەکی یاسایی کە بە یارمەتی ڕووسەکان ئەم کارە کرا.

# جموجۆڵی مەسیحییە چەکدارەکان و
# کاریگەری لەسەر سمکۆ و دەوڵەتانی رووسیە

بەریتانیا و عوسمانی، دوای دەستپێکردنی جەنگی جیهانی، بێ ئەوەی گوێ بدەنە بێ لایەنی ئێران، هەرکامە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی خۆی، هێزەکانی هێنایە ناو وڵات. رووسەکان بەر لە جەنگ، چەندین یەکەی چەکداریان لە ئازەربایجان هەبوو و ئەم ویلایەتە بە شێوەیەکی پراکتیکی لەژێر دەستیان بوو.

عوسمانییەکان گوایە بە بیانوی ئەوەی کە رووسیەی قەیسەری بنەمای بێلایەنی ئێرانی پێشێل کردووە بە پێویستی نەزانی کە ئەو بێ لایەنی ئێران لەبەر چاو بگرێ و هێزەکانی خۆی رەوانەی ئازەربایجان کرد.

پاشان لە سەرەتای جەنگ، هێزەکانی رووس، ناوچەکانی رۆژهەڵاتی عوسمانیان بۆ ماوەیەکی کورت داگیرکرد و هەوڵیان دا لە ئەرمەنی و نەستوری ناوچەکە بۆ مەبەستە سوپاییەکەی خۆیان سوود وەربگرن. سیسیل جی ئەدمۆندز، هۆکاری کۆچی مەسیحیانی نەستوری بۆ ئێران بەم شێوەیە شی دەکاتەوە: " ئەم خەڵکە چیانشین و شەڕکەرە لە بەهاری (١٩١٦) بە هاندانی هێزەکانی رووس کە لەم ناوچەیە (لە رۆژهەڵاتی عوسمانی) پەلاماری تورکەکانی دابوو، دژی تورکەکان راپەڕین و کاتێ رووسەکان پاشەکشەیان کرد، تورکەکان تۆڵەی خۆیان لەم خەڵکە دەکردەوەو بۆیە هیچ رێگایەکی تریان لە بەردەمدا نەبوو بێجگە لە کۆچ کردنیان بۆ ئێران. ئەوان لەژێر فەرماندەیی رووسەکان درێژەیان بەشەڕ دا... ".[٩]

ئەدمۆندز ژمارەی نەستورییەکانی پەنابەر بە (٣٥٠٠٠) کەس و کەسرەوی بە ٥٠٠٠٠ کەس دادەنێ.[١٠] جگە لە مەسیحییەکانی کۆچەری عوسمانی، کەمینەیەکی ئاسووری و ئەرمەنیش لە چەندین سەدە پێش لە بەشی رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ و شاری ورمێ نیشتەجێبوون. ئەرفەع لە بارەی ژمارەی دانیشتووان و بەربڵاوی ئاسورییەکانی ئێران وا دەنووسێ: "لە رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ دوو ناوچە هەیە کە دانیشتوانی تێکەڵیەکە لە ئازەری زمانی شیعە و ئاسووری، کەسێ چارەگی موسڵمان و یەك چارەگی مەسیحین. ناوچەکانی باکووری سەلماس کە پتر لە شەست گوندەو ناوچەکانی باشووری ورمێ کە (٣٠٠) گوندە، لە دەشتی نێوان دەریاچە و کێوەکانی رۆژئاوا کە بارەگەی کوردانە، هەڵکەوتووە.

ناوچەکانی رۆخ ورمێ بەرەو باکوور، رۆژئاوا و باشوور، جێ نشینگەی کوردانە و بەم جۆرە زۆربەی شیعە ئازەرییەکان و کەمینەیەك لە ئاسوورییەکان لە نێو کوردانن.[11] هەڵبەت دەبێ ئەوە لەبەر چاو بگیرێ کە دانیشتوانی ئاسووری ئێران نزیك بە (٤٠٠٠٠) کەس بوون کە لەگەڵ نەستوورییە پەنابەرەکان کە بە جیلو یا جلویە ناوبانگن، هەستی هاوەدردیان دەکرد. رووسەکان لە ورمێ دەستیان کرد بەوەی کە لە ئاسوورییەکان، هێزی چەکداری پێك بهێنن (لە گشت سەرچاوە فارسی و هەندێ سەرچاوەی رۆژئاوا، بە نەستوورییەکان یا جیلوەکان، ئاسووری دەگوترێ) و لەگەڵ مارشیمۆن رابەری ئایینییەکەیان بەینیان خۆشبوو، لازاریف لە بارەی چۆنیەتی ئەم پێوەندییانە دەنووسێ:" حکوومەتی رووسیە، ساڵانە بڕی پێنج سەد روبڵیان دەدایە مارشیمۆن و ئەو دوو لەشکری لە پەیڕەوانی ئاسووری خۆی پێك هێنا (کە لە ئەنجامدا بوونە لەشکری پیادە) و بەم شێوەیە پشتگیریان لێ دەکردن، بەڵام ئەمانە کەوتنە بەر ئەشکەنجە و ئازاری سەرکردە کوردەکان بە تایبەتی سمکۆ".[12]

مەسیحییەکان زۆر بە جیدی بەتەمای جیابوونەوە بوون لە ئازەربایجانی رۆژئاوا بەوەی کە دەوڵەتێکی مەسیحی پێك بهێنن، چونکە بە ئاشکرا باسیان لە نیاز و ئاواتی خۆیان دەکرد و لە رۆژنامە و بڵاوکراوەکانیان لە بارەی ئەم ئامانجانە دەیاننووسی، بێگومان کورد و ئازەریان لە ناوچەکە هەراسان کرد. دەوڵەتە رۆژئاواییەکانی تر وەك بەریتانیا و فەڕەنسەش لە وروژاندنی مەسیحییەکان رۆڵیان دەبینی و بێجگە لە پیاوانی ئەوان کە لە ناو خەڵکەکە کاریان دەکرد، مژدەبەخشانی ئایینی ئەمریکی و ئەورووپیش لەم پیلانە پشکداربوون. ئەم مژدەبەخشانە لە سەردەمی سەفەوییەکانەوە، بەردەوام دەهاتنە ناو مەسیحییەکان تاکو بیانکەن بە پروتستانت.[13]

ئاسوورییەکان هەر لە ساڵی ١٩١٦ یەکیەتییەکی رامیاریان پێك هێنا کە بە یەکیەتی ئازاد بەناوبانگەو "هێزی چەکدار"بە بازوی سیاسیی ئەو حسێب دەکرا. (محەممەد تەمدن) بە درێژی باس لە ئامانجە بیست ماددەیی هێزی چەکدار دەکا کە بریتییە لە دامەزراندنی سیستمێکی کۆماری ئاسووری، پەرلەمان، دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئاسووری، رێکخستنی سیستمی باج، هەوڵ دان بۆ زیندووکردنەوەی زمانی سریانی و ... لە بارەی بەندی یەکەمی پەیڕەو و پرۆگرامی ئەم سوپا ئاسوورییە دەنووسێ: " هۆکاری سەرەکی لە دروستکردنی ئەم یەکیەتییە ئازادە، ئەوە بوو کە گەلی مەسیحی، بەسەربەخۆیی ژیانی خۆیان بەسەر بەرن، لە کوێ؟

لە هەندێ شوێنی دیاریکراوی خوارەوە:

ورمێ، موسڵ، ترك عابدین، نسیبین، جەزیرە (جەزیرەی ئیبن عومەر)، جولاملك (چۆلە مێرگ)، بەم مەرجە کە لەگەڵ رووسیەی گەورەی ئازادیخواز یەکگرن (واتە لە کاروباری بازرگانی و سوپای یەکگرن).(١٤)

لەگەڵ دەرچوونی رووسەکان، ئاسوورییەکان هەستیان کرد دەتوانن بە ئازادی کار بکەن و بەهۆی ئەم چەك و تفاقەی کە لە هێزەکانی رووسی کڕیبوویان، بە تەواوەتی بەسەر ورمێ و دەوروبەری زاڵ بوون. ئاسوورییەکان هیچ لە دەوڵەتی ئێران نەدەترسان، چونکە دەیانزانی چەند بێ دەسەڵاتە بۆیە دەستیان بەسەر سەروەتی موسڵمانانی کورد و تورك داگرت و قەتلوعامی ترسناکیان لێ کردن لە شاری ورمێ کە رەهەندێکی بەرفراوانی هەبوو. سمکۆ لە بارەگەی خۆی لە قوتور و چەهریق بینەری ئەم رووداوانە بوو و بە بۆچوونی ئاسوورییەکان تەنیا هێزی چەکداری ناوچەکە هەر ئان و ساتێك لەوانە بوو کە لەگەڵ عوسمانییەکان یەکبگرن، هۆزی شکاك لەژێر فەرمانی سمکۆ بوو. لەم رووەوە مارشیمۆن رابەری ئاسورییەکان خوازیاری یەکیەتییەکی رامیاری و سەربازی لەگەڵ سمکۆ بوو. لە رێکەوتی ٢٥ی رێبەندانی ١٢٩٦ ك.ش ١٩١٨ز مارشیمۆن بە (١٤٠) سوارەوە بۆ دیداری سەرەك خێڵی شکاك چووە کۆنەشار لە سەلماس، کەسرەوی لە زمانی سمکۆوە دەڵێ: " مارشیمۆن پێی گوتبوو: ئەو خاکە کە ئێستا پێی دەڵێن کوردستان نیشتمانی هەموومان بووە، بەڵام جیاوازی ئایین، ئێمەی وا لێك بڵاو و پەرتەوازە کردووە، ئێستا دەبێ هەردوولا هاودەست بین و ئەم وڵاتە بخەینە ژێر دەستمان و بە یەکەوە بژین و هەروەها گوتی : ئێمە سوپامان ئامادەکردووە، بەڵام هێزی سوارەمان نییە، ئەگەر ئێوە لەگەڵ ئێمە بن، چونکە ئێوە سوارەتان زۆرە ئەوا بەیەکەوە دەچین و تەورێز دەگرین".(١٥)

ئاغاسیش بەپشتبەستن بە یادداشتەکانی مەلا محەممەد جەعفەر دەنووسێ کە مارشیمۆن خوازیاری یەکگرتن لەگەڵ کوردان بوو تا لەم رێگەیەوە، نیشتمانی هاوبەشی کورد و مەسیحییەکان واتە کوردستان لە چەنگ داگیرکەران یان ئێرانییەکان رزگار بێ.(١٦) ئەمە یەکەم جار بوو کە ئێرانییان وەك داگیرکەرانی کوردستان ناو دەهێنران، وڵاتێك کە هەمیشە بەشێك لە ئێران بووە، بەڵکو ئێرانییەکان ناوەکەشیان لێناوە واتە لە راستیدا نووسەرانی خوراسانی بوون کە لە سەردەمی سوڵتان سەنجەری سەلجوقی بەشی رۆژهەڵاتی ویلایەتی جبال یان ناولێنا کوردستان و لە (جبال) یان جیاکردەوەو کردیان بە ویلایەتێکی جیاواز و سوڵتان برازای خۆی بەناوی سلێمان کرد بە والی ئەوێ. لە دواییدا، رووسەکان و ئەورووپیەکانی تر و دوابەدوای ئەوان ناسیونالیستانی کوردیش لە پڕۆپاگەندە و کتێبەکانی خۆیان، بەردەوام ئێرانییەکانیان وەك داگیرکارانی کوردستان ناو دەهێنا، گوایە کوردستان وڵاتێکی جوداو یەکەیەکی سیاسیی سەربەخۆ بووە کە ئێران بە زەبری چەك دەسەڵاتی

بەسەر داگرتووە، لە حالەتێکدا کە یەکەم دەوڵەتی ئێرانی ناوچەکە، ماددەکان (لە راستیدا کوردەکان) دایانمەزراند و دەوڵەتی هەخامەنەشی لەم دەوڵەتە پەیدابوو.

بەهەرحاڵ، رابەری ئاسوورییەکان و گشت سەد و چل سوارەکەی کە لەگەڵی بوون بەدەستی سمکۆ کوژران کە کاردانەوەیەکی توند و ترسناکی ئاسوورییەکانی ورمێی بەدوادا هات، بەجۆرێك کە هەزاران کەس لە خەڵکی ورمێ بە دەستی مەسیحییەکان قەتلوعام کران. کەسرەوی ئەم کارەی سمکۆی بە "کارێکی نەفامانە" لە قەڵەم داوە کە بووە هۆی کوژرانی دە هەزار کەسی دانیشتووی بێ تاوانی ورمێ، بەڵام نووسەری مێژووی خۆی لەو بڕوایەدایە کە کوشتنی مارشیمۆن بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکی تەورێز و ورمێ لە پلانەکانی ناپەسندی مەسیحییەکان بۆ جیابوونەوە لە ئازەربایجان ئاگادار ببنەوە.(١٧)

وا پێدەچێ کە نووسەری مێژووی (خۆی) راست بکا، چونکە سمکۆ بەم کارەی هەم پلان داڕێژ و خاوەن بیرۆکەی جوداخوازی مەسیحییەکانی ورمێی لە نێو برد و هەم نیشانی دا کە خەڵکی ئازەربایجان لە تورك و کورد سەرەڕای ناتەبایی ناوخۆیی خۆیان رەزامەند نین لەسەر جودابوونەوەی ئەم ویلایەتە و لە بەرانبەر جوداخوازانی مەسیحی خۆڕاگری دەکەن.

ئاسوورییەکان دوای سەرکوتکردنی خەڵکی ورمێ و پەلاماری چەهریقیان دا و لە شەڕێکی سەختدا، سمکۆیان تێك شکاند و هەندێ لە بنەماڵەی ئەویان کوشت و بڕێکی تریش بەدیل گیران.

ورده ورده لە کۆتـــایی ١٢٦٩ ك.ش (١٨٩٠ ز) تاکۆتـــایی بەهـــاری ساڵی ١٢٩٧ ك.ش (١٩١٨ ز) لە سۆنگەی کاڵبوونەوەی رۆڵی رووسیە لە کاروباری ئێراندا لە ئەنجامی شۆڕشی نێوخۆیی ئەو وڵاتە، مەسیحیانی جوداخواز پشتیان بە بەریتانیا بەست و رابەرانی ئاسووری پێوەندییەکی پتەویان لەگەڵ فەرماندەی سوپای بەریتانیا لە ئێران ساز کرد. پاش هاتنی دووبارەی هێزە عوسمانییەکان بۆ رۆژئاوای ئازەربایجان لە ناوەڕاستی مانگی حوزەیران ١٢٩٧ ك.ش (١٩١٨ز) زنجیرە شەڕێکی خوێناوی لە نێوان مەسیحیەکان و تورکەکان روویدا کە بووە هۆی شکستی مەسیحییەکان. سمکۆ لەم ئان و ساتەدا چالاك ببوو و بە مەبەستی یارمەتی کوردی (خۆی) کە لە لایەن هێزەکانی ئەرمەنی کە لە وان هاتبوون، و هەڕەشەیان لێدەکردن، خۆی و سوپاکەی لە کەمین دانیشتن لە دۆڵی قوتوور و حەوت هەزار کەسیان لێ کوشتن و خەڵکی خۆی بە دەرکردنی بڵاوکراوەیەك رێزیان لێ نا.(١٨)

بەم شێوەیە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئاسوورییەکان لە ورمێ کۆتایی پێهات و پاشماوەی " هێزی چەکدار" بە فەرماندەیی ئاغا پوترس لە تەك خەڵکی ئاسایی مەسیحی لە سەرەتای هاوینی ١٢٩٧

ك.ش ( ١٩١٨ ز) له بەرانبەر هێزی تورك رایان كرد و له رێگەی ساین قەلآت هاتنه ناو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەكان له بیجار و لەوێوە بۆ عێراق گواسترانەوە.

به راستی كاریگەری بیرۆكەو بۆچوونی جوداخوازی مەسیحییەكان و كاركردی سەربەخۆیانەی ئەوان به درێژایی فەرمانڕەوایی ئەوان له ورمێ، لەسەر مێشكی كورد چی بووبێ؟

ئایا ئاشكراكردنی خواستی مارشیمۆن بۆ یەكگرتنی كورد و مەسیحی و داوا كردنی له سمكۆ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێكی سەربەخۆ له ئازەربایجان نەبووە هۆی ئەوەی كه وا له ئاغای كورد بكا به تاقی تەنیا ئەو پڕۆژەیه به ئەنجام بگەیەنێ؟ ئایا لاوازی و سستی دەوڵەتی ناوەند و پشتگیری عوسمانی و بەریتانیا لەم پلانه نەبووە هۆی ئەوەی كه سمكۆ بوروژێنێ؟

محەممەد تەمەدون له بارەی كاریگەری دروشمی سەربەخۆخوازانەی ئاسوورییەكان له نێو كورددا دەنووسێ كه مەسیحییەكان و پەنابەرانی جیلو " بۆ یەك جار بوون به ئامرازی دەستی بیانی و بڕیاریاندا كه سەربەخۆیی بۆ ورمێ وەربگرن و سەرەتای پێك هێنانی ئەنجوومەنی شووڕایان لەم شاره ئامادە كردو لیژنەی سەرۆكایەتیان بۆ دانا و هەر ئەم كارانه بووە هۆی ئەوەی كه خەڵكێكی وەك ئیسماعیل ئاغا پاشان بیر له خودموختاری (ئوتۆنۆمی) بكاتەوە..."[١٩]

ئاسوورییەكان تەنانەت دوای دەرچوونیان له ئێرانیش ئاواتە دوورودرێژەكانی خۆیان لەبیر نەكرد و ئاغا پوترس به پشتیوانی ئینگلیزەكان و وەزیری دەرەوەی ئەو وڵاته لۆرد كرزن له كۆنفرانسی لوزان له كانوونی دووەمی ١٩٢٣ داوای له دەوڵەته براوەكانی شەڕ كرد كه نیشتیمانێك بۆ ئاسوورییەكان له نێوان موسڵ، كوردستانی عوسمانی و كوردستانی ئێران تا سنووری ورمێ لەبەرچاو بگیرێ. ئەم هەوڵه له لایەن دەوڵەتانی ئێران و توركیه به توندی بەرپەرچ دراوە.[٢٠] بەڵام وەڵامی نەرێی سمكۆ بۆ پێشنیاری ئاسوورییەكان بۆ جووداكردنەوەی ئازەربایجان و كوردستان و پێكهێنانی وڵاتێكی سەربەخۆ له چییەوە هاتبوو؟

به دڵنیاییەوە، ئاغای كورد نەك له سۆنگەی ناسیونالیزمی كوردی، بەڵكو لەبەر ئەو قین و دوژمنكارییه قووڵەی له نێوان كورد و مەسیحی لەمێژ بوو هەبوو، ئامادە نەبوو لەگەڵ ئەم كۆنه دوژمنانەی كورد هاوكاری بكا و بڕوایان پێ بكا، جگه لەمه بەپێی قسەی سمكۆ، ئەو بەو كارەی خزمەتی ئێران و یەكپارچەیی ئەوی كردووە و بەپێی نووسراوی كەسرەوی" هەمیشه ئەم چیرۆكەی دەگێڕایەوە و به شاكاری خۆی دەزانی و گلەیی دەكرد كه ئێرانییەكان ڕێزیان لەو كارەی ئەو نەگرتووە".[٢١]

سمكۆ کاتێ ئەم پلانەی مەسیحیانی بۆ جوداکردنەوەی ئازەربایجان رەتکردەوە دەوڵەتی ئێران هیچ جۆرە هێزێکی سەربازی و دەسەڵاتی سیاسی بۆ پێشگرتن لەم پیلانە لەبەر دەست دانەبوو. ئەم رووداوە ئەوە دەسەلمێنێ کە تا ئەو کاتی، سمكۆ هێشتا لە ئاست مانەوەی یەکپارچەیی ئێران وەك خۆی وەفدار بووە، بەڵام بە جۆرێك لە جۆرەکان کەوتبووە ژێرکاریگەری دروشمە جوداخوازییەکەی ئەوان. پاشان (ئاغا بوزرگ خان ابراهیمی)، کە ماوەیەك بوو بە حاکمی مەهاباد و جارێکیان بوو بە نوێنەری پەرلەمان، لە پەرلەماندا رێزی لەم کارەی سمكۆ ناو و ئەمەی لە قازانجی ئێران زانی و لە راستیدا کورد دوای شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵا بینەری بێ دەسەڵاتی رۆژ بە رۆژ زیاتری دەوڵەتی ئێران لە ئازەربایجان بوون و هاوتەریب هێزو دەسەڵاتی خۆیان لە زیاد بووندا بوو، هەنووکە ئامادەیی دەستەیەکی نوێ کە لەو سەری هاتبوون، قبوڵ نەدەکرد. بە تایبەتی هێزی جەنگی و سەروەتی سیاسی ئەندامانی ئەم دەستەیە زۆر بەرزتر بوو لە هێزی کۆمەڵگە و دەوڵەتی ئێران. لەم رووەوە زێدەڕەوییەکانی مەسیحیان لەگەڵ دەسەڵاتی زیاتر وەرگرتنی سەرەك هۆزە کوردییەکان بە تایبەتی سمكۆ، تووشی پێکدادان بوو. کەواتە دەگەینە ئەم ئەنجامە کە کوشتنی مارشیمۆن بە ئاگاییەگی تەواو ئەنجام دراوە و نە بەو جۆرە کە( د. زاهدی) باسی لێوە دەکا کە گوایە لە تەماعی ئەنگوستیلە پر نرخەکەی دا ئەو رووداوە روویداوە.[٢٢]
دوای سەرکەوتنی سمكۆ بەسەر هێزەکانی مەسیحی لە قوتور، دەسەڵاتی ئەو دووبارە زیادی کردەوە بە شێوەیەك کە دوای دەرچوونی مەسیحییەکان لە ورمێ لە هەشتی مانگی گەلاوێژی ١٢٩٧ ك.ش (١٩١٦ ز) هۆزی شکاك بوون بە دەسەڵاتترین هێزی چەکداری لە دەوروبەری دەریاچەی ورمێ و شارەکانی خۆی، سەلماس و ورمێ، بەڵام هیچ نیشانەیەك لە ویستی ئەو بۆ وەرگرتنی ئۆتۆنۆمی یا فەرمانڕەوایی بەسەر گشت ناوچەکانی کوردنشین نابیندرێ، بەلایەنی کەمی لەم سەردەمەدا. کەواتە لە دەرەنجامدا دەکرێ بڵێین کە دروشمی جوداخوازی مەسیحیان بوو کە هەستی ناوچەگەری کوردانی وروژاند و شەڕوپێکدادانی مەسیحییەکان لەگەڵ خەڵکی ئازەری و کورد، بووە هۆی ئەوەی کە ئازەرییەکان بێ توانا و کوردەکانیش بەهێز بن، چونکە ئازەرییەکان سترەکتوری خێڵایەتییان نەبوو و زیاتر خەریکی کاری کشتوکاڵی و بازرگانی بوون و سیاسەتی تێکدەرانەی ئاسوورییەکان بووە هۆی لە ناوچوونی هێزی بەرهەم هێنان و لە نێوچوونی ژێرخان و وزەی دارایی، بەڵام کورد کە لەبەر پاراستنی ستراکتوری خێڵایەتی و هێزی چەکداری کلاسیکی خۆی، وێڕای ململانێی لەگەڵ مەسیحییەکان، وەك نەیاری سەرەکی ئەوان درێژەیان بە خۆڕاگریان دا و لە ئەنجامدا وەك هێزی سەرەکی لە ناوچەکە سەریان هەڵدا. نووسەری مێژووی (خۆی) لەو بڕوایەدایە کە "... چالاکی سیاسیی مەسیحیان بووە هۆی ئەوەی هۆزەکانی کورد و لە هەمووان زیاتر هۆزی شکاك کە لەو کاتەدا دەسەڵاتێکی فرەیان پەیداکردبوو، هەوڵ بدەن بەسەر ناوچەی رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ دا زاڵ بن.[٢٣]

# راپەڕینی سمكۆ لە دژی دەوڵەتی ناوەندی

دوای دەرچوونی مەسیحییەكان لە ئازەربایجان، لە گەلاوێژی ١٢٩٧ ك.ش (١٩١٨ ز) و واژۆی دەست هەڵگرتن لە شەڕ لە لایەن عوسمانییەكان لە پاییزی هەمان ساڵ، سمكۆ بەرەبەرە ناوچەكانی دەوروبەری سەلماس و خۆی داگیركرد و شوێنی خۆی قایم كرد. لە ٢٥ی ڕێبەندانی ساڵی ١٢٩٧ ك.ش ١٩١٩ز سەردار فاتح بە خۆی و ٥٠ سوارە وەك فەرمانڕەوای ورمێ هاتە ناو شارو لە لایەن سمكۆ و كۆنسولی بەریتانیا لە تەورێز دان بە فەرمانڕەواییەكەی نراو لە راستیدا هۆی هاوكاری سەردار فاتح و سمكۆ لەوەدا بوو كە كوردەكان زەوییەكی زۆری هەڵاتووانی ئازەرییان دەست بەسەردا گرتبوو كە لە سەردەمی بوونی مەسیحییەكان ناوچەكەیان جێ هێشتبوو، لە داهاتی جووتیارانی دیكەی ئازەریش بەشێكییان بۆ خۆیان هەڵدەگرت، هەروەها ئاسایشی هەندێ ڕێگا لە ئەستۆی ئاغای شكاك بوو كە ئەویش ببوو بە سەرچاوەیەكی گرنگی داهات بۆ سمكۆ و هەموو ئەو كارانە بە دڵی سەردار فاتح بوو. محەممەد تەمەدون دەنووسێ كە سپهدار حاكمی ئازەربایجان كە دەبینێ بەم سیاسەتەی سەردار فاتح، ورمێ بە زوویی دەكەوێتە دەست كوردان، لە بانەمەڕی ساڵی ١٢٩٨ (١٩١٩ز) (زیا ئەلدەوڵە ئەلبەرزی) كرد بە حاكمی ورمێ.[٢٤] پشتیوانی كۆنسولی بەریتانیا لە تەورێز و سمكۆ لە سەردار فاتح لە جاری دووەمی فەرمانڕەواییەكەی نیشاندەری پێوەندی نهێنی كورد و سەردار فاتحە. سمكۆ لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (سەردار فاتح) زێتر بەدوای كۆكردنەوەی پارەو پوول بوو و هیچ خواستێكی سیاسی باس نەكرد. نووسەری مێژووی خۆی دەنووسێ:" ئیسماعیل ئاغا نامەی پڕ لە هەڕەشەی بۆ خەڵكی خۆی نووسی و بەم شێوەیە ویستی ملكەچی خۆیان بكا، بەڵام خەڵكی خۆی بە مەردانە خۆڕاگریان كردو لە بەرانبەر ستەمكاران و پەلاماردەران ئەنجامی چاكیان وەدەست هێنابوو، ئەو جارەش ئامادەی شەڕ بوون و نەهاتنە ژێرباری سستی و بەدبەختی."[٢٥] ئەو هەروەها دەڵێ لە مانگی بانەمەڕی ساڵی ١٢٩٨ ك.ش (١٩١٩ ز) ئیسماعیل ئاغا ملی قەراتەپەی كرد بە سنووری كوردستان و لە خەڵكی ڕێبوار یەك ریال و بۆ گوێ درێژێك دوو ریال و بۆ هەر ئەسپێك پێنج ریال و حوشتر بیست ریال وەك باج و گومركی وەردەگرت، لە كۆتایی مانگی شەعبان كاری كوشتار و تاڵانی ئەو گەیشتە ئەوپەڕی و تا كێوی قلابی هاتەپێش و ماڵ و ماڵاتی دێهاتی باشووری شاری خۆی تاڵانكرد، بەڵام چونكە

ژمارەیەك چەكدار لە خۆی هاتنە یارمەتی دانی خەڵكی ئەم گوندانە، ئیسماعیل ئاغا ناچار بوو كە بەشێك لە دەسكەوتی تاڵانەكانی بەجێ بهێڵێ و پاشەكشە بكا". [٢٦]

لە بانەمەڕی ساڵی ١٢٩٨ ك.ش(١٩١٩ ز) و بەر لە گەیشتنی (زیا ئەلدەولە ئەلبەرزی) بۆ ورمێ، (موكەڕەم ئەلمولك) كە لە نەبوونی سپهدار جێگری والی تەورێز بوو، بڕیاری دا كە بێ ئاگاداری حاكم و دەوڵەت بە ناردنی دیارییەك ماددەی تەقینەوەی تێدا بێ، خۆی لە دەست سمكۆ رزگار بكا كە لە ئەنجامی تەقینەوەكە برایەكی سەرەك خێڵی شكاك و سی كەس لە دەوروبەرەكەی كوژران. ئاغاسی لە هەوڵی ئەوە دایە كە ئەرمەنییەكان تۆمەتبار بكا وەك تۆڵە سەندنەوەیەك لە سمكۆ كە حاكمی تەورێزیان (لە راستیدا جێگری حاكم) داناوەو هەر ئەوانیش بۆمبەكەیان ساز كردبوو. [٢٧]

(برویەنسن) یش گەیشتۆتە ئەم ئەنجامە كە لە ئەنجامی ئەم تەقینەوەیە بوو كە سمكۆ كەوتە دامەزراندنی كوردستانی سەربەخۆ و لەم بارەیەوە هەوڵێكی زۆری دا و یەكیەتییەكی خێڵەكی پێك هێنا تا راپەڕینێكی گەورە لە دژی دەوڵەتی ئێران دەست پێ بكا. [٢٨] لە راستیدا ناردنی ئەم بۆمبە نیشانەی بێ دەسەڵاتی و لاوازی دەوڵەت بوو لە رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆی لەگەڵ ئاغای شكاك كە وای لێكرد لە دوژمنكاری و توندوتیژیدا بەبڕشتتربێ. (كەسرەوی)ش لەو باوەڕە دایە كە" سمكۆ مەسەلەی بۆمبی كردە بیانوو، پەیمانشكێنی و فرت و فێڵی دەوڵەتی ئێرانی بۆ كوردەكان زەق دەكردەوە تا زیاتر بۆ یاخیبوون هانیان بدا. [٢٩]

پاش ماوەیەكی كەم سپهدار بۆ تەورێز گەڕایەوە و (موكەڕەم ئەلمولك)ی راسپارد كە پیلانگێڕان بدۆزێتەوە، ئاشكرایە ئەم كارە بێ توانایی ئێرانی لەبەرچاوی سەركردە كوردەكان زەقتر كردەوە. موكەڕەم ئەلمولك كە خۆی بە بەرپرس دەزانی لەم كارەی (ص١٦٨) یەكێ لە ئازادیخوازانی خۆشەویستی بەناوی شازادە جهانگیر میرزای تۆمەتبار كردو دایە دەست سمكۆ. واپێدەچوو كە ئەم موجاهیدەی سەردەمی دەستوورییەت كە لە هاوڕێیانی حەیدەرخانی عەمو ئۆغلی لە سەردەمی گەمارۆی خۆی بوو و لەو ئازەرییانە بوو كە لە راپەڕینی دەستوورییەتخوازانی گەیلان بەشدار بوو، لە سۆنگەی كارە پێشكەوتووخوازەكانی وەك بنیاتنانی قوتابخانە گەلێ بە پرەنسیپی تازە لە ساڵی ١٢٩٥ ك.ش ( ١٩١٦ ز) لە شاری خۆی و خزمەتە بەرچاوەكانی بە موجاهیدانی ئەنجوومەنی ئەو شارە، لە نێو مەلا و لایەنگرانی ئیستبداد ناحەزانێكی پەیدا كرد و هەر ئەوان بوون كە پڕۆپاگەندەی بەشداری ئەویان لە ناردنی بۆمب بڵاوكردەوە. [٣٠]

سمکۆ بێجگە لە جهانگیر میرزا، سیانزە کەس لە پاسەوانانی قەراچەداغیشی بەند کردو بە بیانووی ئەوەی کە قەراچەداغییەکان لە کوشتنی جەعفەر ئاغا لە تەوریز دەستیان هەبوو، دوای ئەشکەنجەیان ئەمری کرد بە تەور پارچە پارچەیان بکەن و لە شاخ هەڵیان دەنە خوارەوە.(٣١) بەهەرحاڵ سمکۆ دوای ئەم رووداوە، شێوازێکی توندوتیژتری بەخۆیەوە گرت کە یەکەم نیشانەی نارەزایەتی دەربڕینی بوو بە دانانی (زیا ئەلدەولە ئەلبەرزی). چەند رۆژ پاش هاتنی فەرمانڕەوای نوێ بۆ ورمێ، لایەنگرانی سمکۆ چوونە ناو خەڵکی و رایانگەیاند کە" لەمەودوا دەبێ فەرمانڕەوایان خەڵکی خودی ورمێ بن. سەرۆکی (نەزیمە) و سەرۆکی جەندرمە بۆ دەبێ لە دەرەوە بنێرن، مەگەر لە خودی ورمێ خەڵکێکی شارەزاو زانا کەمن کە ئەم مایەپووچانەمان بۆ دەنێرن کە بە لەخۆباییەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن و هەوڵ دەدەن هەمیشە نێوان کورد و عەجەم ناخۆش بکەن. مەگەر راستییەکەی ئەوە نییە کە ئەوان خەڵکی ئێرە نین و دڵیان بەم دەڤەرە ناسووتێ و تا ئێستاش بەرانبەر بەم هەموو پارە بەلاشەی کە وەردەگرن بە ئەندازەی دینارێك لە ئاوەدان کردنەوەی ئەم دەڤەرە کاریان ئەنجام نەداوە.(٣٢)

سمکۆ هەوڵی دا ورمێ داگیر بکا و فەرمانڕەوای نوێ بکوژێ یان دەربکا، بەڵام پیاوانی (زیا ئەلدەوڵە) وایان لێکرد کە شار بەجێ بهێڵێ. لەو ساڵان ژمارەی دانیشتووانی کورد لە ورمێ دەگەیشتە پێنج تا شەش هەزار کەس کە لەچاو گشت دانیشتووانی ورمێ کە لە نێوان سی تا چل هەزار بوو ژمارەیەکی زۆر نەبوو، بۆیە سمکۆ بۆ پاراستنی شار ناچار بوو پشت بە هێزی خێڵ ببەستێ و هەر بۆیەش بۆ ماوەیەك ورمێی ئابلۆقە دا. ئێستا ئەو پرسیارە دێتە پێش کە بۆچی سمکۆ بە دانانی کاربەدەستی بیانی لە شاری ئازەرینشین، دژایەتی دەکرد؟ ئەگەر بە راستی بیری لە سەربەخۆیی یا ئۆتۆنۆمی کوردستانی دەکردەوە، چۆن ئامادەیی کاربەدەستانی ناخۆجێی لە شارگەلی تەواو کوردی وەك مەهاباد، سەردەشت، سەقز، بانە و سنە قبووڵ دەکرد، لە حاڵەتێکدا دەست بەسەر داگرتنی ئەم ناوچانە بۆ ئەو زۆر ساناتر بوو لە ورمێ و لەم رێگەوە بۆی هەبوو پشتیوانی هۆزەکانی کوردی بۆ خۆی مسۆگەر بکا؟ وەڵام ئەوەیە کە بە پێچەوانەی بۆچوونی برۆیەنسن کە دەڵێ سمکۆ دوای رووداوای تەقینەوەکە خۆی ئامادەکرد بۆ وەرگرتنی سەربەخۆیی کوردستان و بۆ پێکهێنانی یەکیەتییەکی خیلایەتی دەستی بە جموجۆڵ کرد، دەبێ بگوترێ کە یەکیەتی ناوبراو بە لانی کەمی لەم کاتەدا بە تەواوەتی نەهاتەدی و لە راستیدا دوای داگیرکردنی مەهاباد لە ساڵی ١٣٠٠ك.ش (١٩٢١ز) هاتەدی. جگە لەمە سمکۆ نە بۆ سەربەخۆیی کوردستان، بەڵکو بۆ داگیرکردنی ورمێ کە دووەم شاری ئازەرییەکان بوو

دوای تەوریز، تەقەلای دەکرد و پاڵنەری ئەو لەم داگیرکارییە ئەوە بوو کە ببێتە خاوەنی بەپیتترین و دەوڵەمەندترین ناوچەی ئازەربایجان و گریمان ئەو خوازیاری چاکسازی بوو بۆ ناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی ورمێ، ئەی بۆچی خەڵکی ورمێ لە نۆی جۆزەردانی ١٢٩٨ ک.ش (١٩١٩ز) بە هەموو هێزیان لە دژی ئەو و جەنگاوەرانی خۆڕاگریان کرد و راویان نان، لە حاڵەتێکدا کە هێزی سەربازی ژێردەستی فەرمانڕەوای نوێ نەدەگەیشتە سێ سەد کەس. پێشك سەرۆکی شکاکەکان دەیزانی کە لە ساڵی ١٢٨٥ ک.ش ١٩٠٦ز تا ئەو کاتی لە ئەنجامی ناکۆکی نێوان مەشرووتەخوازان و ئیستبداد و هاتنی هێزەکانی رووس بۆ ئازەربایجان، شەڕی گەورەو کردەکانی مەسیحییەکان، بڕستی لە خەڵکی ورمێ بڕیبوو و یەکیەتی کۆمەڵایەتییان لاواز بووەو و ئەو باشترین هەلی دەسکەوتووە بۆ زاڵبوون بەسەریاندا.(٣٣)

دوای شکستی سمکۆ، کوردی دانیشتووی ناو شار لە ترسان ویستیان شار بەجێ بهێڵن، بەڵام (زیا ئەلدەولە) رایگەیاند کە : "هەرگیز شەڕێك لە نێوان شیعە و سوننە لە ئارادا نییە و پرسی ئایینی و رەگەزی لەگۆڕێ نییە و هەر کەس بەهەر جۆرێك بیەوێ خەڵکی ئازار بدا بە شیعەو سوننەوە، بێ جیاوازی سزا دەدرێ"(٣٤)

ئەو کارەی حاکم وا دەردەخا کە کێشەی سمکۆ کێشەی نەتەوایەتی نەبوو و بۆچونی کاربەدەستانی دەوڵەت لەو سەردەمی هەر ئەوە بووە کە راپەڕینێکی ساکاری خێڵەکییە و لە هیچ سەرچاوەیەك ئاماژە بە جەنگی سوننە و شیعە و کورد و تورك نەکراوەو بۆ سەلماندنی ئەم وتەیەش ئەو راستییەیە، کە سمکۆ نەیتوانی کۆمەڵگەی کوردی بجووڵێنێ چ بگا بەوەی لە بەرانبەر کۆمەڵگە و دەوڵەتی ئێران بیانوەستێنێ. هێزی شکاك دوای شکستهێنانیان لە گرتنی ورمێ، بە سەرکردایەتی تاهیر بەگی شکاك بەندەری گلمان خانەیان داگیرکرد و کەلوپەلی ناو عەمبارەکانیان بۆ چەهریق گواستەوە.(٣٥)

ماوەی حوکمرانی زیا ئەلدەولە ئەلبەرزی تا ناوەڕاستی مانگی تەممووزی ساڵی ١٢٩٨ ك (١٩١٩ ز) درێژەی خایاند، لەم رێکەوتە لە لایەن سپهدار لادراو لە جیاتیان دووبارە سەردار فاتح بوو بە فەرمانڕەوای ورمێ. سەردار فاتح لەتەك کۆنسولی بەریتانیا لە تەوریز و سەربازانی هیندی هاتنە ناو شارو زوو کوردەکان دەستیان لە گەمارۆی شار هەڵگرت. حاکمی نوێ لە بەرانبەر دابینکردنی ئاسایشی رێگاکان، ناوچەکەیان بە کوردەکان راسپارد و جەندرمەی کورد لەژێر سەرپەرشتی دوو کوردی خەڵکی عوسمانی بەناوی شێخ عەبدوڵلا و لەتیف چاووش لە خزم

و کەسی سەید تەها کە خۆی لەم کاتەدا لە عێراق بوو، دەست بەکاربوون و بڕیاردرا کە بڕێك پارەیان پێ بدەن.[٣٦]

هەروەها سالار هومایون ئەواجیقی حاکمی سەلماس کە پێشتر بەرپرسی ئاسایشی ڕێگاکان و سەرپەرشتی قەرەسوران بوو، لادرا و بڕیاردرا مانگێ هەزار تومەن مووچەی جەندرمەکانی دیلمقان بدرێتە سمکۆ و پیاوەکانی.[٣٧] سەرەڕای بەشداری کوردان لە بەڕێوەبردنی کاروبار، هەمدیسان هۆزگەلی ژێر فەرمانی سمکۆ، گوندەکانی دەوروبەری دەریاچەی ورمێیان تالان دەکرد و ئابووری ناوچەکەیان ئیفلیج کردبوو. لەم مێژووەوە لە ناوەڕاستی مانگی پوشپەریی ١٢٩٨ تا فەروەردینی ١٢٩٩ (١٩٢٠ ز) ڕووداوگەلێ ڕوویان دا کە بووە هۆی بەهێزتربوونی هەڵکەوتی سمکۆ بە شێوەیەکی وا کە بەپێداگرتنی سەردار فاتح و پشتگیری کۆنسولی بەریتانیا لە تەورێز نازناوی "سەردار نوسرەت"و شمشێرێکی ئاوزێڕ و پلەی سنووردارێ ئێرانی لە ناوچەی لە لایەن دەوڵەتی ئێران بە ئاغای کورد بەخشرا.[٣٨] لەم کاتەدا، (عەین ئەلدەولە) لە جیاتی سپهدار بوو بە فەرمانڕەوای ئازەربایجان و ئەویش سەردار (ئینتسارێ) وەك جێگری فەرمانڕەوا نادرە تەورێز، هاوکات لەگەڵ ئەم گۆڕانکارییە، سەید تەها هاتە ئێران و گەیشتە سمکۆ، لە ئەنجامی هاتنی سەید تەها، جموجۆلی چەکداری کوردەکان خەستتر بوو بە شێوەیەك کە تاران ناچاربوو کاردانەوەی هەبێ و هەر زووبەزوو بەپێی خواستی یەك لە دوای یەکی سەردار ئینتسار، یەکەی ڕێك و پێکی قەزاق بە فەرماندەیی ئەفسەری ڕووس بەناو سەرهەنگ فیلیپۆف ڕەوانەی ناوچەکە کران. بەرەنگاربوونەوەیەکی توند لە نێوان قەزاقی دەوڵەتی و سمکۆ و هاوەڵانی ڕوویدا کە کوردەکان شکان و قەڵای چەهریق کەوتە گەمارۆی سەرهەنگ فیلیپۆف.

سمکۆ لە یەکەم جووڵەی بۆ زاڵبوونی بەسەر ناوچەکانی ڕۆژئاوا و باشووری دەریاچەی ورمێ تووشی گرفت بوو و بەیەکجاری هەموو شوێنە داگیرکراوەکانی لەکیس چوو. سەردار ئینتسار کە سووربوو لەوەی بەهەر چەشنێك بێت ئاغای کورد بەند بکات یان بکوژێت، درێژەی بەئابلۆقەکە دا و کوردەکانی خستە تەنگەتاوێکی دژوار، بەڵام لەناکاوڕا بروسکەیەك لە (عەین ئەلدەولە) گەیشتە دەستی کە تێیدا فەرمان بە جێگری والی درابوو کە لەگەڵ سمکۆ ئاشتی بکا و سەرهەنگ فیلیپۆفیش فەرمانێکی بەو بابەتەی لە تاران بەدەست گەیشت.

کەسرەوی بەندەکانی ئەو ڕێککەوتنامە چاوەڕوان نەکراوەی نێوان ئەفسەری قەزاقی ڕووس و سەرکردەی شکاکەکان بەم شێوەیە باس دەکا:

١ـ سمكۆ ئەو تالآنیانەی لە لەکستان هاوردبووی، بگەڕێنێتەوەو خوێنبەهای کوژراوان بدا .

٢ـ پاشماوەی چەکدارانی عوسمانی لە لای خۆی دەربکا.

٣ـ لەدەستدرێژی بۆ ناو کاروباری سەلماس و ورمیٚ خۆی دوورخاتەوە.

٤ـ قەرەبووی خەرجی هاتنی لەشکری دەوڵەت بداتەوە.

٥ـ هەرچی چەکی هەیەتی بیداتە دەوڵەت.

٦ـ برای خۆی ئەحمەد ئاغا بۆ تەوریٚز بنێریٚ تاکو لە قەزاقخانە لە نێو فەرماندەکان دا بیٚ.

بەم مەرجانە دەوڵەت لە گوناهانی خۆش دەبیٚ و دەهێڵیٚ کە لە چەهریق دابنیشیٚ و ئاگاداری سنوور بیٚ.[٣٩] ڤان برویەنسن، کوچێراو ئەرفع، باس لە وەستانی گوماناوی چالاکی چەکداری لە دژی کورد دەکەن سەرەڕای سەرکەوتنی هێزی دەوڵەتی لەم شەڕەدا، هیچیان نەنووسیوە، بەڵام کەسرەوی، تەمەدون و ئاغاسی لەو بڕوایەدان کە هێزی دەرەکی و بە تایبەتی بەریتانیا، وەك تەنها دەسەڵاتی کاریگەر لە شانۆی سیاسەتی ئێرانی ئەوکاتی، دەوڵەتی ناچار بەم وەستانە کردووە.[٤٠] لە هەموو ئەم سەرچاوانە هاتووە کە سەرۆکی خێڵی شکاك بروسکەگەلیٚ بۆ (عەین ئەلدەولە) دەنێریٚ کە ئەو کاتی لە زەنجان نیشتەجیٚ بووە و هەروەها بروسکەی بۆ سەید تەها لە بەغدا ناردووە و تێیدا داوای یارمەتی لیٚ کردووە. کەسرەوی بۆ روونکردنەوەی ئەم راستییە لەو کاتی یا دوای ئەو، لەگەڵ سەردار ئینتسار و سەید تەها وتووێژی کردووە و بە پشتبەستن بە زانیاری ئەم دوانە، پڕۆپاگەندەی بەرتیل وەرگرتنی (عەین ئەلدەولە) و فیلیپۆف لە سمکۆ بە بیٚ بنچینە دەزانیٚ و داکۆکی دەکا کە:" دەستی سیاسەتی هەندیٚ لە دراوسێکان لە رووداوەکە بوو" چونکە بەپێی وتەی ئەو، فەرمانی وەستانی هێرش و ئابلۆقەی چەهریق لە لایەن خەڵکی پلەبەرزتر لە (عەین ئەلدەولە) لە لایەن دەوڵەتەوە دەرچووبوو.[٤١] تەمەدونیش لە بارەی کاردانەوەی خەڵکی لە ئاست بەخشینی سمکۆ دەنووسیٚ:" کاتیٚ خەڵك ئەم هەواڵەیان بیست، زۆر زویربوون و زانیان ئەم ماستە مویەکی تێدایە، (موزەفەر ئەعلەم) (سەردار ئینتسار)یش لەم رووداوە تووڕە بوو و لە تەوریٚز بە ئاشکرا ناڕەزامەندیی خۆی لەم کێشانە، لە بەردەم خەڵکی و ئازادیخوازان دەربڕی".[٤٢]

هۆکاری هەڵگرتنی گەمارۆ و رزگاربوونی سمکۆ، هەرچی بوو بووە هۆی پتەوبوونی هەڵکەوتی چەکداری ئەو، چونکە ئەو بەپێی هیچ کام لەو بەندانە نەجووڵایەوەو هەرچەندە بە رواڵەت ئارام

دانیشتبوو، بەڵام لە ژێرەوە، لەگەڵ سەرەك هۆزەکان و بەگزادەکان پێوەندی هەبوو و وای کرد کە پەیمانی لەگەڵ نوێ بکەنەوە بۆ کارەکانی دواتری.[٤٣]

بە بڕوای کەسرەوی لەوەی کە نەیانتوانی سمکۆ دەستەمۆ بکەن، ئەم ئەنجامەی لێکەوتەوە و بەهێزتری کرد، چونکە تا ئێستا ژمارەیەکی زۆر لە کوردان لەگەڵ ئەو نەکەوتەبوون و لایەنگری دەوڵەت بوون، تەنانەت هەندێ لە کوردانی سابلاغ و شوێنەکانی تر لەم شەڕوشۆڕانەدا لە ریزی هێزی دەوڵەتدابوون، بەڵام کە ئەمە رووی دا و سمکۆ لە تەنگانەترین بارودۆخی خۆیدا بوو، ئازادکراو سوپای دەوڵەت گەڕایەوە، ئەمە وای کرد کە نرخی دەوڵەت لەبەرچاوی ئەوان دابەزێ و لە لایەکی تر سام و هەیبەتی سمکۆ لای ئەوان زێدتربوو، چونکە وای بۆچوون کە خەڵکانێك هەن پشتیوانی لێ دەکەن".[٤٤]

کەواتە ئەنجامەکانی ئەم رووداوە لە دوو خاڵ دا کورت دەکرێتەوە:

هاتنی سەید تەها بۆ ناو راپەڕین و ئامانجەکانی سیاسی ئەو ئاشکراتر بوو و رادەی دەستڕۆیی خێڵەکیانەی سمکۆ زێدەتر بوو، لە نێو هۆزە کوردەکانی ئازەربایجان. دوای دەرچوونی هێزەکانی قەزاق، سمکۆ هێدی هێدی هەموو ئەو ناوچانەی کە لە دەستیدابوو، سەرلەنوێ وەدەست هێناوە. ئەرفەع لە شەڕەکانی ئەو کاتی لە دژی سمکۆ، بەشدار بووە و نووسینەکانی بەهایەکی زۆری رووداونووسی هەیە، ئاماژە بە گۆڕانکاری لە ناوەڕۆکی سیاسی راپەڕینی سمکۆ دوای دەرچوونی قەزاقەکان دەکا و دەڵێ:

" لە ساڵی ١٩٢٠ سمکۆ بە ئاشکرایی باس لە سەربەخۆیی کورد دەکا کە دیدی ئەو بریتی بوو لە دامەزراندنی حکوومەتێکی تاکەکەسی و تاکڕەوانە بەسەر هۆزە کوردییەکانی ئازەربایجان و داگیرکردنی بەشێکی زۆر لەو ناوچانەی کە کوردی نییە وەك ناوچەکانی رۆژئاواو باکووری رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ وەك شاری ورمێ و دەشتەکەی، سەلماس و لەوانەیە شاری خۆی. خەڵکی ئەم ناوچانە هەمووی ئازەری واتە تورك و شیعەن و لە رووی دابونەریت و شێوەی ژیان لەگەڵ کوردان جیاوازییەکی تەواویان هەیە، لە حاڵەتێکدا کە خەڵکی کورد شەڕکەر و رەشمالنشینن، تورکەکان خەڵکێکی ئارام و نیشتەجێی گوندەکانن".[٤٥]

بۆ ئەوەی رەوشی تازەی سمکۆ و هۆکارەکانی گرتنەبەری ئەم رەوشە بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی بناسین، پێویستە لەگەڵ کاریگەری چالاکی ناوچەگەرێتی (شێخ محەممەدی خیابانی) و چالاکی بەرفراوانی خەباتگێڕانی کوردی دراوسێی ئێران، ئاشنا بین.

# ڕۆلی بزاڤی خیابانی له جووڵانەوەی سمکۆ

ئاڵۆزی سیاسی ئێران له دوای جەنگی گەورە، بێ توانایی دەوڵەت له بواری سیاسی، ئابووری و سوپایی و دەست تێوەردانی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتری بەریتانیا له کاروباری ناوخۆی وڵات، دەبووە هۆی بەدەرکەوتنی ناڕەزایی له نێو ئازادیخوازان که زەقترین نموونەی ئەم ناڕەزایەتییە له چوارچێوەی ڕاپەڕینی جەنگەڵ، خیابانی و پسیان دەبیندرێ و ئامانجی سەرەکی ئەم چالاکیانە جێبەجێکردنی ڕاستەقینەی دەستوور و بەرهەڵستی کردن له ئاست دەست تێوەردانی بیانییەکان له کاروباری ئێراندا. بە پێچەوانەی ئەو پرۆپاگەندانەی کە له بارەی بیروڕای (شێخ محەممەد خیابانی) کراوە، ئەو نە تەنیا جوداخواز نەبوو، بەڵکو بە هەموو وزەیەوە هەوڵیدا کە دەستوورییەت له تێۆرییەوە بکاتە پراکتیك و لەوەی ڕا کە ئازەرییەکان له، لەنێوبردنی ئیستبدادی بچووك ڕۆڵی سەرەکیان بینیبوو، ئەو پێی خۆش بوو سەرلەنوێ ئازەربایجان بکاتە بنکەی بووژانەوەی ژیانی مەشرووتە و له حاڵەتی سڕبوونی دوای شەڕ دەریبهێنێ.

لێرەدا دەرفەت نییە بە تەواو له ڕاپەڕینی خیابانی بکۆڵینەوە، تەنیا هەوڵ دەدرێ کاریگەری ئەو ڕاپەڕینە لەسەر کوردانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا ڕوون بکرێتەوە. جووڵانەوەی خیابانی له دوو لاوە کاریگەری لەسەر کورد هەبوو کە له ئەنجامدا بووە هۆی بەهێزکردنی سمکۆ:

١ـ له سۆنگەی پێداگرتنی خیابانی بە بەڕێوەبەرێتی ناوچەی ئازەربایجان بە دەستی خەڵکی، ناوچەگەری خۆجێی و هەستی ناوچەگەری Pegionalisme، له نێو کورداندا بەرز بۆوە.

٢ـ دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی خیابانی، هەندێ له لایەنگرانی ئەو هاوکاری سمکۆیان کرد و ئاغای کوردیان دنە دەدا ورمێ بگرێ و دژایەتی حکوومەتی تەورێز بکا.

ناوچەگەری خیابانی کە لەسەر بنچینەی پێکهێنانی ئەنجوومەنی ویلایەتی و لەسەر بنەمای یاسای بنەڕەتی مەشرووتە، هاتبووە باسکردن، هیچ جۆرە زیانێکی بە یەکیەتیی میللی و پاراستنی هەموو خاکی ئێران نەدەگەیاند و هەڵبەت کە دژایەتی کاربەدەستانی ناوەندیان دەکرد کە نێردرابوون بۆ ئازەربایجان، لەبەر ئەو گەندەڵکاری و سستی ئەوان بوو کە ئازادیخوازان بۆ چارەسەری گیروگرفتە ناوچەییەکەی ئەو ویلایەتە، باسیان له دانانی خەڵکی خۆجێیی دەکرد.

عەلی ئازەری لە لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنەی خۆی سەبارەت بە کاروکردەوەو ئامانجی (شێخ محەممەد خیابانی) دەسەلمێنێ کە ئەو بۆ ژیاندنەوەی مەشرووتە و کۆتایی هێنان بە پشێوی سیاسی ئێران، لەسەرەتادا هەوڵیدا کە ئازەربایجان لە نا یەکسانی و گەندەڵکاری پاك بکاتەوە و گرفتەکانی ئەوێ بەهۆی خودی تورکەکان چارەسەر بکات بۆ نموونە یەکەم کاری ئەو چارەسەری کەمی نان لە ئازەربایجان بوو، هەروەها نەیهێشت کە( شەریف ئەلدەوڵە بەنی ئادەم) کە لە تارانەوە نێردرا وەك حاکمی نوێی تەورێز، بێتە ناو شار و هەروەها بەهۆی گەندەڵی، کۆمەڵێك فەرمانبەری نێردراوی ناوەندی بەهۆی هەوادارنی خیابانی دەرکران.(٤٦) شاری تەورێز لە هەژدەی سەفەر ١٣٣٦ ك.ق ١٩١٥ز کۆمەڵێك خۆپێشاندانی بەربلاوی هەوادارانی خیابانی بەخۆیەوە دی و لە کۆتایی خۆپێشاندانەکان ڕاگەیاندراوێکیان پێشکەش بە دەوڵەتی وسوق ئەلدەوڵە کرد کە " خەڵکی ئازەربایجان بە ڕاشکاوی دەڵێن: لەبەر ئەوەی کابینەیەکی تۆکمە و جێ بڕوای خەڵکی لە ناوەند، پێك نەهێندراوە، فەرمانەکانی ناوەند لێرە جێبەجێ ناکرێ".(٤٧) ئەم کارانە بۆ کوردی ئازەربایجان سەرنجراکێش بوو، کە بە پێچەوانەی کوردی ویلایەتی کوردستان، ڕەزامەندنەبوون لەسەربوونی کاربەدەستانی بیانی لە ناوچەکەی خۆیان، لەگەڵ ئەوەی کە خیابانی جوداخواز نەبوو، بەڵام کە" کاربەدەستانی دزو بەرتیلخۆرو دەڵاڵی لە دامودەزگای حکوومەت دەرکرد و لەم ڕێگەیەوە دەستی خراپکاری تارانی لە ئازەربایجان کورت کردەوە."(٤٨) ڕواڵەتی ئەم کارە لەبەر چاوی کوردان بەمانای ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی ناوەند بوو لە ناوچەکەو بە دەسپێکی جودایی ئازەربایجانیان دەزانی لە ئێران و ئەمە بوو تروسکە و هیوایەك بۆ جوداخوازانی وەك سەید تەها بۆ جوداکردنەوەی ناوچە کوردییەکان.

کریس کوچێرا باس لە پێوەندی (سەیف ئەلقوزات) مامی قازی محەممەد و خەتیبی نوێژی هەینی ئەو کاتی مەهاباد لەگەڵ بزاڤی خیابانی دەکا و دەنووسێ کە ئەو، پارچە هۆنراوەیەکی لە ستایشی " شۆڕشی تەورێز" لە گۆڤاری ئازادیستان بڵاوکردەوە، کە بڵاوکەرەوەی بیروڕای لایەنگرانی خیابانی بوو.(٤٩)

سەیف ئەلقوزات تاکە مەلایەك بوو پشتگیری لە کارەکانی سمکۆ دەکردو هانی دا بۆ داگیرکردنی ئازەربایجان و بێگومان ڕووهێنان و پێشوازی کەسانێك وەك سەیف ئەلقوزات لە هزرو بڕوای خیابانی، تەنیا پشتگیریکردن بوو لەو بەشەی خواستەکانی مەلای تەورێز کە پێوەندی بە ناوچەگەرێتی و زیادکردنی دەسەڵاتی خۆجێیی ئازەربایجانییەکانەوە هەبوو.

نوسەری کورد( م. کارۆخیش) بنەمای پێوەندی نێوان سمکۆ و شێخ محەممەدی خیابانی بە راست دەزانی، بەڵام رادەی ئەو پێوەندییە زۆر سەرنجراکێش نازانێ.[٥٠] تەوەری پێوەندی سمکۆ لەگەڵ بزاڤی خیابانی کە رەهەندەکانی هێشتا تەواو نەناسراوە، هەمان دژایەتی کردنی گەڕانەوەی دەسەڵاتی ئیداری و سەربازی دەوڵەتی ناوەندی لە ئازەربایجان بوو کە ئیمکانی ئەوەی بە سمکۆ دەدا تاکو لە سەرقاڵی دەوڵەت بەرانبەر بە خیابانی کەڵك وەربگرێ و قەڵەمڕەوی خۆی بەرەو رۆژهەڵاتی دەریاچەی ورمێ بەرفرە بکات، بەڵام هاوکاری هەوادارانی خیابانی و سمکۆ و لە دواییدا (ئەبولقاسمی لاهوتی) فەرماندەی ژاندارمەکانی جێگیر لە بەندەری شەرەفخانە، دەگەڕایەوە بۆ دژایەتی کردنی هەرسێکیان لە ئاست کودەتای ١٢٩٩ ك.ش ١٩٢٠ز بوو. لەژێر تیشکی ئەم هاوکارییە، سەرۆکی شکاکەکان توانی بێ هیچ گرفتێك شاری ورمێ داگیر بکات. (موخبیر ئەلسەڵتەنەی هیدایەت) کە لە سەرکوتکردنی بزووتنەوەی خیابانی رۆڵی بنەڕەتی بینیبوو لە بارەی پێوەندی نێوان سمکۆ و راپەڕینەکانییەوە بەم جۆرە دەدوێ:

" رووداوی کودەتای سێی رەشەمە لە راپەڕیوان بادامچی و موعتەمید ئەلتوجار لە ماڵی ساعید ئەلسوڵتە هاتنە لام  کە دەبێ دژایەتی کودەتا بکرێت، گوتم ... لە بەیاننامەی حکوومەت، کارێك کە دژایەتییەکەی پێویست بێ، نییە کوشتن بەر لە تاوان، تاوانە. لە من هومێد بڕاوبوون، بانگهێشتی سمیتقۆیان کرد نامەیان بەر دەستمان کەوت".[٥١]

ئەو لە پەرتووکەکەی تری خۆی بەناوی (خاتیرات و خەتەرات) هەر ئەم بابەتەی دووبارە کردۆتەوە دەڵێت " راپەڕیوان کە لە من نائومێد بوون، لەگەڵ لاهوتی کەوتنە گفتوگۆ تاکو لە بەرانبەر کودەتای تاران کودەتایەك بکەن، تەنانەت ئیسماعیل ئاغایان بانگهێشت کرد کە نووسراویان بەر دەستمان کەوت..."[٥٢] بەڵام کەسرەوی هۆی هاوکاری راپەڕیوان و سمکۆ نە لە لەبەر رووبەڕووبوونەوە لە ئاست کودەتا بوو، بەڵکو تۆڵەسەندنەوە بوو لە موخبیر ئەلسوڵتە و لەو بڕوایە دایە کە: "لەوەی کە لە ئازەربایجان چەند هەواڵێکی ئەو (خیابانی) بەناوی رق هەڵگرتن لە موخبیر ئەلسوڵتە بە کارێکی خراپیان کرد ئەویش ئەمە بوو کە خۆیان گەیاندە ئیسماعیل ئاغا (سمکۆ) و دووبارە بۆ ئاژاوە هانیان دا و(ئەرشەد ئەلمولك) ناوێکیان بۆ لای ئەو هەنارد. ئیسماعیل ئاغا دووڕو بوو لەگەڵ دەوڵەت و خۆیشی خوازیاری ئاژاوە بوو، دەرفەتی لەدەست نەدا و دووبارە دەست بەکار بوو. ئەرشەد ئەلمولك کە خۆی خەڵکی ورمێ بوو بە فەرمانی ئیسماعیل ئاغا شاری( ورمێ )ی لە زستانی ١٢٩٩ (١٩٢٠) داگیر کرد".[٥٣]

ئاشکرایە کە سمکۆش لە ئاست کودەتا زۆر گەش بین نەبوو و ئەو هاوکارییەی نێوان ئەو و ڕاپەڕیوان بێجگە لە سازبوونی گرفت لە بەردەم کودەتاچییەکان، بیانگە و زەمینەیەکی باش بوو بۆ ئەوەی دەست بەسەر ورمێ دابگرێت. لە زستانی ۱۲۹۹ ك.ش (۱۹۲۰ ز) ( ئەرشەد ئەلمولك) بە یارمەتی هەوادارانی خیابانی حاکمی نێردراوی تەورێز بەناوی میرزا عەلی ئەکبەرخان دەستگیر دەکا و کارێکی وا دەکا کە هێزەکانی جەندرمە و پۆلیس لەوێ دەربکرێن و داوای لە سمکۆ کرد کە لەگەڵ هێزەکەی بێتە ناو شار.

هێزەکانی دەوڵەتی لە بەندەری گوڵمانخانە دامەزران، بەڵام دوای چەند رۆژێك خۆڕاگری لە ئاست هێزەکانی عومەرخانی شەریفی مامی سمکۆ ناچاربوون بەندەر چۆل بکەن. کەلوپەلی بازرگانان بۆ جاری دووەم لە لایەن شکاکەکانەوە تالانکراو بۆ چەهریق گوازرایەوە.

شێوەی مامەڵەی سمکۆ لەگەڵ خەلکی شاردا بریتی بوو لە ئەشکەنجەی دەوڵەمەندان بە مەبەستی دەست بەسەرداگرتنی شتومەك و چەکەکانیان، سەرکوتکردنی خەلکی، دروستکردنی بارێکی نائارام، لە راپۆرتەکانی وەزارەتی ناوخۆ، ئاماژە بە رەفتاری دڕندانەی شکاکەکان کراوە کە بەرانبەر بە خەلکی ورمێ نواندوویانە.(٥٤)

هیچ نیشانەیەك لە راگەیاندنی سەربەخۆیی یا خودموختاری و دامەزراندنی دەزگا سیاسییەکان، ئابووری و سوپایی کە لە ناسیونالیزمی کوردی سەرچاوەی وەرگرتبێ بەرچاو ناکەوێ و تەنیا کاری بەرچاوی سمکۆ دەست بەسەر داگرتنی دە هەزار لیرە و هەندێ فیشەك و تفەنگ لە خەلکی ورمێ بوو و تەنانەت زێڕو زیوەری ژنانی شار بەهۆی عومەر خان بە تالان چوو و بەپێی نووسینی (تمدن)زۆربەی دەوڵەمەندان لە ترسی ئەشکەنجەدان، خۆیان کوشت.(٥٥)

بەم شێوەیە هاوبیرانی (محەممەد خیابانی) بوونە هۆی توندوتیژی پتری کارەکانی سمکۆ و بەردەوامی لە هەڵچوونەکانی و دوای ئەم رووداوەش مرخی لە داگیرکردنی سابلاغ خۆشکرد.

# سەید تەها ئەفەندی و سمکۆ

رووداوەکانی ئازەربایجان و راپەڕینی سمکۆ و ناوبانگ دەرکردنی ئەو وەك کەسێکی چەکداری بەهێز لەدوای جەنگی گەورە، هەرزوو سەرنجی کوردەکانی ئەو دیو سنووری راکێشا بۆ ئەم هەلکەوتە تازەیەی کوردی ئەم بەرە، لەگەڵ ئەم زانیارییە کە لە ئێراندا هیچ رێکخراو و هێزێکی سیاسیی ناسیونالیستی کوردی بوونی نییە و سمکۆ نوێنەرایەتی رەوتێکی دەرەبەگیانەی ناوچەگەرییە، بڕیاریان دا ئەزموونی سیاسیی خۆیان لە خزمەت ئەم جموجۆڵە دانێن کە لە رووی سیاسییەوە پێنەگەیشتووە، لەبەر ئەم هۆکارانە، کەسانێکی خاوەن ئەزموون وەك سەید تەها ئەفەندی و مستەفا پاشا یامولکییان رەوانەی چەهریق کرد. سەید تەها ئەفەندی کوڕی شێخ عەبدولقادر و نەوەی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لە روخسارە سیاسییەکانی کوردستانی عوسمانی لە سەرەتای سەدەی بیستەم و کەسێکە کە رۆڵێکی زۆر گرنگی لە بەهێزکردن و موکوم کردنی بزاڤی سمکۆ و هۆزی شکاك لە ئەستۆدا بوو. سەید تەها لە سالآنی جەنگی گەورە لە بنیاتنەران و ئەندامانی سەرەکی کۆمەڵەی ئیستیخلاسی کوردستان (کۆمەڵەی رزگاری کوردستان) و نێردراوی ئەم گروپە بوو بۆ لای کۆنسولی رووسیە لە ورمێ بۆ راکێشانی پشتیوانی رووسیەی قەیسەری بۆ پێکهێنانی کوردستانی گەورە. هەڵبەت دەبێ بزاندرێ کە هیچ نیشانەیەك یان بەلگەیەك کە سەلمێنەری هاوکاری یان ئەندام بوونی سمکۆ لەم کۆمەڵەیە بێ، لەبەردەست نییە، بەلاّم ئەوەی سەید تەها بە سمکۆ گرێ دەدا نە کێشەی سیاسی، بەلکو خزمایەتی ئەو لەگەڵ بنەماڵەی محەممەد ئاغای شکاك بوو، سەید تەها لە راستیدا زاوای برای سمکۆ واتە جەعفەر ئاغا بوو. هەروەها ئەویش وەك هەموو کەسایەتییە نەتەوەییەکانی کوردی عوسمانی و هەموو رێکخراو و کۆمەڵەکانی نەتەوەیی کورد، بەدوای هێزێکی جیهانی دەگەڕا وەك رووسیە یان بەریتانیا بۆ ئەوەی پشتیوانی لە پێکهێنانی کوردستانی گەورە بکا و یارمەتی خەباتی چەکدارییان بدا. لە روانگەی ئەم جۆرە کەسانە، بە دەرکەوتنی هەر هێزێکی چەکداری لە یەکێ لە بەشەکانی کوردستان وەك هاتنەدی یەکێ لە دوو مەرجی پێویستییە بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی ناوچە کوردنشینەکان. کاتێ کە تەها هاتە ناو ئێران، دەوڵەتی عوسمانی لەو پەڕی لاوازیدا بوو و دەنگۆی ئەوە لە ئارادابوو کە دەوڵەتێکی ئەرمەنی لەناو خاکی عوسمانی لە لایەن دەوڵەتی سەرکەوتووی شەڕی گەورە پێك بهێندرێ و کۆمەڵەی تورکیە کە( عەبدولقادر) باوکی تەها، پیاوی ژمارە یەکی ئەم کۆمەڵەیە حسێب دەکرا، لەسەر ئەم بڕیارە بوو کە بەهۆی هەڵگیرسانی راپەڕینێك لە نێو کوردی ئێران و عێراقی ئایندە و تورکیە، کۆمەڵەی نەتەوەکان والێدەکا ئاوڕ لە مافەکانی کوردان بداتەوەو تەها بۆ ئەم مەبەستە هاتە

ئێران. ئامانجی سیاسیی زۆربەی سەرانی کورد لەو سەردەمی لە چوارچێوەی ناسیونالیزمی خێڵەکی گەشەی کردبوو. بە روانینێکی خێرا بە هەلکەوتنی کۆمەڵایەتی ئەو کوردانەی کە یەکەم پارتی کوردییان دروست کردووە، واتە کورانی بەدرخان، کوڕانی شێخ عوبەیدوڵلاّ شێخ سەعیدی پیران، شێخەکانی بارزان، شێخ مەحمودی بەرزنجی و سەید رەزا، دەبینین کە گشتیان هەلکەوتەیەکی خێلی ئاییینیان هەبووە، بۆ نموونە شێخ عوبەیدوڵلاّ شێخ ئەحمد بارزانی و شێخ مەحموود، هەموویان زەویداری گەورە بوون و لە هەمان کاتدا پیاوی ئاییینیش بوون، تەنانەت راپەڕینی ئارارات و شێخ سەعیدی پیران کە بەهۆی چەکداران و پیاوانی ئاییینی کورد دەستی پێکرد.

تا رادەیەکی زۆر پشتی بەستبوو بە هێزی خێڵەکان، کەواتە رۆڵی ئەم سەرکردانە و رۆڵی ناسیونالیزمی خێڵەکی ئەوان لە سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتی لە نێو کوردان، بایەخێکی زۆری هەیە و هەرچەندە کۆمەلگەی کوردی لە ڕووی کولتووری سیاسی، نەتەوایەتی قەرزاری رۆشنبیرانی شارنشین و پیاوانی ئاییینییە، بەڵام کاریگەری ناسیونالیزمی خێڵەکی لە نێو کوردان حاشاهەڵنەگرە.

لە قامووسی هەلگرانی دروشمی ناسیونالیزمی خێڵەکی، گەڕاندنەوەی خودموختاری کلاسیك و ئازادی و سەربەخۆیی سەرۆك هۆزەکان ئامانج بوو. واتە ئەو خێرو بەرەکەتەی کە بنەماڵە کۆنەکانی کورد لە چەندین سەدە لەمەوبەر هەیانبوو. رابەرانی ناسیونالیستی خێڵەکی، هێزی خەڵك و بە تایبەتی شارنشینانی کوردیان لە چالاکییەکانی خۆیان لەبەرچاو نەدەگرت و هەموو جموجۆڵی سیاسیان کورت کردبۆوە لە پێوەندییان بە هێزەکانی بیانی و پشتبەستن بە دەستە چەکدارەکانی خێڵایەتیان. سەید تەها لە راستیدا بە نوێنەری ئەم جۆرە ناسیونالیزمەیە حسێب دەکرێ و دوای شکانی سمکۆ لە هێزەکانی سەرهەنگ فیلیپۆڤ، لە بەغداوە هات بۆ چەهریق تاکو راپەڕینی تەواو خێلەکییە سەرەکی هۆزی شکاك لەو شێوەیە روالەت سادەیەی ژیانی خێڵایەتی بەدەربهێنێ و لە خزمەت ناسیونالیزمی کوردی بەگەڕ بخا. سەید تەها لەم رێگەیەوە تەنها نەبوو و خێرا نیشتمانپەروەرانی کوردی تورکیە و عێراقیش هاتنە ریزی ئەو. تەقەلاّی سەرەکی ئەم کەسانە بە سیاسی کردنی راپەڕینی سمکۆ بوو و دەزانین لەم رێگەیەوە سەرکەوتنیان وەدەست نەهێنا. نووسەری کتێبی "بزووتنەوەکانی کورد لە دێرزەمانەوە تا ئێستا" لە بارەی کاریگەری سەید تەها و کەسایەتییەکانی کورد لەسەر بیر و هزری سمکۆ دەنووسێ: " سمکۆ بەپێی ئەو هەلومەرجەی کە هاتە ئارا، بە سانایی هەڵوێستی خۆی گۆڕی. دەبێ بگوترێ کە ئەو کەوتە ژێر کاریگەری هەلکەوتەی کۆمەڵایەتی و دەسەلاّتدارێتی هەندێ کەسایەتی بەناوبانگ بە تایبەتی لە ئاراستەکردنی چالاکییە شۆڕشگێڕییەکانی سمکۆ، سەید تەها رۆڵێکی گەورەی بینی کە کەسایەتی دیاری بزووتنەوەی کوردی بوو. سمکۆ لەگەڵ ئەودا لە رادەبەدەر پێوەندی دۆستانەی هەبوو و

دەکەوتە ژێر کاریگەری ئەو لە دروستکردنی بڕوای دامەزراندنی کوردستانی گەورەو سەربەخۆ و ئەم بیرۆکەیە ریشەی داکوتا."[1] ڤان برویەنسن لەو بڕوایەدا کە بەهۆی پێوەندی بە سەید تەها کە دەستڕۆترین کەسایەتی کورد و رابەرێکی ناسیونالیستی بەهێز بوو، بوو بە راوێژکاری سمکۆ لە رووی سیاسییەوە".[2]

سەید تەها هەمیشە بە بیانووی مولکەکانی لە ئێران دەهاتە ئەو دیوی سنوور و بۆیە دەوڵەتی ئێران لە دواییدا دەستی بەسەر مولکەکانی داگرت.[3] تەها دوای وردبوونەوە لە هەموو لایەنەکانی چالاکی سمکۆ و دەرچوونی قەزاقی فیلیپۆڤ لە چەهریق، بە پەلە بەرەو بەغدا گەڕایەوە و چاوی کەوت بە ویلسون کۆمیسەری بەریتانیا لە عێراق و داخوازی کوردەکانی پێراگەیاند. لەم چاوپێکەوتنە دا، چارەنووسی کوردستانی ئێرانیش کەوتە بەر شرۆڤەکردن. رەفیق حلمی داخوازییەکانی سەید تەها لە بەریتانیا بەم جۆرە دەژمێرێ:

١ـ سەقامگیری دەوڵەتی یەکپارچەیی کورد لەژێر چاودێری بەریتانیا بەو مەرجەی کە کوردستانی ئێرانیش بەشێکی بێ.

٢ـ راگەیاندنی لێبوردنی گشتی بە شێوەیەکی فەرمی بۆ ئەوەی هەستی کوردی عێراق بۆ لای خۆیان رابکێشن.

٣ـ سەقامگیری دەوڵەتی کوردی لەسەر بنەمای بەشداری گشت توێژەکان بێ، واتە کۆماری بێ.

٤ـ دڵنیاکردنەوەی کوردان لە لایەن ئینگلیزەکانەوە و نووسینی پەیمانێك لە بابەت ئاسایشی ئەرمەن و ئاشوور و نەبزووتنی ئەوان لە بەرانبەر دەوڵەتی تازە پێگرتووی کوردی.

٥ـ گشت ئەو یارمەتیانەی کە بەریتانیا بە عێراق دەدا، دەبێ بداتە دەوڵەتی کوردیش.[4]

برویەنسن ئاماژە بەم خاڵە دەکا کە ئەو دەمەی دانوستانی ویلسون و سەید تەها لە بەغدا لە گۆڕێ بوو، نامەیەك لە لایەن سمکۆوە بۆ کۆمیسەری بەریتانی هات کە گشت داخوازییەکانی سەید تەهای تێدابوو.

ئاشکرایە کە سمکۆ بەپێی ئیشارەی تەها ئەم کارەی ئەنجام دابوو. ئەو بەر لەمە تەنانەت بایەخی بە کێشەکانی کوردستانی باشوور نەدەدا چ بگا بە بارودۆخی کوردستانی عێراق. کریس کوچێراش لەو بڕوایە دا کە "سمکۆ لەژێر کاریگەری تەها لە ساڵی (١٩١٩) داوای یارمەتی لە بەریتانیا کردووە."[5] وەڵامی کاربەدەستی بەریتانی نێگەتیڤ بوو، چونکە بەریتانیا ئەوکاتی لە هەوڵی ئەوەدابوو کە وا لە

ئێران بکا ڕێککەوتنامەی ١٩١٩ قبوڵ بکا و نەیدەویست بیانگەیەك بداتە دەست تاران. ئامانجی سەید تەها لەم کارانە وەدەستهێنانی دەسکەوتی سیاسی و لەوانەیە چەکداری بوو، بەڵام سمکۆ تەنیا لەبەر ئەوە پێیخۆش بوو لە بەریتانیا خۆی نزیك بکاتەوە بۆ ئەوەی تەمای چەك وەرگرتنی پێیان هەبوو. ئەمە پاڵ پێوەنەری سمکۆ بوو کە هەر لە سەرەتای دەسەڵاتدارێتی مستەفا کەماڵ، خۆی لە کەمالییەکان نزیك کردەوە. برویەنسن بەپێی سەرچاوەی ئەرمەنییەکان دەنووسێ کە " سەید تەها و سمکۆ هاوکات لەگەڵ خۆنزیك کردنەوە لە ئینگلیزەکان، پێوەندییان سازکرد لەگەڵ ناسیونالیستەکانی کەمالی لە شاری (وان) دا و تورکەکان دەیانویست بۆ سەرکوتکردنی ئەرمەنەکان لە ئانادۆڵی ڕۆژهەڵات و ئەگەر پێویست بێ لە شوێنەکانی دیکەش، کەڵکیان لێ وەرگرن.[٦] تەها بێجگە لەم کارانە لە بەستنی فیدراسیونێك لە هۆزە کوردییەکان لەژێر سەرکردایەتی سمکۆ، کاریگەربوو و هۆیەکەشی ئەمە بوو کە دوای هاتنی تەها لە سەرەتادا هۆزی هەرکی، واتە هۆزی ژێر فەرمانی ئەو و دوای سەرکەوتنی سمکۆ لە جەنگی میاندواو بەسەر جەندارمەکان لە ناوەڕاستی هاوینی ١٣٠٠ ك.ش (١٩٢١ ز) هۆزەکانی مامەش، مەنگوڕ، دێبوکری، پیران، زەرزا، گەورك، فەیزوڵلابەگی، پشدەرییەکانی عێراق، بانە و قادرخانی لە ناکاو گشتیان خوازیاری هاتنیان بۆ ناو فیدراسیۆتی سمکۆ بوون و بە کەڵك وەرگرتنی لەم هێزانە بوو کە مەهابادیان داگیرکردو گومان لەمەدا نییە کە تەها ئاغای شکاکی هان داوە بۆ هێرش بۆ سەر مەهاباد، چونکە دوایی هەر ئەو بوو کە داکۆکی کرد لە داگیرکردنی سەقزو ویلایەتی کوردستان.[٧] بە شێوەیەکی گشتی سەید تەها هاندەری سەرەکی هۆزە موکرییەکان بوو لە پێکهێنانی فیدراسیۆتی خێڵەکی لەژێر سەرکردایەتی سمکۆ و لە ڕاستیدا ئەوە بوو کە هێزێکی دە هەزار کەسی لە کوردی بۆ سەرۆکی شکاکەکان ڕێکخست. کارێکی تری سەید تەها لە ئاست هەرچی پتر بە کوردی کردنی ڕاپەڕینی سمکۆ، هەوڵێکی زۆریدا بۆ ئەوەی زمانی کوردی بکرێتە زمانی فەرمی و دەستیان کرد بە چاپکردنی ڕۆژنامە و نووسراوی گومرك بە ڕێنووسی کوردی. محەممەد تەمەدونی نووسەر، بارودۆخی ئێران لە جەنگی یەکەمی جیهانی شی دەکاتەوە کە چۆن ڕۆژێك لە مانگی شەواڵ ١٣٤٠ ك.ق ـ ١٣٠٠ ك.ش (١٩٢١ ز) سید عەبدوڵلاّ لە خزمانی سەید تەها و لە کەسانی تێگەیشتووی سمکۆ هاتە دیدەنی ئەو و گوتی کە سمکۆ دەیەوێ ڕۆژنامەیەکی کوردی بڵاو بکاتەوە، بۆیە پێویستیان بە چاپخانەی ئەو هەیە، کاتێ ئەو دژایەتی کرد، پیاوانی سمکۆ بە زۆردارەکی دەستیان بەسەر چاپخانە داگرت و ناویان لە تەمەدون گۆڕی بۆ(غیرەت).[٨] ئەو ڕۆژنامەیە کە (ڕۆژا کورد و شەوا عەجەم) و سەرنووسەرەکەی مەلا محەممەدی کرجانی زادەبوو، بە دوو زمانی کوردی و فارسی و هەفتانە بڵاو دەبۆوە، بێجگە لەم ڕۆژنامەیە بەڵگەنامەکانی

گومرگیش بە زمانی کوردی بەهۆی لەتیف چاوەش کە لە خزمەتی سەید تەها بوو لەو چاپخانەیە بلاو دەکرایەوە کە لە سەردەمی زالبوونی سمکۆ بەسەر ورمێ، لە بەندەری گلمانخانە و ناوچەکانی دیکەی کوردنشین، رەونەقی هەبوو.(٩)

هەلبەت نووسەر " لە بارەی خەباتی کوردستان" دەیەوێ بسەلمێنێ کە مستەفا پاشا لە ئەندامانی سەرەکی کۆمەلەی عێراق ئەم رۆژنامەیەی لە ورمێ بلاوکردەوە کە رەونەقی ئەوتۆی نەبوو.(١٠) دەبێ بگوترێ سمکۆ لە هاوکاری سەید تەها سوودێکی ئەوتۆی نەبینی و سەید تەهاش نەیتوانی راپەرینی ئەو بە شێوەیەکی تەواو نەتەوەیی لەسەر بنەمای ناسیونالیزمی کوردی دەربهێنێ و تەنانەت لەوپەری هێزو دەسەلاتداری سمکۆش هیچ گۆرانێك بەسەر ناوەرۆکی تەواو خێلایەتی لایەنگرانی راپەرینی ئەو نەهات و ئەم بزاڤە نەیتوانی لە تەواوی ئەو ماوەیەدا لەگەل گوندنشینەکانی دامەزراو، توێژەکانی شارنشین و پیاوانی ئایینی کورد لە بازنەیەکی بەرفرەوان پێوەندی ساز بکا و تەنانەت سەید تەها نەیتوانی رێگە لە سمکۆ بگرێ لە تالانکردنی خەلکی مەهاباد.

# سمكۆ و کوردانی تورکیه و عێراق

لە دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم لە ئێران پێکهاتەی سیاسی کورد لە ئارادانەبوو و دەرکەوتنی سمکۆ وەك هێزێکی چەکدار لە نێو کوردی ئێران زۆر زوو سەرنجی پارت و کۆمەڵە کوردییەکانی عێراق و تورکیای بۆ لای خۆی راکێشا. زۆر زوو هەڵسووڕێنەرانی ئەم پارتانە هەوڵیان دا کە لە سەرەك خێڵی شکاك بۆ بەهێزکردنی ناسیونالیزمی کوردی، سوودوەرگرن و هەوڵ بدەن دروشمەکان بۆ کۆمەڵگەی کوردی ئێران بگوازنەوە و لە کۆتاییدا کۆمەڵەی گەلان ناچار بکەن دان بە مافی کورد بنێ. لەم کاتەدا بەریتانیا، فەرەنسە و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك وڵاتانی سەرکەوتووی شەڕ لە شەڕی گەورە، پێکهێنانی وڵاتی ئەرمەنستان و کوردستانی سەربەخۆ لە رێککەوتنامەی سیڤەر کە عوسمانیش واژۆی کرد، پێشبینی کرابوو و تەنیا چاوەڕوانی چارەسەری کێشەی یۆنانییەکان و کەمالییەکان بوون. تایبەتمەندییەکی گرنگ لە سەرنجدانی کۆمەڵەی تورکیە و کۆمەڵەی عێراق لە ئاست راپەڕینی سمکۆ ئەوەیە کە ئەم رێکخراوە سیاسییە هەریەك بەپێی هەلومەرج و بارودۆخی ناوچەکە چاوەڕوانی هەندێ شتبوون لە ئاغای شکاك کە لە ئەنجامدا هیچ گونجانێك لە نێوان بارودۆخ و چاوەڕوانییەکان لە ئارادانەبوو. بۆ ناسینی ئەم جیاوازیانە دەبێ پێوەندی سمکۆ لەگەڵ هەر کام لەم دووپارتە بە جیاجیا شرۆڤە بکرێ، بەڵام دەبێ بزاندرێ کە ئەندامانی ئەم دووپارتە بە درێژایی ئەم پێوندییە نەیانتوانی لە سەرەك خێڵی شکاك، رابەرێکی شۆڕشگێڕ دروست بکەن یاخود راپەڕینی ئەو لە سیمای خێڵەکی دەربهێنن و بیکەن بە شۆڕشێکی کوردی.

## أ ـ سمکۆ و کۆمەڵەی تورکیە

کۆمەڵەی تورکیە زووتر لە کوردانی عێراق لەگەڵ سمکۆ پێوەندی سیاسیی بەرقەرار کرد و کاری سەرەکی و یەکەمی ئەوان، ناردنی سەید تەها بۆ ئێران بوو و لەوێڕا کە ئەم حیزبە لە نێوان ساڵانی ۱۲۹۷ تا ۱۳۰۲ ك.ش ( ۱۹۲۳ ز) هێشتا بڕوای بە هاوکاریکردن لەگەڵ ئەتاتورك هەبوو، و بە سمکۆی رادەسپارد کە پێوەندی خۆی لەگەڵ تورکەکان موکوم بکا و تەنانەت هەندێ لە لایەنگرانی وەك ئەحمەد تەقی و مەحموود فازیل، نێوان سەرەك هۆزی شکاك و جەنەراڵەکانی تورك کاری پەیامنێریان کرد. لە ئەنجامی کارەکانی سەید تەها، کوردەکان بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سمکۆ، توانیان هەندێ دەسەڵات وەدەست بهێنن، رۆژنامەیەکی کوردی بڵاو بۆوە و دەستەی ژاندارمی کورد و فەرمانڕەوایانی کورد، رێگاویان و شارەکانیان بەڕێوەدەبرد. ئەم گۆڕانکارییانە وەك گرنگترین کاریگەرییەکانی کۆمەڵەی

تورکیه له راپەڕینی سمکۆ دەژمێردرێ. له ئان و ساتی وتووێژی سمکۆ لەگەڵ ئینگلیزەکان له کۆتایی ساڵی ۱۹۲۲ز ئەحمەد تەقی له تورکیه بوو و لەگەڵ ئەندامانی کارامەی کۆمەڵەی کورد وەك جەنەڕاڵ خالیدبەگی جبرانلی، یوسف زیا بەگ یوزباشی عەلی یاوەر و رابەرانی تری ئەو رێکخراوه له ترابوزان دیداریان کرد ئەوان له ریگەی تەقی نامەیەکیان بۆ سمکۆ نارد که تێیدا داوایان لێکردبوو که هاوکاریان لەگەڵ تورکان زێده بکەن و هەوڵ بدەن لەگەڵ سۆڤیەتییەکان پێوەندی ساز بکەن.[11] هەموو ئەم کارانه بۆ ئەوەی بوو که سمکۆ له بەریتانیا نزیك نەبێتەوەو داوای یارمەتی کردن له سۆڤیەتییەکانی هیچ مەترسییەکی بۆ تورکیا نەبوو، چونکه لەو کاتی پشتیوانییان له مستەفا کەماڵ دەکرد. بەهەرحاڵ ئەحمەد تەقی به فەرمانی سمکۆ لەگەڵ کۆنسولی سۆڤیەت له شاری ورمێ دیداریان کرد و دوو ویستی سەرەکی ئاغای کوردیان به کۆنسول راگەیاند که بریتی بوو له ناردنی یارمەتییه خێراکان بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی له دەست چوویان له ناوچەی ژێر دەستڕۆیی پێشوی و داننانی سۆڤیەت به سمکۆ وەك نوێنەری هەموو کوردان.[12] بەڵام کۆنسول وەڵامی ئەحمەد تەقی دواخست بۆ دوای ئاخافتنی لەگەڵ مۆسکۆ و داوای حەفتەیەك مۆڵەتی کرد. دوای تێپەڕینی ئەم کاته دیاریکراوه، کۆنسول وەڵامی دایەوه که " مۆسکۆ له توانایدا نییه یەکەم داخوازی سمکۆ بهێنێته دی. ئێمه رووسەکان لەبەر ئەوەی کوردمان خۆش دەوێ نامانەوێ فێڵیان لێ بکەین و بەڵێنی یارمەتیان پێ بدەین، بۆیه ئەم داخوازییه رەت دەکەینەوه، بەڵام دوور نییه له ئاینده رەزامەند بین ، بەڵام سەبارەت له داخوازی دووەمی سمکۆ لەوانەیه بتوانین یارمەتی پێ بگەیەنین. ئیسماعیل ئاغا دەبێ لەمەودوا بەردەوام پێوەندی لەگەڵمان هەبێ تا له بارودۆخ ئاگاداری بکەینەوه".[13]

سمکۆ داوای له رووسەکان کردبوو تا یارمەتی بدەن له گەڕاندنەوەو سەقامگیری دەسەڵاتی له ناوچەی باکوری کوردستان و هیچ قسەیەکی سەبارەت به سەربەخۆیی کوردستان نەکردبوو، ئەوه هەمان شت بوو که ئەو داوای له ئینگلیزەکان و تورکەکان کردبوو. کۆمەڵەی تورکیه، جارێکی تر له ساڵی (۱۹۲۰) هەوڵیان دابوو تا سمکۆ هان بدەن بۆ هاوکاری لەگەڵ راپەڕیوانی دەوروبەری رەواندز، ئەو ساڵی هۆزەکانی زێبازی، بارزانی و شێخەکانی بجیل چەند کاربەدەستێکی سیاسی بەریتانیان له رەواندز کوشت و دەوڵەتی بەریتانیاش چەکدارانی ئاسووری نارده سەریان و له ئەنجامدا سەرەك هۆزەکان بڕیاریان دا، داوا له سمکۆ و مستەفا کەماڵ بکەن که یارمەتیان بدەن. سمکۆ له وەڵامی راشکاویدا پێی راگەیاندن که ئەو توانایی بەشداریکردنی له راپەڕینی رەواندز نییه و داوای لێکردن که بێنه ئێران و لێره راپەڕینێك ساز و تەیار بکەن که هەڵبەت رازی نەبوون.[14]

پێوەندی لە نێوان سمکۆ و ڕاپەڕیوانی، ئەحمەد تەقی و لە ڕاستیدا کۆمەڵەی تورکیەو بوو، بەڵام سمکۆ هیچ حەزی نەدەکرد کە لە ئێران دەربچێ و لە دەرەوەی ناوچەکەی خۆی چالاکی بنوێنێ. سەرەنجام دوا کار و جموجۆڵی سیاسی کۆمەڵەی تورکیە، قەناعەت هێنان بە سمکۆ بوو بۆ ئەوەی هاوکاری مستەفا کەماڵ بکا و لە لایەکی تر سوود لە دەستڕۆیی سمکۆ وەربگرن بەو مانایە کە نەهێڵێ شێخ مەحموودی بەرزنجی لە بەریتانیا نزیك ببێتەوە. ڕەفیق حلمی و ئەحمەد تەقی هەردووکیان ئاماژە بەم ڕاستییە دەکەن کە شێخ مەحموود لە سەرەتای ساڵی (١٩٢٣) دوای پێداگرتنی سمکۆ، شاندێکی لە ڕێگەی ئێرانەوە بۆ تورکیە نارد بۆ ئەوەی لەگەڵ مستەفا کەماڵ وتووێژ بکەن کە بێ ئەنجام گەڕانەوە سلێمانی و پاش ماوەیەکی کورت دوای ئەم ڕووداوە، تورکیە و بەریتانیا لەسەر موسڵ ڕێککەوتن.(١٥)

لە ئەنجامی ئەم ڕێککەوتنە، هەوڵ و تەقەلای تورکیە بۆ ئەنجامدانی ڕاپەڕینێك لەناو خاکی ئێران بە یارمەتی کەمالییەکان، پووچەڵ بۆوە و سمکۆ لەڕووی سیاسییەوە بوو بە کارتێکی سووتاو کە ئیتر هەرگیز نەیتوانی هەلکەوتی پێشتری وەدەست بهێنێ. لەوانەیە دوای ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران لە ساڵی (١٩٢٥) تەنانەت بەر لەوەش کۆمەڵەی تورکیە گەیشتە ئەم ئەنجامە کە مستەفا کەماڵ و کەمالیە شۆڤینیەکانی تورك هیچ جۆرە هاریکارییەکی کورد ناکەن، و لەو ساوە سمکۆ کەوتە ژێر چاودێری دەوڵەتی تورکیە و بڕەبڕە، ناوە ناوە تا ساڵی ١٩٣٠ وەك ئامرازێکی سادە لە دەست سوپای تورکیا لە مشتومڕی سنووری ئێران و تورکیە سوودی لێ وەردەگیرا .

## ب ـ سمکۆ و پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵەی عێراق و شێخ محموودی بەرزنجی

بەڵام پێوەندی سمکۆ بە کۆمەڵەی عێراقەوە، هێندە بە بەرهەم نەبوو و لە بنەڕەتدا هیچ ئەنجامێکی نەبوو، هۆکارەکەشی ئاشکرایە، ئەگەر سمکۆ زیاد لە ڕادە لە نیشتمانپەروەرانی کوردی عێراق نزیك دەبۆوە ئیتر نەیدەتوانی چاوەڕوانی یارمەتی لە دەوڵەتی تورکیە بێ، چونکە کۆمەڵەی عێراق خوازیاری دەسپێکی بزووتنەوەی کورد بوو لە خاکی تورکیە و مستەفا کەمالی بە گەورەترین دوژمنی نەتەوەی کورد دەزانی. کرێس کوچێرا ئاماژە بە وتووێژی نێوان سمکۆ و مستەفا پاشا نوێنەری کۆمەڵەی عێراق لە کۆتایی ساڵی ١٩٢١ دەکا کە تێیدا کوردی عێراق لە ئاغای شکاکی پرسیبوو کە: " ...بۆچی لە جیاتی شەڕ لەگەڵ ئێران ناڕوا یارمەتی کوردانی وان و ئەرزەڕۆم و هەکاری و خەرپوت بدا کە لەئەنجامی سەرکوتی مستەفا کەماڵ لە ژێر ئەشکەنجەدان؟ و سمکۆ وەڵامی دایەوە کە نایەوێ بە ئێجگاری پێوەندی لەگەڵ تورکان بپچڕێنێ، چونکە چەکی دەدەنێ".(١٦)

(ڕەفیق حیلمی)ش هۆی دانیشتنی دووەمی مستەفا پاشا و سمکۆ لە ساڵی (١٩٢٢) ئاوا باس دەکا: " مستەفا پاشا بۆ ئەوەی چوو بوو کە سمکۆ ببینێ لەسەر سنووری ئێران و تورکیە بەڵکو هانی بدا کە واز لە ئێران بهێنێ و ئاگری ڕاپەڕین لە تورکیە هەڵایسێنێ."(١٧) هەروەها دەڵێ کە تورکەکان ئاگاداری ڕادەی دوژمنایەتی کۆمەڵەی عێراق بوون بە تایبەتی مستەفا پاشا لەگەڵ مستەفا کەمال و لە ترسی ڕاکێشانی سمکۆ بۆ لای خۆیان (کۆمەڵە) بە شەو، هێرشیان بردە سەر، لەسەر سنوور و کوڕەکەیان بە دیل گرت.(١٨) لە ساڵی ١٣٠١ ک.ش ( ١٩٢٢ ز) شێخ مەحموود هێشتا بڕیارێکی ڕاشکاوی نەدابوو کە بچێتە لای بەریتانیا (واتە ئەو شتەی کە کۆمەڵەی عێراقی لێی دەویست) یا بە یەکگرتنی لەگەڵ تورکیا و مستەفا کەماڵ (واتە ئەوەی کە کۆمەڵەی تورکیا لێی دەویست) کۆمەڵەی عێراق چاوەڕێ بوو کە سمکۆ شێخ، ناچار بکا بۆ ئەوەی لەگەڵ بەریتانیا یەك بگرێ. سمکۆ لە ساڵی (١٩٢٢) هاتە ناو شاری سلێمانی و وەك قارەمانێك پێشوازیان لێ کرد. ڕەفیق حلمی لە بارەی کاریگەری گەشتی سەرۆك نووسیویەتی: " ناو و ناوبانگی سمکۆ و چیرۆکی دلێری و قارەمانییەکانی ئەو کوردە ناودارە ماوەیەك بوو گەیشتبووە کوردستانی عێراق و لەم ڕووەوە هاتنی ئەو بۆ سلێمانی بە مانای چارەسەری کێشەی کورد بوو و هیوای نیشتمانپەروەرانی سەرلەنوێ زیندوو کردەوە. ئیسماعیل ئاغا سەرۆکی هۆزی شکاك لە ناو دڵی هەر تاکێکی کورد جێگەیەکی بەرزی هەبوو و قارەمانی نەتەوەیی بوو".(١٩)

بەبۆنەی هاتنی ئەو، چەند گوللە تۆپ هاویشترا و لەبەر دەمی هێزی شێخ مەحموود تێپەڕی. نزیك بوونەوەی سەرەك خێڵی شکاك بۆ لای کوردی عێراق بە پێچەوانەی بۆچوونی کۆچێرا لەبەر داواکاری یارمەتی نەبوو، چونکە هەر لە سەرەتاوە ئەو نەیدەویست خۆی لە کاروباری کوردی عێراق و تورکیە وەربدا و هەر لە سەرەتای کار ئاشکرا بوو کە هەنگاوێك بە پێچەوانەی بەرژەوەندی ئەو لەبەر خاتری پاراستنی گیانی کوڕەکەشی بێ، لە دژی تورکان هەڵناگرێ کۆمەڵەی عێراق لەوکاتی دژی ڕووبەڕووبوونەوەی کورد بوو لەگەڵ ئێرانداو لەو بڕوایە دابوو کە دوژمنی سەرەکی کوردان، عەرەب و تورکن. لەم ڕووەوە دەیویست بە یارمەتی و پشتیوانی بەریتانیا وڵاتێکی سەربەخۆیی کوردی لە ناوچەکانی کوردنشینی تورکیە و عێراق دابمەزرێنێ. ڕەفیق حلمی کاردانەوەی ئەندامانی کۆمەڵەی لە ئاست هاتنی سمکۆ بۆ ناو سلێمانی ئەم جۆرە وێنا دەکا:" هاتنی سمکۆ بۆ سلێمانی لەبەرچاوی نەتەوەییەکانی کورد بە مانای کۆتایی گیروگرفت و گومان بوو لە کێشەی کورد و دەیتوانی شێخ مەحموودی لە دوڕیانی کە تێی کەوتبوو، ڕزگار بکا. مستەفا پاشا لە هەمووان زیاتر خۆشحاڵ بوو. ئەو وای بۆ دەچوو کە سمکۆ قەناعەت بە شێخ مەحموود دەهێنێ سەبارەت بە ئامانجەکانی و سیاسەتی

بەریتانیا بەرەو پێشەوە دەچێ و ئینجا بەر لە هەر شتێ، تورك لە رەواندز دەردەکرێن و شەپۆلی خەبات و شۆڕش دەگاتە کوردستانی تورکیە، بە کورتی ئەو بۆ شکانی پشتی ئەتاتورك لە تەقەلا دابوو". [٢٠]

بەڵام هەموو ئەو ئاواتانەی مایە پووچ بوو، چونکە مانەوەی یەك مانگ و نیوەی سمکۆ، وای لێکرد کە پتر لە جاران لە ئاست کۆمەڵەی عێراق، شێخ مەحموود و بەریتانیا رەشبین ببێ. بێگومان سمکۆ نەیدەویست لەژێر دەسەڵاتی شێخ بێ، چونکە ئەو وەك نوێنەری سیستمی خێڵەکی لەگەڵ شێخ کە نوێنەری زەویداری شارنشین بوو، نەدەگونجا، لەگەڵ ئەوەی کە رەفیق حلمی هەوڵی ئەوەی دەدا کە نەگونجانی نێوان سمکۆ و شێخ کەمالّ نیشان بدا بەهۆی وەبیرهێنانەوەی یارمەتییەکانی ئاغای شکاك بە بنەماڵەی شێخ لە کاتی گرتن و دوورخستنەوەی. لە عێراق لە ساڵی (١٩١٩) لە لایەن ئینگلیزەکانەوە، بەڵام نەگەیشتن بە هیچ رێککەوتنێك لە لایەن هەردووکیان، بەسە بۆ ئەوەی تێ بگەین کە جیاوازی و ناکۆکیان هەیە لە جۆری بیرکردنەوەدا. [٢١]

ئەدمۆندز ئەمەی دەرك پێ کردبوو کە یەککرتن لەنێوان سەید تەها و سمکۆ لەگەڵ شێخ مەحموود مەحاڵە و ئەم هەوڵە شکست دەهێنێ، کۆچێرا بە دوور نازانێ کە ئاغای شکاك لە دژی بیرۆکەی دروست کردنی دەوڵەتی کوردستانی گەورە بووبێ، کە خودی خۆی سەرۆکی نەبێ. [٢٢] جگە لەمە (عەبدوڵڵا ئەحمەد رەسوڵ پشدەری) شیکردۆتەوە کە سمکۆ دوای جودایی لە شێخ مەحموود بە ئاغای پشدەری گوتبوو کە " شێخ مەحموود بە کەلکی رابەرایەتی کوردان نایەت، بیروڕای نەگۆری نییە، هەر دەمەی لەسەر رایەکە و نازانێ دەبێ چی بکا؟". [٢٣] بەم شێوەیە سمکۆ سەلماندی کە هیچ خاڵێکی هاوبەشی لە نێوان ئەو و کوردی عێراق و شێخ مەحموود نییە و مەودای ئەو و ئامانجەکانی ئەوان فرە زیادە. هەر بۆیە مستەفا پاشا لە نامەیەك بۆ کوڕەکەی لە بارەی سمکۆ نووسیویەتی کە: " سمکۆ پیاوێکی نەزانە، ئەو لەگەڵ ناسیونالیستانی کەمالی چاك دەسازێ، چونکە چەکی پێ دەدەن". [٢٤] ئەم رووداوانە ئەمە نیشان دەدان کە سمکۆ بەهیچ شێوەیەك ئەو کوردە نەتەوەییە نییە کە بەدوای خودموختاری یان سەربەخۆیی کوردستانەوە بێ. پێوەندی بەردەوامی نەتەوەییەکانی کورد لە دەرەوەی ئێران لەگەڵ سمکۆدا نەیتوانی راپەڕینی ئەو لە شێوازی خێلایەتی دەربکا و گوندی و شارنشینانی کورد لە پارێزگای کوردستان و بەشی کوردنشینی ئازەربایجان بۆ لای خۆی رابکێشێ و تەنانەت پڕۆپاگەندەچیانی پارتە کوردییەکان لەوبەری سنوور نەیانتوانی رۆشنبیرەکان و پیاوانی ئایینی کوردی ئێران هان بدەن هاوکاری ئاغای شکاك بکەن. هەروەها ئەم هاوکارییە نەیتوانی راپەڕینی شکاکەکان بەرەو بەشەکانی باشووری تری کوردستان و بە لایەنی کەمی بخزێنێتە نێو هۆزەکانی ئەو دەڤەرە. هەروەها سەرەڕای کۆششی بەربڵاوی چالاکانەی ئەم پارتانە، سمکۆ هەرگیز پێی خۆش نەبوو لە تەك ئەوان و لە دەرەوەی ئێران چالاکی بنوێنێ و هەمیشە

هەوڵی دەدا لە ناو ئێران سوودیان لێ وەربگرێ. بە شێوەیەکی گشتی دەبێ بگوترێ کە کوردی تورکیە و عێراق نەیانتوانی بۆ سمکۆ پێکهاتەیەکی سیاسی ساز بکەن و لە بنەڕەتدا هەوڵی ئەوان بۆ سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی کورد لە ئێران بێ ئاکام بوو، ئەویش لە سەردەمێك کە وڵاتەکەمان هیچ توانایەکی سیاسی و سوپایی پێویستی بۆ پاراستنی تەواوەتیی خاکی خۆی نەبوو.

# پەیوەندی سمکۆ لەگەڵ ئینگلیزەکان

ویلایەتی ئازەربایجان دوای ڕێکەوتنامەی تورکمەنچای هێدی هێدی بوو بە مەیدانی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری ڕووسیەی قەیسەری و ماوەیەکی کەم دوای کۆتایی هاتن بە شەڕە ناوخۆییەکانی سەرچاوە گرتوو لە شۆڕشی مەشروتە (دەستووری) دەرکەوتنی سەربازی ڕووسەکان وردەوردە لە تەوریز و ناوچەکانی دیکەی ئازەربایجان، ڕەهەندەکانی ئەو دەسەڵاتەی زیاتر پەرەپێدا. بەڵام بەریتانیاش بەلەبەرچاو گرتنی بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری خۆی کەم تا زۆر هەوڵی دەدا دەست لە کاروباری ئازەربایجان وەربدا و پێشتریش بینیمان کە دیپلۆماتەکانی بەریتانیا چ ڕۆڵێکیان لە شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلاّدا گێڕا.

نێردراوان و دیپلۆماتەکانی بەریتانیایی، تەنانەت دوای ڕێکەوتنامەی ئینگلیزی و ڕووسی بۆ دابەشکردنی ئێران بۆ دوو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان لە ساڵی (١٩٠٧) داو بەدەست هێنانی سەرمایە و داهات و هەروەها بەدەست هێنانی زانیاری لە ئازەربایجان و درزکردنە ناو هۆزو عەشیرەکانی ئەو ناوچەیە بۆ لای خۆیان هەر بەردەوام بوون.

لازاریف بەپشتبەستن بە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیەی قەیسەری، باس لە هەوڵی بەردەوامی باڵوێزەکانی ئینگلیزی دەکا. لە ناوچە کوردنشینەکانی عوسمانی و ئازەربایجانی ئێران بۆ ڕاکێشانی سەرۆکە کوردەکانی ئەو ناوچانە لەسەر بنەمای ڕاپۆرتی دیپلۆماتەکانی (ڕووس) دا نیشان دەدا کە چۆن نێردراوەکانی ئینگلیز، کە زۆربەیان لە ئەفسەرانی سوپایی ئینگلیزی بوون، بەردەوام پارەیەکی زۆریان بۆ کارتێکردن لە سەرۆکە کوردەکان خەرج دەکرد.

ئینگلیزەکان جیا لە نێردراوە سیاسییەکانیان، هەموو کات بە کەڵك وەرگرتن لە سیخور و قەشە موژدەدەرەکان و بازرگانە ئینگیزی و تا ڕادەیەکیش ئەمریکییەکان، بە شێوەیەکی ڕێکخراو و ئامانجدار بۆ پەرەپێدانی دەسەڵات و زاڵبوونی سیاسی و ئابووری خۆیان و گورز وەشاندن لە بەرژەوەندییەکانی ڕووسیە لە ئازەربایجاندا هەوڵیان دەدا.

دوای شۆڕشی (١٩١٧)ی ڕووسیا و نەمانی ئەو دەوڵەتە لەسەر شانۆی سیاسی ئێران، دەوڵەتی بەریتانیا زیاتر لە هەموو کاتێکی دیکە دەستی خۆی بۆ دەست تێوەردان لە ناوچە کوردنشینەکان ئاوەڵا دی، ئەوڕۆکە هەموو مێژوونووس و لێکۆڵەرەوەکانی کێشەی ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاست و کوردەکان لەو خاڵەدا یەك دەگرنەوە، کە لانی کەم یەکێك لە هۆیەکانی دژایەتی بەریتانیا لەگەڵ ئۆتۆنۆمی و سەربەخۆیی کوردستانی عێراق، ئەوە بوو کە نەیدەویست یەکگرتوویی هەرێمایەتی وڵاتەکانی ئێران و تورکیە لە لایەن شۆڕشی بەلشەڤیکی یەکیەتی سۆڤیەتەوە بکەوێتە مەترسییەوە، بە تایبەت لەو سەردەمانەی کە بەریتانیا لەو وڵاتانەدا بەرژەوەندی ئابووری و سیاسی بەرچاوی هەبوو جیا لەوانە کە پێشبینی ڕۆڵی بەرچاوی بۆ ئەو دوو وڵاتە کردبوو لە ناوچەکانی رۆژئاوادا کە پشتێنێکی ئەمنی بەدەوری یەکیەتی سۆڤیەتدا بکێشێ.

بەریتانیا لە کاردانەوەی بۆ ویستەکانی سمکۆ کە خوازیاری پشتیوانی هەمە لایەنەی بەریتانیا لە بەرانبەر ئێران دابوو بەو شێوەیە وەڵامی سەید تەها دەداتەوە کە "هەرچەندە دەوڵەتی ئێران هیچ کات حوکم و دەسەڵاتی کاریگەری بەسەر کوردستانی"ئێران" دا بەکار نەهێناوە، بەڵام جیابوونەوەی ئەو ناوچەیە لە ئێران بێشك هەرایەکی گەورە لە تاراندا دروست دەکا و بۆ دەست پێکردنی "سەردەمێکی" نوێ کەوا چاوەڕوان دەکرێ بە ڕێکەوتنامەی بەریتانیا و ئێران دەست پێ بکا سەرەتایەکی باش نابێ".[١]

سمکۆ لە ساڵەکانی (١٩١٩هەتا ١٩٢١ ز/ ١٢٩٧ تا ١٢٩٩ ك. ش) پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ نێردراوەکانی بەریتانیا لە ناوچەکەدا هەبوو کە واسیتەکانی ئەو لەگەڵ ئەوان (بەریتانیا) دا بە زۆری بابەکر ئاغای پشدەری یەکێك لە سەرۆکە دەسەڵاتدارەکانی عەشیرەتی پشدەر و مستەفا پاشا یەکێك لە بەرپرسەکانی کۆمەڵەی عێراق بوو.

سمکۆ بەر لە گرتنی مەهاباد هەوڵی دەدا پشتیوانی سیاسی و دارایی بەریتانیا وەدەست بهێنێ. کاپیتان کێرت باڵوێزی بەریتانیا لە تەورێز ڕۆڵی کاریگەری هەبوو لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٩٨ ه، ١٩٢٠ ز و لەسەرکار لابردنی زیا ئەلدەولە ئەلبەرزی و هەر ئەویش بوو لەگەڵ سەردار فاتح و (٢٠٠ )سەربازی هیندی چوونە ناو شاری ورمێ و پێش چوونە ناو شاریش دانوستانیان لەگەڵ سمکۆ کرد. هەروەها لە کاتی دەست بەسەرداگرتنی ورمێ و ناوچەکانی دەوروبەری لە لایەن سمکۆ کە لەو کاتدا زۆربەی مەشروتەخوازە کۆنەکانی وەك سوڵتان ئەسەد ئاغاخان فشەنگچی و کازم خان بە پێك چەندین بەربەست و قایمکاریان لە نزیك دەریاچەی ورمێ کردبوو بۆ ئەوەی بەندەرەکانی گلماتخانەو شەرەفخانە بپارێزن و پێش لە پێشڕەوی عەشیرەتە کوردەکان بۆ لای ڕۆژهەڵات بگرن، لەو کاتدا دیپلۆماتی ئینگلیزی لە ناوچەکەدا بوو

و لە لایەك خۆبەختكەرانی هان دەدا كە لە بەرانبەر خانی شكاك دا خۆبەدەستەوە بدەن و سەنگەرەكانیان چۆڵ بكەن و هەروەها هەڕەشەشی لێ دەكردن !. [٢]

كەسرەوی لە كاتی باسكردن لە رووداوەكانی پەیوەندیدار بە شۆڕشی سمكۆ، راستەوخۆ باس لە ئینگلیزەكان ناكا، بەڵام لە دوورەوە دەست بۆ دەست تێوەردانی دراوسێ بەهێزەكانی ئێران لەو كێشەیەدا درێژ دەكا و شتێكی سروشتییە كە لەو كاتدا بەهۆی نەمانی رووسیە لەسەر شانۆی سیاسی ئێراندا، بە پلەی یەكەم بەریتانیا و پاشان عوسمانی رۆڵی بەرچاویان لە هاندانی سمكۆدا هەبووە، بەڵام (محەممەد تەمەدون) كە بۆ خۆی ئەو رووداوانەی بینیوە كە لە كاتی یاخیبوونی عەشیرەتە كوردەكان روویانداوە، بە بەردەوامی باس لە دەست تێوەردان و چالاكی نێردراوانی بەریتانیا لەو كێشانەدا دەكا و لەسەر ئەو بڕوایەشە كە هەر بەپێ داگرتن و گوشار خستنە سەری ئەو كەسانە بووە كە ئەحمەد شای قاجار نازناوی سەرداری نوسرەتی لە ساڵی (١٢٩٨) (١٩١٩ز) بە سمكۆ بەخشیوە. [٣] لەگەڵ یەك قەبزە شمشێری جەواهیر نیشانیشی بۆ ناردووە.

جیا لە كەسرەوی، تیمسار حەسەن ئەرفەع كە لە كۆتایی ساڵی (١٢٩٩) (١٩٢٠ز) لە شەڕی دژ بە كوردەكاندا بەشداری كردبوو، بە هیچ شێوەیەك باس لە هەڵسوكەوتی نێردراوە بەریتانیاییەكان ناكا، بەڵام سەرگورد (عقید)مەلەك زادە كە فەرماندەی هێزەكانی دەوڵەتی لە شەڕی مەهاباد دا لە ئەستۆ بوو لە بیرەوەرییەكانی خۆیدا باس لە گیرانی دوو هیندی دەكا كە لە پێكدادانە سەرەتاییەكان لەگەڵ سەید تەها دا رووی داوە كە "بەهەرحاڵ دوای ئەو لێكۆڵینەوەیەی كە لەگەل ئەوان (هیندییەكان) كرا، نامەیەك لە جلیقەی یەكێك لە ئەواندا دۆزرایەوە. ئەو نامەیە لە لایەن حاكمی سەربازی (بەرپرسی سەربازی) ئینگلیز لە موسڵ، بۆ سەید تەها نووسراوە كە تێیدا باس لە جل و بەرگی یۆنیفۆرمی سەربازی و تەقەمەنی دەكا، بە بەدەست هێنانی ئەو نامەیە پەردە لەسەر فیت و كەڵەكی ئینگلیز هەڵدرایەوە ".... ناچاربووم كە دەوڵەتی ئێران و فەرماندەی گشتی هێزەكان لەو كارە گرینگە ئاگادار بكەمەوە، هەروەها ئاگاداری دەرەنجامی خراپی ئەو كارەش بووم، هەر بۆیە بۆ خۆم ناوەڕۆكی نامەكەم بە شێوەیەكی رەمزی (هێما) بۆ تاران و تەورێز نارد". [٤]

دەربڕینەكانی مەلەك زادە لە لایەن (موخبیر ئەلسەڵتەنە) پەسەندكراوەو ئەو لە(خاتیرات و خەتەرات)دا ئاماژە بە پەیوەندی نهێنی سمكۆ لەگەڵ بەریتانیا دەكا و هەروەها دەنووسێت :

(سمكۆ) لەگەڵ ئینگلیزەکان پەیوەندی هەبوو، سەید تەها وەزیرو راوێژکاری سمکۆ بە فەردە تووتنی بۆ باڵوێزی بەریتانیا لە تەورێز دەنارد[٥].

دوای داگیرکردنی مەهاباد لە ساڵی (١٣٠٠)دا ١٩٢١، دەسەڵاتی سمکۆ گەیشتە بەرزترین رادەو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیشی یەك لەسەر سێی ویلایەتی کوردستان و سەرانسەری ناوچەکانی رۆژئاواو باشووری ورمێی دەگرتەوەو تورکەکانیش بەشێکی سەرەکی لە چەك و تەقەمەنی ئەویان لەو کاتیدا دابین دەکردو بەریتانیاکانیش لە لایەنی داراییەوە پشتیوانیان لێ دەکرد پاش تێك شکانی مەهاباد، سەردەشتیش کەوتە مەترسییەوە هەر بۆیە بەرپرسی گومرگی ئەوێ میرزاخودادادخان کە دیتی بەربەرەکانی لە شارەکە چی وای نەماوە تێك بشکێ هەموو کەلوپەلەکان و ئارشیفی دایرەی گومرگی دایە دەست سەرۆکی عەشایری ناوچەی سەردەشت و رەبەت و پاشان خۆی چوو بۆ سلێمانی و لەوێڕا چوو بۆ باڵوێزخانەی ئێران لە بەغدا، باڵوێزی ئێران لە بەغدا بەپێی زانیارییەکانی میرزاخودادادخان و لە زمانی ئەوەوە بەو شێوەیە وەزارەتی دەرەوەی (ئێران ) ئاگادار دەکاتەوە.

" هەروەها دەیگوت کە بێگومان دەوڵەتی خاوەن شکۆی (بەریتانیا) لەگەڵ ئیسماعیل ئاغادا هاموشۆی هەیە، چونکە ئێمە هەموو رۆژێ شاهیدی پەیام گۆڕینەوە بووین لە نێوانیاندا. کە پارەیان پێ دەدان هەروەها ئەکبەر ئاغای کورد کاربەدەستی سیاسی دەوڵەتی خاوەن شکۆیە لە سلێمانی، ئەو خەریکی راهێنانی پشدەرییەکانە، ئەو هاموشۆ و پەیوەندی لەگەڵ هەموو کوردەکان هەیە و رایان دەهێنێ و هەروەها لە بابەت دەستدرێژی کردنی پشدەرییەکان راستییەکەی ئەوەیە کە ئاغایان دەستیان لەو کارەدا هەیە.[٦]

کۆچێرا (کریس) لەسەر ئەو باوەڕەیە کە هەوڵی سمکۆ بۆ خۆ نزیککردنەوە لە بەریتانیا لە ترسی هاتنە سەرکاری کەسێکی بەهێزی وەك رەزاخان لە شانۆی سیاسی ئێراندا و هەروەها بەدەست هێنانی چەك و تەقەمەنی بووە.[٧] بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە سمکۆ ئەو تەقەمەنیانەی کە پێویستی پێی بوایە لە رێگەی تورکەکانەوە دابینی دەکرد و هیچ باکێکی بە رەزاخان نەبوو، ئەوەی کە سمکۆی لە بەریتانیا نزیك دەکردەوە پێویستی بە داننانی بەریتانیا بوو بۆ دەسەڵاتە سیاسییەکەی لە چوارچێوەی ئێراندا، شتێك کە بە ئەنجام گەیاندنی ئەو کارە لە توانایی تورکەکاندا نەبوو و هەر بۆیە نابێ وابیر بکرێتەوە کە ئەو بەدوای پێکهێنانی کوردستانێکی گەورەدا بوو کە پێویستی بە ناساندن و دانپیانانی بەریتانیا بوو بۆ ئەو کارانەی. لە لایەکی دیکە بەریتانیا هێشتا هەتا هێنانە سەر دەسەڵاتی رەزاخان مەودایەکی زۆری لەپێش بوو و بە

هاندانی سمکۆ هەوڵی دەدا کە ئیمتیاز لە ئەنجوومەنی ئازادیخوازانی ئێران و تەنانەت شەخسی ڕەزاشاش وەربگرێ. یەکێك لە هەوڵەکانی بەریتانیا لاوازکردنی سیستمی ئیداری ئێران لە ناوچە داگیرکراوەکانی ژێر دەستی سمکۆ بوو بۆ نموونە بالۆێزخانەی بەریتانیا لە تەورێز داوای لە سمکۆ کرد کە "سەرپەرشتی لایەنگرانی بەریتانیا، لە شارەکانی خۆی و ورمێ و شاهپور وەئەستۆی خۆی بگرێ". (٨)

دەرەنجام دوای ئەوەی دەوڵەتی بەریتانیا لە هاوکاری ڕەزاخان و دەست و پەیوەندییەکانی لەگەڵ خۆیان دڵنیابوو و دوای ئەوەی کە جووڵانەوەکانی جەنگەڵ، خوراسان و خیابانی بە ئاماژەی کاربەدەستانی بەریتانیا و بەهۆی قەزاقەکانی ژێر فەرمانی ڕەزاخان سەرکوتکران نۆبەی سمکۆش هات. لە کاتێکدا کە لە ڕاپەڕینی جەنگەڵدا سەرهەنگ ئیسمایس و ئەفسەرانی دیکەی بەریتانیا ڕاستەوخۆ لە شەڕی دژی میرزا کوچك خاندا بەشدارییان دەکرد (٩)، چ هۆکارێکی دیکە لە گۆڕی دابوو کە کاربەدەستانی بەریتانیا هێشتاش یارمەتی بە سمکۆ بگەیەنن؟ لەگەڵ کام لۆژیك دەیخوێنێتەوە ئەگەر بزانین کە بەریتانیا لە لایەك بۆ بەهێزکردن و جێگیرکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندی هەوڵی دەداو لە لایەکی دیکە لە زۆربەی ناوچەکانی دیکە هانی بیرۆکەی جوداخوازی دەداو بە ئەنقەست هەوڵی لاوازکردنی دەوڵەتی ناوەندی دەدا؟ ئایا بەریتانیاکان لەوە دەترسان کە بزووتنەوە ئازادیخوازەکانی جەنگەڵ و خوراسانی و خیابانی بە ئامانجەکانی خۆیان بگەن و حکوومەتێکی نەتەوەیی میللی بهێننە سەرکار، یان ترسی لەوە هەبوو کە ئەو ڕاپەڕینانە بوار بۆ دەستتێوەردانی بەلشەڤییەکان پێك بهێنن کە ئەوە وای لێ کردن کاردانەوەی جیدی و بەپەلەیان لە بەرانبەر ئەو ڕلپەڕینانەدا هەبێ؟ ئەوەی ڕاستییەکی قەبووڵ کراو، کە بێدەنگ کردنی ئاوازەکانی ئازادیخوازانەی سەردەمداری ئەو ڕاپەڕینانە بۆ بەریتانیا گرنگییەکی زۆری هەبوو و کۆتایی هێنان بەو کارانە لە لایەن نێردراوانی بەریتانیا لە ناوچەکەدا لە سەرووی هەموو کارێك بوو و سمکۆ دەیتوانی لە کاتی پێشڕەوی بەلشەڤییەکان دیوارێك لە ڕۆژهەڵاتی عێراق دروست بکا و پێش لە مەترسی دەرکەوتنی سەرچاوەکانی نەوتی کەرکووك بگرێ و جیا لەوە ئەگەر دەوڵەتێکی سەربەخۆ و میللی لە ئێراندا هاتبایە سەرکار ئەوا بەریتانیا بە سانایی دەیتوانی بە پەرەپێدانی یارمەتییەکانی خۆی بۆ سمکۆ، عەشایری لوڕو بەختیاری و شێخ خەزعەل بەربەستی جیدی لەسەر ڕێگای گەشەکردنی ئەو دەوڵەتە گریمانییە پێك بهێنێ و پێویست بە گوتن ناکا کە پێکهێنانی پەیوەندی و یەکگرتوویی لە نێوان ئەو هێزە جوداخوازانەدا کارێکی زۆر سادەو مسۆگەر دەبوو.

جێگیربوونی دەسەڵاتی ڕەزاخان بەرە بەرە بارودۆخێکی هێنایە پێش کە سەرکوتکردنی سمکۆ هەروەك سەرکوتی شێخ خەزعەل لایەنێکی پێویستی بە خۆوە گرت و بە ڕاستی بە ئاکام گەیشتنی ئەو کارە دەیتوانی لە ناساندنی سەرداری سپە (ڕەزاخان) هەروەها بوون بە مایەی شانازی و ئابڕوی میللی لە چاوی ناحەزانیدا زۆر کاریگەر بێ. لە ڕاستیشدا هەر وای لێهات و ڕەزاخان کەڵکی زۆری لە کۆتایی هاتنی ئاژاوەو گەندەڵی شکاکەکان وەرگرت. هەڵبەتە بەریتانیاییەکان پێیان خۆشبوو دوای تێك شکانی سمکۆ لە جێگایەکی دیکە کەڵك لە هێزەکانی دەوڵەتی ئێران وەربگرن، واتە لە چارەسەرکردنی گرفتی شێخ مەحموودی بەرزنجی.

بەهەرحاڵ بارودۆخی کوردەکان لە عێراق و تورکیە لەو ساڵانەدا شێوەیەکی تازەی بەخۆوە گرتبوو، ئاڵۆزییەکی تایبەتی تێدا بەدیار کەوتبوو: لە لایەك ئەوان لە عێراق لەژێر چاودێری شێخ مەحموود خەریکی هەوڵ و تەقەلا بوون بۆ سەربەخۆیی و لە لایەکی دیکە کۆمەڵەی تورکیە هێشتا هیوای خۆی لە دەست نەدابوو کە مستەفا کەماڵ بەڵێنەکانی خۆی بۆ دانی جۆرێك ئۆتۆنۆمی بۆ نەتەوەی کورد جێبەجێ بکا، و بۆ گەیشتن بەو ئامانجە ئەو چاوەڕوانیەیان هەبوو کە کوردەکانی عێراق بێنە پاڵ کوردەکانی تورکیە و بەتایبەت یارمەتی کەمالییەکان بدەن بۆ وەرگرتنەوەی ویلایەتی موسڵ لە بەریتانیا. بەڵام تورکیە بۆ پێشگرتن لە هاوکاری سمکۆ لەگەڵ کۆمەڵەی عێراق و بەریتانییەکان، لە سنووری ئێران و تورکیە هێرشیان کردە سەری و ژنە خۆشەویستەکەیان کوشت و جەواهیرات و لیرەکانیان بە تاڵان بردو کوڕە شەش ساڵەکەی بەناوی خەسرەویان بەدیل گرت. لەو ئان و ساتەدا سەید تەها ناوچەی نەهری لە خاکی تورکیای بەجێهێشت و هاتە پاڵ کۆمەڵەی عێراق و هەروەك ئەندامانی دیکەی ئەو حیزبە خوازیاری هاوکاری هەمە لایەنەی شێخ مەحموود و کوردەکانی دیکە لەگەڵ بەریتانیا بوو بە دژی تورکیەی کەمالی، هەر لەبەر ئەوەش هانی سمکۆی دا کە هاوکاری لەگەڵ شێخ مەحموود بکاو بۆ بەهێزکردنەوەو نوێکردنەوەی هێزەکانی سەفەرێکی سلێمانی بکا.

گێڕانەوەی ڕەشید جەودەت کە یەکێکە لە چالاکە سیاسییەکانی کوردی عێراق و لە ساڵەکانی دوای شەڕی گەورە بۆ ماوەی دوو ساڵ و نیو ڕاوێژکاری گشتی سیاسیی و سەربازی سمکۆ بووە، لەگەڵ گێڕانەوەی نێردراوێکی سیاسیی ئینگلیز لە عێراق، سیسیل جی ئەدمۆندز، لە بابەت هۆکاری هاندەری سەفەری سەرۆکی شکاکەکان بۆ کوردستانی عێراق زۆر جیاوازە. ئەدمۆندز ئیدعا دەکا کە هاتنی سمکۆ لە کۆتایی ئۆکتۆبەری ١٩٢٢ بۆ ئەودیوی سنوور لە ناکاو و بێ

ئاگاداری بووەو لەبەر ئەوەی کە ئەو" بۆ یارمەتی وەرگرتن بۆ عێراق هاتبوو هەروەها لەبەر ئەوەی کە ئێمە نەمان هێشت راستەوخۆ بچێتە هەولێر زۆر سەری سورماو ناراحەت بوو"[١٠].

دیارە کە هەم سمکۆ لە حەشارگەیەك لەو دیوی سنوورەکان دەگەڕا و هەم کەمالییەکان، ئینگلیزەکان و کۆمەڵەی عێراق و تورکیە حەزیان لێ بوو ئەو بۆ لای خۆیان رابکێشن و لەو نێوەدا مستەفا پاشا یامولکی دەسپێشخەری کردووەو لە پێش هەموویان خۆی گەیاندۆتە سنوور و سمکۆی رازیکردووە لەگەڵی بچێ بۆ سلێمانی و هەڵبەت ئەو هەنگاوەی بێ ئاگادارکردنەوەی بەریتانییەکان ئەنجام دراوە.

رەشید جەودەت راوێژکاری سیاسیی سمکۆ کە یەکێك لە ئەفسەرانی سوپای تازە دامەزراوی شێخ مەحموودیش بووە لە یادداشتەکانی خۆیدا ئاماژە بەو خاڵە دەکا کە لە ساڵی (١٩٢٢) شێخ قادر فەرماندەی هێزەکانی ژێر فەرمانی شێخ مەحموود ئەمری بەو کردووە کە ماڵی باوکی بۆ نیشتەجێبوونی سمکۆ لە سلێمانی ئامادە بکا و ماوەیەك دوای ئامادەبوونی نشینگەکە، خانی شکاك بە شێوەیەکی رەسمی هاتە ناو سلێمانی و لەو ماڵەدا جێگیر بوو.[١١]

سمکۆ هەر لە سەرەتاوە بڕیاری دابوو کە نەچێتە ناو کایەی ئینگلیزەکان و بەڵام کاتێك کە لە گوندی* "دێری" لە کوردستانی عێراقدا مابۆوە سەید تەها کاربەدەستی سیاسی بەریتانیا چاوپێکەوتنیان لەگەڵ سازکرد و سەرۆك عەشیرەتی شکاك دوای رەخنەگرتن لە سیاسەتی بەریتانیا بەنیسبەت کوردەکان بەو کاربەدەستەی گوت :" ئەگەر نیەتێکی خێرتان هەیەو بە راستگۆییەوە دێنە پێش، رازی بن بە سەربەخۆیی کوردستان، بەو شێوەیە منیش ئامادە دەبم و بەڵێنتان پێ دەدەم کە کوردەکان بکەمە لایەنگری ئێوەو ئەگەر ئەو کارەش ناکەن تەنیا ئەو داواکارییەم لە ئێوە هەیە کە یارمەتیم بدەن هەتا بگەڕێمەوە ناوچەکانی خۆم لە ئێران. جا چ بە شەڕ بێ و چ بە ئاشتی و ئەگەر بە ئاشتیش بوو ئەوا ئێوە دەبێ پارێزگاری ئەو ئاشتییە بکەن.[١٢] لە قسەکانی سمکۆ ڕا وادیاردەکەوێ کە ئەو هیچ هیوایەکی بە وەرگرتنی چەك و تەقەمەنی یان بەڕەسمی ناسینی سەربەخۆیی هیچ ناوچەیەکی کوردنشین لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە لایەن بەریتانییەکانەوە نەبووە و پێشنیارەکانی ئەو تەنیا بۆ وەدەست هێنانی زەمانەتی لەندەن بووە بۆ مەبەستی ئاشتکردنەوەی ئەو لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا. بەڵام ئینگلیزەکان حەزیان لێ بووە لە کاروباری عێراقدا کەڵك لە ئەو وەربگرن هەر بۆیە نێردراوی بەریتانیا پێشنیاری ئەوەی کرد کە بڕێکی دیاریکراوی پارە بە سمکۆ بدەن و براکەشی بەناوی ئەحمەد ئاغا لەسەر حکومەتی بادینانی (عێراق) دابنێن، بەڵام سمکۆ کە ئامادە نەبوو لە دەرەوەی

ئێران هیچ هەنگاوێك هەڵبهێنێ یان بە واتایەکی دیکە هیچ هۆگرییەکی لەودیوی سنوورەکان نەبوو، چونکە نەیدەویست تورکەکان لە خۆی بتۆرێنێ کە کوڕەکەیان بە بارمتە لەلای خۆیان گل دابۆوە هەر بۆیە ئەو پێشنیارەی رەفزکردەوە، بە تایبەت کە لێرەدا نێردراوی بەریتانی بەو شێوەیە وەڵامی دابوویەوە کە "ویستەکانی ئەو (سمکۆ) لە سەرووی پانتایی دەسەڵاتی ئەو دایە و هەر بۆیە قەبووڵ کردنی ئەوە شتێکی ناممکینە"(١٣).

سمکۆ کە لە دانوسانەکانی "دێری" بە هیچ ئاکامێك نەگەیشتبوو، هیچ بە پێویستی نەدەزانی بچێتە هەولێر، هەر بۆیە پێی باش بوو کە بەپێی بانگهێشتەکەی شێخ مەحموود بۆ سلێمانی سەفەر بکا، هەم رەمزی قەزازو هەم رەفیق حیلمی ئاماژە بەتێکهەڵچوون لە نێوان سمکۆ لەگەڵ نوێنەری بەریتانیا و سەید تەها دا دەکەن کە لەوێدا ئەو بە هەڕەشەکردنی چەك شۆفێری ئەفسەری بەریتانیای ناچار بە راوەستان کردووەو هەروەها دوای سەرزەنیشتی سەید تەها بەرەو سلێمانی وەرێ کەوتووە(١٤). هەروەها (عیزەت فاتح) واسیتی نێوان ئینگلیزەکان لەگەڵ سمکۆدا گوتوویەتی کە خانی شکاك دوای ئەوەی گوێبیست بوو کە سورمە خوشکی مارشەمعون لەو کاتەدا لە بەغدایە و گازەندەی سمکۆی لە لایەن بەریتانییەکان کردووەو خوازیاری بەدیل گرتنی ئەون لە رۆیشتن بۆ هەولێر پەشیمان بۆوە(١٥). بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانە سەید تەها بۆ هەمیشە لە سمکۆ جیا بۆوە هێزەکانی خۆی لە خزمەت بەریتانییەکان داناو پاشان لە بەرەکانی شەڕی دژ بە وەدەرنانی سوپای تورکەکان لە رەواندز و حەریر لە ساڵی (١٣٠٢ هەتاوی ١٩٢٣ز) دا بەشداری کرد.

بەو شێوەیە سمکۆ نیشانیدا کە هیچ ئۆگری حەزێکی بە نیسبەت کوردستانی گەورە نییە و ئەگەر جار جاریش باس لە کوردستانی گەورە دەکا ئەوا بۆ ئەوەیە کە یارمەتی نەتەوە پەرەستەکانی کورد لەودیوی سنوور بۆ خۆی مسۆگەر بکا و لەوانەشە لەو رێگایەوە بتوانێ چەك و تەقەمەنی نێردراوی لە لایەن وڵاتە گەورەکانی وەك فەرانسە، بەریتانیا و رووسیەی وەدەست بکەوێ و لە واقیعدا ئەو لەژێر پەردەی کوردستانی گەورەوە دەیویست ئۆتۆنۆمییەکی تەقلیدی لە چوارچێوەی ئێراندا بەدەست بهێنێ. کۆچێرا بە پشت بەستن بە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی فەرانسە، نیشان دەدا کە سمکۆ پەیوەندی بە فەرانسەییەکانیش کردووە، بەڵام ئەو، دەوڵەتە بە بیانووی ئەوەی کە خانی کورد "هەر لە سەرەتاوە کەلوپەل و پارەی لە بەریتانیا وەردەگرت" لە هەر جۆرە یارمەتیەك بۆ ئەو خۆیان دەبوارد(١٦).

# پەیوەندی سمکۆ لەگەڵ تورکەکان لە ساڵەکانی دوای شەڕی گەورە

لە کاتی تاوتۆکردنی شێوەی هەڵسوکەوتی سیاسەتمەدارانی تورك لەگەڵ شۆڕشی سمکۆ، دەبێ بزانین کە ئەوان چ لە دەورانی دەسەڵاتی ئیستبدادی سوڵتانەکانی عوسمانی و چ لە سەردەمی تورکە لاوەکان و چ لە رۆژگاری کەمالییەکاندا پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و قووڵیان لەگەڵ کۆمەڵگەی کوردی ئێران، تەنانەت لە بواری مەزهەبیشەوە نەبووە. تەنیا دەسەڵاتیان بەسەر هەندێك عەشایری کورد لە ئازەربایجان و ئەویش بە تایبەت لەسەر سنوورەکاندا هەبوو کە دەکرێ باسی لێوە بکرێ، بەڵام ئەویش هەموو کات راست نەبووە، هاندانی ئەو هۆزانەش تەنیا بۆ ئەو مەبەستە بووە کە ئیمتیازی زەویوزار لە ئێران، وەربگرن و لەوانەشە بۆ مەبەستی گورزوەشاندن بێت لە بەرژەوەندی سیاسی ـ ئابووری رووسیە لەناوچەکەدا و نابێ ئەو هەنگاوانە بە واتای جووڵانی هەستی نەتەوەیی کوردەکان لە ئێراندا لە قەڵەم بدرێت، چونکە لەو حاڵەتەدا گەورەترین زەرەروزیان لە عوسمانییەکان خۆیان دەکەوت کە سێ لەسەر چواری ناوچە کوردنشینەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە سنووری دەسەڵاتی ئەواندابوو. بۆیە روونە کە پشتیوانی تورکە لاوەکان و کەمالییەکان لەسەر ئەو بنەمایە راوەستابوو کە سەرۆك عەشیرەتی شکاك رێبەری راپەڕینێکی میللی نییە، بەڵکو سەرۆکی عەشیرەتێکی یاخی و مایەی دەردەسەری دەوڵەتی ئێرانە. بۆیە جۆری پەیوەندییەکەش هەمووکات لە یەك ئاست دابوو، بەو مانایە کە تورکەکان هەندێك چەك و تەقەمەنیان بە جەنگاوەرانی سمکۆ دەدا کە چاوەڕوانی ئەوەش نەبوون ئەو بتوانێ بەو ئیمکانیاتە ناوچەکانی رۆژئاوای گۆمی ورمێ لە (ئێران) جیا بکاتەوە، بەڵکو ئەو چاوەڕوانیەیان هەبوو کە خانی کورد لانی کەم هەتا کاتی ئیمزای رێکەوتنامەی دیاریکردنی سنوور لە نێوان عوسمانی و ئێراندا درێژە بە لاوازکردنی ئێرانییەکان بدا.

ئارەزووی عوسمانییەکان بۆ ژێر دەستکردنی سمکۆ لە ماوەی ساڵەکانی (١٢٨٧ ـ ١٢٩٤ ك.ش) ١٩٠٨-١٩١٥ز لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەو ناوچەی ستراتیژیکی قوتور و دەوروبەری لەژێر دەستدابوو، جێگایەك کە ئەوان هەوڵی دەست بەسەراگرتن و کۆنترۆڵی ئەو ناوچەیان دەدا. جیا لەوە هەوڵەکانی رووسیەی قەیسەری بۆ راکێشانی سمکۆ جۆرێك رکابەری لە نێوان تورك و رووسەکان دروست کردبوو و هەر ئەو بارودۆخەش جار بە جار هانی تورکەکانی دەدا بۆ زیاتر نزیکبوونەوە لە سمکۆ. لازاریف بەهۆی دەست گەیشتنی بە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی رووسیە نیشان دەدات کە هەستیاری دیپلۆماتەکانی ئەو وڵاتە بە نیسبەتی گرینگی سمکۆ زیاتر لە لایەن کاربەدەستانی

سیاسیی و سەربازی رووسیە لە تفلیس دابوو، کە هۆشداریان بە دەوڵەتی رووسیە دەدا، بەڵام لە تاران و پترزبورگ سیاسەتمەدارانی رووسیە کەمتر سمکۆیان بە جیدی دەگرت. هەر بۆیەش لە کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۱۲ شاری تفلیس میوانداریەتی سمکۆی کرد و ئەو چاوپێکەوتنی لەگەڵ حاکمی ئەو شارە، واتسۆف داشکۆف کردو هەروەها میدالیایەکیشی لە حاکمی ئەو شارە وەرگرت، پاشان یەکەکانی سوارەی نیژ گورد بەرێکوپێکی لە بەردەم سمکۆ دا تێپەرین[17]. عوسمانییەکان هەر بە زوویی لە رێگەی نوێنەری خۆیان ترحان پاشا لە رووسیە نارەزایەتی خۆیان بۆ ئەو هەنگاوەی رووسیە دەربڕی و وەزیری دەرەوەی رووسیەش دیبلۆماتی تورکی دڵنیا کردەوە کە لە سمکۆ بەدژی بەرژەوەندی دەوڵەتی ئەوان کەڵك وەرناگیرێ.[18]

بەو شێوەیە رووسیە نیشانیدا کە ئامادەیە بەلەبەرچاو گرتنی لاوازی ئێران لە بەرانبەر عوسمانیدا، پێش لە پێشڕەوی تورکە لاوەکان بۆ ناوچەکانی باشووری قەفقاز بگرێ. بەشی سەرەکی سیاسەتی رووسەکان لەو قۆناغەدا بریتی بوو لە بەهێزکردنی هەندێك لە سەرۆك هۆزە بەهێزەکانی نیشتەجێی سەر سنوور وەك سمکۆ و پێشگرتن لە یەککگرتنی کوردەکانی ژێر ئاڵای سوڵتانەکانی عوسمانی. دەوڵەتی عوسمانی لە ماوەی شۆڕشی مەشروتە هەتا شەڕی یەکەمی جیهانی لە قەبووڵ کردنی ئەو پەیمانانەی کە لە رێکەوتنامەی ئەرزەرۆم (۱۸٤۸ م ۱۲٦۳ ك.ق)و رای کۆمیسیۆنی دیاریکردنی سنوور (۱۹۱۳م/۱۳۳۱ ك) و بەندەکانی تایبەت بە مافی ئێران لە رێکەوتنامەی سان ستیفانۆ و بەرلین خۆی دەبواردو هەوڵی بە فێروادنی کاتی دەداو بە دەستپێکردنی شەڕو داگیرکردنی ئێران لە لایەن هاوسێیەکانییەوە هەموو شتێك فەرامۆشکرا. پێشتر دیتمان کە چۆن لە ماوەی شەڕی گەورەدا عوسمانییەکان هەوڵیان دەدا سەرۆکە کوردەکان و لەوانەش سمکۆ بەهۆی دروشمی ئیسلامییەوە بۆ لای خۆی رابکێشێ و هەروەها شاهیدی ئەوە بووین کە سمکۆ لە ناوەڕاستەکانی جەنگ جۆرێك سیاسەتی بێ لایەنی گرتبۆبەر و لەو رێگایەوە فۆرمێکی دیکەی بەهێزو دەسەڵاتی خۆی دەدا. شۆڕشی ئوکتۆبەرو نەمانی رووسەکان لەسەر مەیدانی سیاسی، سەربازی ناوچەکەداو جووڵە کەوتنی مەسیحییەکان و هەڵچوونی سمکۆ لە بەرابەر دەوڵەتی ئێران داوای لە ئەو (سمکۆ) کرد کە بەدوای پشتیوانی هێزێکی دەرەکی و بە تایبەت تورکەکاندا بگەڕێ و تورکەکانیش بە زوویی حەز و ئارەزووی خۆیان بۆ ئەو هاوکارییە دوو لایەنییە دەربڕی. تورکەکان کەلوپەلی تایبەتیان بۆ پێکهێنانی یەکەیەکی - تۆپخانە لە خزمەت کوردەکان دەناو راوێژکارانی تورك بە پارەیەکی زۆر لە لای سمکۆ دامەزران و ژمارەیەك لەوان هەر بە زوویی لەگەڵ ژنانی عەشیرەتی شکاك زەماوەندیان کرد. رادەی دەسەڵاتی

سوپاییەکانی تورك لە دامودەزگای سمكۆدا ئەوەندە فراوان و ئاشكرابوو كە دەوڵەتی ئێران لە ئاكامدا بەو كارەی زانی.

لە راپۆرتی مەهدی ئیلهامی جێگری ویلایەتی ئازەربایجان بۆ وەزارەتی ناوخۆ لە رێكەوتی ١٩٢٠ دوای بەیان كردنی تێك هەڵچوونی عەشایری ژێر فەرمانی ئیسماعیل ئاغا لە ناوچەكانی خەسرەو ئاباد دا هاتووە كە "ئیسماعیل ئاغا ژمارەی پازدە كەس لە سەربازی عوسمانی بە بڕی پارەی مانگانە پێنج سەد تومان هێناوەتە ژێر خزمەتی خۆی."(١٩) كەسرەوی ژمارەی بەكرێ گیراوانی تورك بە چەند سەد كەس دادەنێ، بەڵام تەمەدونی دەڵێ سەد كەس بوونە(٢٠). هەندێك لە سەرچاوەكان بوونی توركەكان لە سوپای سمكۆ بە یەكێك لە هۆكارەكانی باڵادەستی هێزەكانی سمكۆ بەسەر هێزەكانی دەوڵەتیدا دەنێن. وادێنە بەرچاو كە سمكۆ ئەو ئیجازەی بە خۆی داوە كە بە شێوەیەكی فراوان لەگەڵ توركەكان هاوكاری بكا. هەر ئەو هەڵسوكەوتەشە كە مارتین ڤان برویەنسن و كەسرەوی بەو ئاكامە دەگەیەنێ كە كاریگەربوونی ئەو وەك سەركردەیەكی كورد پەیوەندی بە ساڵەكانی پێش جەنگەوە هەیەو لە رابردووشدا وەها پێشینەیەكی هەبووە. لێرەوە كە مارتین ڤان برویەنسن سمكۆ وەك رێبەری جووڵانەوەی نەتەوەیی لە كوردستانی ئێراندا دەناسێنێ. دوای تاوتوێ كردنی دروشمەكانی یەكگرتنی (جیهانی) ئیسلامی ، عوسمانییەكان وا لێك دەداتەوە كە ناسیونالیزمی كورد لە خاكی عوسمانیدا سەرەتا بەهۆی كاردانەوە لە بەرانبەر ناسیونالیزمی ئەرمەنیدا سەریهەڵداوە و پاشان لە بەرابەر بزووتنەوەی توركە لاوەكان لەنێو جیلی نەوەی دەرس خوێندا واتایەكی رەگ و ریشەدارتری پەیدا كردو دوای شەڕی گەورە بەهۆی تێكشكانی دەوڵەتی عوسمانی زۆر بە خێرایی لە نێو كوردانی توركیە و عێراقدا پەرەی ستاند، بە شێوەیەك كە زۆربەی سەرۆك عەشیرەت و پیاوانی ئایینی چوونە ریزی ئەو ناسیونالیزمە تازە دروست بووە، كە لەوانەش دەكرێ ئاماژە بە سمكۆ بدرێ(٢١).

كەسرەوی گەشەكردنی ئەفكارو هزری سیاسیی سمكۆ بۆ ئەوروپییەكان و بە تایبەت بۆ دیپلۆمات و ئەو موژدەدەرانە دەگەڕێنێتەوە كە لە كیشوەری ئەوروپاوە بۆ ئاسیا نێردرابوون. كە بە وتەی ئەو سەرسەری بوون و بیرۆكەی جیاخوازیان لە نێوان كورد و ئەرمەن و ئەوانی دیكەدا بڵاو دەكردەوەو "كوردەكانیش لەمێژساڵ بوو كە گوێبیستی ئەو قسانە بوون و هەندێك لە كەسایەتییە هۆشیارەكانیان دوای ئەو بیرۆكە هەرزانە كەوتبوون و هەندێك جاریش كتێب و وتاریان لەو بارەوە نووسیبوو. ئێستا سمكۆ دەیویست ئەو ئارەزوویە بێنێتە قۆناغی پراكتیك و بە لاساییكردنەوە لە ئازادیخوازانی تورك كە "جینی توركیان" پێك هێنابوو ئەویش دەیهەویست هەوڵی دروستكردنی گروپێكی بەناو"ژینی كورد"بدا (٢٢).

هەم مارتین ڤان برویەنسین و هەم کەسرەوی لەو لێکدانەوەیەی خۆیاندا بە هەڵەدا چوون، چونکە ڕوونە کە سمکۆ نەتەنیا نوێنەری ناسیونالیزمی کوردی نەبووە، بەڵکو پێگەی عەشیرەتی ئەو هیچ کات.ئەو ئیجازەی پێ نەدەدا کە وەها هۆشیارێکی سیاسیی هەبێ کە لەژێر ڕووناکایی ئەودا و بە لاساییکردنەوە لە تورکە لاوەکان هەوڵی پێکهێنانی ڕێکخراوێکی سیاسیی بدا و ئەوەش واقیعیەتێکە کە سەرۆك عەشیرەتی شکاك لە سەرانسەری ماوەی یاخیبوونی خۆیدا حزبێکی سیاسی پێك نەهێناو لە بنەمادا لە سەنتەری هیچ جۆرە بزاوتێکی هزری و سیاسیی لەناو کوردەکاندا نەبووە کە ئەوەش لە لایەن زۆر لە سەرچاوەکانەوە دانی پیانراوەو سەلماندنی ئەوە کارێکی زۆر دژوار نییە.

هەر بۆیە قەبووڵ کردنی ئەو خاڵە کە لەناو تەواوی عەشایری کوردی ئێراندا، تەنیا یەك کەس و ئەویش سمکۆیە لەژێر کاریگەری تورکە لاوەکاندا بووەو سەرپەرشتی ناسیونالیزمی کوردی کردووە، کارێکی دژوارەو لەگەڵ هیچ لۆژیکێك یەك ناگرێتەوە، چونکە لەهەمان کاتدا سەرۆك عەشیرەتەکانی کوردی عوسمانی زۆر لە تورکە لاوەکان ڕەشبین بوون و ترس و دڵەراوکێیان لە هەڵسوکەوت و جموجۆڵی ئەوان هەبوو. "سێر جیرالد لۆتیر" باڵوێزی بەریتانیا لە ئەستانبول هۆکارەکانی ئەو ڕەشبینییە لە ساڵی (١٩٠٨) بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە:" جێگەی سەرسوڕمان نییە ئەگەر خان و سەرۆکە کوردەکان لە ڕژێمی نوێ (واتە ڕژێمی تورکە لاوەکان) ناڕازی بن، چونکە ترس و دڵەڕاوکێیان لە ئەوەیە کە ئەو ڕژێمە نوێیە ببێتە مایەی پێکهێنانی ئاسایش و یاسا و پێش لەبێ یاسایی و بێ سەروبەری بگرێ [٢٣] هەروەها دەڵێ کە بزووتنەوەی تورکە لاوەکان پێشی لە دەسەلاتخوازی سەرۆکە کوردەکان دەگرت و ئەوان کە پێشتر پشتیان بە سوڵتان بەستبوو لەو ڕەحمەتەی بێبەش کرد. لە ڕاستیدا ئەو چینە دەرس خوێنەی کورد (intelligentsia ) بوون کە بەهۆی ئاشنابوونیان لەگەڵ مەرام و بیروڕای سیاسیی ڕۆژئاواو بەهۆی هاوکاریان لەگەڵ تورکە لاوەکان لە خەباتکردن لە دژی ئیستبدادی (سوڵتان عەبدولحەمید) دا توانیان یەکەمین ئەحزابی کوردی وەك (جەمعیەتی تەعالی و تەرەقی کوردستان) (کۆمەڵەی هاریکاری و بەرزێتی کوردستان ) و حزبی نوێکردنەوەو (تجدد)، (ئەنجوومەنی دۆستانی کورد و هێڤیا کورد) دابمەزرێنن. کوچێرا باس لە دەرکەوتنی چینێکی "ناوەڕاست" دەکا کە پێکهاتەکەی لە بورژوازە گەورەکان و نەوەکانی ئەو میرانەی پێشوو بوون کە ژیانیان بەرەو هەژاری دەرۆیشت و کەنداڵ (نەزان)یش کوڕەکانی ئەو میر و سەرۆك عەشایرانەی کە لە قوتابخانە - عەشایرییەکان یان ئەکادیمیە سەربازییەکانی عوسمانیدا فێری خوێندن ببوون بە یەکەمین نەتەوەپەروەرانی کورد بە مانای ئەوڕۆکە دەزانی [٢٤].

هەر بۆیە کاریگەربوونی سمکۆ بە تورکە لاوەکان ئەویش لە کاتێکدا کە سەرۆك عەشیرەتەکانی عوسمانی لە ئەوان بێزاربوون جێگەی گومانە، و مومکین نییە کە تورکە لاوەکان و پاشانیش کەمالییەکان بە جۆرێك یارمەتی ئاغای کوردیان دابێ کە لە ئاکامی ئەو یارمەتییانە لە شێوەی ناسیونالیزمی کوردیدا بەرجەستە بوو بێ، جیا لەوەش دەسکەوتە سیاسیی و رێکخراوەییەکانی تورکە لاوەکان کە ئەو کات نوێنەری بورژوازی بچووك و چینی ناوەڕاست کۆمەڵگای عوسمانی بوون چ کێشێکی بۆ سەرۆك عەشیرەتێکی کوردی ئێرانی هەبوو کە خۆی دژی بەهێزبوونی دەوڵەتی ناوەندی و چینی ناوەڕاستی شارنشین بوو؟

لە راستیدا سمکۆ ئاشنایەتی لەگەڵ بەرنامەکانی ئیبراهیم پاشای سەرۆکی عەشیرەتی میلاندا هەبوو بۆ دژایەتی کردنی تورکە لاوەکان و یاخیبوون لە دژی ئەوان، چونکە میلانییەکانی عوسمانی کۆمەڵە تایفەیەکیان لە ئێراندا هەبوو کە بە هاوپەیمانی سروشتی شکاکەکان بە حیساب دەهاتن و هەڵبەتە کوژرانی ئیبراهیم پاشا لە کێوەکانی (عبدالعزیز) دا بە دەستی تورکە لاوەکان بۆ سمکۆ و سەرۆکە کوردەکانی دیکە لە ئێراندا زۆر ناخۆش بوو[٢٥].

سمکۆ دەبووایە زیاتر بە نەتەوە پەروەرەکانی کوردی ژێر دەسەڵاتــی عوسمانی کاریگەر بوایە کە لەوکاتدا دەیانەویست رەنگ و روویەکی نەتەوەگەری بە یاخیبوونە سادەکانی سەرۆك عەشیرەتەکان بدەن نەك بکەوێتە ژێر کاریگەری تورکە لاوەکان کە لە ئیمپراتۆریای تۆرانی (پان تورکیزم) دروستکراوی خەیاڵیاندا هیچ جێگایەکیان بۆ کورد نەکردبۆوە.

کوچێرا نووسەری فەڕانسەوی لەسەر ئەو باوەڕەیە کە سمکۆ بەهۆی ناکامبوونی لە بەدەست هێنانی متمانەی بریتانییەکان ناچاربوو داوای یارمەتی لە تورکەکان بکا سەرەڕای ئەوەی کە "لە ناسیۆنالیستە تورکەکان بێزاربوو ئەوانی زیاتر لە ئێرانییەکان بە دوژمنی کوردەکان دەزانی" بەڵام هیچ کات پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەوان نەپساند، چونکە ئەوان ئەو چەك و تەقەمەنییەی کە زۆر پێویستی پێی بوو بۆیان دابین دەکرد [٢٦].

دانەری فەڕەنسی خۆی لەو راستییە دەدزێتەوە کە ناردنی چەك لە لایەن تورکەکانەوە کارێك بوو کە پێشتریش پێشینەی هەبووەو پێشینەی ئەو بۆ ساڵەکانی پێش لە مەشروتە و شەڕی یەکەم دەگەڕایەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە نەتەوەپەروەرانی کوردی عێراق بەلەبەرچاو گرتنی رۆڵی بەریتانیا لە بەخشینی سەربەخۆیی بە عەرەبەکان، ئەوانیش دەیانەویست وەها ئیمتیازێك بۆ کوردەکان لە لەندەن وەربگرن، بۆیە سمکۆیان ناچارکرد کە لە بەریتانیا نزیك ببێتەوە. جیا لەوەش تورکە لاوەکان و کەمالییەکان لەبەر

ئەوە چەکیان نەدەدا بە سمکۆ کە وڵاتێکی سەربەخۆی کوردی دابمەزرێنێ، بەڵکو تەیارکردنی سمکۆ لە لایەن تورکەکانەوە لە قۆناغ و سەردەمە جیاوازەکاندا تەنیا لە خزمەتی یەکێك لە ئامانجە زیادەڕەوییەکانی ئەوان واتا جیاکردنەوەی چەند بەشێك لە ئازەربایجانی ڕۆژئاواو ناوچەکانی وەك ماکۆو قوتور بوو کە لەساڵی (١٩٠٨) دا تاهیر پاشا نوێنەری تورکەکان لە دانوساندنێکدا لەگەڵ کۆنسولی رووس لە ورمێ ئیدعای مافی تورکیە بەسەر ئەو ناوچانەدا کردبوو کە لە روانگەی ئەوەوە زەوییەکانی نێوان هێڵی (٣٠و ٤٠ )پلە، واتە بەشێکی گەورەی کوردستانی ئێران دەگرێتەوە[٢٧].

ئەو ڕووداوانەی کە لە ساتەوەختی دیاریکردنی سنووری نێوان ئێران و تورکیە و لە کاتی شۆڕشی ئارارات لە ساڵانی (١٩٣٠ز/١٣٠٩ ك.ش) ڕوویاندا، نیشانیان دا کە سمکۆ تەنیا لەبەر ئەو مەبەستە بۆتە جێگەی سەرنجی تورکەکان و لەو کاتەشدا جارێکی دیکە هەوڵ درا هەر بۆ ئەو مەبەستە کەڵکی لێ وەربگیرێ، (کاوە بەیات) نیشان دەدا کە بەهۆی وێکچوونی ستراتیژی سۆڤیەت و تورکە کەمالییەکان لە ساڵەکانی دوای ڕووخانی کۆمارەکانی مساوات و ئەرمەنستان لە ساڵەکانی ١٩٢٠ دا، تورکەکان هاندرابوون کە ماکۆ داگیر بکەن [٢٨]. هەروەها لە ڕاپۆرتی باڵوێزی ئێران لە فەڕانسە لە ساڵی (١٩٢٢)دا ئاماژە بەو ڕاستییە کراوە کە تورکە کەمالییەکان بە بیانووی بەپیت بوونی خاکی ماکۆ و گرینگی ئەوێ بۆ ئیدارەی ئانادولی هەوڵیان دەدا کە یەکیەتی سۆڤیەت بۆ قەبووڵ کردنی دەسەڵاتی تورکیە لەو ناوچانەدا بخەنە ژێر گوشارەوە و ئەو وڵاتە بەهۆی بێلایەنییەکانی لەو هەنگاوانە دڵنیای بکەنەوە.[٢٩] هەر بۆیە لە ڕاستی بە دوورە کە بڵێین دەوڵەتی تورکیە لە پێناو پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد و پارێزگاری کردن لە بەرژەوەندی کوردەکان لە هەوڵی جیاکردنەوەی ئازەربایجان بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی یەکیەتی سۆڤیەت بووەو هەروەها چەکی بە سمکۆش دابێ. زۆرترین ئیمتیازی کە سمکۆ لەوانەبوو لە کاتی جیاکردنەوەی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا لە لایەن تورکیەوە بەدەستی هێنابایە ، دەست بەسەرداگرتنی چەند بەشێك لە زەویوزارە بە پیتەکانی ئەو ناوچەیە بوایە، کە ئەو ئیمتیازەش هەر لە ساڵی (١٩٢٣) کەمالییەکان بەڵێنیان پێدابوو، بەڵام ڕێکەوتننامەی ئاشتی بروکسل لە بەردەم بە ئەنجام گەیاندنی ئەو بەڵێنانە بەربەست بوو. بەو جۆرەی کە ئەحمەد تەقی نووسیویەتی ئەو لە بەدەست هێنانی وەها ئیمتیازێك زۆر ڕازی و خۆشحاڵ بووە [٣٠].

کەمالییەکان لە ساڵی (١٩٢٢) دا هەمان ئەو بەڵێنانەیان بە شێخ مەحموودیش دابوو بە مەرجێك کە کوردستانی باشوور لە عێراق جیا بکاتەوەو بە تورکیای بلکێنێ، بەڵام ئەو بە پێچەوانەی سمکۆ دژی ئەو بیرۆکەیە بوو. کەسرەوی و تەمەدون ئیدعا دەکەن کە سەردار ئینتیسار توانی هەندێك لەو ڕاوێژکارە تورکانە لە هاوکاری لەگەڵ سمکۆ پەشیمان بکاتەوە، بەڵام حەقیقەت ئەوەیە کە سوپاییەکانی

تورك هەتا کۆتایی شەڕی چارەنووسسازی (شەکریاز) لە ساڵی (١٩٢٢) هەروا لە خزمەت خانی کورد دابوون و لە بنەڕەتدا مانەوەی سمکۆ بۆ ماوەی (٩) ساڵ لە خاکی تورکیا دا نیشاندەری ئەو حەقیقەتەیە کە تورکیەی کەماڵی نەیدەویست هەروا بە سانایی دەستی لێ هەڵبگرێت. مارتین ڤان برۆیەنسین بە پشت بەستن بە سەرچاوە ئەرمەنییەکان ڕەهەندێکی دیکە لە نییەت و ئامانجەکانی کەماڵییەکان لە یارمەتی دانی سمکۆ ئاشکرا دەکات و لەو بارەیەوە دەنووسێت :" بەپێی سەرچاوە ئەرمەنییەکان سمکۆ و سەید تەها هاوکات لەگەڵ یەك (لە ساڵی ١٩١٩ سەید تەها لە حاڵی پەیوەندی گرتن بە بەریتانیاوە بووە) خەریکی پەیوەندی کردن بە ناسیونالیستەکانی تورك لە شاری (وان) دا بوون کە حەزیان لێی بوو ئەوان بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ پیلانی گەڕانەوەی ئەرمەنییەکان بۆ ڕۆژهەڵات بەکرێ بگرن و بۆ ئەو مەبەستە بەڵێنی یارمەتیان بە هەردووکیان دا و لە ساڵی داهاتوودا (١٩٢٠) هەر دوو سەرکردەی کورد هەم لەگەڵ ئینگلیزەکان و هەم لەگەڵ ناسیونالیستەکانی تورکدا پەیوەندیان هەبوو"[٣١].

بەو شێوەیە هەڵسوکەوت و پەیوەندی سمکۆ لەگەڵ تورکە کەماڵییەکان هیچ لە کرداری ڕێبەرێکی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی کورد نەدەچوو و زیاتر وێنای کەسێکی دانراو و ملکەچی لە زیهنەکاندا دروست دەکرد و جیا لەوە نیشانی دەدا کە سەرۆکی شکاکەکان بە هیچ شێوەیەك دیدێکی سیاسی قووڵی نییە. لە کاتێکدا شێخ مەحموودی بەرزنجی هیچ کات فریوی وادەو بەڵێنەکانی مستەفا کەماڵ و ئینگلیزەکانی نەخواردو ڕووداوەکانی پاشانیش نیشانیان دا کە ئەو (شێخ مەحموود) لە سەر حەق بووە[٣٢].

پێشتر دیتمان کە سمکۆ زیاتر لەژێر کاریگەری کۆمەڵەی تورکی لە کەماڵییەکان نزیك ببۆوەو پەیوەندیدەرەکانی ئەو لەگەڵ ناوەندی هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیە لە شاری وان دا، لە لایەن ئەندامانی ئەو حیزبەوە بووە و لە واقیعدا جیا لەو هۆیانەی کەوای کرد خانی شکاك پەیوەندی لەگەڵ کەماڵییەکان ببەستێ ئەو لە لایەن کۆمەڵەی تورکیاش بۆ ئەو کارە هان دەدرا.

ئەحمەد تەقی لە زمانی مەحموود فازیل بە ڕەگەز کوردی وەکیلی قەدری بەگی حاکمی (وان)ەوە دەنووسێ کە لە ساڵی ١٩٢٠" سمکۆ لە ناوچەکانی خۆیدا پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ تورکەکان پێك هێناوەو بە یەکێك لە دۆستانی ژەنەڕاڵ کازم قرەپاشا بەحسێب دێ و تورکەکان بە جۆرەها چەك و تەقەمەنی یارمەتی دەدەن"[٣٣].

سمکۆ بە رادەیەك گرینگی بە بەرژەوەندییەکانی تورکیە دەدا کە لە سەرەتای شۆڕشی عەشایری ڕەواندز لە دژی ئینگلیزەکان لە هاوینی (١٩٢٠) دا، کە هێشتا کەمالییەکان کاردانەوەیەکیان بە نیسبەتی ئەو شۆڕشە نیشان نەدابوو، لەبەر ئەوەی کە دەیزانی بەشداریکردنی لەو شۆڕشە لە بەرژەوەندی تورکەکاندا نییە هەر بۆیە بەشداری تێدا نەکرد. ئەحمەد تەقی کە نوێنەر و نێردراوی شۆڕشگێڕان بوو بۆ لای سمکۆ لە بەرابەر هەستیاری بوونی خانی کورد بە نیسبەت بەرژەوەندی تورکەکان دەنووسێ: " هۆکاری هاوکاری نەکردنی سمکۆ لەگەڵ شۆڕشگێڕانی ڕەواندز ئەوە بوو کە خۆی پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ تورکەکان هەبوو و نەیدەویست هیچ زەرەر لە بەرژەوەندی تورکەکان بدا، چونکە ئەو پێی وابوو کە تەنیا لە یەك ڕێگاوە بەرژەوەندی تورکەکان دەپارێزرێ و ئەویش پەرەپێدانی ئالۆزییە لە کوردستانی ئێراندا بۆ ئەوەی کە تورکەکان بتوانن بچنە ناو ئەو ناوچانەوە"(٣٤).

پاش ماوەیەك تورکەکان یەکەیەکی سەربازیان بە سەرۆکایەتی سەرهەنگ عەلی شەفیق ناسراو بە ئوزدەمیر بۆ ڕەواندز نارد و ئەو ناوچەیە بوو بە ناوەندی جووڵانەوەیەکی ئەو وڵاتە لە دژی بەریتانیا. گرینگی دەربڕینەکانی ئەحمەد تەقی لە بابەت ئامانجی دووروودرێژی تورکە کەمالییەکان و چاو تێبڕینی ئەوان لە خاکی ئێران و بە خزمەت گرتنی سمکۆ بۆ ئەو ڕێگایەی کاتێك ئاشکرا دەبێ کە بزانین ئەحمەد تەقی ئەندامی کۆمەڵەی تورکیە و کەسایەتی جێگەی دڵنیایی تورکەکان و هەروەها ڕاوێژکاری جێگەی باوەڕی سمکۆ و نزیکترین خەباتکاری کورد لە سمکۆ بوو و تەنیا ئەوە کە لە بیرەوەرییەکانی خۆی لە زمانی سمکۆوە دەگێڕێتەوە کە ئامانجی کۆتایی تورکەکان لە یارمەتیدانی سمکۆ جیاکردنەوەی بەشێك لە خاکی ئێران بوو (٣٥)، بەچاوخشاندنێکی خێرا بەسەر بارودۆخی سیاسی وڵاتی عێراق لە ساڵی (١٩٢١) دا ڕاستی و دروستی ئیدعاکانی ئەحمەد تەقی لە بابەت ئارەزووە فراوانخوازییەکانی کەمالییەکان بە نیسبەت زەوییەکانی ئێران لامان ئاشکرا دەبێ، لە واقیعدا تورکیە ئەو ئامادەییەی تێدا بوو کە لە ئەگەری لاوازیی بەریتانییەکان لە ئاکامی شۆڕشی چەکدارانەی شیعەکانی عێراق بە ڕێبەرایەتی پیاوانی ئایینی نەجەف و کەربەلا کە لە ساڵی (١٩٢١) دا ڕوویدا کەڵکی پێویست وەربگرێ، ئەو کارە لەبەرچاوی بەریتانییەکانەوە شاردراوە نەبوو، هەروەها یەکێك لە ئاگادارترین نێردراوانی بەریتانیا بە ناوی خاتوو (گرترود مارگارت بل) لە بابەت ئەو دیاردانەی کە لەوانەبوو دوای بەجێهێشتنی عێراق لە لایەن بەریتانیاوە لەو وڵاتە ڕوویدا گوتوویەتی کە: " ئەگەر بەریتانیا بڕیاری دابوایە کە واز لە کاروباری عێراق بهێنێ، ئەوا زۆربەی هەرە زۆری عێراقییەکان دووبارە لایەنگری خۆیان بۆ تورکەکان نیشان دەدا" (٣٦).

(عبدولهادی حائری) لەو باوەڕە دایە کە ئەگەر تورکەکان جارێکی دیکە توانیبایان دەست بەسەر عێراقدا بگرن، ئەوا دەوڵەتی تورکیە مەترسی دەخستە سەر دەسەڵاتی فەڕەنسییەکان لە سوریەو بریتانییەکان لە فەلەستین، ئوردەن، میسر، سودان، ماوەرای ئوردەن (نیمچە دورگەی عەرەبی و تا رادەیەکی زۆریش سەرکەوتوو دەبوو)[٣٧] .

هەرچەندە وێنەی سەرهەڵدانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ئاسیادا، دوای شەڕی یەکەمی جیهانی زۆر لەگەڵ واقیعدا ناگونجێ، بەڵام دەتوانرێ وا وێنا بکرێ کە ئەگەر ئینگلیزەکان لە عێراقدا کاردانەوەیەکیان لە خۆیان نیشان دابوایە، ئەوا تورکە کەمالییەکان لەدەست بەسەرداگرتنی باکووری عێراق و جیاکردنەوەی بەشێك لە باکووری رۆژئاوای ئێراندا زۆر سەرکەوتوو دەبوون و هیچ دوور نەبوو کە یەکیەتی سۆڤیەتیش بۆ گورز وەشاندن لە بەرژەوەندی بەریتانیا لە ئێران و عێراقدا لە بەرانبەر ئەو دەست درێژییانەی کەمالییەکان چاوپۆشی کردبایە.

دوای کودەتای (١٢٩٩) ك.ش ١٩٢١ز دەوڵەتی ئێران هەوڵەکانی خۆی بە شێوازی دیبلۆماسی بۆ گوشار خستنە سەر تورکیەی کەمالی بۆ مەبەستی بڕینی یارمەتییەکان بۆ سمکۆ پەرەپێداو بە وتەی (مەهدی ئیعتمادی موقەدەم) یەکێك لە ئەندامانی وەفدی ئێرانی نێردراو بۆ تورکیە لە ساڵی(١٣٠٠ ك.ش دا ١٩٢١ز) لەسەر پێداگرتنی سەرداری سپە (رەزاخان) ئێران، داوای لە مستەفا کەماڵ کرد کە تورکیە کۆتایی بە دانی چەك بە کوردەکان و هەروەها ناردنی راوێژکاری سەربازی بۆ لای سمکۆ بهێنێ[٣٨].

رەشبینبوونی سمکۆ لە تورکەکان بۆ شکستی دوای ساڵی ١٣٠١ ك.ش (١٩٢٢) دەگەڕێتەوە، چونکە ئەو لە سەرەتادا وای دەزانی کە تورکەکان جارێکی دیکەش بە چەك و چۆڵی تازەو کاریگەر عەشیرەتی سمکۆ تەیار دەکەنەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەو کارە بەهۆی شەڕی تورکەکان لەگەڵ یۆنانییەکاندا بە ئەنجام نەگەیشت، خانی کورد بەهۆی کۆمەڵەی عێراقییەوە هەوڵی دەدا کە لە بەریتانیا نزیك ببێتەوەو بەو شێوەیە کەمالییەکان بخاتە ژێر گوشارەوە، بەڵام کاردانەوەی ئەوان زۆر خێراو ماڵ وێرانکەر بوو، هەر پاش ئەوەی کە بۆیان روون بۆوە کە سمکۆ لەگەڵ مستەفا پاشای یامولکی یان بەکر ئاغای پشدەری پەیوەندیدەری ئینگلیزەکان لە ناوچەکەدا خەریکی دانوستاندنە، یەکەیەکی سەربازی تورکیە لە سنوور تێپەڕی و هێرشی کردە سەر خانی کوردو یەکێك لە ژنەکانیان کوشت و کوڕە شەش ساڵەکەشی بەناوی خەسرەو بەدیل گیرا. رەفیق حیلمی لەو باوەڕە دایە کە کەمالییەکان جیا لەو ترسەی کە لە هاوکاری سمکۆ لەگەڵ ئینگلیزەکان لە خاکی عێراقدا هەیانبوو، هۆیەکی دیکەی

نیگەرانییان کە لە دانوساندن لەگەڵ مستەفا پاشای یامولکی هەستیان پێ کرد و پەیوەندی بە ئاسایشی ناوخۆیی تورکیەوە هەیەو (مستەفا کەماڵ) بەباشی دەیزانی کە مستەفا پاشا لە هەوڵی ڕاپەڕینێکی گەورەدایە لەناو کوردەکانی تورکیەداو سمکۆی بۆ ڕێبەری ئەو ڕاپەرینە لەبەر چاو گرتووە، ئەوە راستییەکە کە ڕەشید جەودەتیش دانیٚ پیٚدا دەنیٚو لە یادداشتەکانی ئەو وابەدیار دەکەویٚ کە هەنگاو و هەوڵەکانی سمکۆ بەتەواوەتی لەژێر چاودێری تورکەکاندابووە(٣٩).

شتێکی سروشتی بوو کە کەمالّییەکان ببنە بەربەست لەبەردەم سمکۆ بۆ ئەوەی نەچێتە ناو هێڵی سیاسەتەکانی کۆمەڵەی عێراق و ئینگلیزەکان و هەر بۆ ئەو مەبەستەش بەردەوام وەبیر سەرۆکی شکاکەکانیان دەهێنایەوە کە ئەگەر ژیانی کوڕەکەی لا گرینگە و هێشتاش هەوڵی گەڕانەوەی لیرەو جەواهیراتەکەی دەدا، نابێ بەپێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی تورکیا هەنگاو هەڵبهێنێ.(٤٠)

لەژێر کارتێکردنی ئەو گوشارانەوە سمکۆ لەمانگی ئۆکتۆبەری ١٩٢٢ پەیوەندی خۆی لەگەڵ کاربەدەستانی بەریتانیا پچڕاندو پەنای بۆ شێخ مەحمودی بەرزنجی لە سلێمانی برد، کە لەوکاتەدا لە دەرەوەی دەسەڵاتی بەریتانیا بوو.

دەوڵەتی تورکیا لەوکاتەدا بەکەڵك وەرگرتن لە دوژمنایەتی شێخ مەحموود لەگەڵ بەریتانیا، ژمارەیەکی کەم لە سەربازە تورکەکانی لەژێر فەرمانی سەرهەنگ عەلی شەفیق ناسراو بە ئۆزدەمیر کە پێشتریش لەبەرەی ئادانا لەگەڵ فەرەنسییەکان شەڕی کردبوو بۆ ڕەواندز بەڕێ کرد ئەویش هەر بەزوویی دەستی بەپڕوپاگەندەیەکی فراوان لەناو زانایان، سەرۆك عەشیرەت و بازرگانەکان کردو هەوڵیدا هەتا بوارێك بڕەخسێت بۆ لکاندنی ناوچەکانی موسڵ، بادینان، ڕەواندز، ڕانیە و زاخۆ بەدەوڵەتی تورکیەوە. ئۆزدەمیر بۆ پێشگرتن لە پێکهاتنی بەرەیەکی دژ بەتورك کە پێکهاتبێ لە سمکۆ، شێخ مەحموود، کۆمەڵەی عێراقی و بەریتانیا، وەفدێك کە پێکهاتبوو لە ئەفسەرانی تورك و کوردی لایەنگیری تورکیە بە شێوەیەکی نهێنی ناردە سلێمانی هەتا پێش بە هاوکاری سەرۆکی شکاکەکان لەگەڵ دوژمنانی تورك بگرێ.

نێردراوانی ئۆزدەمێر پێشنیاریان بەسمکۆ کرد کە لیرەکان و کوڕەکەی پێ دەدەنەوەو جیا لەوەش کۆمەڵێك زەوی و زاری بەپیت و بەرەکەتی لە ناوچەکانی شەمدینان و وان پێ دەدەن بەمەرجێك کە دەست لە هاوکاری لەگەڵ کوردەکانی عێراق هەڵبگرێت، هەروەها داوای لێ کرد ڕێگە خۆش بکا بۆ دانوساندنێك لە نێوان شێخ مەحموود و ئۆزدەمیرو کارێك بکا کە شێخ هاوکاری لەگەڵ تورکیە بکا.(٤١)

بەو شێوەیە جارێکی دیکەش سمکۆ خزمەتی بە سیاسەتی کەمالییەکان کردووەو بەخێرایی ڕێگای بۆ دانوسادن لە نێوان شێخ مەحموود و ئۆزدەمیر خۆشکرد و شێخی رازی کرد وەفدێك بۆ وتووێژ بۆ لای مستەفا کەماڵ لە ئەنقەرە بنێرێ. ئەحمەد تەقی کە یەکێك لە ئەندامانی نێردراوی ئۆزدەمیر بۆ سلێمانی بوو لەو بارەیەوە دەنووسێ:-

"بۆم دەرکەوت سمکۆ لەوکارەدا (پێکهێنانی دانوسانڵدن) ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە و ئەو بووە کە شێخی هانداوە تا داوا لە ئۆزدەمیر بکات وەفدێك بۆ وتووێژە سەرەتاییەکان بۆ سلێمانی بنێرێ."(٤٢)

بەزوویی ئاکامی ئەو دانوسانڵدنە بەرایییانە بە ڕێکەوتنامەیەك کۆتایی پێهات کە بەپێی ئەو شێخ مەحموود دەبوایە وەفدێك بۆ دانوساندنی لە بابەت سنووری ئۆتۆنۆمی کوردەکان لە کۆماری تورکیادا بۆ لای مستەفا کەماڵ لەئەنقەرە بنێرێ، بەو شێوەیە بوو کە سمکۆ خزمەتێکی بەنرخی پێشکەش بەکەمالییەکان کردو پێشی بەدژایەتی کردنی شێخ مەحموود لەگەڵ کەمالییەکان گرت.

مێژوونوسی کورد ڕەمزی قەزاز پێی وایە جیا لەو هۆکارانەی کە باسمانکرد تورکەکان هۆکاری دیکەش وای لێ کردن کە جارێکی دیکەش سمکۆ بۆ هێڵی سیاسەتەکانی خۆیان رابکێشنەوە. لەبەر ئەوەی ئینگلیزەکان بۆ بەربەرەکانی کردن لەگەڵ هەوڵەکانی سەرهەنگ ئۆزدەمیر پاشا، فەرمانیان دا بەو نەستورییە مەسیحیانەی لەژێر پشتیوانی خۆیاندابوون، کە هێرش بۆ سەر ناوچەکانی هورەمار، زاخۆو جۆلەمێرگ بەرن، مستەفا کەماڵ هەوڵی دەدا بۆ بەربەرەکانی کردنی لەبەرانبەر ئەوانەدا کەڵك لە سمکۆ وەربگرێ.(٤٣)

لە لایەکی دیکە شێخ مەحموود بەرزنجی لە بەهاری ساڵی (١٩٢٣) دا، لە سەرەتای شەڕێکی یەك لاکەرەوە دابوو لەگەڵ ئینگلیزەکان و فڕۆکەکانی بەریتانیایی لە ڕۆژەکانی ١٦و ١٩٢٣/٢/٢٣ بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵك، کاغەزیان بەسەر شاری سلێمانیدا بڵاوکردەوە کە لەودا داوایان لە خەڵکی شارو، شێخ مەحموود و سمکۆ کرد بوو کە شار بەجێ بهێڵن بۆ ئەوەی لە بۆردوومانەکاندا زەرەرو زیانی گیانیان لێ نەکەوێ.(٤٤)

ئەو ئاڵوگۆڕانە بوونە هۆی ئەوەی لە ١٩٢٣/٢/٢٨دا سمکۆ شاری سلێمانی بەجێ بهێڵێ و بۆ ئەوەی پاشماوەی ژیانی خۆی بەتەواوەتی لە خزمەت سیاسەتەکانی تورکیە دابێت سەرۆکی شکاکەکان ناچار بوو کە بچێتە تورکیەو لەو ماوەیەدا بەهۆی هەوڵەکانی کۆمەڵەی تورکیە و هەروەها ئەو خێرایییەی کە ڕووداوەکان بەخۆیان گرتبوو، ژەنڕاڵی تورك کازم بەکر پاشا، کوڕەکەی (سمکۆ)و هەزار لیرەی لەو پارەیەی کە دەستی بەسەر داگیرا بوو بۆ ناردەوە.(٤٥)

لەسەرەتاکانی هاوینی (١٩٢٣)دا ئینگلیزەکان بەخێرایی دەست بەکاربوون‌و لە دوو لایەنەوە هێرشیان کردە سەر ڕەواندز" دەستەیەك لە سەربازان لەگەڵ جەنگاوەرانی هەرکی لەژێر فەرمانی سەید تەهاو دەستەیەکی دیکەش لە هێزەکانی بەریتانیا، ئابلۆقەی ڕەواندزیان دا، کە لە ئاکامدا سەرهەنگ ئۆزدەمیر بێتێکهەڵچوون و شەڕ هێزەکانی خۆی لە بیست و دووی نیسانی ١٩٢٣ لە ناوچەکە دا بردە دەرێ‌و دەوڵەتی بەریتانیا سەید تەهای کردە فەرمانڕەوای ڕەواندز.

سمکۆی شکست خواردوو لەو کاتەدا ئامادە بوو ڕادەی هاریکارییەکەی خۆی لەگەڵ کەمالییەکان پەرە پێ بدا، چونکە پاش سەرکوتکردنی شێخ مەحموودو وەدەرنانی هێزەکانی تورکیە لە باکووری عێراق، ئیتر هیچ حەشارگەیەکی لەو وڵاتەدا نەمابوو، ئینگلیزەکانیش ئامادە نەبوون پشتیوانی لێ بکەن‌و تەنیا کەسێك ئامادەی وەرگرتنی سمکۆ بوو ئەویش مستەفا کەماڵ بوو. دوای بۆردوومانی سلێمانی لە لایەن ئینگلیزەکانەوە، کۆمەڵەی تورکیە توانی کارێك بکا کە کوڕەکەی ئازاد بکرێ و هەزار لیرەش لە داراییە دەست بەسەر گیراوەکەی بۆ بگەڕێننەوە، پاشان بۆ شاری وان بانگهێشت کرا هەتا مەرجەکانی هاوکاری کردنی لەگەڵ دەوڵەتی تورکیە تاوتوێ بکرێت. سمکۆ لەگەڵ ڕەشید جەودەت و ئەحمەد تەقی چوون بۆ پێگەی ژەنەڕاڵ سلێمان سەبری بەگ فەرماندەی هێزەکانی ئاسیایی تورکیە لە شاری وان و ئەفسەری تورك بەتیپێکی سەربازی پێشوازی لە سمکۆ کردو هەروەها سەرۆك عەشیرەتە کوردییەکان لە هەردوو دیوی سنوور چاوپێکەوتنیان لەگەڵ سمکۆ کرد بەو جۆرەی کە ئەحمەد تەقی نووسیویەتی، ژەنەڕاڵ سەبری بەگ هەندێك تفەنگ و تەقەمەنی بە سوپای سمکۆ داوەو هەروەها پێی گوتووە: "حکومەتی تورکیە دەیهەوێ هەزار سەربازی تورکی بەجل و بەرگی کوردی و چەکەوە تەواو تەیار بکاو بیانخاتە ژێر دەستی تۆوە، هەروەها ئیجازە بەعەشایەری ژێر دەسەڵاتی تورکیە دراوە هاوکاریت بکەن. جووڵەی خۆت لە ئێرانەوە دەست پێ بکەو دەست بەسەر ناوچە کوردنشینەکان دابگرەو براکەت ئەحمەد ئاغا بکە بەجێگری خۆت‌و بەهەموو هێزەکەتەوە بەرەو ناوچەکانی باشوور بڕۆ."[٤٦]

هەروەها ئەفسەری تورك داوای لە سمکۆ کرد لە هیچ شوێنێك باس لە ناوەڕۆکی ئەو دانوسانندنە نەکا، بۆ خۆی پاشان چوو بۆ ناوچەی باش قەڵاو هەتا ئەو خێزانەی کە بۆ ئەو کارە لەبەر چاو گیرابوون ڕێك بخا، بەڵام سەرۆکی شکاکەکان زۆر شانسی نەبوو، چونکە هەر ئەو ڕۆژەی کە تورکەکان خەریکی ئامادەکردنی پیلانێك بوون بۆ نانەوەی ئاژاوە لە ئازربایجان و کوردستانی ئێراندا، نوێنەری تورکیە و بەریتانیا لە لۆزان ڕێککەوتن ڕێکەوتنامەیەکی بەرایی بۆ دیاریکردنی هێڵی سنووری تورکیە و عێراق لە لایەن هەردوو لایەن واژۆ (ئیمزا) کراو قەرار بوو کێشەی موسڵ لە ڕێگەی گەڕانەوە بۆ رای خەڵکی ئەو ناوچەیە لە ڕێگەی ریفراندۆم چارەسەر بکرێ.[٤٧]

پەیمانی لۆزان کە لە (٢٢ حوزەیرانی ١٩٢٣) لە نێوان تورکیە و وڵاتانی سەرکەوتوو لە شەڕدا ئیمزا کرا، بواری بۆ ڕێکەوتنی برۆکسل پێك هێنا کە لە ئاکامی ئەودا شوورای کۆمەڵەی گەلان لە (١٦ دیسێمبەری ١٩٢٥) هێڵی سنووری نێوان عێراق و تورکیە کە پاشان بەهێڵی برۆکسل ناسرا پەسەند کرد.[٤٨]

ئەو گۆڕانکارییانە بوونە هۆی ئەوەی کە هیچ کات بوار بۆ ئیمکانی دروستبوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە ئەرمەنستان و کوردستاندا نەڕەخسێت و کوردەکانی تورکیە و عێراق کە پێشتر بەپێی پەیمانی سیڤەر (sever) بەشایستە دانرا بوون بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی، بۆ هەمیشە لەو مافە بێبەش بوون، بەڵام دەرەنجامەکانی پەیمانی لۆزان لە هەموویان زیاتر زەرەرو زیانی بەسمکۆ گەیاند. ئەحمەد تەقی کە لە هەموو شوێنێك لەگەڵ سمکۆ بووە، دوای چوونی ژەنەڕاڵ سەبری بەگ بۆ باش قەڵا ئەویش لەگەڵ خانی کورد بۆ ئەو ناوچەیە چووە هەتا خۆ ڕێکخستن و ئامادەکردنی سەربازانی تورك ببینێ کە قەرار بوو لە خزمەت سمکۆ دابن، بەڵام لە دواساتەکاندا لە لایەن مستەفا کەماڵەوە تەلگرافێك بەژنراڵ سەبری بەگ گەیشت کە لەودا نووسرا بوو:

"بەهۆی بارودۆخی نێو نەتەوەیی ناچارین بۆ ماوەیەك جووڵانەوەی ئیسماعیل ئاغا، دوا بخەین، سەربازەکان بگەڕێنەوە وان و سڵاوی منیش بە ئیسماعیل ئاغا بگەیەنن و ڕێزی لێ بگرنو هەموو ئیمکانیاتی خۆشی ژیانی بۆ دابین بکەن، بەپشتیوانی خوا لە دەرفەتەکانی داهاتوودا یارمەتی دەدەین"[٤٩]

بەو شێوەیە سمکۆ دوایەمینو تەنیا بەختی خۆشی بۆ لە سەرڕا ڕێکخستنەوەی هێزە سیاسیو سەربازییەکانی لە دەستدا هەر بۆیە لە پاشماوەی ژیانیشیدا پشتی بەسوپای تورکی و هێزی عەشایری ئەو ناوچەیە دەبەستو تەنانەت کەماڵییەکان خۆیان لەو بەڵێنانەش بوارد کە بەهۆی وەفدی نێردراوی ئۆزدەمیر پاشا بۆ سلێمانی دابوویان بەخانی کورد، کە بەپێی ئەو دەبووایە زەوییە بەپیتەکانی ناوچەی شەمدینانو وانی پێ بدەن.

لەوەڕا سمکۆ دەسەڵات و هێزی خۆی لەناو عەشایری ئازەربایجاندا لەدەست داو بەلەبەرچاوگرتنی سەرکەوتن و پتەوبوونی دەسەڵاتی سیاسی بەریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەتایبەت ئێران و عێراقداو بەهێزبوونی بناغەی سیاسی و سەربازی حکوومەتی پەهلەوی و چاوەدێری کاریگەرو باشی سوپای تازە دامەزراوی ئێران بەسەر سنوورەکان و هەروەها سەرەتای داواکاریو ویستەکانی نەتەوەپەروەرانی کوردی تورکیە و سەرهەڵدانی چەند شۆڕشێك لەناو کوردەکانی ئەو وڵاتەدا، هەموو

ئەوانە بوونە هۆی ئەوەی کەئیمکانی کەڵك وەرگرتن لە سمکۆ لە لایەن کەمالییەکانەوە دژوار بێ، بەڵام دیارنەبوونی هێڵی سنووری لە نێوان ئێران و تورکیە لە لایەك و سەرهەڵدانی شۆڕشی ئارارات لە ساڵی ۱۹۲۷/ ۱۳۰٦ ک.ش لە لایەکی دیکە ئەو فاکتەرانە بوون کەوای لە کەمالییەکان کرد جارێکی دیکەش سمکۆ بۆ ناوچە سنوورییەکان بەرێ بکەنەوەو تورکیە کە بەنۆبە کەلکی لە عەشایری ئازربایجان وەرگرتبوو بۆ زەرەر گەیاندن بەبەرژەوەندی ئێران، ئێستاکە بۆ جلەوکردنی ڕاپەڕینی کوردەکانی ژێر دەستی خۆی دەیهەویست کەڵك لەو عەشایرانە وەربگرێ. کاوە بەیات لەو لێکۆڵینەوە فراوانەی خۆیدا لە بابەت شۆڕشی ئارارات و کاریگەری بەسەر پەیوەندییە دەرەکییەکانی ئێراندا لە ماوەی ساڵەکانی (۱۳۰۷ — ۱۳۱۱) ۱۹۲۸-۱۹۳۲ز دا، بەپشت بەستن بەبەڵگەنامەی زۆرو جۆراو جۆر نیشان دەدا کە کەمالییەکان هەتا بەیەکجاری سەرکوتکرانی شۆڕشی ئارارات و وەدەست هێنانی ڕێکەوتنێکی روون لە بابەت دیاریکردنی سنوور لەگەڵ ئێراندا، وەك کارتێکی گوشار لەدژی ئاسایش و مافی حاکمیەت و دەسەڵاتی ئێران کەلکیان لە سمکۆ وەردەگرت.(٥٠)

ڕێکەوتنامەی دیاریکردنی سنووری نێوان ئێران و تورکیە کە کاری دیاریکردنی ئەو سنوورە لە بەندەکانی ئەو ڕێکەوتنامەیە داهاتبوو هەر لەساڵی (۱۳۱۱) ۱۹۳۲ز وە دەستی پێکردو لە ناوەڕاستی ۱۳۱۳ ۱۹۳٥ز دا کۆتایی پێهات بەهۆی، ئاکامی ڕێکەوتنی ئەو دوو دەوڵەتە لە دانوساندنە چڕو درێژخایەنی ساڵەکانی( ۱۳۰۷ — ۱۳۱۰) ۱۹۲۸-۱۹۳۱ز دابووو لەهەر لایەکەوە چاوی لێ بکەین بەزەرەری بەرژەوەندی ئێران تەواو بوو، بەپێی ئەو ڕێکەوتنە ڕژێمی پەهلەوی نە تەنیا قەڵای ستراتیژی ئاراراتی لە دەستدا، بەڵکو بەهەموارکردنی ڕێگای سەرکوتکردنی کەمالییەکان بۆ شۆڕشی ئارارات، بوو بەهۆی بێزاری کوردەکان لە کارایی ئێران و سیاسەتەکانی ئەو دەوڵەتە، چونکە هەتا ئەو کاتە کوردەکان خۆیان بەبرا بچووکی فارسەکان دەزانی‌و لە خەباتیان لە دژی ڕەگەزەکانی زەرد و سامی چاوەڕێی یارمەتیان لەبرا گەورەکەیان (فارسەکان) هەبوو، بەڵام بەداخەوە ڕژێمی پەهلەوی بێ بوونی هیچ بەڵگەیەك  کە عەقڵ قەبووڵی بکاو بێ ئەوەی کە ئەو ڕاپەرینە بچووکترین هەڕەشە بخاتە سەر کوردستانی ئێران، مەیدانی بە کەمالییەکاندا بۆ ئەوەی کە ئەو ڕاپەڕینە خامۆش بکەن.

بەڵام ڕۆڵی سمکۆش لێرەدا جێگەی سەرنجە و هاوکاری ئەو لەگەڵ کەمالییەکان دروست لە کاتێکدا ئەوان (کەمالییەکان) خەریکی کوشتارو بنبڕکردنی کوردەکانی ژێر دەستی تورکیە لە ئارارات بوون، جارێکی دیکە نیشانی دا کە ئەو هیچ پەیوەندی و حەزێکی بە ئایدیای نەتەوەپەرستانەی کوردەکانی تورکیە و عێراقەوە نییە و حەزی لێیە وەك رابردوو بە پشت بەستن بە تورکەکان، دەسەڵاتی

دەرەبەگایەتیی خۆی جارێکی دیکە لە ڕۆژئاوای ئازەربایجاندا بگەڕێنێتەوە سمکۆ ئەگەر جار جار باسی پێك هێنانی کوردستانی سەربەخۆو مافی کوردەکانی دەکرد، تەنیا مەبەستی ئەوە بوو بەو هەلوێستانەی یارمەتییەکانی کۆمەڵەی عێراق و تورکیە بۆ خۆی مسۆگەر بکاو ئەو لەژێر پەردەی ئەو ئیدعایانەدا دەیهەویست بە داخوازە سەرەکییەکانی خۆی بگا کە حکوومەتکردن بەسەر ئازربایجان دا بوو.

لە تەموزی ساڵی ۱۹۲۳ کاتێك کە تەلگرافی مستەفا کەماڵ کە باس لە ڕاگرتن و تەیار نەکردنی سمکۆ دەکات بەژەنەڕاڵ سەبری بەگ سنووورداری تورکیە لە ڕۆژهەلاتی ئانادۆڵ گەیشت، سەرۆکی شکاکەکان کە دەرفەتێکی زێڕینی لەدەستدابوو پەردەی لەسەر نییەتەکانی خۆی بۆ هاوکاریکردنی لەگەڵ تورکەکان هەڵدایەوەو لە لای ئەحمەد تەقی دانی بەوە ناوە کە ئەو حەزی لە حکوومەت کرد نە بەسەر ئازربایجانی ڕۆژئاواو هەروەها گوتی:

"هیچ کات بارودۆخێکی ئاوا گونجاوم بۆ نەڕەخسابوو، تەنیا ئەوەندە بەس بوو کە بگەم بە خاکی ئێران و ئەو ناوچانەی کە دەمەویست دەستیان بەسەردا بگرم، ئیتر پاش ئەوە هیچ کات وەدوای سیاسەت نەدەکەوتم."(۵۱)

لە ساڵی (۱۳۰۹) ۱۹۳۰ کە هێشتا سمکۆ هەوڵی دەدا لە بەڕێوەبردنی ئازربایجانی ڕۆژئاوادا ڕۆڵی هەبێ دوای دانووسانی لەگەڵ دەوڵەت، بەڕواڵەت لە لایەن شای ئێرانەوە لەسەر حکوومەتی شنۆ دامەزرا، بەڵام ئەفسەرانی سوپا کە هیچ لەو دڵنیانەبوون بەفێڵ و تەڵەکە لە شنۆیە کوشتیان. بەو شێوەیە سمکۆ بەپێچەوانەی شێخ مەحموودی بەرزنجی و شێخ سەعیدی پیران و ڕێبەرانی شۆڕشی ئارارات کە نوێنەرانی ڕاستەقینەی ناسیۆنالیزمی کورد بوون و لەسەر حیسابی لایەنێکی دیکە مساوەمەیان نەدەکرد، بێ بوونی بەرنامەیەکی ڕوون و داڕێژراو، هەتا دوایین ساتەکانی ژیانی تەنیا لە بیری دەسەلاتخوازیو بەدەست هێنانی دەسەلاتێکی لۆکالی (ناوچەیی) دابوو و هەر لەسەر بنەمای ئەو ئامانجە دەسەلاتخوازییەش بوو کە تورکەکان بۆ پیادەکردنی پیلانی خۆیان ئەویان بەباش زانیبوو.

ئەگەر چاو لە ئامانجەکانی تورکیەی کەمالی بەنیسبەت پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئێراندا بکەین، دەبینین جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ ئارەزوو و نییەتی حکوومەتی عوسمانی و تورکە لاوەکاندا نەبوو تاڕادەیەکی زۆریش لەوان بۆیان بەمیرات مابۆوە.

گرینگترین ئامانجەکانی تورکیە لە یارمەتیدانی سمکۆ بریتی بوون لە:

هەوڵدان بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی زەوی لە ئێران و دەست بەسەر داگرتن بەسەر ناوچە ستراتیژییەکانی وەك ماکۆ، قوتورو قەڵای ئاراراتی بچووك کە بەپێی بڕیارەکانی کۆمیسیۆنی دیاریکردنی سنوور لە ساڵی (١٩١٣) ببوونە بەشێك لە ئێران.

قۆستنەوەو کەڵك وەرگرتن لە لاوازی ئێران بۆ جیاکردنەوەی ئەو ناوچانەی کە دەکەونە نێوان مەهابادو لاجانو زنە و سۆمای و برادۆست کە لە بارودۆخی ئاسایی و ئارامیدا جیاکردنەوەی ئەو ناوچانە نامومکین بوو، بەڵام بەبوونی کەسانێکی وەك سمکۆ و ئاژاوە نانەوە لەو ناوچانەدا بەدەستی وەها کەسانێك، تورکەکان بۆ بەدەست هێنانی وەها ئیمتیازێك بەختی زیاتریان هەبوو، ناردنی چەك و تەقەمەنی و هەروەها ڕاوێژکاری سەربازی، ناردنی سەربازانی تورك بەجل و بەرگی کوردی بۆ سمکۆ پێشتریش دیاریکردنی ئەرکەکانی ئەو، هەموویان لە خزمەت ئەو ئامانجەدا بوون کە بێسەروبەری لە ئازربایجانی ڕۆژئاوادا دروست بکا.

ئەگەر کەمالییەکان بەئامانجە ناشەرعییەکانیان گەیشتبان، لەوانە بوو سمکۆ تاماوەیەك توانیبای دەسەڵاتی خۆی بپارێزێت لەسەر ئەو ناوچانەی کەدایبڕیبوون، بەڵام هەر بەو شێوەی کە(ئەحمەد تەقیش) نیشانی داوە قەرار بوو زەوی و زاری بەپیت لە ناوچەکانی شەمدینان و وان (لەناو خاکی تورکیە) بەسەرۆکی شکاکەکان بدرێتو ئەو خاڵەش لە خۆیدا دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە لانی کەمی ڕۆڵی سمکۆ لەو کارانەدا، ڕۆڵێکی ناوچەیی بوو و ئیمکانی نەبوو کە مستەفا کەماڵ هەر لەبنەڕەتدا دژی بوونی نەتەوەی کورد بوون، ڕازی بن بەدامەزراندی کوردستانێکی سەربەخۆ، ئەویش لە شوێنێك کە هاوسێی تورکەکان بێ.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بەو خاڵە بکرێت کە جۆری پەیوەندی سمکۆ لەگەڵ تورکەکان دەکرێ لەگەڵ پەیوەندی (شێخ خەزعەل) لەگەڵ بەریتانیادا بەراورد بکرێ لەو جێگایەوە کە هەم سمکۆ و هەم (شێخ خەزعەل) نوێنەری ئینتمای جوداخوازی کوردەکان و عەرەبەکان لە دەسەڵاتی ناوەندی بوون، هەر لەبەر ئەو هۆیەو هەروەها بەهۆی گرینگی ستراتژیکی ناوچەکانی ژێر دەستیان بوو کە بوونە جێگەی سەرنجو پشتیوانی وڵاتانی بێگانە و هیچ کام لەوانە ناتوانرێ بەنوێنەرانی ناسیونالیزمی کوردی و عەرەب لە ئێراندا دابنرێن. بەگشتی دەبێ بڵێین سمکۆ هیچ کات لە سەنتەری جووڵانەوەیەکی نەتەوەخوازی کوردی دانە بووەو وەك (شێخ خەزعەل) تەنیا بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندی ناوچەیی و لۆکاڵی خۆی لە هەوڵ و تەقەلادا بووە.

# داگیرکردنی سابلاغی موکری (مەهاباد)

سەرکەوتنەکانی جەنگاوەرانی ژێر فەرمانی سمکۆ لە ڕوویەروبوونەوەیان لەگەڵ هێزە دەوڵەتی‌و ناوچەییەکان و دەست بەسەر داگرتنی بەسەر شاری ورمێ، سەڵماس، ناوچە بەپیتەکانی نێوان ماکۆ و خۆی لە باکوورو هەروەها سەردەشت لە باشوور، سەرنجی عەشایری موکری بۆ لای خۆی ڕاکێشا، چونکە ئەوانیش دەیانویست لەو ئاڵان و بڕۆیەی لە ئەنجامی ئەو هێرشکارانەی عەشایری شکاکدا بەدەست هاتبوون بەشیان هەبێ. جووڵێنەری عەشایری موکری بۆ وەها هەڵوێست وەرگرتنێك بە زۆری.بۆ تاڵانکردن و بەدەستهێنانی داهاتی زۆرتر بوو، چونکە ئەوان هەتا پێش هێرشکارەکانی عەشایری شکاك هێشتا بەنیسبەت دەوڵەتی ناوەندی وەفادارمابوونەوەو بەوتەی کەسرەوی "... تا ئێستا ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکانی سابلاغ و شوێنەکانی دیکە لەو هێرشەدا هاوکاریان لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەتیدا دەکرد...".(١)

مارتین ڤان برویەنسن لەسەر ئەو باوەڕەیە کە جێبەجێ نەکردنی خاڵەکانی ڕێکەوتنامەی نێوان سمکۆ لەگەڵ سەرهەنگ فیلیپۆف لە لایەن سەرۆك عەشیرەتی شکاکەوە جارێکی دیکە پێگەی ئەوی لە نێوان کوردەکانی ناوچەکە پتەو کردەوەو ئەو توانی جارێکی دیکە کۆنترۆڵی دەشتەکانی ورمێ‌و سەڵماس و بەشی باشووری خۆی بەدەست بگرێ لە ورمێدا کەسانێکی وەك (ئەرشەد ئەملولك)و تەیموور ئاغای گزرەی کردە جاکمی ئەو شارە (٢) تەیموور ئاغا یەکێك لە سەرۆکە گەورەکانی شکاك‌و هەروەها لە خزمەکانی سمکۆ بوو.

بەپەرەستاندنی دەسەڵاتی سمکۆ حەزێکی دوو لایەنی زۆر لە نێوان سمکۆ و سەرۆك عەشیرەتەکانی موکری بۆ پێکهێنانی یەکێتییەکی گەورەی عەشایری کورد لە ئازەربایجاندا پێکهات و بارودۆخی سیاسی و سەربازی ئەو ناوچەیەو ئەو بۆشاییەی لە ئەنجامی نەبوونی دەوڵەتی ناوەندی لەو ناوچەیەدا دروست ببوو، بە ئەنجام گەیشتنی وەها کارێکی زۆر زیاتر مومکین کرد. جموجۆڵەکانی سمکۆ بەر لە هێرش کردنە سەر سابلاغ بۆ بەدەست گرتنی ڕێبەری عەشایری ناوچەکە بە شێوەیەکی بەرچاو پەرەیستاند بوو کە نیشانەی پان و بەرینی ئامانجەکانی ئەو بوو بۆ دەست بەسەرداگرتنی ئازربایجانی ڕۆژئاوا.

ڕۆژنامەی ئەستێرەی ئێران (ستاره ایران) لە ژمارەی ڕۆژی چوارشەممەی ١٦ی زیقعدەی ساڵی ١٣٤٠ کـ. ق ١٩١٩ز خۆیدا ئاوا باس لە ئاسانکاری سمکۆ بۆ پێك هێنانی یەکیەتییەکی عەشایری لە ڕێبەرایەتی (سمکۆ) خۆی دەکا:

"بەگوێرەی ئەو ڕاپۆرتەی کەبەدەستمان گەیشتووە ئیسماعیل ئاغای سیمتقۆ (سمکۆ) دوای پتەوکردنی ئەو ناوچانەی لەژێر دەستیدایە، بەو دواییانە دەیهەوێ عەشایری کوردستان بۆ لای خۆی رابکێشێ و ماوەیەکە چەند نوێنەرێکی بۆ سنووری کوردستانو بۆ ناو عەشایر و هۆزەکان ناردووە کە دانوساندنیان لەگەڵ یەکتر کردووە کە بۆ بەهێزکردنی خۆی ئەوان بۆ لای خۆی رابکێشێ.

بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی لەو بوارەدا هەندێك پێشبینی لە لایەن دەوڵەتەوە لەوبارەیەوە کراوە، هەر بۆیە هێزە سەربازییەکانی لە ناوچەکانی کوردستان و ساین قلعه (شاهین دژ) و ناوچەکانی دیکەی کوردستانیان زیادکردووە. چاوەڕوان ناکرێ کە هەنگاو و هەوڵەکانی نوێنەرانی ئیسماعیل ئاغا لە نێو هۆز و عەشایرەکانی ئەو ناوچانەدا زۆر کاریگەربن."[٣]

هەروەك روونە لە تارانەوە شۆڕشی سمکۆیان زۆر بەجیدی نەدەگرت کە هەر ئەو کەمتەرخەمیو سستییەی کاربەدەست و لایەنە پەیوەندیدارەکانو چاپکراوەکانی پایتەخت بە هۆکارەکانی گەشەکردنی شۆڕشی سمکۆ دادەنرێت. هەر بۆیە سمکۆ لە مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٣٤٠ ك.ق ١٩١٩ز ئامادەی هێرش کردنە سەر سابلاغ (مهاباد) بوو، بەڵام هێشتا نەیتوانی بوو هەموو عەشایرەکان بهێنێتەوە ناو چوارچێوەی ئەو یەکیەتییەی کە دەیەویست پێکی بهێنێ. دوکتۆر ئاسۆ پێی وایە کە تەنیا ((دوای گیرانی شاری "مەهاباد" بوو کە عەشایری موکری ئامادەیی خۆیان بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ سمکۆ نیشان داو هەندێك کەس بەویستی خۆیان و خۆبەخشانە چوونە ریزی هێزەکانی ئیسماعیل ئاغاوە.))[٤]

بەڵام ئەو هێزە سێ تا پێنج هەزار کەسییەی سمکۆ کە تەنیا هەزار کەس لەجەنگاوەرانی شکاك لەناویاندا وەبەرچاو دەکەوت کە بەیەقینی لە لایەن عەشیرەتی هەرکی، کە لەژێر فەرمانی سەید تەها دابوون، هەروەها لە لایەن هۆزەکانی مامەش مەنگوڕو پشدەریش بەتەواوەتی پشتیوانیان لێ دەکرا. لە سەرەتادا سەید تەها لەگەڵ هەرکییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە هێرشی کردە سەر ژاندارم (هێزی ئاسایش)ەکانی ماژورو مەلەك زادە لە سابلاغدا، بەڵام لەو هێرشەدا شکستی خواردو پاشاکشەی پێکراو لە ڕۆژی دواتر سمکۆ لە هێرشێکی لەناکاودا هێزی هەشت سەد کەسی ژاندەرمەکانی تێك شکاندو زیاتر لە چوار سەد

کەسی لێ بەدیل گرتن کە پاشان هەموویانی تیرباران کرد، شکاکەکان هەر بەزوویی هاتنە ناو شارو هەموو ماڵ و داهاتی خەڵکی شاری سابلاغیان بەتاڵان برد. تاڵان کردنی خەڵکی کورد لە لایەن سمکۆوە لە حوکمی ئەزموونێکی گەورەو هەڵبژاردنێکی چارەنووس سازدا بوو لە نێوان پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردیدا، کە دەیتوانی پایتەختی ئەو حکوومەتە شاری مەهاباد بێ‌و یان مانەوە لە شێوەی رێبەری یاخیبوونێکی سادەی فیوداڵیدا بوو کە هیچ جۆرە ئامانجێکی نەتەوە پەروەری نەبوو.

کریس کۆچێرا کە سمکۆ بەیەکێك لە باوکەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی دادەنێ بەو شێوەیە پاساو بۆ هەنگاو ناڕاستەکانی سمکۆ دێنێتەوە:

"هێزەکانی سمکۆ دوای دەست بەسەرداگرتنی مەهاباد، ئەو شارەیان تاڵان کرد کە هەر ئەو کارەش بوو بەهۆی ئەوەی زۆربەی خەڵك خۆی لێ دوورە پەرێز رابگرن، لە کاتی شەڕدا گەورە پیاوێکی شار بەناوی قازی لەتیف کوژراو موڵك و ماڵی زۆر لە گەورەکانی دیکەی شار بەتاڵان بردرا، چەند حەوتوو دواتر سمکۆ لە چاوپێکەوتنێکی کە لەگەڵ مستەفا پاشا نێردراوی یەکێك لە یانەکانی کوردی قوستەنتەنییە ئەنجامی داوە لە بابەت ئەو رووداوە بیروڕای خۆی دەربڕی. بەو شێوەیەی کە ئەو دەڵێ کاتێك لە مەهاباد نزیك کەوتەوە، گەورەو سەرۆکەکانی شاری بۆ لای خۆی بانگهێشت کرد، بەڵام ئەوان نەچوون و هەروەها خەڵکی سابلاغ هیچ نوێنەرێکیان بۆ لای ئەو نەنارد. پاشان سمکۆ دەڵێ کە ئێرانییەکان لە چوارچێوەی شارەکەیان بەشەڕ رازی بوونەو لە ئاکام دا شار بەهێرشێك گیرا، خەڵکی شارەکە بوون بەقوربانی ئەو کارەیان، لە لایەکی دیکە شکاکەکانیش زەرەروزیانی گیانیان لێکەوت، بەڵام لە بابەت تاڵانکردنی شارەکە سمکۆ لەو باوەڕەدایە سەرەڕای ئەوەی ئەو بەو کارە رازی نەبووە بەڵام نەدەکرا پێش بەو کارە بگیرێ‌و ... پاشان دەڵێ "هەوڵ دەدەم لە دڵی خەڵکی دەربهێنم." وەکو دیارە هەوڵەکانی سمکۆ بۆ دڵدانەوەی گەورە کەسایەتی دیارەکانی شار بێهودە بووبێ، چونکە هەتا ئەو رۆکەش خەڵکی مەهاباد لە بارەی سمکۆوە سەرەڕای ئەوەی کە لە لایەنێکەوە بەباوکی ناسیۆنالیزمی کورد ناسراوە، بەڵام زۆر بەتاڵی باسی لێوە دەکەن.(٥)

ئەو دانەری فەڕانسەوییە هۆی شکستی ژاندەرمەکان (ئەمنیە) لە لایەك دەگێڕێتەوە بۆ سەر رێکوپێك نەبوونو بێ بەرنامەییانو لە لایەکی دیکەوە سەرهەڵدانی رق و قینی خەڵك لە شاری مەهاباد بەدژی ئەوان بە هۆیەکی دیکەی شکستەکەیان دەزانێ.(٦)

بەڵام راستییەکان پێچەوانەی ئەوە دەردەخەنو بەپێی نووسینەکانی محەممەد تەمەدون و دوکتۆر ئاسۆ، خەڵکی مەهاباد نەتەنیا "نوێنەر"یان بۆ لای سمکۆ ناردووەو داوایان لەو کردووە شارەکە تالاّن نەکات، هەروەها داوایان لێ کرد دیلەکانی ژاندەرمە ئازاد بکرێنو نەکوژرێن. نووسەرانی وەك کوچێرا هەموو کات هەوڵ دەدەن بەکەڵك وەرگرتن لە متێودی مەقەست و چەسپ (واتە برینو پێکەوەنان) بەرەیەکی کوردی لە بەرانبەر بەرەیەکی ئێرانیدا زیاد بکەن و راستییەکان ئاوەژوو نیشان بدەن. محەممەد تەمەدون دەنووسێ خەڵکی مەهاباد نەیانهێشت نایب هاشم خان کە یەکێك لە ئەفسەرانی ژاندەرمەری بوو.[٧] بەدەستی شکاکەکان بکوژرێ.

گێڕانەوەی ئەو ڕووداوە لە زاری کەسێکی خەڵکی شاری مەهاباد لەو کاتدا بەچاوی خۆی هێرشی سمکۆی بینیوە، ئیدعای تەمەدون دەسەلمێنێ.

دوکتۆر ئاسۆ لەزاری باوکییەوە کە بەچاوی خۆی ئەو ڕووداوەی بینیوە دەنوسێ:

"دوای داگیرکردنی شاری مەهاباد لە لایەن سمکۆوە ژمارەیەك لە پیاو ماقووڵان و جێباوەڕانو پیاوانی ئایینی و سەیدەکان و هەروەها بازرگان و زاناکان بەکۆمەڵێك پێشکەشیو خەلاّتەوە دەچنە لای ئیسماعیل ئاغا کە ئەوکات لە دەرەوەی شارو لە شوێنی کوشتارگاکەی (ژاندەرمەرییەکان) بووە هەتا ملکەچی و ڕیزی خۆیان نیشان بدەنو هەروەها داوای بەخشینی ژاندارمەرییەکانو پاراستنی شاری لە تالاّن و دەستدرێژی لێ بکەن. بەلاّم ئەو تاقمە لەنوێنەرانی شار، هەوەڵین کەسانێك دەبن لە لایەن هێزی چریکی و چەکدارەکانی ئیسماعیل ئاغاوە ڕووت دەکرێنەوەو بە دەرپێوە (ژێر پانتۆڵ) دەیانگەڕێننەوە بۆ شارەکە پاشان کرداری ناپاکی کوژرانی ژاندارمەرییەکان ڕوودەدا. پاشان شار بەزوویی لە لایەن هێزەکانی ئیسماعیل ئاغاوە تالاّن کرا. قازی لەتیفی بەستەزمان کە دوای ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەیە تازە لە مەنفای رووسەکان بۆ وڵات گەڕابۆوە، بەدەستی هێزەکانی شکاك شەهید کرا. تاقە نەخۆشخانەیەکی ئەمریکایی کە لە تەنیشت مزگەوتی سوور بوو، تالاّن کراو سەرۆکی نەخۆشخانەکەشیان کوشت و خێزانی پاشان پەنای بۆ سەید تەها برد، ئەو توانی ئەو ژنە لە مەیدانی شەڕ ڕزگار بکاو پاشان بۆ دەرەوەی بنێرێتەوە ..."[٨]

بەو شێوەیە دەبینین خەڵکی شاری مەهاباد نەتەنیا دوژمنایەتیان لەگەل ژاندەرمەکان نەبووە، بەڵکو بەپێچەوانەی ڕاپۆرتی مستەفا پاشا، وەفدێکی تەواو کە لە هەموو چین و توێژەکانی پێك هاتبوو بۆ چاوپێکەوتن چوون بۆ لای سمکۆ بۆ ئەوەی ڕازی بکەن شارەکە تالاّن نەکا، بەڵام ئەو قەبوولّی نەکرد، هەڵسوکەوتی دوای سەرکەوتنەکانی، ئەوە دەسەلمێنن کە کورد و ئازەری و

مەسیحی لای سمکۆ هیچ جیاوازییەکیان نەبووەو ئەو تالآنکردنی ماڵ و دارایی کوردەکانیش بەکردارێکی ئاسایی لێك داوەتەوە ئەگەر بەو شێوەیەی کە کریس کۆچێرا لاف لێ دەدا سمکۆ لە لایەك یەکێك لە باوکانی ناسیۆنالیزمی کوردی لە ئێراندابووە، ئەدی بۆچی هیچ جۆرە پەیوەندییەکی "تایبەتی" لەگەڵ کوردەکان نەبووە؟ بۆچی ئەو هەڵسوکەوتەی لەگەڵ ئازەرییەکان هەبوو هەمان هەڵسوکەوتی لەگەڵ کوردەکانیش لەخۆی نیشان دا؟

بۆچی هیچ جۆرە جیاکاری و جیاوازییەکی لە نێوان کورد و نەتەوەکانی دیکەی ئێراندا، دانە دەنا؟ جەنگ بەهۆی کوشتاری ژاندەرمەکانەوە چووە قۆناغێکی دیکەوەو (موخبیر ئەلسەڵتەنە) حاکمی تەورێز هێزێکی تێکەڵاو لە ژاندەرمەری لەژێر فەرمانی سەرهەنگێکی سویدی بەناوی لوند برگو هەروەها هێزە ناوچەییەکان لەژێر سەرکردایەتی ساڵحان ئەمیر ئەرشەدی قراچەداغی کە بەگشتی ژمارەیان (١٥٠٠) کەس دەبوو ئامادەی شەر لەگەڵ کوردەکان کرد. تێکهەڵچوون لە (٢٨ ئازەری (خەزەڵوەری) ساڵی ١٣٠٠) ١٩٢١ز لە داوێنی کێوی شکریازی لە نێوان خۆی و سەڵماس دەستی پێکرد، کە لە سەرەتادا سەرکەوتن بەدەست هێزە دەوڵەتییەکانەوە بوو، بەڵام لەناکاو ئەمیر ئەرشەد بەگوللە پێکراو کوژرا، لە لایەکی دیکەش فەرماندەی سویدی نەیتوانی کارێکی زۆر بکا، چونکە تووشی کەمی تەقەمەنی ببوو و ئەو تەقەمەنیانەی کە لە پشتەوەی بەرەکانی شەڕدا بۆیان دەهات بەتایبەتی تفەنگی رووسی و فەرەنسی بوو لە کاتێکدا تفەنگی ژاندارمەرییەکانی بەریتانیایی بوو.[٩]

نووسەری مێژووی ئەرسباران بەناوی سەرهەنگ بایبوردی پێی وایە کە مردنی ئەمیر ئەرشەد ئەویش لە کاتێکدا کە چی وایان نەمابوو سەربکەون، جێگەی گومان بوو.[١٠]

(موخبیر ئەلسەڵتەنە) دوای ئەو شکستە داوای یارمەتی لە تاران دەکا، بەڵام سەرکەوتنی خێرای سمکۆ لەشەڕی (شەکریازی)دا، پێگەی ئەوی زیاتر لە جاران پتەو کردو تەنانەت هەندێك لە تورك و ئازەرییەکانیش مەیلیان بەلای ئەودا هەبوو، حەسەن ئەرفەع کە لە شەڕی ئەمیر ئەرشەد لە دژی کوردەکان، بەشداریکرد بوو باس لە هاوکاری ژمارەیەکی زۆر لە تورکەکان و سیخوڕی کردنیان بۆ سمکۆ دەکا.[١١]

دوای سەرکەوتنی سمکۆ شارەکانی مەراغە، میاندواو و خۆیە ڕاستەوخۆ کەوتنە بەر مەترسی عەشیرەتە کوردەکان و کۆنترۆڵ کردنی شارەکانی ورمێ، سەلماس، شنۆ، سەقز، سابلاغ، سەردەشتو بانە کەوتە دەستی سەرۆکی شکاکەکان. دەسەڵاتخوازی ئەو لەو کاتەدا گەیشتبووە لووتکەی خۆی بە شێوەیەك کە رەفیق حیلمی وەك حاکمێکی بێ هاوتای ئازەربایجان باسی لێوە

دەکا کە بە هۆی ئەو سەرکەوتنانەوە بوو کە کوردەکانی عێراق و تورکیە ئەویان بەقارەمانێکی نەتەوەیی دادەنا.[١٢] پرسیارێکی کە لێرەدا دێتە پێش ئەوەیە کە بۆچی (قولی خان ئیقبال ئەلسەڵتەنە)ی ماکۆیی کە بەسەرداری ماکۆ ناسراوەو بەهێزترین سنووورداری ئێران و گەورەترین خاوەن زەوی ئازەربایجان لەو سەردەمیدابووە هیچ هەنگاوێکی بەدژی سمکۆ ئەنجام نەداوەو لە تەواوی دەورانی یاخیبوونی سەرۆك عەشیرەتی شکاك ئەوی تەحەمول کردووە؟ موخبیر ئەلسەڵتەنەی هیدایەت سەرداری ماکۆ بەبوونی پەیوەندی نهێنی لەگەڵ سمکۆ تاوانبار دەکاو لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئەو دەستی شکاکەکانی لەو کوشتار و تالانکردنی خەڵکی ئازربایجاندا ئاوەڵا کردووە. هیدایەت ئیدعا دەکات سەرداری ماکۆ زانیاری هەڵەی لە بابەت ئامانجی کوردەکان بەدەوڵەت داو لەو بارەیەوە دەنووسێ: " (ئیقبال ئەلسەڵتەنە) رەدی ئەوەی دایەوە کە ئیسماعیل ئاغا (بۆ لای دەوروبەری مەهاباد) چوو بیٚو دەڵێت ئەمن ئەلێرەمە، ئەو بۆ کوێ دەچێ، هەموو شتێك لێرە بۆ من روونو ئاشکرایە..."[١٣]

(موخبیر ئەلسەڵتەنە) لە گومانکردنی خۆی بەنیسبەت سەرداری ماکۆ کە گوایە هاوڕا بووە لەگەڵ سمکۆ، لەسەر حەق بوو، چونکە سەرۆکی عەشیرەتی شکاك بەراستی لە لایەن سەرداری ماکۆوە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و هێدی پشتیوانی لیٚ دەکرا، بۆ نموونە هیچ کات تێکهەڵچوونی سەربازی لە نێوانیاندا رووی نەداو تەنانەت دوای دانانی (شوجاع ئەلسەڵتەنە)ی کوڕی سەرداری ماکۆ بۆ حکومڕانی شاری خوێ لەساڵی (١٣٤٠ ك.ق) ١٩١٩ز سمکۆ کە پێشتر بەردەوام هێرشی دەکردە سەر ئەو شارەو دێهاتەکانی تالان دەکردن، بەڵام ئەو جارە وازی لە هەڕەشەکانی خۆی هێناو ڕایگەیاند "مادام کە شوجاع ئەلسەڵتەنە حاکمی شاری (خوێ)یە، ئەو دەستدرێژی بۆ سەر ئەو شارە ناکاو ملکەچی و گوێ رایەڵی خۆشی بۆ سەرداری ماکۆ دەرنەبڕی..."[١٤]. سمکۆ لە ماوەی شۆڕشی چوار ساڵەی خۆیدا هیچ کات دەستدرێژی بۆ سەر شاری ماکۆو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سەرداری ماکۆ نەکردو لەبەرانبەردا، (ئیقبال ئەلسەڵتەنە)ش دەستی وی لەو هەنگاوانەیدا بەتەواوەتی ئاوەڵا کردو بێشك ئەوەش یەکێك لە هۆیەکانی بەردەوامی دەسەڵاتی سمکۆ بووە. هەروەها دەکرێ ئاوا لێك بدرێتەوە کە جووڵانەوەی سمکۆ هیچ کات جووڵانەوەیەکی جیاخوازی نەبووە، چونکە ئەگەر وابوایە ئەوا سەرداری ماکۆ لە بەرانبەردا دژکردەوەی خۆی نیشان دەدا، بەواتایەکی دیکە یاخیبوونی خاوەن مولکێك و سەرۆك عەشیرەتێکی کورد لە بەرانبەر دەوڵەتدا لە ڕوانگەی مولکدارێکی دیکەی وەك (ئیقبال ئەلسەڵتەنە) کارێکی ناوخۆیی بووەو هیچ مەسئولیەتێکی بۆ دروست نەدەکرد.

# ئاكامی کاری سمکۆ

سەرۆکی عەشیرەتی شکاك پێش دوایین شەڕی چارەنووسسازی خۆی لە هاوینی ساڵی ١٣٠١ ك .ش/ ١٣٤١ك ١٩٢٢ز لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەتیدا، توانی شارەکانی ساین قەلعە (شاهین دێژ)و سەقزیش بخاتە چوارچێوەی سنووری خۆی، پاشان سەید تەها هەوڵی‌دا دەست بەسەر شاری مەراغەدا بگرێ، بەڵام خەڵکی ئەو ناوچەیە بێ پشتیوانی هێزە دەوڵەتییەکان توانیان عەشایری کورد تێك بشکێنن. دوای شکستی ئەمیر ئەرشەد، (موخبیر ئەلسەڵتەنە) حاکمی تەورێز بەدەستووری دەوڵەت هێزێکی تازەی لەژێر فەرمانی خالۆ قوربانی کورد کە پێشتر لە هاوپەیمانانی میرزا کوچك خان (جەنگەڵی) بوو و ئێستا پاڵی وەسەرداری سپە (ڕەزا خان) دا بوو بۆ شەڕی سمکۆی نارد، بەڵام ئەویش وەك ئەمیر ئەرشەد هەر لە سەرەتای شەڕەوە بەگوللەیەك کوژرا. دوایین شەڕ لە هاوینی ساڵی ١٣٠١ ك.ش ١٩٢٢ز لە داوێنی کێوی شکریازی لە باشووری (خۆی)دا ڕوویدا کە لەوێدا هەموو عەشیرە هاوپەیمانەکانی سمکۆ کە لە دە هەزار کەس پێك هاتبوون بەشداریان لەو شەڕەدا کرد کە سەرکردایەتی هێزە دەوڵەتییەکان لێرەدا سەرتیپ (ئەمانوڵڵا خانی جهانبانی) بوو. شەڕی شکربازی لە ڕۆژێکی زیاتر نەکێشاو لە ئاکامدا سەرۆکی عەشیرەتی شکاك زۆر بەتوندی تێك شکاو بۆ خۆی و ماڵەکەی پەنایان بۆ تورکیە برد.

لێرە بەدواوە هەتا ساڵی ١٣٠٩، ١٩٣٠ز کە لە لایەن هێزە سوپاییەکانی ئێرانی نیشتەجێ لە شارۆچکەی سنوری شنۆدا لە بۆسەیەکدا کە بۆیان دانابۆوە کوژراو جیا لە ماوەیەکی کورت کە لەناو عەشیرەتی پشدەری لە کوردستانی عێراقدا ژیاوە، پاشماوەی ژیانی لە تورکیە بووەو لە خزمەت ئامانجی کەمالییەکان دابووە[*].

---

[*] سمکۆی شکاك، نەك بەو جۆرەی کە نووسەر باسی دەکا، بەڵکو لەوپەڕی نامەردیدا کاتێك لە لایەن سەرهەنگ سادق خان لە شنۆ بانگهێشت دەکرێ بەو بیانەوەی کە شا دەیهەوێ ببینێ، شەهید کرا.

هەمموو سەرچاوە فارسییەکان بێ کەم و زۆر نە تەنیا سمکۆ وەك ڕێبەرێکی نەتەوەیی ناناسن، بەڵکو زیاتر وەك سەرۆك عەشیرەتێکی یاخی و تالاّنچی و ڕێگر باسی لێ دەکەن، لێکۆڵینەوەیەکی ورد لەسەر خۆی و کەسانی ژێر دەستیشی هەر ئەو بابەتە دەسەلمێنن. پێگەی عەشیرەی شکاك و بارودۆخی گشتی ئازەربایجان لە سێ دەیەی سەرەتای سەدەی بیستەمدا، هەلومەرجێکیان پێکهێنا بوو کە ڕێگای بۆ سەرهەڵدانی دەسەڵاتێکی هۆزگەرایی لەناو کوردەکانی ئەو ویلایەتەدا ئاوەڵا دەکرد. پێگەی جوگرافیایی زۆر گرینگی عەشیرەتی شکاك لە ناوچەی ستراتیژێکی قوتور، و دەسەڵاتخوازی و لووتبەرزی سمکۆ سەرۆکی ئەو عەشیرەتە بۆ دەست بەسەرداگرتن بەسەر بەشی ڕۆژئاوای ئازەربایجان، هاندانو یارمەتی دارایی و چەك و چۆڵییەکانی دەوڵەتی عوسمانی، بەریتانیا و رووسیە بە سەرۆك عەشیرەتی شکاك لە سەردەمە جیاوازەکانداو ڕۆژ بەڕۆژ لاوازی و بێ توانا بوونی دەوڵەتی ئێران. لەو هۆکارانە بوون، کە لە ساڵەکانی (١٢٩٧ – ١٣٠١ ک.هـ)، ١٩١٩-١٩٢٢ز بوونە هۆی ئەوەی شۆڕشی سمکۆ سەر هەڵبدات. کریس کۆچێراو ئا.س ملکیف کە سمکۆ بە یەکێك لە باوکانی ناسیۆنالیزمی کوردی لەقەڵەم دەدەن، ئاوڕ لەو ڕاستییە نادەنەوە کە هیچ کام لەو هۆکارانەی بوونە هۆی یاخی بوونی سمکۆ ڕەنگو ڕووی نەتەوەپەروەریان، پێوە دیار نەبووەو تەنیا لە ساڵەکانی کۆتایی شۆڕشەکە دایە کە سەرەنجی کوردەکانی تورکیە و عێراق بۆ لای ئەو شۆڕشە رادەکێشرێتو دەزانین هەوڵەکانی ئەوان بۆ ئەوەی ئەو یاخیبوونە جیاخوازە عەشیرەتی شکاك بکەن بەڕاپەڕینێك کە پێوەرێکی نەتەوەپەروەری هەبێ بێ ئاکام بوو. لە بەشەکانی پێشتر گوترا کە عەشیرەتی شکاك بەهۆی دەسدرێژی و تالاّنکردنی موڵك و ماڵی جووتیارە نیشتەجێ بووەکانی ئازەری لەژێر کاریگەری و هاندانی دەوڵەتی عوسمانیدا، لەگەڵ دەوڵەتی ئێران لە سەرەتای سەدەی بیستەم تووشی تێك هەڵچوون هات. مینۆرسکی بەو پێیەی ناوچەکانی بۆ خۆی بینیوە باس لەو ناوبانگە ئەفسانەییەی (جەعفەر ئاغا) لە ساڵی ١٩١٣ دەکا وەك ڕێگرو تالاّنچی لەسەر موڵك و دارایی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە و دەنوسێت دەوڵەتی ئێران بەهۆی لاوازی و بێ توانایی خۆی نەیتوانیوە سەرۆکی شکاکەکان سەرکوت بکات و هەر بۆیە بەرەسمی کردوویەتی بەپارێزەری سنووری ئێران لە ناوچەکانی (خۆی)دا، بەڵام خانی کورد تەنانەت دوای وەرگرتنی ئەو پلە و پایەش دەستی لەتالاّن و ڕووتاندنەوەی موڵك و ماڵی خەلکی ناوچەکە هەڵنەگرتووە.[١]

بالوێزی ئەوکاتی ئێران بەناوی (ئەرفەع ئەلدەوڵە) لە ڕاپۆرتی خۆیدا لە ڕێکەوتی ١٧ی شەعبان ١٣٢٤ کـ.ق دا، ١٩٠٣ز کە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ناردووە لە بابەت هەڵسوکەوتی شکاکەکان، ئاماژە بەڕاپۆرتەکانی بالیۆزخانەی ئێران لە شاری وان و بایەزیدا دەکاو دەنووسێت ئیسماعیل

ئاغاو جەعفەر ئاغا سەرۆکەکانی هۆزی شکاك دەست درێژی دەکەنە سەر گوندەکانی دەوروبەری خوێ و سەڵماس کە لەو لایەنەشەوە لەژێر پشتیوانی کاربەدەستی تورك، بەناوی جواد بەگ دانە، کە قائممەقامی قەزای حەمیدییە و هەروەها جێگیرنەبوونی هێزە سوپاییەکانی ئێران لەو ناوچە سنووریانە داوای کردووە ئیسماعیل ئاغا بوێرتربێ.[٢]

مەهدی ئاقاسی کە زیاتر لە لێکۆڵەرانی دیکە هۆیەکانی بەدەسەڵات گەیشتنی ئیسماعیل ئاغای تاوتوێ کردووە، دەنووسێ دوای پشتیوانییە کاریگەرییەکەی سەرۆکە شکاکەکان بۆ سەرداری ماکۆ لەشەڕی"سکمناباد" (سۆکمەن ئاوا)دا، لە دژی مەشرووتەخوازەکانی خوێ لە چواری شەعبانی ١٣٢٥ کـ.ق دا، ١٩٠٥ز سەردار بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو چاکەیەی ئیسماعیل ئاغا بەوی کرد بوو ناوچەکانی مەحالی قوتوری خستە سەر دەسەڵاتی ئەو، بەڵام ئیسماعیل ئاغا دوای مانەوەو جێگیربوونی لە قوتوردا دیسان بەئارامی دانەنیشت و دەستی بەتاڵانکردنی گوندەکانی دەوروبەری خوێ کرد. لەبەر ئەوەی دەوڵەت هێزێکی تەواوی بۆ لەناوبردنی ئاژاوەی ئەو نەبوو بۆیە پاش ڕاوێژکردنو بەباش زانین، وەفدێکی شەش کەسی (کە لە لایەن ئەنجوومەنی ویلایەتی ئازربایجان بۆ تاوتوێکردنی ناکۆکییەکانی خوێ و ماکۆ بۆ ناوچەکە نێردرا بوو) قەرار بوو دڵی ئیسماعیل ئاغا بدەنەوەو بەو شێوەیە ڕەزایەتی ئەو بەدەست بهێنن بۆ ئەو مەبەستە حکومڕانی قوتوریان بەرەسمی بەو ئەسپارد بەو مەرجەی کە لەوەی بەولاوە دەست لە تاڵان و رووتاندنەوەی گوندەکانی دەوروبەری خوی هەڵگرێ ئەو کەلوپەلەی کە هەتا ئێستا بەتاڵانی بردبوو بۆ خاوەنەکانیان بگێڕێتەوەو هەروەها (ئیقبال ئەلسەڵتەنە)، ئەلێرەدا گرەنتی دڵسۆزی و بەڵێنی ئەو بکات بەو شێوەیەی دەبینین کە ئیسماعیل ئاغا بەهۆی شەڕ فرۆشی و ئاژاوەی خۆی توانی حکوومەتی ناوچەی قوتور بەدەست بهێنێ."[٣]

دوای ئەو رووداوە سمکۆ زۆر چالاکانە لە شەڕەکانی لایەنگیرانی ئیستبداد دا لە دژی مەشروتەخوازەکان بەشداری کردو لە ئابڵۆقەدانی شارەکانی خوێ و تەورێزدا هاوکات لەگەڵ ئیستبداد بەشداریکرد، لە هەمان کاتدا خەریکی ناراحەت کردن و گوشار خستنە سەر خەڵك و جووتیاران و بازرگانەکانی شارەکانی خوێ و سەڵماس و ئازەربایجان بوو. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا واتە لەساڵی ١٩٠٥ز هەتا سەرهەڵدانی شەڕی جیهانی یەکەم لەساڵی ١٣٣٣ کـ.ق دا ١٩١٤ز سەرۆکی شکاکەکان بە شێوەیەکی بەرنامە داڕێژراو دەسەڵاتی خۆی پەرەپێدەداو چەندین قەڵای پتەوی لە چەهریق ساز کرد. لە ماوەی ساڵەکانی شەڕی جیهانگیری یەکەمدا، سمکۆ بەپێچەوانەی سەرۆکە کوردەکانی دیکە کە بەپیل بانگەوازی جیهادی عوسمانییەکانەوە چووبوون، ئەو لەگەڵ

رووسەکان بەجۆرێك ڕێکەوتن گەیشتبوو، لەژێر ڕووناکایی ئەو ڕێکەوتنەدا سنووری ناوچەکانی ژێر دەسەلاتیی خۆی پەرە پێ دەداو هەروەها دۆستە رووسەکانی بە گوشار خستنە سەر دەوڵەتی لاوازی ئێران شێوەیەکی یاساییان بەوکارانە دەدا. سمکۆ لە بەرانبەر کوشتاری هەشت هەزار کەس لە خەڵکی مەهاباد بەدەستی قەزاقەکانی سیبریایی بێدەنگی لە خۆی نیشان داو بێ گوێدانە گیان و ماڵ و نامووسی خەڵکی کورد وای بەباش زانی چاوپۆشی لە تاوانی رووسەکان بکات و هیچ یارمەتییەك بەخەڵکی مەهاباد نەکا. کاردانەوەی توندی سەرۆکی شکاکەکان لە بەرانبەر چالاکی سیاسی و سەربازییەکانی مەسیحی جیاخوازە ئاشورییەکان لە ساڵی ١٩١٧ز دا نیشانیدا، کە ئەو دژی جیابوونەوەی ئازەربایجانەو نایهەوێ لەورێگایەدا هاوکاری مەسیحییەکان بکا. بە شێوەیەکی بنەڕەتی سمکۆ دەیزانی کوردەکانی ئێران حەزیان لە هاوپەیمانیەتی لەگەڵ مەسیحیەکان و جیابوونەوە لە ئێران نییەو ئەو ناتوانێت بێ هاودەنگی لەگەڵ سەرۆکە کوردەکانی دیکەو بێ لەبەرچاو گرتنی پێشینەی دوژمنایەتی کۆنی نێوان کوردەکان و مەسیحییە جیاخوازەکانو هەروەها نەبوونی هەستی جیاخوازی لە لایەن کوردەکانی ئێرانەوە، هەنگاوێك لەو بارەوە بهاوێ.

لە سەرچاوە کوردییەکاندا، هیچ جۆرە ئاماژەیەك بەپەیوەندی سمکۆ لەگەڵ رێکخراو و کەسایەتی نەتەوەپەروەرەکانی کوردی عوسمانی، هەر لە سەرەتای هاتنی بۆ ناو مەیدانی سیاسەتی ئازربایجانەوە هەتا کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی نەکردووە. تەنیا (عەبدوڵڵا پشدەری) نووسیویەتی لە ساڵی (١٩١٦) دا عەشیرەتی بەهێزی پشدەری هاوکاریان لەگەڵ سەرکردەی شکاکەکان دەست پێ کردووەو بەسەرنجدان بەرۆڵی چالاك و بەرفراوانی ئەو عەشیرەتەی کوردی عێراق لەشەڕی دژی سوپای رووسدا دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە سمکۆ و عەشیرەتی شکاك لە ڕوانگەی ڕێبەرانی پشدەرییەکان بەتاکە هاوپەیمانی ئەوان لە ئێران دادەنران کە ئەوەش هیچ پەیوەندی بەناسیۆنالیزمی کوردییەوە نەبووەو دەتوانرێ لە چوارچێوەی پەیوەندی نەریتی نێوان عەشیرەتە کوردییەکانی ئەو کات باسی لێوە بکرێ.(٤)

دوای کۆتایی هاتنی شەڕی جیهانی چالاکییەکانی عەشیرەتی شکاك توند و تۆڵی زیاتری پێوە دیار بوو و بەزوویی شێوەی ئاژاوەیەکی هەمەلایەنەی بەخۆیەوە گرت کە عەشیرەتەکانی کوردی ئازربایجان ڕۆڵێکی سەرەکییان تێدا هەبوو، کە دوو تایبەتمەندی سەرەکی هەبوو. تا سەرکوتکردنی یەکجاری سمکۆ لە شەڕی شەکریازیدا، لە تایبەتمەندییە سەرەکی و نەگۆڕەکانی ئەو مایەوە، ئەو تایبەتمەندییانە بەپێی گرینگیان بریتی بوون لە:

١- دەست بەسەرداگرتن و تالانکردنی موڵك و ماڵی ئازەرییەکان، مەسیحییەکان و تەنانەت کوردەکانیش.

٢- پێداگرتن لەسەر بەڕێوەبردنی ئازربایجان بەدەستی ڕەگەزە خۆجێییەکان.

ئاشکرایە لە سەرەتای کارەکەیدا تایبەتمەندی یەکەم دیارترو پڕ ڕەنگتربوو لە تایبەتمەندی دووەم. کەسرەوی لە مێژووی مەشروتە و مێژووی هەژدە ساڵەی ئازربایجاندا بە شێوەیەکی بەربڵاو باس لە تالانکارییەکانی سمکۆ دەکا و نیشان دەدا کە ئەو هەوڵی دەدا دەست بەسەر ڕێگا گرینگەکانی بازرگانی دەوروبەری گۆمی ورمێ و بەندەرەکانی شەرەفخانە و گولمانخانەدا بگرێ و بەسەریاندا زاڵ بێ‌و لە بارودۆخە جۆراو جۆرەکاندا کەلوپەلەکانی نێو کۆگاکانی بەندەری گولمانخانە بەتاڵ بکاو بۆ چەهریق رایان گوێزێ.(٥)

(محەممەدی تەمەدون)یش کە لە نزیکەوە بۆ خۆی کارەکانی سمکۆی بینیوە ئاماژە بەڕەفتارو هەڵسوکەوتی سمکۆ لەگەڵ خەڵکی ورمێ دوای دەست بەسەر داگرتنی شارەکەو لە ساڵی ١٢٩٨ ك.ش ١٩١٩ز و وەدەرنانی (زیا ئەلدەولە) دەکات و دەنووسێت کە خانی کورد دوای لەکار لادانی ئەرشەد ئەلمولك و وەدەرنانی (زیا ئەلدەولە) یەکێك لەنزیکەکانی خۆی بەناوی تەیموور ئاغا ناسراو بە (موکەڕەم ئەلسولتانی) لەسەر حکوومەتی ورمێ دانا لە دوای ماوەیەك بەفەرمانی ئەو لە شاری ورمێدا جاریان کێشا کە "... خەڵکی بەڕێزو بەشەرەفی ورمێ لە لای بینایەی قەیسەر خانەدا کۆببنەوەو گلەیی‌و سکالاکانی خۆیان باس بکەن... بەو شێوەیە خەڵکیان ئاگادار کردەوە کە ئیسماعیل ئاغا دەڵێت ئەمن لەزوڵمی فەرمانداری (پێشوو) بێ ئاگابووم و خەڵك دەبێ بزانن کە ئەمن خەڵکی (ورمێ) وەك کراسەکەی خۆم دەزانم (کەلێم نزیکە)و لە سەرم پێویستە گوێ لە دەردی دڵیان بگرم و نەهێڵم بچووکترین زوڵمیان لێ بکرێت و گلەیی و گازەندەیان لەهەر کەسێك هەیە بێ ترس و دڵەڕاوکێ لێرە باسی بکەن، هەتا ئەمن بەوردی پێیان رابگەم."(٦)

خەڵك لە ساعەتی دیاریکراودا چوونە ئەو شوێنەی لەبەرچاو گیرابوو. بەڵام لەوێدا عومەر خانی شکاك کە مامی سمکۆ و بەرپرسی سەربازی شکاکەکان بوو، بەئەوانی ڕاگەیاند کە "ئێوە بەپێی دەستووری ئیسماعیل ئاغا ئەلێرە ڕادەگیرێن هەتا بڕی ١٠,٠٠٠ لیرەی زێڕو ١٠٠,٠٠٠ فیشەك دەدەن بەئێمە و پاشان ڕێگاتان هەیە بچنە دەرەوە".(٧) بەڵام خەڵك بەربەرەکانیان کرد بە شێوەیەك کە شکاکان ناچاربوون ئەشکەنجەیان بدەن‌و بەبەکارهێنانی گوشارێکی زۆر توانیان پارەو ئەو چەك و چۆڵانەی سمکۆ پێویستی پێیان بوو، لە خەڵکی ورمێ وەربگیرێت. جیا لە ورمێ سمکۆ داوای پارەی

لەزۆربەی خەڵکی ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئازەربایجان دەکرد کە لە ڕاستیدا جۆرێك باج وەرگرتن بوو. عەلی ئازەری دەنووسێت سمکۆ دوای وەرگرتنی پێنج هەزار تومان لە خەڵکی لکستان و قەرەقشلاق دەستی لە ئازاری خەڵك هەڵگرت، بەڵام دوای ماوەیەك جارێکی دیکە بەخەڵکی ئەو ناوچەیەی ڕاگەیاند کە ئەگەر "فیشەکەکان لەگەڵ چەند کەسێك کەسەردەستەی بەرگری کەرەکانن بۆ لای من نەنێرن و ڕەزایەتی من بەدەست نەهێنن کەمترین سزا کە لە لایەن منەوە دەتاندرێتێ، کوشتنی ژن و منداڵەکانتانە".(٨)

چونکە لکستانییەکان بەرگریان کردبوو، هەر بۆیە سەرۆکی شکاکەکان لەگەڵ شێخ عەبدوڵلاّ کە یەکێك لە کوردەکانی عوسمانی بوو لەگەڵ چل سەربازی عوسمانی بەتوندی دانیشتوانی ئەو ناوچەیان سەرکوتکرد. مەهدی ئاقاسیش باس لە شێوەی هەڵسوکەوتی سمکۆ لەگەڵ خەڵکی (خۆی)دا دەکاو ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێ کە سەرۆکی عەشیرەتی شکاك هەموو کات لە بیری وەرگرتنو دەست بەسەرداگرتنی دارایی دانیشتوانی شاری خۆی و ناوچەکانی دەوروبەری بووە، بۆ نموونە دوای ئەوەی ئەو لە ساڵی (١٣٣٦) ک. ق ١٩١٥ز دا بەهۆی هێزی سوارەکانی خۆی مەسیحییەکانی شاری (وان) کە هاتبوون یارمەتی ئاشوورییەکانی ورمێ بدەن تێك شکاندو بەوکارەی یارمەتییەکی گرینگی بەخەڵکی خۆی کرد، پاشان ئەرمەنییەکانی شاری (خۆی) پەنایان بۆ ماڵی زانا و بازرگان و ناسراوەکانی شار بردو سمکۆ داوای لە خەڵکی شار کرد مەسیحییە پەنابردووەکان لەگەڵ داهاتەکانیان بدەن بەئەو هەتا ئەو تۆڵەی ئەو زەرەرو زیانە بکاتەوە کە ئاسوورییەکان لە چەهریق لەسەربازەکانیان داوە ، بەڵام خەڵك ئەو داواکارییەی ئەویان ڕەتکردەوەو لە ئەنجامدا:

"... بابەتی ناکۆکی کە لە کۆمیسیۆنێکدا پێك هاتبوو لە سەرکردەکانی سوپای عوسمانیو ئیسماعیل ئاغاو ناسراوانی شاری خۆیدا باسکرا. ئیسماعیل ئاغا کەڵکی لە دەرفەتەکە وەرگرتو خەڵکی ورمێی بەلایەنگری ئەرمەنی و مەسیحییەکان دانا. حاجی جەعفەر ناوێك کە لە بازرگانە بەناوبانگەکانی ئەوکات بوو، وەڵامی دایەوە کە مەبەستی ئیسماعیل ئاغا کوشتار و تاڵانکردنە، نەلایەنگری کردن لە ئیسلام، چونکە ئەو کارەی لە بارەی هەڵاتووە موسڵمانەکانی سەڵماس و ورمێشدا ئەنجام دەداو لەڕێگای خۆی و سەڵماسدا دەست بەسەر داهاتیان دادەگرێ و دەیان ڕووتێنێتەوە، دوای مشتومڕو قسە کردنێکی زۆر وادانرا کە خەڵکی خۆی (١٠٠) وەقر گەنم و حەوت هەزار تومان نەقد بدەن بە سمکۆ و پاشان ئیسماعیل ئاغاو کوردەکانی ژێر دەستی لەگەڵ بنەماڵەکانیان گوندەکانی خۆی چۆڵ بکەنو لەگەڵ چەکدارە ناوچەییەکان و ژمارەیەك لە سوپاییەکانی تورك بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەرمەنی و ئاشوورییەکان بچن و ئیسماعیل ئاغا دوای

وەرگرتنی ئەو بڕە پارە نەقدەو گەنمە لەگەڵ لەشکرەکەی خۆی بەجێ هێشت ..."[9] ئەو وێنەیەی کەم لە بەڵگەنامە ئیدارییەکانی دەوڵەتی ئێران لە سمکۆ کێشراوە هیچ وێکچوونێکی لەگەڵ ڕێبەری ڕاپەڕینی کوردەکانی ئێراندا نییەو زۆرتر کەسایەتی خانێکی خۆسەپێن و تالآنچی بەرجەستە دەکا کە پشت بە هیچ یاسەیەك نابەستێ. بۆ نموونە بەرپرسی گومرگی کۆنەشار لە ساڵی (١٣٣٩) ك.ق ١٩١٨ز دا وەزارەتی دارایی ئاگادار دەکاتەوە کە ئیسماعیل ئاغا تفەنگەکەی ئەوی وەك پێشکەشێك بە ئەمانەت بردووەو ئیتر پێی نەداوەتەوە [10] لە بەڵگەنامەکانی دیکەدا شاهیدی هەوڵی بەرفرەوانی سمکۆینە بۆ سەپاندنی دەسەلآتی خۆی بە سەر ئیداراتی گومرگی ناوچەکانی ڕۆژئاوا و باشووری ئازەربایجان و بەدەستووری ئەو کاغەزەی گومرگی بەزمانی کوردی چاپکراوە کە وەزارەتی دارایی ئێران ڕایگەیاند ئەوان هیچ بایەخێکیان نییە لە ڕێکەوتی (٢ ی سەرەتای ١٣٣٩ ك.ق ١٩١٨ز) بەرپرسی گومرگەکانی وڵات بەپشتبەستن بەڕاپۆرتی بەرپرسی گومرگی ویلایەتی تەورێز وەزارەتی دارایی ئاگادار کردەوە کە "لە ڕێکەوتی بەزۆر کۆچ پێکردنی ئەندامانی گومرگی دیلمقان هەتا ئێستا، ئیسماعیل ئاغا یەکێك لەژێر دەستەکانی خۆی ناسراو بە موختار پاشا خان وەك بەرپرسی گومرگ لەوێ داناوە، ناوبراو پارەی گومرگی وەردەگرێتو هەروەها قەبزی ناڕەسمی دەردەکا. لەهەمان کاتدا بەرپرسی گومرگی خۆی بەهۆی ڕاگەیاندنێکەوە خەڵکی ئاگادار کردۆتەوە کە ئەو گومرگە هیچ ڕەسمیەتێکی نییەو ئیدارەی گومرگ هیچ بایەخو گرینگی بەو مۆچە گومرگیانەی نادات کەلەوێ دەدرێ."[11]

سەرۆکی شکاکەکان لە کاتی دەست بەسەرداگرتنی شاری مەهاباددا، هەزارو سەد تومەن لە بەرپرسی گومرگی ئەو شارەو یەکێك لە یاوەرانی دزیوەو هەروەها دەستی بەسەر چەك و تەقەمەنییەکانی لە گومرگی کۆنەشاردا لە جوزای قوی ئیل ١٣٣٩ کـ. ق ١٩١٨ز دا، داگرتووە[12].

ئەو هەنگاو و کارانە هیچ لە چالاکییە سیاسییەکانی ڕێبەرێکی شۆڕشگێر ناچێ کە بۆ بەدەست هێنانی مافی نەتەوەی خۆی لەهەوڵ و خەباتدابێ. لەوانەیە والێك بدرێتەوە کە پێداگرتنی سمکۆ بۆ بەدەست هێنانی دارایی و پارەی زۆرتر بۆ ئەوە بوویێت چەکی پێ بکڕێ و هەروەها جووڵانەوەکەی بەرەو پێشەوە بەرێت، هەر بۆیە کەسانێکی وەك مارتین ڤان برۆیەنسن کە بە شێوەیەك لاینگیریان لە سمکۆ کردووە بەوشێوەیە گومان دەکەن، بەڵام بەڵگەی تەواو لەبەردەستدایە. دەتوانرێ بسەلمێنرێ کە بەو شێوەیە نییە. مارتین ڤان برۆیەنسن هۆکاری تالآنکاری سمکۆ کە لە ڕاونگەی ئێرانییەکانەوە بەباج وەرگرتن دادەنرێو لە ڕوانگەی سمکۆشەوە بەکۆکردنەوەی سەرانە لێك دەدرێتەوە، بەمەبەستی

دابین کردنی خەرجی سوپایەکی چوار هەزار کەسیو بەکرێ گیراوانی عوسمانی و هەروەها وەك ئامرازێك کە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات دەزانێ.[13]

ئەگەر بەپێی بۆچوونی برۆیەنسن بەراستی سمکۆ رێبەرایەتی راپەرینی نەتەوەیی کوردەکانی لەئەستۆ بووە، بۆچی هەموو ماڵ و دارایی خەڵکی مەهابادی، هەر لە فەقیرەوە بگرە هەتا دەوڵەمەند بەتاڵان برد؟ هەر بەو جۆرەی کە (عەبدوڵڵا ناهید) نووسیویەتی ئەو کەسانەی کە سەرۆکی شکاك لەسەر کار دانابوون لە باری فەساد و تاڵان و دەست بەسەرداگرتنی دارایی خەڵکی (کورد)ی ناوچەکانی بانە و سەقز هەروەك کاربەدەستانی دەوڵەتی قاجارییە وابوون لەناوچەکاندا.[14]

ئەگەر سمکۆ بەراستی کوردێکی نەتەوەپەروەر بووایە، لە جیاتی لەناوبردنی ئابووری ناچەکانی رۆژئاواو باشووری ئازەربایجان لە رێگەی ئیفلیج کردنی پەیوەندی بازرگانی نێوان شارەکانو هەروەها راوەدوونانی جووتیارانی لەسەر ئەو زەوی و زارانەی کە نزیکەی دە ساڵ دەبوو نەچێندرا بوون، دەبوایە کەشێکی ئارام و گونجاو بۆ گەشەپێدانی ئابووری ناوچەکەو هەروەها سەرچاوەیەکی شەرعی و ناسراوی بۆ دابینکردنی خەرجییەکانی ناوچەکە پێك بهێنایە.

حەسەن ئەرفەع بلرودۆخی گشتی ئازەربایجانی رۆژئاوا، دوای شکستی سەرۆکی عەشیرەتی شکاك لە شەڕی شەکریازی بەو شێوەیە وەسف دەکا: "کاتێك ئێمە بۆ جارێکی دیکە لە ساڵی ١٩٢٢ شاری ورمێمان گرتەوە هەموو خەڵکی شار بۆ پێشوازیمان دەهاتن. بەڵام لە (٢٥) هەزار دانیشتووی ئەو شارە تەنیا چوار هەتا پێنج هەزار کەس لەو شارەدا مابوونەوە. هیچ گۆشتیان بەلەشییەوە نەمابوو تەنیا ئیسك و پروسك لەپەڕۆو پاتاڵی کۆنەدا پێچرابوونەوە، خەڵکی شار بە شێوەیەکی زۆر وەحشیانە لە لایەن ئاشوورییەکانەوە هێرشیان کرابوویە سەرو تاڵانکرابوون. پاشان لە لایەن کوردەکانیشەوە هێرشیان کرابووە سەرو تاڵانکرابوون و نزیکەی سێ سەد گوندی ناوچەکە چۆڵو پاشان وێرانکرابوون. چەندین ساڵی کێشا هەتا جارێکی دیکە خەڵك لەو ناوچانە نیشتەجێ ببنەوەو خەریکی ئاژەڵداری و جووتیاری و باغەوانی ببنەوە."[15]

ڕەفیق حیلمی بەگ کە یەکێك لە ستایشکارانی سمکۆیەو بۆ ماوەیەکی کەم دوای دواین شکستی سمکۆ لە هێزە دەوڵەتییەکان لە لایەن شێخ مەحموودی بەرزنجییەوە لەگەڵ وەفدێك بۆ وتووێژ لەگەڵ مستەفا کەماڵ لە رێگەی ئێرانەوە چووبوونە تورکیە، بەپێی ئەو شتانەی کە بۆ خۆی بینیونی، بەوشێوەیە وەسفی هەڵسوکەوتی سمکۆ لە ئازەربایجانی رۆژئاوادا دەکا: " خەڵکی ورمێ هەندێك بەکوردی تورکی و کەمێکیش بە فارسی قسە دەکەن. کاتی دەسەڵاتخوازی سمکۆ ئەو ناوچەیە

بەتەواوەتی لەژێر فەرمانی ئەو دابوو، بەڵام بەداخەوە دەبێ بڵێم خەڵك زۆر گلەیی و گازەندەیان لە سمکۆ هەبوو و لەهەر دەرفەتێکدا بەئاخ و ناڵە و غەمی زۆرەوە باسیان لە سەردەمی فەرمانڕەوایی و بێ ڕەحمییەکانی ئەو دەکردەوە. بۆ من کە کوردێك بووم قەبووڵ کردنی ئەوە زۆر سەخت بوو کە قارەمانێکی کورد ئاوا ناوبانگێکی ناحەزی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە."(١٦)

ئەگەر سمکۆ بەراستی بەتەمای سیستەمێکی سیاسی سەربەخۆ یان ئۆتۆنۆمی لە کوردستان دابوو، ئایا کارێکی عاقڵانە بوو خەرج و تێچوونی شەڕکەرانی خۆی لە ڕێگەی ڕووتاندنەوەو تاڵانکردنی دارایی دانیشتوانی تورك، کورد و مەسیحی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی دابین بکا؟ ئەگەر وای دابنێین جوڵانەوەکەی ئامانجدار بووە، ئایا بەکارهێنانی ئەو هەموو توندوتیژیو لەو جۆرە ڕەفتارانە نەدەبووە هۆی بچڕانی پەیوەندی خەڵك لەگەڵ خۆی و ئامانجەکانی؟

وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە زۆر دژوار نییە بەتایبەت کاتێك بزانین سمکۆ هیچ هەنگاوێکی سیاسیو بەتایبەت لە پەیوەندی لەگەڵ ناسیونالیزمی سیاسی یان کولتووری کورددا ئەنجام نەداوە، لەبنەڕەتدا کارەکانی ئەو بارودۆخێکیان پێك نەهێنا هەتا لەژێر تیشکی ئەودا مەسەلەی مافی کوردەکانی ئێران بێتە بەرباس و خواستەوە، بێ بەرنامەیی و نەبوونی پلانێکی دیار و ڕوون بۆ ئیدارەکردنی ئەو ناوچانەی لەژێر کۆنتڕۆڵی دابوون بۆ هەمیشە بەیەکێك لە کەموکوڕییە دیارەکانی بزووتنەوەی سەرکردەی شکاکەکان دەمێنێتەوە تەنانەت کریس کۆچێرا کە لە نووسینەکانیدا بەجۆرێك لایەنگیری لەسمکۆ دەکات ناچار بووە لەگەڵ ئاماژەدان بەو نامەیەی کە گوایە سمکۆ بۆ (زەفەر ئەلدەولەی موقەدەم)، (فەرماندەی لەشکری ئازەربایجان لەساڵی ١٩٢٢) نووسیو، لەودا باسی خودموختاری تێدا هێناوەتە گۆڕێ دانی بەو ڕاستییە ناوە کە خانی کورد "... وادیارە کە دەرفەتی ئەوەی نەبووە بۆچوونی خۆی بەروونی لە بابەت شێوەی ئیدارەکردنی ئەو ئۆتۆنۆمییە دەربڕێ."(١٧)

ئەو کەموکوورییە بەرچاوانەی سمکۆ و ڕاپەڕینی ئەو تەنانەت بۆتە جێگای نارەزایەتی و ڕەخنە گرتنی نەتەوەپەروەرانی تورکیە و عێراق بە شێوەیەك کە لە نووسینەکانی کریس کۆچێرا دا ڕەنگی داوەتەوە " لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٢١ کە ڕێبەرانی کوردی قوستەنتەنییە خەریکی ئامادەکردنی شۆڕشێکی سەراسەری بوون، هەوڵیاندا سمکۆ بۆ لای ئەو شۆڕشە ڕابکێشن ... بەڵام سمکۆ وەڵامی دانەوە کە نایەوێ پەیوەندی لەگەڵ تورکەکان بپچڕێنێ، چونکە ئەوان چەکی دەدەنێ."(١٨)

هەروەها سمکۆ لەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ (مستەفا پاشا یامولکی)دا، کە بۆ دیدەنی ئەو لە ساڵی ١٩٢١ دا هاتبووە ئێران هەتا "... داوای لێ بکا ئامانجەکانی خۆی بۆ ڕوون بکاتەوەو لێی

دەپرسی ئایا هیچ ڕێکخراوێکی هەیەو چۆن دەیەوێ ئەو ناوچانەی کە دەستی بەسەردا گرتوون ئیدارەیان بکا، هەروەها بۆچی ئالآیەکی نییە؟" ئەو (سمکۆ) دەڵێ:- "ئێستا هیچ ڕێکخراوێکی تایبەتیمان نییە، ئەمن تەنها تاکێکم لە کوردستاندا، سەرەکیترین کار لە ئێستادا ڕزگارکردنی وڵاتە، گرینگ نییە کێ فەرمانڕەوایی بەسەردا دەکا، من وەکو خۆم هیچ حەزو ئارەزوویەکم بۆ فەرمانڕەوایی کردن نییە، بەڵام لە بابەت ئالآو ئەو جۆرە شتانە، من پێم وانییە کە پێویست بەو شتانە بکا... هەروەها بەو جۆرەی کە دەیبینی شکاکەکان بۆ هەر یەکەیەك جۆرەها ئالآیان هەیە."(١٩)

بەو شێوەیە سمکۆ هەر بەخێرایی دانی بەوە نا کە هیچ پلانێکی بۆ ئیدارەکردنی ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی خۆی نییە و هەروەها حەزو ئارەزووی فەرمانڕەوایی کردنیشی بەسەر ئەو ناوچانەدا نییە. سەرچاوە ئێرانییەکانیش بەڕاشکاوی دەیسەلمێنن کە سمکۆ لە بنەڕەتدا بەدوای وەدەست هێنانی مافی سیاسی کوردەکانەوە نەبوو، تەنیا گرینگی بەزیاتر کردنی دەسەڵاتی خۆی و عەشیرەتەکەی خۆی دەدا. کەسرەوی لەوبارەیەوە نووسیویەتی: "ئێستا کە سیمگۆ (سمکۆ) ئامادە بووەو ئالآی هەڵداوەو "داوای ئازادی کوردستان" دەکا، چ دەکا؟ ... ئایا کۆنفرانسی داوە کە کوردەکان بۆ ژیانێکی ئازادو بەدەستەوەگرتنی کاروباری حکوومەتی ئامادە دەکا؟ ئایا هەوڵی نەهێشتنی ئەو بەربڵاوی و پەرتییە دەدا کە لەناو کوردەکاندا هەیە؟... نەخێر!... "ئازادی کوردستان" خۆ بەو کارانە نییە، ئەدی چی دەکا؟... گوندەکان تاڵان دەکا، دەغڵ و دانەکان لەناو دەبا. هەروەها پەیامی بۆ خەڵکی بەتاڵانچوو و بەستەزمانی لەکستان ناردووە کەپارەی دەوێ."(٢٠)

حەسەن ئەرفەع کە لەنزیکەوە شاهیدی کردەوەکانی سمکۆ بووەو چەندین جار لە مەیدانی شەڕدا لەگەڵ ئەو جەنگاوە پێیوایە کە "لەوانەیە هەڵسوکەوتی ئیسماعیل ئاغا (سمکۆ) بەیەکەمین هەوڵەکان دابنرێ کە کوردەکانی ئێران بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی لەخۆیان نیشان داوە. بەڵام ناکرێ ڕەفتاری سمکۆ بەواتای عەمەلیاتێکی (هەوڵ) واقیعی بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی بەواتا مۆدێرنەکەی دابنرێ بەجۆرێك کە لەگەڵ پێوەرو بارودۆخی ئێستای جیهان بگونجێ. بەڵکو ئەو لە بنەڕەتدا حەزی بەڕووتاندنەوەو ژینۆسایدی خەڵك دەهات و لەبەر ئەوەی کە نەیدەتوانی ئەو بەڵایە بەسەر کوردەکان بهێنێ، هێرشەکانی خۆی بۆ ئەو ناوچانەی کە کوردی لێ نییە وەك سەلماس و ورمێ و خۆی ئاراستە دەکردو بەدوای ئەو هێرش کاریانەدا، خەڵکی ئەو ناوچانەی بە شێوەیەکی بەرچاو کەم کردەوە."(٢١)

دانەرانی کتێبی مێژووی پەنجا ساڵەی هێزی پیادەی سوپای شاهەنشاهی لە بابەت ئامانجە سەرەکییەکانی سمکۆ ئاماژە بەو خاڵانە دەکەن: "پێکهێنانی بێسەروبەرەیی، تاڵانی دارایی خەڵكو کوشتنیانو هەروەها هەوڵدان بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی (ملوك ئەلتوایفی)"[٢٢]

هەموو ئەو داوەری و هەڵسەنگاندنانە، ئێمە بەو ئاکامە دەگەیەنن کە شۆڕشی عەشیرەتی شکاك ڕووداوێك بوو کە ریشەی لە نەتەوەپەروەری کوردیدا نەبوو وەبەتەواوەتی بە ئەنجامی بارودۆخی تایبەتی ئێرانو ئازەربایجان لە دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم دەژمێردرا و هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کە ناتوانین هیچ وێکچوونێك لە نێوان ڕاپەڕینی ئەو لەگەڵ کوردەکانی تورکیە و عێراق هەر لەو سەردەمەدا بدۆزینەوە.

هۆکاری ئەو ناهاوتایی و لێك نەچوونە دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی لەو خاڵانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

١- شۆڕشەکە پێگەی سیاسی نەبووە و هەروەها چوارچێوەی تەواو عەشیرەتی هەبوو لەسەرەتای کاردا. عەشیرەتی شکاك بەقۆستنەوەی نەبوونی دەسەڵاتێکی سەربازی دەوڵەتی ئێران لە ناوچەکانی هاوسنوور لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا، دەستی بەیاخیبوون و دەستدرێژی بۆ سەر خاوەن موڵکەکانی دراوسێی خۆی کرد، لەو ڕێگەیەدا پشت ئەستوور بوو بەپشتیوانی سیاسی، دارایی و چەکی عوسمانییەکان.

٢- نەبوونی پەیوەندی لە ئاستی ڕێبەری ئەو جووڵانەوەیە لەگەڵ ڕۆشنبیرانی نەریتی، واتا پیاوانی ئایینی و چینی شارنشین وەك بازرگانەکان لە کەموکووڕیە بەرچاوەکانی ئەو جووڵانەوەیە دەژمێردرێ کە تەنیا هۆکاری کاریگەر لەو جووڵانەوەیە پەرەستاندنی، عەشایری و سەرۆکەکانیان بوون تەنانەت نوێنەرانی ناسیۆنالیزمی هۆزگەرێتی لە نێوان کوردە چالاکەکانی عێراق و تورکیەدا زۆرترین و هاودەمترین ڕاوێژکاران و هاوکارانی سەرەکی سمکۆیان پێکدەهێنا کە نموونەی بەرچاوی ئەوان سەید تەها بوو. لە حەقیقەتدا جووڵانەوەی سمکۆ هەر لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی لە چوارچێوەی عەشایردا مایەوەو ڕێبەریو هەیکەل و گوێگرانی ئەوان لەسەراسەری سەردەمی چالاکی ئەو جووڵانەوەیە، عەشایری کورد بوون، ئەویش تەنیا لە ئازەربایجاندا.

٣- پێداگرتنی سمکۆ بۆ پێشڕەوی کردن بۆ ڕۆژهەڵاتی ئازەربایجان و گوێنەدانی ئەو بەچارەنووسی باشووری کوردستان سەرەڕای ئەو هەموو پێداگرتنەی سەید تەها کە نوێنەری ناسیۆنالیزمی هۆزایەتیی ڕاپەڕینەکە بوو، دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە سەرۆکی شکاکەکان لە ڕادە بەدەر شەیدای

حکوومەتێکی (ملوك ئەلتوایفی)و ناوچەگەریەتی بووە، لەوانەیە هەوڵی بەدەست هێنانی سەروەت و سامانی زۆرتری داوەو هێرشکاری بەردەوامەکانی ئەو بۆ شارە ئازەرینشینەکانی ڕۆژهەڵاتی ئازەربایجان کە لە لایەنی ئابوورییەوە دەوڵەمەندتر بوونە لە شارەکانی ویلایەتی کوردستان، ریشەی لەو راستییە داهەیە.

٤- سمکۆ هیچ داواکارییەکی ڕەسمی بۆ بەدەست هێنانی ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆیی لە کوردستاندا، نەهێنایە ئارایەوەو لەبنەڕەتدا هیچ نیشانەیەك لە هەنگاوەکانی لەو ئاراستەیەدا چ لە نێوان کوردەکانی ئێران و چ لە بەرانبەر دەوڵەتی ناوەندیدا، لە دەستدا نییە و نابێ وابەستەبوونی سەرکردەی شکاکەکان بە بەریتانیا و تورکیەی کەماڵی کە بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی پشتیوانی دارایی و چەك و تەقەمەنی بوو بەمانای هەوڵدانی ئەو بۆ بەدەست هێنانی دانپیانانی ڕەسمی بۆ ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆیی کوردستان لە لایەن ئەو دەوڵەتانە لێك بدرێتەوە، چونکە ئەو دوو وڵاتە لەوکاتدا دژی هەرجۆرە بەخشینی ماف بەکوردەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوون.

٥- پەیوەندی ئەو لەگەڵ کۆمەڵەی تورکیە و کۆمەڵەی عێراق لەوەوە سەرچاوەی نەدەگرت کەئەو مەیلی بۆ پێکهێنانی کوردستانێکی گەورە هەیەو ئەگەر جارجار لە چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ نوێنەرانی ئەو گروپانەدا بەڕواڵەت باسی لە سەربەخۆیی کوردستان و ئازادی کوردەکانی دەکرد تەنیا بۆ ئەوە بوو لە کاتە جیاوەزەکاندا لە ڕێگەی ئەوانەوە پشتیوانی دارایی و چەك و تەقەمەنی بەریتانیا و تورکیە بۆ خۆی مسۆگەر بکا و دەزانین ئەندامەکانی کۆمەڵەی تورکیە و کۆمەڵەی عێراق دوای شەڕی جیهانی یەکەم نێوەندیگەریی نێوان سەرۆکی شکاکەکان لەگەڵ تورکیە و بەریتانیا دابوون، بەڵام ڕێکخراوو حزبە کوردییەکان بۆ خۆنزیککردنەوە لە سمکۆ، ئامانجی گرینگ و بنەڕەتیان هەبوو کە بریتییە لە:

I- بە "سیاسی" کردنی شۆڕشی سمکۆو ئاراستەکردنی ئەو بەرەوتی ئامانجەکانی ناسیۆنالیزمی کورددا.

II- کەڵك وەرگرتن لە دەسەڵاتی سەربازی هێزی دە هەزار کەسی ژێر فەرمانی سمکۆ بۆ پێکهێنانی لقێکی سەربازی بۆ ڕێکخراوە سیاسییەکانی کورد لە تورکیە و عێراق. جێگەی وەبیرهێنانەوەیە کە حزبە کوردییە هاوسێکانی، دوای بێهیوابوونیان لە پێکهێنانی سیستەمێکی ئۆتۆنۆمی بەهۆی سمکۆوە هەوڵیاندا ئەو لە خزمەت ئامانجەکانی خۆیان لە دەرەوەی ئێراندا بەکاربهێنن، بەڵام ئەو خۆی لە هاوکاریکردنی لەگەڵ ئەوان بەدوور ڕاگرت. ئەحمەد تەقی لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا نیشان

دەدا کە چۆن سمکۆ لە هاوبەشی کردن لە ڕاپەڕینەکانی کوردەکانی ڕەواندز و بەجیل لە ساڵی (١٩٢١)دا لەدژی ئینگلیزەکان خۆی بوارد.[٢٣]

هەروەها مستەفا پاشا یامولکی کە لە دنەدانی سەرۆکی شکاکەکان بەدژی تورکەکانی کەماڵیو یارمەتیدان بەکوردەکانی تورکیەدا هیچ ئاکامێکی بەدەست نەهێنا بوو، ئەوی (سمکۆ) بەپیاوێکی نەزان دادەنا کە پەیوەندییەکی گەرم و دۆستانەی لەگەڵ ناسیۆنالیستەکانی کەماڵی هەیە، چونکە ئەوان تەقەمەنیان دەدایە- ئەوەش کارێك بوو کە بەڕای مستەفا پاشا هیچ ئاکامێکی نەدەبوو.[٢٤]

٦- هەڵسوکەوتی سمکۆ لەسەردەمی دەسەڵاتخوازی و دەست ڕۆیشتنی بەسەر ناوچەکانی ڕۆژئاواو باشووری ئازربایجاندا لە ساڵەکانی (١٢٩٧ هەتا ١٣٠١ ک.ش) ١٩١٩-١٩٢٢ز هیچ جۆرە وێکچوونێکی لەگەڵ ناسیونالیستانی کوردی هاوسێی وەك شۆڕشگێڕانی ئارارات و شێخ مەحموودی بەرزنجیدا نەبوو. شێخ مەحموود لە ماوەی سەرکەوتنە کورت خایەنەکەیدا لە ساڵی ١٩٢٢ بەزووترین کات کابینەیەکی پێکهێناو خۆی بەمەلیکی کوردستان دانا، سوپایەکی میللی کوردانی پێکهێنا، هەروەها بەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراو و گونجاو بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی کوردستان هەنگاوی دەنا. هەروەها ڕێکخراوی "خۆیبوون"و ئیحسان نووری پاشا ڕێبەری سەربازی شۆڕشی ئارارات لە ساڵی ١٩٣٠ دا پێکهاتنی کۆماری کوردستانی ڕاگەیاند، بەڵام سمکۆ سەرەڕای ئەوەی دەرفەتێکی زیاتری هەبوو، هیچ هەنگاوێکی بۆ پێکهێنانی دەوڵەت، دیاریکردنی پایتەخت و دامەزراندنی حیزب یان چوارچێوەی سیاسی هەڵنەهێنا کە لەسەر بناغەی نەتەوەپەروەری کوردی بێ.

گرینگترین هەنگاوی سیاسی کە بۆ خزمەتکردن بەنەتەوەگەریەتی کوردی لە سەردەمی دەسەڵاتی سمکۆ دا هەڵێنرابێ، دەرکردنی ڕۆژنامەی "کورد" بوو کە لە ساڵی (١٣٠٠) ک.ش ١٩٢١ز بەدوو زمانی کوردی و فارسی لە ورمێ دا بڵاو دەبوویەوە کە سەر نووسەرەکەی مەلا محەممەدی تیرجانی زادە بوو. محەممەد تەمەدون نووسەری کتێبی بارودۆخی ئێران لە شەڕی جیهانی یەکەمدا بە شێوەیەکی تێرو تەسەل باس لە دەست بەسەرداگرتنی چاپخانەکەی خۆی دەکا کە لە لایەن کەسەکانی سەید تەهاوە بۆ مەبەستی چاپکردنی ئەو ڕۆژنامەیە ئەنجام دراوە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەوروپشتەکانی سەید تەها بەرپرسی ئەنجام دانی ئەو کارە بوون.[٢٥]

ئەو خاڵە نیشان دەدا کە بەشی سیاسی شۆڕشی نوێنەرانی ناسیۆنالیزمی هۆزگەرێتی عێراقو تورکیە بۆ ئەنجامدانی هەنگاوی نەتەوەگەری و مۆدێرنی لەو شێوەیە زیاتر چالاك بوونە هەتا سمکۆو کوردەکانی ئێرانی، نووسەری کتێبی "لەبابەتی خەباتی کوردستان"یش بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی

"کورد" بە کاری مستەفا پاشای یامولکی دەزانێ و دەنووسێت چونکە ڕۆژنامەکە هیچ ڕەونەق و ڕەنگدانەوەیەکی نەبوو هەر بۆیە مستەفا پاشا گەڕایەوە بۆ عێراق.(٢٦)

جیا لەوە لە دیوانی سەیف ئەلقوزاتی مەهابادیدا باس لە قەسیدەیەك دەکرێ کە ئەو شاعیرە کوردە لە مەدح و پێداهەلگوتنی سمکۆ دا هۆنیوێتیەوە و لە لایەن (قازی محەممەد جەمال ئەلدینی هەکاری)، کە قازییەکی جێگەی باوەڕی سمکۆ و کوردەکانی تورکیە بووەو هەروەها بەیەکێك لە بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامەی "کورد" دادەنرێ، بەچاپ گەیشتووە.(٢٧)

هەمووی ئەو دەنگوباسانە دەرخەری ئەو ڕاستییەن کە بلاوکردنەوەی ڕۆژنامە و ئیدارەکردنی ئەو، بۆ کوردەکانی عێراق و تورکیە دەگەڕێتەوەو لەو جێگەیەوە کە لەوکاتدا هیچ ڕێکخراو حزبێکی ناسیۆنالیست لەنێوان کوردەکانی ئێراندا پێی نەگرتبوو دەکرێ بەو شێوەیە هەلسەنگێندرێ کە جوولانەوەی سمکۆ جوولانەوەیەکی تەواو دەرەبەگایەتی بووە کە هیچ جۆرە ئامانجێکی نەتەوەپەروەری پێوە دیار نەبووەو هەولەکانی کوردە چالاکەکانی هاوسێش بۆ "پێشکەوتنی" ئەو بەهیچ جێگایەك نەگەیشتووە.

# دەرەنجام

مێژوونووسانی ئەورووپا و نەتەوەپەروەرەکانی کورد سوورن لەسەر ئەوەی سمکۆ بەیەکێك لە باوکەکانی ناسیونالیزمی کورد دابنێن، بەلاّم بەڵگە و دیکۆمێنتی زۆر بۆ رەتکردنەوەی ئەو بۆچوونە لە دەستدا هەیە. ئەو ئاغا کوردە لە ڕاستیدا میراتگری دەسەلاّتخوازی باوك و براکەی بوو کە لە سەردەمی مەشروتیەتدا لە بەناوبانگترین یاخیبووانی ئازربایجان بوون و تەنیا مردنی ئەوان بوو کە ئەو ئەگەرەی بۆ سمکۆ ڕەخساند کە ڕۆڵی کاریگەری خۆی لە ناوچەکەدا بگێڕێ.

سمکۆ لە ڕێگەی بەشداریکردن لە شەڕەکانی لایەنگیرانی ئیستیبداد لە دژی دەستووریخوازان پەرەی بە دەسەلاّتی سەربازی و سیاسی خۆی داو هەروەها دەسەلاّتی بەسەر ناوچەی ستراتیژیکی قوتور، وای کرد کە ببێتە جێگەی سەرنجی رووسیەی قەیسەری و عوسمانی، بەلاّم ئەو زۆر وریایانە توانی هاوسەنگییەك لە نێوان ئەو دوو هێزە لە بەرژەوەندی خۆی رابگرێ هیچ کاتێك مەیلی بۆ قەبووڵ کردنی تابعییەت و ملکەچ بوون بۆ عوسمانی نیشان نەداو دەسپێکردنی شەڕی جیهانی یەکەم دەرفەتێکی بۆ ئەو پێکهێنا کە لە پەنای پەرەپێدانی دەسەلاّتی خۆی بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی جیدی لە شەڕدا بەشداری بکا بەکەڵك وەرگرتن لە دەرفەت، چەك و تەقەمەنی کۆبکاتەوە .

لە کۆتایی شەڕدا سەرۆکی عەشیرەتی شکاك ببوو بەیەکێك لە هێزە کارتێکەرەکانی ئازەربایجان‌و بەکەڵك وەرگرتن لەو ئیمکاناتە بوو کە بەربەرەکانیی هەوڵی جیاخوازیی مەسیحییەکانی جێگیر لە ناوچەکانی ورمێدا کرد.

شەڕەکانی سەردەمی مەشروتە، کێبەڕکێی ڕووس و عوسمانی، شەڕی گەورە و جیاخوازی مەسیحییەکانی نەستووری، قۆناغگەلێك بوون کە ئەوتوانی بەسەرکەوتوویی هەموویان تێپەڕبکاو پەرە بەتوانای سیاسی‌و سەربازی خۆی بداو کە بەپێی ئەوە پانتایی زۆرخوازی و فراوانخوازییەکانیش فراوانتر بوونەوە بە شێوەیەك کە دوای ئەو ڕووداوانە ئیدعای حکوومەت کردن بەسەر ناوچەکانی ڕۆژئاواو باشووری ئازەربایجانی دەکرد. جیاخوازی مەسیحییەکان و خەباتی ناوچەگەریانەی خیابانی، وای لە سەرکردەی کوردەکان کرد کە بۆ لای دروشمە ناوچەگەرێتییەکاندا رابکێشرێ. لە لایەکی دیکە هێزەکانی سیاسی کورد دراوسێیەکان بەلەبەرچاوگرتنی دەسەلاّتی سمکۆ، هانی ئەویان دەدا بۆ پێکهێنانی کیانێکی کوردی، بەلاّم سەرۆکی شکاکەکان بەهەڵێنانی چەندین هەنگاو وەك پێشڕەوی کردن بۆ ناوچەکانی ڕۆژهەلاّتی ئازەربایجان، تالانکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەلاّتی خۆی‌و لەوانە شاری

کوردنشینی مەهاباد، هەروەها حەز لێ نەبوونی ئەو بۆ گرتنی ناوچە کوردنشینەکان لە باشوور و دامەزراندنی پەیوەندی گەرم لەگەڵ مستەفا کەماڵ، هەموو ئەوانە نیشانیان دا کە دەیەوێ فەرمانڕەوای بێرکابەری ئازەربایجان بێ‌و هیچ مەیلێکی بۆ بەشداری کردن لە چارەنووسی کوردەکانی عێراق‌و تورکیەدا نەبێ.

سمکۆ لەماوەی حکومڕانیەکەیدا ڕێکخراوێکی سیاسی، دەوڵەت‌و بنەمایەکی یاسایی کە لەسەر بنەڕەتی نەتەوەپەروەری کوردی بێ، پێکنەهێناو تەنیا ڕۆژنامەیەکی کوردی لە دامودەزگای ئەودا چاپ دەبوو لە ڕاستیدا ئەویش بەرهەمی هەوڵ‌و تەقەلای سەید تەهاو مستەفا پاشا بوو کە لە کوردەکانی تورکیە و عێراق بوون.

جەنگاوەرانی ژێر فەرمانی خانی شکاك، خەڵکی تورك‌و کوردو مەسیحی جێگیر لە ناوچەکانی ژێردەسەلاتی ئەویان وەك یەك تالان دەکردو لە ماوەی دەسەلات‌و حکومڕانی ئەودا بەشی ڕۆژئاواو باشووری ویلایەتیی ئازەربایجان ژمارەیەکی سەرەکی لە دانیشتوان و هەروەها بەروبوومی خۆی لەدەست دا. پەیوەندی سمکۆ لەگەڵ بەریتانیاو تورکیە تەنیا بۆ بەدەستهێنانی پارەو هەروەها چەك‌و تەقەمەنی بوو و هەوڵی دەدا لەو ڕێگەیەوە دەسەلاتی خۆی بەسەر ڕۆژئاوای ئازەربایجاندا بپارێزێ.

بەشێوەیەکی گشتی دەبێ بڵێین کە ڕاپەڕینی سمکۆ هەڵچوونێکی دەرەبەگایەتی زۆر سادەی بەدەردەخست کە هیچ جۆرە لایەنێکی نەتەوەپەروەری کوردی پێوە دیار نەبوو، جارێکی دیکە ئەو ڕاستییەی نیشان دا کە عەشایری کوردی نیشتەجێ لەسەر سنوورەکان هەمیشە ئامادەیی‌و ئیمکاناتی زیاتریان لەبەر دەستدایە بۆ سەرپێچی کردن لە دەسەلاتی ناوەندی.

# پەراوێزەکان

## بەندی یەکەم:

١ـ حرکت تاریخی کرد به خراسان ـ کلیم الله توحدی (مشهد، انتشارات دانشگاه مشهد، ١٣٥٩) صص ٨ و ٧.

٢ـ تاریخ افشار ـ میرزا رشید ادیب الشعرا ـ به تصحیح پرویز شهریار افشار ـ محمود رامیان (تبریز شورای مرکزی جنبش ملی ٢٥٠٠ ساله شاهنشاهی آذربایجان غربی، ١٣٤٦) صص ٣٦ ـ ٢٥.

٣ـ همان مأخذ ـ صص ٣٧٠ ـ ٣٦٦.

٤ـ همان مأخذ ـ ص ٤٧٨.

٥ـ همان ـ ٤٩٧.

٦ـ تاریخ مشروطەو ایران، سید احمد کسروی (تهران، انتشارات امیرکبیر، ٢٥٣٦) چاپ ١٣ ـ ص ١٤٣.

7- La Revue du monde Musulman, 2em annee n'5, mai 1908, les kurds persanset Linvasion Ottmane, Nicolas. A.L.M P12 .

٨ـ گزیده اسناد سیاسی ایران و عثمانی (تهران، انتشارات وزارت خارجه، ٧٠ ـ ١٣٦٩) ج ٤ ـ صص ٤ ـ ٤٦٢.

٩ـ همان مأخذ ـ سند شماره ٧٨٥ ـ صص ٤٨٢ ـ ٤٨١.

١٠ـ همان ـ همان صفحات.

١١ـ همان مأخذ ـ سند شماره ٧٦٦ ـ صص ٤٢٦ ـ ٤٢٥.

١٢ـ همان مأخذ ـ سند شماره ٧٨١ ـ ص ٤٦٣.

13- The kurdish Rpublic of 1946 – William Eagleton JR (london oxford university press, 1963) P7 .

١٤ـ کورد، مینۆرسکی ـ حەمە سەعید حەمە کەریم کردوویەتی بە کوردی (صلاح الدین ـ چاپخانەی زانکۆی صلاح الدین، ١٩٨٤) ل ١٤١ ـ ١٤٠.

١٥ـ همان مأخذ ـ همان صفحات.

١٦ـ ایران دیروز یا خاطرات پرنس ارفع الدوله ـ رضا ارفع (ارفع الدوله) (تهران، چاپخانه وزارت فرهنگ ١٣٤٥) صص ٤٣٤ ـ ٤٣٣.

١٧ـ تاریخ مشروطەو ایران ـ سید احمد کسروی ـ ج ١٣ ـ صص ١٤٥ ـ ١٤٣و خاطرات ارفع الدوله ص ٤٣٥.

١٨ـ کێشەی کورد (١٨٩٠ ـ ١٩١٧) م.س.لازاریف ـ دوکتۆر کاوس قەفتان لە روسیەوە کردویەتی بە کوردی (بەغدا ـ مطبعە الجاحظ، ١٩٨٩) دووبەش ـ بەشی یەکەم ـ ل ٢٠٣.

١٩ـ کرد و کردستان ـ واسیلی نیکیتین، ترجمه محمد قاضی (تهران، انتشارات نیلوفر ـ ١٣٦٦) صص ٥٤٨ ـ ٥٤٧.

٢٠ـ کێشەی کورد ـ لازاریف ـ ب ١ ـ ل ٢٠٣ ـ ٢٠٢.

۲۱ـ هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

۲۲ـ تاریخ مشروطەو ایران ـ سید احمد کسروی ـ ص ٤۲۸.

۲۳ـ تاریخ خوی ـ مهدی آقاسی (تبریز، انتشارات مؤسسه تاریخ و فرهنگ ایران، ۱۳۵۰) صص ۳۱۳ و ۳۱۲.

۲٤ـ همان مأخذ ـ ص ۳۱۳.

۲۵ـ کێشەی کورد ـ لازاریف ـ ب ۱ ـ ل ۲۸۸.

۲٦ـ هەمان شوێن.

۲۷ـ هەمان سەرچاوە ـ ب ۲ ـ ل ۵۱۹.

## بەندی دووهەم:

۱ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ صص ۵۹٤ ـ ۵۹۳ و The Conflict of tribes and state in IRAN and AFGHANISTAN, edited by Richard. L. Tapper. (London. Crom Helm, 1983) Chapter of Kurdish tribish and the state of RAN, the cast of simko, srevolt. Van. Bruinessen. Martin. PP 364 – 400.

۲ـ کێشەی کورد ـ ب ۲ ـ ل ٦۱۰.

۳ـ تاریخ خوی ـ ص ۳۵۲.

٤ـ تاریخ خوی ـ صص ۳۵۳ ـ ۳۵۲.

۵ـ کێشەی کورد ـ ب ۲ ـ ل ٦۲٤.

٦ـ هەمان شوێن.

۷ـ رستاخیز ایران ـ مدارك، مقالات و نگارشات خارجی ۱۲۹۹ تا ۱۳۲۲ شمسی، نوشتەو فتح الله نوری اسفندیاری (تهران، چاپ سازمان برنامه، ۱۳٤۳) صص ۱۱۳ ـ ۱۱۱. مقالەو میرزا افروزخان در روزنامەو Near East در سپتامبر ۱۹۲٤.

8- Van Bruinssen, op.cit. PP 364 – 400

۹ـ کردها ـ ترکها ـ عربها ـ سیسیل جی ادموندز ـ ترجمەو ابراهیم یونسی (تهران، روزبهان، ۱۳٦۷) ص ٤۲۱.

۱۰ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ صص ۷٦۳ ـ ۷٦۲ و کردها، ترکها، عربها، ص ٤۲۱.

11- The Kurds, ARFA, Hassan. (London, Oxford university press, 1968) P50 .

۱۲ـ کێشەی کورد ـ ب ۲ ـ ل ۵۹۱ ـ ۵۹۰.

۱۳ـ تاریخ میسیون امریکایی در ایران، جان الدر ـ ترجمەو سهیل آذري (بی جا، انتشارات جهان، ۱۳۳۳) صص ۲٤ ـ ٤.

۱٤ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ محمد تمدن (تهران، چاپخانەو اسلامیه) صص ۲۰۷ ـ ۲۰٤.

۱۵ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ احمد کسروی ـ ص ۲۰٤.

۱٦ـ تاریخ خوی ـ مهدی آقاسی ـ ص ۳۸۷.

۱۷ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ص ۷۲۸ و تاریخ خوی ـ ص ۳۹۰.

۱۸ـ تاریخ خوی ـ صص ۳۹۸ ـ ۳۹۶.

۱۹ـ اوضاع جنگ ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ ص ۲۰۳.

۲۰ـ تاریخ مختصر احزاب سیاسی ایران ـ ملك الشعرای بهار ـ ۲جلد ـ ج ۱ (تهران، امیرکبیر، ۱۳۷۱) چاپ چهارم ـ صص ۲۸۰ ـ ۲۷۵.

۲۱ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ص ۷۲۷.

۲۲ـ بررسی و تحقیق دربارهو شاهپور آذربایجان ـ دکتر حبیب زاهدی ـ ص ۲۱.

۲۳ـ تاریخ خوی ـ صص ۳٦۹ ـ ۳٦۸.

۲٤ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ ص ۳۱۹.

۲۵ـ تاریخ خوی ـ صص ٤۳۰ ـ ٤۲۹.

۲٦ـ همان مأخذ ـ صص ٤۳۲ ـ ٤۳۱.

۲۷ـ همان، ص ٤۳۰.

28- Van Bruinessen, po.cit. P 386 .

۲۹ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ص ۸۳۲.

۳۰ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه / صص ۳٤۱ ـ ۳۳۹ و تاریخ خوی / صص ٤۳۵ ـ ٤۳۲.

۳۱ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ۸۳٦.

۳۲ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ ص ۳۲۲.

۳۳ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ ص ۳۲۳.

۳٤ـ همان مأخذ ـ ص ۳۲۵.

۳۵ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ص ۸۳۹.

۳٦ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ ص ۳۲۷.

۳۷ـ بررسی و تحقیق درباره شاهپور آذربایجان ـ صص ۲۳ و ۲۲.

۳۸ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ ص ۳۵٦.

۳۹ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ص ۸۵۵.

٤۰ـ تاریخ خوی ـ صص ٤٤٤ ـ ٤٤۰ و تاریخ هیجده ساله . . . ـ صص ۸۵۷ ـ ۸۵۳ و اوضاع ایران در جنگ اول ـ صص ۳٤۵ ـ ۳٤۳.

٤۱ـ تاریخ هیجده ساله . . . ـ ص ۸۵۷.

٤۲ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ ص ۳٤٤.

٤۳ـ همان مأخذ ـ ص ۳٤۵.

٤٤ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ص ۸۵۷.

45- ARFA, op.cit. P 58 .

٤٦ـ شیخ محمد خیابانی، علی آذری (تهران، صفی علیشاه، ۱۳۵٤) چاپ چهارم ـ صص ۱۳۲ ـ ۱۳۰.

٤۷ـ همان مأخذ ـ صص ۱۵٤ ـ ۱۵۱.

٤۸ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ ص ۳٤۹.

٤٩ـ جنبش ملی کرد ـ ص ١٩٥.

٥٠ـ جنبشهای کرد از دیرباز تا کنون ـ نگارش و اقتباس م.کاردوخ (سوئد Coimen اسکاندیناوی، ١٩٩٣) ٢جلد ـ ج دوم ـ ص ١٩٣.

٥١ـ بر من چه گـذشت، مهدی قلی خان هدایت (تهران، بی‌تا، ١٣٢٣) ص ٣٥.

٥٢ـ خاطرات و خطرات، مهدی قلی‌خان هدایت (تهران، زوار، ١٣٦٣) چاپ چهارم ـ ٣٣١.

٥٣ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ص ٨٩٥.

٥٤ـ سازمان اسناد ملی ایران ـ ٣٦ ـ ٢٩٠٠٠١٩٠٩ گزارش ٢٥ میزان ١٣٣٩ هـ.ق.

٥٥ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ صص ٣٦٣ ـ ٣٦٠.

## بەندی سێیەم:

١ـ جنبشهای ملی کرد از دیرباز تاکنون ـ ج ٢ ـ ص ١٩٤.

2- Van Bruinessen, op.cit. P 384 .

٣ـ سازمان اسناد ملی ایران ـ سند شماره ٢٧٣ ـ ٤٢ ـ ١١٦٠٠١.

٤ـ یادداشت ـ رفیق حلمی ـ سێ‌بەش (بەغدا، مطبعەی مەعاریف، ١٩٥٦) بەشی یەکەم، ل ٢٦٥.

٥ـ جنبش ملی کرد ـ ص ٦٦.

6- Van Bruinessen, op.cit. P 386 .

7- ARFA, op.cit. pp 58 – 59 .

٨ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ صص ٣٧٢ ـ ٣٦٩.

٩ـ همان مأخذ ـ همان صفحات.

١٠ـ دربارەو مبارزات کردستان ـ حمید مؤمنی (تهران، شباهنگ، ١٣٥٨) ص ٣٣.

١١ـ یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی (بەغدا، سلمان الاعظمی، ١٩٧٠) ل ٧٥.

١٢ـ هەمان سەرچاوە، ل ٨٣ و ٨٢.

١٣ـ هەمان شوێن.

١٤ـ هەمان سەرچاوە، ل ٤٦ ـ ٤٤.

١٥ـ یادداشت ـ رفیق حلمی ـ ب ٣ ـ ل ٦٥ ـ ٥٠ و یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی ـ ل ٦٩.

١٦ـ جنبش ملی کرد ـ صص ٦٧ ـ ٦٦.

١٧ـ یادداشت رفیق حلمیٚ ـ بەرگی دووەم ـ ل ٦٠٥ ـ ٦٠٤.

١٨ـ هەمان سەرچاوە ـ ل ٦٠٤.

١٩ـ هەمان سەرچاوە ـ ل ٥٥٩.

٢٠ـ هەمان سەرچاوە ـ ل ٦٠٠.

۲۱ـ هەمان سەرچاوە ـ ل ٥٩٨.

۲۲ـ جنبش ملی کرد ـ ص ٦٦.

۲۳ـ یادداشتەکانم ـ عبداللە احمد رسول پشدری ـ ل ۳۲ و ۳۱.

۲٤ـ جنبش ملی کرد ـ ص ٦٦.

## بەندی چوارەم:

۱ـ جنبش ملی کرد ـ ص ٦٦.

۲ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیە ـ صص ۳٤۸ ـ ۳٤٦.

۳ـ همان مأخذ ـ ص ۳٥٦.

٤ـ خاطرات ماذور ملك زادة ـ نقل از اوضاع ایرانُ در جنگ اول ـ صص ۳۷۷ ـ ۳۷٦.

٥ـ خاطرات و خطرات ـ مهدی قلی خان هدایت (مخبر السلطنه) ـ (تهران، زوار، ۱۳٦۳) چاپ چهارم ـ ص ۳۲۳.

٦ـ سازمان اسناد ملی ایران ـ ۲۰۹٥ ـ ۲٤۰ ـ سند نمره ۱٥۲٥ به مورخه ۱۳٤۰/۱/٤.

۷ـ جنبش ملی کرد ـ صص ٦۷ ـ ٦٦.

۸ـ بررسی و تحقیق درباره شاهپور آذربایجان ـ دکتر حبیب زاهدی ـ ص ۲۳.

۹ـ تاریخ مختصر احزاب سیاسی ایران ـ ۲جلد ـ ملك الشعرای بهار ـ چاپ چهارم ـ (تهران، امیرکبیر، ۱۳۷۱) ج ۱ـ ص ۱۷۱.

۱۰ـ کردها ـ ترکها ـ عربها ـ سیسیل جی ـ ادموندز ـ ترجمه ابراهیم یونسی (تهران، روزبهان، ۱۳٦۷) ص ۲٤۳.

۱۱ـ بزووتنەوەی سیاسیو رۆشنبیری کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەمەوە هەتا ناوەڕاستی چەرخی بیست، نووسینی رمزی قزاز (سلێمانی، چاپخانەی ژین، ۱۹۷۱) ل ۱۹۷ ـ ۱۹٥.

۱۲ـ هەمان سەرچاوە ـ ل ۱٥۷ ـ ۱٥٦.

۱۳ـ هەمان سەرچاوە ـ ل ۱٥۸.

۱٤ـ یادداشت رەفیق حلمی ـ ب۲ ـ ل ٥۹۸ ـ ٥۹۷ و کورد لە کۆتایی . . . رمزی قزاز ـ ل ۱٦۰ ـ ۱٥۹.

۱٥ـ یادداشت رفیق حلمی ـ ب ۲ ـ ب ٥۹۸ ـ ٥۹۷.

۱٦ـ جنبش ملی کرد ـ کریس کوچرا ـ ص ٦۷.

۱۷ـ کێشەی کورد ـ م.س.لازاریف ـ ج ۲ـ ل ٥۳٤.

۱۸ـ هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

۱۹ـ سازمان اسناد ملی ـ سند شماره ۲۹۰۰۰۱۲٦۸/۲۰.

۲۰ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ص ۸۳۰ ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ ص ۳۳۷.

21- Van Bruinessen, op.cit. PP 378 – 379 .

۲۲ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ص ۸۳۰.

۲۳ـ کێشەی کورد ـ ب ۱ ـ ل ۲۲۸.

٢٤ـ جنبش ملی کرد ـ ص ٢٧ و کردها ـ صص ٧٣ ـ ٦٩.

٢٥ـ کێشەی کورد ـ ب ١ ـ ل ٢١٧.

٢٦ـ جنبش ملی کرد ـ ص ٦٨.

٢٧ـ کێشەی کورد ـ ب ١ ـ ل ٢١٧.

٢٨ـ مجله نگاه نو ـ ش ١٠ مهر و آبان ١٣٧١ ـ صص ١٤٩ ـ ١٣١ ـ مقاله و تبانی شوروی و ترکیه، نوشته کاوه بیات.

٢٩ـ گزارش سفارت فوق العاده در پاریس بە وزارت امور خارجه در ١٦ آوریل ١٩٢٢ ـ ١٣٠١/١/١٧ ـ مؤسسه مطالعات و پژوهشهای فرهنگی ـ سند شماره ٨ ـ ١٢٥٢٧ ـ نقل از کتاب شورش کردهای ترکیه و تأثیر آن بر روابط خارجی ایران ـ ١٣١١ ـ ١٣٠٧ هـ.ش، کاوه بیات (تهران، نشر تاریخ ایران، ١٣٧٤)

٣٠ـ یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی ـ ل ٤٧ و ٤٦.

31- Martin Van Bruinessen, op.cit. P 386 .

٣٢ـ کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەمەوە . . . رمزی قزاز ـ ل ٢١٩ ـ ٢١١.

٣٣ـ یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی ـ ل ٤٧ و ٤٦.

٣٤ـ هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە ٤٨ ـ ٤٧.

٣٥ـ یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی ـ ل ٨٥.

٣٦ـ مسائل مرزی ایران و عراق و تأثیر آن در مناسبات دو کشور ـ دکتر آزرمیدخت مشایخ فریدونی (تهران، امیرکبیر، ١٣٦٩).

٣٧ـ تشیع و مشروطیت در ایران و نقش ایرانیان مقیم عراق ـ عبدالهادی حائری (تهران، امیرکبیر، ١٣٦٠) صص ١٢٠ ـ ١٧٢ ـ ١٧١.

٣٨ـ یادی از گذشته، مهدی اعتماد مقدم (تجریش، چاپ ایران، ١٣٥٢) صص ٩٦ ـ ٩٢.

٣٩ـ یادداشت ـ رفیق حلمی ـ ب ٢ ـ ل ٦٠٧ ـ ٦٠٤ و کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەمەوە ـ ڕەمزی قەزاز، ل ١٩٧ ـ ١٩٥.

٤٠ـ یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی ـ ل ٧٣ ـ ٦٩ و یادداشت رفیق حلمی ـ ب ٢ ـ ل ٦٠٧ ـ ٦٠٤.

٤١ـ یادداشت ـ رفیق حلمی ـ ب ٣ ـ ل ٥٤.

٤٢ـ یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی ـ ل ٦٩.

٤٣ـ کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەم. ل ١٧٠ و یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی ل ٨٧.

٤٤ـ کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەم ـ ل ١٧.

٤٥ـ یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی ـ ل ٧٣ ـ ٧٠.

٤٦ـ یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی ـ ل ٨٥.

٤٧ـ کردها ـ گروهی از نویسندگان ـ ترجمە و ابراهیم یونسی (تهران، روزبهان، ١٣٧٢) چاپ دوم، صص ١٨٤ ـ ١٨٣.

٤٨ـ یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی ـ ل ٨٦ ـ ٨٥.

٤٩ـ هەمان شوێن.

٥٠ـ شورش کردهای ترکیه و تأثیر آن بر روابط خارجی ایران ١٣١٠ ـ ١٣٠٧ ش ـ نوشته کاوه بیات ـ (تهران، نشر تاریخ ایران، ١٣٧٤) صص ١٤١ ـ ١٤٠ و ١٠٠ و ٧٩ و ٧١.

٥١ـ یادداشتەکانی ئەحمەد تەقی ـ ل ٨٦.

## بەندی پێنجەم:

١ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ص ٨٥٧.

2- Martin Van Bruinessen, op.cit. P 387 .

٣ـ سازمان اسناد ملی ایران ـ ژیل سند شماره ٢٦٠٠٠٥٩/٧.

٤ـ خاطرات دکتر آسو یات خاطرات زندگی پرماجرای دکتر آسو "چهرەو مهاباد" ـ به قلم محمود قادرزاده (آسو) و توضیح از محمود پدرام (زوزان)، (تهران، نشر هور، ١٣٧٣) ص ٢٥.

٥ـ جنبش ملی کرد ـ صص ٦٢ ـ ٦١.

٦ـ همانجا.

٧ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ ص ٣٧٣.

٨ـ خاطرات دکتر آسو ـ صص ٢٥ و ٢٤.

٩ـ جنبش ملی کرد ـ ص ٦٢.

١٠ـ تاریخ ارسباران ـ سرهنگ بایبوردی (تهران، انتشارات کتابخانەو ابن سینا، ١٣٤١) ص ١٤٤.

11- ARFA, op.cit, P60 .

١٢ـ یادداشت ـ رفیق حلمی ـ ب ٢ ـ ل ٥٩٨ ـ ٥٩٧.

١٣ـ خاطرات و خطرات ـ مخبرالسلطنة هدایت چاپ چهارم (تهران، زوار، ١٣٦٣) ص ٣٢٤.

١٤ـ تاریخ خوی ـ ص ٤٥٤.

## بەندی شەشەم:

١ـ کورد ـ مینۆرسکی ـ ل ١٤١ ـ ١٤٠.

٢ـ گزیدەو اسناد سیاسی ایران و عثمانی ـ ج چهارم ـ سند شماره ٧٦٦ ـ صص ٤٢٦ ـ ٤٢٥.

٣ـ تاریخ خوی ـ ص ٣١٣.

٤ـ یادداشتەکانم ـ ب ١ـ ل ٣٢ ـ ٣١.

٥ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ صص ٨٤١ ـ ٨٢٩ ـ ٨٥٨ ـ ٨٥٠.

٦ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ ص ٣٦٠.

٧ـ همان جا.

٨ـ شیخ محمد خیابانی ـ علی آذری ـ ص ٢٢٨.

٩ـ تاریخ خوی ـ صص ٤٠٤ و ٤٠٣.

١٠ـ سازمان اسناد ملی ایران ـ ژیل سند شماره ٢٠ تا ٧٤/٤٥/١٨ ـ ٢٤٠.

١١ـ همان مأخذ ـ ژیل سند شماره ٧٤/٤٥/٩ ـ ٢٤٠.

١٢ـ همان مأخذ ـ همان سند ـ صفحات ١٠ و ١٨.

13- Martin Van Bruinessen, op.cit. P 385 .

١٤ـ خاطرات من ـ عبدالله ناهید (افتخار)، به اهتمام احمد قاضی (تهران، بی‌تا، ١٣٦٣) ص ٧٢.

15- ARFA, op.cit, p 65 .

١٦ـ یادداشت ـ رفیق حلمی ـ ب ٣ـ ل ٧٩.

١٧ـ جنبش ملی کرد ـ ص ٦٥.

١٨ـ همان مأخذ ـ صص ٦٦ ـ ٦٥.

١٩ـ همان ـ ص ٦٥.

٢٠ـ تاریخ هیجده ساله آذربایجان ـ ص ٨٣١.

21- ARFA, op.cit, P65 .

٢٢ـ تاریخ پنجاه ساله‌و نیروی زمینی ارتش شاهنشاهی ایران ـ سپهبد محمد کاظمی، سرهنگ ستاد منوچهر البرز (تهران، انتشارات نیروی زمینی ارتش ایران، ١٣٥٥) ص ٦٨.

٢٣ـ یادداشته‌کانی ئه‌حمه‌د ته‌قی ـ ل ٤٧ و ٤٦.

٢٤ـ جنبش ملی کرد ـ ص ٦٦.

٢٥ـ اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه ـ صص ٣٧٢ ـ ٣٦٩.

٢٦ـ درباره‌و مبارزات کردستان ـ حمید مؤمنی ـ ص ٣٣.

٢٧ـ دیوان سیف القضات مهابادی ـ به اهتمام احمد قاضی (بی جا، بی تا، ١٣٦١) ص ٨١.

# دەروازە

لە بەشەکانی پێشتر هەوڵ درا سێ تایبەتمەندی بنەڕەتی ناوچە کوردنشینەکانی ئێران، واتە جیاوازی نێوان کوردستانی باکوورو باشوور، وەفاداری ناسیۆنالیستەکانی ئێران و نەبوونی ناسیۆنالیزمی کورد هەتا کاتی پاشایەتی ڕەزا شا، باسی لێوە بکرێ. لاوازی حکوومەتی قاجار هەتا سەردەمی دوای مەشروتییەت (دەستووری) سەرهەڵدانی ئاراستەگەلی جیاواز و پشتیوانی هێزە بێگانەکان لەوان لە سەردەمی قەیران‌و لە ماوەی نێوان دەستوورییەت هەتا کودەتای (١٢٩٩ ک. ش) ١٩٢٠ز لە زەمینەکانی هەڵچوونی سمکۆ بوون. بەڵام ڕەزا شا دوای بەدەست گرتنی دەسەڵات زنجیرە هەنگاو و چاکسازی بەڕواڵەت نوێخوازانەی وەك گۆڕینی جلوبەرگ، دامەزراندنی سیستمی وەزیفە (سەربازی بەزۆرەملێ)، لابردنی حیجاب، نیشتەجێکردنی بەزۆری عەشیرەتەکان، قەدەغە کردنی بەکارهێنانی زمانی کوردی و لەناوبردنی دەسەڵاتە ناوچەییەکانی پەیڕەو کرد. هەموو ئەو هەنگاوانە هەلومەرجێکی لە سەردەمی پەهلەویدا هێنایە ئاراوە کە ئاکامی ئەوان وەك چەوساندنەوەی نەتەوایەتی بەرجەستە بوو. ئەو هەنگاوانە، بوو بەهۆی پارێزگاری کردنی کوردەکان لە کلتوورو دابونەریت و زمانی خۆیان و هەروەها کۆمەڵە نارەزایەتێکی لە ناو خەڵکدا ساز کرد، کە نموونەی بەرجەستەی ئەو، ڕاپەڕینی مەلا خەلیل و عەشیرەتی مەنگوڕ بوون. لەو بەشەدا، هۆیەکانی بێزاری چینی ناوەڕاستی شارنشینی کورد لە حکوومەتی ڕەزا شا، دوورکەوتنەوەی کوردەکان لە ناسیۆنالیزمی ئێرانی بۆ یەکەم جارو دروستبوونی زەمینەیەك بۆ گەشەکردنی ناسیۆنالیزمی کوردی لە ناو کوردەکانی ئازەربایجاندا تاوتوێ دەکرێ.

ناوچه کوردنشینه‌کان له سه‌رده‌می به‌ڕێوه‌به‌ری ڕه‌زا شادا، دووچاری ئاڵوگۆڕگه‌لێکی زۆر قووڵ له بواره‌کانی ئابووری و سیاسیدا بووه، پانتایی و فراوانی ئه‌م گۆڕانکارییانه له ئاستێکدا بوو که کورده‌کانی ئێران بۆ یه‌که‌مجار له دوای ڕووخانی حکومه‌تی ڕه‌زا شادا، له جیاتی نزیکبوونه‌وه له کولتووری ئێرانی، له هه‌وڵی ناسین و پاراستنی ناسنامه و شوناسی کوردایه‌تی خۆیاندا بوون. هه‌تا پێش هاتنه سه‌رکاری ڕژێمی په‌هله‌وی، ئامێری گرینگی په‌یوه‌ندی کورد به‌دنیای ده‌ره‌وه، به‌چاوپۆشین له ناوخۆی ئێران، به‌شی کوردنشینی وڵاتی عوسمانی بوو و په‌یوه‌ندی کورده‌کان له‌هه‌ر دوو دیوی سنووره‌وه، له‌و ڕێگایانه‌ی خواره‌وه پێکده‌هات:

١- جێنشینبوون و په‌رته‌وازه‌یی تایفه و عه‌شیره‌ته‌کان له هه‌ر دوو دیوی سنوور، هه‌بوونی په‌یوه‌ندی خوێنی له نێوان ئه‌ندامانی عه‌شیره‌ته‌کان و کۆچی وه‌رزیان به‌خاکی هه‌ردوو وڵاتی ئێران‌و عوسمانیدا.

٢- په‌یوه‌ندی بازرگانی به‌هۆی کۆیستانی بوونی ناوچه‌که، نه‌بوونی ڕێگای شیاو بۆ که‌ڵك لێ وه‌رگرتن، بێ دیسپلینی و خه‌راپه‌کاری عه‌شیره‌ته‌کان وای کرد بوو (ئه‌و ناوچانه) ره‌ونه‌قێکی وای نه‌بێ.

٣- په‌یوه‌ندی کولتوورییه‌کان، که تایبه‌ت بوون به‌هاتووچۆی قوتابیانی زانستی ئایینی و شاعیرانی کورد له هه‌ردوو دیوی سنووردا به‌مه‌به‌ستی سوود وه‌رگرتن له قوتابخانه ئایینییه‌کان و بنکه زانستییه‌کانی شاره کوردییه‌کان.

به‌دوای ڕووخانی حکوومه‌تی قاجاری و جێکه‌وتنی ناوچه کوردنشینه‌کان بۆ ژێر چاودێری ڕاسته‌وخۆی ده‌وڵه‌تی ناوه‌ندی، له لایه‌که‌وه په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ کورده‌کانی ئه‌و دیوی سنوور له لایه‌کی دیکه چینێکی خوێنده‌وار په‌یدابوون که به‌پێچه‌وانه‌ی ڕۆشنبیره نه‌ریتییه‌کانی سه‌رده‌می قاجار، ئاسۆگه‌لێکی فیکری نوێیان له پێشچاو بوو، په‌یدابوونی ئه‌م چینه نوێیه له کوردستان هاوکات له‌گه‌ڵ په‌ره‌سه‌ندنی نه‌ته‌وه‌گه‌ری کوردی عێراق و تورکیه دابوو. دیارده‌یه‌ك که دواجار سه‌رنجی کورده‌کانی ئێرانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاو دوای ڕووخانی ڕه‌زا شا، له نێو لاوانی کورد دا، لایه‌نگیری خوێن گه‌رمی زۆری په‌یدا کرد.

له دوای ئه‌وه‌ی به‌شێك له ڕۆشنبیران و به‌شێکی تا ڕاده‌یه‌ك زۆر له چینی ناوه‌ندی کورد به‌رده‌وام له ڕێگه‌ی به‌رز ڕاگرتنی ناسیۆنالیزمی کورد، هه‌وڵیان داوه، که ئه‌وه‌ش ڕاستییه‌کی حاشا هه‌ڵنه‌گره. به‌ڵام ده‌بێ بزانین له ئێراندا سه‌ره‌ڕای پشتیوانی هه‌ندێك له کورده‌کان له‌م دیارده‌یه،

هەوڵدان بۆ بەهێز کردن و بەرەو پێشەوەبردنی ئەو (ناسیۆنالیزم)ە هیچ کات بەڕادەی بەهێزی و هەوڵی کوردەکانی عیراق‌و تورکیە نەبووە، چونکە لە لایەك ناسیۆنالیزمی کورد لە ئێراندا، پێش لە هەر شتێك لە ویستی کوردەکان بۆ چاکسازی کۆمەڵایەتی و ئابووری سەرچاوەی گرتووەو لە لایەکی دیکە نزیکی دوو زمانی کوردی و فارسی، هەروەها بەشداریکردنی بەرچاو و حاشا هەڵنەگری کولتووری ئێران و زمان‌و ئەدەبیاتی فارسی لە بنیاتنان و پەروەردەکردنی زمان، کولتوور و ئەدەبیاتی کوردیدا، هەمیشە توانیویەتی بەشێك لە ڕۆشنبیران، هونەرمەندان و زانست دۆستانی کورد بۆ لای خۆی رابکێشی‌و هەر ئەم کارەش تا ڕادەیەك ڕووبەڕووبوونەوەی توندی ناسیۆنالیزمی کوردی، لەگەڵ ناسیۆنالیزمی فارسی کەم کردۆتەوە. لەو بەشەدا هەوڵ دراوە ئەو هۆکارانەی کە وایان کردووە کوردەکان خۆیان لە هەلومەرجی نوێ ببوێرن، دەست نیشان بکەین‌و لەو ڕێگایەوە بەراوردێك لە نێوان شێوە و کارایی حکوومەتەکانی قاجار و پەهلەویدا بکەین لە بابەت پارێزگاری کردن لە یەکێتی و یەکپارچەیی میللی لە ئێراندا.

پێشینەی یەکەم تێکهەڵچوونی ڕەزاشا لەگەل کوردەکان بۆ شۆڕشی سمکۆ دەگەڕێتەوە. ئەو لەو کاتیدا سەرداری سوپا و وەزیری شەڕ بوو، لە کوژاندنەوەی ئاگری ئەم ئاژاوەیەدا، سوودێکی ڕاگەیاندنی باشی وەرگرت، سەرداری سپە (فەرماندەی سوپا) دەیزانی درەنگ یا زوو سمکۆ ناتوانێ لە بەرانبەر هێزی ئەودا بەربەرەکانی بکات‌و لەناودەچێ هەر بۆیە بزووتنەوەکەی بە شێوەیەکی گەورە بەرجەستە دەکرد هەتا بتوانێ لە دوای دامرکاندنەوەی ئەو ئاژاوەیە ڕەزامەندی خەڵك بەدەست بهێنێ‌و ئابڕۆیەکیش بۆ خۆی ساز بکا.

یەکەمین هەنگاو بۆ چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە، لابردنی والی یاسایی ئازەربایجان (موسەدەق ئەلسەڵتەنە) لە ڕێکەوتی (٢٠ سەرەتانی ١٣٠١ ك.ش ١٩٢٢ز) دەستی پێکردو کەفالەتی ئەم ویلایەتە درا بەکەسایەتییەکی سەربازی بە ناوی سەرتیب (ئەمانوڵلاّ خانی جهانبانی)و توانی لە ماوەیەکی کەمدا سمکۆ تێك بشکێنی. (مەلەك ئەلشوعەرای بەهار)، لە بارەی دەنگدانەوەی ئەم سەرکەوتنە لە کتێبی، کورتە مێژووی حزبە سیاسییەکانی ئێران نووسیویەتی: "ڕزگار کردنی چەهریق بە شێوەکی زۆر چاوەڕوان نەکراو لە وڵاتدا دەنگی دایەوە کە تا ئێستا شتی ئاوا ڕووی نەداوە، فەرماندەی سوپاو دۆستە عاقڵەکانی کە هیچ دەرفەت و چرکەیەکی کۆمەڵایەتی و هەروەها هیچ دەرفەتێکی سوودمەندی سیاسیان بەفیڕۆ نەدەدا، باشترین و زۆرترین سوودیان لەم ڕووداوە وەرگرت‌و زۆربەی شارەکانی ئێران تەلگرافی خۆشی و پیرۆزبایی پێ دەگەیشت و جەژن و شادی دەکرا."(١)

فەرماندەی سوپا، لە پەرلەماندا، کە بەو بۆنەیەوە جەژنێکی سازدا بوو، لەوێدا وتارێکی خوێندەوە "بێجگە لە تەگەلێکی ئالۆز هیچی دیکە نەبوو. بەکورتی، رزگارکردنی چەهریق لە پەرلەماندا دەنگدانەوەی هەبوو، لە لایەن نوێنەرە جیاوازەکان و تەنانەت سەرۆکی پەرلەمانیش رێزو قەدردانی لە وەزیری جەنگ کرا.(٢)

پاش تێکشکانی سمکۆ و دالّدەدانی لە لایەن عەشیرەتەکانی تورکیە و هەندێ کاتیش عێراق دا، کە وای کرد جوولانەوەی لە سنوورەکاندا هەبێ، دەوڵەت هەستیارییەکی زۆری بەنسبەت ئەو و هەروەها، سەرپێچی عەباس خانی سەردار ڕەشید پەیدا کرد. عەلی ئەسغەر زەرگەز، سەرکوتی سمکۆی چ لە ڕوانگەی ناوخۆو چ لە ڕوانگەی دەرەوە بەگرینگ دەزانی و کاریگەری ئەوی لە پتەوکردنی پێگەی ڕەزا خانی سەرداری سوپاو هەروەها ویستی ئەو بۆ ناوەندگەرایی بەم شێوەیە لێکداوەتەوە: "لە دوای ئەم سەرکەوتنە سەربازییانەی ڕەزا خان لە دژی ڕاپەڕیوانی کورد، تەواوی ناوچەکانی باکوور و باکووری ڕۆژئاوای ئێران کەوتنە ژێر دەسەلاتی سەربازی ئەوەوە. سەرکەوتنی لەشکری ڕەزا خان بەسەر کوردەکاندا، چ لە ڕوانگەی نێوخۆیی‌و چ لە ڕوانگەی دەنگدانەوەی لە دەرەوەدا، سەرکەوتنێکی شایەنی سەرنج بوو.

گرنگی ئەوە، تەنها لەم کارە دا نەبوو کە هەر شێوە شکستێك لەم بوارەدا، دەیتوانی بەلەدەستدانی ئازربایجان و کوردستان تەواو بێ، بەڵکو لەم لایەنەوە گرنگ بوو کە دەربڕی توانای سوپای نوێ بوو لە دارشتن و جێبەجێکردنی وەها پلان و کردەوەیەکدا. ئەم ڕووداوە کەسایەتی‌و دەستڕۆیی رەزاخانی تا ڕادەیەکی چاوەڕوان نەکراو بردەسەرێ تێکشکانی سمیتقۆ (سمکۆ) ئەم خاڵەی روون کردەوە کە بەرنامەی ڕەزا خان بۆ بەرفراوان کردنی ڕاستەوخۆ و دەست بەسەر داگرتنی حکوومەتی تاران بە شێوەیەکی هێمن بەسەر تەواوی ناوچەکانی وڵاتدا شتێکی زۆر مەحاڵ نییە، لەو نێوەدا خێڵە ناارامەکانی دیکەی باکوور، وەك شایسێوانەکان و تایفەکانی دیکەی ئازەری لە ترسان چەکیان دانا .(٣)

سمکۆی تێکشکاو لە نزیکی سنوور گیرسابۆوەو ئەوەش مایەی نیگەرانی دەوڵەتی ئێران بوو. ئاژاوەنانەوەی (سالار ئەلدەولە)و عەباس خانی سەرداری رەشید لە ساڵی (١٣٠٢ ك ش) ١٩٢٣ز لە کوردستانی باشوورو هەروەها گرفتی مانەوەی سمکۆ لە نزیکی سنووری ئازەربایجان، هۆگەلێك بوون کە پێویستی هەبوونی ئامادەیی سەربازی بەردەوام و بەرفراوانی دەوڵەتی ناوەندی لە هەموو ناوچە کوردنشینەکان پێك دەهێنا.

له ساڵی ۱۳۰۲ ك.ش ۱۹۲۳ز عەشیرەتەكانی گولباغی، مەندومی، هەورامی، جاف و ئەوانی دیکە بۆ پشتیوانی کردن لە شازادە (سالار ئەلدەولە)و لەژێر ڕێبەری سەردار ڕەشید و مەحموود خانیٚ دزلی و مەحموود خانی کانی سانان ، دەستیان بە شۆڕش کرد. لە بەشی پێشوودا گوتمان کە سمکۆ تەنیا بۆ بەدەست هێنانی دەسەلاتێکی ناوچەیی لەگەڵ دەولەتی ناوەندیدا تووشی شەڕ بوو، ئەگینا ئەوەی وەك جیاخوازی سەرۆکی عەشیرەتی شکاك باس دەکریٚ، زۆرتر پەیوەندی هەیە بە پڕوپاگەندەی نەتەوەپەروەرەكانی عێراق و تورکیە و هەروەها ڕۆلی گوماناوی بەریتانیا و تورکیەی کەمالی. کاریگەری عەشیرەتەکانی کوردستانی باشووریش لەوکاتەدا، هاندەرێکی وێکچووی لەگەڵ بزووتنەوەکەی سمکۆ هەبوو، لە لایەکەوە ئەوان ڕەوتی ناوەندگەرایی ڕووەو پێشی دەولەتیان هەست پێدەکردو ئەویان بە بەربەستی ئۆتۆنۆمییە نەریتییەکەی خۆیان دەزانی و لە لایەکی دیکەوە هاندانی بێگانەکان و بەتایبەتیش بەریتانیاش، وای دەکرد ئەوان لە بەرانبەر دەولەتی ناوەندیدا رابوەستن.

دانەری مێژووی مەردوخ، باوەڕی وایە کە دژایەتی نێوان (سەید زیائەدین تەبا تەبایی) و ڕەزا خان هۆی ڕاپەڕینی سەردار ڕەشید بووە. ئەو لەم بارەیەوە دەنووسیٚ "لە دوای ئەوەی کە (سەید زیائەدین) هەستی بە مەترسی کرد لە لایەن ڕەزا خانەوە" هەر بە زوویی سەردار ڕەشیدی ئازاد کرد کە ئەوکات لە تاران زیندانی بوو و بە یاوەری میرزا عەلی محەممەد خان لە ئەندامانی وەزارەتی ناوخۆ ناردییە ناو عەشیرەتەکانی هەورامان و لە دوای سەرهەلدانی شۆڕش، کۆنسولی بەریتانیا لە کرماشان بە ناوی مستەر کاون بۆ ماوەیەك ئارامی کردەوە، هەتا ئەوەی کە دوو ساڵی دواتر دەستی بە شۆڕش کردەوەو ئەو جارەیان بۆ عێراق هەلات.(٤)

ئەو ڕاپەڕینە بە خێرایی سەرکوتکراو، دەولەت توانی جارێکی دیکە ئارامی بۆ ناوچەکە بگەڕێنێتەوە، بەلام دەرکەوت کە عەشیرەتە نیشتەجێیەکانی سەر سنوور، بەکەلك وەرگرتن و دلنیا بوون لە ئیمکانی پەناهەندەیی لەودیوی سنوور، هەموو کات ئامادەنە ناوچەکە تووشی ئاژاوە بکەن و لە هاوکاریکردن لەگەڵ بەریتانیاش هیچ ترسێکیان نییە. چەند ساڵ دواتر، واتە لە ساڵی (۱۳۰۵ ك.ش) ۱۹۲٦ز ئاگری شۆڕشێکی نویٚ لە کوردستان هەلگیرساو ئەو جارەش بەریتانیا لە هەلگیرساندنی ئەو ئاگرە دا، ڕۆلی سەرەکی گێڕا. هەموو پێگە سەربازییەکان، ناوەندی ژاندارمەریو هێزە سەربازییەکان، هەر لە سنووری تورکیەوە هەتا کرماشان کەوتنە بەر شالاوی عەشیرەتەکانو شارەکانی سەردەشت و مەهاباد و مەریوان بە شێوەیەکی جیدی کەوتنە بەر مەترسی. جیا لە عەشیرەتە ئێرانییەکان، پشدەرییەکانی عێراقیش یارمەتیەکی بەبایەخیان

پێشکەش بە سالار ئەلدەولە کرد. بەڵام ئامانجی بەریتانیا لە ئاوەڵاکردنی دەستی (سالار ئەلدەولە) چی بوو؟ دانەری مێژووی پەیوەندی سیاسیی ئێران و ئینگلیز، بەپشتبەستن بە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەو، وەزارەتی موستەعمەراتی بەریتانیا، نیشان دەدات کە دیبلۆمات و کاربەدەستەکانی ئینگلیزی لە عێراقدا، بەتەواوی ئاگاداری کارەکانی شازادەی قاجار بوون، بەڵام هەواڵی تایبەت بەم ڕووداوەیان ئەوەندە درەنگ بەدەوڵەتی ئێران ڕاگەیاند کە (سالار ئەلدەولە) دەرفەتی تەواوی بەدەست هێنا بۆ پێك هێنانی یەکیەتییەکی عەشیرەتی و تەیارکردنی جەنگاوەرانی کورد بەچەکە پێشکەوتووەکانی بەریتانیا، بەو شێوەی کە بۆ خۆی دەیەویست.(٥)

(حەسەن ئەرفەع)یش بەکورتی ئاماژەی بەهاوکاری نێوان بەریتانیاییەکان و (سالار ئەلدەولە) کردووەو دەنووسێ، کاتێك شازادەی قاجار لە سنوور تێدەپەڕی و هاتنە نێو خاکی ئێران، یەکێك لە ئەفسەرانی پاسەوانی بەریتانیا ئەوی بینی، بەڵام چونکە فەرمانی گرتنی ناوبراوی پێ نەبوو، تەنیا بەغدای لەو کارە ئاگادارکردەوە، ئەم دواکەوتنە بووە هۆی ئەوەی کە(سالار ئەلدەولە)، لەگەڵ سەرۆکەکانی کورد بکەوێتە وتووێژەوەو پێویستییەکانی شۆڕش ئامادە بکا.(٦)

زەرگەر پێیوایە، هەڵچوونی کوردەکان دەتوانرێ بەهۆی گوشاری بەریتانیا دابندرێ بۆ سەر دەوڵەتی ئێران، چونکە لەوکاتدا، ڕەزا شا. گرینگی بەداواکارییە زۆرەکانی بەریتانیا لە بابەت چارەسەرکردنی مەسەلە هەڵپەسێردراوەکانی نێوان دوو وڵات نەدابوو. گرینگترین مەسەلەکان ئەوانە بوون:

١- گەڕاندنەوەی یارمەتییە داراییەکان کە حکوومەتی ئێران لە ماوەی ساڵەکانی ١٩١٦ تا ئۆکتۆبەری ١٩٢٠، لە باڵیۆزخانەی بەریتانیای وەرگرتبوو.

٢- کاروباری شێخی محەمەرە (خورڕەم شار).

٣- دانئنان بە عێراق.

٤- ڕێگە دان بەفڕینی هێڵی ئاسمانی بەریتانیا لە سەرووی پانتایی ئێران(٧)

ئەو ڕووداوە جارێکی دیکە دەریخست بەریتانیا بەچ ئاسانییەك دەتوانێ کەڵك لە عەشیرەتە کوردەکان وەرگرێ لە دژی حکوومەتی ئێران و ئەوان لە کاتێکی گونجاودا وەك کارتێك بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندییە نامەشرووع و ناڕەواکانی خۆی و بەتاڵانبردنی سەرچاوەکانی ئێران و

ولآتانی ناوچەکە بەکاربهێنێ. کاتی ئەوە هاتبوو کە ڕێگایەك بۆ چارەسەری گرفتی عەشیرەتەکان بدۆزرێتەوە. پێویستی ئەنجامدانی ئەو کارە کاتێك هەست پێکرا، کە سمکۆش دوای چەند ساڵ بێ دەنگی لە کوردستانی باکوور، دەستی بەجووڵان کردو هاوکات لەگەڵ کوردەکانی باشوور لە کۆتایی بەهاری ساڵی (١٣٠٥ ک. ش) ١٩٢٦ز هەوڵی دا بەیارمەتی عەشیرەتەکانی بەگزادە و هەرکی شاری سەلماس داگیر بکات، بەڵام بەهۆی بەرگری سوپا ناچار بوو پاشەکشە بکات. هاوکات بوونی هەڵچوونی سمکۆو سەرپێچی عەشیرەتەکانی کوردستانی باشوور (کوردستانی ئەردەلان) بەمانای ئەوە نەبوو سەرۆکی عەشیرەتی شکاك توانیویەتی، یەکێتییەکی عەشیرەیی نوێ پێکبهێنێ، یان ئەوەی پەیوەندی یەك لە نێوان ئەو و کوردەکانی باشوور پێك هاتووە. ڤان برویەنسن لە وتاری "هۆزە کوردەکان و شۆڕشی سمکۆ" بانگەشەی ئەوە دەکا کە سمکۆ لە ساڵەکانی بەهێزی و پەرەسەندنی ڕاپەڕینەکەیدا "لە مەریوان و هەورامان کاریگەری و دەسترۆیی هەبووە تەنانەت هۆزەکانی ناوچەکانی باشووریش وەك لوڕستان ئامادەی پشتیوانی کردن لە ڕاپەڕینی ئەو بوونە".(٨)

هەر چەندە بەڵگەیەکی قایم و پتەو بۆ چەسپاندنی ئەو ئیدعایە لەدەستدا نییە و بەڵگەکان ئەوە ناسەلمێنن، بەڵام ئەگەر وای دابنێین کە ئەو شتە ڕاستە، ناتوانین بڵێین لە ساڵی ١٣٠٥ك ١٩٢٦ز وەها پەیوەندییەك هەبووەو لە بیرمان نەچێت ڕێبەری جووڵانەوەی کوردەکانی باشوور لەوکاتیدا (سالار ئەلدەولە) بووە نەك سمکۆ. حەسەن ئەرفەع کە لە سەرکوتکردنی کوردەکانی باشووردا بەشدار بووە بێ ئەوەی بەتەواوی ئاماژە بەرۆڵی بەریتانیا لەو ڕووداوەدا بکات، پەیوەندی سمکۆ لەگەڵ سەرۆکەکانی هەورامان و مەریوان ڕەت دەکاتەوەو ئیدعا دەکا "ئەو ڕووداوگەلە گرینگەی (ساڵی ١٣٠٥ ک.ش ١٩٢٦ز) لە کوردستانی باشووردا ڕوویدا، هیچ پەیوەندییەکی بە هەوڵەکانی سمکۆ لە ساڵی (١٩٢٦ز) لە ئازەربایجاندا نەداوە، چونکە کەسێك کە لە هەواڵەکانی ساڵانی پێشوودا بەچاکی ناسرا بوو، بەڵام ئامادە نەبوونی ئەو لە شانۆی ڕووداوەکاندا، هەر لە سەرەتای شەڕی یەکەمەوە، تا ڕادەیەك یادی ئەوی لە بیر بردبۆوە، جارێکی دیکە لە شانۆی ڕووداوەکاندا دەرکەوتەوە. ئەو پیاوەش (سالار ئەلدەولە)ی قاجار بوو، هاوپەیمانانی ئەو سەرۆکە کوردانە بوون کە بەهۆی ژن و ژنخوازییەکانەوە پەیوەندیان پەیدا کرد بوو."(٩)

ئاشکرایە سەرپێچی عەشیرەتە کوردەکان بەتەواوەتی بەفیتی بەریتانیا و بەهۆی یارمەتییەکانی وەزارەتی دەرەوەو وەزارەتی موستەعمەراتی ئەو وڵاتەوە دەستی پێکرد بوو، لە ئاکامیشدا هەر بەهۆی دەست و پەیوەندییەکانی ئەوانەوە کۆتایی پێهات. خاڵێکی جێگای سەرنج لەبارەی

سەرپێچی عەشیرەتەکانی کوردستانی باشوور ئەوەیە، کە ئەوانیش وەك سمکۆ بۆ پارێزگاری کردن لە ئۆتۆنۆمی نەریتی خۆیان لە چوارچێوەی پانتایی دەسترۆیی خۆیان هەوڵیان دەداو لەبنەڕەتدا هیچ هاندانێکی سیاسی یان ئامانج و ویستگەلێکی دیاریکراو کە پەیوەندی بەناسیۆنالیزمی کوردەوە هەبێ لە کارکەرو هەڵسوکەوتی ئەواندا بەرچاو نەدەکەوت: بە شێوەیەکی گشتی دەوڵەتی بەریتانیا بە سەرنجدان لە ویستی کوردەکان بوو کە ئەوانی بۆ دژایەتی کردن بە دژی دەوڵەتی ناوەندی هان دەدا.

لێرەوە کە هێشتا زەمینەیەکی گونجاو بۆ پەیدابوونی ناسیۆنالیزمی کوردی لە ئێراندا نەڕەخسابوو، رووداوگەلی بەوشێوەیە تەنیا دەبێ بدرێتە پاڵ پیلان و سیاسەتە گوماناوییەکانی بەریتانیاو بە پێچەوانەی بۆچوونی مێژوونووسی رووسی، ئا.س. ملیکۆف، ناتوانرێ جوولێنەری سەرەکی ئەم شێوە ڕاپەڕینانە بە بەرگری لە سەربەخۆیی کوردستان و هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی دابنێین، چونکە گەر بەڕاستی وەها جوولێنەرێك هەبووبێ، بێگومان دەبوایە خاوەن زەوییە گەورەکان، پیاوانی ئایینی و چینی ناوەندی شارنشین لەم هەنگاوانەدا بەشداریان کردبایە و ڕۆلێکیان نواندبایە، بەڵام دەبینین کەوای لێ نەهات و شۆڕشە کاتییەکانی لەم شێوەیە جیا لە ژیانی سیاسی کۆمەڵگای کوردی بوون و دیاردەگەلێکی تەواو عەشیرەیی و بەرتەسك و لە چوارچێوەی ناوچەیەکی دیاریکراودا مانەوە. ئا.س. ملیکۆف هەوڵی داوە، ڕۆڵی بەریتانیا لە کاروباری سیاسیی کوردەکانی باشوور بە شێوەیەکی لاوەکی نیشان بدات و هەر بۆیە مەسەلەکە بەوشێوەیە شرۆڤە و شی دەکاتەوە: "خەبات لە بەشە کوێستانییەکان، لەو نێوەشدا کوردستان دژوار بوو، لەوێ زۆربەی عەشیرەتەکان یەکیان گرتبوو، خەباتێك کە لە کۆتایی ساڵی (١٩٢١) وە لەگەڵ ئەوانە دەستی پێکرد بوو، بەسەرکەوتنی هەر جارە لایەنێك هەتا ساڵی (١٩٢٥) درێژەی کێشا. هۆی دژواری "مل پێکەچکردنی" کوردستان ئەوە بوو، کە کوردەکان لە کاتی شەڕکردن لە دژی سوپای دەوڵەتی ناوەندی، هەروەها بەرگریان لە سەربەخۆیی میللی خۆشیان دەکرد... لە ساڵی (١٩٢١) لە کوردستاندا، دووبارە ڕاپەڕین دەستی پێکردەوە، ناسیۆنالیستەکان کە لە عیراقو تورکیەوە هاتبوون و هەروەها شازادە (سالار ئەلدەوڵە)، کەسایەتی کۆنەپەرستی بەناوبانگ، سەرکردایەتی ئەو شۆڕشەیان دەکرد. ئیمپریالیزمەکانی بەریتانیا کە هەوڵیان دەدا جیاوگی زیاتر لە ڕەزا شا وەربگرن هەوڵی بەرفراوانی ئەو شۆڕشەیان دەدا، هەر دوای ئەوەی کە پێکهاتن لە نێوان رێبەرانی شۆڕشەکە و دەوڵەت ئەنجام درا، بەریتانیا دەستی لە یارمەتیدانی ئەو کوردانە هەڵگرت کە پێشتر دەستیان بەخەبات کرد بوو"[١٠]

بەپێچەوانەی بانگەشەی ملیکۆف، شۆڕشی کوردەکان تەنیا بەپشت بەستن بەچەك و هەروەها لە پاش ڕێکەوتنامەی نێوان ئێران و بەریتانیا کۆتایی پێهات و وردە وردە بابەتگەلی تایبەت بەگەڕاندنەوە قەرزە هەڵپەسێراوەکانی ئێران بۆ بەریتانیا، لە ماوەی شەڕی یەکەم و دانپێنان بە عێراق و مەسەلەی تایبەت بەکاروباری خورەمشار (محمره)و شێخ خەزعەل کۆتایی پێهات و بەرژەوەندی بەریتانیا لەو بارەیەوە بە تەواوەتی دابینکرا.[11] لە ساڵی (١٣٠٨ ک. ش) ١٩٢٩ز دا مەحموود خانی دزڵی سەرلەنوێ شەڕی دەوڵەتی ڕاگەیاند، بەڵام ئەو جارەیان سەرپێچی ئەو، هیچ پەیوەندی بە دەوڵەتە بیانییەکان نەبوو و تەنیا بەرگرییەك بوو لەبەرانبەر بەرنامەکانی داماڵینی چەك و جێگیرکردنی پێگە سەربازی و ئیدارییەکانی دەوڵەتی ناوەندی لە ناوچەکانی هەوراماندا. حەسەن ئەرفەع کە لەم تێکهەڵچوونانەدا بەشداری کردووە، بەم شێوەیە باس لە هۆیەکانی هاندان و ویستی سەرەکی خانی هەورامان دەکا: "هێزی (٢٥٠٠) کەسی دەوڵەتی ناوەندی لە ناوچە بەرزە کوێستانییەکان دەستی بەپێشڕەوی کردو پاش چەند تێکهەڵچوونێکی لاوەکی، لە ئاکامدا توانی دەست بەسەر مەریوان دا بگرێت... جیا لەتێکهەڵچوونێکی کورت کە لە نزیکی زراب ڕوویداو منیش تێیدا بەشداربووم، پێشڕەوی ئێمە کەم تا زۆر بێ تێکهەڵچوون و خوێن ڕێژی بووە، ئەم شەڕانە لەگەڵ ئەو پێکدادانەی لەگەڵ سمکۆ و کوردەکانی ئازەربایجان رووی دابوو یان لەگەڵ ڕاپەڕینی ساڵانی (١٩٢٥، ١٩٣٠) یان (١٩٣٧)، هیچ وێکچوونێکی نەبوو، چونکە لێرەدا کوردەکان بۆ ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆیی شەڕیان نەدەکرد، بەڵکو ئامانجیان پارێزگاری کردن لە دەسەڵات و دەستڕۆیی ناوخۆیی خۆیان بوو"[12] بەو شێوەیە هەستیاربوونی هەلکەوت و پێگەی سیاسی ناوچە سنوورییەکانی کوردستان، ئاسانی سوود وەرگرتنی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا لە سەرۆك عەشیرەتەکان، هەروەك ئامێرێك لە دژی دەوڵەتی ناوەندی ئێران، ڕاوەستان و بەرگریکردنی عەشیرەتەکان لەبەرانبەر جێگیرکردنی ئیدارەو ناوەندە سەربازییەکان و هەروەها زەروورەتی چەك داماڵینی جەنگاوەرانی کورد، سەرنجی حکوومەتی پەهلەوی بۆ ئەم ڕاستییە ڕاکێشا، کە ئەو ناوچە زیان هەڵگرە، ناوەندێکی هەمیشەیی و ماتەوزە (بالقوە)ی قەیرانە و دەبێ هەرچی زووتر ئەوە لە ناو بچێت و پێش بەهۆکارگەلی قەیران بگرێت. بێگومان گەشەکردنی ناسیۆنالیزمی کورد لە تورکیە و عێراقیش، پەرەیان بەم نیگەرانیانە دەداو سێ شۆڕشی گەورەی کوردەکانی تورکیە، پەیدابوونی ڕێکخراوی خۆیبوون و ڕاپەڕینی شێخ مەحموودی بەرزنجی لەوانە بوو کوردەکان بخاتە ژێر کاریگەری خۆی. حکوومەتی ڕەزا شا بۆ چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە، چەند ڕێگەچارەو تەگبیرێکی کرد کە گرینگترینیان ئەوانەن.

١- پێشگرتن لە تێپەڕبوون و هاتووچۆی عەشیرەتە کوردەکانی ئێرانی و نائێرانی هەردوو دیوی سنوور.

٢- ناردنی یەکەکانی گەشت و گەڕان بۆ ناوچە سنوورییەکان، دانانی بنکەگەلێك بۆ هێزەکانی سوپا لە شارە کوردنشینەکان، جێگیرکردنی پاسگاو شوێنی ژاندەرمەکان یان هێزی ئاسایش (ئەمنیە) لە دەوروبەری ڕێگا سەرەکییەکان.

٣- چەك داماڵینی عەشیرەتەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان.

٤- بەزۆر نیشتەجێکردنی عەشیرەتەکان و دوورخستنەوەی ئەو تایفانەی لەبەرانبەر ئەو بەرنامانەدا بەرگریان دەکرد. پێویستی بەپراکتیك کردنی ئەو زەروورەتانە کە لە ڕوانگەی دابینکردنی ئاسایشی میللی گرینگی حاشا هەڵنەگری هەبوو، بووە هۆی ئەوەی یەکەمین نیشانەکانی ئامادەبوونی حکوومەتی ناوەندی لەکوردستاندا، بەهاتنی هێزە سەربازییەکان و هەروەها نەمانی بوونیادە نەریتیەکانی دەسەڵات واتا پەیدا بکات و خەڵکی کورد لە سەرەتاوە ڕووبەڕووی سیاسەتی مستی ئاسنینی ڕەزا شا بوونەوە.

لەدوای ئۆپەراسیۆنی سەرکەوتوانەی سوپای شاهەنشاهی، ئیدارە دەوڵەتیەکان وردە وردە لە کوردستاندا، دامەزران و یاسای سەربازی بەزۆری هاتە قۆناغی جێبەجێکردن و پەیوەندی نزیکی کاربەدەستانی ڕژێمی پەهلەوی لەگەڵ خەڵکی کورد دەستی پێکرد. خاڵی گرینگ لێرەدایە هەموو خەڵکی کورد لە سەرەتادا، دژی ئەم گۆڕانکارییانە نەبوون، بەڵام شێوەی ناڕێکیو بە هەڵەی جێبەجێ کردنی ئەوان و توندوتیژی لە ڕادەبەدەرو شێوەی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری نامرۆڤانەی بەڕێوەبەرانی جێبەجێکەری ئەم بەرنامانە بوو کە بەدرێژایی حکوومەتی ڕەزا شا، شەپۆلێك نەفرەت و بێزاری لەبەرانبەر دەوڵەتی ناوەندی لە نێوان کوردەکاندا دروستکرد، ئەگینا ئەوان هیچ جۆرە تاڕەزاییەتییەکیان لەگەڵ دەقی بەرنامەکاندا نەبوو.

# چەك كردنی عەشیرەتەكان

ئێران لە سەردەمی قاجاردا تەشكیلاتێكی ڕێكوپێكی سەربازی نەبوو هەروەها سوپایەكی بەدیسپلین و كلاسیكی بەپێوانەكانی دنیای ئەو كاتی لەدەستدا نەبوو، زۆربەی كات خێڵە چەكدارەكان لەكاتی شەڕدا ئەم كەموكورتییەیان پڕ دەكردەوە. بوونی خێڵ و عەشیرەتەكان لە ڕوانگەی دەوڵەتی قاجاردا، گرنگییەكی زۆری هەبوو، بەتایبەتی ئەو عەشیرەتانەی لە ناوچە سنوورییەكاندا نیشتەجێ بوون، لەبەر ئەو ڕۆڵەی كە لە پاراستنی سنووری وڵات دەیاننواند، زیاتر جێگای سەرنج بوون. ڕۆڵی خێڵەكان، بەتایبەتی لە جەریانی شۆڕشی مەشروتییەت، شەڕە ناوخۆییەكانی سەرچاوە گرتوو لەو (شۆڕشە)، و شەڕی یەكەمی جیهانی و ساڵەكانی بێسەروبەری سیاسی و كۆمەڵایەتی لە ڕابردوو زیاتر دیاربوو، پانتایی بایەخی سیاسی ئەم بەشە لە دانیشتوانی ئێران گەیشتە ڕادەیەك كە سەرۆكی عەشیرەتە كوردی، بەختیاری، قشقایی و عەرەبەكان لە ناوچەكانی باكووری ڕۆژئاواو باشووری وڵات كەوتنە سەنتەری بزووتنەوە جیاخوازەكان. هەندێك لەوان وەكو سمكۆ، شێخ خەزعەل و سەرانی بەختیاری پەیوەندی پتەوییان لەگەڵ دەسەڵاتی بێگانەكان دامەزراند، بە شێوەیەك كە پێگە و دەسەڵاتخوازی دەوڵەتی ناوەندی لەژێر كاریگەری ڕوو لە زیادی دەسەڵاتی خێڵەكان بەتوندی بەرەو كزی ڕۆیشت.

دانەری (مێژووی پەیوەندی ئێران و ئینگلیز) لە سەردەمی ڕەزا شادا لە بارەی ژیانی (دەروونخوازانەی) عەشیرەتەكان و ئەو زیانەی كە ئەم حاڵەتە بەیەكپارچەیی میللی ئێرانی دەگەیاند و هەروەها سوودوەرگرتنی هێزە بێگانەكان لە خودموختاری نەریتی عەشیرەتەكان دەنووسێت: "هەتا ساڵەكانی دەیەی (١٩٣٠) ئەو ناوچانەی (توركومەن سەحرا، كوردستان، لورستان و فارس) بەدژواری نیشانەكانی بوونی ناسیۆنالیزمیان پێك دەهێنا، هەروەها یەكپارچەیی ئێرانیش تا ڕادەیەكی زۆر تا ئەو كات واتایەكی سیاسی هەبوو، بەڵام وردە وردە دەسەڵاتی خێڵەكان زیاد بوو. كۆنترۆڵ كردنیان جاربەجار دژوارتر دەبوو، گرینگترین هۆكارێك كە كاریگەری هەبوو لەسەر پەیوەندی دەرەوەی ئێران خودموختاری سەرۆك خێڵەكان بووە كە ئەوانی بەنیسبەت دەستڕۆیی بێگانەكان ئامادە دەكرد. هەندێك لە ناوچە خێڵكییەكانی وەك كوردستان و (توركومەن سەحرا)و بلوچستان بوونە ناوەندی پیلان دانانی سیاسی‌و سیخوڕی هەواڵگری بەریتانیا، ڕووسیە، هەندێك جاریش ئەڵمانیا". [1]

لەم نێوانەدا کوردستان، بەدەربڕینێکی دیکە ناوچە کوردنیشینەکانی ئازەربایجان، بەهۆی هەلومەرجی (سەرچاوە گرتوو) لە شۆڕشی مەشروتە، شەڕە ناوخۆییەکان، هاتنی سوپای ڕووسیاو سەرپێچی سمکۆ خاوەن هەلکەوتنکی تایبەت بوو. بێشك دەستەبەرکردنی ئاسایش یەکێك لە سەرەکترین کارەکانی حکوومەتی پەهلەوی پێکدەهێنا.

یەکەمین کاری ڕەزاشا بۆ تێکدانی دەسەڵاتە لۆکاڵیەکان دەبوایە بە چەککردنی عەشیرەتەکان دەستی پێ کردبایە. کارێك کە پێویستی ئەنجامدانی زیاتر لە هەر کاتێکی تر هەست پێ دەکراو ئامانجیش لەناوبردنی توانای شەڕکردنی سەرۆکە خودموختارەکان و هەزاران شەڕکەری ژێر دەسەڵاتیان، دابینکردنی کەشوهەوایەکی هێمن بۆ پێشکەوتنی بازرگانی و دەستەبەرکردنی ئاسایشی ڕێگا بازرگانییەکانو جێبەجێکردنی بەرنامە و گۆڕانکارییەکانی جێی سەرنجی ڕژێمی نوێ و لابردنی بەربەست بوو لەسەر ڕێی جێگیرکردنی دامەزراوە ئیداری و نیزامییەکان. لێرەدا خاڵێك جێگای سەرنجە کە پشت گوێخستنی ئەو خاڵە ناتەواوی لە داوەری کردندا پێك دێنی سەبارەت بەڕوانگەی کوردەکان بەرانبەر کارەکانی ڕژێمی پەهلەوی، ئەویش ئەوەیە کە هەموو کوردەکان بەبێ جیاکردنەوە (هیچ خێڵەکییەك لەدژی چەککردنی عەشیرەتەکان نەبوون، تەنانەت وەرزێرە نیشتەجێیەکان، شارنشینەکان و بەتایبەت بازرگانەکان و هەڵبەت خانەدانو زەویدارە شارنشینەکان لەگەڵ ئەم کارەدا بوون.

بۆ نموونە (یەحیا سادق وەزیری) لە بارەی هەڵسوکەوتی خەڵکی سنە لە سیاسەتی چەککردنی عەشیرەتەکان بەم شێوەیە بیروڕای خۆی دەردەبڕێ "بەرنامەی چەککردنی لەگەڵ پێشوازی خەڵکی سنە بەتایبەت، بازاڕی و بازرگانەکان ڕووبەڕووبووە، چونکە پێش ئەوە خەڵك بوو بوونە قوربانی دەستدرێژیو تاڵانکاری عەشیرەتەکانی مەندومی، گوڵباغی، جاف، هۆنی... هتد. جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیە موژدەی گەشەی ئابووری و چەسپاندنی ئاسایشی لە کاروباری کۆمەڵایەتیو ئابووری دەدا. هەر لەبەر ئەمە بوو کە خەڵك ڕووی خۆشیان بەم بەرنامەیە نیشان دا"[(٢)]

(شێخ محەممەدی مەردۆخ)یش پاش باسکردنی تەواوی بارودۆخی ویلایەتی کوردستان لە ساڵەکانی دوای شەڕی جیهانی یەکەم، باس لە نەبوونی ئاسایش بەشێوەیەکی بەربلاو و ڕێگری و گوشاری لەرادە بەدەری خێڵ و عەشیرەتەکان لەسەر رەعیەتەکان و شارنشینەکان دەکات و دەنووسێت: "کۆتایی ئەم قۆناغە کە ئەو بەسەردەمی "بێسەروبەری عەشایری" ناوی دەبا بۆتە

هۆی ڕازیبوونی خەڵکی کوردو تەنیا عەشیرەتەکانی لە جێبەجێکردنی یاسای چەك کردن خەمناك و ناڕازی بوون"[٣]

دانەری کتێبی (لە بارەی خەباتی کوردستان)یش لەگەڵ ئەو ڕایەیە کە لەگەڵ بە دەسەڵات گەیشتنی ڕەزاخان بنەماڵە دەستڕۆییەکانی شارنشین لە سنە و ناوچەگەلی تر یەکسەر چوونە پاڵ ئەو و بوونە هاوپەیمانی دەوڵەت. کە دەتوانین لەوانە ئاماژەبە (ئەسەف ئەعزەم)و (موعتەمد وەزیری)و هەندێکی تر بکەین. خاڵی گرینگ لێرەدا ئەوەیە کە کۆمەڵە کەسایەتییەکی وەکو (ئەسەف ئەعزەم) پەیمانیان بەستبوو کە سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەی مەریوان و هەورامان هان بدەن و تەشویقیان بکەن بۆ دانەوەی چەکەکانیان بەدەوڵەت)[٤]

هەر بۆیە دەبینین کە خاوەن زەوییە شارنشینەکان، بازرگان و بازاڕییەکان لەگەڵ یاسای چەککردن تەواو هاوڕا بوون، پێشوازیان لێ دەکرد. بەڵام عەشیرەتەکان و خێڵەکان بەتوندی لەبەرانبەر ئەم یاسایەدا وەستان و هەر ئەم بەرگرییە بووە هۆی هەرچی زیاتر دەست تێوەردانی دەوڵەتی لە کاروباری ناوچەکە.

خێڵە کوردییەکان وەکو خێڵەکانی تری ئێران ژیانی لە ناو چوارچێوەی عەشیرەتییان بەبێ چەك بەدژوار زانیوەو بۆ چەسپاندنی یەکسانی لەگەڵ هاوسێ چەکدارەکانی خۆیان و سوودوەرگرتن لە ئیمکانیاتی ژیان لە کۆمەڵگایەك بەپێوانەگەلی عەشیرەتی چەکیان پێویست بوو.

ئیبراهیم خواجە نووری دژکردەوەی مەنفی عەشیرەتەکانی لەبەرانبەر یاسای چەککردن دەرهاویشتەی نەبوونی یاسا و ئاسایش دەزانێ و باوەڕی وایە کە لەو سەردەمەدا چەك پشت و پەنایەك بوو کە خێڵێکی لەبەرانبەر ئەگەرە ترسناکەکاندا دەپاراست. ئەو هەستیاری خێڵەکانی لەبەرانبەر ئەم مەسەلەیە بەم شێوە باس کردووە: "بۆ ئەوەی سەرنج بدەین بەگرینگی ئەم کارە دەبێ بەدروستی لە خەیاڵی خۆماندا وێنای بکەین و بزانین کە تفەنگ لە ڕوانگەی سوارێکی خێڵەوە یانی چی؟ تفەنگ واتە هێز، تفەنگ واتە بەدەست هێنانی دەسکەوت، واتە بەرگری لەناموس و ماڵ، واتە نەڕۆیشتنە ژێر باڵی دەوڵەت، واتە هەموو شتێك، واتە خودا ..."[٥] خێڵەکان هیچ شێوەیەك لە ژیانیان گونجاوتر لە شێوەی ژیانی ئەو ڕۆژەی خۆیان دانەدەنا، چونکە لەو سەردەمانەدا یاساو ئیرادەی دەوڵەت بۆ بەڕێوەبەری کۆمەڵگا نەبوو و پەیوەندی مرۆڤەکان و گروپە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنەمای عورف و نەریتەکان ڕێك دەخرا، بوونی چەك خۆی لە خۆیدا بە شێوەیەك لە جیاوگ دەژمێردرا. جیا لەم هاندەرە، هۆکاری دیکە هەبوون کە دەبوونە ڕێگر لەبەردەم عەشیرەکان بۆ

دانەوەی چەکەکانیان بەسوپا، ئەم هۆکاری دووەمە هەڵپەرسی سوپاییەکان و ئەفسەرانی گەندەڵ و تەماحکاری ئەوان بوو. ئەفسەرانی سوپا سزای پێشبینی کراویان بۆ سەرپێچی کەرانی نەدانەوەی چەك کردبوو بە بیانوویەك، بێجگە لە کۆکردنەوەی سامان لەم ڕێگەیەوە بەدوای بەدەست هێنانی پلەی بەرزتری عەسکەریش بوون. کردەوەی لەم جۆرە ڕەوتی کۆکردنەوەی چەکی خێڵەکانی لەگەڵ وەستان و بەرەنگاری بەرەو ڕوو کردو بووە هۆی تێکهەڵچوونی خوێناوی لە نێوان سوپاو کوردەکان. بەڵگەخوازی یەکێك لە خانەکانی هەورامان بۆ پاساو هێنانەوەو لەخۆبواردن لە دانەوەی چەك بەدەوڵەت. پەسند کردنی ئەم بانگەشەیەی سەرەوەیە ئەو دەڵێت لە کاتێکدا کە دوژمن و رکابەرە ناوچەییەکانی چەك نەکراون، ئەو چۆن دەتوانی چەکەکانی عەشیرەتەکەی بداتەوەو جیا لەوەش زیاتر ئەفسەران و لێپرسراوانی دەوڵەت تەنانەت پاش کۆکردنەوەی چەکەکانیش سەرۆکەکان دەنێرنە گرتووخانە و تا بەراگەیاندنی گرتنی ئەوان وەك ڕەگەزگەلی دەستدرێژیکەرو سەرپێچیکەر پلەی بەرزو گونجاوتر لە دەوڵەت وەرگرن، بەوهۆیەوە ئەو ترسی زۆری لە نێردراوانی دەوڵەت هەیە و ئامادە نییە چەکەکانی عەشیرەتەکەی بداتەوە بەدەوڵەت بە بێ بەدەست هێنانی گرێنتی کەسێکی دەست ڕۆیشتوو.[٦]

(حەمیدی موئمن)یش ئاماژە بەبێ متمانەیی سەرانی دزلێ و بەڵێنەکانی ئەفسەرانی سوپاو بەڕێوەبەرانی دەوڵەت دەکات، گوایە لە خەمی ئاسایشی عەشیرەتەکانی هەورامان دان و پاش دانەوەی چەکەکانیان دەنووسێت: تەنانەت هەندێك لە سەرۆکەکانیان دوای چەك کردنیان لە ماوەی ساڵەکانی (١٣٠٨ تا ١٣١٠) ١٩٢٩-١٩٣١ز بەدیل گرت.[٧]

(یەحیا سادق وەزیریش) باوەڕی وایە ئەفسەرانی سوپای ڕەزاشا پاش چەککردنی گوڵباغی، مەندومی، هۆنی و مەریوانی هەموو ماڵەکانیانی بەتاڵان بردو ئەندامانی عەشیرەتەکانیان بۆ ناوچەکانی دەوروبەری (قوم)و (سمنان) ڕاگواست و بەزۆر نیشتەجێیان کردن.[٨] ئاکام و دەرەنجامی ئەم کردارە هەڵەیە جگە لە هێنانەکایەی نەفرەت و بێزاری لە نێوان هەموو عەشیرەکانی ئێران بەرانبەر بە ڕیژێمی ڕەزاشا، نەیدەتوانی شتێکی دیکە بێت.

(نەعمەتوڵلا قازی) باس لە بێ دەسەڵاتی سەرۆك عەشیرەتەکان لە ئاست ڕژێمی تازە دەکاتو دەنووسێت: "پاش چەککردن، عەشیرەتەکان بێدەسەڵات و بێ توانا بوون، چونکە تەواوی پاڵپشتی ئەوان بەو چەکانەیان بوو کە لە دەستیاندابوو، لەناکاودا خۆیان بێ پشتیوان و یارو یاوەر هەست پێ دەکردو بێ ڕێزو بێ بایەخ و قوڕبەسەر بوون. لە بەرانبەر هێزە سوپاییەکان بتەوێ و نەتەوێت

سەریان نەوی کرد لەوەها حاڵێکدا زۆر لەسوپاییەکان کە خاوەنی هیچ هەستێکی ئەرکناسی و ویژدانی کار بەوشێوەیە کە شایستەی بن نەبوون ، یان باوەڕیان بە (دەسەڵاتی ویژدان) نەبوو، هەرکە پیاوە بەهێزەکانی پێشتریان لە بەرانبەر خۆیان بە بێ دەستەڵاتی بینی سەریان نەوی کردوو، زوڵم و زۆریان دەست پێکردو دەستیان کرد بەزۆر باج وەرگرتن و بەبڕینی ماڵ و دارایی ئەوانەوە خەریك بوون. بەڵام بەو تاڵانیانە قەناعەتیان نەکردوو شێوەیەکیان گرتە پێش کە بووە هۆی داخ لەدڵی و نەفرەتی عەشیرەتەکانو غرووری پیاوە بەجەرگەکانی ئێڵ و کوڕە خانەدانەکانیان بریندار کرد کە شەو و ڕۆژ لە بیرۆکەی تۆڵەدا بوونو بۆ گەیشتن بەکاتی گونجاو رۆژیان دەژمارد"[9]

لەگەڵ ئەوەی هەڵسوکەوتی بەرپرسانی سوپای دەوڵەتی شا لەگەڵ خێڵەکانی ئێران لە هەموو ناوچەکان وەك یەك بوو، بۆ نموونە لە بارەی کوردەکانەوە توندی زیاتر لەچاو قەشقایی، بەختیاری یا تورکمەنەکان بەکارنەدەبراو هەموو نەتەوەکان بە شێوەیەکی یەکسان بووبوونە قوربانی بێ بەرپرسیاریەتی زێدەخوازی و توندوتیژی دەسەڵاتدارانی ڕەزاشا. بەڵام دەبینین کە کاریگەری و دژکردەوەکانی ئەم گوشارانە لە نێوان هەموو نەتەوە ئێرانییەکان، وەك یەك نەبوون و بەلایەنی کەمەوە لە بارەی کوردەکانەوە دەرەنجامی زۆر ماڵوێرانکەری بەدوادا هات کە بەکورتی بریتی بوو لە پەیدابوونی بێزاری و نەفرەت و ڕق و قین لە نێوان کوردەکان بەنیسبەت فارسەکان و بتەوێ و نەتەوێ زوڵمی ڕەزاشا لە نێوان کوردەکان بە شێوەی زوڵمی فارس بەدژی کورد بەرجەستە دەبوو.

پاش جێبەجێکردنی یاسای چەککردنی ڕادەی دەسەڵات و دەست بەسەراگرتنی نیزامییەکانی سوپای شاهەنشایی لە ناوچە کوردنشینەکاندا زیاد بوو، و بەهاوڕیزو ئیعتباری دەسەڵاتدارانی ناوچەیی زۆر کەم بوو، ناڕەزایەتی دەربڕین بەدژی یاسای چەککردن و شێوەی جێبەجێکردنی، یەکێك لە هۆکارە گرینگەکانی ناڕەزایی عەشیرەتەکان بوو لە ڕژێمی پەهلەویو زۆر لە سەرۆك عەشیرەتەکانی نزیك سەر سنوور وەك محەممەد رەشید خان قادر خان زادە، جەعفەر سوڵتانی هۆنی، مەحموود خانی دزڵی و محەممەد خانی کانی سانان پاش بەرگریکردن لەبەرانبەر ئەم خواستانەی دەوڵەت، بوونە پەناهەندەی عێراقو لەمەش زیاتر کە زەوییەکانیان بوونە مولکی دەوڵەت و خۆشیان بوونە خزمەتکاری ئیمپریالیزمی ئینگلیزو مانگانە لە کۆمپانیای نەوتی ئینگلیز و عێراق مووچەیان وەردەگرت.

نەشکانەوەی سەرنجی ئەم دەستە لە ڕێبەرانی کورد بە لای ناسیۆنالیزم نەتەوەخوازی بووە هۆی ئەوەی بەشێك لە سەرۆك عەشیرەتەکان ببنە خزمەتکاری ئیمپریالیزمی ئینگلیز و کۆمەڵگای کوردی هەرچی زیاتر لە دەوڵەتی ئێران دوور بکەوێتەوە.

## جێنشین کردنی زۆرەملێی عەشیرەتەکان یا تەختەقاپوو

زاراوەی (تختەقاپو) بەواتای لابردنی ڕەشماڵ و کەڵك وەرگرتن لە نشینگەیەك کە دەرگای لە دار دروست کراوی هەبێ و پەیوەستە بەجێنشین کردنی عەشیرەتە کۆچەرەکان لەگوندەکاندا.

بەدڵنیاییەوە پاڵنەری ڕژێمی پەهلەوی لەجێنشین کردن و گواستنەوەی عەشیرەت و خێڵەکانی ئێران هۆکاری ئابووری نەبووەو بەبەشێك لەبەرنامەیەکی ڕێکخراو و گشتگیری (جامع) چاکسازی ئابووری و کۆمەڵایەتی نەدەژمێرا. چونکە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ڕەزا شادا بەشی زۆری داهاتی وڵات سەرفی ئامادەکردنی سوپای شاهەنشایی و جێگیرکردنی دامودەزگای بەڕێوەبەری دەکراو پرۆژەیەکی ڕێکخراو بۆ گۆڕینی بارودۆخی ژیانی سەخت و پڕ ڕەنجی وەرزێرانی ئێرانی لە ئارادا نەبوو، هەر بۆیە ئامانجی کۆتایی و سەرەکی ڕەزاشا لە جێنشینکردنی زۆرەملێی عەشیرەتەکان لە ناوبردنی ناوەندە ناوچەیی و نەریتییەکانی دەسەڵات بوو، کە بەدرێژایی سەدەکانی ڕابردوو بە بونیادکرابوون و لەڕوانگەی ڕژێمی قاجارەوە جۆرێك شەرعییەتی پەیدا کردبوو.

(حەبیبوڵڵا موختاری) هۆکاری جێبەجێکردنی یاسای (نیشتەجێکردنی بەزۆرەملێ)ی بەتەواوی بەکارێکی سیاسی زانیوەو وەهای لێکدەداتەوە :"لە کارەکانی تری دەوڵەت بۆ پێشگیری لە هەر جۆرە دەسەڵاتخوازی و دەسەڵاتی سەرۆك عەشیرەتەکان لە ناوچە نیشتەجێیەکان خۆیان، یاسایەك لە ئەنجوومەنی شورای میللی دەرچوو کە ئیجازەی پێدرا مولکی ئەوان هەلسەنگێنرێ، پاشان مولکییەتیی دەوڵەتیی دەربێنن‌و لە بەرانبەردا لەناوچەکانی تردا مولکیان بەهەمان نرخ‌و بەها دەدرێتێ، کەلەم ڕێگەیەوە دەسەڵاتی ئەوان لەم ناوچەیەدا کەم دەبێتەوەو وەکو مرۆڤگەلی ئاسایی لە شوێنەکانی تری وڵاتدا خەریکی کشتوکاڵ بن و نەتوانن هەوڵی ئاڵۆزی و شۆڕش‌و خوێنڕێژی لە ناوچەکەدا بەدەست بهێنن و لەم ڕێگەیەوە دەستڕۆیی و کاریگەریان لە ناوچەکاندا کەم بۆوە.[١٠]

لە بەرانبەردا، (ئەمین نبانی) مەسەلەی چەسپاندنی ئاسایش دێنێتە پێش کە ئەویش بەنۆبەی خۆی پاڵنەری سیاسی هەیە، دەنووسێت: "بەهۆی بێتوانایی دەوڵەتی ناوەندی لەدەستبەسەراگرتنی ڕاپەڕینی خێڵەکان، هیچ ئاسایشی ناوخۆی لە پاش شەڕی جیهانی یەکەم لە ئێراندا بوونی نەبوو، ڕەزا شا لە پێش هەر شتێکدا بە ئەرکی خۆی دەزانێ کۆتایی بە

بێسەروبەری عەشیرەتەکان بهێنێ، ڕێگری، تۆقاندن و تالانکاری دەستی بەسەر شارەکاندا گرتبوو. ئەو بەتێکشکاندنی بەرگری چەکدارانەی عەشیرەتەکان لەگەڵ وەزیفەیەکی گرانتر بەرەو ڕوو بوو کە هێمن کردنەوەو نیشتەجێ کردنیان بوو". [١١]

تا ئێرە ئەو هۆیانەی کە ئەم لێکۆڵەرەوانە بۆ لێکدانەوەی هۆیەکانی جێنشینکردنی خێڵەکان خستیانە ڕوو، بۆ لە ناوبردنی ناوەندە نەریتییەکانی دەسەڵات، هەوڵدان بۆ گەڕانەوەی ناوەندگەرایی بوو لە ناوچە دوورەکان و دەستەبەرکردنی ئاسایش و ئارامی کورت دەکرایەوە کە هەموویان ئامانجگەلی ناوخۆیی بوونو لە بەرژەوەندییە ناوخۆییەکانی دەوڵەت سەرچاوەیان دەگرت، بەڵام لە بارەی کوردستان و ئەو عەشیرەتانەی کە تێیدا نیشتەجێن، ئەم سیاسەتە بە شێوەیەك جێبەجێ دەکرا کە ببێتە هۆی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئێران لەبەرانبەر دراوسێیەکانی.

ناکۆکی لەسەر سنوور لەگەڵ تورکیە و عێراق، سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کوردی لەم وڵاتانەو ئاڵۆزی و پەرێشانییەی دەیتوانی کاریگەری هەبێت لەسەر خێڵە نیشتەجێیەکان بەدرێژایی سنوورەکان کە بووە هۆی ئەوەی کە هەڵسوکەوتی دەوڵەت لەگەڵ کوردەکان بەنیسبەت عەشیرەتەکانی دیکەی ئێران هەستیاری و تایبەتمەندی گرینگتری دەکرد. جیا لە دراوسێکان و حیزبە کوردییەکان، گرفتی سمکۆش بە چارەسەرنەکراوی مابووەوەو هێشتا لەژێر چەتری عەشیرەتێکی بەهێزی وەك عەشیرەتی پشدەری مابووە، هەموو کاتێك ئیمکانی هەبوو لە گۆشەیەك لە ناوچەکە ئاژاوە ساز بکات. لەم ڕووەوە دەوڵەت لە یەکەمین هەنگاودا، داوای لە پشدەرییەکانی کرد لەبەرانبەر کەڵك وەرگرتنی مەڕوماڵاتەکەیان لە لەوەڕگاکانی ناو خاکی ئێران باجی زیاتر بدەنو هەروەها قەرزەکانی ڕابردووشیان بدەنەوە، عەشیرەتی پشدەری و لقی سەرەکی ئەو، واتە تایفەی (نورەدینی) بەگرنگترین هاوپەیمانی دەرەوەی سنووری سمکۆ دادەنران و بەشێکی زۆری سەرۆکەکانیان لە ناو خاکی ئێراندا لە دەوروبەری سەردەشتو ڕەبەت و ئاڵان خاوەنی زەویوزاری کشتوکاڵیو لەوەڕگای فراوان بوون. ئەم پێگەیە لە کۆتاییەکانی سەدەی (١٩) و لە دوای شەڕگەلێکی توند لەگەڵ عەشیرەتی مەنگوڕەوە دەستیان کەوتبوو، بنج و بناوانی لە بەرنامەی فراوانخوازیانەی دەوڵەتی عوسمانیدا بۆ دەستگرتن بەسەر ڕۆژئاواو باشووری ئازەربایجاندا هەبوو. لە ساڵی (١٣٠٣)ك ١٩٢٤ز ئێران سنووری بەڕووی پشدەرییەکاندا داخست و ئاگاداری پێدان کە لەمەودوا بۆ کەڵك وەرگرتن لە لەوەڕگاکانی ناوچەکە دەبێت ئەم مەرجانە قەبووڵ بکەن:

١- هەر کەسێکی پشدەری لیرەیەکی عوسمانی بەنیشانەی زەویانە (عەوارز) بدات بەدەوڵەتی ئێران.

٢- چەکەکانی خۆیان تەسلیم بەدەوڵەتی ئێران بکەن.

٣- باجی دە ساڵی ڕابردوو بدەنەوە بەدەوڵەت.

پشدەرییەکان لەبەرانبەر ئەم مەرجانەدا وەڵامیان دایەوە کە ئامادەن بۆ هەر ڕەشماڵێك (نەك سەرانە) لیرەیەکی عوسمانی بدەن و هەرگیز بەچەکەوە نەجووڵێن و لە بارەی ڕابردووشەوە هیچ نادەنەوە، هەر بۆیە لەو کاتەوە شەڕ دەستی پێکرد.[١٢]

خێڵە پشدەرییەکان پاش تێکهەڵچوونێکی توند لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەت کە پێکهاتبوو لە قزاقەکان و عەشیرەتە کوردییەکانی ئێران وەکو مامەشییەکان -دیبۆکرییەکان- مەنگوڕەکان...هتد کە دژ بەفراوان بوونی زەوییەکان و پانتاییی ئەو عەشیرەتانەی نیشتەجێی عێراق لە کوردستانی ئێراندابوون، دەرکران بۆ وڵاتی سەرەکییان لەودیوی سنوورەوە.

پاشان لە ساڵی (١٣٠٥) ١٩٢٦ز خاوەن زەوی و خانەدانەکانی پشدەری بانگهێشت کران بۆ شاری سنووری سەردەشت تالە بابەتی خاوەندارییەتیان بکۆڵدرێتەوە، بەڵام ئەفسەرانی سوپا هەموویان گرتن و پاش دانی پارەیەکی زۆر بەسوپاییە بڵندپایەکان ئازاد کران. لە ساڵی (١٠٣٦) ١٩٢٧ز یەکەیەکی سوپایی لە نزیکی سەردەشت کەوتە بەر هێرشی پشدەرییەکان و لە ناوچوون، لە ئاکامدا شار کەوتە دەستی تایفەی پشدەرییەکان و بنکەی سەربازی ئەوێ بۆ ماوەی (٤٥) ڕۆژ گەمارۆ درا. لە ئاکامدا بەو شێوەیە کە(عەبدوڵڵا پشدەری) نووسیویەتی کۆنسولی ئێران لە سلێمانی پاش گفتوگۆ لەگەڵ (شێخ مەحموود بەرزنجی ) بەناوبژیوانی ئەو پشدەرییەکانی ناچار بە بەجێهێشتنی شارو وتوێژ لەگەڵ سەرتیب (سەیف ئەفشار) کرد و لە کۆتاییدا دەوڵەتی ئێران زەویوزاری پشدەرییەکانی کڕی.[١٣] میرزا فەیروزخان لە وتارەکەی (١٨ – دیسامبیری ١٩٢٤)ی خۆیدا دەنووسێ: کەخەڵکی ئێران بەریتانیا بەبەرپرسی سەرپێچی عەشیرەتی پشدەری دەزانن، بەڵام هاندەری ئەم ڕووداوە هەرچی بوو، ئەنجامی ئەو بۆ سمکۆ بەواتای لە دەستدانی یەکێك لە هاوپەیمانە سەرەکییەکانی لە خاکی عێراق دەژمێردراو چارەیەکی نەهێشتەوە بۆ ئەوە مەگەر هەرچی زیاتر پاڵ بدات بۆ تورکیە و عەشیرەتەکانی ئەو وڵاتە. لە پارێزگاری کوردستانیش بەربەست گەلێك بۆ هاتنی عەشیرەتی بە هێزی جاف بۆ خاکی ئێران دانراو لە ژێر کاریگەری هەوڵەکانی سوپا، مەریوان و هەورامان لە خەڵکانی

سەرپێچیکەر پاك کرایەوە. بەڵام نیشتەجێکردنی عەشیرەتەکان لەسەر بنەمای بەرنامەیەکی ڕێکوپێك و بەنیەتی چاکەوە جێبەجێ نەدەکرا و ئاکامی ئەوە زۆر زوو خۆی بە شێوەی کارەساتێکی مرۆیی و ئابووری نیشان دا. ئەمین بنانی کە دەربڕینێکی لایەنگیرانەی بە نیسبەتی کردەوەکانی ڕەزا شاش هەیە، لە بارەی شێوەی جێبەجێکردنی سیاسەتی ئەوا بەرانبەر خێڵەکان بەم جۆرە ڕوانگەی خۆی دەربڕیوە:

"ئەو( ڕەزاخان)ە دەیەویست بە هیچ شێوەیەك ئیزنی گەڕانەوە بۆ بێسەروبەریی خێڵەکان نەدا وەکو ئەوەی لە ساڵەکانی سەرەتای گەیشتن بە دەسەڵات، شاهیدی ڕوودانی بوو. بە گەرمییەوە درێژەی بە بەرنامەیەك دەدا کە بۆ جێنشینکردنی خێڵەکان بە شێوەیەکی هەمیشەیی لەسەر زەوییە کشتوکاڵییەکان داڕێژرا بوو، ئەم بەرنامەیە بە پێشگرتن لە کۆچە وەرزییەکان لە ڕێگەی هێزەوە، دروستکردنی خانووەکان لە هەندێك ناوچە بە مەبەستی جێنشینکردنیان و دابەشکردنی زەوییە دەوڵەتییەکان و پێدانی دانەوێڵەی خۆڕایی بە عەشیرەتەکان بۆ هاندانیان بۆ کشتوکاڵ و ئازادکردنی ئاژەڵداری ئەنجام دەدرا"[١٤]

دەوڵەت بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی زانیاری لە بارەی ژمارەی بنەماڵە، پیاوانی شەڕکەر، رادەی چەك و ژمارەی مەڕ و ماڵاتی خێڵەکان – ئەوانی ناچار دەکرد ناسنامە بۆ ئەندامانی خێڵەکانیان وەربگرن، پاشان بۆ پێشگیری لە کۆچی وەرزی عەشیرەتەکان لەناوچەکانی گەرمیان و کوێستان حکومەتی نیزامی (بارودۆخی نائاسایی) ڕاگەیاندرا. ئێران سیاسەتی جێنشینکردنی بەزۆری لە ئازەربایجانی ڕۆژئاوا بەتوندییەکی زیاتر لە پارێزگای کوردستان بەکارهێنا. لە باشوور تەنها سەرۆك عەشیرەتەکان گیران و زیندانی کران. بەڵام لە باکووری کوردستان هەموو عەشیرەکان نیشتەجێ کران و هەندێکیش لە زێدی خۆیان بۆ ناوچەکانی تری ئێران گوازرانەوەو ئەندامەکانیان دەرچوون بۆ عێراق و تورکیە یا خرانە زیندانەوە. جیاوازی کارکردنی دەوڵەت لەم دوو ناوچەیە لە هەستیاری بارودۆخی عەشیرەتەکانی ئازەربایجان پاش دامرکاندنەوەی شۆڕشی سمکۆ و پشدەرییەکان و ترس لە جووڵانەوەی سەر نوێی سمکۆ و شۆڕشی ئارارات کە خێڵی جەلالی دەرگیر کردبوو، ناکۆکی سنووری لەگەڵ تورکیە و بەرگری عەشیرەتەکانی ئەم ناوچەیە لەبەرانبەر جێنشینکردنی زۆرەملێی سەرچاوەی گرتبوو، خێڵگەلێکی گەورەی وەك زیلان لەگەڵ پێنج تایفە، جەلالی لەگەڵ دە تایفە، میلان لەگەڵ یازدە تایفە، شکاك لەگەڵ بیست و نۆ تایفە، مامەش، گەورك، دیبۆکری، بەگزادەو پیران هەرکام لەگەڵ چەندین تایفە بە شێوەیەکی تەواو جێنشینبوون. هەندێك لەم خێڵانە لە فەرمانی

دەولەت سەرپێچییان کرد. کە بەتوندی سەرکوت و پاشان راگوێزران، بۆ نموونە لە تایفە راپەڕیوەکان دەتوانین ئاماژە بە قزلباشەکان، خلکانلوەکان، ساکانەکان و قندکانلوەکان بکەین". [(١٥)]

قزلباشەکان لە ماکۆ بۆ ناوچەکانی خۆی، مشکین شار و رامین و قەزوین راگوێزران و لە سالی (١٣٢١) ١٩٤٢ز هەندێکیان گەڕانەوە. هەروەها هەندێك لە ئەندامەکانی تایفەی خلکانلو کە لە ماوەی راپەڕینی ئارارات یارمەتییان بەکوردەکانی تورکیە کرد بوو ئەوانش هەر راگوێزران یا دەرچوون بۆ ناو خاکی تورکیە. ئەندامەکانی تایفەی ساکان و قندکانلوش لە شارەکانی تۆیسرکان، هەمەدان، قەزوین و مشکین شار نیشتەجێبوون. لە باشووری کوردستانیش خێلەکانی مەریوانو هەورامان هەرچەند تا ماوەیەك بەرگریان کرد، بەلام لە ئاکامدا ئەوانیش سەرکوتکران و پاشان بە ناچاری نیشتەجێبوون. بەلام هێشتاش هەتا چاوەدێری تەواو بەسەر شەرکەرانی خێلەکان رێیەکی دوور لەپێش بوو، کارگەلێکی وەکو سەربازی زۆرەملیّ یا خزمەتی زۆرەملێی ژێر ئالای دەولەت، جێگیرکردنی پێگەگەلی نیزامی لە ناوەندە نیشتەجێیەکانی عەشیرەتەکان و گۆڕینی جلوبەرگیش پێویست بوو تا جگە لە هەلومەرجی سیاسی تازە کەشێکی فەرهەنگی و کۆمەلایەتی نویّ بۆ لە ناوبردنی ژیانی نەریتی رابردوو بهێنێتەکایەوە. دروستکردنی سوپایەکی یەکپارچە و بەهێز کە بتوانیّ دەسەلاتی دەولەتی ناوەندی لە هەموو ناوچەکانی ئێران جێگیر بکات، یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی رژێمی دەستوورییەت بوو. بەلام بەهۆی بەربەستگەی ناوخۆیی و دەستتێوەردانی بێگانەکان و بەئەنجام گەیشتنی ئەو کارە تاپێش چوونە دەری رووسەکان لە خاکی ئێران وەدواکەوت. پاش کودەتای (١٢٩٩) ١٩٢٠ز بەهۆی هەلومەرجی تازەی پێکهێنانی سوپایەکی رێکوپێك و بە دیسپلین بوو بە یەکێك لە سەرەکیترین و سەرەتاییترین کارەکانی رەزاخان و بالی لایەنگیری. دەبیّ بزانین دژایەتی لەگەل سەربازی زۆرەملیّ تەنها پەیوەست نەبوو بەعەشیرەتە کوردەکانەوە، بەلکو لوڕەکان و قشقاییەکان و توێژگەلێکی وەکو پیاوانی روحانیش دژی بوون.

گەلالەی (سەربازی زۆرەملیّ) لە رێکەوتی (١٦ جۆزەردانی ١٣٠٤) ١٩٢٥ز لە لایەن پەرلەمانەوە پەسەندکرا، بەلام دوو سال دواتر لە ناوچە کوردنشینەکان جێبەجێکرا، بەرگری لەبەرانبەر فەرمانی دەولەت توند بوو، هەستی بێزاری و بیّ بڕوایی کوردەکان بەرانبەر شاو سوپاکەی لە راستیدا دەمێك بوو سەریهەلدابوو، بەرگری و سەر دانەنواندن لەبەرانبەر ئەم فەرمانەدا لە راستیدا گازاندەکردن لە رابردوودا بوو، قولایی ئەم بێزارییە لەو گۆرانی و

سروودانەی کە عەشیرەتەکان دایاننناون لە وەسفکردنی بێ دەسەلاتی کوردەکان و لەناوچوونی ئازادی لاوەکانیان و کەلك وەرگرتنی هەلپەرستانەی شا لەوانە، لەو شەڕانەی کە لەناوخۆی وڵاتدا بەڕێی دەخستن و ئارەزووی لە ناوچوونی شا، بەئاشکرا دیارە."[16]

خێڵەکان و عەشیرەتەکان بەناردنی لاوەکانیان بۆ خزمەت، هێزی سەرەکی کاریان لە ئابووری شوانکاریدا لەدەست داو ئەم بەمانای ئیفلیج بوونی ژیانی ئەوان بوو. بەزوویی ناوەندە نیزامییەکان لە ڕۆژئاوای ئازەربایجان و پارێزگاری کوردستان دامەزران و بەهۆی گرینگیدانی ئەفسەرگەلێکی وەکو (عەبدوڵلا خان ئەمیر تهماسی)، (سەرهەنگ محمود خان ئەمین) ...هتد لە ماوەی دەیەیەك هەموو شارە کوردنشینەکان و ناوچە ئیستراتیژییەکان بوونە خاوەن مۆلگەی سەربازیو لەمەو بەدواوە ئەفسەرانی سوپاو (ژاندارمەری) ڕاستەوخۆ پەیوەندییان لەگەڵ خەڵکی کوردستان پەیدا کردو بەهۆی نەبوونی سیستەمێکی لێپرسینەوەی ڕێکوپێك لە ڕژێمی ڕەزاخاندا گیان و ماڵو نامووسی خەڵك بووە یاری ئارەزووی کاربەدەستانی گەندەڵ و دەسەلاتخوازی دەوڵەتی شاهەنشایی. دەستێوەردانە ناڕەواکانی دەست و پێوەندییەکانی دەوڵەتی شاهەنشایی لە کاروباری ژیانی خەڵکی کورد بۆ یەکەمین جار، ئەو بیرۆکەیەی لە ناو مێشکی کوردە خوێندەوارەکاندا جووڵاند، کە ئەم هەموو جیاکاری و گوشارە بەو هۆیەوە بەسەر کوردەکاندا دەسەپێندرێ، چونکە لە ڕوانگەی کاربەدەستە نێردراوەکانی دەوڵەت، خەڵکی کورد بە نەتەوەیەکی بێگانە، باوەڕپێنەکراو و ڕام نەکراو دادەنران و تەنیا زمانی هێز، باش دەزانن. بە وتەی (یەحیا سادق وەزیری) دانانی دامەزراوە نیزامییەکانی بۆ جێگیرکردنی ئاسایش لەگەڵ پێشوازی کوردەکان بەرەو ڕوو بوو، بەلام توندوتیژی لە ڕادە بەدەری نیزامییەکان و دەستدرێژیان بۆ بەرژەوەندییەکانی خەڵك بوو بەهۆی بێزاری خەڵکی بەرانبەر بە سوپا"[17]

لەسەر بنەمای ئەمە خزمەتی سەربازی زۆرەملێ بووە هۆی ناڕەزایی خێڵەکان و دامەزراندنی پێگە نیزامییەکان، دەستی نیزامییەکان و ژاندارمەکانی لە کاروباری ژیانی خەڵکی ئاوەڵە کردەوە. مەسەلەی گۆڕینی جلوبەرگ و کلاوی پەهلەویش یەکێك لە کارەکانی ڕژێمی پەهلەوی بوو کە بەزۆر لە هەموو شوێنەکانی وڵات جێبەجێکراو لە کوردستانیش بەتوندی و جیدییەوە درێژەی پێدرا بە شێوەیەك کە بووە هۆی ڕاپەڕینی عەشیرەتی مەنگوڕ بەسەرکردایەتی (مەلا خەلیل). پێکهێنانی ئیدارەکانی تۆمارکردنی موڵك و بەڵگەکان، شارەوانییەکان، ناوەندگەلی ڕاهێنان دادگاو شتی دیکەی هاوتەریب لەگەڵ هەوڵەکانی دیکەی ڕژێمی پەهلەوی لە ناوچە کوردنشینەکان درێژەی پێدەدرا. بەلام ئەم گۆڕانکارییانە بەدوو هۆ بۆتە جێگای دژایەتی

کوردەکان، یەکەم: پشتگوێخستنی ڕۆڵی خەڵکی ناوچەکان لە بەڕێوەبردنی ناوچەکە و دووەم: نیزامییەکان خاوەنی دەسەڵاتێکی لەڕادەبەدەر بوون لە نێوان کارمەندانی دەوڵەتی. (یەحیا سادق وەزیری) بارودۆخی ئەوکات بەم شێوەیە لێکدەداتەوە: لەگەڵ ئەوەی کە جێگیرکردنی ئیدارەکان لە ناوچە کوردنشینەکان بۆ دابینکردنی کار بۆ لاوان و پێکهێنانی بە چینی ناوەندی شارنشین لەبنەڕەتدا کارێکی دروست بوو، بەڵام بەئاشکرایی ژمارەی کارمەندانی ناوچەیی لە ئیدارەی کوردستان کەم بووەوەو بنەماڵە خاوەن دەستڕۆیشتووەکانی ڕابردوو کەم کەم جێی خۆیان دایە کارمەندە نێردراوەکانی دەوڵەت، ئەگەر لە سەردەمی قاجار حاکمی ویلایەت هۆکاری پێکهێنانی پەیوەندی کوردەکان بوو بەناوەندەوە، ئێستا کۆمەڵێك لە فارسەکان و ئازەرییەکان بەسەلیقەی جۆرا و جۆر ئەم ئەرکەیان گرتۆتە ئەستۆ، بێشك سەرنجی زۆریان نەدەدایە بەرژەوەندی، تایبەتمەندییە فەرهەنگییەکان و سۆز و ئیحساساتی کوردەکان."[١٨]

سرپرسی سایکسیش لە بارەی بارودۆخی ئێران لە ساڵی ١٩٣٠ (١٣٠٩ ك.ش) دەنووسێ: "ئەمڕۆ لە جیاتی منداڵانی بنەماڵە ناسراوەکان، نیزامییەکان لە تاران دەنێردرێن بۆ دەوروبەری کە زۆربەشیان بەزوویی ئەرکەکەیان دەگۆڕدرێ ئەمانە کەمتر ئۆگرن بە خەڵکێك کە حوکمیان بەسەردا دەکەن، بەپێچەوانەوە لەگەڵ دانیشتووانی ویلایەتەکان بە شێوەیەکی ناشیرین ڕەفتار دەکەن و ئەو پارەیەی بەدەستی دەهێنن یا لە تاران یا لە ئەورووپا خەرجی دەکەن، لەگەڵ ئەوەی کە ڕادەی باجەکان چووەتە سەرێ و بە تەواوی و بێ هیچ ئەملاو ئەولایەك وەردەگیرێت لە کاتێکدا کە لە زەمانی زوودا ئاسایی بوو لەگەڵ بەرپرسی باج پێك بێن."[١٩]

دانەرانی مێژووی کامبریج دەرەنجامی سیاسەتی بەزۆر نیشتەجێکردنیان بە (لە نێو چوونی ئاژەڵەکان، کەمبوونەوەی ماددەی خۆراکی و هاتنەخواری ئاستی ژیان و نەخۆشی و مردنی زیاترو لەدەستچوونی ئازادی و چەوساندنەوە بەهۆی بەرپرسانی ناوچەیی و حکوومەتی دەژمێرن).[٢٠] خێڵەکان و عەشیرەتەکان لەوکاتەدا بەشێکی زۆری گۆشتی وڵاتیان بەرهەم دەهێناو بەوشێوەیە کە ڕۆژنامەی تایمیز لە (٢٦ کانوونی دووەمی ١٩٢٧) هەواڵی ناردووە ژمارەی ئەندامانی عەشیرەتەکان لەو سەردەمەدا دەگەیشتە سێ ملیۆن کەس، واتە یەك لە سەر سێی خەڵکی وڵاتو پەرتەوازەیی و کۆبوونەوەی ئەوان لە ناوچە سنوورییەکانی وڵات لە هەموو شوێنێکی تر زیاتر بووە.[٢١]

چەکداربوونی عەشیرەتەکان و ئامادەبوونیان لە ناوچە سنوورییەکان ئەو پێویستییەی دەردەخست کە تاکە دەزگای کاریگەر بۆ چاوەدێرییان تەنها دەتوانێت سوپا بێ، چونکە لە سەرەتای هەمان کارەوە تایفە جۆرا و جۆرەکانی ویلایەتەکان پێشانیان دابوو بەسەختی لەبەرانبەر هەر شێوە ئالوگۆڕێکدا دەوەستن و ڕەزا شا دەسەلاتێکی بێ کۆتایی دابووە ئەفسەرانی بەرپرسی جێبەجێکەری سیاسەتی بەزۆر نیشتەجێکردن و بەگشتی هەر نیزامییەکی ئەرکناس، لەسەر بنەمای ئەزموون و شێوەی خۆی ئەو کارانەی جێبەجێ دەکرد. بۆ نموونە (بەپێی فەرمانی ڕەزا شا بڕیار درا هەندێك لە تایفەکانی لوڕ بەخێرایی بۆ لای خوراسان کۆچ پێ بکرێن و ڕەزم ئارا بووە بەرپرسی ئەم کارە. ئەویش لەسەر حیسابی هێزی بەدەنی خۆی ڕاوەستانی ڕۆژانەی لە نێوان (٣٠ تا ٣٥) کیلۆمەتر لەبەرچاوگرت، تا وەلامدەری (بەڵێنی) خێرای لە کارەکەدا بێت. لە کاتێکدا کە کۆچ پێکردنی ڕۆژانەی ژن و منداڵ و مەڕ و ماڵات بۆ ماوەی چەند حەوتوو بە سەلامەتی ئەویش بەم خێراییە کارێکی دژوار و نەگونجاوە. ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە هەموو مەڕ و ماڵات چوار پێیەکانی تایفەی کۆچدراوی لوڕ، لە ناوچوون و ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی بەساڵداچوو تەنانەت دایکانی گەنج کە لە کاتی کۆچکردندا، دووگیان دەبوون، بێشك کە نەیاندەتوانی درێژە بەکۆچەکە بدەن و لە ڕێگەدا دەمردن".

ڕەزم ئارا خۆی لە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە، هەروەك (ئەتیلا) لە مردن و زیانی مرۆیی و ئاژەڵەکان داخ و کەسەری خۆی دەردەبڕێ. بەڵام لە هەمان کاتدا بە بیری دەهێنایەوە کە بابەتی (کارێکی سەربازی) بووەو (بنەمای دیسپلین)ی سوپا وای دەخواست ئەم کارە بەم شێوەیە جێبەجێ بکرێت، چونکە لە کاروباری نیزامیدا ڕەحم بوونی نییە. ئەو ئاگای لەوە نەبوو کە لە جێبەجێکردنی کارەکەیدا گەورەترین ڕەگەز کە بنەمای مرۆڤ بوون و ئێرانی بوونە لە بیری کردبوو).[٢٢]

بەهۆی گوشاری بەڕێوەبەرانی نیزامی و ئەو تەنگەتاوەی کە پێکیان هێنا بوو، عەشیرەکان دەستیانکرد بەڕاپەڕین و لە ساڵی (١٣٠٨) ١٩٢٩ز زنجیرەیەك ڕاپەڕین ڕوویاندا لە نێوان قشقاییەکان و بەختیارییەکان و بویرییەکان و خێڵەکانی خەمسە و مامەسانی لە فارس و لوڕستان و مەنگوڕەکان لە ئازەربایجانی ڕۆژئاوا. ئیڤانۆف باوەڕی وایە کە عەشیرەتەکان خوازیاری گەڕانەوە بوون بۆ سەردەمی پێش سیاسەتی بەزۆر نیشتەجێکردن و لابردنی حکوومەتی نیزامی و فەرمانداری نزامی لە ناوچەکانیان و وەستاندنی چەککردنی زۆرەملێ و کەمکردنەوەی باج و سەرانە و نەهێشتنی خزمەتی زۆرەملی و لەگەڵ لەبەرکردنی جلوبەرگی

به شێوەی ئەوروپایی و بەتایبەت کڵاوی پەهلەوی کە بەهۆی ڕەزا خانەوە چەسپا بوو دژایەتییان دەکرد.[٢٣]

لە ڕوانگەی دانەرانی (مێژووی کامبریج)یش (داواکاری هەموو خێڵەکان کەم و زۆر یەکسان بوو: بەکۆتایی هێنان بە چەککردن و سەربازگیری، کەمکردنەوەی باج و سەرانە، گەڕانەوەی خودموختاری.[٢٤] هەر بۆیە دەبێ بزاندرێ کە هاندەرەکانی عەشیرەتی مەنگوڕ لە هەڵچوونیان بەدژی دەوڵەت لە ساڵی (١٣٠٨ ک.ش) ١٩٢٩ز سەرچاوەی لە ناسیونالیزمی کورد وەردەنەگرت و زیاتر لێکچوونی لەگەڵ هەڵچوونی قەشقائی و بەختیارییەکاندا هەبوو تەنیا جیاوازی نێوانیان ئەو ڕۆڵە گرینگەیە کە پیاوانی ئاییینی سوننی لە ڕاگەیاندنی جیهاد بەدژی حکومەتی پەهلەویدا گێڕایان، ئەو شۆڕشە بە شۆڕشی مەلا خەلیل بەناوبانگە و بە تەنیا وەك یاخیبوونێکی سەرەکی عەشایری کورد لەبەرانبەر دەوڵەتی ڕەزا شا بەژماردێت، هەر بۆیە تاوتوێکردنی سەرپێی ئەو ڕاپەڕینە لێرەدا جێگای خۆیەتی.

حکوومەتی ڕەزا شا پاش نیشاندانی هێزەکەی لە هەموو شوێنێکی وڵاتدا و جێگیرکردنی هێزی سەربازی لە ناوەندەکانی قەیران و هەروەها قەتل و عام کردنی عەشیرەتە یاخی و سەرپێچیکەرەکان، بەرەبەرە زەمینەیەکی نیسبی بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکان و بەرنامە نوێخوازەکانی خۆی پێکهێناو لەبەر ئەوەی هەموو هێزە ناڕازی و دژەکان لەسەر ڕێگا لابردران، جێبەجێکردنی بەرنامەکان تا ڕادەیەك بێ بەربەست پراکتیك دەکران، لە ئازەربایجانی ڕۆژئاواش چاوەڕوان دەکرا بە سەرکوتکردنی سمکۆ، کوردەکانی ئەوێ لەبەرمبەر دەوڵەتدا، ملکەچی بنوێنن و پێشوازی لە نوێخوازی و نوێگەرایی دەوڵەتی پەهلەوی بکەن، بەڵام بەڕێوەبەرانی ئەوێ لە لێکدانەوەکانیاندا بەهەڵەدا چووبوون و حکوومەتی پەهلەوی بەتەواوەتی لە دژکردەوەی هێزی سیاسی و کۆمەڵایەتی ناو کوردەکانی ئەو ناوچەیە بێئاگابوو، دژکردەوەیەك کە بە شێوەی ڕاپەرینی ڕێبەری عەشیرەتە مەنگوڕ و بەڕێبەرایەتی مەلا خەلیل گور عومەری بەرجەستە بوو.

لە ساڵی (١٣٠٧ ک.ش) ١٩٢٨ز بەڕێوەبەرانی حکوومەتی پەهلەوی یاسای جلوبەرگی هاوشێوەو کڵاوی پەهلەویان جێبەجێکرد و ئەفسەرانی پۆلیس بەرپرسی چاوەدێری ئەو پرۆژەیە بوون. لە ناوچە کوردنشینەکانیش یەکەم هەنگاوەکان بۆ سەپاندنی جلوبەرگی ئەوروپایی بەسەر شارنشین و گوندنشین و عەشیرەتەکان پێکهاتو لە کۆتایی ساڵی (١٣٠٧ک.ش) ١٩٢٩ز جێبەجێکردنی ئەو بەرەبەرە بەڕێوە چوو. بەرنامەی گۆڕینی جلوبەرگ دوای سەرکەوتنی ڕێژەیی دەوڵەت لە بەزۆر نیشتەجێکردنی عەشیرەتەکان، دامەزراندنی ئیدارە و پێگە سەربازییەکان و تاڕادەیەکیش چەك داماڵینی ئەوان پەیڕەو کرا. ئەو گۆڕانکارییانە بە شێوەیەکی چڕو لە لایەن سوپاییەکانەوە ئەنجام درا، بۆ نموونە پێش لە هەڵچوونی مەنگوڕەکان، سەرکردەو ڕێبەرە سەرەکییەکانی تایفەکانی ئەو عەشیرەتە لە بەندیخانە سەربازییەکانی تەورێزدا بوون هەر بەسەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکە، لە لایەن تیمسار حەسەن موقەددەم (زەفەر ئەلدەولە موقەددەم) ئازادکران بۆ ئەوەی ئەندامانی عەشیرەتی خۆیان لە پێکدادان لەگەڵ دەوڵەت پەشیمان بکەنەوە. لەوناوەدا پارێزگای کوردستان یان بەواتایەکی دیکە کوردستانی باشوور سیاسەتی گۆڕینی جلوبەرگی زۆر بەهێمنی قەبووڵ کردو بەرگرییەکی جیدی لە بەرانبەردا نیشان نەدا، بەراستی هۆی ئەوە دەبێ چی بێ؟ دانەری کتێبی (توحفەی ناسری لە مێژوو و جوگرافیای کوردستاندا) بەو شێوەیە باس لە گۆشەیەکی وێکچووی جلوبەرگ و ڕواڵەتی دانیشتوانی شاری سنە لەگەڵ دانیشتوانی دیکەی ئێران لە سەردەمی قاجاریدا دەکات: "شێوەی جلوبەرگی دانیشتوانی ئەو شارە بە نێر و مێیەوە بەپێچەوانەی جلوبەرگی کوردی شارەکانی دیکە،

جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ جلوبەرگی ناوچە عەجەمەکان نییە، تەنیا لە جلوبەرگی ئافرەتەکاندا، جیاوازییەك هەیە کە ئافرەتە عەجەمەکان کلاوزەڕی و هەوری لەسەریان ناپێچن و لە جیاتی ئەو قەجەری دادەنێن، ئەوانە (کوردەکان) کلاوزەڕی و هەوری زۆر سەیر لەسەریان دەنێن کە لەگەڵ زەوقەکانیش دەگونجێ، زۆربەی ئافرەتە نەناسراوەکان کە لەسەر هەمان یاسای کۆنی کوردی روخساریان داناپۆشن و بەبێ چارشێو رووبەند دەردەکەون، ئەویش یەکێك لە عادەتە پاشکۆییەکانی کوردە."[1] یەحیا سادق وەزیریش پێیوایە کە هاوڕایی و هاوکاری خانەدانە شارنشینەکانی سنە لەگەڵ سیاسەتی گۆڕینی جلوبەرگ، لە لایەن ڕژێمی پەهلەوییەوە لە بەرەوپێشبردنی ئەودا زۆر کاریگەر بووەو بۆتە هۆی ئەوەی خەڵکی کوردستان کەڵك وەرگرتنی خانەدانە شارنشین و بازرگانەکانی دانیشتووی سنە و سەقز لە جلوبەرگی ئاسایی و بەکارهاتووی ناوچەکانی دیکەی ئێران لە سەردەمی قاجاردا، ئیمکانی گۆڕانی جلوبەرگی لە باشووری کوردستان ئاسانتر کردبۆوە.[2]

وادێتە بەرچاو کە ئیدعای سادق وەزیری تا رادەیەك لە ڕاستی نزیك بێ، چونکە لەڕاپۆرتی شمس مەلیك ئارا، حاکمی کوردستان لە ڕێکەوتی ١٣١٤/١١/٩ (١٩٣٦ز)، بۆ سەرۆکایەتی وەزیران، ئەو لە هاوکاری چینی یەکەمی کوردستان لەگەڵ دەوڵەت ڕەزایەتی دەردەبڕێ و لە واقیعدا هەر ئەو چینە لە خانەدانە شارنشینە لە یەکەمین تاقم لە کوردەکان بوون کە خۆیان و هاوسەرەکانیان لەسەر شێوەی ئەوروپایی لە پێش چاوی خەڵك دەرکەوتن.[3]

بەڵام لە کوردستانی باکوور هەر لە سەرەتاوە ئەو ویستەی دەوڵەت لەگەڵ ناڕەزایەتی خەڵك ڕووبەڕووبۆوە و پێشڕەوی ئەو ناڕەزایەتی و دژایەتییە، پیاوانی ئایینی واتە خوێندەوارە نەریتییەکانی کۆمەڵگا بوون، کەسانێك کە سەر بە پاراستنی تایبەتمەندییە نەتەوەیی و دابونەریتە نەتەوەییەکانی خۆیان زۆر بەتوندی و دەمارگیریانە پێیان دادەگرت.

دانەری کتێبی "ڕاپەڕینی مەلا خەلیل" کە لە نزیکەوە لە ناو ڕووداوەکان دابووە، مەسەلەی گۆڕینی جلوبەرگ بەوشێوەیە باس دەکا:

"لە سابلاغی (مەهاباد) موکری جەژن و کۆڕ و کۆبوونەوەی تایبەت بەگۆڕینی جلوبەرگ دەستی پێ کردبوو بەزۆری جلوبەرگی فەرەنگی (ڕۆژئاوا)و لەبەرکردنی کۆت و شەڵوار و کڵاوی پەهلەویان لە جێگەی جلوبەرگی نەریتی ناوچەکە، دادەناو پاشان بۆ ئەو کارەیان دەستیان بەخۆشی و جەژن دەکرد... هەموو شوێنێکی وڵاتیان ڕووناك کردبوو خەریکی شیعر خوێندنەوەو وتاردان و شیرینی بڵاوکردنەوە بوون، سەرەڕای ئەوە گۆڕینی جلوبەرگی باو و نەریتی ناوچەکە زۆر بەدڵی خەڵك نەبوو

لایان پەسەند نەبوو، هەر بۆیە کەم تا زۆر نارەزایەتی و بێزاری لەو کردەوانەی دەوڵەت کەوتە سەرزاری خەڵك و جۆرەها لێکدانەوەیان بۆ دەکردو زۆرجاریش لە لایەن هەندێك لە کەسایەتی نەریتی و دەمارگیرەکانەوە، مۆری کافربوونیان لەسەر ئەو کەسانە دادەنا کە ئەو جلوبەرگانەیان لەبەر دەکردو داوای سزادانیان بۆ دەکردن، چونکە نە بەخۆشی و نەبەزۆری شارنشین و گوندنشینەکان ڕازی نەبوون و نەفرەت و بێزاری لەو هەنگاوانەی کاربەدەستانی دەوڵەت، کاریگەری بەرچاوی لە رۆحییەتی عەشایری سەر سنووردا هەبوو، عەشیرەتەکانی مەنگوری سنوورنشین لەم کارەی دەوڵەت تووشی ناڕەحەتی و پەشێوی بوون و ڕێبەر و پێشەوای ئایینزایی مەنگوڕ و زانا و مامۆستای بەناوبانگی ئەو تایفەیە، خوالێخۆشبوو (مەلا خەلیل گور عومەر) کە کەسایەتییەکی ئایینی دەست ڕۆیبوو جێگەی ڕێزی ئەو عەشیرەتە بوو، دژایەتی ئەو هەوڵ و هەنگاوانەی دەوڵەتی کردو ئالای یاخیبوونی بەرزکردەوە..."[٤]

لە سەرەتاکانی زستانی ساڵی (١٣٠٧ ك.ش) ١٩٢٨ز دەستە و تاقمی زۆر لە هێزە سەربازییە نێردراوەکان لە لایەن سەرلەشکر خەزاعی لە سەراسەری موکریان وەك مەهاباد، سەردەشت، نەغەدەو شنۆدا بڵاوبوونەوە، هەتا هەوڵەکانی عەشایری موکری بخەنە ژێر چاوەدێری و کۆنترۆڵەوە. ژمارەیەك لە هێزە سەربازییەکان لە گوندەکانی نێوان مەهاباد و سەردەشت دوای تێکهەڵچوونیان، لە لایەن مەنگوورەکانەوە بەدیل گیران و وەك سزادانێك لێواری کڵاوەکانیان لە لایەن عەشیرەتەکانەوە بڕدران. لە ناوەڕاستەکانی زستاندا، گوشاری مەنگوڕ و عەشیرەتە هاوپەیمانەکانیان توندتر بوو و شاری مەهاباد کەوتە بەر ئابلۆقەی ئەوان. بەو جۆرەی کە سەرتیپ بیگلری دەنووسێت، ئەوا مەلا خەلیل بوو کە ئاگری ئەو ئاژاوەیەی هەڵایساند و عەشایرەکانیش چوونە پاڵی و تەنیا لایەنگریان لەو دەکرد.[٥] بەهەرحاڵ لەرێبەندانی ١٣٠٧ ١٩٢٩ز هێزە سەربازییەکان توانیان بەرزاییەکانی زاڵ بەسەر شاری مەهاباد داگیر بکەن و لە جەرگەی پێکدادانەکەش ئاڵا هەڵگری مەلا خلیل بەناوی سەید محەممەد ئەمین گیانی لەدەست دا.

پاشەکشەی مەلا خەلیل و مەنگوڕەکان دەستی پێکرد و چالاکییە سەربازییەکانیش ڕاوەستان. میرزا کەریم شیشەوانی، نووسەری یادداشتی تایبەت بەڕاپەڕینی مەنگوڕەکان، لە بارەی ڕاوەستانی کردەوە سەربازییەکانەوە دەنووسێ، هەم یاخیبووەکان و هەم هێزە سەربازییەکان بەهۆی سەرمای توندی زستانەوە پێویستیان بەنوێکردنەوەی هێزەکانیان هەبوو، هەر بۆیە پێیان باش بوو لە بەهاری ساڵی داهاتوودا شەڕ دەست پێبکەنەوە.[٦] سەرتیپ بیگلری باس لە نامەیەك دەکات کە لە لایەن مەلا خەلیلەوە بۆ کوڕەکەی نووسراوە کە ئەو نامەیەی لە ناو کتێب و کەلوپەلەکانی مەلا خەلیل

دۆزیوەتەوە، ناوەڕۆکی نامەکە ئاماژە بەڕاوەستانی هێرشی دوولایەنە بەهۆی سەرمای زستانەوە دەکاو نووسرا بوو کە ئێستا لەگەڵ سوپا ئاشتیمان کردووە بۆ ئەوەی لەبەهاردا، عەجەمەکان چارەڕەش بکەین.[٧]

سەرلەشکر خەزاعی فەرماندەی هێزەکانی ئازەربایجان هەر لە سەرەتای ڕاپەڕینەکە بۆی دەرکەوتبوو کە هەموو کوردەکانی ئەو ناوچەیە و هەروەها پیاوانی ئایینی لە واقیعداو بە شێوەیەکی جیدی دژی گۆڕینی جلوبەرگی بەزۆرەملێ بوون و ئەو ئاژاوەیە تەنیا لە سەردەمی مەلا خەلیل و مەنگوڕەکان نەدەخولایەوە. هەر بۆیە هەوڵیدا راستییەکان بۆ ڕەزا شا ڕوون بکاتەوەو لە ڕاپۆرتێکی تەلگرافدا دەنووسێ:"بەنیسبەت گۆڕینی جلوبەرگەوە، زانایانی ئایینی سوننی فەرمانی جیهادیان داوەو گۆڕینی جلوبەرگیان بە کوفر زانیوەو هەر لەبەر ئەوەش عەشیرە سنوورنشینەکان دەستیان بەڕاپەڕین و شەڕو ئاژاوە کردووە. ئەگەر بەڕاستی دەیانهەوێ (مەبەست ڕەزا خانە) میللەت لە ئارامی و خۆشگوزەرانی دابێ، دەبێ چاوپۆشی لە هاوشێوەکردنی جلوبەرگ و دانانی نوێخوازی بکەیت. خەزاعی."[٨] ڕەزا شا پاش خوێندنەوەی ئەو ڕاپۆرتە، عەلی بێگ حەیدەری، نوێنەری مەهاباد، دەخاتە ژێر لێپرسینەوەو لێی دەپرسێ: "ئێوە نوێنەر و وەکیلی کوردەکانن، ئەوە لە کاتێکدایە کە کوردەکانی ئەوێ هیچ حەزیان لە گۆڕینی جلوبەرگ نییە و زانایانی ئەوێ ئەو بابەتە بەکوفر دەزانن و قەبوولیان نەدەکرد ئێوە بۆچی ئەمنتان ئاگادار نەکردۆتەوە،..."[٩]

دیارە ئەو ڕەفتارەی شا بە تەواوەتی جۆرێك خۆنواندن بووە، چونکە ئەو ئەگەر بە ڕاستی گرینگی بەداخوازی خەڵك دەدا، دەبوایە هەوڵەکانی خۆی هەر لەو کاتەوە ڕاوەستاندبا یان لایەنی کەم کەمی کردباوە، لە کاتێکدا وای نەکردو بەدەستووری ئەو عەلی بێگ حەیدەری نێردرا بۆ مەهاباد، هەتا نەهێڵێت شۆڕشەکە لە ناو عەشیرەتەکانی دیکەش تەشەنە بکا. هەروەها مەلا محەممەد موفتی نوێنەری سەقز لە پەرلەمان لە سەرەتای ڕەشەمەی ساڵی (١٣٠٧ ك.ش) ١٩٢٩ز لە ڕێگەی جادەی کرماشان — سنەوە، چوو بۆ سەقز، هەتا پێش لە بەشداریکردنی عەشیرەتەکانی سەقز لە ڕاپەڕینی مەنگوڕەکان بگرێت و هەروەها دژایەتی جلوبەرگی ئەوروپایی نەکەن.[١٠]

هاوپەیمانی سەرەکی دەوڵەت لەو ڕووداوانەدا، دیبۆکرییەکان بوون، ئەوانە بەزۆری لە سەردەمی قاجارەکانیش، بەهۆی رکابەری عەشیرەتی، باشترین پشتیوانی دەوڵەتی ناوەندی و حاکمی ئازەربایجان دەژمێردران. بەڵام جیدیترین پشتیوانی مەلا خەلیل و مەنگوڕەکانیش، عەشیرەتی گەورك بوو کە ئەندامەکانی زۆرتر لە دەوروبەری لق و پۆپەکانی سیمینەرود و دەرەزاب لە نزیکی پەنجا گوند دا نیشتەجێببوون. (حەبیبوڵڵا تابانی) دەنووسێت کە خەڵکانی ئەو عەشیرەتە بەهۆی

کەمبوونی شوێن و لەوەڕگە، بەردەوام لەگەڵ عەشیرەتەکانی دیکە خەریکی شەڕ بوون و هەر بۆیە لەوانەیە کە سەرۆکەکانی ئەو عەشیرەتانە مەبەستیان لە هاوکاریکردن لەگەڵ مەنگوڕەکان ئەوە بوو، کە هاوپەیمانێکی سەرەکی بۆ خۆیان بدۆزنەوە.[١١]

دەوڵەتی ئێران بۆ خۆتێهەڵقورتان لە شەڕێکی هەمەلایەنە هیچ پەلەیەکی نەبوو و هەوڵیدەدا شۆڕشگێڕان بێشەڕ ناچار بەخۆبەدەستەوەدانەوە بکا، جیا لەوە تاران پێی خۆش نەبوو کە پەیوەندییەك لە نێوان کوردەکانی موکری و شۆڕشگێڕانی ئارارات دروست بێ یان دەوڵەتی تورکیە ئیمکانی سوودوەرگرتن لەو شۆڕشە بەدەست بهێنێت و سمکۆ بنێرێتەوە بۆ سنوورەکانی ئازربایجان. لە ناوەڕاستی بەهاری (١٣٠٨) ١٩٢٩ز، فڕۆکەکانی سوپا، شوێنە گرینگەکانی مەنگوڕەکانیان بەتوندی بۆردومان کردو پاشان هێرش بۆ سەر ناوچە قایم و پتەوەکانی دوژمن لە کوێستانی "بوگە نیوە" دەستی پێکرد و دوای شەڕێکی کورتخایەن، سوپا توانی ڕاپەڕیوەکان، ڕەوانەی ئەو دیوی عێراق بکات و بەکەڵك وەرگرتن لە پردی کلاناسیان لە ڕووباری زاب بپەڕنەوە. (مەلا خەلیل)یش لە سنوور پەڕییەوەو پەنای بۆ پیاوانی ئایینی عێراق بردو بەو شێوەیە ڕاپەڕینی مەنگوڕەکان کۆتایی پێهات. هەڵبەتە ڕەزا شا، پێش لە دەست پێکردنی دوایین هێرش، سەرتیپ (زەفەر ئەلدەولە موقەدەمی) بەهۆی ئاشنایەتی لەگەڵ مەسەلەی ئازەربایجان، کوردەکانی موکری و هەروەها سیاسەتی تورکیە، لە جێگەی سەرلەشکر خەزاعی، کرد بەفەرماندەی هێزەکانی باکووری ڕۆژئاوا.

دانەری کتێبی "ڕاپەرینی مەلا خەلیل" گومانی لەوەدا نییە کە سەرتیپ موقەدەم هەوڵی ئەوەی دەدا کە زەرەروزیان لە خەڵکی مەدەنی نەکەوێت و تا ئەو جێگەیەی کە بۆی دەکرێت شۆڕشگێڕان نەخاتە ژێر گوشارەوە، هەر بۆیە شەڕەکە زۆر کورت بوو و هەربەزوویی هەڵگیرسێنەرانی ڕاپەڕینەکە بەخشران و تەنانەت لە لایەن ڕەزا شاوە چەند خەلاتێك، وەك بڕی پێنج سەد تومەن و سەعاتێك و چەند قەبزە تفەنگێك درایە مەلا خەلیل.[١٢]

(زەفەر ئەلدەولە) دەیزانی کە لە سێدارەدانی پاڵنەرانی ڕاپەرینەکە، دەبێتە هۆی هەڵچوونی عەشیرەتەکانی دیکە و جارێکی دیکەش ناوچەکان تووشی ئاژاوە دەبنەوە، لە ڕوانگەی سیاسییەوە ڕەهەندەکانی ڕاپەڕینی مەلا خەلیل زۆر گرینگ و بەرچاوبوون، بەڵام لە لایەنی هاتنی پیاوانی ئایینی کورد بۆ مەیدانی خەباتی سیاسیی، گرینگی زۆری هەبوو، ئێستا ئەو پرسیارە دێتە پێش کە بۆچی عەشیرەتە کوردەکان ڕیبەرایەتی پیاوانی ئایینی خۆیان قەبووڵ کردو بەپێی فتوای ئەوان ڕاپەڕینیان کرد؟ بێگومان عەشیرەتەکان بەهۆی ناڕازیبوونی خۆیان، گلەیی و شکایەتیان لە دەوڵەت هەبوو کە زۆر پەیوەندی بەئایینەوە نەبوو، سەرۆکەکان دەیانزانی کە چاکسازی دەوڵەتی ناوەندی هەر

له چەك داماڵین و جلوبەرگی هاوشێوەوە هەتا نیشتەجێکردنی بەزۆری لە درێژماوەدا ڕێکخستنی سیستمی عەشیرەیی لەناو دەباو عەشیرەتگەرایی وەك هاوولاتییەکی ملکەچ دەخاتە ژێر چاوەدێری سوپاو ژاندارمەرییەوە.

بەڵام زانایانی ئایینی سوننی کە هەروەك هاوتا شیعەکانی خۆیان ماوەیەك بوو کەوتبوونە ژێر چاوەدێری دەوڵەت، ئاگایان لەو حەقیقەتە هەبوو کە ڕژێمی پەهلەوی بەلەناوبردنی هێزی ئابووری عەشیرەتەکان، پێکهێنانی ئیدارەکانی تۆمار و مولکەکان، دادوەری، پۆلیس و ژاندارمەریو لێکپچڕاندنی هۆیەکانی پەیوەندی ماددی و مەعنەوی لە نێوان زانایانی ئایینی و خەڵك، بەتەواوەتی دەسەڵاتی ئایینی وەلاوە دەنێنو لە ئەسپاردنی ڕۆڵێکی زۆر بچووکیش بەوان خۆیان دەبوێرن، پاشان لە دەیەی دووەمی دەسەڵاتی ڕەزا شادا، قەدەغەکرانی تۆمار و بلاوکردنەوەی بەرهەمە کوردییەکانو قسەکردن بەو زمانە لە ناوەندە ئیداری و فێرکارییەکان، زیاتر لە جاران پیاوانی ئایینی لە دەسەڵات دوور کردەوە، چونکە پیاوانی ئایینی لە پەرەپێدانی بەردەوام و سەرەکی کولتوور و زمانی کوردی بوون و بێشك بەنیسبەت ئازادی کەڵك وەرگرتن لەو زمانە زۆر هەستیاربوون و وەرگرتنەوەی ئیرادەی کارکردن لەوان لەو زەمینەیەدا، بەواتای داخستنی قوتابخانە و زنجیرە دەرسییە نارەسمییەکان بوو کە لە نێوانیاندا منداڵانی کورد هاوکات لەگەڵ زمانی فارسی و عەرەبی، فێری زمانی کوردیش دەبوون و بەو هۆیەوە یەکێك لە ڕێگاکانی دیکەی بژێوی زانایانی ئایینی کورد لە ناوچوو.

جیا لەوانە قەدەغەکردنی ئەنجامدانی کردارو بۆنە ئایینییەکان بەهۆی زانایانی ئایینی کوردو پێش گرتن لە کۆڕو کۆبوونەوە ئاینزاییەکان، زانایانی زۆر بەتوندی ڕەشبین کرد. وەلاوەنانی ڕۆحانییەتی کورد لە هەموو زەمینەکاندا، بوو بەهۆی سەرهەڵدانی ناڕەزایەتی و بێزاری توندی ئەو چینە لە ڕژێمی پەهلەوی و هەروەها ڕەشبینی بەنیسبەت فارسەکان و تەنانەت ناسیۆنالیزمی ئێرانیش و بێگومان گەندەڵی، بەرتیلخۆری و زۆرەملێ کاربەدەستانی سوپایی و ئیدارییەکانی دەوڵەت بەرانبەر بەکوردەکان ئەو گومانەی بەهێزتر کرد.

دوورکەوتنی زانایانی ئایینی کورد لە ڕژێمی پەهلەوی، بەتایبەت لە ئازەربایجان، بە ڕادەیەك جیدی بوو کە حاکمی پارێزگاری ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، لەوکاتیدا، ئینتمای یەکێك لە زانا ئایینییە پایەبەرزەکانی کوردی بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ دەوڵەت لە زەمینەی کەڵك وەرگرتن لە جلوبەرگی ئەوروپایی بەگرینگ زانیوەو بابەتەکەی بەو شێوەیە بۆ ئاگاداری سەرۆك وەزیران ناردووە: "ئەحمەد تەرجانی یەکێك لە زانایانی گرینگی سابلاغ کە لە لایەن خەڵکەوە زۆر ڕێزی لێ دەگیرێ و بەپێی

یاسا مافی کەڵك وەرگرتن لە جەمەدانەی هەیە، بەچاولێکردن لەو تەشریفاتەی لە لایەن پارێزگاوە لێیکراوە، خۆی داواکاری پێشکەش کردووە کە جلوبەرگی هاوشێوە لەبەربکات و هەر بەجلوبەرگی ئایینیشەوە دەرس بڵێتەوەو کاروباری ئایینی ئەنجام بدات. ئەو مەسەلەیە کاریگەری لەرادەبەدەری لەسەر ئەهلی سوننە هەبووەو بۆیە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو مەسەلەیە، دەکرێ سوودی زیاتر لە ناوبراو ببینین ، عامری."(١٣)

هەربۆیە دەبێ بگوترێ مەلا خەلیل لە ڕاپەڕینەکەی خۆیدا بەتەنیا نەبوو و خاوەنی پشتیوانی ناڕاستەوخۆ و هێمنی زاناکانی دیکە بوو، لە ڕاستیدا دەنگی ئەو بەدەنگی ناڕەزایەتی زانایانی ئایینی کورد دەژمێردرا بەدژی گشت سیاسەتە نوێخوازییەکانی ڕەزا شا. لە بارەی ئاکام و دەرکەوتەکانی ڕاپەڕینی مەلا خەلیل دەکرێ ئاماژە بۆ دوو بابەت بکرێ:-

١- ئاوەڵابوونی دەستی دەوڵەت بۆ هەرچی زیاتر خستنە ژێر چاوەدێری عەشیرەتە کوردەکان. چونکە دوای ئەو ڕووداوە بەزۆری سەرۆك تایفە و سەرۆکی عەشیرەتەکان لە لایەن دەوڵەتەوە هەڵدەبژێردران، لە کاتێکدا لە سەردەمی قاجارەکان، شا تەنیا دانی بەو سەرۆکانە دەنا، کە لە لایەن تایفەکانەوە هەڵبژێردرابوون و پاشان بەرپرسایەتی دەدایە. ئاکامەکەی ئەوەبوو کە لەمە بەدواوە، چینێکی تازە لە سەرۆکە پارێزگارو سەر بە دەوڵەتییەکان لەناو عەشیرەکان پێکدەهات کە دەوڵەتی ناوەندی ویستەکانی خۆی بەپشتبەستن بەوان ( سەرۆك عەشیرەتەکان) جێبەجێ دەکرد.

٢- دوا بەدوای ڕاپەڕینی مەلا خەلیل، زانایانی ئایینی لە کوردستانی باکوور، بە شێوەیەکی بێوێنە ڕووبەڕووی ڕێژیمی پەهلەوی ڕاوەستان، کارێك کە هەتا پێش ئەمە وێنەی نەبوو بەهۆی سیاسەتی خەراپی پەهلەوی دروست بوو. ناڕەزایەتی زانایانی ئایینی کورد لە دەیەی دووەمی حکوومەتی ڕەزا خان ئەوەندە پەرەیستاند، کە ئەو کەسانە دوا بەدوای ڕووخانی ئەو (ڕەزا خان) لە پێکهێنانی یەکەمین حیزبی کوردەکانی ئێران کە لەسەر بنەمای نەتەوەخوازی کوردی بەناوی کۆمەڵی ژ. ك بوو، زۆر کاریگەریان هەبوو.

بێگومان لە سەردەمی پەهلەویدا کوردەکانی ئێران چوونە ناو قۆناغێکی نوێوە، کە بە بەراوردکردن لەگەڵ ژیانی سیاسیی سەردەمی قاجار، بە قۆناغێکی بەتەواوەتی جیاواز دادەنراو گەورەترین و گرینگترین تایبەتمەندی ئەو، شتێکە کە کۆمەڵناسی هاوچەرخی ئەورۆکە وەك چەوساندنەوەی نەتەوایەتی ناوی دەبات- دیاردەیەك کە لە سەردەمی قاجاردا، بوونی نەبوو و لێرەدا هەوڵ دەدرێت هۆیەکانی سەهەڵدانی تاوتوێ بکرێت.

لە سەردەمی دەسەڵاتی بنەماڵەی قاجاردا، هێزە سیاسیی و کۆمەڵایەتییە دەستڕۆییەکانی کوردستان وەك حاکم، سەرۆك عێل و عەشیرەت، پیاوانی ئایینی، خاوەن موڵکە گەورەکان، بازرگان و دیوانسالارە خۆجێیەکان، تا رادەیەك پەیوەندییەکی پتەویان لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا هەبوو و کۆمەڵگای کوردی سەرەڕای جیاوازی لە مەزهەبدا، نە تەنیا لە ئێراندا بەڵکو لە (وڵاتی) عوسمانیشدا حەز و ئارەزووی خۆیان بەنیسبەت کولتووری ئێران و زمانی فارسی نیشان دەداو ئەگەر لێکۆڵینەوەیەکی کورت لە بارەی شاعیر، عارف و نووسەرانی کورد بە شێوەیەکی گشتی بکرێت، دەبینددرێ کە بەشێکی گرینگ لە بەرهەمی نووسین و سرودەکانی ئەو خاوەن مەعریفانە بەزمانی فارسی نووسراوەتەوە.

ئینتیمای کوردەکانی دراوسێ بۆ زمانی فارسی، بەتایبەت لە عێراقدا، هاوکات لەگەڵ گرینگی دانی ئەوان بەپارێزگاری و پەروەردەکردنی زمانی کوردی هەتا دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم هەروا چالاك بوو، بەڵام پاشان بەهۆی گەشەکردنی نەتەوەپەروەری کوردی ئەو ئینتیمایە تا ڕادەیەك کەم ڕەنگ بوو هەتا ئەوەی لە ئاکامدا لەناو چوو.

دانەری کتێبی " کوردو پێوەستگی نەژادی و تاریخی " کە بە بەرهەمێکی زۆر بەبایەخ لە بارەی شوێنگەی ڕەگەزی کوردەکان بەژماردێ و لە ناوەڕاستی ساڵەکانی حکوومەتی ڕەزا شا دا نووسراوەو لەبارەی کارکردی زمانی فارسی لە نێو کوردەکانی عێراقدا دەنوسێ "تا ئەو دواییانەش زۆربەی ناوچەکانی کوردستان لە نامە ناردن و کتێب نووسین جیا لە زمانی فارسی هیچ زمانێکی دیکەیان بەکارنەدەهێنا، هەروەك چۆن ئەو کتێبە مێژووییانەی زانایانی کورد نوسیویانە وەك شەرەفنامەو هتد بەزمانی فارسی نووسراون... بۆ نموونە باری سلێمانی عێراق بە نموونە دەهێنینەوە کە یەکێك لە ناوەندەکانی کوردانە و ئێستاکە بۆتە بەشێکی عێراق. زمانی (خەڵکی) سلێمانییە، وەك زمانی کوردستانی ئێران (مەریوان، سەقز، بانە و مەهاباد و سنە) یە، تەنیا کەمێك جیاوازی لە شێوەزاریاندا هەیە. لە سلێمانیدا هەموو کڕین و فرۆشتن و بەڵێنی و گفتوگۆکان، فەرمان و قەباڵەکان بەزمانی فارسی بوون و هەتا ساڵی ١٩٢١ زاینیش زمانی خوێندن لەوێ فارسی بوو، تەنانەت کتێبی فارسی لە قوتابخانە دەوڵەتییەکانیش دەگوترایەوە وەك (میزان ئەلتەعلیمی) شێخ عەبدولکەریم بوشەهریو هتد... لەو ساڵییەوە

هەولێر، کتێبە فارسییەکانی وەك، (نساب ئەلعوبیان و کولیاتی سەعدی و دیوانی حافز و خەمسەی نیزامی)و کتێبەکانی جامی و نانو هەڵدانی شێخ بەهایی و هتد دەخوێندران."[١٤]

خەباتگێڕی سیاسی کورد، عەبدوڵلا ئەحمەد ڕەسول پشدەری، ئاماژە بەو ڕاستییە دەکات کە دایك و باوکی ئاشنای زمانی فارسی بوونە و خۆشی لە تەمەنی منداڵیدا، جیا لە کتێبە ئایینییەکان، کتێبە فارسییەکانی گوڵستان و بوستانی سەعدی وەك ماددەی دەرسی خوێندەوەو هەروەها دەڵێ: "لەو کاتدا (کوردستانی عیراق) تەنیا زمانی فارسی لە نێو کوردەکاندا پەرەیستاند بوو و ئەگەر کەسێکی زمانی فارسی باش زانیبایە ئەوا نازناوی میرزایان لێ دەنا کە بەواتای دوکتۆر یان مامۆستا (لەئەدەبیات دا) بوو، لەو کاتدا بەو شێوەیە بوو."[١٥]

تەنانەت ناسیۆنالیستە کوردەکان کە دەمارگرژییەکی توندیان بەنیسبەت زمانی کوردی نیشان دەدا و ئەویان بەکۆڵەکەیەکی پتەوی نەتەوایەتیی کوردەکان و هەروەها بەجیاکەرەوەی ئەوان لەگەڵ فارس، تورك و عەرەبەکان دەزانی، تا رادەیەك گرینگیان دەدا بەزمانی فارسی و هێشتاش تامەزرۆی ئەو زمانە بوون. بۆ نموونە لە سەردەمی حوکمڕانی شێخ مەحموود لە شاری سلێمانی ڕۆژنامەیەك بەناوی "بانگی کوردستان" لە ساڵی (١٩٢٢) دەردەچوو کە مستەفا پاشا یامولکی سەرنووسەری ئەو ڕۆژنامەیە بوو، سەرەرای ئەوەی زمان حاڵی حکوومەتی شێخ مەحموود بوو، بەڵام هێشتا چەند بەشێکی بەزمانی فارسی دەردەچوو.[١٦]

ئەو بابەتە نیشان دەدا کە لەو ساڵانەدا زۆربەی خەڵکی سلێمانی، ئاشنای زمانی فارسی بوونەو لەوەش زیاتر هۆگری و ئینتیمای فێربوون و بەکارهێنانی ئەو زمانەیان هەبووە. بەڕاستی ئارەزووو حەزی کوردەکانی عێراق بۆ زمانی فارسی، بێ ئەوەی حکوومەتی ئێران لە دروستکردنی ئەو حەزەدا ڕۆڵێکی نواندبێ دەیتوانی یارمەتیدەری دەسترۆیی زیاتری ئێران لە عێراق بێت و بەسەرنج راکێشان و بەدەست هێنانی دڵی کوردەکان، ئەوان کران بەهاوپەیمانی سروشتی ئێران، بەڵام حکوومەتی ڕەزا شا نەتەنیا هیچ ئینتیمایەکی بۆ نزیکبوونەوە لە کوردەکانی عێراق و تورکیە نیشان نەدا، بەڵکو بەگرتنە پێشی سیاسەتی نادروست و نالۆژیکی کوردەکانی ئێرانیشی لە خۆی دوور کردەوە.

ڕەزا شا پاش گەڕانەوە لە سەفەرەکەی خۆی بۆ تورکیە لە ساڵی (١٣١٣ ك.ش) ١٩٣٤ز لەژێر کاریگەری سیاسەتەکانی (مستەفا کەماڵ) دا، بڕیاریدا کە لەمەبەدواوە هەموو گەلانی ئێرانیو لە ناویشیاندا کوردەکان مافی خوێندن و نووسین بەزمانی زگماکی خۆیان نییە. کەریمی

حیسامی لە بارەی هەوڵەکانی دەوڵەت بۆ یاساغکردنی کەڵك وەرگرتن لە زمانی کوردی لە کوردستاندا دەنووسێ: "... نووسین و خوێندنەوەی زمانی کوردی یاساغ لە قەڵەم دراو تەنانەت بڕیاردرا ئیدارەکان بەم زمانە گفتوگۆ نەکەن. لەسەر دەرگای ئیدارەکان نووسرا بوو: قسەکردن جیا بەفارسی قەدەغەیە."[17]

سیاسەتی حکوومەتی پەهلەوی بەنیسبەت خەڵکی کوردەوە بەدوو قۆناغ تێدەپەڕیّ و لەهەر کام لەو قۆناغانەدا بەدوای ئامانجگەلێکی تایبەتدا دەگەڕان گرینگترینیان بریتینە لە:

قۆناغی یەکەم: پێك هاتبوو لە نەهێشتنی هۆزگەرایی، لە ناوبردنی گرووپی چەکداری عەشیرەتەکان، بڵاوکردنەوەی دەسترۆیی دەوڵەتی ناوەندی هەتا سنوورەکان، دامەزراندی ئیداراتی تۆمارکردنی بەڵگەنامە و موڵکەکان، دارایی، دادوەری و ناوەندەکانی ڕاهێنان و سەربازی بوون ئەو ئامانجانەی کە لە ناوچە کوردنشینەکان دەیانبردە پێش هەمان ئەو ئامانجانەشیان بۆ ناوچەکانی دیکە پێشبینی دەکرد.

بەڵام قۆناغی دووەم: تایبەت بوو بەقەدەغەکردنی کەڵك وەرگرتن لە زمانی کوردی و هەروەها دانەمەزراندنی کارمەندە خۆجێییەکان لە کوردستاندا.

هاندەری هەنگاوەکانی یەکەم، لە قۆناغی یەکەمدا کە بەهیچ شێوەیەك تایبەت بەکوردستان نەبوو، بەڵکو لە سەرانسەری وڵاتدا، پراکتیك کراو لە بەرژەوەندی گشتی وڵات، بەجێ گەیاندنی هەندێك لە دروشمەکانی دەستووری وەك ناوەندگەرایی و مۆدێرنبوون و پێویستی بەبەرگریکردن لەدژی پڕۆپاگەندەی سۆڤیەت و بەلشەڤیکی سەرچاوەی دەگرت، بەڵام هەوڵەکانی قۆناغی دووەم بەتەواوەتی بۆ بەرگریکردن بوو بەدژی دەسترۆیی ناسیۆنالیزمی سیاسی کوردەکان لەو دیوی سنوور و زیاتر حاڵەتی پێشگرتنی هەبوو. دوکتۆر عەباس وەلی لەسەر ئەو باوەڕەیە کە مەبەستی ڕەزا شا لە قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمانی ناوچەیی، پێك هێنانی شوناسێکی یەکپارچە بوو بۆ خەڵکی ئێران، کە دەبوایە ڕواڵەتێکی ئەورووپایی و ڕۆژئاوایی هەبوایە بەو شێوەیە جۆراوجۆری کولتوری و جیاوازییە نەتەوەییەکان بەهیچ شێوەیەك لەبەرچاو نەدەگیران.[18]

یاسای بنەڕەتی (دەستوور) زۆر زووتر لە دەسەڵاتداریەتی ڕەزا خان ڕایگەیاند بوو کە زمانی فارسی، زمانی ڕەسمی وڵاتە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك نەببووە هۆی ناڕەزایەتی کورد و نەتەوەکانی دیکە لەو سەردەمیدا. لەوکاتیدا مەسەلەی قەدەغەکردنی زمانی گەلانی نافارس

باس نەکراو ئەوەش بەو مانایەیە کە مەشروتەخوازان و یاسادانەری دەستووریی هیچ حەزیان لێ نەبوو رەسمیبوونی زمانی فارسی ببێتە هۆی لە ناوچوونی زمانە ناوچەییەکان و هەروەها نوێخوازی لە وڵاتدا ببێتە هۆی لە ناوچوونی کولتووری گەلانی دیکەی ئێرانی، لە واقیعدا ئەو هەنگاوانەی ڕەزا خان بە پێشێلکردنی ناوەڕۆك و ئاماژەکانی دەستوور دەژمێردراو بەڕوونی بەدیار دەکەوت کە زەمینە بۆ ناسیۆنالیزمی کورد لە ئێراندا دەرەخسێنێت ئەو یەکتر قەبووڵ کردنەی کە لە لایەن مەشروتیەتەوە پێك هاتبوو لەناوچوو.

کوردەکانی ئێران بەگشتی لەو گۆڕانکارییانەی لە ناوچە کوردنشینەکانی تورکیە و عێراق رووی دەدا دوورە پەرێزبوون، بەڵام جۆرێك هەستیاربوونی لەو دیوی سنوور بەنیسبەت چارەنووسی کوردەکانی دیکە هەبوو. یەحیا سادق وەزیری دەڵێ کاتێك لەساڵی (١٣٠١ ك. ش) ١٩٢٢ز شۆڕشی شێخ مەحموود لەئەوپەڕی لووتکەی خۆی دابوو، کوردەکانی سنە نوێنەرێکیان بۆ لای ئەو بۆ عێراق نارد هەتا تاوتوێی پێگەی ئەو بکەن، بەڵام ئەو لە رووی ئەزموونی سیاسی و هێزی رێکخستن، شێخی زۆر بەجیدی و کاریگەر نەزانی. هەروەها لە ماوەی ساڵەکانی (١٩٣٠ هەتا ١٩٣٧ز) تاقمێکی بچووك لە پیاوانی ئایینی کورد لە ناوچەکانی موکریان چالاکیان دەنواند کە "پەیوەندیان لەگەڵ شۆڕشی ئارارات و رێکخراوی خۆیبوون هەبوو و جارجاریش لەگەڵ کوردستانی عێراق پەیوەندیان دروست دەکرد."[١٩]

ئەندامانی سەرەکی ئەو تاقمە بچووکە بریتی بوون لە قازی محەممەد، شێخ ئەحمەدی سریلاوا، قازی کاك محەممەد بۆکانی ( محەممەد سادق قزلجی)و مەلا ئەحمەد فۆزی.

هیچ دوور نییە ئەو یارمەتییە بەئەژمارانەی کە عەشیرەتەکانی جەلالی و خلیکانلو و بەشۆڕشگێڕانی ئاراراتیان دەکرد لە ئاکامی هاندانی ئەو تاقمە بوو بێ، بەڵام هیچ جۆرە دیکۆمێنت و بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی ئەو بانگەشەیە لە دەستدانییە، ڕژیمی پەهلەوی بەهۆی ڕاپەڕینی شێخ مەحموودی بەرزەنجی لە عێراق و شۆڕشی ئارارات لە تورکیە و هەروەها دروستبوونی رێکخراوی خۆیبوون و هیوا لەو وڵاتەدا تووشی نیگەرانییەکی زۆر ببوو و لەوە دەترسا کە بیروبۆچوونی کوردەکانی ئەو دیوی سنوور ببێتە هۆی بزاوتنی هاوزمانانی خۆیان لە ناوخۆی ئێرانداو یەکپارچەیی ئەرزی ئێران بکەوێتە مەترسییەوە، لە کاتێکدا هیچ پاساوێك بۆ ئەو نیگەرانییە نەبوو، چونکە لە کاتی ئەگەری پێکهاتنی دەوڵەتێکی بچووکی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی تورکیە، ئەو دەوڵەتە گریمانەییە بێگومان دەکەوێتە بەر هەڕەشەی تورکیە و هەر

بۆیە ئیمکانی نزیك بوون و تەنانەت پێوەلکانی بەئێرانەوەش لەئارادا دەبوو و هەر بەو رادەیەش لێبوونەوەی کوردستانی ئێران کەمتر دەبۆوە.

ئەگەر ئێران یارمەتی کوردەکانی ئەو دیوی سنووری دابوایە ئەوا هەستی هاودەردی و وەفاداری کوردەکانی ئێرانیش بەنیسبەت دەوڵەتی ئێران سەری هەڵدەداو هەلومەرجێك دەهاتە پێشی وەك نموونەی مێژوویی ئەوکات کە شا پشتیوانی لە مەلا مستەفا بارزانی کرد لەبەرانبەر سوپای بەعسی عێراقیدا. کریس کۆچێرا هەڵوێستی کوردەکانی ئێرانی بەنیسبەت یارمەتییەکانی شا بۆ مەلا مستەفا بەو جۆرە باس دەکات: "لە ئێراندا سیاسەتی شا، دەنگدانەوەیەکی گەورەی پەیدا کردووە، گوندنشینە کوردەکان لەو یەکەم کەسانە بوونە کە ستایشی هەڵوێست و ڕەفتاری شایان دەکرد بەنیسبەت کوردەکانی عێراق. یەکێك لە گوندنشینەکانی، سەر سنووری ئێران لە شویاتی ساڵی ١٩٧٥دا گوتی: "پێشتر ئێمە و بەتایبەتی خەڵکی مەهاباد، لە هیچ کردەوەیەك بۆ پێکهێنانی گرفت بۆ حکوومەتی شا، درێغیمان نەدەکرد، بەڵام لەو کاتەوە کە یارمەتی بارزانی دەدات مەسەلەکە جیاوازە" هەروەها دەڵێ: "تەنانەت بنەماڵەی قازی محەممەد گوتویانە: "بەدیتنی ئەو کارانەی کە لە بەرانبەر مافی پەناهەندەکاندا دەیکات (مەبەست شایە) ئێمە لە مافەکانی خۆمان خۆش دەبین کە شا بەدژی ئەو بنەماڵەیە کردوویەتی" وەکو دیار بوو تا ڕادەیەك ژێر پێی ڕێبەرانی کوردی ئێرانی بەتاڵ دەبوو."[٢٠]

تەنانەت لەدەستپێکی حکوومەتی ڕەزا شاوە، کەسانێك هەبوون کە دەرك و تێگەیشتنێکی دروستیان لە مەسەلەی کورد هەبوو و ئاگاداری ئەو ڕۆڵە گرینگە بوون کە دەبێ ئێران بیگێڕێت، یەکێك لەو کەسانە دوکتۆر مەحموود ئەفشار یەزدی بووە، ئەو لە یەکێك لە وتارەکانی خۆیدا ئاماژە بەو ڕاستییە دەدات کە سەربەخۆیی کوردستانی عوسمانی نەتەنیا هیچ زەرەرو زیانێکی بۆ ئێران نییە، بەڵکو تەنانەت دامەزراندنی دەوڵەتێکی بچووکی ئێرانیڕەگەز کە وەك بەربەستێك لە نێوان ئێران و تورکیە بێت، دەتوانی پێش لە پەرەستاندی مەترسی زەرد (ڕەگەزی زەرد) یان تورانیزمی تورکەکان بۆ لای ڕۆژهەڵات بگرێ.[٢١] تەنانەت کوردەکانی دەرەوەی ئێرانیش هەموو کات چاوی هیوایان لەو یارمەتیانەی ئێران بوو بۆ پشتگیری کردن لەوان لەبەرابەر مەترسی ڕەگەزی سامی و تورکدا. سەرهەنگ مسەوەر ڕەحمانی کارمەندی سەربازی ئێران لە بەغدا، لەساڵی (١٣٣١ ك.ش) ١٩٥٢ز کە لە سەردەمی حکوومەتی (دوکتۆر موسەدەق)دا هەوڵی پوچەڵکردنەوەی پیلانی ئینگلیزەکانی دەدا بەدژی بە

خۆماڵیکردنی نەوت، لە ڕێگەی سنوورەکانی ئێرانەوە هەوڵی دەدا پێش لە جوولانەوەی حەمە رەشید (بانە) بەکرێگیراوی بەریتانیا بەدژی ئێران بگرێ، باس لە چاوپێکەوتنی خۆی لەگەڵ شێخ مەحموود دەکا کە لەودا بەو شێوەیە شێخ رەخنە لە سیاسەتی ئێران دەگرێت: "واپێ دەچێ ئێرانییەکان سەرەداویان ون کردبێتو لە ڕێگایەکی هەڵەوە چاو لە مەسەلەکە دەکەن، چونکە لە بنەڕەتدا کوردەکان لەگەڵ ئێرانییەکان هاونژادن و ئینتمایەکی زاتیان بۆ هاوکاری کردن لەگەڵ ئێراندا هەیە، هەر بۆیە ئێران ئیمکاناتی زۆرتری بۆ راکێشانی هاوکاری کوردەکان بۆ پێشکەوتنی سیاسەتی میللی خۆی لە دژی دوژمنەکانی لەدەستدایە هەتا دەوڵەتەکانی دیکە. ئێستاکە ئەگەر دەوڵەتی ئێران لەگەڵ نەتەوەیەك کە لە بنچینەدا ئینتمای هاوکاری هەیە، تووشی ساردی و نێوان ناخۆشی بێ، ئەوشتە جیا بەلاوازی سیاسی و بێئاگایی زیاتر ناتوانین بەشتێکی دیکەی ناوبنێین. پرسیارێك کە بەردەوام دەبێ لە ئێراندا باسی لێ بکرێت ئەوەیە کە بۆچی دەبێ دەوڵەتی ئێران لە ئیمکانی هاندانی کورد لە لایەن بێگانەکانەوە بەدژی خۆی نیگەران بێ؟ ئەوە لە کاتێکدایە ئەگەر ئێران دەستپێشخەری بکات و بۆ نموونە، کوردە نارازییەکانی عێراق بەدژی عێراق بەهێز بکات، ئەوا دەوڵەتی عێراق تووشی نیگەرانیگەلێك زیاتر لەوە دەکات کە خۆیان لەگەڵێ ڕووبەڕووبوونە، ئەوکات ئەوە عێراقییەکان دەبن کە بۆ دامرکاندنەوەی ئاژاوەکە داوا دەکەن کە نییەتی باشی خۆیان نیشان بدەن نەوەك بەپێچەوانەوە."(٢٢)

بەڵام رژێمی ڕەزا خان بێ لەبەرچاوگرتنی بەژەوەندییە بان سنوورییەکانی ئێران، نەتەنیا هیچ یارمەتی کوردەکانی نەداوە بەو جۆرەی کە دوکتۆر ئەفشار دەڵێ کە بنەمای (ئێرەدێنتیسم) (Irredentism) یان پێوەلکاندن کە دەکرا لە بابەت ڕۆژهەڵاتی تورکیە و عێراقەوە کارایی هەبێ (چونکە ئەو ناوچانە پێش لەکۆچکردنی رەگەزەکانی عەرەب و تورك و تەنانەت دوای ئەوانیش لە سەردەمە جیاوازەکاندا بەشێك لە ئیمپراتۆریای ئێرانی گەورە بوو" باسی لێوە نەکرد.(٢٣) بەڵکو بە ئاوەڵەکردنی دەستی تورکەکان بۆ سەرکوتی شۆڕشی ئارارات و یارمەتیدان بە مستەفا کەمال قەسابی کوردەکان، لەواقیعدا هەڵەیەکی گەورەی مێژوویی کرد کە پاشان کوڕەکەشی محەممەد ڕەزا لە بابەت کوردەکانی عێراق، واتە دانیشتووانی ولاتێك کە شارستانییەتەکەی ڕەنگو بۆنی ئێرانی هەیە، ئەو هەڵەیەی دووبارە کردەوە. یەکەمین دەرەنجامی ئەو هەڵانەی ڕەزا شا، یان بەو جۆرەی کە شێخ مەحموود دەڵێ، لاوازی سیاسیی ئەو بەنیسبەت کوردەکان، دڵرەنجانی توندی کوردەکانی ناوخۆی ئێران بوو کە پاشان بەهۆی گوشار

و قەدەکردنی زمان و فەرهەنگی کوردی زیاتر تەشەنەی کردو لە ئاکامدا بە شێوەی کۆماری مەهاباد سەری وەدەرنا، هەڵچوونێك کە سیاسەتمەداری سەردەمی پەهلەوی و کەسێك کە لە نزیکەوە ئاشنایەتی لەگەڵ مەسەلەی کورددا هەبوو، واتە (ئیعتلا و ئەملەلك خەلعتەبری)، ئیمکانی روودانی ئەو هەڵچوونەی بەدوور نەزانیبوو ئەگەر هیچ چاکسازییەك جێبەجێ نەکرابایە و کەلوپەلی راحەتی و ئاسایشی ژیانی کوردەکان پێك نەهاتبایە، هەروەها دەڵێ ئەگەر کوردەکان تووشی ناهومێدی بن ئەوا بۆ لای پڕۆپاگەندەی رێکخراوە کوردییەکانی ئەو دیوی سنوور رادەکێشرێن، بەڵام ئەگەر چاکسازی روویدات، ئەوکات پڕۆپاگەندەی کوردەکانی ئەو دیوی سنوور بێ ئاکام دەبێ و تەنانەت کوردەکانی (بەین ئەلنەهرەین)یش سەرنجیان بۆ لای ئێران وەردەگێڕنەوە.[٢٤]

هەر بۆیە ناتوانرێت بگوترێ کەسیاسەتی رژێمی پەهلەوی بەنیسبەت کوردەکان هیچ جۆرە نارەزاییەتێکی لە نێوان ئێرانییەکان نەبووە، چونکە کەسانێکی وەك دوکتۆر (ئەفشار و ئیعتلاو ئەملەلك خەلعتەبری) تەنیا رێگای چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لە ئێرانیان بەئەنجامدانی چاکسازی واقعیی و باشکردنی ئاستی ژیانی کوردەکان و هەروەها بەیارمەتیدانی کوردەکانی تورکیە و عێراق دەزانی و پاشانیش ئاراستەی رووداوەکان نیشانیدا کە ئەوان لەسەر راستی بوونە. لە کۆبەندێکی گشتیدا دەتوانین بڵێین، قەدەغەکردنی زمانی کوردی، سەپاندنی جلوبەرگی ئەوروپایی بەسەر کوردەکاندا، دوورخستنەوەو بەندکردنی کەسایەتییە دیارو هەروەها سەرۆك عەشیرەکانی کورد، دانانی کارمەندە ناکوردەکان و گوشاری سوپاییەکان و ژاندەرمەکانی ڕەزا خان بەسەر دانیشتوانی کوردستان، هەموویان بەو واتایە بوون کە ڕژێمی پەهلەوی دژایەتی ئازادی هەڵسوکەوت و زمان، دابونەریتی کوردەکان دەکا، ئەو شەڕانگیزییە بێهۆیە و گوێ نەدان و بەهیچ نەزانینە بێ هۆیانە لە بابەت زمان و کولتووری یەکێك لە گەلانی ئێرانی، نەتەوەی کوردی بەتەواوەتی لە حکوومەتی پەهلەوی دوور کردەوە. حکوومەتی ڕەزا خان تەناتەت کەرەستەی پێویستیشی بۆ فێرکردنی زمانی فارسی بۆ کوردەکان دەستەبەرنەکرد بوو، لە کاتێکدا، دوا قوتابخانە دواناوەندییەکانی کوردستان هەتا پێش پوشپەڕی بیست (١٣٢٠ ك.ش) ١٩٤١ز نەدەگەیشتە پێنج یان شەش دانە، ئەوەش لە کاتێکدابوو کە پێی دادەگرت نابێ کەس کەڵك لە زمانی کوردی وەربگرێت.[٢٥]

ئەوە راستە کە ڕەزا شا، هەروەك ئەتاتورك سەدان هەزار کوردی بەبۆمبا و گازی کیمیاویو چەکی میکرۆبی جینۆساید نەکردووە، وەکو ئەو هەوڵی نەداوە کوردەکان بکات بە "تورکی

کێوی"و هەوڵی ئەوەی نەداوە لە خەڵکی مەهاباد و هەورامان فارسی کێوی دروست بکا، بەڵام ئاکامی کارکرد و هەڵسوکەوتی ئەویش لەگەڵ دەرەنجامی هەوڵەکانی ئەتاتورك و ناسیۆنالیستە تورکەکان هەریەك شت بوو، ئەویش دروستبوونی چەوساندنەوەی نەتەوایەتی بوو. مەبەست لەوەها گوشارێك لەناوبردنی شوناسی میللی و نەتەوەیی تاقمێك لە خەڵك کە لە چوارچێوەی وڵاتێکدا لە لایەنی رەگەزی، زمانی و مەزهەبی و کولتووری بەکەمینەیەکی جیاواز دادەنرێت.

ڕژیمی پەهلەوی بەو سیاسەتە هەڵانەی خۆی، ئەو هەستەی لە ناو هەندێك لە کوردەکان، بەتایبەتی پیاوانی ئایینی باکووری کوردستان، دروستکرد کە گەلی کورد تووشی چەوساندنەوەیەك هاتووە کە لە لایەن فارسی زمانەکانەوە بەسەریاندا سەپاوەو بەدڵنیاییەوە ئەو هەستە بەدوور لە چاوە وردبینەکانی دراوسێ بەهێزەکانی وەك یەکێتی سۆڤیەت و ڕێکخراوە سیاسییە کوردەکان لە عێراق و تورکیە دا، نەمایەوە ئەو هێزانە هەوڵیان دا ئەو قەیرانەی لە ناو کوردەکانی دانیشتووی باکووری کوردستان (مەبەست موکریان و سەرەوەیە) رووی داوە بۆ مەبەستی بەرژەوەندی خۆیانی راکێشن. بێ ئەوەی کە ویستبێتمان بەرگری لە کارکردی ڕەزا خان بکەین و هەروەها لە بابەت بەکارهێنانی سیاسەتی خەراپ بەنیسبەت کوردەکان، بێتاوانی لە قەڵەم بدەین، دەبێ هاندانەکانی یەکیەتی سۆڤیەت پاش خیانەتەکانی ڕژیمی پەهلەوی بەهۆکارێکی گرینگی دیکە دابنێین لە هۆشیاربوونەوەو جووڵانەوەی کوردەکانی ئێراندا. سیخوڕی پایەبەرزو گرینگی رووس بەناوی (ژرژئاقابکۆف) کە لە دەیەی سی زاینی بۆ ڕۆژئاوا هەڵات و نهێنییەکانی ڕێکخراوی،( گ. پ. ئو)، یان (پاشان بوویە، کا. گ. ب.) بڵاوکردەوە لە بارەی شێوەی تێڕوانینی سۆڤیەت بۆ مەسەلەی کورد لە ماوەی دوو شەڕی جیهانیدا دەنوسێ: "... دەوڵەتی سۆڤیەت لە سەرەتای ساڵی (١٩٢٧) دا، هەوڵی دا لە ناوچە بچووکە کوردنشینەکەی ناو خاکی خۆیدا یەك "کۆماری سەربەخۆی کوردی" دامەزرێنێت هەتا بەو هۆیەوە بەراکێشانی کوردەکانی ناو وڵاتانی دراوسێی بۆ لای خۆی و هاندانی هەستی ئەو کەسانەی کە چەندە ساڵە خوازیاری "کوردستانێکی سەربەخۆنە" بتوانێت هەموو ناوچە کوردنشینەکانی کە لە سەراسەری وڵاتانی وەك ئێران و عێراق و تورکیە دانە بە خاکی خۆیەوە بلکێنێ."(٢٦)

(ئاقابکۆف) پاشان بە ئاماژەکردن بەو واقعیەتەی کە وەزارەتی دەرەوەی رووسیە لە دژکردەوەی دەوڵەتەکانی تورکیە و ئێران نیگەران بوو ئەگەر ئەو شتە وەڕاست بگەڕێت، هەر بۆیە دەڵێت

که ڕێکخراوی (گ. پ. ئو)، بڕیاری دا بە یارمەتی تۆڕێك لە سیخوڕەکانی خۆی دەست بە پڕۆپاگەندە لەناو کوردەکاندا بکات و لەگەڵ سەرۆك عەشیرەکان، ڕێکەوتنێکی نهێنی ببەستێت (ئاقابکۆف) دەنووسێ کە بۆ "جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی خاڵەکان ئەمن فەرمانم بە میناسیان (یەکێك لە سیخورەکانی سۆڤیەت لە ئێران)دا، کە یەکەم هەنگاو بۆ دانانی تۆڕێکی سیخوڕی لە ناو کوردەکان بهاوێژێت و شاری سابلاغم (مەهابادی ئێستا) وەك یەکەم ناوەندی ئەو عەمەلیاتە (پڕۆژە) هەڵبژارد."(٢٧)

لە ساڵەکانی داگیرکردنی ئازەربایجان ئەو جۆرە چالاکیانە زۆر بەخێرایی لە لایەن دەزگای سیخوڕی سۆڤیەتەوە کاریان بۆ دەکراو ئاکامەکەشی لە شێوەی یارمەتیدان بەکۆمەڵەی (ژ. ك )دا دەردەکەوت، بەهەرحاڵ ڕژێمی ڕەزا شا بۆ ڕاکێشانی بۆچوون و سۆزی نەتەوەی کورد بۆ لای خۆی سەرکەتوو نەبوو تۆوی دژایەتی و ناڕازی بوون لە دەوڵەتی ناوەندی لە هزری ئەواندا بلاوکردەوە، کە ئەو ناڕەزایەتییە، زۆر بەزوویی بوو بەنەفرەت و بێزاری لە دەوڵەت. ئەو بێزارییە بە شێوەیەکی قوڵ لە شیعرەکانی میرزا حەسەنی موکری ناسراو بە (سەیفوالقوزات)، قازی مەهاباد و مامی (قازی محەممەد) دا ڕەنگی داوەتەوە کە دەڵێت:

"قەدەغەکردنی زمانی زگماکی بۆچی؟

ئەو هەموو ستەم و دوورکەوتنەوەو جیابوونەوەو زوڵمە بۆچی؟

لە ناو عەجەمەکاندا (شیعەکان) دەبنە دیل و کۆیلە

هەورامییەکان و مەهابادییەکان و خێڵی جەلالی

هەندێك لەوان بۆ ئەراك و سمنان و دامغان بەڕێ دەکەن

دەستەیەکیش دەنێرنە شارەکەی شێخ سەعدی

هەر کوردێك کە ناسراو و عاقڵ و جێگەی بڕوایە

یان ئەوتا ئاوارەکراوە لە وڵات یان بێتاوان لە بەندیخانەیە

دەچیە ماڵی هەر کوردێك دەنگی شیوەن و گریان دێ

لەو ڕۆژگارەدا کە لە هەموو گوندێك شادی و خۆشی هەیە"

# دەرەنجام

ڕژێمی پەهلەوی، بە پشتبەستن بەهێزی بێگانە و وەك وەڵامدەری دوو گرفتی بنەڕەتی لە
ئاستی گۆڕەپانۆی سیاسیدا، دەرکەوت کە بریتی بوون لە:

١ـ پێشگرتن لە بەلشەڤیزمی ڕووسی.

٢ـ چارەسەرکردنی قەیرانی هەمەلایەنە لە ناوخۆی وڵاتدا.

دروشمە نوێخوازەکانی تیۆریسێنەکانی ڕژێمی پەهلەوی هەمان ئەو دروشمانە بوون کە لە شۆڕشی
دەستووریدا بە ئەنجام نەگەیشتبوون، کە وردە وردە شێوەیەکی زیادەڕەویانەی بەخۆوە گرتبوو و
شێوەی جێبەجێکردنیشی لەگەڵ پێگەیشتوویی، توندڕەوی و گەندەڵییەك هاوتەریب ببوو کە بۆ
یەکەم جار کۆمەڵگای ئێرانی لەگەڵ مەترسی لاوازی یەکیەتی میللی ڕووبەڕوو کرد.
حکومەتی قاجار، سەرەڕای ئەوەی کە دژی گۆڕانکاری و بەرەوپێشەوەچوونی قووڵ لە ئێراندا
بوو، بەڵام توانی یەکیەتی میللی وڵات بە پشتبەستن بەرێبازە نەریتییەکان بپارێزێ.

بەڵام حکوومەتی پەهلەوی سەرەڕای لە دەستدابوونی هێزی پسپۆڕی زیاتر و ئیمکاناتی دارایی
زیاتر، نەتەنیا ناسیۆنالیزمی ریشەداکوتاوی ئێرانی کە دەرەنجامی شۆڕشی دەستووری بوو
هەموو گەلانی ئێرانی و لەو نێوەشدا، کوردەکانیش وەفاداری خۆیان بۆ (ئەو ناسیۆنالیزمە)
نیشان دابوو، بەتەواوەتی لاواز کرد، بەڵکو بۆ پێکهێنانی کولتوورێکی نوێی ئێرانی کە دوو
ڕەگەزی باستانگەرایی (کولتووری کۆنی ئێرانی)و ڕۆژئاوایی بوون لەودا زۆر بەزەقی بە
دیاردەکەوت، هەستا بە لە ناوبردنی کولتووری ئیسلامی و هەوەها کولتووری گەلانی دیکەی
ئێرانی کە فارس نەبوون. ڕەزا شا بەتایبەت لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کوردەکاندا، لاسایی
تورکیەی کەمالی دەکردەوەو لە ڕواڵەتدا گۆشەنیگایەکیشی لە شوێنگەی ئێران و ئەو
مەترسییە هەبوو کە کوردەکانی (بەین ئەلنەهرەین)و تورکیە کە دەیانتوانی بۆ ئاسایشی ئەو
دروستی بکەن، بەڵام گرینگی بەو واقعیەتە نەدا کە جۆری خۆبەستنەوەو پەیوەندی کوردەکان
لەگەڵ دەوڵەت و کۆمەڵگای ئێرانی زۆر پتەوترە لە بنەماکانی پەیوەندی کوردەکان لەگەڵ تورك
و عەرەبەکاندا.

سەپاندنی بەرنامە و ئامانجگەلێکی وەك نیشتەجێکردنی بەزۆری عەشیرەتەکان، گرتنی سەربازی بەزۆرەملێ، یاساغکردنی جلوبەرگی نەریتی، لابردنی حیجابی ژنان، داماڵینی چەك، یاساغکردنی هەموو زمانەکانی جیا لە فارسی، هەوڵدانێك بوو کە ڕەزا شا بەئەنجامدانی ئەوان، ناسیۆنالیزمی راستەقینەی ئێرانی لاواز کردو ناسیۆنالیزمی تایبەت بە پەهلەوییەکانی بەهێز کرد کە هیچ جۆرە هاوبەشییەکی گشتی تێدا نەبوو.

لە ئاکامی ئەو کارانەی حکومەتی پەهلەوی، هەستیارترین بەشی کوردستان، واتە کوردستانی باکوور، بوو بەشوێنەگەیەکی باش بۆ گەشەکردنی ناسیۆنالیزم و چەوساندنەوەی میللی، کە لە سەردەمی قاجارەکاندا نەبوو، لەو سەردەمەدا پێکهات و خودئاگایی لە نێوان کوردەکانی ئێراندا بەهێز کرد. هەرچەندە چەوساندنەوەی میللی پیادەکراو بەسەر کوردەکاندا لایەن ڕەزا شاوە، بەهیچ شێوەیەك لە لایەنی توندی و قووڵایی لەگەڵ نموونەی هاوشێوەی ئەوان لە تورکیەی کەمالیدا بەراود ناکرێ، بەڵام ئاکامی ئەو کاتی دەرکەوتنی قەیرانی ئازەربایجان، بە شێوەی ئارەزووی زۆر جیدی بەشێك لە رۆشنبیرانی کورد بۆ دروستکردنی وڵاتێکی کوردی سەربەخۆ دەرکەوت و بوو بەهۆکاری بنەڕەتی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کورد لە ئێراندا.

# پەراوێزەکان

## بەندی یەکەم:

١ـ تاريخ مختصر احزاب سياسى ايران، ملك الشعراى بهار، ٢جلد، ج ١ (تهران، اميركبير، ١٣٧١) ص ٢٦٦.

٢ـ همان مأخذ ـ ص ٢٦٦.

٣ـ تاريخ روابط سياسى ايران و انگليس در دوره رضاشاه، نوشتەو على اصغر زرگر، ترجمەو كاوه بيات (تهران، انتشارات پروين و انتشارات معين، ١٣٧١) صص ٩٦ و ٩٥.

٤ـ تاريخ مردوخ يا تاريخ كرد و كردستان، شيخ محمد مردوخ كردستانى ـ ٢جلد، چاپ ٢، ج ٢ (سنندج، انتشارات كتابفروشى غريقى، ١٣٥١) ص ٣٨٠.

٥ـ تاريخ روابط سياسى ايران و انگليس در دوره رضاشاه، صص ١٦٨ ـ ١٦٠.

6- Kurds, ARFA, Hassan – a historical amd political study (london, New York, Oxford, university – 1986) P64 .

٧ـ تاريخ روابط ايران و انگليس در دوره رضاشاه ـ صص ١٧١ ـ ١٧٠.

8- The conflict of tribes and state in IRAN and AFGHANISTAN, edited by RICHARD.L.Tapper (London, Croom Helm, 1983) chapter of Kurdish tribes and the state of IRAN, the case Simko's revolt, Van Bruinessen Martin, P 388.

9- ARFA, op.cit, P64 .

١٠ـ استقرار ديكتاتورى رضاخان در ايران ـ نوشته ا.س.مكيلف، ترجمەو سيروس ايزدى (تهران، كتابهاى جيبى ١٣٥٨) صص ٩٥ و ٩٤.

١١ـ تاريخ روابط سياسى ايران و انگليس در دوره رضاشاه ـ صص ١٧٩ ـ ١٧١.

12- ARFA, op.cit, P66 .

## بەندی دووهەم:


١ـ تاريخ روابط سياسى ايران و انگليس در دوره رضاشاه ـ ص ١٣٤.

٢ـ مصاحبه با يحيى صادق وزيرى، دى‌ماه ١٣٧٤.

٣ـ تاريخ مردوخ ـ ج ٢ ـ صص ٤٢٧ ـ ٣٢٠.

٤ـ درباره مبارزات كردستان ـ حميد مؤمنى (تهران، شباهنگ، ١٣٥٨) صص ٢٧ و ٢٦.

٥ـ بازيگرى عصر طلايى، ابراهيم خواجه نورى (تهران، جاويدان، ١٣٥٧) ص ١٢٥.

٦ـ تاريخ مردوخ ـ ج ١ ـ صص ٧٨ ـ ٧٤.

٧ـ درباره مبارزات كردستان ـ ص ٢٦.

٨ـ مصاحبه با يحيى صادق وزيرى ـ دى‌ماه ١٣٧٤.

٩ـ علل سقوط حكومت رضاشاه ـ نوشتەو نعمت الله قاضى (شكيب) (تهران، آثار، ١٣٧٢) ص ١٧٢.

١٠ـ تاريخ بيدارى ايران، حبيب الله مختارى (مختار السلطنه) (تهران، چاپخانه دانشگاه، ١٣٢٦) ص ٥٥٦.

11- The Modernization of IRAN 1921 – 1941, AMIN BANANI (Stnaford university press, California printed, 1969) P121 .

١٢ـ رستاخيز ايران، مدارك، مقالات و نگارشات خارجى ١٢٩٩ ـ ١٣٢٣، گرد آورنده فتح الله نورى اسفنديارى (تهران، بى نا، بى نا) صص ١١٠ ـ ١٠٩ـ مقالەو ميرزا فيروزخان در روزنامەو Near East در هيجدهم دسامبر ١٩٢٤.

١٣ـ يادداشتەكانم، عبدالله احمد رەسولى پشدەرى، ج ١ (بەغدا، وەزارەتى رۆشنبيرى‌و راگەياندن ١٩٩٢) صص ٣٠ ـ ٢٨.

14- Amin Banani, op.cit, PP 127 – 128 .

١٥ـ ساختار سازمان ايلات و شيوەو معيشت عشاير آذربايجان غربى ـ ابراهيم اسكندرى نيا (اروميه، انتشارات انزلى، ١٣٦٦) صص ٢٤٩ ـ ١٣٣.

١٦ـ كاروانێك لە شەهيدانى كوردستانى ئێران ـ كەريم حيسامى (سنندج، انتشارات روزبه ١٩٧١) ل ٨ - ١٠.

١٧ـ مصاحبه با يحيى صادق وزيرى، دى ماه ١٣٧٤.

١٨ـ همان مأخذ.

١٩ـ تاريخ ايران، ژنرال سرپرسى سايكس، ترجمەو سيد محمد تقى فخرداعى گيلانى (تهران، انتشارات علمى، بى نا) ٢ مجلد، ج ٢، صص ٨٤٩ و ٨٤٨.

٢٠ـ سلسلەو پهلوى و نيروهاى مذهبى به روايت تاريخ كمبريج، جلد ٧، ترجمەو عباس مخبر، چاپ ٢ (تهران، گرح نو، ١٣٧٢) ص ٢٧.

٢١ـ رستاخيز ايران، گرد آورده نورى اسفنديارى، مقاله ٢٦ ژانويه ١٩٢٧ روزنامه تايز، صص ٨ ـ ٣٣٦.

٢٢ـ كهنه سرباز، خاطرات سياسى و نظامى سرهنگ غلامرضا مصور رحمانى (تهران، رسا، ١٣٦٦) پانويس، صص ١٣٦ ـ ١٣٥.

٢٣ـ تاریخ نوین ایران، م.س.ایوانف (بی تا، بی نا، بی جا) ص ٨٥.
٢٤ـ تاریخ کمبریج، سلسلهو پهلوی و نیروهای مذهبی به روایت تاریخ کمبریج ـ ترجمهو عباس مخبر ـ ص ٢٩.

## بەندی سێیەم:

١ـ تحفهو ناصری در تاریخ و جغرافیای کردستان، میرزا شکرالله سنندجی (فخرالکتاب)، بـه تصـحیح دکـتر حشـمت الله طبیبی (تهران، امیرکبیر، ١٣٦٦) ص ١٨.
٢ـ مصاحبه با یحیی صادق وزیری ـ دیماه ١٣٧٤.
٣ـ واقعهو کشف حجاب ـ مجموعهو اسناد، سازمان مدارك فرهنگی انقلاب اسـلامی (تهـران، سـازمان مـدارك فرهنگـی انقـلاب اسلامی و مؤسسه و پژوهش و مطالعات فرهنگی، ١٣٧١)گزارش حاکم کردستان در ١٣١٤/١١/٩ ـ سند شماره ٦٦ ـ ص ١٦٦.
٤ـ قیام ملاخلیل و رد فرمان رضاخان ـ بر پایهو خـاطرات میرزاکریم شیشهوانی ـ بـه کوشـش ابـراهیم افخمـی (سـقز، انتشـارات محمدی، ١٣٦٧٨) صص ٩ و ٨.
٥ـ خاطرات یك سرباز ـ سرتیپ حیدر قلی بیگلری (تهران، ستاد بزرگ ارتشتاران، ادارهو روابـط عمومی بررسیهای تاریخی، تهـران) ص ٦٨.
٦ـ قیام ملاخلیل و رد فرمان رچاخان ـ صص ٢٣ و ٢١.
٧ـ خاطرات یك سرباز ـ ص ٦٩.
٨ـ قیام ملاخلیل و رد فرمان رضاخان ـ ص ٢٢.
٩ـ همانجا.
١٠ـ تاریخ کرد و کردستان ـ محمد مردوخ (سنندج، انتشارات غریقی، ١٣٥١) ٢جلد ـ ج ٢ ـ ص ٤١٧.
١١ـ بررسی اوضاع طبیعـی، اقتصادی و انسانی کردستان "نمونهو کردستان مکری ـ حبیب الله تابانی" (بی جـا، بـی نـا، ١٣٤٥) صص ٧٧ ـ ٧٤.
١٢ـ قیام ملاخلیل و رد فرمان رچاخان ـ صص ٦٠ ـ ٣٥.
١٣ـ واقعهو کشف حجاب ـ اسناد منتشر نشده از واقعه کشف حجاب در عصر رضاخان ـ سند شمارهو ٤٥ ـ تلگراف رمـز ایـالات آذربایجان غربی در تاریخ ١٣١٤/١٠/٨ ـ ص ١٣٢.

١ـ کرد و پیوستگی نژادی او ـ غلامرضا رشید یاسمی (تهران، موقوفات دکتر محمود افشار یزدی، ١٣٦٩) ص ١٣٥.

٢ـ یادداشتەکانم ـ عبدالله احمد رەسولی پشدەری ـ دوو بەش ـ بەشی یەکەم (بەغدا، وەزارەتی راگەیاندن و رۆشنبیری، ١٩٩٢) ل ٧ و ٦.

٣ـ یادداشت ـ رەفیق حلمی ـ سی‌بەش (بەغدا ـ چاپخانەی مەعاریف، ١٩٥٦) ب ٢ ـ ل ٥٩٥ ـ ٥٩٨.

٤ـ کاروانێك لە شەهیدانی کوردستان ـ کەریمی حیسامی ـ ل ٩.

5- La revue du people Méditerraneéns, N° 68 – 69, 1994, le Dr Abbas Vali, Jenese et stracture du nationalisme kurd en IRAN, PP 158, 159 .

٦ـ کاروانێك لە شەهیدانی کوردستان ـ ل ١١.

٧ـ جنبش ملی کرد، کریس کوچرا ـ ترجمەو ابراهیم یونسی (تهران، انتشارات نگاه، ١٣٧٣) ص ٤٣٢.

٨ـ مجلەو آینده (دوره اول) تیرماه ١٣٠٤ ـ شمارەو اول ـ ص ٦٢.

٩ـ کهنه سرباز ـ خاطرات سرهنگ ستاد غلامرضا مصور رحمانی ـ صص ٢٥٤ ـ ٢٥٣.

١٠ـ گنجینەو مقالات سیاسی یا سیاستنامه جدید دکتر محمود افشار یزدی ـ ٢ مجلد (تهران، بنیاد موقوفات دکتر محمود افشار یزدی، ١٣٦٨) ج ١، صص ٤٩٨ ـ ٤٩٤.

١١ـ مؤسسه مطالعات فرهنگی ـ اسناد نصرالله خان اعتلالملك خلعتبری ـ سند شمارەو ٣٨ و ٥٨٠٣٥، نقل از کتاب شورش کردهای ترکیه و تأثیر آن بر روابط خارجی ایران ١٣١٠ ـ ١٣٠٧ ه.ش ـ کاوەو بیات ـ (تهران، نشر تاریخ ایران، ١٣٧٤)

١٢ـ مصاحبه با یحیی صادق وزیری و تاریخچەو مهاباد ـ سید محمد صمدی (مهاباد، مؤلف، ١٣٦٤) صص ٣٠ ـ ٢٦.

١٣ـ خاطرات ژرژ آقابکف ـ ترجمەو دکتر حسین ابوترابیان (تهران، انتشارات پیام، ١٣٧٥) صص ١٣٠ و ١٣١.

١٤ـ همان مأخذ ـ همان صفحات.

## دەروازە

بە دوای فەرمانڕەوایی ڕەزاشا دا، کوردەکان لە باکوور و باشووری کوردستان، ڕاپەڕین‌و ئەوپەڕی بێزاری و ناڕەزایەتیی خۆیان لە بەرامبەر ئاڵوگۆڕەکانی سەردەمی پەهلەویدا هەڵڕشت. لە باکووری کوردستاندا (مەبەستی نووسەر باکووری کوردستانی ڕۆژهەلاتە. و) لە ئەنجامی ئامادەبوونی سیاسیی یەکێتیی سۆڤیەت، ویستی جیاکردنەوەی ئازەربایجان و هەبوونی زەمینەی گونجاوی سیاسیی و کۆمەلایەتی بۆ دەرکەوتنی ناسیۆنالیزمی کوردی، دەرفەتێکی بێ وێنە بۆ کوردەکان ڕەخسا، کە لەو سۆنگەیەوە توانیان یەکەمین پارتی سیاسیی کوردی لە ئێران و یەکەمین حکوومەتی خودموختاری کوردی لە ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستدا دابمەزرێنن. ئاشنابوون لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەکان، بەرنامە و ئامانجەکانی ئەو حکوومەتە، جۆری ئەو خودموختارییەی کە داوایان دەکردو چۆنیەتیی دەرکەوتنی دروشمی دێموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان، لەو بابەتانەن کە لەو بەشەدا لێیان دەکۆڵینەوە. هەروەها هەوڵ دەدەین ڕۆڵی قازی محەممەد لە دەرکەوتنی ناسیۆنالیزمی سیاسیی کورد و هۆکارە ناوخۆییەکانی ڕووخانی کۆماری مهابادو کارنامەی حیزبی دێموکرات بە درێژایی یازدە مانگ حکوومەت کردنی بەوردی بخرێنە بەرباس. لەو بەشەدا بە پێی توانا سوود لە بەڵگەنامە چاپ نەکراوەکان وەرگیراوە.

بەداگیرکردنی ئێران لە خەرمانانی ١٣٢٠ ١٩٤١ز داو دەستنیشانکردنی ناوچەکانی دەسەڵاتی سۆڤیەت و بریتانیا، هەلومەرجێکی نوێ لە ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجان و پارێزگای کوردستان هاتە ئاراوە. سەرەتا ئەو سەرۆك هۆزانەی کە لە زیندانەکانی رژێمی رەزاشا پەستێورابوون، ئازاد کران و ژمارەیەکیان بۆ زێدی خۆیان گەڕانەوە، پاشان بەشێك لەو سەرۆك هۆزانەی کە لە سەردەمی دەسەڵاتدارەتیی رەزاشا، بە ویستی خۆیان ژیانی دوورخراوەییان هەڵبژارد بوو و زۆربەیان بەرەو عێراق هەڵاتبوون بۆ کوردستان گەڕانەوە، کە دەتوانین ئاماژە بە (محمد رشیدخان قادرخان زادەی) ناسراو بە حەمە رەشید، (محموودخانی دزڵی و محموودخانی کانی سانانی)و . . . بکەین، کە لە ماوەی دوورخراوەییاندا چووبوونە ژێر سایەی پارێزگاری سیاسیی و ئابووریی دەوڵەتی ئینگلیز.

پەرتبوونی خێرای سوپای شاهەنشاهی، لە بەرامبەر هێرشەکانی لەشکری سوورو هێزەکانی ئینگلیزدا لە لایەك و هەڵاتنی ئەفسەر و سەربازەکان لە سەربازگەکانیان، هەروەها پەشێویو سەرلێشێوانی سەرکردە پلەبەرزەکان لە لایەکی دیکەوە، هەلومەرجێکی لەباری بۆ سەرلەنوێ چەکدار بوونەوەی هۆز و خێڵەکانی ئێران، بۆ نموونە کوردەکان دروستکرد. لە کوردستانی ئێرانیش هەروەك خوراسان و لوڕستان و پارێزگاکانی دیکە، خەڵك هێزە سوپاییەکانیان لە چەك دادەماڵی یان چەکەکانیان بە نرخێکی یەکجار هەرزان دەکڕینەوە. کەریم حیسامی بەم شێوەیە باس لە چۆنیەتیی چەکداربوونی کوردەکان، لە ئازەربایجانی رۆژئاوادا دەکا:

"هەر لە دەستپێکی (خەرمانانی ١٣٢٠) (١٩٤١ز)ەوە خەڵکی کورد روویان لە هێزو ژاندارمەکانی حکوومەتی ئێران کردو لە هەر جێگەیەك دەستیان بە ژاندارمەیەك یان ئەفسەرێکی حکوومەتی رەزا راگەیشتبا، چەکیان دەکرد. ئەفسەر و ژاندارمەکانی رەزاشا جلوبەرگی سوپاییان فڕێ دەداو جلوبەرگی ئاساییان لەبەر دەکردو بەرەو تاران تێیان دەتەقاند، لەو بەینەدا تفەنگی برنوو لەگەڵ پانتۆڵێك یان جووتێك کەوش ئاڵوگۆڕ دەکرا، زۆربەی ئەو کوردانەی بەسەرباز گیرابوون، بێجگە لە چەکەکانی خۆیان چەکی دیکەشیان دەهێنا. چەند تیپێکی سوپای شاهەنشاهی کە دەیانویست لە مەراغەوە بۆ شارۆیرانی موکریان بچن، لە ناوچەی "شازادە" کەوتنە بەر دەسرێژی بۆمب هاوێژێکی رووسی و سەرەنجام بەبێ تێکهەڵچوون چەکەکانیان فڕێداو هەر یەکەو بۆ سووچێك هەڵات. خەڵکی ناوچەکەش کەوتنە کۆکردنەوەی

ﻪنگەکانیان. بەم شێوەیە چەك و چۆڵی ژاندارمە و سوپاییەکانی رەزاشا، کەوتە دەست خەڵكو ئاکامدا کوردەکان چەکداربوون."[1]

ادەبوونی سەربازی رووسەکان لە ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجانی رۆژئاوادا، زۆری نەکێشاو رزوو یەکەکانی سەربازی لەشکری سوور، بەرەو شارە ئازەرینشینەکان پاشەکشەیان کرد. بەڵام ر لە هەمان کاتیشدا رێگەیان لە یەکە پەرپووتەکانی سوپای ئێران گرت کە خۆیان کۆبکەنەوەو کخستنەکانیان نوێ بکەنەوە، کوردەکان کە بۆ ماوەی بیست ساڵ لەژێر گوشاری دەسەڵاتی نسەرانی تورەو توندوتیژی سوپای شاهەنشاهیدا دەیان ناڵاند، لە پرێك هەستیان بە ئازادییەکی راو کردو دیتیان کە لەشکری سوور لەپێناو نەهێشتنی سەروەری و دەسەڵاتدارەتیی سیاسیی و ربازیی دەوڵەتی ناوەندی لە سەرانسەری ئازەربایجاندا هەوڵ دەدا.

ڵام لە پارێزگای کوردستان بارودۆخەکە جیاوازبوو، لەوێ پاش گەڕانەوەی سەرۆکە دوورخراوەکان عێراق، هەرزوو یەکێتیی نێوان هۆزە کوردییەکان فۆرمی گرت و عەشیرەتەکانی بانە، مەریوان هەورامان بە دوای چەکداربووندا، لە نزیك سنوور لێك کۆبوونەوە. حەمە رەشیدخان لەگەڵ موو تیرەکانی هۆزی بەگزادە، هێرشی کردە سەر شاری بانەو دێهاتەکانی دەوروبەری و پاش بە ن بردنی پادگانی بانە، رووی کردە سەقز. هەر بەم شێوەیەش هۆزەکانی مەریوان و هەورامان ژێر فەرمانی محەممەد رەزاخانی مەریوانی، مەحموود خانی کانی سانانی و مەحموود خانی ی، سنووریان بەزاندو بۆ هێرش کردنە سەر سنە خۆیان ئامادە کرد. بە پێی نووسینەکەی ەرفەع" حەمە رەشید و خانەکانی مەریوان و هەورامان، خوازیاری بە رەسمی ناسینی ربەخۆیی کوردستانن لەلایەن ئینگلیزییەکانەوە. دانووسانی نێوان خانەکان و ئەفسەرانی گلیزی لە شاری سنەدا، دە رۆژی خایاندو سەرەنجام بەرپرسانی ئینگلیزی بە کوردەکانیان ەیاند کە دەبێ ئەو مەسەلەیە لە لایەن فەرماندەیی باڵای سوپای ئینگلیزی لە بەغدا وتووێژی سەر بکرێ.[2]

ستیوارت" کە باس لە شۆڕشی چەکدارانەی "کوردە سەربەخۆیی خوازەکان" لە پارێزگای ردستاندا دەکا، ئەوەشمان وەبیر دێنێتەوە کە ژەنەراڵی ئینگلیزی "ئسلیم" بەخۆیو بە ەکەیەکی سەربازی سوارەوە توانی بزووتنەوەکە بێنێتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، بێ ئەوەی لەگەڵ زە شەڕکەرەکان کە هێزێکی گەورەیان بۆ شەڕ کۆکردبۆوە، تێك هەڵچێ.[3]

بەم شێوەیە گەڵاڵەی سەربەخۆیی کوردستان بۆ یەکەم جار لە حەوتووی یەکەمی هاتنە ناوەوەی هاوپەیمانەکان بۆ نێو خاکی ئێران، لەژێر چاوەدێریی ئینگلیزەکان، لە لایەن تاقمێك لەو سەرۆك هۆزانەوە پێشنیارکرا، کە پێشتر لە عێراق بوون و پێوەندیەکی گوماناویان لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بەستبوو. شك لەوە دانییە کە هێنانەگۆڕێی ئەو مەسەلەیە و هێرش کردنەسەر مەڵبەندە سەربازییەکان لە لایەن کوردەکانەوە، دەستی بریتانیای تێدابوو.

ئێستا پێویستە بزانین بۆچی بریتانیا ئەو بارودۆخەی خوڵقاندو مەبەستی لەم هەنگاوانە چ بوو؟ بە وردبوونەوە لە سیاسەتی بریتانیای داگیرکەر لە ڕۆژەکانی سێ تا بیست و شەشی خەرمانان، کە محەممەد ڕەزاشا لە ئەنجومەنی نیشتمانیدا سوێندیخوارد، دەردەکەوێ کە ئەو وڵاتە لە ماوەیەکی کورتدا دەستی لە دروستکردنی گۆڕانکاریی گرینگ و چارەنووسساز هەبووە لە کاروباری سیاسیی ئێراندا. سووربوو لەسەر ئەوەی کە بە جێگرەوەی ڕەزاشا و پیاوانی دەوڵەتی ئەوکاتی ئێران نیشان بدا، دابەشکردنی ئێران یان بەپێچەوانەوە پاراستنی یەکێتیی نەتەوەیی و تەواوەتیی ئەرزی وڵات، بەستراوەتەوە بە ڕادەی هاوکاری کردنیان لەگەڵ هاوپەیمانەکان بە گشتیو بریتانیا بە تایبەتی. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو مەسەلەیە دەبێ بڵێین کە ڕاگەیاندنی دروشمی سەربەخۆیی کوردستان لە لایەن یەکێتییەکی هۆزایەتیی تازە دەرکەوتوو، کە دامەزرێنەرەکانی لەگەڵ ئەو هۆزانە دا بوون کە ماوەی دوورخراوەییان لە عێراقو لەژێر سێبەری ئیمپریالیزمی بریتانیادا بەسەربردبوو، لە هەلومەرجێکی ئەوتۆدا کە هیچ هێزێکی ئێرانی لە ناوچەکەدا بوونی نییە، هێنانە گۆڕێی مەسەلەی وەها، لە پیلانگێڕی و ئاژاوەنانەوەی بەریتانیا زیاتر، ناکرێ شتێکی دیکە بێو مەبەستیش ترساندنی تاران بوو. بەڵام پاشان دەبینین کە هەر لەگەڵ ئەوەی دەوڵەتی ئێران بەڵێنی هاوکاریی پێویستی بە هاوپەیمانەکاندا، ئینگلیزییەکان هەڵگەڕانەوەو کەشوهەوایەکی گونجاویان بۆ لەشکری ئێران ڕەخساند، تا ڕووبەڕووی کوردەکان ببنەوەو حەمەرەشید و خانەکانی دیکەی مەریوانیش سەرکوت بکا. پاش ماوەیەك کوردەکان کپ کرانو (ئەرفەع) گوتەنی نەك هەر باسی سەربەخۆیی کوردستان نەکرایەوە، بەڵکو بە نێوەنجیگەری ئەفسەری سیاسیی هێزەکانی ئینگلیزی لە کرماشان ناسراو بە کۆلۆنێل "رجی فلیچەر" کە بە مەبەستی چاودێریکردن بەسەر دانووسانەکانی کوردەکان و دەوڵەتی ناوەندی هاتبووە سەقز، بڕیار درا کە حەمە ڕەشید لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بکرێتە فەرمانداری بانەو هێزەکانیشی بە چەکداری بمێنێتەوە. هەر بەم شێوەیە خانەکانی مەریوان و هەورامان دەربەستی هاوکاریکردن

لەگەڵ ناوەندبوون و لە بەرامبەریشدا ئینگلیزەکان داوایان لە دەوڵەت کرد کە هێزەکانی پۆلیس و سوپا لە شاری بانە ببەنە دەرێ.(٤)

محەمەد رەشید یەکێك لە سەرۆکە ناسراوەکانی هۆزی بەگزادەی بانە بوو، کە تیرە جیاوازەکانی ئەو هۆزە زۆر زووتر لە بە دەسەڵات گەیشتنی رەزاخان، شاری بانەیان لەژێر دەست دابوو و بە پارێزەری سنوورەکانی ئێران لەقەڵەم دەدران. لە سەردەمی رەزاشادا مڵك و ماڵی حەمەرەشید دەستی بەسەر داگیراو خۆی گوتەنی دوای تێپەڕاندنی چەند ساڵێك لە زیندانەکانی رژێمی پەهلەوی ئاوارەی عێراق بوو.(٥)

حەمە رەشیدخان تاکو دامەزرانی کۆماری مەهاباد بە بەردەوامی لە ناوچەکە بوونی هەبوو و سەرقاڵی سەرکوت کردنی نەیارانی بوو. ساڵی ١٣٢٣ ١٩٤٤ز بازاڕی شاری بانەی ئاگر تێبەرداو کۆتایی بە هاوکاریکردنی حکوومەتی ناوەندی هێنا. لە رۆژەکانی دامەزراندنی کۆماری مەهاباد بە پلەی ژەنراڵی گەیشت. بەڵام پاش ماوەیەك خیانەتی لەگەڵ قازی دا کردو بەو چەکانەوە کە لە حیزبی دێموکراتی وەرگرتبوو، بەرەو عێراق هەڵات. چەند ساڵ دواتر حەمە رەشیدخان بەشداری لەو ئاژاوەیەدا کرد کە بۆ تێکدانی ئاسایشی رۆژئاوای وڵاتو بە مەبەستی لاوازکردنی حکوومەتەکەی موسەدق لە لایەن بەریتانیاوە رێکخرا بوو. بەڵام لایەنگرانی موسەدق بە هۆشیارییەوە مامەڵەیان لەگەڵ مەسەلەکە کردو حەمە رەشیدخانیش سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا. ئەوەی لە ساڵەکانی دواییدا لە پارێزگای کوردستان رووی دەدا، شتێك نەبوو بێجگە لە یەکلاکردنەوەی مامەڵەی هۆزایەتی و تالآنکارییە ئاساییەکانی سەرۆك هۆزەکان. ئەو رووداوانە بێبەشبوون لە هەر چەشنە هاندەرو پاڵنەرێکی سیاسیی و درێژەی رێوڕەسمی هۆزایەتی بوو لەسەرانسەری ئێراندا. بەرەبەرە حەمە رەشید رکەبەرە (تیلەکۆیی)و (گوڵباغی)یەکانی لە مەیدان وەدەرناو وەك تاکە هێزێکی هۆزایەتی لە باشووری رۆژئاوای موکریاندا مایەوە، بۆ مەبەستی وەدەستهێنانی پلەی سەرۆکایەتیی نێو هۆزەکان، سەفەرێکی بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت کرد. هەر لەو سەروبەندەدا، لەگەڵ قازی محەمەد دۆستایەتییان دامەزراندو هاوکاریی سیاسییان دەستی پێکرد. وەزارەتی نێوخۆ لە راپۆرتی رۆژی ١٣٢١/٧/١٢ی ١٩٤٢ز خۆی دا، بۆ سەرۆك وەزیران لە بارەی جموجووڵەکانی حەمە رەشید لە نێو هۆزەکاندا بەم شێوەیە دەنووسێ:

"حەمە رەشیدی بانە لەگەڵ (٣٠٠) کەسی سوارە، رۆژی (٢٢ی خەرمانانی ١٣٢١ی) ١٩٤٢ هەتاوی لە ماڵی ئەمیر ئەسعەدو براکانی میوان بووە. دوای دوو رۆژ بەرەو مەهاباد وەرێ کەوتووە، وێدەچێ سەرقاڵی ئاشتکردنەوەی کوردەکان بێ لەتەك یەکتردا."(٦)

حەمە رەشید لەو هەولانەیدا کە بۆ پێکهێنانی یەکێتیی هۆزایەتیی نوێ لە نێو کوردەکاندا خستنیە گەڕ، شکستی هێنا. دەوڵەتی ئێران بە درێژایی ساڵەکانی ١٣٢٠ تا ١٣٢٥ ١٩٤١-١٩٤٦ز سیاسەتی خۆی لە بەهێزکردنی یەکە سەربازییەکان و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی سەرۆك هۆزەکان و ڕاگرتنی دڵی خاوەن ملکە گەورەکان دا کورت دەکردەوە. هەر بەو هۆیەش ئیمکانی فۆڕم گرتنی بزووتنەوەیەکی تەواو هۆزایەتی لەژێر سێبەری حەمە ڕەشیدخان، لە پارێزگای کوردستاندا، کەمڕەنگ بۆوە. بە تایبەت لەو کاتەدا کە ئینگلیزەکان پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە پشتیوانی کردنی دەوڵەتی ئێراندا دەبینییەوە. بەڵام لە ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا دا، سەرەتا هەلومەرجەکە لەگەڵ پارێزگای کوردستان جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو، بەو مانایەی کە لەوێش بە گەڕانەوەی ئاغا دوورخراوەکانی وەك زێرۆبەگی هەرکی (کە لە هاوکارانی پێشووی سمکۆ بوو)و بە ئازادبوونی سەرۆك هۆزەکانی شکاك، جەلالی و مامەش و مەنگوڕ لە زیندان سەروماڵی دێهاتی و شارنشینانی کورد و ئازەری کەوتە مەترسییەوە. دیارترین کەسایەتیی ئازاد کراو لەو سەردەمەدا عومەرخانی شەریفی، مامی سمکۆ بوو. هۆزەکان لە باکووری کوردستان دەست ئاوەڵاتر بوون بەبەراوردکردن لەگەڵ باشوور دا، چونکە لەو ناوچەیەدا هیچ یەك لە رووسەکان و ئێرانییەکان بە کردەوە ئامادەیی سەربازییان نەبوو. بەو پێیە مەیدان بە یەکلاییکردنەوەی ناکۆکییە هۆزایەتییەکان و تاڵانکردنی دێهات و شارەکان چۆل ببوو.

دوکتۆر قادر مەحموود زادە، ناسراو بە ئاسۆ، کە یەکێك بوو لەو قوتابییانەی لە لایەن قازی محەممەدەوە بۆ رووسیە نێردرا بوون، بەو شێوەیە بارودۆخی ئەو سەردەمە شی دەکاتەوە:

"ساڵانێك بوو هۆزەکان خوازیاری بە دەستهێنانی چەکی گەرم بوونو بە دوای دەرفەتێکدا دەگەڕان، ئێستا هەلومەرج بۆ گەیشتن بەو ئاواتە دێرینەیە ئامادە بووە. لە کەڵکەڵەی ئەوە دابوون، کە هەر یەکەو بە شێوەیەك دەسەڵاتی هۆز سەروەریی (ملوك ئەلتەوایفی) خۆی پەرەپێبدا. لە قۆناغی یەکەمدا چاویان لە مەهاباد بڕیبوو کە بە خەیاڵی ئەوان بە سەروەت و سامان و زێڕو جەواهیرات و شتی بەنرخ و دانسقە ئاخنرا بوو. خەڵکی شارەکەش دەست و پێ سپیلکەن و توانای بەرگری کردنیان نییە." [٧]

زۆربەی دەوڵەمەندەکان مەهابادیان بەجێ هێشت و خەڵکی سادەش مانەوەو لە ترسی هێرشی رووسەکان و هۆزەکان، ژیانیان لێ تاڵ بوو. ئەرفەع و جەلالی پوور بەو وێنەیەی کە لە هەلومەرجی ناوچەکەوە دەیخەنە روو، لەسەر قسەکانی دوکتۆر ئاسۆ پێ دادەگرنەوە. [٨]

لێرە دابوو کە زەمینەی بەرجەستە بوونی قازی محەممەدو بەشداریکردنی لە دابینکردنی ئاسایش‌و ئارامی شاردا هاتە گۆڕێ. ئەو بە رادەیەك سەرکەوتوو لەژێرباری ئەو بەرپرسایەتییە هاتە دەرێ، کە سەرنجی رووسەکان و خەڵکی ناوچەکەشی بۆ لای خۆی راکێشا. قازی لە روحانییە ناسراو و بەڕێزەکانی مەهاباد بوو، سەردەمانێك بەرپرسی ئەوقافی ئەو شارەو ماوەیەك بەرپرسی فەرهەنگ‌و لە زەمانی شەڕیشدا قازی‌و سەردەفتەری مەهاباد بوو. "سید مهەدی فەرخ" کە لە ساڵی ١٣١٦ ١٩٣٧ز دا، پارێزگاری ئازەربایجانی رۆژئاوا بووە، لە بیرەوەرییەکانی خۆی ئاماژە بەو خاڵە دەکا کە قازی محەممەد "لە نێو کەسوکارو ناسیاوانیدا دەست رۆیشتوو و خاوەن بڕوا بوو و لە قسەی دەرنەدەچوون‌و لەو رۆژانەدا ئێمە تەنیا وەك کەسایەتییەکی ناسراوی ناوچەیی دەمانناسی."(٩)

قازی بۆ رووبەڕووبوونەوەی هۆزەکان، خەڵکی مەهابادی چەکدار کرد، بەو توانای رێکخستن‌و هۆشیارییەی کە هەیبوو پێشگیریی لە رووداني هەر چەشنە تێکهەڵچوونێك لە نێوان شارنشینەکان‌و هۆزەکان دا کرد. (١٠) بێدەنگیی رووسەکان لە بەرامبەر تالانکاری و کوشتن و بڕینەکانی هۆزەکان تا ماوەیەك درێژەی هەبوو. لەوانەیە هەر ئەو بێدەنگییەش بێ کە (ئەرفەعی) هێنابێتە سەر ئەو باوەڕەی کە بڵێ "لەو رۆژانەدا سیاسەتی رووسەکان بەرامبەر بە کوردەکان شێوەیەکی دیاریکراوو روونی نەبووە."(١١)

بەڵام راستییەکە ئەوەیە کە بێدەنگیی رووسەکان سەبارەت بە وێرانکاری و کارە تێکدەرانەکانی هۆزەکان لە رۆژئاوای ئازەربایجاندا، کاتی و بەرژەوەندیخوازانە بوو، چونکە لەو سەردەمەدا نزیکەی دە تا دوازدە هەزار کەس لە هۆزەکان چەکداربوون و لە بەرژەوەندیی لەشکری سووردا نەبوو، کە لایەنگری لە هیچ کام لە دەستە بازییەکانی هۆزەکان بکا. لەگەڵ ئەوانەشدا رووسەکان سەرقاڵی ئامادەکردنی سەفەری شاندێکی بیست کەسی لە گەورە پیاوانی کورد بۆ سۆڤیەت بوون. ئەندامەکانی ئەو شاندە پێکهاتبوون لە حاجی بابە شێخ، عەبدوڵڵا ئەیلخانی زادەو ... هەڵبەت قازی محەممەد و ئامۆزاکەی محەممەد حوسێن خانی سەیفی قازییشی لەو سەفەرەدا لەگەڵ بوون. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو راستییەی کە زۆربەی ئەندامانی ئەو شاندە، خاوەن پێگەی هۆزایەتی بوون، دەکرێ بڵێین کە تا ئەو کات رووسیە رۆڵی رۆشنبیران و نوێنەرانی چالاکی چینی ناوەندی شارنشینی لە کۆمەڵگەی کوردیدا بە کەم بایەخ دادەنا. چونکە تا ئەو کات پارتێکی وەك کۆمەڵەی ژ.ك واتە سەرچاوەیەك کە ئەو هێزانە لێك کۆکاتەوە، دەرنەکەوتبوو. بەڵام خودی بانگهێشت کردنی ئەو کەسانەو وتەبێژییەکەی میر جەعفەری باقرۆف سەرکۆماری ئازەربایجانی

سۆڤیەت‌و ئامادەبوونی بۆ بەجێهێنانی داواکارییەکانیان مەیلی رووسییەی بۆ دەستێوەردان لە کاروباری داهاتووی سیاسیی ئازەربایجان پێشان دەداو ئاماژەی بە ئایندەیەکی پڕ کێشەو ئاژاوە دەکرد. شاندە کوردییەکە چەند رۆژێکیان لە باکۆ بە تەماشاکردنی کارخانەکان، کێڵگە هەرەوەزییەکان و قوتابخانە و زانکۆکانەوە تێپەڕ کرد، هەر لە یەکەمین دیدار لەگەڵ باقرۆف دا ناکۆکی کەوتە نێو ئەندامانی شاندەکە.

بە پێی نووسینەکەی ئیگلتۆن لە کاتێکدا قازی محەمەد رێزێکی زیاتری لێ دەگیراو گرینگییەکی تایبەتیی پێ دەدرا، ئەوانی دیکە لەسەر پاراستنی چەك و چۆڵی هۆزەکانیان لەگەڵ رووسەکاندا خەریکی چەنە لێدان بوون. بەهۆی رێکنەکەوتنیان لەسەر گەلاڵەی ئامانج و خواستەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی، دەمەتەقێ و چڕەو گوڕەیان لێ پەیدا بوو.[12]

جەلالی پووریش دەنووسێ کە قازی محەممەد راستەوخۆ داوای سەربەخۆیی کوردستانی لە باقرۆف کردو گوتی پێویستە سۆڤیەت لە رێگەی لەشکری سوور بە دابەشکردنی چەك بەسەر کوردەکان دا، پشتیوانیان لێ بکا.[13]

رووسەکان لە رواڵەتدا لەسەر چەکدار مانەوەی هۆزەکانی مەهاباد، سەلماس و شنۆ رازی بوون، بەڵام داوایان لە هۆزە کوردییەکانی ورمێ کرد چەکەکانیان فڕێ بدەن. بەم شێوەیە رووسەکان کە دەستیان دابووە جۆرێك راپرسی لەنێو کوردەکاندا، سەرۆك هۆزەکانیان وەك بەرهەڵستکاری بەرنامەکانیان دیتەوە لە بەرامبەردا زیاتر لە پێشووش خۆیان لە قازی محەممەد نزیك کردەوە. قازی پاش گەڕانەوەی لە یەکێتیی سۆڤیەت بە شەوقێکی زیاترەوە دەستی دایە بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکی مەهاباد. سەرەتای هەنگاوەکانی لە چارەسەرکردنی کێشە و ناکۆکییەکانی نێوان تیرە جۆراوجۆرەکان و چارەسەرکردنی گرفتی ئازووقە و قەندو چاوە دەستی پێکرد کە لەو سەردەمەدا کۆسپ و تەگەرەیەکی زۆری دروستکردبوو. بۆ نموونە هەوڵی چارەسەرکردنی ناکۆکیی نێوان تایفەکانی هەرکی و شکاکی دا لەگەڵ تیرەکانی مامەش و مەنگوڕو گەورك، ئەوەش بە هاوکاریی عومەرخانی شەریفی سەری گرت. لە راپۆرتی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی گشتیی وڵاتدا بۆ وەزارەتی شەڕ لەو بارەیەوە هاتووە:

"... بە پێی راپۆرتی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی مەهاباد کاتژمێر ۱۹ی رۆژی ۱۳۲۱/۷/۱۰ ۱۹٤۲ز عومەرخان سەرۆکی تایفەی کوردی شکاك، زێڕۆبەگ سەرۆکی تایفەی هەرکی و رەشید بەگ، بە یاوەریی سەد کەسی چەکدارو سێ ئۆتۆمبیلی بارهەڵگر لە ورمێوە خۆیان گەیاندۆتە

مەهاباد بە مەبەستی دیدەنی و سەردانی قازی محەممەدو سەرۆك تایفەکانی مامەش و مەنگوڕو گەورك."[14]

ئەو کات قازی محەممەد لەگەڵ زۆربەی سەرۆك هۆزەکان ئاشنایەتیی دروستکردبوو، هەوڵی دەدا بە سوود وەرگرتن لە نفووزی خۆی، شاری مەهاباد بە تایفەکانی مەنگوڕو مامەش و گەورك و دێبوکری چۆڵ بکاو لە شوێنێکی سەربازییەوە بیگۆڕێ بۆ شوێنێکی مەدەنی. وەزارەتی نێوخۆ بەم شێوەیە ئامانجیْ قازی محەممەد لەو کارانەی دا، بۆ نیهادی سەرۆك وەزیری شی دەکاتەوە:

"... بەپێی راپۆرتەکانی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی مەهاباد، عومەرخان هەموو سەرۆك هۆزە کوردییەکانی هەرکی لە ئێران و عێراق، هۆزەکانی زەرزاو مەنگوڕ و مامەش و گەورك و پیران و دێبوکری و کوردەکانی سولدوزی کە ژمارەیان (١٤٦) کەسی چەکدارە بۆ مەهاباد بانگهێشتن کردووە. سێ کۆبوونەوەی لە ماڵی خۆی و قازی محەممەد دا بۆ سازداون. کۆبوونەوەی یەکەمیان سەبارەت بە کوژرانی ئیبراهیم شێخ ئاغای و فەتاح میری موکری و قادر پیرۆتی و چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان ئەم سێ تایفەیەی سەرەوە بوو. دووهەمیان بۆ چۆل کردنی مەهاباد لە هۆزەکانی مەنگوڕو مامەش و گەورك کە لەوێ کۆبوونەتەوەو لابردنی سەرانەی هۆزایەتی کە لە خەڵکیان دەستاند. لە کۆبوونەوەی سێهەمدا یەکگرتوویی و یەکێتیی کوردەکان بەوپەڕی دلگەرمییەوە کەوتە بەرباس..."[15]. بەم شێوەیە قازی محەممەد هەوڵی دەدا هۆزەکان بە دژی دەوڵەتی ئێرانیّ لە بەرەیەکی یەکدەنگ و یەکگرتوو دا کۆبکاتەوە.

هۆیەکی دیکە کە وای کردبوو ئەم پیاوە ئایینییە، هەرچی زیاتر دەست لە کاروباری سیاسیی وەربدا، ئەوە بوو کە لە دەستخستنە نێو کاروباری ئازەربایجان بە گشتی و کوردەکان بە تایبەتی لە لایەن دەوڵەتەوە پێشگیریی دەکرد. بۆ نموونە کاتێك دەوڵەتی ئێران لە ساڵی ١٣٢٢ ١٩٤٣ز ئەمیر ئەسعەدی دێبوکری کردە فەرمانداری مەهاباد، قازی بە توندی دژایەتی ئەو مەسەلەیەی کردو یەکسەر چوو بۆ تاران و دوای دیدەنی لەگەڵ شا دا، ئەمیر ئەسعەد وەلانراو ئامۆزای قازی محەممەد بوو بە فەرمانداری مەهاباد، هەروەها سەبارەت بە دەستنیشانکردنی سەرۆکایەتی هەر چوار تایفەی هۆزی مەنگوڕ لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە، قازی محەممەد دژایەتیی کردو بە هەڵبژاردنی دەوڵەت رازی نەبوو. بەرهەڵستکارانی ئەو مەسەلەیەشی دژی دەوڵەت هان دا. پارێزگاری ئازەربایجانی رۆژئاوا لە راپۆرتی خۆیدا بۆ وەزارەتی نێوخۆ دەنووسیّ: "... قازی محەممەد کە سەرچاوەی هەموو ئالۆزیو ئاژاوەکانی مەهابادە، خەڵکی هانداوە دژ بە پارێزگاری ناوەندی ناڕەزایەتی دەربڕن."[16]

له هەنگاوەکانی دیکەی قازی محەممەد دەتوانین ئاماژە بە هەوڵەکانی بکەین بۆ وەرگرتنی یارمەتی و هاوکاری لە بریتانیا لە پێناو وەدەستهێنانی سەربەخۆیی بۆ کوردستان. ئەو لە هەمانکاتدا پەیوەندییە گەرمەکەی خۆی لەگەڵ رووسیەدا دەپاریزیۆ بە پێچەوانەی لێکدانەوەی کریس کۆچێرا بە هیچ شێوەیەك هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەو دوو دەوڵەتە شاراوەو نادیار نەبووە. چونکە دەیزانی بریتانیا ئەگەر نەبێ لە رواڵەت داو بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی لە ئێراندا باوەڕی بە پاراستنی تەواوەتیی خاکی ئەو وڵاتە هەیەو جووڵانەوەی کوردەکانیش، بە لەبەرچاوگرتنی ستراکتۆری هۆزایەتیی کۆمەڵگەی کورد بووە، بە جووڵانەوەیەکی دواکەوتووی دەزانیۆ ئەگەر لەبەر خاتری پاراستنی سەروەریی خاکی عێراقیش بێ، لە بەرامبەر داخوازییەکانی قازی محەممەد دا گوێگرێکی باش نابێ. لەوەش بگوزەرێین بریتانیا هەر ئەوکات خەریکی سەرکوتکردنی جووڵانەوەی میللیی کوردەکانی عێراق بوو[17].

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا قازی هەر پێی وابوو کە لە رێگەی وڵاتێکی زلهێزی جیهانی ئازادەوە واتە بریتانیا، بە ئامانجەکانی خۆی دەگا. لەگەڵ ئەوەی سەردانێکی سۆڤیەتی کردبوو. ئومێدێکیشی هەبوو کە ئەو رووساردییەی ئینگلیزەکان بەرامبەر بە کورد نەهێڵێ. هەر بەو هۆیەش هاوکات لەگەڵ پێکهاتنی کۆمەڵەی (ژ.ك) وتووێژێکی لە تەك ئورکهارت (Urquhart) کۆنسولی ئینگلیزو دۆکرسپینی ئیروایس (Decrispighy Irwisse) مارشالی بریتانیا بۆ عێراق، لە تەورێز ئەنجامدا و وێڕای پیاهەڵگوتنی ئەو ئازادییانەی بریتانیاییەکان داویانە بە کوردەکانی عێراق، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش داوای بێبەش نەکردنی کۆمەڵگەی کوردی ئێرانی لەو چەشنە ئازادییانە کرد. بێگومان بە نێوەنجیگەری بریتانیا، بەڵام بەپێی نووسینی کۆچێرا "کاربەدەستانی بریتانیا لە دەربڕینی هەرجۆرە بیروڕایەك لەو بارەیەوە بێدەنگیان لێ کرد."[18]

دوکتۆر رەحیمی قازی ویستوویەتی کە قازی وەك دژە ئیمپریالیستێك و دوژمنی ئەمریکاو ئینگلستان بەرجەستە بکاو بە شیفتە و هەڵوەدای یەکێتیی سۆڤیەت و سۆسیالیزمی بناسێنێ، بەڵام راستییەکە ئەوەیە کە قازی لە سەردانی بۆ تارانو لە کاتی وتووێژکردن لەگەڵ قەوامو لە دەرفەتەکانی دیکەشدا هەوڵیدا تا لە پشتیوانیی ئەمریکا بۆ بە رەسمی ناسینی خودموختاری بۆ کوردستان بەو شێوەیەی کە بۆ خۆی دای نابوو، دڵنیابێ. هەوڵێك کە تیایدا سەرنەکەوت. دەبێ ئەوەش بزانین کە پشتبەستنی قازی محەممەد بە سۆڤیەتەوە نە رێکەوت و نە لەپڕێك دابوو، بەڵکو ئەو رووداوە دەرەنجامی هەلومەرجی ناوچە داگیرکراوەکان و سیاسەتی بریتانیا و سۆڤیەت، لەوانەش کاریگەرتر بە پەلەبوونی قازی بوو، بە بوێرییەوە دەتوانین بڵێین کە ئەو لە ئەندامەکانی

کۆمەڵەی (ژ.ك)یش توندرەوتر بوو. هەرچەند ئەوان سەربەخۆیی کوردستانیان وەك دوایین قۆناغی گەیشتن بە مافەکانیان رەد نەدەکردەوە، بێگومان لە کاتێکدا هەلومەرج رەخسابێ، بەڵام ئەوەی کە دەیویست خێراو بە پشتیوانیی هێزێکی دەرەکی، چ بریتانیاو چ سۆڤیەت یان ئەمریکا، کوردستان بە خودموختارییەکی ڕەها بگەیەنێ، کەسایەتی قازی بوو. ئەو لەو پێناوەدا تەنانەت لە کوردەکانی عێراقیش کە خوازیاری جۆرێك خودموختاری گونجاو بوون ڕێبازێکی توندڕەوانەتری گرتبووە پێش. قازی دوای بوونە ئەندامی لە کۆمەڵەی ( ژ.ك )دا توانی ئەو روانگەیەی خۆی بچەسپێنێ و ئەندامانی کۆمەڵەش کە لەگەڵ خەباتی چەکداریدا نەبوون و خوازیاری خودموختارییەکی گونجاو لە چوارچێوەی ئێران دابوون لەو بیروبۆچوونانە پاشگەز کاتەوە. لە راستیدا قازی پەیڕەوی بنەمای سوود وەرگرتن لە دەرفەتی مێژوویی بوو بەبێ گوێ دانە هەلومەرجی ناوچەیی و جیهانیی ئەوسا. رەوتی رووداوەکانیش دەریانخست کە قازی تەنانەت هەلومەرجی نێوخۆی کوردستانیشی لەبەرچاو نەگرتوەو بەهۆی خۆشباوەڕیی لە رادەبەدەری سەبارەت بە سۆڤیەت تووشی هەڵەیەکی گەورە بووە.

بێزاری و تووڕەیی قازی لە ئاست ئەو هەموو ستەمە نەتەوەییەی لە سەردەمی رەزاشا دا بەرامبەر بە کورد کرابوو، هەروەها هەڵسوکەوتی وێرانکەرو نامرۆڤانەی کاربەدەستانی حکوومەتی پەهلەوی، رێگەی لە هەر چەشنە رێکەوتن و گونجانێك لە نێوان قازی و دەوڵەتی ناوەندیدا گرت. ئەوەش وای لە قازی کرد خۆی لە نیزیك بوونەوەی ئەو هێزە پێشکەوتووخوازانەش ببوێرێ، کە لە دەوری دوکتۆر محەممەدی موسەدق و لە چوارچێوەی حیزبی ئێراندا لێك کۆببوونەوە.

(رەحیمی زەهتاب فەرد) کە لە تێکۆشەرانی ئازەربایجانی و یەکێك لە بەرهەڵستکارانی مانەوەی پیشەوەری‌و رووسەکان لەو پارێزگایە دابوو، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا باس لە چاوپێکەوتنێکی نێوان سەید زیائەدین تەباتەبایی و قازی محەممەد لە رەزبەری (١٣٢٤) ١٩٤٥ز دا دەکاو دەنووسێ کە سەید زیا دوای دیدارەکە سەبارەت بە هۆکارەکانی دژایەتی کردنی قازی لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی دا گوتی:

"قازی وەك پیاوێکی زاناو ئێرانناس، فازڵ و ئەهلی هونەر، تووشی سیاسەت بووەو شێواندوویانە، رێگەی گەڕانەوە شك ناباو یان توانای گەڕانەوەی نییە... دەبێ رەگوڕیشەی ئەو بەرهەڵستکاری‌و رق ئەستوورییەی قازی لە سیاسەتی هەڵەی بەرپرسانی مەملەکەت لە ئاست کوردەکان و زوڵم و زۆریی کاربەدەستانی خۆجێی و نێردراوەکانی دەوڵەتی ناوەندی لەوەش زیاتر

سوپاییەکان و بەڕێوەبەرە کارگێڕییەکان، بەتایبەتی فەرمانداران و پارێزگاران و فەرماندەکانی لەشکرو ژاندارمی دا ببینینەوە. خوا دەزانێ کە چیان نەکردووە؟"[١٩]

بە پێچەوانەی بیروبۆچوونی باوی زۆر لە مێژوونووسان و لێکۆڵەرانی مێژووی کوردستان، ڕۆڵی قازی محەممەد لە دروستکردنی ئاڵوگۆڕەکان کە سەرەنجام دەرکەوتنی ناسیۆنالیزمی سیاسیی کوردی لێکەوتەوە، بەرچاوترە لە چالاکییەکانی کۆمەڵەی ژ.ک. هەنگاو و کارەکانی قازی محەممەد لە رووخانی ڕێژیمی ڕەزاشاوە تا بوون بە ئەندامی لە کۆمەڵەی ژ.ک دا، واتە لە خەرمانانی ١٣٢٠ تا هاوینی ١٣٢٤ ١٩٤١-١٩٤٥ز لەم خاڵانە دا کورت دەکرێنەوە:

١ـ هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی پشتیوانی یەکێك لە دوو زلهێزی "سۆڤیەتو بەریتانیا" بۆ مەبەستی جیاکردنەوەی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ.

٢ـ هەوڵدان بۆ ڕێکخستنی هێزی هۆزەکان و لەنێوبردنی ناکۆکیی نێوان تیرە جۆراوجۆرەکانی کوردو ئاراستەکردنی بێزاریو ناڕەزایەتیی هۆزەکان بە ئاقارێکی سیاسیی دژ بە حکوومەتی ناوەندی.

٣ـ هەوڵدان بۆ کۆسپ و تەگەرە خستنە پێش گەڕانەوەو نوێکردنەوەی دەسەڵاتی کارگێڕیو سەربازی دەوڵەتی ناوەندی بۆ ڕۆژئاواو باشووری ئازەربایجان.

٤ـ قازی محەممەد هەر لە یەکەم سەردانی بۆ سۆڤیەت تێگەیشت کە رووسەکان بۆ داهاتووی ناوچەکە پیلانێکیان لەژێرسەر دایە. بەو پێیە هەوڵیدا ڕێبەریی بەرەی لایەنگرو هەوادارانی سۆڤیەت وەئەستۆ بگرێ، بەو مەبەستە ڕۆڵی نێوەنجیگەری لە نێوان خەڵکی کورد و سۆڤیەت دا گێڕا.

بە شێوەیەکی گشتی دەبێ بڵێین قازی محەممەد توانی بۆ ماوەیەك هۆزەکان لە دەوڵەتی ناوەندی دوورەپەرێز ڕاگرێ، بەڵام لەگەڵ دامەزرانی کۆماری مەهابادو پڕڕەنگتربوونی دەسەڵاتی سۆڤیەت لە ڕووداوەکانی ناوچەدا، سەرەنجام ڕەوتی هۆزایەتی پاڵی وەدەوڵەتی ناوەندیدا، پێویستە کە هەر لەو هەڵگەڕانەوە سیاسییەشدا بەدوای هۆیەکانی رووخانی یەکەمین کۆماری کوردیدا بگەڕێین.

# هەلومەرجی پێکهاتنی کۆمەڵەی ژ.ك

کۆمەڵەی (ژ.ك)، یەکەمین پارتی سیاسیی بوو لەسەر بنەمای هەستی نەتەوایەتیی کوردی، لە کوردستانی ئێراندا، پێکهات و پاشان بەپێی کۆمەڵێك زەروریاتی سەردەم و دوای پێکهێنانی گۆڕانکاری لە بەرنامە و ڕێبازەکەیدا بوو بە حیزبی دیمۆکرات.

ئەوڕۆ کوردەکانی ئێران و عێراق سەبارەت بە دەسنیشان کردنی رادەی رۆڵی کوردەکانی عێراق لە دروستبوون و پەرەپێدانی کۆمەڵەدا، جیاوازیی بیروبۆچوونیان هەیە، بەڵام بەڵگە و نیشانەی زۆر لەبەردەست دایە کە حیزبێك بە ناوی کۆمەڵەی (ژ.ك)، بۆ یەکەمجار بەهۆی کوردەکانی عێراقو لە شاری سلێمانی دامەزراوە. مەحموود جەودەت لە ناسیۆنالیستە چالاکەکانی کورد، دامەزرێنەری سەرەکیی ئەو پارتە بووە.

کۆمەڵەی (ژ.ك) لە سلێمانی کە هاوکات لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی جیهانیی دووەم هاتبووە کایەوە، هەر زوو لەبەریەك هەڵوەشاو دامەزرێنەرانی بە گرتنەبەری سیاسەتی نوێ و دامەزراندنی ڕێکخستنی نوێ، حیزبی "هیوا"یان راگەیاند. لە سەرەتای دەستپێکردنی شەڕی جیهانیی دووەم، حیزب و ناسیۆنالیستە کوردەکانی عێراق بۆ گرینگیدان بە کێشەی کورد (کە تا ئەوکات لە کوردستانی عێراقو تورکیەدا کورت کرابۆوە) و فراوانکردنی رەهەندەکانی ئەو کێشەیەو قۆستنەوەی گۆڕانکارییە سیاسییە قووڵەکانی جیهان، هەوڵی گواستنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردیان بۆ کوردستانی ئێران دا.[١]

ماوەیەك پاش راگەیاندنی وجودی کۆمەڵەی سلێمانی لەساڵی (١٣١٩ ه.ش) ١٩٤٠ز پیاوێکی ئایینی پایەبەرزی کورد بە ناوی مەلا ئەحمەدی فەوزی لە سلێمانییەوە هاتە مەهابادو مەجلیسی دەرسگوتنەوەی دامەزراند. لێکۆڵەری کورد محەمەد سەمەدی کە لەگەڵ ژمارەیەك لە ئەندامانی دامەزرێنەری کۆمەڵەدا وتووێژی ساز داوە، بە لەبەرچاو گرتنی وتەکانیان دەنووسێ کە مەلا ئەحمەدی فەوزی بێجگە لە زانیاریی ئایینی وانەی "هەستی نەتەوایەتیی کوردی"یشی بە قوتابییەکانی دەگوتەوە.[٢]

کەریمی حیسامی وێڕای ئاماژەکردنی بە پێکهاتنی گرووپێکی سیاسیی بچووك بە بەشداریی پیاوانی ئایینی ناوچەی موکریان لە ماوەی ساڵەکانی (١٣٠٧ ـ ١٣١٠) ١٩٢٨-١٩٣١ز، کە

لەگەڵ شۆڕشی ئارارات و پارتی خۆیبوون دا پێوەندییان هەبووە، مەلا ئەحمەدی فەوزییش بە بەرپرسی سەرەکیی ئەو گرووپە دەناسێنێ‌و لەبارەی نەخشی مەلا ئەحمەد لە چالاکیی سیاسیی کوردەکان لە نێوەڕاستی ساڵەکانی دەسەڵاتدارەتیی رەزاشا دا دەنووسێ: "پێویستە بزانرێ کە رۆڵی مەلا ئەحمەدی فەوزی یەکێك لە رۆشنبیرانی کورد، لە بەرەبەری هەڵگیرسانی شەڕی جیهانیی دووەم دا زۆر گرینگە، ئەو لە سلێمانییەوە بۆ موکریان هاتبوو، لە راچڵەکاندنی هەستی نەتەوەیی‌و دامەزراندنی ئەو گرووپە سیاسییە بچووکەدا دەوری سەرەکیی هەبوو." (۳)

لە نووسینەکانی حیسامی و سەمەدی ڕا دەردەکەوێ کە مەلا ئەحمەدی فەوزی، ئەگەر نەبێ لە دوو سەردەمی ناسك و هەستیاردا رووی کردۆتە مەهابادو هەرجارەو هەوڵی داوە گۆڕانکارییەك دروست بکاو هەستی نەتەوەیی لە نێو کوردەکانی موکریاندا وەئاگا بێنێ: جارێکیان لە گەرمەی شۆڕشی ئارارات داو جارێکی دیکەش لە دەسپێکی شەڕی جیهانیی دووهەمدا.

ئیگلتۆن و کۆچێرا لە بارەی چالاکییەکانی ئەو مەلا کوردەوە هیچیان نەگوتووە، بەڵام ئاشکرایە کە بەپەرەپێدەرێکی بەتوانای بیری ناسیۆنالیزمی کوردی دەزانرێ‌و بە دڵنیاییەوە لە لایەن گرووپە سیاسییەکانی کورد لە عێراق و تورکیەوە رەوانەی ئێران کرابوو، دەکرێ چالاکییەکانیشی بە سەرەتای دەستپێکردنی بانگەشە و هەنگاوەکانی کۆمەڵەی سلێمانی و پاشان پارتی هیوا لە نێو کوردەکانی ئێراندا لە قەڵەم بدەین.

هەڵبژاردن و دەستنیشانکردنی رۆژئاوای ئازەربایجان بەگشتی و ناوچەی موکریان بە تایبەتی، لە لایەن کوردەکانی عێراقەوە وەك خاڵی دەسپێك بۆ بڵاوکردنەوەی بیروبڕوا سیاسییەکانیان، ئەوە دەردەخا کە پارێزگای کوردستان یان باشووری کوردستانی رۆژهەڵات، ئامادەی وەرگرتنی ناسیۆنالیزمی کوردی و فرێدانی ناسیۆنالیزمی ئێرانی نییەو لە بنەمادا لێکیان جیا ناکاتەوە. پێویستە ئەو راستییەش بسەلمێنین کە کۆمەڵی کوردی دوای تاقیکردنەوەی ستەمی میلییی حکوومەتی رەزاشا، مەودایەکی زۆری لەگەڵ ناسیۆنالیزمی ئێرانیدا پەیدا کردبوو. لە باکووری کوردستانی رۆژهەڵاتدا بە باشی هەست بەو مەسەلەیە دەکرا. ئیدی پیاوانی ئایینی‌و خوێندەوارانی نیشتەجێ لەو ناوچەیەدا، ئۆگریی خۆیان سەبارەت بە دروشم و چالاکییە سیاسییەکانی کوردەکانی ئەوبەری سنوور پێشان دا. بۆ نموونە کەسێکی وەك (عەبدولڕەحمان زەبیحی) کە پاشان بە بەرپرسی گشتیی کۆمەڵەی (ژ.ك) هەڵبژێردراو پێشتر مامۆستای منداڵی ئاغا دەوڵەمەندەکان بوو، ئاماژەی بە دەرکەوتنی نەوەیەکی نوێ لە نێو کوردەکاندا

دەکرد. ئامادە بوو حاشا لە شوناسی ئێرانی بوونی خۆی بکاو لە بریتییان شوناسی کوردی هەڵبژێرێ. ئەو "... لە پێشەنگی ئەو کەسانەدا بوو کە پێوەندیی لەگەڵ بزووتنەوە کوردییەکانی سلێمانی دا دامەزراند."[٤]

بەڵام دەبێ بگوترێ کە لە ڕووی چەندییەتییەوە ژمارەی ئەو جیابیرو نەوە تازەیە، زۆر کەم بوو. بەڵام لە رووی چۆنیەتییەوە گرینگییەکەی بە رادەیەك بوو کە سەرنجی پارتەکانی ئەودیوی بۆ لای خۆی راکێشا. محەممەد سەمەدی لە بارەی کارەکانی (مەلا ئەحمەدی فەوزی )دا دەنووسێ کە بازنەی دەرسگوتنەوەکەی بە هیچ شێوەیەك رێکخستنێکی سیاسیی نەبوو، لە پەیڕەوو پرۆگرامو چوارچێوە بێبەری بوو، هەڵبەت مەبەستیشی ئەوە نییە کە لەو بازنەی دەرسگوتنەوەدا، بابەتی سیاسیی تاوتوێ نەدەکرا.[٥]

ئەو باسە نیشاندەری ئەو راستییەیە کە کوردستانی ئێران، لەو سەردەمەدا بەپێچەوانەی کوردستانی عێراق و تورکیە ئامادەی وەخۆگرتن و هەرسکردنی ناسیۆنالیزمی کوردی نەبووەو لە بەرامبەر ناسیۆنالیزمی ئێرانیبوونیشدا زۆر بەرچاو نەبووە. لەبەر ئەو هۆیەش کوردەکانی عێراق هەوڵیان دەدا کە دانیشتوانی موکریان لەگەڵ هەستی نەتەوایەتیی کوردیدا ئاشنا بکەن. ئیشارەی کەریم حیسامییش لە نەبوونی هەستی نەتەوایەتیی کوردی لە سەردەمی رێژیمی رەزاشا دا، بەڵگەیە بۆ ئەم بانگەشەیە. هەر خودی کەریم حیسامی باس لەوەش دەکا کە ژمارەیەکی کەمی پیاوانی ئایینی خاوەنی ئەم بیروبۆچوونانە بوونو بە نهێنی لە عێراقەوە کتێبی کوردییان وەگیر دێنا.[٦]

دیرك کینان، کە لە نزیکەوە پێوەندیی لەگەڵ کوردەکانی عێراقدا هەبوو، دەنووسێ کە مامۆستا و راهێنەرانی کۆمەڵەی (ژ.ك) لە مەهاباد، ژمارەیەك کوردی عێراق بوونو هەر ئەوانیش پارتی ناوبراویان لە شانە نهێنییەکاندا رێکخست.[٧] وێکچوونی پێگەی کۆمەڵایەتیی دامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی ژ.ك)ی سلێمانی و کۆمەڵەی ژ.ك لە مەهاباد سەلمێنەری ئەو راستییەیە کە (کۆمەڵ)ی مەهاباد کۆپیی کۆمەڵەی سلێمانی بووە، چونکە کۆمەڵەی سلێمانی لە خوێندەوارانی شاری سەر بە چینی ناوەند پێك هاتبوو، لە مەهابادیش هەر ئەو رەگەزانە پێکهێنەری کۆمەڵەی ژ.ك بوون.

## چۆنیەتیی دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ.ک

لە رۆژی ٢٥ی خەرمانانی ساڵی ١٣٢١ی هەتاوی ١٩٤٢ز، شازدە کەس لە خەڵکی مەهاباد بە ئامادەبوونی دوو نێردراوی پارتی هیوا لە باغێکی تەنیشت شار کۆبوونەوە کە یەکێکیان کاپتنی سوپای عێراقی میرحاج ئەحمەد بوو کۆمەڵەکەیان دامەزراند. لە ئەندامە دامەزرێنەرەکانی ئەو کۆمەڵەیە دەتوانین ئاماژە بە رەحمانی زەبیحی و شاعیرانی ناسراوی کورد هەژارو هێمن بکەین. ئەو رێورەسمە لە باغی یەکێك لە بەڵێندەرەکانی تووتن بە ناوی حاجی مستەفا داوودی کە بۆ خۆشی ئەندامی کۆمەڵە بوو وەڕێ خرا. بەپێی نووسینەکەی ئیگلتۆن، کاپیتان میرحاج وێڕای ئەوەی لە لایەن پارتی هیواوە پیرۆزبایی لە دامەزرانی کۆمەڵە کرد هێندێك پێشنیارو راسپاردەشی لە لایەن پارتی هیواوە، بۆ رێکخستنی کاروباری ئەندامانی کۆمەڵە و دامەزراندنی شانەی نهێنیو سەربەخۆ لە یەکتر پێبوو.(٨) ئەو پێشنیاریکرد کە پێویستە ئەندامە تازەکان لە کاتی پێوەندیگرتن بە کۆمەڵە سوێندبخۆن. خودی ئامادەبوونی ئەندامانی هیوا لەو رێورەسمەداو هێنانە گۆڕێی راسپاردەو رێنوێنییەکانیان بۆ رێکخستنی کۆمەڵە رۆڵی کوردەکانی عێراق لە دامەزراندنی کۆمەڵەی (ژ ـ ك) دا ئاشکرا دەکا. لە ساڵەکانی دواتردا پێوەندیی نێوان ژ ـ ك و هیوا رۆژ لە دوای رۆژ گەرمتر دەبوو، بە رادەیەك ئەو پێوەندییە پەرەی سەند کە هەر ئەو ئەفسەرە کوردە عێراقییە و کەسایەتییە سەربازییەکانی دیکەی هاوبیری بە کردەوە سوپای کۆماری مەهابادیان پێکهێنا.

ئامادەبوونی بەرچاوی کوردەکان عێراق لەو ئاڵوگۆڕانەدا کۆچێرا گوتەنی وای کردووە کوردەکانی عێراق کۆمەڵەی ژ ـ ك بە لقێکی هیوا بزانن.(٩)

هەروەها ئەبولقاسمی قازی (سەدری قازی) برای قازی محەممەد لە خولی چوارەمی مەجلیسی شوواری میللیدا نوێنەری شاری مەهاباد بوو، لە یەکێك لە وتەبێژییەکانی لە مەجلیسدا لە رێکەوتی ٢٩ی خەزەڵوەری ١٣٢٤ی هەتاوی ١٩٤٥ز، لە پێوەندی لەگەڵ بارودۆخی کوردستاندا، ئاماژە بەو راستییە دەکاو دەڵێ: ". . . دەنگۆی جیاکردنەوەی کوردستان درۆیە . . . کۆمەڵەش لە خاکی عێراقدا دامەزراوە نەك لە کوردستانی ئێران."(١٠)

بە هەرحاڵ کاتێك لە مێژووی دامەزرانی کۆمەڵەی ژ ـ ك دەکۆڵینەوە، چالاکییەکانی کوردەکانی عێراق و هەوڵدانیان بۆ بەهێزکردن و پڕڕەنگ کردنی شوناسی کوردیو لە

بەرامبەریشدا سڕینەوەی ناسیۆنالیزمی ئێرانی، لە ئەندێشەو یادەوەریی کوردەکانی ئێراندا، مەسەلەیەکی پڕبایەخە. ئەو هەولانە کاتێك دەستیان پێکرد کە کۆمەلگەی ئێرانی پاش وەلانانی ستراکتۆرە سیاسیی و ئابوورییەکانی دەورانی قاجاری و پاشان بەدواداهاتنی قۆناغێکی(٢٠) ساڵەی خەفەقان، هێشتا نەیتوانیبوو پێناسەیەکی سەردەمیانە لە یەکێتیی نەتەوەیی‌و ڕەهەندی ناسیۆنالیزمی ئێرانی بکا. لە کاتێکدا ناسیۆنالیزمی کوردی لەودیو، لە گەشەکردن و پەرەستاندندا بوو، ئەو وێنانەی لە مافەکانی کوردی دەکرد، ڕوونترو واتادارتربوون لەچاو ئەوەی ناسیۆنالیزمی ئێرانی لە کەللەی دابوو. ولاتی ئێران تەنانەت دیکتاتۆریی ڕەزاشاش بەردەوام سەکۆی ئامادەبوونی ئیستیعمار بوو. ناسیۆنالیستە ئێرانییەکان بۆ بیناکردنەوەی ڕوح‌و بە بەرداکردنەوەی ناسیۆنالیزمی ئێرانی یەك دەیە دوای لادانی ڕەزاشا وەخۆ کەوتن. بەرەی میللیی ئێران بە ڕێبەریی د.موسەدیق لە ڕووداوی خۆماڵیکردنی نەوتدا شێوەیەکی تازەی لەو ناسیۆنالیزمە خستە ڕوو و سەرنجی ڕێژەیەکی بەرچاوی کوردەکانی باشووری ڕۆژئاوای ئێرانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. بەلام حەوت ساڵ زووتر لەو کارە، ناسیۆنالیزمی کوردی لە ئێران وەسەر پێ کەوتبوو.

# چۆنیەتیی ئەندام وەرگرتن و ئامانجەکانی ژ. ك

لە سەرەتادا چالاکییەکانی کۆمەڵە بە نهێنی بەڕێوە دەچوون، تا ئەو دەمەی لە پشتیوانیی هەمەلایەنەی یەکێتیی سۆڤیەت دڵنیابوون، ئەوسا دەستیان دایە تێکۆشانی بەرچاو و ئاشکرا. دژایەتی کردنی ئەعیان و سەرۆکە خۆجێییەکان لەگەڵ چالاکییەکانی کۆمەڵە بە رادەیەك کاریگەر بوو کە سەرەڕای ئامادەنەبوونی دەوڵەتی ناوەندی دیسان ناچار بوو بەنهێنی کار بکا. ئەو بارودۆخە کۆمەڵەی ناچار کرد داوای پشتیوانی و یارمەتی تاکەهێزی سیاسیی و سەربازیی ناوچەکە "یەکێتیی سۆڤیەت" بکاو رۆزڤێلت گوتەنی: "ناچار پەنای بۆ دەستڕۆیشتوویی سۆڤیەت برد"[11].

لە راستیدا ئەگەر پارێزگاریکردنی سۆڤیەت نەبووایە، بەرەوپێشچوونی کۆمەڵە هەروا لە سەرخۆ دەبوو. ئیگلتۆن لە بارەی چۆنیەتیی ئەندام وەرگرتن و چاوەڕوانییەکانی حیزب لە لایەنگرانی، دەڵێ هەر ئەندامێکی تازە کە دەهاتە نێو کۆمەڵەوە دەبووایە ئەو مەرجانە پەسند بکا:

١ـ خیانەت بە میللەتی کورد نەکا،
٢ـ بۆ بەدەستهێنانی خودموختاری کوردەکان هەوڵ بدا،
٣ـ نهێنییەکانی حیزب چ بە نووسینو چ بە قسەکردن نەدرکێنێ،
٤ـ لە هەموو تەمەنیدا بە ئەندامەتیی کۆمەڵە بمێنێتەوە،
٥ـ هەموو ژن و پیاوێکی کورد بە خوشك و برای خۆی بزانێ،
٦ـ بە بێ پرسی کۆمەڵە نەچێتە نێو هیچ حیزب و گرووپێکی دیکەوە.[12]

ئیگلتۆن ئەوەش دەنووسێ کە دامەزرێنەرانی حیزب ئەو مەرجانەیان بە یارمەتیی میرحاج دانابوو[13]. ئاشکراشە کە هیوا هەموو تەجروبە و توانای رێکخستنی خۆی خستبووە خزمەت ژ ـ ك ەوە. بەڵام لە بارەی ئامانج و داواکارییەکانی کۆمەڵەوە دەبێ بڵێین خودموختاری بۆ کوردستان لە چوارچێوەی ئێراندا، لەگەڵ داواکارییەکانی پارتی هیوا لە حکوومەتی عێراقی گونجانێکی هەبوو و کرۆکی ئامانجەکانی پێك دەهێنا. بەپێی لێکدانەوەی رێبەرانی کۆمەڵە کاریگەرترین هەنگاو لەو پێناوەدا بەرزکردنەوەی ئاستی فەرهەنگیی خەڵکی کورد بوو. رێبەرانی کۆمەڵە تا پێش دەستپێکردنی دەستڕۆیی رووسەکان لە نێو پارتەکەداو تا ئەو دەمەی کە گفت و بەڵێنەکانی سۆڤیەت کەڵکەڵەی کوردستانی گەورەی نەخستبووە مێشکیانەوە تێگەیشتنێکی تا رادەیەك دروست و مەعقوولیان لە پێگەی کوردەکانی ئێران هەبوو. بەرژەوەندی سینفی و

فەرهەنگیی میللەتی کوردیان لە ئێران و ئەوەی لەو پێوەندییەدا دەکرێ وەدەست بهێنرێ، بە گرینگتر دەزانی لە خەونی هەرگیز وەدی نەهاتووی "کوردستانی گەورە".

نووسەری کتێبی "جووڵانەوە کوردییەکان لە کۆنەوە تا ئێستا" لە بارەی روانگەی رێبەرانی کۆمەڵە و چۆنیەتیی بڕیاردان لەو بارەیەوە دەنووسێ:

". . . لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٤، بە هیمەتی یەکێك لە خاوەن پیشەکانی شاری مەهاباد بەناوی زەبیحی، کۆبوونەوەی سەرەتای پارتی تازە دروستبوو "ژینا کوردستان" (کۆمەڵەی ژ.ك) دامەزرا. لەو کۆبوونەوەیە دا پەیڕەو و پرۆگرامی پارتەکە نووسراو پەسەند کرا کە تێی دا خەباتی گەلی کورد بۆ گەیشتنی بە مافی چارەی خۆنووسین لە بەدەستهێنانی خودموختاری لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئێران دا کورت کرابۆوە. بەو شێوەیە بابەتی کوردستانی گەورەو سەربەخۆ سپێردرایە داهاتوو و بە ئەرکی پلەی دووی پارتەکە لە قەڵەم درا"[١٤].بۆ پێداگرتن لەسەر بانگەشەی نووسەری ئەم کتێبە سەبارەت بە نەرم و نیان بوونی سیاسەتەکانی کۆمەڵە یەکێك لە ئەندامانی پێشووی ئەم پارتە لەبارەی چۆنیەتیی کارو کردەوەو چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵەی ژ.ك بەو شێوەیە بیروڕاکانی خستە روو: "ژ.ك کۆمەڵەیەکی نەتەوەیی ـ ئایینی بوو، کە باوەڕی بە خەباتی چەکداریْ نەبوو، هەوڵی دەدا گەلی کورد لە رێگەی بەرزکردنەوەی ئاستی فەرهەنگییەوە رزگار بکا"[١٥].

سیاسەتی ژ.ك بەبەراوردکردنی لەگەڵ سیاسەتی پارتە کوردییەکانی دراوسێ زۆر نەرمو ئاشتیخوازانەتر بوو. هەبوونی ئەو خەسڵەتەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی بارودۆخی کۆمەڵگەی ئێرانی و بارودۆخی گشتیی ئێران لەگەڵ پێگەی کۆمەڵی کوردی لە وڵاتانی دراوسێی ئێراندا. لێرەدا کوردبوون هاوتای نائێرانیبوون نەبوو. کۆمەڵەش بە پێچەوانەی پارتە کوردییەکانی تورکیە و عێراق نەیدەتوانی زۆر پێ لەسەر جیاوازیی نەژادی و نەتەوەیی کوردەکان لەگەڵ گەلانی دیکەی ئێران بەتایبەتی فارس دابگرێ. لەبەر ئەو هۆیەش بوو کە بۆ گۆڕینی هەلومەرجی ژیانی جووتیاران، واتە زۆرینەی دانیشتوانی کوردستان دەیویست ئاڵوگۆڕ لە بوارەکانی فەرهەنگی و ئابووری و کۆمەڵایەتی دا پێکبێنێ.

د.عەباسی وەلی کاتێك لێکۆڵینەوە لەسەر ناسیۆنالیزمی کوردی لە ئێراندا دەکاو دێتە سەر باسی ئامانجەکانی کۆمەڵە، تا هاوکاریکردنی لەگەڵ رووسیە ئاماژە بەو خاڵە دەکا کە: "سەرمایەی ئایدیۆلۆژی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، بەردەوام کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی نێو پێکهاتەی چینایەتیی کۆمەڵی کوردی زەق دەکردەوە، "نیشتمان" ئۆرگانی

کۆمەڵە ئاماژەی بەردەوامی بە نایەکسانیی نێوان نەدارو دەوڵەمەند لە کۆمەڵگەی کوردیدا دەکرد.[١٦]

بەو شێوەیە کۆمەڵە لە لایەکەوە دەیتوانی کۆمەڵانی هەژاری کورد بخاتە چوارچێوەی گوتارەکانییەوە، لە لایەکی دیکەشەوە گوشار بخاتە سەر دەوڵەتی ئێران بۆ وەرگرتنی مافی کوردەکانو جێبەجێکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی. مەیل پەیداکردنی (ژ.ك) بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی هێزێکی دەرەکی، لەو شوێنەوە سەرچاوەی دەگرت کە هۆزەکانی ناوچە رووی خۆشیان لە ئاست چالاکییەکانیدا نیشان نەدەداو ئەو خانانەش کە ئەندامی پارتەکە بوون "زۆر پاوانخوازبوونو رێرەوێکی فکریی دیاریکراویان نەبوو".[١٧]

رێبەرانی کۆمەڵەش بەشارەزابوونیان لە ئاستی هۆشیاریی سیاسیی و تینووبوونی ئەو چینە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات بە پارێزەوە مامەڵەیان دەگەڵدا دەکردن و چالاکییەکانی خۆیانیان لێ دەشاردنەوە. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو راستییە کە هێزەکانی حکوومەتی ناوەندی ئامادەبوونێکی ئەوتۆیان لە ناوچەکە دا نەبووە، دەبێ ئەو نهێنیکارییەی ئەندامانی کۆمەڵە لە ترسی سەرۆك هۆزەکان بووبێ. هەرچەندە کەسایەتیی نێوهۆزەکانیش ببوونە ئەندامی کۆمەڵە، بەڵام کەسە دیارەکانی وەك عومەرخان، حەمە رەشید، سەرۆك هۆزەکانی دێبوکری لەگەڵ کۆمەڵە نەکەوتبوون. رۆزڤێلت گوتەنی: "بە گشتی کۆمەڵە لە ئاغاو سەرۆك هۆزەکان دەسڵەمییەوە."[١٨] لەوانەیە بوێرین بڵێین یەکێك لەو هۆیانەی (ژ.ك)ی گەیاندۆتە سەر ئەو باوەڕەی رێبازێکی نەتەوەپەروەرانەی سیاسیی ناچەکدارانە بگرێتە پێش، لەبەرچاوگرتنی ئەو تێبینییە بووە کە هەر لەگەڵ هەڵایسانی خەباتی چەکداری بۆ وەدەستهێنانی خودموختاری دەستی لە گۆزەکە دێتە دەرێو هۆزەکان سەرەتا لە مەیدانی سەربازی و پاشان مەیدانی سیاسییدا هێزو توانای خۆیان وەگەڕ دەخەنو ئەوجار رۆشنبیرانی شاری و دامەزرێنەرانی کۆمەڵە دەخەنە پەراوێزەوەو چارەنووسی گەلی کورد دەبەنە ژێر رکێفی خۆیان.

خاڵێك کە دەتوانین بۆ بابەتەکانی سەرەوەی زیاد بکەین ئەوەیە کە دانیشتووانی شارنشین بە تەواوی لەگەڵ کۆمەڵەدا نەبوون، سەرەڕای ئەوەش شارنشینەکان رێژەیەکی کەمتری دانیشتوانی کوردستانیان پێك دەهێنا بە بەراورد لەگەڵ جووتیارانی نیشتەجێو هۆزەکان دا. چوارچێوەی دەسترۆیشتوویی کۆمەڵە ناوچەکانی مەهاباد، باکووری سەقز و شنۆ و سلدووز و بۆکانی دەگرتەوە. بەهۆی دژایەتیکردنی ئاغایەکان بەدەر لە ژێر ناوچەی دەسەڵاتی سۆڤیەت، تەنانەت لە بانەو سەردەشت کە لە ژێر دەسەڵاتی حەمە رەشید دابوون بە شێوەی پێویست پەرەی نەسەند.

# پێکهاتنی کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە

لە خەرمانانی (١٣٢١) ١٩٤٢ تا پووشپەڕی (١٣٢٤) ١٩٤٥ کە قازی کۆمەڵەی هەڵوەشاندو حیزبی دیمۆکراتی دامەزراند، گۆڕانکاریگەلێکی گرینگ هەم لە نێو کۆمەڵەو هەم لە ئازەربایجاندا روویدا، کە بەشێکی گەورەی لە یەکێتیی سۆڤیەت و بەشەکانی دیکەش لە بارودۆخی کوردستانی عێراقەوە سەرچاوەی دەگرت. یەکەمین رووداوی لەو چەشنە دامەزراندنی پێوەندی بوو لە نێوان کۆمەڵە و یەکێك لە ئەفسەرەکانی سوپای سوور بە ناوی عەبدوڵلا ئۆف کە لە مەهاباد بوو. ئەو پێوەندییە "ئەنجوومەنی دۆستایەتی کوردستان و سۆڤیەت"ی لێ کەوتەوە. بنکەی ئەو ئەنجوومەنەش بەو حوکمەی کە ئاسایشی تەواوی هەبوو، شوێنێکی ئەمین بوو بۆ گرێدانی کۆبوونەوە نهێنییەکانی ئەندامانی کۆمەڵە.

لە بانەمەڕی ساڵی (١٣٢٣) ١٩٤٤ دا، ئەو دەمەی ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ك ژمارەیان گەیشتبووە سەد کەس، کۆمیتەیەکی ناوەندییان هەڵبژارد کە لە نێویاندا دەتوانین (محمد یاهو، رەحمان زەبیحی، هێمن و هەژار)ی شاعیر نێو بەرین، کە بە دوای ئیگلتون وەك چالاکترین ئەندامانی حیزب ناسێنرابوون.[١٩] ئەو کات لە نێو کۆمەڵەدا دیمۆکراسی هەبوو، بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنیش سەلمێنەری ئەو راستییەیە، بەڵام دوای هاتنی قازی محەممەد بۆ نێو کۆمەڵە، بارودۆخەکە گۆڕا.

# رووبەڕووبوونەوەی خەڵك و ئەندامانی کۆمەڵە لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی مەهاباد

لە بەهاری ساڵی (١٣٢٢) ١٩٤٣ز دا، دانیشتووانی مەهاباد، بۆ دەربڕینی هەستی بێزاریان بەرامبەر شێوەی دابەشکردنی قەند و شەکرو خراپ کەڵك وەرگرتنی کاربەدەستانی دەوڵەتی لەو کاڵایانە، هێرشیان کردە سەر بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی مەهابادو چەند (کارمەند)ێکیان کوشت، بەپێی بەڵگە کۆمەڵەی ژ.ك لە پشت ئەو هێرشە بووە، تا بە قۆستنەوەی بێزاری و تووڕەیی خەڵك بەرامبەر شێوەی دابەشکردنی قەند و چا، دوا نیشانەی کارگێڕی دەوڵەتی ناوەندی لە ناوچە کوردنشینەکاندا بسڕێتەوە.

دەستگرتن بەسەر شارەوانیی مەهاباد دا بە هاندانی کۆمەڵەو بە هەوڵ و کۆششی یەکێك لە دامەزرێنەرانی بە ناوی حوسێن فرووهەر (ناسراو بە حوسێن زێڕ یا زێڕنگەر) کە بۆخۆی کارمەندی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی مەهاباد بوو، بەڕێوە چوو. دوکتۆر ئاسۆ کە بۆخۆی لە نزیکەوە ئاگای لە رووداوەکە بووە نووسیویەتی:

"رۆژێك لەو ساڵە پڕئاژاوەو نائەمنانە بوو کە لەگەڵ خوالێخۆشبوو عەزیز فەرهادی بەڕێگە دا دەرۆیشتین و گوتیان عەزیز کرمانج لەبەردەم شارەداری وتار دەدا. بە پێی قسەی خەڵك‌و ئەو راستییانەی لە بەرچاوبوون، عەزیز کرمانج لەژێر کاریگەریی حوسێن فرووهەر دەیویست شۆڕش بکاو سۆسیالیزم جێگیر بکا، کاربەدەستانی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس کە تاکە نوێنەری بێ دەسەڵاتی دەوڵەت بوون، لەشار وەدەر نێن." [٢٠]

ئیگلتون دەنووسێ چەند ساتێك پێش هێرشی خەڵك بۆ سەر بینایەی شارەبانی پیاوێك بە نێوی عەزیز خان (عەزیز کرمانج) لە مەیدانی چوارچرای شاری مەهاباد سەرگەرمی قسەکردن بوو سەبارەت بە فەرهەنگ و ناسنامەی میللیی کوردەکان، هەر ئەویش بوو خەڵکی هاندا هێرش بکەنە سەر بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس. [٢١] لە ئەنجامی ئەو هێرشەدا حەوت پۆلیس کوژران و بنکەی پۆلیسیش وێران بوو. دانیشتووانی شار لەو رۆژانەدا لە چۆنیەتیی دابەشکردنی قەند و شەکر ناڕازی بوون، چونکە بەردەوام کۆمەڵێك لە کاربەدەستانی دەوڵەت و سەرۆك هۆزەکان دەستیان دەخستە نێو ئەو بەشەی خەڵکی مەهاباد کە مانگانە دابەش دەکرا. بە پێی بەڵگەکانی وەزارەتی نێوخۆ یەکێك لە هۆیەکانی ناکۆکیی نێوان کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتی مەرکەزیدا، ناڕازیبوونیان لە شێوەی دابەشکردنی قەند و شەکر بوو. تەنانەت لە رۆژەکانی دروستبوونی کۆماری مەهابادیش دا هەروا بە چارەسەر نەکراوەیی مایەوە. یەکێك لە راپۆرتەکانی وەزارتی شاهەنشاهی لە رێکەوتی (١٦ی سەرماوەزی ١٣٢٣) ١٩٤٤ز بۆ سەرۆك وەزیران، لە بارەی بارودۆخی ئازەربایجانی رۆژئاوا، ئاماژە بە پێشنیاری پارێزگاری ئەو پارێزگایە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی قەند و شەکری مەهاباد دەداو تێیدا روون کراوەتەوە کە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە ویستی سەرۆکەکان، ئاغا کوردەکان‌و نوێنەرەکانی مەهابادی لە مەجلیسی شوورای میللی لەگەڵ دایە. [٢٢]

هەروەها لە راپۆرتی فەرمانداریی مەهاباد بۆ وەزارەتی نێوخۆ لە رێکەوتی (١٦ی پووشپەڕی ١٣٢٤) ١٩٤٥ز دا هاتووە کە خەڵکی شار لە چۆنیەتیی دابەشکردنی چا، قەند و شەکر بە

توندی تووڕەنو لە ڕێگەی قازی محەممەد کە ڕۆڵی پێشڕەوی وەئەستۆ گرتووە، وێڕای ناڕەزایەتی دەربڕین بەرامبەر بە بیروکراسیی زاڵ بەسەر سیستمی کارگێڕی دەوڵەت دا، بە فەرمانداد دەڵێن:

"فەرماندار کە نوێنەری ڕەسمی دەوڵەتەو کارمەندی پایەبەرزی وەزارەتی نێوخۆیە ئەگەر لەو هەلومەرجە شڵەژاوەدا، نەتوانێ روخسەتی دابەشکردنی سەهمیەی خەڵك بدا، بۆچی لە مەهاباد دا ماوەتەوە؟ "[٢٣]

ئاشکرایە کە تۆوی بێزاریی خەڵك بەرامبەر دەوڵەت لە نێو مەهاباد دا چێنرابوو، کۆمەڵەش ئەو بێزارییەی ئاراستە کردووە. دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە قازی محەممەد ئاگای لەو کارەی کۆمەڵەی (ژ.ك) نەبوو، چونکە لەگەڵ توندوتیژیدا نەبوو. سەرۆکی شارەبانی لە ماڵی خۆی پەنا داو تەرمی کوژراوەکانیشی بەخاك سپارد.[٢٤]

پرسیار ئەوەیە ئامانجی کۆمەڵە لە وێرانکردنی بنکەی پۆلیسی مەهاباد چ بوو؟ بە دڵنیاییەوە دەیویست بەو هەنگاوە، تاکە نیشانەی سەربازی و هەواڵگری دەوڵەتی ناوەندی لە ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجان لەناو بباو کۆتایی بە ئامادەبوونی لەو ناوچانەدا بهێنێ. لە ڕاستیدا ئەو جووڵانەوەیە هەلومەرجێکی ئامادە کرد کە هاووڵاتیانی کوردی دەیانتوانی جڵەوی کاروبارەکان بە دەستەوە بگرنو لەو ڕێگەیەوە کەش و هەوای کراوەتر بۆ بزووتنەوەی سیاسیی لایەنگران و ئەندامانی کۆمەڵە دەهاتە ئاراوە. بە کورتی ئامانجەکانی ئەو کارە لە بەرژەوەندیی کۆمەڵەی ژ.ك دابوو. دوکتۆر ئاسۆ باس دەکا کە هەر بە دوای نەمانی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، خەڵکی مەهاباد کەوتنە دروستکردنی ئەنجوومەنێکی پیشەیی کە قازی محەممەد ڕۆڵی ڕێبەرو ڕێکخەری تێدا دەبینی.[٢٥]

بەم شێوەیە دەبینین کە قازی محەممەد وەك پارێزەری مافەکانی خەڵك لە بەرامبەر عەشایرو دەوڵەتی ناوەندی و هەروەها وەك کەسایەتییەك کە دەیویست هێزە سیاسییەکانی کورد لە هەمبەر ئامانجە نەتەوایەتییەکانی کورد دا یەکگرتوو بکا، لەو ڕووداوەشدا دەستپێشخەری کردو دەسەڵاتی خۆی پێشان داو سەرلەنوێ سەرنجی کاربەدەستانی سۆڤیەتی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە. ڕووسەکانیش بە لەبەرچاوگرتنی ناسراوی و قسەڕۆیشتوویی قازی محەممەد لە لایەك و گرینگیی کۆمەڵە بۆ ئامانجەکانی داهاتوویان لە لایەکی دیکەوە بڕیاریان دا ئەو دووانە لێك نزیك بکەنەوە.

# ئەندامەتیی قازی محەممەد لە کۆمەڵەدا

دوای ئەوەی ئەندامانی کۆمەڵە لەگەڵ کاربەدەستان و ئەفسەرانی لەشکری سووردا پێوەندییان گرت، زەرورەتی پێکهێنانی ڕێبەریەکی بەهێز بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر هەستی پێدەکرا. ویلیام دۆگلاس سەبارەت بەو هۆیانەی کە بوونە هۆی ئەندامەتیی قازی محەممەد لە کۆمەڵەدا دەنووسێ:

"دوای پێکهێنانی ئەنجوومەنی دۆستایەتیی کوردستان و سۆڤیەت و بەرێخستنی سیناریۆیەك لە بارەی کوردستان، ڕووسەکان ڕۆڵێکی تازەتریان لە کێشەکاندا وەئەستۆ گرت. ئەوان لە چەند کەسایەتیی پایەبەرزی کوردی نزیکبوونەوەو داوایان لـێکردن بەرپرسایەتی بزووتنەوەی کۆمەڵە بخەنە ئەستۆو یەکێك لەو کەسایەتییانە هاوڕێی من عومەرخانی شەریفی بوو، کە هەموو ئەو کەسایەتییانە خۆیان لەو کارە بوارد، لە ئاکام دا ڕووسەکان قازی محەممەدیان هەڵبژارد کە کوردێکی سەربە چینی ناوەند بوو."(٢٦)

ڕووسەکان لە میانەی یەکەم سەردانی شاندی کورد بۆ یەکێتیی سۆڤیەت لە ساڵی (١٣٢٠) ١٩٤١ز دا، لەگەڵ بیروبۆچوون و تێفکرینی قازی محەممەد دا ئاشنابیوون. ئاگایان لە وتووێژەکانی قازی لەگەڵ ئۆرکرت (Urquert) کۆنسولی بەریتانیا لە تەورێزو دوکرسپینی ئیرڤایس مارشاڵی بەریتانیا لە عێراق هەبوو، کە لە نێوەڕاستی ساڵی (١٩٤٢) سەبارەت بە سەربەخۆیی کوردستان ئەنجامیان دابوو.

قازی محەممەد جێی باوەڕی خەڵك و لە کاروباری سیاسییدا شێلگیرو ماندوونەناس بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کەسایەتییەکی زانا و ئەهلی زانست بوو، شانۆنامەشی دەنووسی. کاتێك شانۆی (دایکی نیشتمان) لە هۆڵی بینایەی ئەنجوومەنی دۆستایەتیی کوردو سۆڤیەت لەسەر سەکۆ پێشکەشکرا، هەستی نەتەوەیی کوردەکانی بەتوندی جووڵاند.

نووسەری وتاری "مهاباد و مەرگی قازییەکان" دەنووسێ کە لە میانەی دادگایی کردنی قازی محەممەد لە دادگای سەربازی، ئاماژە بە کاریگەریی ئەو شانۆیانە کرابوو کە لە دژی شا هێنابوونیە سەر سەکۆ.(٢٧)

قازی محەممەد بە توندی لە ڕژێمی پەهلەوی ناڕازی بوو، چەند جاریش بۆ بەرگریکردن لە خەڵکی کورد لەگەڵ ـ کەسانی بەرپرس‌و بۆ نموونە خودی شادا لە تاران چاوپێکەوتنێکی کردو بۆ لایەنگری کردن لە ڕێکخراوە ناسیۆنالیستە کوردییەکان لە ڕێبەرانی کۆمەڵەش بەباوەڕتر بوو. هەموو ئەو هۆیانە دەستیان خستە ناودەستی یەك‌و لە ئەنجامدا کاربەدەستانی نهێنیی سرڤیسی سیخوڕیی سۆڤیەت (چکا)و ئەفسەرانی

سوپای سوور، قازی محەممەدیان بە کەسێکی گونجاو بۆ ڕێبەری کردنی کۆمەڵە دەستنیشان کرد. بێجگە لە دۆگلاس کە ئاماژە بە دەوری سۆڤیەت دەکا سەبارەت بەوەی قازی محەممەد ببێتە ئەندامی کۆمەڵە، "رۆزڤێلت"یش دەنووسێ: "... کۆمەڵە لەژێر فشاری سۆڤیەتدا قازی محەممەدی وەك ئەندام وەرگرت... ."(28)

بەڵام ئیگلتۆن بەبێ ئەوەی ئاماژە بەو مەسەلەیە بکا ، دەنووسێ کە کۆمەڵە دوای دوو ساڵ دوودڵیو وردبوونەوە، لە بارەی راکێشانی قازی محەممەد بۆنێو کۆمەڵە، کە کەسایەتیی ناسراو و ڕێنیشاندەری خەڵکی مەهاباد بوو، سەرەنجام بۆ هاوکاریکردنی کۆمەڵە بانگهێشتی کردو ئەویش بێ وەدرەنگ خستن پەسندی کرد.(29)

وا دێتە بەرچاو کە ئەندامەتیی قازی لە کۆمەڵەدا، شێوەیەکی سەپاندنی هەبووبێ، ئەگەر ڕێبەرانی حیزب، خۆشیان لەو مەسەلەیە هاتبا، چاوەڕوانی ڕێنوێنی سۆڤیەتیان نەدەکردو هەر لە سەرەتاوە داوای هاوکاریو یارمەتییان لێ دەکرد. هیچ پاساوێکیش نەدەبوو بۆوەی کە دوو ساڵی تەواو لە وەرگرتنیدا چاوەڕوان بن. پرسیارێك کە دێتە پێش ئەوەیە کە بۆچی کۆمەڵە لە وەرگرتنی قازیدا تووشی ترس و دڵەڕاوکێ ببوو؟ درك کنیان بەم شێوەیە وەڵام دەداتەوە:

"ئەندامەتیی قازی بۆیە وەدرەنگ کەوتبوو، چونکە سەرەڕای ئەوەی جێگەی ڕێزی زۆربەی خەڵك بوو، ئەندامانی کۆمەڵە ترسی ئەوەیان هەبوو کە بەو هەموو ڕێزو ناوداریییەی کە هەیەتی، خێرا دەسەڵات بێنێتە ژێر دەستی خۆیەوە، ئەو نیگەرانییەش لەخۆڕا نەبوو: زۆری نەخایاند قازی وەك سیمای بەهێزی کۆمەڵە دەرکەوت.(30)

رۆزڤێلت لەو بارەیەوە دەنووسێ: "ڕێبەرانی کۆمەڵە بەنیازبوون قازی بە ئەندام وەرنەگرن، چونکە دەترسان لەوەی قازی بەو کەسایەتییە بەهێزو پاوانخوازەی کە هەیەتیو بەو هەموو ڕێزەی کە لێی بەهرەمەندە، هەرزوو دەسەڵاتی تاکەکەسیی خۆی بسەپێنێ و خەسڵەتی دیموکراسیی کۆمەڵەکە لەنێو ببا. کاتێك کۆمەڵە لەژێر فشاری سۆڤیەتدا قازی بە ئەندام وەرگرت، ڕێك ئەو شتە ڕوویدا کە لێی دەترسان: قازی محەممەد دەسەڵاتی تاکەکەسیی لەنێو کۆمەڵەدا دامەزراند."(31)

کریس کۆچێراش لەسەر ئەو باوەڕەیە کە:

"نیگەرانیی دامەزرێنەرانی کۆمەڵە وەراست گەڕاو قازی بە زوویی جڵەوی کۆمەڵەی وەدەست گرتو بە شێوەیەك بەڕێوەی برد کە دەتگوت سەرۆك بۆخۆیەتی."(۳۲)

قازی بە حوکمی ئەو نفووزە کۆمەڵایەتی و کەسایەتییە بەهێزو روحیەتە دەسەڵاتخوازییەی کە هەیبوو، هیچ کات وەك ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب هەڵنەبژێردراو دوای ئەندامەتی لە کۆمەڵەدا، ناوی خوازراوی "بینایی"یان بۆ هەڵبژارد. (۳۳)

ئەو لە خەرمانانی (۱۳۲۳) ۱۹٤٤ز بە ئەندامبوونی لە کۆمەڵەدا پێگەی خۆی زیاتر لە جاران لەنێو کوردەکان بەگشتی و کوردەکانی مەهاباد دا بە تایبەتی قایم کردو گەیشتە ئەو باوەڕەی کە دەبێ لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت هاوکاری بکا. چونکە قازی هەر لە سەرەتای هاتنی رووس و ئینگلیزەکان بۆ خاکی ئێران، سەرقاڵی هەڵسەنگاندنی سیاسەتی ئەو دوو زلهێزە لە بەرامبەر کوردەکان دابوو. نفووزی یەکێتیی سۆڤیەت لە نێو کۆمەڵەدا کە پێشتر لە رێگەی هاوکاریی نێوانیانەوە دەپارێزرا، ئێستا لە رێگەی قازی محەممەدەوە بەهێزتر دەکرا.

# کاریگەریی قازی محەممەد لەسەر
# سیاسەت و ئامانجەکانی کۆمەڵەی ژ.ك

دوای ئەندامەتیی قازی لە کۆمەڵەدا، لاپەڕەیەکی نویێ لە ڕەوتی سیاسەتەکانی حیزبو لە ئەنجامیشدا لە مێژووی ناسیۆنالیزمی کوردی هەڵدرایەوە، کە کاریگەرییەکانی تا ئەوڕۆش هەستی پێ دەکرێ. هەڵبەت پێویستە بزانرێ ئەو هەموو گۆڕانکارییە لە ئەندێشە و بیروبۆچوونەکانی قازی محەممەدەوە سەرچاوەی نەدەگرت، بەڵکو دەگەڕایەوە بۆ شوێنگەی ئێران لە کۆتایی شەڕی جیهانیی دووهەم و هەڵوێست گرتن و ئامانجی سۆڤیەت و بارودۆخی ئازەربایجان و دەرکەوتنی فیرقەی دیمۆکرات. سەبارەت بە بیروڕاو لێکدانەوەی تایبەتیی قازی محەممەد بۆ ناسیۆنالیزمی کوردی و مافی کوردەکان، دەبێ بڵێین کە ئەو باوەڕی بە کوردستانی گەورە هەبوو، ئەو کەسانەی قازییان لە نووسینگەکەی خۆی لە مەهابادا بینیوە، باسی نەخشەیەکی کوردستانی چاپی لەندەن دەکەن کە لەژوور سەریەوە هەڵواسرا بوو کە سنوورەکەی کوردستانی تورکیە و ئێران و عێراق و سووریە و بەشێك لە ئەرمەنستانی سۆڤیەتی دەگرتەوە، لە سەرێکەوە دەگەیشتە بەندەری ئەسکەندەرونە لەسەر دەریای ناوەڕاستو لە سەرێکی دیکەشەوە لە ڕێگەی لوڕستان و خووزستان و دەشتستان، لە سنووری جیاکەرەوەی نێوان بووشەهرو هندیجان، بە کەنداوی فارس کۆتایی دەهات.

ئەرفەع دەنووسێ لەو نەخشەیەدا هەموو ئەو شارانەی کە کوردنشین نەبوون وەك ئەرزەرۆم، ئەرزنجان، قارس، ماکۆ، سەڵماس، مووسڵ و ورمێ، خرابوونە سەر کوردستان و بەو شێوەیە قازی دەیویست ببێتە ڕێبەری هەموو کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست. (٣٤)

ئیگلتۆن لە بارەی ئەو نەخشەیەوە کە پێیوایە سەبارەت بە سنووری ناوچە کوردنشینەکان زیادەڕەوی تێدا کراوە، دەنووسێ:

"دەیانگوت ئەو نەخشەیە ئینگلیزەکان ئامادەیان کردووە، بەڵام لە ڕاستیدا لە لایەن "کۆمەڵەی کورد" لە بەیروت کێشرابوو کە بەدرخانییەکان لە بەڕێوەبردنی ئەو کۆمەڵەیەدا چالاك بوون. "(٣٥)

لە ڕاستیدا چەند گرووپێکی توندڕەو و ئایدیالیست لە نێو حیزبە کوردییەکانی ئەو سەردەمەدا هەبوون، کە داوای پێکهێنانی کوردستانی گەورەیان دەکرد، (بە پێچەوانەی هیواو کۆمەڵەی (ژ.ك) کە خوازیاری خودموختاری بوون لە چوارچێوەی وڵاتەکانیاندا) بەبێ گوێدانە هەلومەرجی ڕۆژهەڵاتی

نێوەڕاست و پێگەی کۆمەڵی کوردی. دروشمی دوور لە واقعیان هەڵگرتبوو. ئاشکراشە قازی لەگەڵیان دا هاوڕا بوو بۆ بەدیهێنانی (Irredantism) الحاق گرایی۱. بەو جۆرەی کە ئەوان دەیانویست تێدەکۆشا. بە زوویی لێکدانەوەی قازی بۆ ناسیۆنالیزمی کوردی جێگەی تێگەیشتنی ئەندامانی کۆمەڵەی گرتەوە. خەباتی چەکدارانەو بیری جیاخوازی لە ئێران جێگەی بەم بیری خەباتی سیاسیی و پێکهێنانی چاکسازیو گۆڕانکاری لە کوردستان (ئەویش لە رێگەی بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی فەرهەنگیی کوردان لەچوارچێوەی ئێران) دا چۆل کرد. بەڵگەیەك لەبەر دەست دایە کە دەیسەلمێنێ، چەکداربوونی ئەندامانی کۆمەڵە و دامەزراندنی گرووپی چەکدارانە لە داهێنانی قازی بووە، نابێ ئەو مەسەلەیەشمان لەبیرچێ کە زیاتر بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هۆزەکان خەڵکی مەهابادی چەکدارکردبوو. لوئیس فاوست نووسەری کتێبی "ئێران و شەڕی سارد" بەپشتبەستن بە دۆکیومێنتەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دەنووسێ:

"لە ناوچەکانی رۆژئاوای ئازەربایجان، قازی محەممەد رێبەرایەتیی کۆمەڵەی (کە گرووپێکی خۆجێیی ناسیۆنالیستی کوردی بوو) وەئەستۆ گرت، راپۆرتیش نێردرا کە لە مەهاباد سەرقاڵی پێکهێنانی هێزێکی سەربازییە."(٣٦)

قازی پێش سەردانی دووهەمی بۆ سۆڤیەت، هەنگاوی پێویستی بۆ رێنوێنی کردنی کۆمەڵە رووەو شەڕی چەکدارانە هەڵێنابوو، بەڵگەی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا کە فاوست پشتی پێ دەبەستێ بە ژمارەی FO37/45458 رێکەوتی (٦ی ئایاری ١٩٤٥) بەرامبەر لەگەڵ (١٠ی بانەمەڕی ١٣٢٤)، ئەو راستییە دەسەلمێنێ.(٣٧) لە کاتێکدا ئیگلتۆن بانگەشەی ئەوە دەکا کە قازی دوای گەڕانەوەی لە سەردانی دووهەمی بۆ یەکێتیی سۆڤیەت، لە جۆزەردانی (١٣٢٤) ١٩٤٥ز دا وا لەگەڵ رووسەکان رێکەوت کە هاوکاری کاروباری بازرگانیی سۆڤیەت لە مەهاباد بەناوی بابایف بۆ چەکدارکردنی ئەندامانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان هەنگاوی پێویست هەڵێنێتەوە.(٣٨) کەواتە دەردەکەوێ کە قازییش بە راسپاردەکانی باقرۆف و رووسەکان رێگەی خەباتی چەکدارانەی لە نێو کۆمەڵەدا خۆش کردبوو.

قازی کە تێبینیی کردبوو، بە نزیکبوونەوەی کۆتاییەکانی شەڕی جیهانی، سۆڤیەت سیاسەتێکی فرەوانخوازانە لەهەمبەر ئێران دا دەگرێتە پێش، رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر کۆمەڵەی دەخستە سەر هێڵی سیاسیی سۆڤیەت و لەولاشەوە مەودای لەگەڵ کۆمەڵگەی ئێرانی و دەوڵەتی ناوەندی پتر

---

1 Irredantism: وەسەریەك خستنەوەی، چەند پارچەی دابەشکراوی ولاتێك.

دەبوو. ئەو دڵنیایی و خەیاڵ ئاسوودەییەی سۆڤیەتییەکان لە میانەی سەردانی دووهەمی شاندی کوردیدا بە قازییان دابوو، رووەو توندڕەوییەکی زیاتری هان دەدا. لەو سەردانەدا باقرۆف بەڵێن بە رێبەری کۆمەڵە دەدا، کە چەك و تەقەمەنی و ئامێری چاپ بە کوردەکان بداو خودموختاری و ئازادیی خەڵکی کوردیش لەژێر سایەی پارێزگاریکردنی یەکێتیی سۆڤیەت بێنێتە دی.[٣٩]

رووسەکان بە کینایەوە پێناسەی مافی کوردەکانیان دەکردو لەشێوەی "میللەت"ێك دا وێنایان دەکردن کە گوایە بۆخۆشیان تا ئەو کات لە میللەتبوونیان بێئاگابوون و لەگەڵ ئەو پێناسەیەشدا قسەیان لەسەر "دەرفەت"ێکی زێڕینو بێ هاوتا بوو، کە ئامادەیی هێزە سەربازییەکانی سۆڤیەت لە ئێراندا بە نسیبی کردبوون.

بەڵێنی جیاکردنەوەی کوردستان بەهۆی چەکە نێردراوەکانی مۆسکۆ و بە بەهرە وەرگرتن لە پارێزگاری سیاسیی دەوڵەتێکی بەهێزی وەك یەکێتیی سۆڤیەت (کە لەو رۆژانەدا وەك یەکێك لە دوو زلهێزی گەورەی جیهان هاتبووە مەیدانەوە) قازی محەممەد و بەرهەڵستکارانی دیکەی تووشی دڵەراوکێ کردبوو کە لە ئەنجامدا کۆمەڵەی (ژ.ك) لە سەرەتاکانی ساڵی (١٣٢٤) ١٩٤٥ز دا بە رادەی پێویست لەگەڵ ئامانجەکانی پێشووی خۆی کە واقعبینانە دارێژرابوون مەودای گرتو پێی نایە رێڕەوێکەوە کە قازی و رووسەکان دیاریان کردبوو. رێڕەوێك کە لەگەڵ هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کوردستانو ئێراندا نەدەگونجا. لە لایەکی دیکەشەوە رووداوەکانی ئازەربایجان و هەڵوێستەکانی پیشەوەری و فرقەی دیمۆکرات سەرلەنوێ جیاوازی و ناکۆکییە نەریتییەکەی کورد و ئازەری، یان کورد و عەجەمی زیندوو کردەوە کە لە سەردەمی حکوومەتی بیست ساڵەی رەزاشا دا دەرفەتێکی کەمتری دەرکەوتنو گەشەکردنی پێ درابوو. کوردەکان دەیان دی ئازەرییەکان بە پشتیوانی دەوڵەتێکی دەرەکی رووەو بەدەستهێنانی سەربەخۆیی هەنگاو دەنێنو ئەگەر وەخۆ نەکەون سەریان بێ کڵاو دەمێنێتەوەو دەبێ لە بەرامبەر ئاغایەتیی ئازەرییەکاندا ملکەچ بکەن. ئەو هەستە هانی دان ئەوانیش رێك داوای ئەو شتانە بکەن کە فرقەی دیمۆکرات لە دەوڵەتی ناوەندی داوای دەکردن. وێدەچێ هەر لەو پێوەندییە دا ئەندامانی کۆمەڵەش لەگەڵ قازی دا هاوڕابووبن.

لە بارەی بارودۆخی وڵاتیشەوە دەبێ بگوترێ لاوازیی ئێران بەهۆی ئەو قەیرانە ئابوورییەی لە داگیرکاریی هاوپەیمانەکانەوە سەرچاوەی دەگرت، بێهێزیی سیاسیی و تەمەن کورتی کابینەکان کە لە ساڵی ١٣٢٠ ١٩٤١ز بەدواوە تەمەنیان هەرگیز نەگەیشتە ساڵێك و ئیفلیجبوونی باری کارگێڕیو سەربازی بە تایبەتی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت و پەککەوتنی هێزە

میللییەکان، هەلومەرجێکی گونجاویان بۆ گەشەکردنی هەستی جیاخوازی لە نێو کەمایەتییە نەتەوەییەکاندا هێنابووە گۆڕێ. تاکە هۆیەك کە ئەو نەتەوانەی بە ئێران بەستبووە، پاشماوەی پێوەندیی فەرهەنگیو ئایینییەکان لەگەڵ نەتەوەکانی دیکەی ئێران دابوو.

بەڵام دوایین هۆکاری کاریگەر لە گۆڕین و توندوتیژترکردنی سیاسەتەکانی کۆمەڵە بۆ ئەو پەیمانە ئەخلاقییە دەگەڕایەوە کە ئەندامانی کۆمەڵە و خودی قازی محەممەد سەبارەت بە ئامانجی کوردەکانی دراوسێیان بەستبوویان. دوای شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران، شۆڕشی سەید رەزا لە دەرسیمو راپەڕینی ئارارات لە تورکیە و بزووتنەوەکەی شێخ مەحموودو مەلا مستەفا لە عێراق و ناکامیو سەرنەکەوتنی خەباتکارانی گەلی کورد لەو جووڵانەوانەدا، ئێستا تروسکایی ئومێدێك کە لەلایەن یەکێتیی سۆڤیەتەوە بە کۆمەڵە درابوو، بەدی دەکرا. بەوتەی خودی سۆڤیەتییەکان ئەوە بە سەرەتای ئازادی کوردەکانی عێراق و تورکیە دەهاتە ئەژمار، سوود لـێ وەرنەگرتن و نەقۆستنەوەی دەرفەتێکی ئەوتۆش بە تاوان و خیانەت دادەنرا. نابێ چاوەڕوانیی پارتە کوردییەکانی هاوسێو ئەو فشارەی دەیان خستە سەر کۆمەڵە بە کەم بگرین. مەهاباد لەو کاتەدا پێشوازیی لە ناسیۆنالیستە ناودارەکانی کورد وەك قەدری بەگ، پیرەمێرد، قانع، مەلا مستەفای بارزانی و کەسانی دیکە دەکرد، کە وەپشتگوێ خستنی داواکانیان لە توانای قازی و ئەندامانی پایەبەرزی کۆمەڵە دا نەبوو. بە دڵنیاییەوە ئەو هەستی هاوپەیمانییە لەگەڵ حیزبی هیوا زۆر بەهێز بوو، هەر لەبەر ئەوەش بوو کۆمەڵە هەوڵیدا کە سیاسەتێکی هاوتاو گونجاو لەگەڵ سیاسەتی پارتە کوردییەکانی دیکە بگرێتە پێش.

# ڕێکەوتننامەی (سێ سنوور) و هاوپەیمانیەتیی کۆمەڵە لەگەڵ کوردەکانی تورکیە و عێراق و سووریە

پاش ئەندامەتیی قازی محەممەد لە کۆمەڵەی (ژ.ك)و دەرکەوتنی وەك سیمای چارەنووسسازو بێهاوتای حیزب وردەوردە دروشمگەلی وەك گۆڕانکاری فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی ئاشتیخوازانەو لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئێراندا جێیێیان چۆل کردو ناسیۆنالیزمی سیاسیی جێگەی گرتەوە کە ئامانجەکانی پێکهێنانی سیستمێکی سەربەخۆو گشتگیری کوردو کۆشش بۆ دامەزراندنی کوردستانی گەورە بوو. لە سۆنگەی وەدیهێنانی ئەو دروشمە بوو کە کۆمەڵە لە مارسی (١٩٤٤) دا یەکێك لە ئەندامەکانی خۆی بە ناوی (محمد ئەمین شەرەفی) ناردە کەرکوكو تا بەپێی نووسینەکەی ئیگلتۆن "... لەگەڵ نوێنەرانی حیزبی هیواو لە بارەی بەرنامەکانی داهاتوو و هاوکاریکردنی یەکتری وتووێژ بکەن."[٤٠]

ئەندامانی هیوا لەو دانیشتنانەدا بریتی بوون لە: (عزەت عەبدولعەزیز، مستەفا خۆشناو، شێخ قادری برای شێخ مەحموودی بەرزنجی، سەید عەبدولعەزیز گەیلانی کوڕی سەید عەبدوڵلا گەیلانیو رەفیق حیلمی.) بەشێك لەو ئەندامانە کەسایەتیی سەربازیی پایەبەرزبوون کە دواتر لە پێکهێنانو بەڕێوەبردنی سوپای کۆماری مەهاباد، ڕۆڵی سەرەکییان گێڕا. ئاشکرایە کۆمەڵە بۆ بەستنی پەیمانێك لە نێو پارتە کوردییەکاندا تێدەکۆشاو لەو لاشەوە دەیویست بە شێوەیەکی فرەوانتر سوود لە ئەزموونەکانی هیوا وەربگرێ. چونکە یەکسەر دوای ئەم دانیشتن و چاوپێکەوتنە لقی سلێمانیی هیوا کە بەبەراوردکردنی لەگەڵ کەرکوك دا لە سنووری ئێرانەوە نزیکتر بوو چەند نوێنەرێکی نارده مەهاباد.

لە ئاکامدا لە مانگی ئووتی (١٩٤٤) لە ناوچەی سنووری داڵانپەڕ، کە سنووری هاوبەشی نێوان تورکیە، عێراق و ئێرانە، پەیمانی ناسراو بە "سێ سنوور" لە نێوان قاسم قادری، نوێنەری (ژ.ك)، شێخ عەبدوڵلا زێنوێیی نوێنەری هیواو قازی مەلا وەهاب نوێنەری کوردەکانی تورکیە، ئیمزا کرا. ئیگلتۆن دەنووسێ کە ئەو پەیمانە "... پێشەکییەك بوو بۆ هاوکاریکردنی یەکدی، دابەشکردنی پێداویستیو هێزی مرۆیی لە نێوان پارتەکان بۆ پێکهێنانی کوردستانێکی گەورە."[٤١]

لەو ڕووەوە کە کوردەکانی تورکیە و عێراق لە هەلومەرجێکی ئەوتۆ دا نەبوون کە بتوانن هەنگاوێك لە پێناو ئەو دروشمەدا هەڵێننەوە، وێدەچوو ئەو ئەرکە بکەوێتە سەرشانی (ژ.ك)، وادەردەکەوت کە ئازەربایجان لەبەردەم دەروازی گۆڕنکاریی قووڵ دایەو ڕێبەرانی حیزبیش دەیانویست لە هەلومەرجی

نوێدا پشتیوانی حیزبە کوردییەکان وەدەست خەنو بەم شێوەیە رێگە لە ئەگەری پەیدابوونی هەر بزووتنەوەیەکی هۆزایەتی لەو دیوی سنوور دژی کۆمەڵە بگرنو وەك دیارە رێبەری کۆمەڵە ئومێدێکی بە پشتیوانیی دانیشتووانی پارێزگای کوردستان نەبووە.

(بوا) بە لێکدانەوەی ئاڵوگۆڕەکانی دەرەوەی سنوور، روونی دەکاتەوە کە بەستنی پەیمانی سێ سنوورو ئەو ئامادەکارییەی پێشتر بۆی کرابوو، ئاماژەیەك بوو بۆ دروستبوونی دەوڵەتی کوردەکانی ئێران و دارشتنی بناغەی کوردستانی گەورە، لەو بارەیەوە دەنووسێ:

"لە ئادار و نیسانی (١٩٤٤)ی ز، کوردەکانی ئێران لەگەڵ هیواو حیزبی کۆمۆنیستی عێراق (لە راستیدا لقە کوردییەکەی ئەو حیزبە) بەمەبەستی دروستکردنی بەرەیەکی رزگاری کوردی یان حیزبی رزگاریخوازی کوردەکان، پێوەندییان بەست. لە مانگی ئایاری هەمان ساڵدا کوردەکانی ئێران بە رێکەوتن لەگەڵ کوردەکانی عێراق ئاڵای میللیی کوردەکانیان هەڵبژارد، ئەو ئاڵایە لە سێ رەنگی سوورو سپیو سەوز پێکدەهات کە خۆرێك لە ناوەوەی دابوو."(٤٢)

ئەندامانی (ژ.ك) بە لەبەرچاو گرتنی ئەو پشتیوانییەی کە سۆڤیەت لێی دەکردن، ئاسۆی ئایندەیان روناك و دەرفەتیشیان بۆ دروستکردنی یەکەمین حکوومەتی سەربەخۆی کوردی گونجاو دەدی. "حەسەن ئەرفەع"یش پێیوایە ئامانجی چاوپێکەوتنەکانی سەرانی کۆمەڵە لەگەڵ پارتە کوردییەکانی دیکەو گرێدانی پەیمانی سێ سنوور، پێکهێنانی کوردستانی گەورە بووەو یەکێتیی سۆڤیەتیشیان بە ئامادەکاری ئەو زەمینەیە دەناسی."(٤٣)

لێرە بە دواوە، هەموو هەوڵەکانی کۆمەڵە لەپێناو دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی خرانە گەرو لەو لاشەوە هەوڵی رێکخراوە کوردییەکان و کەسایەتییە ناسراوەکان بۆ ناساندنی کێشەی کورد لە ئاستی نێونەتەوەییدا پەرەی سەند. لە رۆژی (٣٠ی مارسی ١٩٤٥) دا ئیحسان نووری، رێبەری راپەرینەکەی ئارارات لە تارانەوە رووەو ئەورووپا کەوتە رێ. لەوێش لە رێگەی "لیگی کوردییەوە" پەیامێکی بۆ کۆنفرانسی سان فرانسیسکۆ ناردو داوای بە رەسمی ناسینی مافی کوردەکان و پێکهێنانی کۆمیسیۆنێکی نێونەتەوەیی بۆ لێك دانەوەو تاوتوێکردنی بارودۆخی ناوچە کوردییەکانی رۆژهەڵاتی نێوەراست کرد.(٤٤)

ئەو سەردەم لیگی کورد لە بەیرووت جێگیربوو. بە درێژایی ساڵی (١٩٤٥)، هاوکات لەگەڵ چالاکییەکانی (ژ.ك ) لە ئێران شەڕی چەکداری مەلا مستەفا دژی سوپای عێراقی و بریتانیا لە عێراق، هەوڵ و کۆششێکی فراوانی دەستپێکرد، وێڕای شیکردنەوەی بارودۆخی کوردەکانی رۆژهەڵاتی نێوەراست، چەند پەیامێکی بۆ رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، کۆنفرانسی وەزیرانی

دەرەوەی سێ دەوڵەتی سەرکەوتوو لە مۆسکۆ و کۆنفرانسی سان فرانسیسکۆ نارد. حیزبی هیواش لە نیوەڕاستی ساڵی (١٣٢٣) ١٩٤٤ز، لە دووتوێی نامەیەکدا بۆ لوئی هندرسن وەزیری موختاری ئەمریکا لە عێراق داوای لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد، دەسەڵات و نفووزی خۆی بۆ سەربەخۆیی کوردەکان وەگەڕخاو ماوەیەك دواتریش بەرەی رزگاریی کورد (بەرەی ئازادی)و رێکخراوی لاوانی کوردی عێراق نامەیەکی هاوشێوەیان بۆ وەزیری موختاری ئەمریکا نارد.[٤٥]

ئامانجی سەرەکیی پارتە کوردییەکان ئەوە بوو، کەش و هەوایەکی نێونەتەوەیی بخوڵقێنن کە تیایدا رووداوەکانی کوردستان و پشتیوانی کوردەکانی عێراق و تورکیە و سووریە لە هەنگاوەکانی قازی محەممەدو کۆمەڵە لە لایەن وڵاتانی رۆژئاواوە، بە دیدێکی ئاساییەوە سەیر بکرێ. بێگومان رێکخراوە کوردییەکان کەم و زۆر ئاگایان لە رووداوەکانی مهاباد هەبوو. دەیانویست لەسەر ئاستی نێونەتەوەییشدا ئەو راوبۆچوونە پەرەپێبدەن کە کێشەی کورد بە خواستو ویستی کوردەکان پێی ناوەتە ئەو قۆناغەو یەکێتیی سۆڤیەت لێی بێبەرییە. ئامانجەکانی ئەو کارەش لادان و نەهێشتنی ئەو بیروڕایە بوو کە کوردەکانی ئێرانی بە وابەستەیی کۆمۆنیزم تاوانبار دەکردو لە لایەکی دیکەشەوە کەمکردنەوەی حەساسیەتی جیهان بوو سەبارەت بەو دەورەی سۆڤیەت لە رووداوەکانی کوردستاندا دەیگێڕا. بەم شێوەیە قازی محەممەدو کۆمەڵەی (ژ.ك) ئەو راستییەیان وەپشتگوێ خست کە هاوکاریکردن و یەکگرتن لەگەڵ هێزە ناسیۆنالیستەکانی ئێران، پتر لە هاوکاریکردن لەگەڵ کوردەکانی تورکیە و عێراق بۆ گەشەکردنی فەرهەنگو بە دەستهێنانی ئازادییە مەدەنییەکانی کۆمەڵگەی کوردی، خێریان بۆ دەداتەوە. چونکە بە کردەوە ئیمکانی هاوکاریکردن لە نێو کوردەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست لە رەهەندێکی سیاسییدا پێك نەهاتبوو. باڵادەستی و بەهێزیی ئیمپریالیزمی ئینگلیز لەسەر عێراقو دیکتاتۆریی تۆقێنەری کەمالییەکان لە تورکیەدا، سەلمێنەری ئەو بانگەشەیەن. لە قازانجی کۆمەڵەش دابوو کە تواناو برستی سیاسیی خۆی بۆ بەدەستهێنانی ئازادی ئێران خستبایە کارو لە هەمان کاتیش دا لە چوارچێوەی ناسیۆنالیزمی کولتووری پێوەندیی خۆی لەگەڵ کوردەکانی هاوسێدا پەرەپێدەدا. بە داخەوە کۆمەڵە جیهانی دوو جەمسەر دەدیو لە بری رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئیمپریالیزمی بەریتانیو یەکێتیی سۆڤیەتی فراوانخوازو رژێمی پەهلەویو لەجیاتی هاوکاریکردن لەگەڵ نەتەوەپەروەرە ئێرانییەکان پاڵی وە یەکێتیی سۆڤیەت داو بەو هەنگاوەشی نیشانی دا کە گرنگییەك بۆ ئازادیی نەتەوەکانی دیکەی ئێرانێ دانانێ.

لە سەروبەندی گۆڕانی کۆمەڵە بۆ حیزبی دیمۆکراتدا، دەکرێ خاڵی بێهێزو لاوازی ئەو رێکخراوە لە پەسندکردنی بێ ئەولاو ئەولای بیروبۆچوونەکانی قازی و پشتبەستنی بێ سنوور بە سۆڤیەتو بێ بڕوایی بە هێزە نەتەوەییەکانی ئێراندا کورت بکەینەوە.

دامەزراندنی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران، لە ئەنجامی پێداچوونەوەی ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ك بە سیاسەتەکانی حیزب و هەڵێنجراوی پێویستییە سیاسییەکانی کۆمەڵگەی کوردی نەبوو، بەڵکو لە گۆڕانکارییەکانی ئازەربایجان و ویستی راستەوخۆی سۆڤیەتەوە سەرچاوەی دەگرت و هەلومەرجی دامەزراندنیشی لە درێژەی وتووێژەکانی دووهەم شاندی کوردی، کە لە رەزبەری (١٣٢٤)دا ١٩٤٥ز لە لایەن کاربەدەستانی سۆڤیەتەوە بۆ باکۆ بانگهێشت کرابوون و بە هاوکاری باقرۆف سەرۆك کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەت ئامادە کرابوو.

ئەوسا سۆڤیەت وەك یەکێك لە دوو هێزی سەرکەوتوو لە جەنگی دووهەمی جیهانیدا لە هەموو کاتێك زیاتر بارودۆخی بۆ بەکردەوەیی کردنی ئامانجە ئاڵۆزەکانی خۆی گونجاو دەدیو لە روانگەی سەرانی ئەو دەوڵەتەوە، کاتی ئەوە هاتبوو رێکخراوی سیاسیی و سەربازی لە نێو کوردەکان و ئازەرییەکان دا دروست ببێ، بە هاوکاریی ئەو رێکخراوانە پرۆژەکانیان بخەنە قۆناغی پراکتیکەوە. بەهۆی کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی و بە حوکمی ئەو پەیمانانەی کە سۆڤیەت بە وڵاتانی هاوپەیمانی دابوو، لە بارەی بەجێهێشتنی ئێران دوای شەڕ، نەدەکرا خۆی لە پاشەکشەپێکردنی لەشکری سوور ببوێرێ، مۆسکۆ پێی خۆش با یان نا، دەبوایە بە ناچاری ئەو کارە بکا. لە دوورەوە بە پێویستی دەزانی کە هێزگەلێکی سیاسیی و سەربازی لە جێی یەکە سەربازییەکانی سۆڤیەت لە ئازەربایجاندا پێك بێنێ کە لە نەبوونی سۆڤیەتدا بەڕێوەبەری سیاسەتەکانی مۆسکۆ بن، بۆ شارەزاییش لە بارەی چۆنیەتیی دروستبوونی حیزبی دیمۆکرات دەبێ سەفەری دووەمی شاندی کورد بۆ باکۆ تاوتوێ بکەین.

## دووهەم سەردانی شاندی کوردی بۆ یەکێتیی سۆڤیەت

لە جۆزەردانی (١٣٢٤) ١٩٤٥ز دا، ژەنەراڵ سەلیم ئاتا کشیۆف، نوێنەری سیاسیی لەشکری سوور لە ئازەربایجان، قازی محەممەدو ئەندامانی پایەبەرزی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی بۆ باکۆ بردن. ئەو سەردانە لە هەموو روویەکەوە لەگەڵ سەردانەکەی ساڵی (١٣٢٠) ١٩٤١ز دا جیاوازی هەبوو. چونکە ئێستا هەم ئامانجی رووسەکان روون و دیاربوو، هەم جێگەی کەسانێکی کۆنسرڤاتی (پارێزگاری) وەك ئەمیر ئەسعەدی دێبوکری لە شاندی کورد دا بەتاڵ بوو. دەیان زانی کە چیان دەوێ، سۆڤیەت سەرقاڵی وەرێخستنی شۆڕشێکی دەستکرد بوو لە ئازەربایجاندا، تا ئەو بەشە لە خاکی ئێران بخاتە ژێر فەرمانڕەوایی خۆی و ئەندامانی کۆمەڵەش دەیانویست وڵاتێکی سەربەخۆی

کوردی دامەزرێنن. لە یەکەم سەردانی شاندەکەدا هیچ یەك لەو کەسانەی دواتر بوونە ئەندامی (ژ.ك) بەشدار نەبوونو لە راستیدا ماددەیەکی خاوی سیاسیی بوون کە زیاتر دەوری گوێگرێکی بێدەنگیان دەگێڕاو سۆڤیەتیش لەو کاتەدا بە ناڕوونی باسی داهاتووی دەکرد، بەڵام ئێستا دوودڵیو گومان لەهەر دوو لا رەوی بۆوە. (عەبدوڵلا پشدەری) دەڵێ ئەندامانی کۆمەڵە لەو سەردانەیاندا بیستەکانی خۆیان بە نووسراوە پێشکەش بە سەرانی رووس کردو تێیدا باسیان لە چارەنووسی کوردستان و خەڵکی کورد کردبوو.[1]

پاش وتووێژێکی چڕوپڕ لە نێوان کوردەکان و سەرانی رووسدا، سەرۆك کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەت (میر جەعفەر باقرۆف) رایگەیاند کە لە ئێرانیدا چوار میللەت هەیە: تورك، فارس، گەیلەكو کورد، کە هەر کامیان مافی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان هەیە، دەبێ بەشێك لە کوردەکانیش لە نێو ئازەربایجانی دیمۆکراتدا (کە هەلومەرجە سەرەتاییەکانی دروستبوونی دەوڵەتێکی خودموختاری بۆ ئامادەکرابوو) بمێننەوە، چونکە پارێزگای کوردستان هەروا بەشێکە لە ئێران، بەڵام ئەو پێشنیارە لەگەڵ نارەزایەتیی قازی محەممەد رووبەڕووبۆوە.[2]

پاشان باقرۆف بەڵێنی دا کە سۆڤیەت پێداویستیی سەربازی وەك تانك، تۆپ، موسەلسەل و تفەنگ دەنێرێتە مەهاباد. ئەوە بێجگە لە وەرگرتنی قوتابییانی کورد لە بنکە سەربازییەکانی باکۆ. هەروەها داوا لە پیشەوەرییش دەکا کە هەشتا قوتابی کورد لەو زانکۆیە دا وەربگیرێن کە بەو روانە لە تەورێز دروست دەکرێ. دەزگای چاپیش دەدرێ بە کوردەکان. باقرۆف زەروورەتی گۆڕینی (کۆمەڵەی ژ.ك)یشی بە گوێدا خوێندن و پاساوەکانی بەم جۆرە شیکردەوە:

"کۆمەڵە لە قەبارەی هەنووکەیی خۆیدا، توانای بەڕێوەبردنی هیچ کارێکی نییەو بە لەبەرچاو گرتنی سەرکەوتنەکانی دیمۆکراسی لەسەر ئاستی جیهان بە تایبەتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەریتانیای گەورەو یەکێتیی سۆڤیەتدا، بزووتنەوەی کوردەکان لە ژێر سێبەری "حیزبی دیمۆکراتی کوردستان" دا زیاتر دەچێتە پێش."[3]

عەبدوڵلا پشدەری دەنووسێ کە باقرۆف داوای لە قازی محەممەدو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە کردبوو حیزبی دیمۆکراتی کوردستان لە جێگەی کۆمەڵەی (ژ.ك) دامەزرێنن.[4]

بەو شێوەیە هەلومەرجێکی شیاو بۆ هەڵوەشاندنەوەی (ژ.ك)و دامەزراندنی حیزبێکی مۆدێرنو گونجاو لەگەڵ بارودۆخی رۆژدا، کە لەگەڵ حیزبە پێشکەوتووەکانی ئەوسای جیهان بە گشتیو فرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجاندا بەتایبەتی هاوکاری هەبێ، هاتبووە گۆڕێ. پاش ماوەیەکی کورت لە گەڕانەوەی ئەندامانی شاندە کوردییەکە لە باکۆ بۆ مەهاباد، ئەو ویستەی رووسەکان هاتە دی.

# چۆنیەتیی دامەزرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان

بیست ڕۆژ دوای گەڕانەوەی قازی محەممەد و کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە لە باکۆوە بۆ مەهاباد، واتە لە (پووشپەڕی ١٣٢٤) ١٩٤٥ز، بڕیاری کۆتایی لەبارەی دامەزراندنی حیزبێکی نوێ دراو لەو بارەیەوە قازی ئاماژەی بە چەند خاڵێك داو "... لە کۆبوونەوەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب وێڕای ئاماژەکردن بە سەردانی وەفدی شاندێکی کوردی بۆ باکۆ، باس لە ڕاسپاردەکانی "باقرۆف"یش سەبارەت بە گۆڕینی ناوی حیزب و ڕاگەیاندنی خەباتکردنی ئاشکراو چالاك کردنی لەژێر ئاڵای ئازادیو دیموکراسیدا هاتە گۆڕێ و گوتیشی کە برا ڕووسەکانمان پشتیوانی لە حیزبە تازەکەمان دەکەن."[٥]

(عەبدوڵلا پشدەری) وێڕای شیکردنەوەی وتەکانی قازی و ئاماژەکردن بە ڕاسپاردەکەی باقرۆف لە بارەی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەوە دەنووسێ:

"ئەندامانی کۆمەڵە بە شێوەیەکی گشتی لە بارەی گۆڕینی ناوی ژ.ك بۆ حیزبی دیموکرات هاوڕا بوونو لەو بارەیەوە بڕیاری پێویست دراو دروشمی حیزبی دیموکرات داڕێژرا. "[٦]

هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە و گۆڕانی بۆ حیزبی دیموکرات، ماوەیەك دوای ئینشعابی لقی ئازەربایجانی حیزبی توودەو بوونی بە فرقەی دیموکراتی ئازەربایجان، ڕوویدا. لقی ئازەربایجانی حیزبی توودەو "گرووپی کاوە" کە کۆمەڵەیەکی کۆمۆنیستی بوون، پێکەوە ئیتلافیان کردو فرقەی دیموکراتی ئازەربایجانیان پێك هێنا، کە ڕێبەرەکەی جەعفەر پیشەوەری لە کۆمۆنیستە خاوەن ئەزموونەکانی ئێرانو بەڕێوەبەری گرووپی کاوەو لقی ئازەربایجانی حیزبی توودە بوو. عەلی شەبستەری لە ئەندامانی بەوەجی فرقەی دیموکراتی ئازەربایجان کاتێك کە نووسەرانی کتێبی "دراوسێیەکانی باشووری کوردستان" گفتوگۆی لەگەڵ دەکەن، سەبارەت بە دەرکەوتنی فرقە و چۆنیەتیی دەستێوەردانی سۆڤیەتەکان لەو ڕووداوەدا دەڵێ: "ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی (پاییزی ١٩٤٥)ی ز، ڕووسەکان پیشەوەریان ڕاسپارد کە حیزبی توودەی ئازەربایجان هەڵوەشێنێو لە جیاتی ئەو فرقەی دیموکرات پێك بێنێ."[٧]

یەکێکی دیکە لە ئەندامانی فرقە بۆ نووسەرانی کتێبی ناوبراو باس دەکا کە ڕێکخستنەکانی حیزبی توودە لە ئازەربایجان سەبارەت بە بڕیاری سۆڤیەت بۆ هەڵوەشاندنەوەیان هیچ ڕوونکردنەوەیەکیان نەداوە بە کۆمیتە.[٨]

وردبوونەوە لەو هەلومەرجەی کە هێزە سیاسییەکانی ئازەربایجانی گۆڕی بۆ دوو هێزو ڕێکخستنی وێکچوو و یەك ناوونیشان و ئەو ڕۆڵەی کە سۆڤیەت لە پێکهێنانی ئەو ئاڵوگۆڕانەدا گێڕای ڕووبەڕووی پرسیارێکمان دەکاتەوە کە بۆچی ڕووسەکان هەوڵیان نەدا سوود لە حیزبی توودەی ئێران وەرگرن وەك تاکە ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستیی لایەنگری سۆڤیەت بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکانیان؟

بەڕاستی چ هۆکارێك هەبوو، کە سۆڤیەت هیچ هەوڵێکی بۆ پەرەپێدانی دەسەڵاتی حیزبی توودە لە ئازەربایجان و ناوچە کوردنشینەکاندا لە خۆی نیشان نەدا. بەڵام لە خوراسان و گەیلان و باشوورو ناوەندو بەشەکانی دیکەی ئێران بە توندی پشتیوانیی لەو حیزبە دەکرد؟ ڕووسەکان باش دەیانزانی کە بە پێی پەیمانەکەیان لەگەڵ هاوپەیمانەکان، بە زوویی هێزەکانی خۆیان لە ئێران دەبەنە دەرێ، بەو شێوەیە دەبووایە چەند هەرەمێکی دەسەڵات لە نێو نەتەوەی کوردو ئازەریدا دروست بکەن کە لە غیابی لەشکری سووردا ئامانجەکانی سۆڤیەت بەجێ بگەیەنن. ئەو هەرەمانە هەمان حیزبە ناسیۆنالیستەکانی کوردو تورك بوون، کە بە وتەی ئەلول ساتن دەبوایە بزووتنەوە جیاخوازییەکانی ئازەربایجان پەرە پێبدەنو ڕووەو جیابوونەوە لە ئێران هەنگاو بنێن.(٩)

ڕووسەکان لەو ڕاستییە بێئاگانەبوون کە حیزبی توودە لە توانای دانییە بەرامبەر بە ئازەرییەکان، کوردەکان و فارسەکان لە یەك کاتدا ڕەنگ و ڕوویەکی ناسیۆنالیستی لە خۆی نیشانبدا و بێجگە لەوەش دیارنەبوو کە ئایا هەموو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب و تەنانەت هەیکەلی حیزبەکەش سەبارەت بە بەرنامەکانی سۆڤیەت لە ئازەربایجاندا هاودەنگ و هاوڕان؟ پاشان دیتمان کەسانی وەك خەلیل مەلەکی، جەلال ئال ئەحمەدو ئەنوەر خامەیی بە توندی دژ بە سیاسەتەکانی سۆڤیەت لە ئازەربایجاندا ناڕەزاییان دەربڕی و تەنانەت ئەو مەسەلەیە هاندەرێکیش بوو بۆ جیابوونەوەیان لە حیزبی توودە، هەرچەندە نوورەدین کیانووری هەوڵی داوە هەرچەشنە پێوەندیەك لە نێوان ڕووداوەکانی ئازەربایجان و جیابوونەوەی ئەو تاقمەدا ڕەت بکاتەوە، بەڵام بە ناچاری دانی بە ناڕازی بوونی خەلیل مەلەکی لەو بوارە داناوە.(١٠)

ئێستا دەتوانین ئەنجامگیرییەك بکەین کە بۆچی حیزبی توودە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکاندا وەك خوزستان و فارس، بەرادەیەك چالاك بوو، کە توانی گەورەترین مانگرتنی کارگەرانی کۆمپانیای نەوت لە سەردەمی داگیرکرانی ئێران لە ڕێکەوتی (٢٣ی پووشپەڕی ١٣٢٥) ١٩٤٦ز دا ڕێك بخا، بەڵام بە درێژایی چوار ساڵ ئامادەبوونی ڕووسەکان لە وڵات و بەهرەمەندبوونی لە پشتیوانییەکانیان، نەیویست یان نەیتوانی لە ئازەربایجان بەگشتی و کوردستان بە تایبەتی شانەی حیزبی دابمەزرێنێ و لایەنگر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە.

رواڵەتی وێکچووی فرقەی دیمۆکرات لەگەڵ حیزبی دیمۆکراتی کوردستان، دەری دەخست کە ئەو دوو حیزبە بەتەمان ئامانجی هاوبەش بەدی بێنن، رۆزڤێلت لەو باوەڕەدایە زۆربەی ئامادەبووانی کۆبوونەوەی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە "... بە لەبەرچاوگرتنی ناوی حیزبەکەو ئەوە کە ئامانجەکانی دابینکردنی دیمۆکراسی، لەسەر شێوەی دیمۆکراسی ئەمریکاییە، بە شوورو شەوقەوە پێشوازییان لەو ئاڵوگۆڕە کرد.[١١]

لەوانەیە وابێتە بەرچاو کە روزڤێلت بەهۆی ئەمریکایی بوونی لە بارەی ئۆگریی سەرۆك و رۆشنبیرانی کورد سەبارەت بە دیمۆکراسی ئەمریکایی زیادەڕەوی کردبێ، بەڵام راستییەکە ئەوەیە کە هەر ئەو دیمۆکرات بوونە، لایەنگرانی لە دەوری حیزب کۆکردەوە. تەنانەت بۆ فرقەی دیمۆکراتیش هەر بەم شێوەیە بوو. نووسەرانی کتێبی "هاوسێیەکانی باشووری رووسیە" لە بارەی هۆکاری هەڵبژاردنی ناوی دیمۆکرات بۆ فرقە دەنووسن:

"بەپشتبەستن بە نووسینە تایبەتییەکانی پیشەوەری، کۆمۆنیستەکان حیزبی تازەیان بە "دیمۆکرات" نێودێر کردو بۆ راکێشانی ئەندام لە نێو هەموو چین و توێژەکان تێدەکۆشان‌و بە ئاواتبوون کەسانێك بۆ لای خۆیان راکێشن کە هەرگیز پێوەندییان بە جووڵانەوەی کۆمۆنیستەکانەوە نەکردبێ." [١٢]

ئەو سیاسەتەی پیشەوەری لە دووسێ مانگی سەرەتادا کاریگەربوو، بەڵام "... بە وتەی ئاغازادە شاهین، یەکێك لە ئەندامانی فرقە، دوای چەند مانگ ژمارەیەك لە ئەندامانی فرقە و بۆ نموونە بۆخۆشی لە فرقە جیابوونەوە کاتێك تێگەیشتن کە ئامانجی جیاخوازانەی هەیە."[١٣]

بەڵام حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بە حوکمی شارەزابوونی لەگەڵ روحیەی خەڵکی کورد، بۆ زیاد کردنی دەسەڵات و لایەنگرانی خۆی، رێوشوێنی دیکەی گرتە پێش کە لە توانای فرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان دانەبوو بیان کا. بۆ نموونە پاش راگەیاندنی دامەزرانی کۆماری مەهاباد و مۆرکردنی پەیماننامەی دۆستایەتی لە نێوان مەهاباد و تەورێزدا، رووسەکان کۆمەڵێك چەك و تەقەمەنییان بەخشیە رێبەرانی حیزب کە بەپێی نووسینەکانی (عەبدوڵڵا پشدەری)، حیزبی دیمۆکرات لە نێو خەڵك دابەشی کردن. "...خەڵکی مەهاباد رێوڕەسمێکیان بەڕێوەبردو بەبەردەوامی چەکیان وەردەگرت و ئامادەبوونی خۆیان بۆ فیداکاری لە رێگەی کوردستاندا رادەگەیاند، تەنانەت ئەو کەسانەی لە عێراقیشەوە دەهاتنە مەهاباد، ئەگەر یەکێك لە دانیشتووانی نێو شار زەمانەتی کردبان، چەکیان پێدەدان‌و لە لیستی سوپای کوردستاندا ناویان دەنووسین. بە کورتی گرینگی و بڕواهەبوون بە حیزبی دیمۆکرات لە نێو خەڵکدا هەستی پێدەکرا."[١٤]

کوردەکان شەیدای چەك بوون، کاتێك قازی چەکە نێردراوەکانی سۆڤیەتی لە نێو خەڵك بەگشتی‌و عەشایردا بەتایبەتی بەشکرد، لایەنگرانی حیزبی دیمۆکرات زیاتربوون، چونکە هەموویان و تەنانەت

کوردەکانی عێراقیش دەیانویست تفەنگیان هەبێ. ئەندامانی حیزبی تازە پێکهاتووی دیمۆکرات، هەڵبژاردنی سەرلەنوێی ڕێبەرو کۆمیتەی ناوەندیان بە پێویست نەزانی، بە واتایەکی دیکە بەڕێوەبەرانی کۆمەڵە لە پۆستەکانی پێشووی خۆیاندا مانەوە، ڕێبەری سەرەکی واتە قازی پێگەی خۆی پاراست.

هەڵبەت روونە کە پێداگرتنی رووسەکان لە مانەوەی قازیدا کاریگەریی خۆی هەبوو، چونکە حیزبی دیمۆکراتیش هەروەك (ژ.ك) هیچ مەیلێکی بۆ وەرگرتنی قازی لە کۆمیتەی ناوەندیدا لە خۆی پیشان نەدا. پەسندکردنی ڕێبەریەتی قازی محەممەدیش بەهایەك بوو کە حیزب بۆ بێبەش نەبوونی لە هاوکارییە ماددی و مەعنەوییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت دەیدا. وەك چۆن لە رابردووش دا ئەوە رووی دابوو. بێگومان حیزبی دیمۆکرات زیاتر لە کۆمەڵەی ژ.ك خۆی لە یەکێتیی سۆڤیەت نزیك کردەوە. ئەو پێوەندییەش نەك هەر لایەنەکانی سیاسیی و ئاسایشی، بەڵکو چۆنیەتیی ڕێکخستنی بەرنامەکان، پێکهێنانی ڕێکخراوو کۆمەڵەی سەر بەحیزبیشی گرتەوە. تۆماس بوا کاتێك باس لە کاریگەریی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت لەسەر حیزبی دیمۆکرات دەکا، دەنووسێ:

"حیزبی دیمۆکرات بە دامەزراندنی ڕێکخراوەکانی لاوان و ژنان و شوورای عالی و کۆمیتەی ناوەندی، زیاتر لە حیزبی کۆمۆنیستی دەچوو." (١٥)

بەڕێوەبردنی ڕێکخراوی ژنان بە خێزانی قازی محەممەد سپێردرا بوو و ڕێکخراوی لاوانیش کەسێك بە ناوی عەلی خوسرەوی بەڕێوەی دەبرد. ئیگلتۆن چالاکییەکانی ڕێکخراوی لاوانی حیزب بەم شێوەیە هەڵدەسەنگێنێ:

"کۆمیتەی ناوەندیی حیزب، لە هەمبەر ڕێکخراوی لاواندا بالاترین ئاستی چاوەدێریکردنی لەبەرچاو گرتبوو، بەڵام ئەو ڕێکخراوە شوناسی جیاوازی خۆی بە تەواوی پاراست، هەرزوو بەهۆی پەرەگرتنی رۆحیەی شەرخوازیان، بە بەراوردکردن لەگەڵ حیزبی دایکدا، ناسران و بەناوبانگ بوون."(١٦)

کۆمەڵەی ژ.ك لەو دامەزراوانە بێبەریبوو، زۆرتر وەك حیزبی هیوا دەچوو کە لەسەر شێوەی حیزبە رۆژئاواییە دیمۆکراتیکەکان دامەزرابوو. ئەرفەع پێیوایە کە هاشمۆف، کۆنسوولی سۆڤیەت لە ورمێ دەستی لە ڕێکخستنی بەرنامەکانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستاندا هەبووە. (١٧)

پێوەندی و نیزیکی لە رادەبەدەری حیزبی دیمۆکرات لەگەڵ سۆڤیەت، کاریگەرییەکی سەیری لەسەر گەشەکردنی نەتەوەپەرستی و بزواندنی هەستی جیاخوازی ئەندامەکانی هەبوو، (عەبدوڵلا پشدەری) وێنەیەکی سەرنجراکێش لەو بارەیەوە بە دەستەوە دەدا:

"ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیمۆکرات (پاش وەرگرتنی چەك و چۆل لە سۆڤیەت) زۆر لەخۆبایی بوون و خوازیاری راگەیاندنی سەربەخۆیی کوردستان بوون، بەڵام قازی ئەو داوایەی پەسند

نەکرد، چونکە لە درێژەی سەفەرەکانیدا بۆ سۆڤیەت، تێگەیشتبوو کە سۆڤیەت پشتیوانی لە سەربەخۆیی کوردستان ناکا."[18]

ئاشکرایە هاندانی سۆڤیەت کاریگەریی تەواوی هەبوو، لەو سەردەمەدا، دروشمی ناسراوی حیزبی دیمۆکرات واتە "دیمۆکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان" نەخرابووە روو. ئەوە لە دوای هاتنە دەرەوەی هێزەکانی لەشکری سوور لە ئێران بوو ئەو دروشمە بەرزکرایەوە. زیادبوونی نفووزی سۆڤیەت لە نێو حیزبی دیمۆکراتدا، بووە مایەی ئەوەی سەرۆك هۆزەکانی لێ دوور کەوێتەوە. لە کاتێکدا کە (ژ.ك )توانیبووی ژمارەیەك لە هۆزەکان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. حیزبی دیمۆکرات نەك هەر لە راکێشانی سەرۆك هۆزەکانی دیکەدا ناکام مایەوە، بەڵکو ئەندامە کۆنەکانیشی تا رادەیەك لە دەستدا. بەپێی نووسینەکەی ئیگلتۆن، قاسم ئاغای ئیلخانی زادەو کاك هەمزەی نەلۆسی سەرۆك هۆزی مامەش کە هەردووکیان لە سەردانی دووهەمی کوردەکاندا بۆ سۆڤیەت بەشداربوون، دوای گەڕانەوەی خۆیان لە هاوکاریکردنی دیمۆکراتەکانی مەهاباد بوارد، تەنانەت قاسم ئاغا لەگەڵ سەرلەشکر هومایوونی پێوەندیی گرتو پاڵی وەحکوومەتی ناوەندی دا.[19]

ئەو بەشەش لە عەشایرو سەرانی هۆزەکان کە درێژەیان بە هاوکاریکردنی حیزبدا، تەنیا لەبەر پاراستنی بەرژەوەندی ئابووریی خۆیان و گەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسیی بووە. سەرچاوە کوردییەکانیش بە روونی باسی ئەو مەسەلەیان کردووە، بۆ نموونە کەریمی حیسامی کە لە نووسینەکەیدا لایەنگری لە حیزبی دیمۆکرات دەکا، دەنووسێ بەشێك لە سەرۆك هۆزەکان و مولکدارانی کوردستان هەر لە رواڵەتدا لەگەڵ حکوومەتی میللی دابوونو بە ناحەق پۆست و پلەو پایەی گرینگیان لە سوپاو وەزارەتەکانو شوێنە حیزبی و حکوومییەکاندا داگیرکردبوو.[20] (عەبدوڵلا پشدەری) دوای شەنوکەوکردنی خاڵە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی کارەکانی قازی و حیزبی دیمۆکرات دەنووسێ:

"زۆربەی ئاغاو سەرۆکە چەکدارەکان کە روویان لە حیزبی دیمۆکرات دەکرد، پۆست و نیشانەو پلەی سەربازییان بە شێوەی ئیفتخاری پێدەدراو هەریەکەو پلەی پالکوونیك (سەرهەنگ) یان پۆدپالکوونیك (سەرهەنگی دووەم)ی پێ دەبەخشرا کە پلە و پایەی رووسی بوون. زۆر لەو سەرۆکانە جل و بەرگی ئەفسەرییان دەکرێو پلەو پایەکانیان لەسەر شانیان قایم دەکرد، ئەوەش تەنیا بۆ راکێشانی سەرنجی خەڵك بوو"[21] و لە جێگەیەکی دیکە دا دەنووسێ "... زۆربەی خەڵکیش بە ناوی فلانە سەرۆك هۆز یان ئاغا، چەکیان لە حیزب وەردەگرت.........، بەڵام لە ئەنجامدا چەکەکانیان دەفرۆشتو ئیدی نەدەگەڕانەوە."[22]

# بەرنامەی حیزبی دیمۆکرات

دوای لەبەریەك هەڵوەشانی ژ.ك و دامەزراندنی حیزبی دیمۆکرات، بەیاننامەیەك بە ئیمزای قازی محەممەدو سەدو پەنجا کەس لە کەسایەتییە ناسراوەکان کورد بڵاو بۆوە، کە تێیدا وێڕای ئاماژەکردن بە ویستی گەلی کورد بۆ سوود وەرگرتن لە ئاکامەکانی بزووتنەوەی رزگاریکەری جیهان لە زەبری فاشیزم‌و هەروەها بەڵێنەکانی مەنشووری ئاتلانتیك، بەرنامە و ئامانجەکانی حیزبیش لە چەند خاڵێکدا گونجێنرا بوو.[٢٣]

لە بەرنامەی کۆمەڵەی (ژ.ك) دا خودموختاری لەسەر دوو بنەمای بەرەسمی ناسینی زمانی کوردی‌و بەڕێوەبردنی کاروباری خۆجێی دامەزرابوو، کە بە وتەی یەحیا سادق وەزیری، خواستی بەڕێوەبردنی خۆجێی بەهۆی دانیشتوانی خۆماڵییەوە، بەتەواوی لەگەڵ ئەسڵی ئەنجوومەنە ویلایەتییەکان لە یاسای بنەڕەتی مەشرووتەدا یەکی دەگرتەوە. تەنیا داوای بەرەسمی کردنی زمانی کوردی سنوورەکانی ئەو یاسایەی بەزاندبوو، بەڵام بەرنامەی حیزبی دیمۆکرات یاسای بنەڕەتی وەبەرچاو نەگرتبوو و بە تەواوی لێی دوور کەوتبۆوە.[٢٤]

ئیگلتۆن و حەسەن ئەرفەع بەو شێوەیە بەندەکانی بەرنامەی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانیان نووسیوە:

"١ـ خەڵکی کوردی ئێران لە رێگەی خودموختاری کارگێڕییەوە، کاروباری خۆجێی خۆیان بەڕێوە دەبەن.

٢ـ زمانی رەسمیی ئیدارەکان و مەدرەسەکان زمانی کوردی دەبێ.

٣ـ لەسەر بنەمای یاسای بنەڕەتی، ئەنجوومەنی ویلایەتی کوردستان بە زوویی هەڵدەبژێرێ و مافی چاوەدێری کۆنترۆڵی هەموو کاروبارە گشتییەکانی هەیە.

٤ـ دەبێ کاربەدەستانی دەوڵەتی کورد بن.

٥ـ داهاتی کوردستان لە کوردستان خەرج بکرێ.

٦ـ حیزبی دیمۆکراتی کوردستان هەموو هەوڵی خۆی دەخاتە گەڕ تا پێوەندییەکی برایانە لەگەڵ خەڵکی ئازەربایجان و کەمایەتییەکانی نیشتەجێی ناوچەکەدا پێك بێنێ.

٧ـ حیزبی دیمۆکرات بۆ مەبەستی گەشەسەندنی ئابووری، بەرزکردنەوەی ئاستی فەرهەنگیو پەروەردەو فێرکردن، پێشخستنی کشتوکاڵ و بازرگانی و بارودۆخی تەندروستیی خەلکی کورد هەوڵ دەدا."[٢٥]

بەڵام ئارچی پالد رۆزڤێلت لە وتارەکەی خۆیدا باس لە بەندی هەشتەم لە بەرنامەی حیزبی دیمۆکرات دا دەکا کە تێیدا نووسراوە: "ئێمە دەمانهەوێ هەموو ئەو گەلانەی لە ئێراندا دەژین بتوانن ئازادانە بۆ دابینکردنی بەختەوەری و پێشکەوتنی ولات تێبکۆشن."[٢٦]

ئیگلتۆن، ئەرفەع و عەبدوللا پشدەری هیچیان باس لە هەشتەمین بەندی بەرنامەکە ناکەن، رۆزڤێلتیش لە باسکردنی ئەو بەندەدا پشتی بە چ کەسێك بەستوە؟ نازانین! بە ئاوڕدانەوەیەکی خێرا لە بەرنامەی حیزب دەتوانین سێ لایەنی گرینگ و دیاری لێ دەستنیشان کەین، کە لە ناسینی رەوتی گۆڕانی ئەندێشەی نەتەوایەتی لە کوردستانی ئێراندا، بە دوای هاتنە ناوەوەی سۆڤیەت بۆ مەیدانی سیاسیی ئێران، رێنماییمان دەکا. ئەو خەسڵەتانەی کە ئەمڕۆ لە بەرنامەی حیزبی دیمۆکراتدا بەرچاو ناکەون یان کەم ڕەنگبوونەوە بریتین لە:

١ـ بەرنامەی حیزبی دیمۆکرات زیاتر لە پێشەکی یاسای بنەڕەتیی ولاتێکی سەربەخۆ دەچوو تا یاسای بنەڕەتی پارێزگایەکی خودموختار لە چوارچێوەی ولاتی دایکدا. چونکە بێجگە لە بەندی سێهەم کە ئاماژە بە ئەنجوومەنە ئەیالەتیو ویلایەتییەکان دەکا، بەندەکانی دیکەی بەرنامە لەگەڵ یاسای بنەڕەتیدا ناکۆك بوون، سەرەڕای ئەوەش شوێن و پێگەی زمانی فارسی لە کۆمەڵی خودموختاری کورد دا، دەستنیشان نەکرابوو و هەروەها مەسەلەی پێوەندیی حکوومەتی خودموختار لەگەڵ حکوومەتی مەرکەزیدا کە ئایا لە چ مەیدانێکدا دەبێ و رادەی دەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندی لە کوردستانی خودموختاردا چەندە دەبێ؟، باسی لێ نەکرابوو.

٢ـ بە تەواوی ئاشکرا بوو کە چەند خالێکی ئەو بەرنامەیە لەگەڵ هەلومەرجی ئەوسای ئازەربایجانو بە ویستی رووسەکان گونجێنرابوو، چونکە تەنیا ئاماژەی بە پێوەندیگرتن لەگەڵ خەلکی ئازەربایجان (لە راستیدا حکوومەتەکەی پیشەوەری) کردبوو، هیچ نیشانەیەکی لە هەوڵدان بۆ دابینکردنی دیمۆکراسی لە نێو نەتەوەکانی دیکەی ئێراندا تێدا بەدی نەدەکرا.

٣ـ بە شێوەیەکی گشتی بەرنامەی حیزب بەرنامەیەکی ئینقلابی نەبوو. بە لەبەرچاو گرتنی ئەو مەسەلەیەی کە کۆمەلگەی کوردی پێویستییەکی سەرەکیی بە چاکسازیی هەمەلایەنەی ئابووریو کۆمەلایەتی هەبوو، حیزبی دیمۆکرات هیچ رێگە چارەیەکی خێراو کاریگەری بۆ دابینکردنی

یەکسانیی کۆمەڵایەتییش تێدا پێشنیارنەکرابوو. لەم رووەوە بەرنامەکە زۆر بە پارێزەوە دارێژرابوو. بەندێك کە تێیدا سیاسەتی رێفۆرمخوازانەی حیزبی دیمۆکرات رەنگی داوەتەوە، بەندی پێنجەمە، کە باس لە کۆکردنەوەی داهاتی کوردستان و خەرجکردنی دەکا لە خودی کوردستاندا، بەڵام کێشەکە لێرەدایە کە سەرچاوەکان بە دەربڕینی جۆراوجۆر ئەو بەندەیان نووسیوەتەوە، رۆزفێلت نووسیویەتی:

"یاسایەك بۆ جووتیاران و خاوەن ملکەکان دابنرێ، کە داهاتووی ئەم دوو چینە دابینبکرێ."[27]

کریس کۆچێرا باس لە "دانانی یاسایەك بۆ خاوەن ملکەکان و جووتیاران"[28] دەکا. بەڵام قاسملوو بەم شێوەیە بەندەکە دەنووسێتەوە "دەبێ لەسەر بنچینەی قانوونێکی گشتی لە نێوان لادێ و خاوەن ملکدا رێکەوتنێك پێك بهێنرێ و دوارۆژی هەردوو لا دابینبکرێ"[29] دواجاریش پیەر رۆندۆ ئاماژە بە ویستی دامەزرێنەرانی حیزبی دیمۆکرات بۆ چاکسازی لە پێوەندییەکانی بەرهەمهێنانی نێوان رەعیەتو دەرەبەگەکان دەکا.[30]

شێوەی دروستی ئەو بەندە هەرچییەك بووبێ، حیزبی دیمۆکرات و قازی محەممەد لە بەشێکی کەمی زیاتر، نەیانتوانی ئەو بەندە بخەنە قۆناغی جێبەجێکردنەوە، چونکە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و ئابووری رێگەی بە وەها بەرنامەیەك نەدەدا. ستراکتۆری کۆمەڵایەتیی کورد، شێوەی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کە لەسەر بنەمای خوێن و خزمایەتی دامەزرابوون، نەبوونی شارێکی گەورە کە ژمارەی دانیشتوانی زۆر بێ، نەبوونی چینی کرێکار کە بە شێوەیەك لە شێوەکان لە ئازەربایجاندا هەبوو، کۆی ئەو هۆیانە رێگربوون لەبەردەم جێبەجێکردنی پرۆژە پێشکەوتووخوازەکەی حیزبی دیمۆکرات کە دەیتوانی خەڵکی کورد رووەو پێشکەوتن هان بدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو توانا و بڕستی حیزبی لە بڵاوکردنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی، فەرهەنگ و زمانی کوردی، راگەیاندنی کۆمارو بەهێز کردنی سیاسیی و سەربازیی کۆمار بەپشتبەستن بە سۆڤیەت و حکوومەتەکەی پیشەوەریو حیزبە کوردییەکانی تورکیە و عێراقدا بەکارهێنرا. هەر لەژێر کاریگەریی ئەو بەرنامە ناسیۆنالیستییە توندڕەوە دابوو کە لە درێژەی یازدە مانگ فەرمانڕەوایی کۆماری مەهاباد دا، هیچ چەشنە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لەژێرخان و پێکهاتەی ئابووریی ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی دیمۆکراتەکان پێك نەهات.* بزووتنەوەی کوردی کە پێشتر کۆمەڵەی (ژ.ك) ی لێ کەوتبۆوەو

---

* لە راستیدا نووسەر چاوەڕوانییەکی نالۆژیکی لە کۆمارێکی ساوای ١١ مانگە هەیە، مەسەلەی گۆرانکاری لە پێکهاتەو ژێرخانی ئابووریدا پێویستی بە هەلومەرجێکی مێژوویی تایبەت و گۆرانکاری لە هۆیەکانی بەرهەمهێنان و پاشان پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان دا هەیە، پێویستە بگوترێ کە ئەو پرۆسەیە بە درێژایی مێژووی حوکمی دەسەڵاتدارانی هاوچەرخی ئێرانی وەدی نەهاتووە. وەرگێر

هاندەری سەرەکیشیان نارەزایی و بێزاری لە ستەمی میلیی رەزاشا بوو، لە جێگەی هەوڵدان بۆ چاکترکردنی بارودۆخی ئابووری، پەروەردەیی، تەندروستیی جووتیارانی کوردو هاوکاریکردن لەگەڵ هێزە نەتەوەییەکانی دیکەی ئێران لە مەرکەز داو خەباتکردن دژی ئیستعماری رۆژئاوایی، دەستیان دایە دروستکردنی سوپای حیزبی و رەدکردنەوەی پێوەندیی چەند هەزار ساڵەی نێوان کوردو نەتەوەکانی دیکەی ئێرانو هاوکاریکردنی یەکیەتیی سۆڤیەت کە لەو سەردەمەدا سیاسەتەکەی لەگەڵ سیاسەتی فرەوانخوازیی رووسیەی سەردەمی تێزاری دا هیچ جیاوازییەکی نەبوو.

# بەندی چوارەم

## ڕۆڵی یەکێتیی سۆڤیەت لە ڕووداوەکانی کوردستاندا
## (١٣٢٠ تا ١٣٢٥)ی هەتاوی (١٩٤١ - ١٩٤٦)ز

تاکە ڕێگەی دەستنیشانکردنی ئامانجەکانی یەکێتیی سۆڤیەت لە ئێراندا، بە درێژایی شەڕی دووەمی جیهانی، لێکدانەوەی سیاسەت و هەڵسوکەوتی ئەو وڵاتەیە لە ئازەربایجان و ناوچە کوردنشینەکان. یەکێتیی سۆڤیەت تا ئەو کاتەی ئەڵمانی نازی ڕێکەوتننامەی هاوکاری و دۆستایەتیی ساڵی ١٩٣٨ی نێوان ئەو دوو وڵاتەی هەڵوەشاندەوە، هەوڵی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئەڵمانی دەدا، بۆ ئەوەی خۆی بگەیەنێتە ئاوە گەرمەکان و کەنداوی فارس.

نووسەرانی کتێبی "هاوسێیەکانی باشووری رووسیە" لە بارەی ئەو ئاواتەی سۆڤیەتەوە نووسیویانە: "لەسەرەتای نۆڤەمبەری ١٩٤٠ مۆلۆتۆف، داوای لە باڵیۆزی ئەڵمان لە مۆسکۆ کرد، کە ئاڵمان دەسەڵاتی سۆڤیەت لە ناوچەکانی باشووری باتوم و باکۆو لەوێشەوە ڕووەو کەنداوی فارس "وەك ناوچەی جێگەی سەرنجی ئەو وڵاتە" بە ڕەسمی بناسێ"(١)

یەکێتیی سۆڤیەت بێجگە لە کەنداوی فارس چاوی تەماحیشی بڕیبووە تەنگەکانی بسفۆڕو داردانێلو لە ساڵی ١٩٣٩ بە دواوە کە هێرشی کردە سەر فنلەنداو بەشێکی خاکەکەی داگیر کرد، خۆشی بۆ هێرشێکی بەرفرەوان ڕووەو تورکیە ئامادە دەکرد. بەڵام تورکەکان بە مۆبیلیزەکردنی ملیۆنێك سەرباز، بە "ستالین"یان نیشاندا کە سەرسەختانە پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەکەن. (ڕیچارد ستیوارت) باس لە هەوڵ و تەقەلاکانی یەکێتیی سۆڤیەت دەکا بۆ فرەوان کردنی ڕۆڵ و نەخشی لە فەلاتی وڵاتی ئێران داو دەنووسێ کە پێش سنوور بەزاندنی خاکی ڕووسیە لە لایەن ئەڵمانیای نازی، سەرانی ڕووس لە (١٦ی پووشپەڕی ١٣١٩) ١٩٤٠ دا، بیرخەرەوەیەکیان دایە دەوڵەتی ئێران کە داوایان کردبوو:

"کۆنترۆڵکردنی ئازەربایجان و لێوارەکانی دەریای خەزەرو دەرکردنی ئیجازەی سوود وەرگرتن لە فرۆکەخانە جۆراوجۆرەکانی وڵات و هێڵی شەمەندەفەر بە ڕووسیە بسپێردرێ."(٢)

بە حوکمی بزۆزییەکانی سۆڤیەت بۆ دەستگرتن بەسەر کەنداوی فارس و تەنگەکانی بسفۆر و داردانێل لە دەریای ڕەشدا، هاوپەیمانەکان، بە تایبەتی بەریتانیا و فەرانسە پرۆژەی هێرشکردنە سەر ئەو وڵاتەو بۆمباران کردنی چاڵە نەوتەکانی باکۆو گرۆزنییان گەڵاڵە کرد، چونکە پێیان وابوو کە یەکێتیی سۆڤیەت تێك هەڵپڕژانی وڵاتانی ڕۆژئاوایی لەگەڵ ئەڵمانیادا دەقۆزێتەوەو چاڵە نەوتەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، بەڵام هێرشی چاوەڕوان نەکراوی ئەڵمانیا بۆ ڕۆژئاوای یەکێتیی سۆڤیەت، بە ناچاری "ستالین"ی خستە ڕیزی هاوپەیمانەکان و هەلومەرجێکی نوێ بۆ دەستێوەردانی ڕووسەکان لە چارەنووسی سیاسیی ئێراندا هاتە گۆڕێ.

# داگیرکردنی باکووری ئێران لە لایەن لەشکری سوورەوە

کاتێك داگیرکردنی ئێران لە لایەن هاوپەیمانەکانەوە بوو بە پێویستییەکی خێرا، هێزەکانی ئینگلیزی و رووسی لە (٣ی خەرمانانی ١٣٢٠) ١٩٤١ز دا، هاتنە ناو خاکی ئێران، لە روالەتدا هەبوونی راوێژکارانی ئەلمانیان کردە بیانوو، بەلام هەر لە سەرەتاوە دەرکەوت کە سۆڤیەت و بەریتانیا بە داگیرکردنی ئێران، بێجگە لە هەلکەوتە ئیستراتیژییەکەی، وەدوای پاراستنی بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی خۆیان لەو ولاتەدا کەوتبوون.

نووسەرانی کتێبی "هاوسێیەکانی باشووری رووسیە" وێرای ئاماژەکردن بە ویستی بێ سنووری سۆڤیەت بۆ دەست خستنە نێو کاروباری ئێران، باس دەکەن کە سۆڤیەت نیشانی دا: "... تەنانەت دوای یەکگرتنی لەگەل بەریتانیا لە جەنگی دووەمی جیهانییدا، دەستی لە هەول و تەقەلاکانی خۆی بۆ گەیشتنە کەنداوی فارس و زەریای هیندی هەلنەگرت."[٣]

هێزەکانی سۆڤیەت بێ درەنگ کردن، پەلاماری ئەو ناوچانەشیان دا کە لە رێکەوتنی نێوان سۆڤیەت و بریتانیا دا، وەبەر وی نەکەوتبوو، سەراسەری کوردستانی خستە ژێر رکێفی خۆیەوە کە لە بنەڕەتدا دەبوو بکەوێتە ژێر دەسەلاتی ئینگلیزەکان. دوای داگیرکردنی سنە لە لایەن لەشکری سوورەوە، سەربازانی ئینگلیزیش هاتنە نێو شارەکەوە، پاشان لەژێر نارەزایی فراوانی سەرانی ئینگلیز، سەربازەکانی رووس لە پارێزگای کوردستان کشانەوەو "... بەلێنیان دا لەو ناوچەیەی کە بۆیان دیاریکراوە زیاتر نەچنە پێش و ئۆبالی ئەو زێدەڕەوییەشیان خستە گەردنی نەخشەکانیان کە گوایە ناخوێندرێنەوەو خراپ بوون."[٤]

لە ئەنجامدا لەشکری سوور (٢٠٠) کیلۆمەتر رووەو باکوور، واتە شاری میاندواو پاشەکشەی کرد، رووسەکان لە سەرەتای کارەوە، لە سۆنگەی لاوازکردنی حکوومەتی ناوەندی، بۆ لێك ترازاندنی یەکێتیی نەتەوەیی ئێرانو لەخەو راپەڕاندنی هەستی نەتەوەیی کوردەکان و ئازەرییەکان، هەنگاویان هەلێناوە، بەپێی قسەی کەریمی حیسامی، بۆمب هاوێژەکانی رووسی لە کاتی هێرش کردنە سەر بنکە سەربازییەکانی ناوچە کوردنشینەکاندا، بەیاننامەیان بە زمانی کوردی بلاو دەکردەوە. [٥] هەلسوکەوتی سیاسیی کاربەدەستانی سۆڤیەت لە سەرەتاکانی داگیرکردنی ئازەربایجان، دەری دەخست کە سۆڤیەت بۆ بەدیهێنانی گۆرانکارییەکی ئەوتۆ هەولی دەدا، کە پێشتر گەلالە کرابوو. بۆ نموونە سەربازانی لەشکری سوور هەر لەگەل گەیشتنیان بۆ

تەوریز، زیندانییە سیاسیی و ئاساییەکانیان ئازاد کردو بە بیانووی دابینکردنی ئاسایشی شار، ئەرمەنییەکانیان چەکدارکرد. لە راپۆرتی کۆنسولی بەریتانیا لە تەوریز، لە ڕێکەوتی (٢٨ی خەرمانانی ١٣٢٠) ١٩٤١ز دا هاتووە کە:

"رووسەکان ویست و ئارەزووی جیاخوازی لە ئازەربایجاندا هان دەدەن... ئەوان پێش مانگی سێپتەمبر، خوازیاری هەڵبژاردنی خۆجێی لە نێو ناوچەکانی ژێر رکێفی خۆیاندا بوون و لە تەوریزیش دەستیان دایە بڵاوکردنەوەی رۆژنامەیەك بە زمانی فارسی، کە رەخنەی لە حکومەتی ناوەندی دەگرت و خەڵکیان هان دەدا تا دژی "ژیانی هەژارانە"یان راپەڕن.[٦]

رەفتاری رووسەکان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیاندا، نیشاندەری ئامانجگەلێکی نهێنی و بەرنامە داڕێژراو بوون و ئاماژەی بە فۆرم گرتنی ئاڵوگۆڕێکی نوێی چارەنووسی خەڵکانی ئەو ناوچەیە دەکرد. دوکتۆر ئیرەج زەوقی روونی دەکاتەوە کە چۆن رووسەکان زەمینەیەکی لەباریان بۆ بێهێزکردنی دامو دەزگا کارگێڕی و سەربازییەکانی ئێران لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیاندا، خۆشکردووە. هاوتەریب لەگەڵ ئەم سیاسەتەدا هەستی جیاخوازیی ئازەرییەکان، ئاسۆرییەکان و کوردەکان دەجووڵێنن، ئەو لەوبارەیەوە دەنووسێ:

"هێزەکانی سۆڤیەت لە سەرەتای هێرشەکەیاندا بۆ ئێران، پادگانە سەربازییەکانی لەشکرو ژاندارمەری و هێزەکانی پۆلیسیان لە مەڵبەندی پارێزگاکاندا، چەك کردووەو ژمارەیان کەم کردوونەتەوە. کاتێك کە حکومەتی ناوەندییش هێزی سەربازیی بۆ ئەو ناوچانە رەوانە دەکا، رووسەکان پێشیان پێدەگرن. ئەگەر کێشەیەکیش لە ئاسایشی ناوچەکەدا دێتە پێش، چارەسەر کردنەکەی دەخەنە ئەستۆی ئەو هێزە چەك کراوە ئێرانییەی مابۆوە، گوایە دەبێ ئەوان هێمنیو ئاسایشی ناوچەکە بپارێزن.[٧]

دوکتۆر زەوقی باس دەکا، کە سنووردارکردنی بەرپرسانی ئێرانی، بووەتە هۆی "دەست ئاوەڵە بوونی دیپلۆماتە رووسییەکان، هاوکات ژمارەی کۆنسولخانەکانی سۆڤیەت لە سەرانسەری ئێراندا زیادی کردو بەو شێوەیە ئەو کەسانە کە لە لایەن لەشکری سوورەوە پشتیوانیان لێ دەکرا، ئامانجە سیاسییەکانی وڵاتەکەیان بە هەڕەشە کردن و فشار هێنان، بە باشترین شێوە وەدی دەهێنا.[٨]

هەر لە سۆنگەی ئەو سیاسەتەوە بوو کە کاربەدەستانی سەربازی و ڕێکخراوی سیخوڕی "چکا" بە بەردەوامی لە شارە کوردنشینە سنوورییەکاندا دەمانەوەو نزیکەی زۆربەی کاربەدەستان لە

نێو خەڵکی ئازەربایجاندا هەڵبژێردرا بوون بە حوکمی شارەزایی کوردەکانی ئازەربایجان لەگەڵ زمانی تورکی، پێوەندی لە نێوان یەکێتیی سۆڤیەت و کوردەکاندا بەئاسانی و بێ هیچ نێوبجیگەرییەك دادەمەزرا.

لەشکری سوور بە درێژایی پێنج ساڵ مانەوەی لە ئێراندا، هیچ کات یەکە سەربازییەکانی خۆی بۆ ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجان نەنارد، چونکە لەو ناوچەیەدا زیاتر لە دە تا پازدە هەزار شەڕکەری خێڵەکی هەبوون و بەرامبەر بە سیاسەتەکانی یەکێتیی سۆڤیەت خۆشبین نەبوون. ئەگەر کارێکی ئەوتۆشیان کردبا، دوور نەبوو هەستی هاودەردی کوردەکان لەگەڵ حکوومەتی ناوەندیدا ببزوێنێ. ئامادەنەبوونی بەرچاوی رووسەکان لە ناوچە کوردییەکان داو رێگرتن لە گەڕانەوەی سیاسیی و سەربازی و کارگێڕی دەوڵەتی ئێران بۆ ئازەربایجان بە مانای دەست واڵاکردنی کوردەکان بوو لە هەموو کاروبارێکدا. بە واتایەکی دیکە بەرەڵاکردنی هەستی جیاخوازیی کوردەکان بوو بە لەبەرچاو گرتنی ئەو ئەزموون و بیرەوەرییانەی کە خەڵك لە گەندەڵی کارگێڕی کاربەدەستانی رەزا شا بۆیان جێمابوو. هەرگیز خوازیاری گەڕانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی بۆ ناوچەکە نەبوون. رووسەکان بۆ لاوازکردنی پێگەی دەوڵەتی ناوەندی راستەوخۆ دەستیان لە بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەکە وەردەدا. بۆ نموونە لە یەکێك لە راپۆرتەکانی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی ورمێ بۆ وەزارەتی نێوخۆ لە رێکەوتی (١٣٢٢/٧/١٥) ١٩٤٣ز دا هاتووە:

"... بەپشتبەستن بە راپۆرتی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی مەهاباد، ماکیماوف کۆنسولی سۆڤیەت، نیشتەجێی ورمێ، چووە بۆ مەهابادو لەوێش چووە بۆ ماڵی قازی محەممەدو سەرۆك هۆزەکانی کۆکردۆتەوەو پێی راگەیاندوون کە نزیك بە دوو ساڵە باجی زەوی و زارتان بە دەوڵەت نەداوە، باجەکە بدەنو لە بەرامبەردا قەندو پارچە وەرگرن. کەریم ئاغای خاوەنی (قوم قەڵا) لە سەرۆکە کوردەکانی موکری گوتوویەتی "ئێوە چەندتان گەنم دەوێ دەودەینێ، بەڵام بە دەوڵەتیی نادەین." لەئەنجامدا هێندێکیان پێشنیارەکەیان پەسند کردو کۆنسولیش گەڕایەوە. کەفیلی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی گشتی وڵات (پاسیار سەیف) "[٩]

بەپێی ئەو بەڵگەنامەیە دەردەکەوێ کە کوردەکانی ئازەربایجان بە قۆستنەوەی بێهێزی حکوومەتی ناوەندی و پشتبەستن بە پشتیوانیی یەکێتیی سۆڤیەت، خۆیان لە باجدان و جێبەجێکردنی ئەرکو بەرپرسایەتییەکانیان لە ئاست حکوومەتدا دەبوێرن، لە لایەکی دیکەشەوە لە یەکێتیی سۆڤیەتو کوردەکانی دراوسێ نزیکتر دەبنەوە. یەکێتیی سۆڤیەتیش کوردە رۆشنبیرەکان بۆ سەربەخۆیی هان دەدەن.

## پەرەگرتنی هەستی جیاخوازانەی کوردەکان لەژێر کاریگەریی یەکێتیی سۆڤیەتدا

یەکێتیی سۆڤیەت تەنیا بۆ جۆشدان و بزواندنی کوردەکان هەوڵی نەدەدا، بەڵکو بەرنامەیەکی ڕێکوپێکی بۆ دروستکردنی ئارەزوو و خواستی جیاخوازی لە نێو نەتەوەکانی کورد و ئازەریو هاوئاهەنگ کردنیان لەو بوارەدا، دارشتبوو. دەیویست جڵەوی هێزو توانای ماتەوزە (بالقوە)ی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی ئەو نەتەوانە بخاتە دەستی کاربەدەستو بەکرێگیراوانی سۆڤیەت، بۆ ئەوەی یەکێتیی نەتەوەیی ئێران لەناو بەرنو بەو جۆرەش بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیان بپارێزن، لەو رووەوە هەوڵیان دا روانگەی سەرۆکە نارازییەکانی ئەو نەتەوانە لێك نزیك بکەنەوەو کۆتایی بە دوژمنایەتیی دێرینەی نێوانیان بهێنن. پێشتر باسمان کرد سەرانی سۆڤیەت لە ساڵی (١٣٢٠) ١٩٤١ز دا شاندێکی پێکهاتوو لە سەرانی کوردیان ناردە باکۆو لەگەڵ میر جەعفەر باقرۆف سەرۆك کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەت وتووێژیان کرد، کە بەپێی وتەی کۆچێراو ئیگلتۆن، بە شێوەیەکی گشتیو تا رادەیەك لێڵ و ناڕوون بابەتەکانیان هێنایە بەرباس. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەسەلەکانی "برایەتی نەتەوەی کوردو ئازەری"، "حەزو ئارەزووی سۆڤیەت بۆ پشتیوانی لە سەربەخۆی میللەتە بچووکەکان" و ئەوە کە کوردەکان دەبێ خۆڕاگر بن تا دەرفەتێکی لەبار بۆ راگەیاندنی سەربەخۆیی دێتە گۆڕێ"، جەختیان لەسەر کرایەوە.[١٠]

دوکتور زەوقی پێیوایە کە رووسەکان لە ساڵەکانی (١٣٢٠ و ١٣٢١) ١٩٤١-١٩٤٢ دا کوردەکانیان دژ بە یەکێتیی میللی تورکیە و ئێران هان دەدا، بەڵام زوو ئەو هەوڵانەیان کەم کردەوە چونکە:

"تێبینی سەرەڕۆیی و بێ ڕەحمی کوردەکانیان لە ئاست تورکە شیعەکان، لە ورمێ (بەهاری ساڵی ١٩٤٢)دا کردبوو. واتە رێك ئەوانەی دەبێ ناوکی بەرگری هەر جووڵانەوەیەك دژی حکوومەتی ناوەندی تاران پێك بێنن. دوای ئەو ئەنجامگیرییە بوو کە سۆڤیەت چاوێکی بە سیاسەتی خۆی لە هەمبەر کوردەکاندا خشاندەوەو هەوڵیدا کوردە شۆڕشگێڕە خودموختاریخوازەکان و شۆڕشگێڕانی ئازەربایجانی لێك نزیك کاتەوە.[١١]

نووسەری فەڕەنسی کریس کۆچێرا هەوڵی داوە کە بانگهێشت کردنی رووسەکان لە شاندێکی کوردی، وەك کاردانەوەی رووسەکان بەرامبەر بەو وتووێژانە لێك بداتەوە کە قازی محەمەد لەگەڵ دوو ئەفسەری ئینگلیزی و ئەمریکاییدا مانگێك پێش هاتنی هاوپەیمانەکان بۆ ئێران لە شاری بۆکاندا ئەنجامی دابوو. بەو شێوەیە راستییەك وەبەرچاو ناگرێ کە سەردانی کوردەکان بۆ سۆڤیەت بەشێك لەو زنجیرە بەرنامە دوورو درێژەی یەکێتیی سۆڤیەت بوو کە لە میانەی هاوکاری کردنی نێوان ئازەرییەکانو کوردەکاندا دەخرایە قۆناغی جێبەجێکردنەوە. بۆ نموونە دوو حەوتوو پێش سەردانی شاندە کوردییەکە بۆ سۆڤیەت، شاندێکی دیکەی پێکهاتوو لە پیاو ماقووڵانو بازرگانانی تەورێز سەردانێکی لەو جۆرەیان کردبوو. باقرۆف بە گوێی دا خوێندبوون کە لە رووی مەعنەوییەوە ئیدی هیچ سنوورێك لە نێوان دوو ئازەربایجان دا نییەو رۆژێك دادێ کە دەبنە یەك ئازەربایجان.(١٢)

ئەو سیاسەتەی سۆڤیەت لەگەڵ نارەزایەتیی بەریتانیا رووبەڕووبۆوەو باڵوێزی ئەو وڵاتە لە مۆسکۆ لە چاوپێکەوتن لەگەڵ مۆلۆتۆف وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتدا، رەخنەی لە هۆکارەکانی ئەو سەردانە و بزواندنی کوردەکان گرتو لە بەرامبەردا مۆلۆتۆف ئەو سەردانەی خستە چوارچێوەی سەردانێکی کولتووری، بەڵام هەر دوو لا باش دەیانزانی کە ئەوە پیلانێکەو بە هەڵکەوتی جوگرافی کوردستانەوە گرێ دراوە.(١٣)

ئیگلتۆن دەڵێ سەردانی یەکەمی کوردەکان ئاگری دوژمنایەتی کوردەکانی لەگەڵ ئێران نێڵ داو هەستی بڕوا بەخۆبوونی تێدا پتەوکردن. رووسەکان بە ئەنقەست رێگەی چەکدار مانەوەی هۆزەکانیان خۆش کردو تەنیا داوایان لە هۆزەکانی ناو ورمێ و دەوروبەرەکەی کرد کە چەکەکانیان دابنێن.(١٤) دیارە رووسەکان نەیان ویستوە کوردەکان و ئازەرییەکان لێکدی هەڵبەزنەوە.

# کۆمەڵەی ژ.ك و یەکێتیی سۆڤیەت

هەنگاوی داهاتووی رووسەکان، دامەزراندنی پێوەندی بوو لەگەڵ کۆمەڵەی (ژ.ك) دا. هەرچەند هیچ بەڵگەیەك سەبارەت بە دەستتێدابوونی کاربەدەستانی سۆڤیەت لە دامەزراندنی ئەو رێکخراوانە دا نییە، بەڵام نابێ لە بیرمان بچێ کە هەلومەرجێکی گونجاو بۆ دروستبوونی ئەو کۆمەڵەیە، لانی کەم لە رووی ئاسایشەوە، لە لایەن لەشکری سوورەوە هاتبووە گۆڕێ. تەنانەت توماس بوا ئەگەری ئاگاداربوونی عەبدوڵلا ئۆف لە دامەزراندنی کۆمەڵەی (ژ.ك) بە دوور نازانێ.[١٥] بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە حیزبی توودە، کە دواتر لە سەرلەنوێ رێکخستنەوەی حیزبی دیمۆکراتدا رۆڵی سەرەکی گێڕا، لەو رووداوەدا هیچ کاریگەرییەکی نەبووە، رۆزڤێڵت دەنووسێ کە پێوەندی کۆمەڵە و سۆڤیەتەکان لە رواڵەتدا لە ئەنجامی ئاشنابوونی بەرێکەوتی (عەبدوڵلا ئۆف)و سەروانی لەشکری سوورو بەرپرسی کڕینی ئەسپ بۆ ئەو لەشکرەو یەکێك لە ئەندامەکانی کۆمەڵە لە مەیخانەیەکی شاری مەهاباد دا لە ساڵی (١٣٢٣) ١٩٤٤ز دا هاتۆتە گۆڕێ. دیارە کە مەیلێکی دوو لایەنە بۆ دامەزراندنی ئەو پێوەندییە هەبووە.

سەرانی سۆڤیەتیش بۆ بەکارهێنانی کۆمەڵەی (ژ.ك) وەك ئامرازێك بێ مەیل نەبوون، دەنا چۆن کەسایەتییەکی سەربازیی سۆڤیەت بەبێ روخسەتی وڵاتەکەی و ئەویش لە هەلومەرجێکی واناسکدا دەتوانێ بڕیارێکی لەو چەشنە بدا. خاڵێکی گرینگ لە بارەی چۆنیەتیی هەڵسوکەوت کردنی سۆڤیەت لەگەڵ کۆمەڵەدا ئەوەیە کە ئەو وڵاتە ماهییەتی سەربەخۆو پشت بەخۆبەستنی ئەو حیزبە و ئامانجی گونجاوی خودموختاری لە چوارچێوەی ئێرانێدا پێ پەسند نەبوو و دەیویست گۆڕانکاریی شیاو لەگەڵ ئامانجەکانی خۆیدا پێك بهێنێ. نووسەرانی کتێبی "هاوسێیکانی باشووری رووسیە" لەو بارەیەوە نووسیویانە:

"رووسەکان بە هاوکاری قازی محەممەد لە هەوڵی پێکهێنانی رێکخراوێك دابوون، کە رۆڵی فیرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان لە نێو کوردەکاندا بگێڕێ. رووسەکان هەستیان دەکرد کە خەسڵەتی نەتەوەپەروەری کۆمەڵە لەگەڵ ئامانجەکانیدا یەك ناخوێنێتەوە." [١٦]

کۆمەڵە بە وەرگرتنی قازی محەممەد وەك رێبەرێك، خۆی خستە ئاقاری سیاسەتەکانی سۆڤیەتەوەو واقعبینیی سیاسیی، قوربانیی بەڵێنەکانی سۆڤیەت کرد. بەڵام ئەوەش زۆر بە ئاسانی چێ نەبوو، چونکە نارەزایەتیی کوردە پارێزگارو سەرۆك هۆزەکانی لە ئاست کۆمەڵەدا

زیاد کردو لە لایەکی دیکەشەوە کەسایەتییە کوردەکانی ئەندامی ئەو حیزبە وەك (سەید عەبدوڵلا گەیلانیو کوڕەکەی کاپتن عەبدولعەزیزو محەممەد سەدیقی کوڕی سەید تەها) دژ بەو گۆڕانکاری و پێوەندی گرتنەی لەگەڵ سۆڤیەتدا لێ قوت بوونەوە. پاشان دەرکەوت کە ناحەق نەبوون.[17]

پێش سەردانی دووهەمی کوردەکان بۆ سۆڤیەت، بەهۆی ئەو ئاسانکارییەی کە لەشکری سوور بۆ هاتوچۆکردنی کوردەکانی دراوسێی ئێران کردی، ئیمکانی بەستنی پەیمانی "سێ سنوور" لە نێو حیزبە سیاسییەکانی کوردی و کۆمەڵەی "ژ.ك" دا رەخسا. لەو سەردەمەدا سۆڤیەت پشتیوانی لە پەرەسەندنی پێوەندیی کوردەکانی ئێران لەگەڵ کوردەکانی عێراق و تورکیە دا دەکرد. بەو کارەش دەیویست رێگر لە بەردەم هاوکاریکردنی کۆمەڵە و حیزبە نەتەوەیی و پێشکەوتووخوازەکانی ئێرانی وەك "حیزبی ئێران" دا دروست بکا. چونکە نەیدەویست بە چاوی خۆی دەرکەوتنی فۆرمێکی نوێ لە یەکێتیی میللیی نەتەوەکانی ئێرانی ببینێ. لە کۆتاییەکانی (١٩٤٤)م، پروپاگەندەکانی سۆڤیەت و گەورەیی هەڵە و کارنەزانییەکانی کاربەدەستان و نیزامییەکانی سەردەمی رەزاشا، کوردە چالاکەکانی بەرامبەر بە ئێران رەشبین کردبوو. رووسەکان توانیان لە گۆڕینی هەستی نەفرەتکردن لە رژێمی شادا بۆ نەفرەتکردن لە مافی حاکمیەتی ئێرانی سەربکەون، ستەمی میللیش (کە دیاردەیەکی نوێی خوڵقاوی سەردەمی دەسەڵاتدارەتی رەزا شا بوو) وەك خەسڵەتێکی دێرین و بەردەوامی حکوومەتەکانی ئێرانی بناسێنن، تەنانەت ئەفسەرێکی رووسی لە مانگی تەمموز (١٩٤٥) دا لە شنۆ رایگەیاند:

"بۆ بردنەپێشی سیاسەتەکانی سۆڤیەت، دەبێ ئێرانییەکان وەك نازییەکان بە کۆمەڵگەی کوردی بناسێنین و رووسەکانیش بە رزگارکەر."[18]

پاش سەرکەوتنی سۆڤیەت لە شەڕی دووەمی جیهانیدا، پێشەکییەك بۆ سیناریۆی دابەشکردنی ئازەربایجان ئامادەکرابوو، پێویست بوو وتووێژ لەگەڵ ئەندامانی پایەبەرزی کۆمەڵەدا بکرێ و رەزامەندییان بۆ هاوکاریکردنی فرقەی دیمۆکرات و دیتنی رۆڵێك لەم سیناریۆیەدا بە دەست بهێنرێ، هەر لەبەر ئەو هۆیانەش ئامادەکاری سەردانی دووەمی کوردەکان بۆ سۆڤیەت دەستپێکرد.

ئەندامانی شاندی کوردی لە دووهەم سەردانیاندا، بێ کەم و زیاد لە نێو ئەندامانی چالاکی کۆمەڵە هەڵبژێردرابوون. بەپێچەوانەی شاندی یەکەم ئامانجەکانیان روون بوو، کە لە پشتیوانیی

سۆڤیەت بۆ پێکهێنانی حکوومەتی سەربەخۆی کوردی و داواکردنی چەك بۆ پاراستنی ئەو حکوومەتە دا کورت دەبۆوە. شتێك کە راستەوخۆ لە لایەن باقرۆفەوە پەسند کرا.

بەڵام سەرۆك کۆماری ئازەربایجانی شوورەوی پێی لەسەر ئەو خاڵە داگرت کە دەبێ کوردەکان لە چوارچێوەی ئازەربایجانی خودموختار دا بژین، تا ئەو کاتەی میللەتی کورد یەك دەگرێ. بەڵام قازی زیاتر لەسەر چارەنووسی جیاوازی کوردەکان و بەشدار نەبوونیان لە ئازەربایجانی خودموختار دا پێی داگرت.(١٩) یەکێتیی سۆڤیەت هەموو ئەو بەڵێنانەی جێبەجێ نەکرد کە بە قازی محەممەدی دابوون‌و لەگەڵ ئەوەی کە لە رواڵەتدا لەگەڵ پێکهێنانی کوردستانێکی سەربەخۆ دابوو، بەڵام لە پراکتیکدا ئەو حکوومەتەی لەسەر هێڵی سیاسەتەکانی خۆی‌و وەك پاشکۆیەکی کۆماری ئازەربایجان هێشتەوە. هیچ گومان لەوەدانییە کە دامەزراندنی حیزبی دیمۆکرات و تەنانەت نێودێر کردنەکەشی بە پێشنیاری سەرانی سۆڤیەت بوو، هەموو سەرچاوەکانیش لەو خاڵەدا یەك دەگرنەوە.

# پێوەندیی یەکێتیی سۆڤیەت لەگەڵ کۆماری مەهاباد دا

**دوای وەسەر پێکەوتنی کۆماری مەهاباد، یەکێتی سۆڤیەت سیاسەتەکانی خۆی بەرامبەر بەم حکوومەتە لەسەر دوو بنەما دامەزراند:**

١ـ هاندانی رێبەرانی کۆمار، بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی تەواو.

٢ـ هەوڵدان بۆ پاراستن و پتەوکردنی یەکێتیی نێوان ئازەربایجان و کوردستان.

لە درێژەی ئەو سیاسەتەی سۆڤیەتدا، حکوومەتی تەورێز لەگەڵ حکوومەتی مەهاباد رێکەوتننامەیەکی هاوکاری و دۆستایەتییان مۆرکرد. لە لایەکی دیکەشەوە سۆڤیەت، چەك و چاپخانە و پووڵ و فرستەندەی رادیۆیی و خزمەتگوزاری دیکەی پێشکەش بە کوردەکان کرد.

مۆسکۆ تا پێی نایە قۆناغی ئاشکرا کردنی داواو چاوەڕوانییەکانی لە ئێران و داواکردنی مەسەلەی جیاوکی نەوتی باکوور، بە کردەوە لەسەر سکەی جیاکردنەوەی ئازەربایجان و کوردستان دەڕۆیشت و زۆر باشیش دەیزانی کە بەریتانیا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی لە چاڵە نەوتەکانی باشووردا، لە بەرامبەر دانی نەوتی باکوور بە سۆڤیەتەکان و جیاکردنەوەی ئازەربایجان و کوردستان، دەنگی لێوە نایەت، یان هەر ناتوانێ دەنگی لێوە بێ.

کاردانەوەکانی ئەمریکاش بەهۆی نەبوونی بەرژەوەندیی ئەو وڵاتە لە ئێرانی ئەو سەردەمە دا، هەرگیز نابێتە لەمپەڕێك لە رێگەی وەدیهاتنی ویستەکانی مۆسکۆ، بەڵام دوای دژایەتی کردنی توندی ئەمریکا لەگەڵ جیاکردنەوەی ئازەربایجان و دروستکردنی کەشوهەوایەکی سیاسیی گونجاو لە لایەن (قەوام ئەلسولتەنە) بۆ دانی جیاوکی نەوتی باکوور بە سۆڤیەت، رووسەکان یەکسەر بە حکوومەتە دەستەمۆکراوەکانی خۆیان لە ئازەربایجان و کوردستانیان راگەیاند کە فکری سەربەخۆیی و جیابوونەوە لە مێشکیان بەرنە دەرێ و بە جۆرێك خودموختاری کارگێڕی لە چوارچێوەی ئێراندا رازی بن. سەرەڕای ئەوەی کە قازی محەممەد و حیزبی دیمۆکرات بە تەواوی لەو بارودۆخە ناڕازی بوون، بەڵام سۆڤیەت تا ئەو کاتیش چەند کارتێکی فشار خستنە سەر کوردەکانی لەبەردەست دابوو، لانی کەم دووجار تەگەرەی خستە بەردەم سەربەخۆیی بڕیاردانی سەرانی مەهاباد:

جاری یەکەم دوای بەجێهێشتنی خاکی ئێران لە لایەن لەشکری سوور لە (٦ی مایسی ١٩٤٦) بوو. کە لەو نێوەدا پیشەوەری لەگەڵ تاران دا دەکەوێتە وتوویژ کردن و بە ئاماژەی رووسەکان بە رادەی پێویست نەرمی و کراوەیی لە خۆی نیشان دەدا، تا ئەو جێگەیەی بتوانێ فۆرمێکی رەسمیو یاسایی بداتە خودموختارییەکەی ئازەربایجان، کوردەکان هەرچەندە درەنگتر وەخۆ کەوتن، بەڵام لە ئاکامدا ملیان داو قازی رووی کردە تاران و پێشنیارەکەی "قەوام"یشی پەسند کرد کە لەسەر بنەمای (هەڵوەشاندنەوەی کۆمارو گۆڕینی بۆ دەزگایەکی کارگێڕی خاوەن دەسەڵاتی فراوان لە ناوچە کوردنشینەکان کە لە پارێزگایەکی یەکپارچەدا کۆدەبوونەوە) دامەزرابوو. بەڵام وەك سەرچاوەکان باس دەکەن باڵوێزخانەی سۆڤیەت بە توندی دژایەتیی ئەو پێشنیارەی کردو قازی محەممەدی لە پەسندکردنی ئاگادار کردەوە. درك کنیان پێیوایە کە سۆڤیەت نەیدەویست کوردستان بە هاوشانی ئازەربایجان ببینێ." (٢٠)

ئەو وەڵامەی درك کنیان پاساوێکی دروستە بۆ رەفتاری چاوەڕوان نەکراوی رووسەکان، مەگەر باقرۆف بە قازی محەممەدی نەگوتبوو کە رووسیە پشتیوانی لە سەربەخۆیی کوردەکانو وەدیهاتنی مافەکانیان دەکا، ئەی ئێستا چ هۆکارێك هەبوو بۆ ئەوەی کە ئەو دەوڵەتە ببێتە رێگر لەبەردەم دروستبوونی رێکەوتنێك لە نێوان ئەوان و حکوومەتی مەرکەزی دا؟

راستییەکە ئەوەیە کە سۆڤیەت تاکو دڵنیابوونی لە بەدەست هێنانی جیاوکی نەوتی باکوور نەیدەویست هیچ رێکەوتنێك لە نێوان حکوومەتی کوردستان و ئازەربایجان لە لایەك و حکوومەتی ناوەندی ئێران لە لایەکی دیکەوە هەبێ. بێجگە لەوەش هۆکارێکی گرینگتر بۆ دژایەتی کردنی سۆڤیەت بەرامبەر رێکەوتننامەکەی قەوام و قازی لە گۆڕێ دابوو. ئەویش ترس لە دیتنەوەی رێگە چارەیەکی عەقڵانی و خۆماڵی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان کوردەکان و حکوومەتی ناوەندی بوو، ئەوان نەیان دەویست کێشەی کورد هەروا بە سانایيو بێ نێوەنجیگەریی ئەوان چارەسەر بکرێ و ئیدی سۆڤیەت دەوری براگەورەیی لە نێو کوردەکاندا لــێ بستێندرێتەوە.

جاری دووهەم کە رووسەکان دەست لە کاروباری کۆماری مەهاباد وەردەدەن، ئەو دەمەیە کە هاشمۆف کۆنسولی سۆڤیەت لەگەڵ هێرشکردنی کوردەکان بۆ سەر سنە و کرماشان، واتە ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیا دان، بە توندی دژایەتیی دەکا، پێی راگەیاندن کە ئەگەر حیزبی دیمۆکرات سەرپێچی لەو ئاگادار کردنەوەیە بکا، ئەوە لە پشتیوانیی سۆڤیەت بۆ

کۆماری مەهاباد بێبەش دەبن. کەسانی وابەستەی بازرگانی سۆڤیەت کە لە مەهاباد بوون، ئاگایان لە رووداوەکان بوو، بەڵام لە دواساتدا کاتێك کە مەنافی کەریمی وەزیری پەروەردە، لەگەڵ هاوکارانی بۆ لێکۆڵینەوەی کۆتایی رووبیان کردبووە سەردەشت، بیروڕای رووسەکان گۆڕا و هاشمۆف بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە گوندی "سەرا" نزیك سەقز، بە ڕستەگەلێکی توندوتیژو کاریگەر، قازی محەممەد، مەلا مستەفا بارزانی، عومەرخانی شکاك، میرحاج ئەحمەدو مستەفا خۆشناوی لە هێرش کردنە سەر ناوچەی نفووزی ئینگلیزەکان ئاگادار کردەوەو بووە ڕێگرێك لەبەردەم هێرشی کوردەکان.[21]

هۆکاری وەرچەرخانی سیاسەتی رووسەکان بۆ ئیمزاکردنی ڕێکەوتننامەی پیشەوەری لەگەڵ موزەفەر فەیرووزی جێگری قەوام، لە ڕێکەوتی (٢٨ی خاکەلێوە) دا دەگەڕایەوەو بە رووبەکی دیکەشدا سەرانی سۆڤیەت بە لەبەرچاو گرتنی ناڕەزایەتیو بێزاریی هۆزەکان، کە بەشی سەرەکیی هێزە هێرشکەرەکەیان پێك دەهێنا، ئومێدێکیان بە سەرکەوتنی هێرشەکە نەبوو، بۆیە پێشیان پێگرت. پاساوی رووسەکان بۆ ئەم هەنگاوانە هەر چیەك بووبێ، ئەوەی دەرخست کە لە روانگەی ئەوانەوە کوردەکان بەو رادەیە "سەربەخۆیی کارکردن"یان نییەو دەبێ لەسەر هێڵی سیاسەتەکانی ئەوان (سۆڤیەت) جووڵە بکەنو ئەوەی بە لایانەوە گرینگە بەرژەوەندییەکانی یەکێتیی سۆڤیەتە نەك ئامانجەکانی قازی و حیزبی دیمۆکرات. پەسندکردنی پێشنیارەکەی قەوام، کە لەسەر بنەمای هەڵوەشاندنەوەی کۆمارو پێکهێنانی پارێزگایەکی یەکپارچە کوردنشین کە پارێزگارەکەی قازی محەممەد بێ، نیشانی دا کە ڕێبەری کوردەکان چاکسازیی سیاسیی و ئابووری و بە پێویستی راستەقینەی کوردەکان دەزانێ، نەك پێکهێنانی سیستەمێکی کۆماری یان سیستەمێکی جیا لە قەوارەی ئێران. ئەو پێشنیارەی "قەوام"یش کە لە کاتی جێبەجێکردنی دا، سەرەتایەك دەبوو بۆ پێناسێکی نوێ لە یەکێتیی نەتەوەیی ئێران، لەگەڵ دژایەتی کردنی رووسەکان رووبەڕووبۆوە، بێشك شتێك نەبوو کە وەبەر دڵیان بکەوێ.

یەکێتیی سۆڤیەت پێشتریش، بێ مەیلی خۆی سەبارەت بەو ڕیفۆرمانەی لە لایەن کۆمیسیۆنی هاوبەشی هاوپەیمانەکان لە سەردەمی سەرۆك وەزیری (حەکیمی) دا لە بارەی مافی نەتەوە ئێرانییەکان و لە نێویشیاندا کوردەکان پێشنیار کرابوو، نیشان دابوو.

لە ماددەی حەوتەمی گەڵاڵەی ڕیفۆرمەکەدا بەکارهێنانی زمانەکانی عەرەبی، کوردی و تورکی و پێکهێنانی ئەنجوومەنی ویلایەتی پێشنیار کرابوو، بەڵام لەو رووەوە کە ئەو گەڵاڵەیە

بەرژەوەندی یەکێتیی سۆڤیەتی تێدا نەبوو، بە ڕوویەکی دیکەشدا دەرگایەکی بۆ دەست خستنە نێو چارەنووسی سیاسیی و ئابووریی ئێران، والا نەدەهێشتەوە، لەگەڵ دژایەتی کردنی ڕێبەرانی ئەم وڵاتەدا ڕووبەڕووبۆوە. ئەو چاکسازییانە کە ﴿بەبڕوای ئیبراهیم سەفایی (لە ڕێکەوتننامەی ۱۹۰۷)ی نێوان ڕووس و ئینگلیز، زیانبارتر بوو و لەژێر فشاری گرووپی کەمینەی ئەنجوومەنی چوارده بە سەرۆکایەتیی دوکتۆر موسەدەق بە نەزۆکی مایەوە﴾، دەرفەتی بە دوو دەوڵەتی بەریتانیا و ئەمریکا دەدا، چاوەدێری بەسەر ژیانی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی نەتەوە ئێرانییەکاندا بکا. بەو هۆیەش کە سۆڤیەت پێی خۆش نەبوو ئەو گەڵاڵەیەی پەسند نەکرد کە بە لانی کەمەوە لە ئازەربایجاندا، لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوایی شەریك بێ.(۲۲)

لە کۆی هەڵسوکەوتەکانی سۆڤیەت لە ئاست کوردەکاندا، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەو وڵاتە بەپێچەوانەی دروشمەکانی یەکسانی و ڕێزگرتن لە مافی نەتەوەکانو خۆدەرخستن وەك برا گەورەی میللەتە بێهێزەکان، هەر لە سەرەتای (نەك بەو شێوەی کە ئێگلتۆن لێکی دەداتەوە) (۲۳) وەرگرتنی جیاوکی نەوتی باکوور دا، چارەنووسی کوردەکانی وەلاناوەو وەك مۆرەیەك لە یارییە سیاسییەکاندا بەکاری هێناون، ئێستا دەتوانین بڵێین یەکێتیی سۆڤیەت بە شێوەیەکی گشتی چارەنووسی کۆماری مهابادی لەژێر دەست دابوو و سەربەخۆیی کارکردنی ئەو کۆمارەی لە بوارەکانی سیاسیی و سەربازی کۆنترۆڵ دەکرد، ئەگەرچی لە ڕواڵەتدا ئەو حکوومەتە لە بوارە کولتوورییەکاندا ئازاد و خاوەن بڕیار بوو.

وێڕای هەموو ئەو تایبەتمەندییانەی یەکێتیی سۆڤیەت، ڕێبەرانی کورد تا دوایین دەرفەت، بڕوای تەواویان بە بەڵێنەکانی یەکێتیی سۆڤیەت هەبوو تا ئەو ڕادەیەی کە شرۆفسکی گوتەنی: ڕووسەکان لە بەدەستهێنانی باوەڕو متمانەی کوردەکانی نیشتەجێی ژێر دەسەڵاتیان دا بە تەواوی سەرکەوتوو بوون.(۲٤)

ڕەحیمی قازی لەو گفتوگۆیەدا کە لەگەڵ کریس کۆچێرا کردوویەتی، گوتوویەتی کە قازی محەمەد تا دوایین ساتەکانی ژیانی خۆی، بڕوایەکی قووڵی بە یەکێتیی سۆڤیەت هەبووە.(۲٥) ئەوەش ڕاستییەکە کە چاوی لێ ناپۆشرێ، چونکە قازی بێجگە لە وەفادارییەکەی بۆ سۆڤیەت، سەرقاڵی دامەزراندنی سیستەمێك بوو کە لەسەر مۆدێلی کۆمارەکانی سۆڤیەت داڕێژرابوو. ئەگەر هەلومەرج دەرفەتی پێدابا، بە تەواوی کەڵکی لەو مۆدێلە وەردەگرت. قازی

له چاوپێکەوتنەکەی دا لەگەڵ ئیسترسۆن، کۆنسوولی ئەمریکا لەتەوریز ساڵی (١٣٢٥) ١٩٤٦ز، پەردە لەسەر ئەو نیەتەی هەڵدەماڵێ:

"... دەیان نەتەوەو میللەتی دانیشتووی وڵاتی گەورەی رووسیە، کە لە ئەنجامی سیاسەتی زۆردارانی رابردوو، نێوانێکی باشیان لەگەڵ یەك دا نەبووە، لە سایەی شۆڕشی گەورەی رووسیەو هاوکارییەکانی دەوڵەتی سۆڤیەت، ئێستا بە ئازادی و سەربەخۆیی گەیشتوونو لە هەموو بوارەکان دا هەنگاوی بەرز رووەو سەربەخۆی هەڵدێننەوەو فەرهەنگ و شارستانیەت و ئابوورییەکەیان پێی ناوەتە قۆناغێك کە لە هیچ زەمان و سەردەمێکدا پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتیی خێرای لەو چەشنە نەدیتراوە." [٢٦]

هەتا بە قسەی رەحیمی قازی: "روانگەکانی قازی محەممەد رۆژ لە دوای رۆژ لە دیدگایەکی مارکسیستی نزیکتر دەبۆوە." [٢٧]

دیارە کە ئەو "یەکسانی کۆمەڵایەتی"یەی مارکسیزم بەڵێنی وەدی هاتنی دەدا، بۆ کۆمەڵگایەك کە دەردی هەژاری، بێکاری، نەخوێندەواری تەنگی پێ هەڵچنیبوو و تا سەرئێسکان کاری کردبوو، لە سەروەت و سامان و پێدراوەکانی سروشت، بێبەش بوو، درەنگ یان زوو سەرنجی شۆڕشگێڕانی بۆ لای خۆی رادەکێشا، بەڵام هۆزەکان لەگەڵ کارو کردەوەی سۆڤیەت لە ئاست مەهاباد دا، دژایەتییان دەکردو، ئەو ترسە لە کۆمۆنیزم نەك هەر لە نێو هۆزەکانی ئێران، بەڵکو لە نێو هۆزە کوردییەکانی عێراقیشدا هەبوو. (عەبدوڵڵا پشدەری) سەبارەت بەو روانگەیەو دیدی سەرۆك هۆزەکان سەبارەت بە ئامانجەکانی سۆڤیەت دەنووسێ:

"لە راستیدا خەڵکی کورد، شتێکیان لە وتووێژی نهێنی رووسیەو (قەوام ئەلسەڵتەنە) نەدەزانی، چونکە رووسەکان لەو بارەیەوە زۆر بە پارێزەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد، بەڵام نوێنەرانی کورد لە هەمان ساڵدا (١٣٢٤) ١٩٤٥ز کە بە سەرۆکایەتیی قازی محەممەد چوونە باکۆ، هەستیان بەو راستییە کرد کە سۆڤیەت سەرقاڵی گرتنەبەری سیاسەتی تایبەتی خۆیەتی لە ئازەربایجان دا ـ قەرەنی ئاغای مامەش کە یەکێك لە ئەندامە پایەبەرزەکانی شاندەکە و پیاوێکی بە ئەزموونو دونیا دیدە بوو، لە کاتی گەڕانەوەیان لە سۆڤیەت گوتبووی: کە هیچ باوەڕم بە دەوڵەتی سۆڤیەت نییەو دەترسم رۆژێك بمان خاتە بازاڕی کڕین و فرۆشتنەوە. قاسم حاجی بایەزید ئاغای دێبوکری، دوای سەردانی دووهەمی کوردەکان بۆ رووسیە، ئەو قسانەی قەرەنی ئاغای مامەشی دووپات کردبۆوە." [٢٨]

ئێستا دەزانین کە بۆچی ئەفسەرانی سیاسیی لەشکری سوور هاوکات لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی (ژ.ك)و دامەزراندنی حیزبی دیمۆکرات، بۆ بەدەستەوە گرتنی جڵەوی نارەزایی و تووڕەیی سەرۆك هۆزەکان لە قازی و حیزبەکەی، ناچاریان کردن کە ڕێکەوتننامەی هاوکاریکردن لەگەڵ کۆماری مەهاباد ئیمزا بکەن.[٢٩] نزیکایەتیی حیزبی دیمۆکرات لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا، بوو بە لەمپەرێك لەبەردەم دروستبوونی بزووتنەوەیەکی کوردی گشتگیر لە هەموو ناوچە کوردنشینەکانی ئێراندا. حیزبی دیمۆکرات بەردەوام کۆماری مەهابادی (کە لە دایکبووی هەوڵو کۆششەکانی بوو) بە سۆڤیەت بەستەوەو سنووری دەسەڵاتی لە چوارچێوەی ناوچەی دەسەڵاتی سۆڤیەتەکاندا هێشتەوە.

# بارودۆخی ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجان پێش دامەزراندنی کۆماری مەهاباد

شاری تەورێز کە لە (١٩ی خەزەڵوەری ١٣٢٤)دا، بە هەوڵ و کۆششی پیشەوەری، ڕێبەری فرقەی دیمۆکرات، شاهیدی دامەزرانی کۆماری خودموختاری ئازەربایجان بوون، بە بەشداریی پێنج نوێنەری کورد لە کۆی سەد و یەك نوێنەر، لە شاری تەورێز دەستی بەکار کرد. لەو قسەو باسانەڕا کە لەناو ئەنجوومەندا کران، ئەندامە کوردەکان کە لە ڕاستیدا ئەندامی حیزبی دیمۆکرات و نوێنەری قازی محەممەد بوون، بۆیان روون بۆوە کە: "... ڕژێمی ئازەربایجان دەیهەوێ هەر چەشنە دەسەڵات و ئیمتیازێك لە کوردان بستێنێتەوەو کوردەکانیش کە ئەوەیان دیت، بۆ مەهاباد گەڕانەوە." [١]

لە ماوەی نێوان پێکهاتنی حکومەتەکەی پیشەوەری تا دامەزراندنی کۆماری مەهاباد، ناکۆکیی نێوان کورد و ئازەرییەکان گەیشتە لوتکە: قازی محەممەد لە (ڕێبەندانی ١٣٢٤)دا هەموو کارمەندە ئازەرییەکانی لە بەڕێوەبەرایەتییەکانی مەهاباد و ناوچەکانی دەوروبەردا وەدەر نا. کاتێك پیشەوەری چەند کەسێکی نارد تا بەرهەمی توتنی ناوچەکە وەك جاران وەرگرێ، لەگەڵ دژایەتی و ناڕەزایەتیی کوردەکان ڕووبەڕووبوونەوە. بەپێی بڕیاری قازی وەفدە ئازەرییەکە کە بە سەرۆکایەتیی پورعەجەم جێگری بەڕێوەبەرایەتیی توتنی تەورێز هاتبوو، بە دەستی بەتاڵ بۆ تەورێز گەڕانەوە. هەر بەو شێوەیەش کرێکارانی کارخانەی قەندی میاندواو لە نێوەڕاستی ڕێبەنداندا، نەیان هێشت قەندو شەکر بنێردرێتە تەورێز. [٢]

بەو شێوەیە کوردەکان ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەبوونی دەسەڵاتی ئازەرییەکان بەسەر ناوچە کوردنشینەکاندا، دژایەتییان کردو هاوکاتیش ڕووسەکان بۆ وەجموجووڵ خستنی کوردەکان لە چوارچێوەی ئامانجەکانی خۆیان دا، دەستبەکاربوون. ڕۆزڤێلت لە بارەی هەوڵ و کۆششی کاربەدەستانی سۆڤیەت لەو قۆناغەدا دەنووسێ:

"لە مانگی تشرینی دووەم و سەرەتاکانی تشرینی یەکەمدا، کاربەدەستانی سۆڤیەت، لە نێو هۆزەکاندا دەسووڕانەوەو پێیان ڕادەگەیاندن کە بۆ خەباتکردن لە پێناوی سەربەخۆییدا وەخۆکەون و بە سەرۆك هۆزەکانیشیان گوت لە مەهاباد کۆببنەوە. هەموو هۆزەکان بێجگە لە مامەش و مەنگوڕ و دێبوکرییەکان ئامادەیی خۆیان بۆ هاوکاریکردن پێشان دا. [٣]

ئەندامانی حیزبی دیمۆکرات لە ٢٦ی سەرماوەزدا، ئالآی ئێرانیان لەسەر دادگای مەهاباد هێنا خوارێو ئالآی کوردستانیان هەڵکرد. لەو کاتەدا قازی محەممەد سەرقاڵی وتووێژکردن بوو لەگەڵ رووسەکان، تاکو سەبارەت بە پێکهێنانی حکوومەتێکی کوردی سەربەخۆ لە ئازەربایجان، رەزامەندیی ئەوان بەدەست بهێنێ. ئیگلتۆن وێڕای ئاماژەکردن بەو وتووێژانە ئەوەش دەردەخا کە رووسەکان پێش دامەزراندنی کۆماری مەهاباد، لە ٢ی رێبەندانی ١٣٢٤دا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ رەزامەندیی خۆیان سەبارەت بە هەنگاوەکانی قازی محەممەد و حیزبی دیمۆکرات بۆ سەربەخۆیی کارکردنی کوردەکان و جیابوونەوەیان لە ئازەربایجان دەربڕیبوو، ئەو لەو بارەیەوە دەنووسێ:

" لە حەڤدەهەمی ژانویە (پێنج رۆژ پێش راگەیاندنی کۆمار)دا، دەنگوباسێکی وا داکەوتبوو کە لێك کۆبوونەوەیەکی گرینگ لە بیست و دووهەمی ژانویە لە مەیدانی چوارچرای مەهاباد، بەڕێوە دەچێ... خودی قازی لە تەورێز لەگەڵ پیشەوەری و کاربەدەستانی سۆڤیەت لە بارەی ویست و ئامانجەکانی گەلی کورد، وتووێژ دەکا." (٤)

قازی دوای گەڕانەوەی لە مەهاباد رۆژی دووی رێبەندانی بۆ راگەیاندنی کۆمار، هەڵبژاردو بە وتەی ئیگلتۆن:

"بەرنامەکانی خۆی خستە بەردەم ستوان (نەماز عەلی ئۆف)، کە دواتر بوو بە ئەفسەری سیاسیی سوپای سوور لە میاندواو داو سەرگورد (یەرماکۆف)... کە هیچیان لەگەڵ بەرنامەکەدا دژایەتییان نەکرد."(٥)

بەلەبەرچاوگرتنی دژایەتی کردنی قازی لەگەڵ پێشنیارەکەی باقرۆف کە لەسەر وابەستەیی قازیو حیزبەکەی بە فیرقەی دیمۆکراتی پیشەوەری دامەزرا بوو، هەلومەرج بۆ دەستپێکردنی چالاکی سەربەخۆیی دیمۆکرات، هاتبووە ئاراوە، ئەو وتووێژەی کە لە گۆڕێش دابوو، تەنیا بۆ ئەو مەبەستە بوو کە چۆنیەتیی هاوکاریکردنی نێوان دوو سیستەمی جیاخواز لێك بدرێتەوە، چونکە کوردەکان دەیانزانی بێ هاوکاریکردنی پیشەوەری، لە پشتیوانی کردنی رووسەکان بێبەش دەبن.

قازی پێش وتووێژکردن لەگەڵ رووسەکان، (عەبدولڕەحمان زەبیحی و عەلی رەیحانی) ناردبووە کۆنسولگەری بەریتانیا لە تەورێز، تا سەبارەت بە مەرجەکانی قازی وتووێژیان لەگەڵ بکەن. بەڵام کۆنسول لەگەڵ ئەو بەرنامەیە دا نەبوو، لەوانەشە بۆ فشار خستنە سەر رووسەکان ئەوەی کردبێ. ئەو هەنگاوەی قازی محەممەد و حیزبی دیمۆکرات بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی دیپلۆماسە ئینگلیزەکان

سەبارەت بە خودموختاری یان سەربەخۆیی کوردستان، کە وەك بەدیهێنانی ئەرکێك لە بەرامبەر جیهانی ئازاد و نوێنەری بە دەسەلاتی ئەو جیهانە واتە (بەریتانیا) لەسەر شانۆی سیاسیی ئێران دەهاتە بەرچاو، لە رووی سیاسییەوە بە هەڵە لە قەڵەم دەدرێ، چونکە بەریتانیا لەو سەردەمەدا تەنیا بیری لە پاراستنی بەرژەوەندییە نەوتییەکانی خۆی لە باشووری ئێران و پاراستنی یەکێتیی خاکی عێراق دەکردەوە، خۆی لە هەر هەنگاوێك سەبارەت بە وەجموجووڵ خستنی کوردەکانی عێراق دەپاراست. هەرچەندە بەرەبەرە بۆ جیاکردنەوەی ئازەربایجان لە لایەن سۆڤیەتو ئەنجامەکانی ئەو جیاکردنەوەیە ملی دەدا. بەڕێوەبەرانی لەندەنیش، دابەشبوونی ئێرانیان بە ئەگەرێکی حەتمی دادەنا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەنەبوون بە ڕەسمی ئەو دابەشکردنە پەسند بکەن.

## راگەیاندنی دامەزراندنی کۆماری مەهاباد

سەرەنجام لە رۆژی (دووی ڕێبەندانی ١٣٢٤) دا قازی لە کاتێکدا جلوبەرگی ئەفسەرانی رووسی لەبەر کردبوو مەندیلیشی لە سەرنابوو، لە بەرامبەر خەڵکی مەهاباد و سەرۆك هۆزەکانی دەوروبەردا، دامەزراندنی کۆماری مەهابادی راگەیاند.

کورتەی قسەکانی بەم شێوەیە بوو "کوردەکان میللەتێکی جیان و خاکی تایبەتی خۆیان هەیەو وەك میللەتانی دیکە مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان هەیە، ئێستا ئەوان هۆشیار بوونەوەو دۆستی بەهێزیان هەیە." (٦)

پاشان سوپاسی خۆی پێشکەش بە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکرات کرد کە وەك سەرۆك کۆمار هەڵیان بژاردووە. لەو ڕێوڕەسمەدا زێرۆبەگی هەرکی، شێخ عەبدوڵڵا فەندی گەیلانی، بە هاوکاریکردن لەگەڵ بەریتانیا تاوانبار کرد، کە یەکێك لە ڕەقیبە بەهێزەکانی قازی بوو بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری. ئیگلتۆن پێیوایە کە سەروان (نەماز عەلی ئۆف) کۆمەڵە

کەسێکی دژی شێخ گەیلانی هان دابوو، تا لەبەر چاوی خەڵکی بخەن. [٧] (عەبدوڵڵا پشدەری)، ئاڵنیامان دەکاتەوە کە شێخ گەیلانی لەو سەردەمەدا نفووزێکی زۆری لە نێو خەڵکدا هەبووەو بە رەقیبی قازی دەژمێردرا. پاشان چۆنیەتیی هەڵبژێرانی قازی بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری بەم شێوەیە باس دەکا:

'سەرۆکایەتیی قازی محەممەد لە رێگەی هەڵبژاردنەوە نەبوو، ئەوەش لەبەر ئەو گرینگییە سیاسیی و دینی و کۆمەڵایەتییەی کە لە نێو خەڵکدا، هەیبوو، تاکە کەسێك کە دەیتوانی لە بەرامبەریدا راوەستێ و لە نێو خەڵکیشدا روخسارێکی دیارو خاوەن رێز بوو (سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی) بوو. ئەگەر پۆستی سەرۆك کۆماری لە رێگەی هەڵبژاردنەوە دیاریکرابا، دوور نەبوو کە (سەید عەبدوڵڵا فەندی)، لە قازی زیاتر دەنگ بهێنێتەوە. بەڵام لەو سەردەمەدا دەنگوباسێکی وا دا کەوتبوو کە خەڵك پێیوایە رووسەکان لەگەڵ (سەید عەبدوڵڵا گەیلانی)دا ناکۆکن. [٨]

ئەو رووداوە دوو راستی دەردەخا:

یەك ئەوە کە قازی کەشوهەوای دیمۆکراتی کۆمەڵەی لە نێو بردبوو، ئیرادەی خۆی بەسەردا سەپاندبوو، دووەم ئەوە کە رووسەکان نەك لە بەرامبەر ئێراندا پشتیوانیان لە قازی و حیزبی دیمۆکرات دەکرد، تەنانەت لە ناوچە کوردنشینەکانیشدا ئەو کەسایەتییە بەهێزە کوردانەی کە خاوەن نفووزو دەسەڵات بوون، بێهێزیان دەکردن و لەسەر رێگەی رێبەری حیزب وەلا دەنران.

بەرهەڵستکارانی قازی بەهۆی کاربەدەستانی سۆڤیەتەوە رام دەکران یان سەرکوت دەکران، کە لە نێویاندا دەتوانین ئاماژە بە کوژرانی مەحموودیان، بازرگانێکی مهابادی و بێدەنگ کردنی چەند سەرۆك هۆزێکی ناکۆك لەگەڵ سیاسەتەکان (قازی) دا بکەین. لە هەڵسەنگاندنێکی گشتیدا دەتوانین بڵێین  کە پێکهاتنی کۆماری مەهابادو هەڵبژاردنی (قازی) محەممەد وەك سەرۆك کۆمار، دوو رووداوی گرینگ بوون کە هیچیان لە رێگەی هەڵبژاردنەوە بەرێوە نەچوون. لە هەر دوو بوار دا رووسەکان رۆڵی کاریگەریان گێڕا. دوای راگەیاندنی کۆمار، قازی چەند نوێنەرێکی بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکان ناردو حەمە ڕەشیدیشی بۆ بانە و سەردەشت نارد، تا سەرانی کورد بۆ هاوکاری کردن لەگەڵ حکوومەتی سەربەخۆی کوردی ناچار بکا، بەڵام بەئاشکرا لەو هەوڵەدا شکستی خوارد.

# پێکهاتەی کابینەی قازی محەممەد

بیست ڕۆژ دوای دامەزرانی کۆماری مەهاباد، ناوی وەزیرەکانی ئەو حکوومەتە لە ڕۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی حیزبی دیمۆکرات دا بەم شێوەیە بڵاو بۆوە:

| | |
|---|---|
| سەرۆك وەزیر | حاجی بابا شێخ |
| وەزیری شەڕ | محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی |
| وەزیری پەروەردەو پێگەیاندن و جێگری سەرۆك کۆمار | مەناف کەریمی |
| وەزیری ناوخۆ | محەمەد ئەمین موعینی |
| وەزیری تەندروستی | محەمەد ئەیوبیان |
| وەزیری دەرەوەو جێگری سەرۆك کۆمار | عەبدولڕەحمان ئیلخانی زادە |
| وەزیری ڕێگاوبان | ئیسماعیل ئیلخانی زادە |
| وەزیری ئابووری | ئەحمەد ئیلاهی |
| وەزیری پۆستە و گەیاندن و تەلەگراف | کەریم ئەحمەدی |
| وەزیری داد | مەلا حوسێن مەجدی |
| وەزیری بازرگانی | مستەفا داودی |
| وەزیری کشتوکاڵ | مەحموود والی زادە |

لە نووسینەکانی (عەبدوڵڵا پشدەری)و (ئیگلتۆن) دا، ناوی خەلیل خوسرەوی وەك وەزیری کار هاتووە، بەڵام کریس کۆچێرا باسی ناکاو ناوی سەدیق حەیدەری وەك وەزیری ڕاگەیاندن دەهێنێ.[٩]

بەم شێوەیە پێنج کەس لە سەرۆکە کوردەکان لە لایەن قازی محەممەدەوە پلەی ژەنەراڵییان پێدرا کە بریتی بوون لە:

١ـ محەمەد حوسێن خان سەیفی قازی

٢ـ عومەرخان شەریفی

٣ـ مەلا مستەفا بارزانی

٤ـ زێرۆبەگ هەرکی

٥ـ محەمەد ڕەشیدخانی قادر خان زادە (حەمەرەشید خانی بانە)

**ئەفسەرانی ستادی لەشکری کۆماری بەو شێوەیەی خوارەوە دیاری کران:**

١ـ جەعفەر کەریمی دێبوکری (خانی قوم قەڵا)

٢ـ مستەفا خۆشناو لە ئەفسەرانی کوردی عێراق و ئەندامی پارتی هیوا

٣ـ محەممەد قودسی لە ئەفسەرانی کوردی عێراق و ئەندامی پارتی هیوا

بەو شێوەیە کۆماری مەهاباد پێکهات و لە سەرەتای دەستپێکردنی چالاکییەکانی وەك حکوومەتێکی جیاو سەربەخۆ لە دەوڵەت و کۆمەڵگەی ئێران خۆی دەرخست، لێکدانەوەی ستراکتۆرو پێکهاتەی حکوومەت و کابینەکەی قازی چەند خاڵێکی سەرنجراکێش لە بارەی بارودۆخی ئەو کاتی کوردستان و چۆنیەتیی گەشەکردنی ناسیۆنالیزمی کورد بەدەستەوە دەدا. دوو تایبەتمەندیی سەرەکیی سیستەمەکەی قازی محەممەد لە یەکبوونی پێگەی کۆمەڵایەتی و جوگرافیای رەگەزە پێکهێنەرەکانی ئەو سیستەمە و حیزبی بوونی هەموو دامەزراوەکانی ئەو حکوومەتە دا کورت دەکرایەوە. هەموو وەزیرانی کابینەکە بێ هیچ هەڵبژاردەیەك مهابادی و ئەندامی حیزبی دیمۆکرات و سەر بە چینی ناوەندی شارنشین بوون. بە واتایەکی دیکە چینی ناوەندی شاری مەهاباد بوونە سەنتەرو میحوەری ناسیۆنالیزمی تازە لە دایکبووی کوردستانی ئێران و قەوارەی کۆماری مەهابادیان پێك دەهێنا، سەرۆك وەزیر "حاجی بابە شێخ" خەڵکی بۆکان بوو، گرینگییەکی ئەوتۆی نەبوو، چونکە کاروباری جێبەجێکردن (اجرایی) لە دەستی سەرۆك کۆمار دا کۆببۆوە، پۆستی سەرۆك وەزیران شێوەیەکی رواڵەتی و تەشریفاتیی هەبوو. بە بوێرییەوە دەتوانین بڵێین پێکهاتنی کۆمەڵەی (ژ.ك)، حیزبی دیمۆکرات، کۆماری مەهاباد و دامەزراوەکانی هەموویان بەپشتبەستن بە رەگەزی مەهابادی جێبەجێ کران و هەموو بەرپرسان و پۆستە گرینگەکان زیاتر مهابادی بوون تا کوردستانی. هەڵبەت ئەو مەسەلەیە خۆی لە خۆیدا نیشاندەری توانای سیاسی باڵای خەڵکی ئەم شارەیە و لە هەمان کاتیشدا ئەو راستییە دەردەخا کە ناسیۆنالیزمی کورد لە ناوچە کوردنشینەکانی دیکەی ئێراندا لە جیاتی لایەنگری بە ئەمەگ، کۆمەڵێك وتەبێژ (مخاطب)ی هەبوو، کە بۆ رێکخستنیان چالاکیی سیاسیی و دەرفەت پێویست بوو. ئێستا دەبێ بپرسین، بۆچی خەڵکی مهاباد بەو رادەیە لە پێکهاتنی ئاڵوگۆڕەکانی ئەو سەردەمەدا کاریگەر بوون؟

شاری مهاباد بە سەنتەری کولتووری کوردەکان لە قەڵەم دەدراو لە رووی ژیانی کولتوورییەوە زیاتر لەگەڵ کوردستانی عێراقدا پێوەندی هەبوو تا تەورێز و تاران و تەنانەت سنەش. بەو هۆیە روانگە و دیدی سیاسیی رۆشنبیرانی مهاباد زیاتر کاریگەری رۆشنبیرانی سلێمانی و

هەولێری لەسەر بوو. کۆمەڵە بەهۆی دەستوەردانی راستەوخۆی کوردەکانی عێراق پێکهات‌و بووە هۆی ئەوەی خوێندەوارانی مهاباد هەرچی زیاتر لەگەڵ کاروباری سیاسییدا تێکەڵ بن. ئەو مەسەلەیە وێڕای ئەوەی کە بووە هۆی بەگەڕخستنی سەرمایەی رووسەکان لە نێو سەرۆك هۆزەکان و گەورە پیاوانی مهاباد، لە لایەکی دیکەشەوە بووە هۆی مەودا گرتنی مهابادییەکان لەگەڵ دانیشتووە کوردەکانی ئازەربایجان و پارێزگای کوردستان. ئەو مەودایە بە رادەیەك پەرەی سەند کە بووە هۆی دروستبوونی ناهاوسەنگییەك لە نێوان رەفتاری سیاسیی کوردەکانی مهاباد لەگەڵ کوردەکانی ئازەربایجان‌و پارێزگای کوردستاندا. بێجگە لە هۆکارە دەرەکییەکان، کۆمەڵێك هاندەری دیکەش هەبوون کە خەڵکی مهابادیان رووەو ئەو چاکسازییانە هان دەدا، کە گرینگترینیان بەربەرەکانی کردن لەگەڵ ئازەرییەکان واتە هەمان دیاردە دێرینەکەی سەردەمی قاجارییەکان و کاردانەوە بەرامبەر بەهەڵسوکەوتی چەوتی کاربەدەستانی ئیداری و سەربازی، رێژیمی رەزاشا بوون. (هەمان دیاردەی ستەمی میللی)، بێزاری و ناڕەزایی کوردەکان لە سیاسەتی رەزاخان لە مهاباد و ناوچەی موکریاندا قووڵترو رەنگدانەوەیەکی زیاتری لەچاو ناوچە کوردنشینەکانی دیکەی ئێران هەبوو، هەر بەو هۆیەش بوو کە لە کرماشان و کوردستان و ئیلامدا، بە دوای رووخانی رێژیمی رەزاشا، شاهیدی رووداوی ئەوتۆ نەبووین، تەنانەت کەمترین رۆڵیان لە رەوتی سیاسیی ناوچەکەدا نابینی.

پاش راگەیاندنی کۆماری مهاباد لە دووی (ڕێبەندانی ١٣٢٤)و پێکهێنانی چەند وەزارەتێك بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئابووری، سیاسیی، کۆمەڵایەتی و پارێزگاری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سیستەمە نوێیەکە، دەرکەوت کە دوو وەزارەتی شەڕو راگەیاندن، گرینگییەکی زۆریان لە داهاتوو دا دەبێ.

بەهۆی بێبەشبوونی حیزبی دیمۆکرات لە پێگەیەکی خەڵکیکی بەهێز، وەزارەتی شەڕ لە ماوەی یازدە مانگدا، بە پشتیوانی سەرەکیی حیزب دەژمێردرا. بێجگە لەو وەزارەتە هیچ هێزێکی دیکە نەی دەتوانی زەمانەتی مانەوەی کۆماری مهاباد لە بەرامبەر لەشکری شا دا بکا. وەزارەتی راگەیاندن هەر لەبەر ئەو هۆیە زۆر چالاك بوو، هەوڵی دەدا ئامانجی ناسیۆنالیزمی جیاخوازی کوردو زەروورەتی هاوکاریکردن لەگەڵ کۆماری مهاباد دا، بۆ خەڵك روون بکاتەوە.

هەڵسەنگاندنی هەڵسوکەوتی حکوومەتی دیمۆکراتەکان، دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە ئەو حکوومەتە پێڕەوی لە بەرنامەیەکی نووسراو بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەی کوردی نەدەکردو خاوەن یاسایەکی بنەڕەتی نووسراو و گشتگیر نەبوو، تا لە پەراوێزی ئەو یاسایەدا پرۆژەی گونجاو لەگەڵ هەلومەرجی سیاسیی ـ کۆمەڵایەتیی کوردستان بخرێنە کارەوە. وەزارەتەکانی کۆماری مهاباد لەسەر مۆدێلی دامەزراوە سیاسییەکانی رێژیمی پیشەوەری دارێژرابوونەوەو لەنێو بەشە جۆراوجۆرەکانی دا هەماهەنگییەك بەدی نەدەکرا. (عەبدوڵڵا پشدەری) کە لە نزیکەوە ئاگای لە گەشە کردنو وەسەرپێ کەوتنی کۆماری مهاباد هەیە، نەبوونی هەماهەنگی لە نێو دامەزراوە دەوڵەتییەکان بە یەکێك لە هۆکارەکانی لاوازی و رووخانی کۆمار دادەنێ و دەنووسێ:

"قازی محەممەد لە رووی رێکخستن و بەرەو پێش بردنی کاروباری کۆمار زۆر دڵسارد بوو، بۆ نموونە لە درێژەی یازدە مانگی حکوومەتەکەیدا دەستوورێك دانەنرا، تا دامەزراوە سیاسیی، ئابووری، سەربازی، کۆمەڵایەتی و پەروەردەییەکان بە تەواوی پێڕەوی لێ بکەن. [1]

ئەگەر رەخنەکانی پشدەری بەجێن، پێویستە بشزانرێ کە ئەو کۆمارە بە شێوەیەکی گشتی لە هەندێك رووەوە سەرکەوتووتر لە حکوومەتی رەزاشا هەڵسوکەوتی کردو توانی تا رادەیەکی زۆر خەڵك لە خۆی رازی کا. لەو بەشەدا لە کارەکانی کۆماری مهابادو ئەو چاکسازییانە دەکۆڵینەوە کە لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا کردوونی،:

## دامەزراندنی کۆمپانیای پەرەسەندن

مپانیای پەرەسەندن، بەرپرسی ڕێکخستنی پێوەندییە ئابوورییەکانی حکوومەتی کوردی لەگەڵ
ران، ئازەربایجان و یەکێتیی سۆڤیەت دابوو. تا پێش بەستنی ڕێکەوتننامەی دۆستایەتی و
وکاری لە نێوان کوردستان و ئازەربایجان، پێوەندییە بازرگانییەکانی ناوچە کوردنشینەکان بە
ێوەیەکی ئاسایی بەردەوام بوون، بەڵام پاش مەودا گرتنی کوردەکان لە حکوومەتی ناوەندی،
وورە بەرپرسانی ئێرانی لە تاران جۆرێك بێبەشکردنی ڕەسمییان دژی کۆماری مهاباد ڕاگەیاند و
دوای ئەو ڕووداوەدا پێوەندییەکانی ئەو کۆمپانیایە لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتدا گەشەی کرد. بەو
ێوەیە کەلوپەلو پێداویستییەکانی کوردەکان لە لایەن سۆڤیەتەوە دەنێردراو لە بەرامبەردا تووتن
، بەرهەمی سەرەکیی ناوچە کوردنشینەکان بوون بۆ ئەو وڵاتە دەنێردرا. ئیگلتۆن باس لە فرۆشتنی
٠٠ ١٨٧٥) کیلۆگرام تووتن لە کۆگاکانی مهاباد بە سۆڤیەت دەکا، کە حکوومەتی ئێران پێش
گەیاندنی کۆمار نرخی ١٠٪ی ئەو بەرهەمەی دابوو، بەڵام دوای ئەو ڕووداوە، وازی لەو مامەڵەیە
ێنا. بەم شێوەیە کۆمپانیای پەرەسەندن، ئەو تووتنەی بە نرخی هەشت سەد هەزار دۆلار لە
رامبەر پوڵی بەکار براوی ئێران و کۆمەڵێك کەلوپەلی ڕووسی وەك شەکر، لیباس و پۆشاکی
وری، پێداویستی شووشەیی و چینی بە ڕووسەکان فرۆشت. بە وتەی ئیگلتۆن ڕووسەکان بە
خێکی کەمتر لەو نرخەی دەوڵەتی ئێران دەیدا تووتنەکەیان دەکڕی. (٢)

ستنیشانکردنی بەهای تووتنی کوردستان کە بە هەر سێ شێوەی باش، ناوەند، خراپ بەرهەم
هێنراو دەخرایە ڕوو، هەمیشە دەبووە هۆی دروستکردنی ناکۆکی لە نێوان وەزارەتی دارایی‌و
رهەمهێنەرانی تووتندا، کە زۆربەیان بۆ موڵکدارو سەرۆك هۆزەکان کاریان دەکرد. قازی محەمەدو
ەدری قازی نوێنەری مهاباد لە ئەنجوومەنی شوورای میللیدا هەمیشە هەوڵی بردنە سەری نرخی
وتنیان دەدا، بەهۆی فشاری ئەوان و داوای سەرۆك وەزیران لە وەزیری دارایی، وەزارەتی دارایی
م شێوەیە وڵامی دانەوە:

ەنابی سەرۆك وەزیر، بەپشتبەستن بە نامەی ژمارە (١٤٧٩٩) ڕێکەوتی (١٣٢٣/٨/١٥)، کە لە
ەتی نرخی کڕینی تووتنی بەرهەم هاتووی ساڵی پار لە مهاباد ئاگادارمان دەکاتەوە، دامەزراوەی
ینی تووتنی ئێرانی، بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی وردو تێبینی کردنی هەموو لایەنەکان، نرخی کڕینی
وتنی لە سەرانسەری وڵاتداو بەلەبەرچاوگرتنی قازانجی بەرهەمهێنەران، دەستنیشان کردووەو

دوای بڕیار لەسەردانی لە لایەن وەزارەتەوە، دراوە بەو شارانەی کە ئەو بەروبوومەی لێ بەرهەم دێ و بەپێی راپۆرتێك کە لە لایەن کاربەدەستانی راسپێراو، سەبارەت بە کڕینی بەرهەمی توتن، بە دەستمان گەیشتوە، نرخی دیاریکراو لە هەر روویەکەوە گونجاوەو لەگەڵ دابەزینی رۆژ لە دوای رۆژی نرخی کەلوپەل دا دەگونجێ. نرخی کڕینی بەروبوومی ساڵی پار، لە مهاباد زیاد ناکرێ. (٣)

لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە داوای زیادکردنی نرخیان نەدەکرد، بۆ نموونە دوای چاوپێکەوتنی سەدری قازی و ژمارەیەك ئاغا و پیاوە گەورەکانی مهاباد لەگەڵ شا لە (سەرماوەزی ١٣٢٣) و وەزارەتی دەرباری شاهەنشاهی لە رێکەوتی ١٣٢٣/٩/١٦ دا، وێڕای شیکردنەوە خواستەکانی سەرانی کورد داوایان لە سەرۆك وەزیری ئەوکات کرد کە نرخی کڕینی توتن بەرنە سەرێو "بۆ دیاریکردنی نرخی یەکجارەکی توتنەکانی شنۆو جێگاکانی دیکەو ... پاراستنی هاوسەنگی، لە لایەن وەزارەتی داراییەوە هەنگاوی جیددی هەڵگیرێ." (٤)

هەر بەو هۆیە نرخی پێشنیارکراوی دەوڵەتی ئێران لە نرخی پێشنیارکراوی رووسەکان پتر بوو. کۆمپانیای پەرەسەندن لەژێر سەرپەرشتی وەزیری نێوخۆ (محەمەد ئەمین موعینی) دابوو، دووکەس لە جێگرەکانی بەناوی قاسم ئۆتمیشی زادەو رەحمان وەلی زادە، کۆمپانیایەکەیان بەڕێوە دەبرد. لەو رووەوە کە قازی محەممەد هەموو کارمەندە غەیرە کوردەکانی، بە فارس و ئازەرییەوە لە بەڕێوەبەرایەتییەکانی ناوچەی خودموختار وەدەرنابوو، لەجێی ئەوان کارمەندی کوردی دانابوو، حکوومەتی ئێرانیش دابینکردنی مووچەی کارمەندانی ناوچەکەی بە ئاڵوگۆڕی بارودۆخەکە بەستبۆوە، هەرچەندە دوای گفتوگۆکانی قەوام و قازی رێکەوتنێك لەو بارەیەوە، هەروەها لە بارەی کڕینی توتنی جووتیاران، هاتبووە ئاراوە، بەڵام بە تەواوی کاری پێنەکرا. کۆماری مهاباد لە رێگەی کۆکردنەوەی باج لە شارو دێیەکان، وەرگرتنی مافی ئەندامەتیی ئەندامان و لایەنگرانی حیزب، فرۆشتنی توتن و بەروبوومی دیکە بە ئازەربایجان و یەکێتیی سۆڤیەت، وەرگرتنی گومرك لەو کەلوپەلانەی کە لە عێراقو ئازەربایجانەوە دەهاتنە ناوچەی خودموختاری کوردستان، خەزێنەی دارایی خۆی پڕ دەکرد. بەڵام ئەو سەرچاوانە بۆ بەڕێوەبردنی کۆماری مهاباد بەس نەبوون، هەر بەو هۆیە لە تەمووزی ١٩٤٦ دا بڕی ٢٠٠٠٠٠ تومەن لە حکوومەتی پیشەوەری قەرز کراو لە بەرامبەردا قەند و شەکری بەرهەم هاتوو لە کارخانەی قەندی میاندواو بە فرقەی دیمۆکرات درا. (٥)
لەسەر یەك بارودۆخی دارایی کۆمار لە هیچ روویەکەوە دڵخۆشکەر نەبوو، بە شێوەیەك کە قازی نەیدەتوانی بارزانییەکان و بنەماڵەکانیان تێر بکا. بەوتەی (یەحیا سادق وەزیری) دیمۆکراتە چەکدارەکان لە باشووری ناوچەی فەرمانڕەوایی کۆماردا، بەبێ پووڵ دان گەنم و خواردەمەنییان لە

اوەن مولکەکانی ناوچەی سەقز وەردەگرت، لە بەرامبەردا بەڵگەیەکیان دەدانێ و کەسیشیان بۆ و کارە ناچار نەدەکرد.[٦]

و مەسەلەیە لەگەڵ بیروڕای رۆزڤێلت یەك دەگرێتەوە کە نووسیویەتی:

یێجگە لە هۆکاری مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئایینی، کە هۆزەکانیان بۆ دژایەتی کردنی کوومەت "کە لە لایەن سۆڤیەتەوە پشتیوانی دەکرا" هان دەدا، هۆکاری ئابووری بەهێزیش ەبوو. بژێوی ژیانی بەشێك لە خەڵك و هۆزە کوردییەکان تووتن بوو. ئەو خەڵکە ئێستا بە بێبەش انەوە لە بازاڕی ئێران، تووشی قەیران ببوون. لە هێندێك ناوچەدا، خواردەمەنی کە بە زەحمەت شی دانیشتووانی دەکرد، لەگەڵ بارزانییەکان کە ئیدی بەچاوی میوان سەیر نەدەکران، بەش دەکرا. [٧] بەو شێوەیە رووخانی کۆماری مهاباد لە (سەرماوەزی ١٣٢٥)، کۆتایی بە بارودۆخی ئاڵۆزی بووری کوردەکان و بەقسەی حاجی بابەشێخ، کۆتایی بەو هەژارییە هێنا کە لە حکوومەتەکەی زی محەممەدەوە سەرچاوەی دەگرت.[٨]

## چاکسازی پەروەردەیی و کولتووری

ازی محەممەد خوازیاری بڵاوکردنەوەی خوێندەواری لە نێو لاوانی کورد دابوو و بەو ئیمکاناتە ەمەی کە هەیبوو، لەو پێناوە دا هەوڵی زۆریدا. بەهۆی زەحمەتەکانی قوتابخانەیەکی ئامادەیی ە مهابادو لە شارەکانی نەغەدە، شنۆو بۆکانیش، قوتابخانەی نوێ کردەوە، کە بە زمانی وردی دەرسی تێدا دەگوترایەوە. لە سەرەتادا مامۆستایان کتێبە دەرسییە فارسییەکانیان ستەوخۆ دەکردەوە بە کوردی، بەڵام لە کۆتاییەکانی تەمەنی کۆماردا، ئەو کتێبانەی کە یشتر لە کوردستانی عێراقەوە راسپێردرا بوون ، گەیشتن، بەڵام ئیگلتۆن گوتەنی:

" ئەو جیاوازییەی لە نێو زاراوەکاندا هەبوو، بووە رێگرێك لەبەردەم کاریگەربوونی ئەو ەرچاوە دەرسییانە."[٩]

ۆسین رامبۆ دەنووسێ کە قازی محەممەد لە هەمان رۆژی راگەیاندنی سەربەخۆیی کوردستاندا، ە هەنگاوێکی نموونەیی و بەرچاودا، مەدرەسەیەکی باڵای کچانەی لەگەڵ دەستبەکاربوونی ۆژنامەی کوردستان، ئۆرگانی حیزبی دیمۆکرات دا کردەوە.[١٠] هەروەها حەمید موئمنی باسی

کردنەوەی قوتابخانەیەك بۆ منداڵانی یەهوودی لە مهاباد دا دەکا، کە بەزمانی عیبری دەرسی تێدا دەگوترایەوە. [11] بەو هۆیە کە لەژێر فەرمانڕەوایی حکوومەتی قازیدا، دامودەزگایەکی زانکۆیی نەبوو، بەپێشنیارکردنی یەکێتیی سۆڤیەت و ڕەزامەندی دەوڵەتی ئێران، ڕێبەری کوردەکان بڕیاری دا کە ٦٠ لاوی کورد، بۆ درێژەدانی خوێندن بنێرێتە یەکێتیی سۆڤیەت پێشر ئەو بڕیارەش حەوت لاوی دیکە بۆ سۆڤیەت نێردرابوون. عەبدوڵلاّ پشدەری دەنووسێ کە قازی ئەو قوتابیانەی زیاتر لە نێو کوڕە سەرۆك هۆزەکاندا هەڵبژاردبوو و مەبەستیشی ئەوە بوو کە "... ئەو عەشیرەتزادانە، بەدیتنی وڵاتانی خاریجیو فێربوونی دابونەریتی میللەتانی دیکە چاوو گوێیان دەکرێتەوەو ئەو ئاغا و ئاغاوەتی و زوڵم و زۆرییەی لەسەر خەڵکی بێ پەنای کورد هەیە، هەڵی دەگرنو دەیگۆڕن."[12]

وێڕای ئەوەش بەو شێوەیەی کە عەبدوڵلاّ پشدەری و ڕۆژنامەی (باختەر) باسی لێ دەکەن، سەرۆك هۆزەکان بە ناردنی کوڕەکانیان بۆ یەکێتیی سۆڤیەت ڕازی نەبوون. ئەوە خۆی لەخۆیدا نیشانەی بێزاری و ناڕەزایەتیی هۆزەکانە لە سیاسەتە چاکسازییەکانی قازی و حیزبی دیمۆکرات. [13] دوای ڕووخانی کۆماری مهاباد ژمارەیەکی کەم نەبێ دەنا هەموو ئەو قوتابیانەی نێردرابوونە یەکێتیی سۆڤیەت گەڕانەوە ئێران، (دوکتۆر قادر محموود زادە) ناسراو بە ئاسۆ، کە بۆ خۆی یەکێك لەو قوتابیانەی بووە دەنووسێ کە لە باکۆ دا:

"... لە کلاسەکانی دەرس گوتنەوەی لەشکری سووردا، کەسانی شەڕ دیتوو و سیاسەتمەدارە بە ئەزموونەکانی شارەزا لە فەلسەفەی مارکسیزم ـ لێنینیزم، واتە چکیستو یوریستە (کارئاگا) دونیا دیتووەکان، دەرسیان پێ دەگوتین وەك: سەرهەنگ حەق ویردیف، سەرهەنگ نەسلانۆفو ..." [14] هەروەها باس لەوەش دەکا کە کاریگەری دەروونی تێکچوونی کۆمارەکانی مهابادو ئازەربایجان، لەسەر قوتابیە کورد و ئازەرییەکان وەك یەك نەبوو. "قوتابییە کوردەکان دانیان بەوە نا کە کڵاویان لەسەرنراوە، بەڵام ئازەرییەکان مەیلێکیان بۆ گەڕانەوە نەبوو، هەر لەوێ مانەوەو درێژەیان بە خوێندن دا."[15]

سەرەنجام پاش تێکهەڵچوونی کوردەکان لەگەڵ سەربازە سۆڤیەتەکان و مانگرتنی سێ مانگەی دەوڵەت سۆڤیەت لە ڕێگەی کونسولگەری ئێران لە باکۆدا، ئەوانیان بۆ ئێران گەڕاندەوە. بەگشتی دەتوانین بڵێین کە حکوومەتەکەی قازی لە تەمەنی کورتی خۆیدا نیشانی دا کە لە توانای دایە بە شێوەیەکی کاریگەرتر لە دەوڵەتی شاهەنشاهی ئێران، لاوانی کورد لە نیعمەتی پەروەردەو خوێندەواری بەهرەمەند بکا، لەو ڕێگەیەشدا ئیرادەو لێوەشاوەییەکی پێویستی هەیە.

# پەرەگرتنی رۆژنامە و چاپکراوی کوردی

لە درێژەی تەمەنی حکوومەتی کۆماری مهاباد دا، کۆمەڵە رۆژنامە و گۆڤارێکی جۆراوجۆر چاپ دەکران، کە هەبوونی کەشوهەوایەکی ئازاد و دەزگایەکی چاپی کە رووسەکان بە دیاری دابوویانە حیزبی دیمۆکرات. هۆکاری یارمەتیدەر بوون بۆ ئەوەی بە رێژەیەکی فراوان بڵاو بکرێنەوە.

هەموو ئەو چاپکراوانە بە زمانی کوردی بڵاودەکرانەوە، بەبەراوردکردن لەگەڵ گۆڤارو رۆژنامەکانی فرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان سەرنجراکێش ترو پڕنێوەڕۆکتر بوون. هەرچەندە رۆزڤێلت ئاماژە بەو راستییەش دەکا کە بابەتی رۆژنامە کوردییەکانیش: "بە رێژەیەکی زۆر داواکانی یەکێتیی سۆڤیەتی تێدا دەگونجێنرا کە وشە بە وشە بۆ کوردی وەردەگێڕدران و شاعیرەکان (هێمنو هەژار) شیعریان بە باڵای ستالین و سوپای سوور دا هەڵدەگوت" (١٦).

دیارە ئەوەش نەریتێك بوو کە بڵاوکراوەکانی حیزبی توودەو فرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان توندتریش پێڕەویان لێ دەکرد، بێشك کاتێك دەبینین سۆڤیەت وەك زلهێزێکی سەرکەوتوو لەشەڕ هاتۆتە دەرێو لە رۆڵی پارێزەری مافی میللەتە زوڵم لێکراوەکان دا خۆی دەدیتەوە، بەو رادەیە سەرنجڕاکێش بوو کە ئیمکانی پڕۆپاگەندەی فراوان بداتە گرووپ و تاقمەکانی لایەنگری خۆی، کۆماری مهابادیش لەو نێوەدا هەڵبواردە نییە. بەڵام دەبێ بزانین کە بڵاوکراوە کوردییەکان هەرگیز ئاماژەیەکیان بە چەمك و بابەتگەلی پێوەندیدار بە کۆمۆنیزم و مارکسیزم نەکردو هەمیشە لە لاپەڕەی یەکەمی بڵاوکراوەکاندا وشەی "بسم الله الرحمن الرحیم"و هێندێك جاریش ئایەتی قورئانی وەبەرچاو دەکەوت. لەو رووەوە کە حکوومەتی مهاباد بڵاوکرانەوەو گەشەپێدانی فەرهەنگ و زمان و ناسیۆنالیزمی کوردی کردبووە بەرنامەی خۆی، بڵاوکراوەکانیش لەو بوارەدا رۆڵێکی بەرچاو و کاریگەریان دەگێڕا، خزمەتێکی زۆریان بە گەشەکردن و بووژاندنەوەی فەرهەنگو زمانی کوردی کرد. ئێمە دەزانین زۆربەی رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی مهاباد، موڵکی حیزبی دیمۆکرات بوون، بەڵام ئەوەش نەدەبووە رێگر لەبەردەم ئەدیبان و شاعیرانی کورد کە نەتوانن بەرهەمەکانی خۆیان چاپ بکەن. بەشێکی گرینگی شیعرەکانی شاعیرانی گەورەی وەك قانع، پیرەمێرد (لە کوردەکانی عێراق)و هەژار و هێمن لە کوردەکانی ئێران، لەو سەردەمەدا بڵاو بوونەوە. رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان کە لەو سەردەمەدا بڵاو دەبوونەوە بریتی بوون لە:

١ـ رۆژنامەی کوردستان کە یەکەمین ژمارەی لە سەرماوەزی ١٣٢٤ دەرچوو، تا سەرماوەزی ١٣٢٥ بەردەوام بوو. ئەو رۆژنامەیە کە دوو حەوتوو جارێك دەردەچوو، ئۆرگانی حیزبی دیمۆکرات بوو. سەرنووسەرەکەش سەید محەمەد جمیدی بوو. رۆزڤێلت دەنووسێ کە مانگانەیەکی سیاسیی بە نێوی "کوردستان" دەردەچوو. بەڵام سەرچاوەکانی دیکە باس لەو مەسەلەیە ناکەن.[١٧]

٢ـ گۆڤاری هەفتانەی "هەڵاڵە" کە تایبەت بە ژنان بوو رەنگ و روویەکی باشی هەبوو.

٣ـ گۆڤاری مانگنامەی "هاوار" کە بابەتی ئەدەبیی تێدا بڵاودەکرایەوە. وێڕای کەمبوونی کاغەزو بوودجەی کەمی حکوومەتی مهاباد، شیعرەکانی (هەژار و هێمن)ی تێدا بڵاودەبۆوە، کە ئۆگریی قازی محەمەدی نیسبەت بە زمانی کوردی پێشان دەدا.

٤ـ گۆڤاری مانگنامەی "ئاژیر" کە لە بارەی نێوەڕۆکی بابەتەکانیەوە زانیاریەکمان نییە.

٥ـ گۆڤاری گەلاوێژ.

٦ـ گۆڤارێك تایبەت بە منداڵان، بەناوی "گڕوگاڵی منداڵان".

٧ـ گۆڤاری مانگنامەی "نیشتمان" کە لە حیزبی دیمۆکرات سەربەخۆ بوو و بەو شێوەیەی کە تۆماس بوا دەنووسێ، لە (٤٠) لاپەڕە دا بڵاودەبۆوە، سەر بە شێخ "عەبدوڵەتیف"ی برای شێخ مەحموود بەرزنجی بوو، لە لاهیجانی ناوچەی سەردەشت چاپ دەکرا.[١٨] گۆڤاری نیشتمان وێنەی سەلاحەددینی ئەیوبی لە بەرگی دواوەی چاپ دەکردو بە نهێنی بۆ عێراق دەنێردرا. بێجگە لەو بڵاوکراوانە، دەزگایەکی رادیۆیی لەبەر دەستی قازی محەمەد دابوو کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کۆمار دا، دەبیستراو هەموو بەرنامەکانی بە زمانی کوردی بوو، هەم بڵاوکراوەکان و هەم رادیۆ لە لایەن وەزارەتی راگەیاندنی کۆمارەوە بەڕێوە دەبران.

# چاکسازییە کۆمەڵایەتییەکان

نامەکانی قازی محەممەد بە دوو ئاقاردا دەڕۆیشتن: پەرەسەندن و بەهێزکردنی ناسیۆنالیزمی کوردیو
بامدانی چاکسازی هەمە لایەنەی ئابووری و کۆمەڵایەتی. قازی دەیویست هەردووکیان وێکڕا،
نە پێش و بەتەواوکەری یەکتری دادەنان، بەڵام هەلومەرجێکی ئەوتۆ بۆ ئەوەی کە ئەو بەرنامانە
نە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە نەگونجابوو، بەڵام ئەو جارەیان ئەوە رژێمی ئێرانیێ نەبوو کە رێگر بوو
مردەم ئەو بەرنامانەدا، بەڵکو بارودۆخی نێوخۆی کوردستان بوو بە رێگر. ناوچە کوردنشینەکانی
ەربایجان سەنتەری کۆبوونەوەی هۆزو مولکدارە گەورەکانی کورد بوو. هەر چەشنە چاکسازییەکی
ری، کاردانەوەی توندوتیژی لە لایەن چەکدارەکانەوە لێ دەکەوتەوە، کە ئەوەندە خۆشییان لە
ڤیەت نەدەهات. بەتایبەت کە ئەو خەڵکانە تازە لە دەسەڵاتی رەزا شا رزگاریان ببوو و سەرقاڵی
سەرپێخستنەوەی ژیانی جارانیان بوون. بێجگە لە دژایەتی کردنی خاوەن موڵك و سەرۆك هۆزەکان
گەڵ چاکسازییەکاندا، خەڵکی ئاساییش ئومێدێکیان پێی نەبوو. بیژەنی جەزنی ئەو راستییە وەبیر
نێتەوە کە "لەو سەردەمەدا جووتیارانی کورد، کە لە بنەمادا جووتیار و نیمچە کۆچەریش بوون، لە
گەی بازنەکانی خوێن و هۆزەوە لێککگرێ دەدران، هیچ نارەزایەتییەکیان لە ئاست سیستەمی وەبەر
ێنانی نیمچە فیوداڵی و نیمچە شوانکارەیی دا نەبوو." (١٩)

لایەکی دیکەشەوە کوردستان لە سەنتەری پیشەسازییەکان و چینێکی کرێکاری وەك ئەوەی کە لە
زەربایجان دا هەبوو بێبەش بوو.

جگە لەوەش لایەنگرانی قازی لە چوارچێوەی چینی ناوەندی شارنشیندا کورت دەکرانەوەو لەو
وەوە کە زۆربەی دانیشتووانی کوردستان لە دێهاتەکاندا نیشتەجێن مەیدانی پێویست و گونجاو بۆ
نجامدانی گۆڕانکاری بونیادی و قووڵ لە گۆڕێدا نەبوو. ویلیام دوگلاس بەم شێوەیە باس لە
لومەرجی نەگونجاو و رێوشوێنی قازی محەممەد بۆ چارەسەرکردنی ئەو مەسەلەیە دەکا:

قازی پێویستیی بە بەرنامەیەك هەبوو بۆ کردە چاکسازییەکانی، تا پشتیوانی کۆمەڵانی خەڵك
سۆگەر بکا... زۆربەی کوردەکان رەعیەتی ئاغاکان یان خاوەن مولکەکان بوون و هەمیشەش پێیان
مرزداربوون. قازی هەستی بە بەهێزی پێگەی خاوەن مولکەکان کردبوو، ئەگەر ویستبای تەکبیرێکی
یفۆرمیستانە لەو رەوشە بکاتەوە، دەبوایە هۆشمەندی سیاسییش لەبەرچاو بگرێ. وێڕای ئەوەش ئەگەر
مرار بوو کە بەرنامە رێفۆرمیستییەکەی سەرنجی خەڵك بۆ لای خۆی راکێشێ، دەبووایە ئەو خراپ
یگەیشتنەی خەڵکی وەلا نابا، کە گوایە ئەو چاکسازییانە هی سۆڤیەتی مولحیدە... هەر ئەوەش بوو

که قازی محەممەدی هان دا تا داوا لە هاوڕێبازەکانی بکا کە لە قورئانو وتەکانی پێغەمبەردا بەدوا بنەماکانی ئەو چاکسازییە دا بگەڕێن." [٢٠] سەرەتاییترین هەنگاوەکانی قازی لە بواری یاسادانان چاپکردنی کۆمەڵێك فەرمان بوو لە رۆژنامەی کوردستاندا. لە بارەی کاروباری دارایی بەڕێوەبەرایەتییە ناسەربازییەکان، شارەوانییەکان، یاساو رێوشوێنی هێزە چەکدارەکان.

بەپێی نووسینەکەی توماس بوا، لە بواری کشتوکاڵ و پێگەی رەعیەت و ئاغاشدا، دەفتەر ناونووسیکردنی زەوییەکان یان پێناسی زەوی ئامادەو چاپکران کە شێوەو چۆنیەتیی پێوەندیی نێوا خاوەن موڵك و جووتیاری دیاری دەکرد، بەڵام باسێك لە چاکسازیی زەوی لە گۆڕێ دانەبوو. [٢١]

دوگلاس کە پێنج ساڵ دوای رووخانی کۆمار، سەفەرێکی ئێرانی کردووە، دەڵێ کە نرخی بەهرە موڵکانە ١٢٪یە، بەڵام هێندێك جار ئاغاکان تا رێژەی ٤٠٪ بەهرە لە رەعیەتەکانیان وەردەگرن. [٢٢]

لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە قازی، رێژەی بەهرەی موڵکانەی کەمتر لە ١٢٪ داناوە کە ل جێگەی خۆیدا هەنگاوێکی بەجێ بووە.

قازی محەممەد لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ هەواڵنێرێکی گۆڤاری "تێهران موسەوەر" دا، کە لە هاوین (١٣٢٥) دا ئەو کات کە لە تاران بوو، کردوویەتی، گوتوویەتی کە هەموارکردنی بەهرە خاوەنداریەتی بۆ کەمکردنەوەی ناکۆکییەکانی نێوان جووتیار و خاوەن موڵك ئەنجام داوە. [٢٣]

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئاشکرایە خاوەن موڵکەکان، بەردەوام ئەو یاسایەیان رەت دەکردەوە حکوومەتی تازە وەسەرپێکەوتووی قازییش توانای سەپاندن و ئیجباریکردنی ئەو یاسایانە و جێبەجێ کردنیانی نەبوو، ئاغا بەهێزەکانی کورد تەنانەت دادگای کۆماری مهابادیشیان بە رەسمی نەدەناسی بۆ یەکلایی کردنەوەی کاروباری نێوخۆیی هۆزەکان و رەعیەتەکان، روویان لە سەرۆکەکانیان دەکرد وەزارەتی دادی کۆمارییش ئەو توانایەی نەبوو کە یاسا بکاتە ئەلتەرناتیڤی نەریت و رێوشوێنەکانی کۆمەڵگەی هۆزایەتیی کوردی.

قاسملۆ لە بارەی گرنگیپێدانی قازی بە جووتیارە بێ زەوییەکاندا نووسیویەتی "لە هەر شوێنێك موڵکدارە گەورەکان و دەوڵەمەندەکان، بە مەبەستی هاوکاریکردنی حکوومەتی ئێران خاکی کوردستانیان بەجێ هێشتبوو. زەوییەکانیان لە نێوان جووتیارانی کورد و بنەماڵەی بارزانییەکان دابەشکرا." [٢٤] تەنانەت لە کۆتاییەکانی حکوومەتەکەی قازی دا ئەو کارانە دەکران، بۆ نموونە لە نێوەڕاستی خەزەڵوەری (١٣٢٥)دا، دیمۆکراتەکان روویان کردە دێی "داش کەشان"و دەستیان بەسەر

هەموو دانەوێڵەو، هەزارو سەد لیرەی عوسمانی، زێرو جەواهێرات و جلوبەرگ و هەزار تمەنی نەختینەی خاوەن مولکێکی بەرهەڵستکاری قازی بەنێوی حیسام لەشکر دا گرتووەو بۆ مهابادیان گواستوونەتەوە.(٢٥)

بەڵام ئەو سیاسەتەش هەر بێ ئاکام مایەوە، چونکە لە کاتی پەرەپێدانی ئەو سیاسەتەدا هۆز و خاوەن مولکە گەورەکانی دیکەش بەرامبەر بە حکوومەتی مهاباد رەشبین بوون و دوژمنایەتیی کۆماریان دەکرد. ئەوەش لە بەرژەوەندیی حکوومەتی کوردەکاندا نەبوو. لە بارەی مافی ژنانیشەوە، ئەو ئازادییە سنووردارەی کە سەبارەت بە دەنگ وەرگرتن و دابینکردنی ژینگەیەکی پەروەردەیی بۆ کچان و ژنان، تەکبیری لێ کرابوون، هەر خێرا سەرانی کۆنەپارێزی کورد لێی هەڵبەزینەوە، سەرۆکە کوردەکانی نیشتەجێی تاران، لە رۆژنامەی باختەر دا کاردانەوەی خۆیان سەبارەت بە زیادبوونی مافی ژنان خستە روو:

"حیزبی کۆمەڵە حیزبێکی کۆمۆنیستە... لە دیدی رێبەرەکانییەوە دەبێ ژن و پیاو لە هەموو کاروبارێکدا یەکسان بن." (٢٦)

لە روانگەی ئەو سەرۆکە کوردانەوە کە نوێنەری کۆمەڵگەی باوکسالاری و هۆزایەتیی کوردستان بوون، ئازادی ژنان و هاتنە مەیدانیان لە بوارەکانی سیاسیی، زانستی و کولتووری، نیشانەی زیادبوونی دەسەڵاتی کۆمۆنیزمی رووسی لە کوردستان دابوو، ئاساییش بوو کە لە کاتێکدا هێزەکانی سۆڤیەت لە خاکی ئێران دابوون، ئەو هەنگاوانە بە پیلانی رووسەکان لە قەڵەم بدرێ کە گوایە لە لایەن حیزبی دیمۆکرات و قازی محەممەد واتە هاورێ نزیکەکانی سۆڤیەت، جێبەجێ دەکرێن، بەهەر شێوەیەك ئاشکرا بوو کە کۆمەڵگەی کوردی بە سانایی مل بۆ ئەو چاکسازییە ناداو گومانیش لەوە دانییە کە لە مهاباد دا نەبێ لە شارەکانی دیکەدا کەسانێك نەبوون کە پێشوازی لەو هەنگاوە چاکسازییانەی قازی بکەن.

لەژێر سایەی حکوومەتی دیمۆکراتەکاندا، ئیدی شوێنەوارێك لە بیروکرایەتی دامودەزگا ئێرانییەکان نەمابوو، سەربازو ئەفسەرە بەرتیل خۆرو فیرعەون خەسڵەتەکانی لەشکری شاهەنشاهی نەمابوون. لە کۆکردنەوەی باج و سەرانەدا هەقی کەس نەدەخورا، کارمەندانی ئیداری هەموویان خەڵکی ناوچەکە بوون‌و لە کارکردن بە رێوشوێنە کولتووری و بەجێ گەیاندنی داب و نەریتەکانیان دا تەواو ئازاد بوون.

قاسملۆ باس لە دامەزراندنی شانۆ لە مهاباد دا دەکاو لەوانەیە مەبەستی هەمان سالۆنی ئەنجوومەنی دۆستایەتیی کوردو سۆڤیەت بێ(٢٧). هەموو ئەو کاروبارانە خەڵکی مهابادیان لە کۆمار نزیکتر کردبۆوە. رۆزڤێڵت گوتەنی مهاباد لە سایەی سیستمەکەی کۆمار دا: "لە شارۆچکەیەکی ویلایەتی،

که وەك هەموو شارۆچکەکانی دیکەی ئێران، بێڕەنگ و داماو بوو، بۆ شارێکی سەرنجراکێش و ڕەنگاوڕەنگ گۆڕابوو. شەقامەکانی پڕبوون لەو خەڵکانەی کە جلوبەرگی میللییان پۆشیبوو. خاوەنی موڵك و ماڵی خۆیان بوونو لە کارو کردەوە ناڕەواکانی سەربازو ژاندارمەکانی دەوڵەتی ناوەندی ڕزگاریان ببوو."(٢٨)

هەموو شاهید و سەرچاوەکان، ئاماژە بەو ڕاستییە دەکەن کە کۆمارەکەی قازی لە چاو حکوومەتەکەی پیشەوەری، لە نێو خەڵکدا خۆشەویست بووەو پشتیوانییەکی زیاتریشی هەبووە. دوژمنێکی سەرەکیی لە ناوچەکانی خۆیدا نەبوو، بێشك ئەو بارودۆخەش لە ئەنجامی نەرم و نیانی کەسایەتیی قازی و نەگرتنە بەری ڕێوشوێنی توندوتیژ بۆ سەرکوتکردنی نەیارانی هاتبووە ئاراوە. لەگەڵ هەموو ئەو خۆشەویستییەی کە قازی محەممەد هەیبوو، بەڵام دەبێ بگوترێ کە حکوومەتەکەی، حکوومەتێکی ئینقلابی نەبوو و نە دەیتوانیو نە دەشیویست بە شێوەیەکی قووڵ هاوکێشە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کوردستان وەرگێڕێ، لەسەریەك دەتوانین بڵێین کە لەبەر ئەوەی ئەو حکوومەتە توانای پێکهێنانی گۆڕانکاری لە هیچ بوارێکدا نەبوو، بە شێوەیەکی توندڕەوانە سەرقاڵی بەهێزکردنی نەتەوەپەروەری کوردی بوو. تاکە دەسکەوتی بەهێزکردن و گەشەپێدانی ناسیۆنالیزمێك بوو کە کۆمەڵە پێشتر دایمەزراندبوو.

# دابینکردنی هێمنی و ئاسایش لە رێگەی دامەزراندنی سوپا و بەرێوەبەرایەتیی پۆلیسەوە

دامەزرانی هێزێکی سەربازیی ڕەسمی، لە دوای راگەیاندنی کۆماری مهاباد، شتێکی چاوەڕوانکراو بوو، چونکە ئەو هێزە دوای ئەندامەتیی قازی لە (ژ.ك ")دا پێکهاتبوو و پێشتریش دیتمان کە قازی هەر لە سالّی (١٣٢٠)ەوە، لە میانەی یەکەمین دیداری لەگەلّ باقرۆفی سەرۆك کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەتدا، دەری خستبوو کە دەیهەوێ کوردەکان چەکدار بکاو لە ئاکامیشدا خەباتی چەکدارانەی وەپێش خەباتی فەرهەنگی خست. لە کاتێکدا کۆمەلّە لایەنگری لە خەباتی ئاشتیخوازانە و کولتووری دەکرد.

بەلاّم قازی بۆ دامەزراندنی سوپا هاندەری دیکەشی هەبوو. پێش هەموو شتێك دەیزانی کە حکوومەت و سوپای شاهەنشاهی ئەو سیستمە خودموختارەی کە هیچ پایەیەکی یاسایی نەبوو، بەرەسمی ناناسێ و بۆ رووبەڕووبوونەوەش لەگەلّ ئەگەری هێرشکارییەکانی لەشکری ئێران، رێکخستنێکی سەربازی پێویست بوو. هۆکاری دووهەم بەسترابۆوە بە هەرەشەی زەبرە هێز (بالقوە)و ناڕاستەوخۆی ئازەرییەکان، کە لە ئەنجامی ئەو مەسەلەیەدا قازی و حیزبی دیمۆکرات بەبێ پشتیوانییەکی سەربازی ئامادە نەبوون هاوکاری لەگەلّ ئازەربایجان و سۆڤیەتدا بکەن. هەروەها قازی لە دادگادا باس لەو هۆکارەی سەرەوە دەکا بۆ دامەزراندنی لەشکرو ئێستاش کەسانێك هەن کە هەر ئەو هۆکارەیان پێ راستە، بۆ نموونە یەحیا سادق وەزیری کە لە نزیکەوە شارەزای رووداوەکانی کوردستانە، ئەو بەلّگەیەی سەرەوەی پێ راستە.[٢٩]

هۆکاری سێهەمیش بۆ ترسی دەولّەتە ساوایەکەی کورد، لە هۆزە چەکدارەکان دەگەڕایەوە کە لایەنگریی دەولّەتی ئێرانیان دەکرد. قازی دەترسا لەوەی کە سێزدە هەزار چەکداری عەشیرەیی بە فیتنەیەکی حکوومەتی ئێران، کۆماری مهاباد لە نێو بەرن و دەشبینین کە هەر وای لـێ هاتو دوای گەڕانەوەی هێزەکانی سۆڤیەت و لاوازبوونی حکوومەتی مهاباد، زۆری نەمابوو هۆزەکانی مەنگوڕ و مامەش لەگەلّ حکوومەتی مهاباد دا پێك دادەن. ئەگەر هێزێکی چەکدار لە مهاباد دا نەبووایەن ئەوا ئەستێرەی تەمەنی کۆمار زووتریش ئاوا دەبوو.[٣٠]

هەروەها ناتوانین چاوپۆشی لە کاریگەری و هاندانی کوردەکانی عێراق و تورکیە بۆ دامەزراندنی ئەو سوپایە بکەین و خودی ناردنی ئەفسەرانی پایەبەرزی کوردی ئەندامی هیوا

(که له لایەن ئینگلیزەکانەوە پەروەردە کرابوون و لە شەڕی ئینگلیزو ئەڵمانەکاندا بەشدارییان کردبوو)، نیشانەی پشتگیریکردنی کوردە دراوسێیەکانە لەم هەنگاوانە. لە ژمارەو جۆری ئەو چەکانەشدا کە سۆڤیەت دابووی بە کۆماری مهاباد، دەردەکەوێ کە یەکێتیی سۆڤیەت نەیدەویست کۆماری مهاباد لە کۆماری ئازەربایجان بەهێزتر بێ و دەیویست وەك پاشکۆیەکی ئازەرییەکانی بهێڵێتەوە. یەکێك لە خاڵە هاوبەشەکانی نێوان کۆماری ئازەربایجان و کۆماری کوردستان هەبوونی خەڵکانی کۆچکردووی ناخۆماڵی بوو لە پێکهاتەی سەربازی حکوومەتەکانیاندا، کە ڕێبەریی ستادی هەر دوو لەشکرەکەیان لەبەر دەست دابوو. ئەو کۆچکردووانەی کە لە دامودەزگای سەربازی و ئیداریی پیشەوەریدا هەبوون، لە ساڵی (١٣١٥)و لە دووتوێی پرۆژەیەکی نهێنیدا بەرەبەرە لە لایەن یەکێتیی سۆڤیەتەوە بۆ ئێران نێردران، بە پێی قسەی ئاغازادە شاهین و عەلی شەبستەری، بەشێکی دیکەیان هاوکات لەگەڵ هێرشی سوپای سوور لە ساڵی (١٣٢٠) دا هاتنە ناو ئێرانەوە "ئەو کۆچکردوو قەفقازییانە دەستیان بەسەر پۆستە گرینگەکاندا گرت و سۆڤیەت ئەوانەی خستە نێو بەڕێوەبەرایەتییە دەوڵەتییەکان و لەشکری خەڵك و کاروباری بازرگانییەوەو بەم شێوە چینێکی پارێزەریان بۆ ڕێژیمی داگیرکاری سۆڤیەت خوڵقاند." (٣١)

بەڵام لە کوردستاندا هاوکات لەگەڵ ڕاگەیاندنی کۆماری مهاباد، ژمارەیەك کەسایەتیی چالاکی سیاسیی هۆزە کوردەکانی عێراق، ڕوویان کردە حکوومەتەکەی قازی، جاری واهەبوو چەند تایفەی عەشیرەیەك دەهاتنە خاکی ئێرانەوەو جاری واش هەبوو کەسانێك لەسەر خواستی خۆیانو بە شێوەی تاکە کەسی و بێ ئەوەی پێوەندییان لەگەڵ حیزبە کوردییەکاندا هەبێ، سنووریان دەبەزاند، لە بەشەکانی پێشوودا دیتمان کە حیزبی دیمۆکرات بە زەمانەتی خەڵکی مهاباد چەکیان بە کوردە عێراقییەکان سپاردو ئەوەش هاندەرێك بوو بۆ ئەوەی زیاتر بێنە نێو ریزەکانی لەشکری کۆمارییەوە. کۆنسوولی ئێران لە سلێمانی لەو ڕاپۆرتەیدا کە لە ڕێکەوتی (٢٠ی خەزەڵوەری ١٣٢٥) بۆ باڵوێزخانەی ئێران لە بەغدای دەنێرێ، دەنووسێ کە لەوانەیە "تایفەکانی ئەحمەد ئاغایی، عەلی ئاغایی، باپیر ئاغایی، نوورەددینی و قەرەنی ئاغای حاجی ڕەسووڵ، لەو ماوەیەدا کە لە سەردەشتدا لە نێوان کۆمەڵە و هێزەکانی دەوڵەتیدا شەڕو پێکدادان هەیە، خۆیانو چەکدارەکانیان هەڵایەك ساز کەن."(٣٢)

(عەبدوڵڵا پشدەری) وێڕای ئاماژەکردن بەو مەسەلەیەی کە حیزبی هیوا ئەو کەسە داواکارانەی کە ئەندامی حیزبەکەش نەبوون، ڕەوانەی ئێرانی دەکردن، دەشنووسێ کە بابەکر ئاغای پشدەری

رسی بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزم و بەفیتی ئینگلیزەکان هەوڵیدا ڕێگە لە کوردەکانی عێراق
ن کە ڕوو بکەنە کۆماری مهاباد. کۆنسولی ئێرانیش پاش باسکردنی هەوڵەکانی دەوڵەتی
اق و تەقەلاکانی بابەکر ئاغا بۆ پاشگەزکردنەوەی هۆزەکانی پشدەری لە هێرش کردنە سەر
کری ئێران لە سەردەشت، باس دەکا کە چۆن ئاغاکانی پشدەر لەو بیرۆکەیە پاشگەز
ەتەوە.(٣٣)

م هاوکاری نەکردنی کۆماری مهاباد لە لایەن کوردەکانی تورکیە دەگەڕێتەوە بۆوەی کە
لە سەرەتاوە تورکیە یەکە سەربازییەکانی بە درێژایی سنووری خۆی لەگەڵ ئێراندا جێگیر
و لەشکری ئێرانیش دانیشتووانی سەر سنووری زیاتر بردنە نێو قووڵایی خاکی تورکیەوەو
ژینێکی ساز کرد کە ئیمکانی پێوەندی گرتنی کوردەکانی ئێران و تورکیەی لە بار برد.(٣٤)

گترین هۆزی کوردی عێراقی کە هاوکاریی کۆماری مهابادی کرد بارزانییەکان بوون،
وو سەرچاوەکان دڵنیامان دەکەنەوە کە پێکهاتەی سەرەکی کۆماری مهاباد، بارزانییەکان
یان دەهێنا، کە نزیکەی (١٠٠٠) تاکوو (١٥٠٠) شەڕکەری ئامادەی شەڕیان هەبوو.
خی سەربازیی بارزانییەکان لە هۆزەکانی دیکەی ئێران و عێراق زیاتر بوو، چونکە ئەزموون
ێشینەی سەربازییان بۆ سەردەمی عوسمانییەکان دەگەڕایەوەو چەند جار عەرەب و تورك و
گلیزەکانیان بەچۆك داهێنابوو، بارزانییەکان لە بەرەکانی شەڕی سەردەشت و بانە و سەقز،
کانە دژی لەشکری ئێرانی شەڕیان کردو لە سەقزدا چەند یەکەیەکی لەشکری ئێرانیان
ست داو بە حوکمی دڵسۆزییان بۆ کۆماری مهابادو ئەو دیسیپلین و ئەزموونە سەربازییە
ەی کە هەیانبوو، بەرپرسی پاراستنی ئاسایشی سنوورەکانی کۆمار لە سەقز و بۆکان و بانە
سەردەشت بوون. وادێتە بەرچاو کە قازی ترسی لە ئەگەری ڕێکەوتن و تەبایی هۆزە کوردە
نییەکان لەگەڵ لەشکر دا هەبووەو پێی باش بوو کە سەرلەشکرەکانی لەشکری شاهەنشاهی
ەڵ هۆزێکی عێراقیدا ڕووبەڕووبن کە بنەماڵە و خەڵکانی بێ دیفاعیان لە نزیك مهاباد
گیربوون. بەڵام ئەو ئەفسەرە کوردانەی کە پەیکەری لەشکری کوردستانیان پێك دەهێنا،
سان ئەندامە هەڵاتووەکانی حیزبی هیوا بوون کە دوای شکانی بارزانییەکان لە سەردەستی
ە ئاسمانییەکانی ئینگلیز لە ساڵی (١٣٢٤)دا ڕوویان کردبووە مهابادو بریتی بوون لە:
رهەنگ عزەت عەبدولعەزیز، سەرهەنگ مستەفا خۆشناو، سەرگورد خەیروڵڵا
بدولکەریم، کاپیتان مەحموود محەممەد قودسی، کاپیتان میرحاج ئەحمەدو چەند کەسێکی
کە. لەو نێوەدا مستەفا خۆشناو و محەممەد قودسی بوونە ئەندامی ستادی لەشکری مهابادو

ئەوانی دیکەش لە شوێنەکانی دیکە سەرقاڵی خزمەتکردن بوون. ئەو ئەفسەرانە لە داد
سەربازییەکانی بەغدا دا، بە مەرگ مەحکووم کرابوون و زۆربەیان دوای رووخانی کۆم
گەڕانەوە عێراق و لە ساڵی (١٩٤٨) دا لە لایەن رژێمەکەی نووری سەعیدەوە لە سێدارە درا
بەبەراوردکردنی رێکخستنی سەربازی پێشەوەری و کوردەکان، تێبینی دەکەین کە ئەفسە
کوردەکانی لەشکری شاهەنشاهی بەپێچەوانەی ئەفسەرانی ئازەری هیچ ئۆگرییەکیان
پێوەندی گرتن بە کۆماری مهاباد لە خۆیان نیشان نەدەداو تەنیا چەند دەرەجەدارێکی کورد
زۆربەیان مهابادی بوون وەك گرووهبان نانەوازادە، کە پێشتر لە کۆمەڵەی (ژ.ك) دا ئەندام بو
لەشکری شای بەجێ هێشت و هاتە نێو ریزەکانی لەشکری مهابادەوە. نانەوازادە پاش
دەرەجەی "سەرهەنگ"ی وەرگرت و لە ستادی لەشکری مهاباد دەستبەکار بوو. بەڵام بەهۆ
رووداوی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەوە گیانی لەدەستدا. گرنگترین ئاکامەکانی هەبوونی ئەفسە
کوردە عێراقییەکان لە مهاباد، پێکهێنانی هێزێکی نیمچە سەربازیی چەکدار بوو لە لاوان
مهابادی، کە باشترین چەکی رووسیان پێ بوو. لەشکری مهاباد (١٢٠٠) سەربازو (٤٠٠
دەرەجەدارو (٧٠) ئەفسەری هەبوو، کۆچێرا دەنووسێ سەربازەکان لە مهابادو ناوچەکان
دەوروبەری، بۆ خزمەت بانگهێشتن کرابوون.[٣٥]

رووسەکان بۆ چاوەدێریکردنی چالاکییەکانی ئەم لەشکرە، ئەفسەرێکیان بەناوی سەلاحەددی
کازمۆف وەك راوێژکار لە مهاباد دا هەبوو، کە بەپێی بڕیاری قازی دەرەجەی سەرهەنگییان پ
دابوو و بە کاك ئاغا ناسرابوو، بەڵام "پسیان" پێیوایە کە کاك ئاغا ئەرکی رێکخستن
لەشکری کوردانی پێ سپێردرابوو.[٣٦]

هەڵبەت هۆزە کوردەکانیش بەشێکی هێزەکانی لەشکری کۆماریان پێك دەهێناو لە چەن
شەڕێکدا چالاکانە بەشدارییان کرد، بەڵام دەرکەوت کە حەز بە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەوڵەت
ئێراندا ناکەن، هەر بۆیەش قازی زۆری متمانە پێ نەبوون و بەرپرسایەتییە سەربازی
گرینگەکانی سپاردبووە بارزانی و هێزە نیمچە سەربازییەکەی مهاباد. عەبدوڵڵا پشدەری ئەو
روون دەکاتەوە کە چۆن دوای کشانەوەی هێزەکانی لەشکری سوور لە خاکی ئێراندا، هۆز
کوردییەکان قازی محەممەدیان ناچارکرد کە لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا، گفتوگۆ بکاو بەم شێوەی
بە تەواوی بێ مەیلیان بەرامبەر بە بەردەوامیی شەڕ نیشان دا.[٣٧]

ویلیام ئیگلتۆن ژمارەی ئەو هێزە عەشایرەی کە دەیانویست هێرش بکەنە سەر ناوچەکانی خواروو، بە بارزانییەکانیشەوە بە (١٢٧٥٠) کەس دادەنێ و ئەرفەعیش باس لە( ١٢٠٠٠) کەس دەکا. (٣٨)

لەشکری کوردان لە چەکە قورسەکانی وەك تانك و فڕۆکە بێبەش بوو، سۆڤیەتەکانیش هیچ کات ئەو بەڵێنەی خۆیان بەجێ نەگەیاند کە بۆ ناردنی ئەو چەکانە دابوویان. بێجگە لەو هێزە، حکوومەتی قازی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسیشی هەبوو کە پێرسۆنێلەکانی جلوبەرگی کوردییان لەبەر دەکردو چەند هۆبەیەکیشی لە شارەکانی مهاباد، نەغەدە، شنۆو بۆکان بەڕێوە دەبرد.

هێزە سەربازییە کوردییەکان بەپێچەوانەی ئەفسەرانی سوپای شاهەنشاهی، دەستدرێژیيان نەدەکردە سەر گیان و ماڵ و نامووسی خەڵك و بەپێچەوانەی ئەو بارودۆخەی لەژێر فەرمانڕەوایی فرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجاندا حاکم بوو، لە کوردستاندا ئاسایش و ئارامی بەرقەرار بوو و لە درێژایی حوکمی یازدە مانگەی کۆماردا تەنها کەسێك کوژرا، لە زیندانەکاندا، زیندانی سیاسیی بەرچاو نەدەکەوت. قازی محەممەد لە سەردانەکەیدا بۆ تاران گفتوگۆیەکی لە لایەن رۆژنامەنووسێکی رۆژنامەی "رەهبەر" لەگەڵ ئەنجام درا، لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دا کە تاکو ئێستا چیتان بۆ خەڵکی کورد کردووە، رایگەیاند کە:

"گەورەترین کاری کە بزووتنەوەکەمان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا ئەنجامیدا، پێکهێنانی رۆحێکی هاوکاری و یەکگرتوویی لە نێو سەدان هەزار ئێرانی دابوو... لەگەڵ کەمی کات و کەلوپەلێکی زۆر کەمدا، لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردەی سیاسیی و سەربازی ژمارەیەکی زۆری هاونیشتمانە کوردەکانتان، پەرەی سەندووە." (٣٩)

هەروەها دەستەبەرکردنی ئاسایش و هێمنیش بە یەکێك لە دەسکەوتەکانی بزووتنەوەکەی خۆی داناو پێیوایە دەبێ لەو بوارەدا هەقی پێبدەن. هەڵسوکەوتی کۆماری مهاباد لە هەموو روویەکەوە نیشانیدا کە کەڵك وەرگرتن لە دانیشتووانی ناوچەکە بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان، تا چەندە متمانەی خەڵك لە ئاستی رژێمی دەسەڵاتدارا دەباتە سەرێ.

# خودموختاری ڕەهای کوردەکان پێش دەرچوونی لەشکری سوور

دوای ئەوەی کابینەی قازی ناسێنراو وەزیرەکان دەستیان بە کارەکانیان کرد، دروشمی پان کوردیزم‌و ڕێکەوتن رووەو پێکهێنانی کوردستانی گەورە، بوو بە ئامانجی کۆتایی قازی و حیزبی دیمۆکرات و هەموو بڕست و توانای کۆماری مهاباد خرایە خزمەت ئەو دروشمانەوە. هەر زوو مهاباد بوو بە مەکۆی ناسیۆنالیستە کوردەکانی تورکیە. عێراق و سووریە و شاعیران و ئەدیبە گەورەکانی کورد لە هەموو رۆژهەڵاتی نێوەڕاستەوە روویان لەم شارە کردو لە لایەکی دیکەشەوە سۆڤیەت هاوکارییە ئابووری‌و سەربازییەکانی خۆی دەستپێکرد، واتە مهاباد بەرەبەرە بوو بە سەنتەری کوردە شۆڕشگێڕەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و قیبلەگای هیوای نەتەوەپەروەرانی کورد.

لەو سەردەمەدا حکوومەتی مهاباد بە پشتیوانیی لەشکری سوورو بەهێزبوونی حکوومەتەکەی پیشەوەری و بەلەبەرچاوگرتنی لاوازیی حکوومەتی ئێران لە هەموو بوارەکاندا و ئەو کابینانەی کە زوو زوو، دەگۆڕدران، نەك هیچ هەوڵێکی بۆ دامەزراندنی بنەمایەکی یاسایی بەپەسندکردنی حکوومەتی ناوەندی نەخستە گەڕ، بەڵکو کۆمەڵە کارێکی دەکرد کە بۆ پێکهێنانی کوردستانی گەورەو جیاکردنەوەی ناوچە کوردنشینەکانی ئێران پێویست بوون. هەر لەو سۆنگەیەوە قازی بڕیاری دا کە پەرە بە راگەیاندن و پڕوپاگەندە کردن بۆ شیکردنەوەی پێگەی کۆماری مهاباد‌و زەروورەتی سەربەخۆیی کوردستان، لەنێو هۆزە کوردییەکانی باشوور لە پارێزگای کوردستان و کرماشاندا بدرێ‌و بۆ ئەو مەبەستەش ئاڵای کوردستان بۆ سەرۆك هۆزەکانی ئەو ناوچانە نێردراو خودی قازی لە ڕێگەی تەلەگراف و ناردنی نامەوە داوای لــێ کردن کە ئاڵاکان هەڵکەن. بەڵام تەنیا مەحموودخانی دزڵی بە پیل ئەو بانگەوازەوە هات و ئەوانی دیکە لە چاوەڕوانی رەوتی رووداوەکان مانەوەو لە هەرچەشنە هەنگاوێك خۆیان پاراست. قازی ماوەیەك چاوەڕوان مایەوەو بەڵام کە دیتی بانگەوازەکەی بەو شێوەیە پێشوازی لــێ نەکراوە، هەوڵیدا کە کەسایەتییە دیارو کاریگەرەکانی ئەو ناوچەیە بخاتە ریزەکانی "ژ.ك"ەوەو چاوی لە هاوکاری کوردەکانی ئەو ناوچەیە پۆشی.

لە راپۆرتی فەرماندەی ژاندارمەری کرماشان بۆ پارێزگاری ئەو پارێزگایە بە ڕێکەوتی (٢٨ی رەشەمەی ١٣٢٤) دا سەبارەت بەو هەنگاوانە نووسراوە کە:

"بەپێی ئەو زانیارییانەی گەیشتوون، هۆزەکانی کوردستان ئاگادارییەکیان بۆ هۆزەکانی کرماشان ناردووە کە بە فەرمانی قازی محەممەد کۆمەڵەی (ژ.ك) مان پەسند کردووەو ئەگەر ئێوەش ئامانجەکانی حیزب پەسند نەکەن دەچنە خانەی دوژمنانی گەلەوە، هەڵبەت بەپێی ئەو زانیارییانە

هەورامییەکانو جوانڕۆییەکانو وەلەدبەگیەکان و گۆرانەکان لەگەڵ (سەید شەمسەدین) (پیری دەلیلی خۆیان) راوێژیان کردووە، کە چ بکەن. ئەگەر ئەو رازی بێ، رازیبوونی هۆزەکانیش حەتمییە... ئەگەر هۆزەکانی کرماشان بچنە پاڵ ئەو حیزبەوە، ئەوا ئاسایش و ئارامیی ناوچەی رۆژئاوا دەشلەژێ و بێسەرەوبەرەیی‌و ئاژاوە شتێکی چاوەڕوان کراو دەبێ." [1]

ئەوە کە حیزبی دیمۆکرات لە پارێزگاکانی کوردستان و کرماشان گەشەی دەکرد، دەوڵەتی تووشی نیگەرانی کردبوو، بەڵام سوپا توانی پێش بە هۆزەکانی باشوور بگرێ کە پاڵ وەحیزبی دیمۆکرات بدەنو لە راپۆرتی فەرماندەی ژاندەرمەری پارێزگای کرماشان دا بە رێکەوتی ٥ی بانەمەڕی (١٣٢٥) دا هاتووە "... تاقمبازی هۆزەکان لە لایەن "هەنگ"*ەوە تێك درا، دیارە چاوپێکەوتنەکانی عەباس قوبادیان، دیدو تێڕوانینی ئەوانی گۆڕی، ئێستا باسی کۆمەڵە ناکرێو ئەو پۆلینەش لەسەر بنەمای نەتەوەییەو لەگەڵ جیاخوازیدا نییە." [2]

قازی محەمەد و کۆمەڵەی ژ.ك تەنانەت پێش راگەیاندنی کۆمار، هەوڵیان دەدا کارگێڕی ناوچەکە بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان، بۆ نموونە قازی لە رەزبەری (١٣٢٤)دا (عەبدوڵڵا نەهری) کە نازناوە حیزبییەکەی "دایکی نیشتمان" بوو، وەك بەرپرسی دارایی سەردەشت هەڵبژارد. وەزارەتی شەڕی ئێران کە لەو کارانە تۆقی بوو، داوای لە سەرۆك وەزیر کرد سەردەشت بخاتە سەر پارێزگای کوردستانو پێوەندییە کارگێڕییەکانی ئەو شارە لەگەڵ مهاباد دا بپچڕێنێ. [3] لە سەرەتاکانی پووشپەری (١٣٢٥) دا قازی لە چاوپێکەوتنێکدا کە هەواڵنێرێکی ئاژانسی هەواڵدەریی فەڕانسە لەگەڵیدا ئەنجامی دابوو رای گەیاند کە:

"ئەگەر فەرمان بدەم سێ تا چوار رۆژ بەسە کە بە (٤٠) هەزار چەکداری کە هەمە ـ هەڵبەت بێجگە لە خەڵکانی یەدەك ـ بچمە نێو کرماشانەوە، واتە گرنگترین شاری کوردنشین و مەڵبەندی دامەزراوە نەفتییەکان، بەڵام من بۆ پێشگرتن لە خوێنڕێژیی نێو برایان لە هیچ هەوڵێك دانامێنم، کوردەکان هیچ کات بۆ ئەوکارە دەست پێشخەر نابن." [4]

بەڵام رێبەری کوردەکان دوای چەند رۆژ فەرمانی هێرشکردنە سەر پارێزگای کوردستانی دەرکردو فەرمانی دا هۆزەکان بە سوارەکانیانەوە ئامادەی شەڕ بن. بەپێی نووسینەکەی "پسیان" لە پووشپەڕی ١٣٢٥دا، هێرشی شەڕکەرە کوردەکان بۆ سەر ناوچەکانی باشوور پتر بوو و هاوکاتیش بازنەی تەبلیغاتیان تا هەورامان و دەوروبەری سنە بە تایبەت لە نێو هۆزەکاندا فراوان کرد. [5]

لە راستیدا ئەوە گوشارو هەڕەشەی راستەوخۆی سۆڤیەت بوو کە کوردەکانی لە هێرشکردنە سەر باشوور پاشگەز کردەوە، پێشتر کوردەکان لە خاکەلێوەی (١٣٢٥)ی هەتاویدا هەنگێکی لەشکری

ئێرانیان لە قەهرئاوای نزیك سەقز پەرت و بڵاو کردبوو. دەوڵەتیش بۆ دەست گرتن بەسەر بارودۆخەکەدا رەزم ئارای وەك سەرکردەی هێزەکانی بەرەی سەقز هەڵبژاردبوو، لە پێنجی پووشپەڕدا، وتووێژێك لە نێوان رەزم ئاراو کوردەکاندا کرا، کە رێکەوتننامەیەکی پێنج بەندیی لـێ کەوتەوە. بەپێی ئەو بەندانە نابێ کوردەکان هێرش بکەنە سەر ستوونە نێردراوەکانی لەشکرو هەروەها لە رێگەی سەقز ـ سەردەشت، سێ کیلۆمەتر رووەو باکوور و لە شاری سەقزیش چوار کیلۆمەتر رووەو باکوور پاشەکشە بکەنو پێگەکانی خۆیان بەهێز نەکەن و فڕۆکە سەربازییەکانیش تەنیا لەسەر رێگەی نێوان سەردەشت ـ سەقزدا بسووڕێنەوەو بۆ باکوور نەچن. لەو گفتۆگۆیانەدا نوێنەرانی ئازەربایجان بە ناوەکانی ئیبراهیم عەلی زادە، خەلیل ئازەر ئابادگان و حسەن جەودەت بەشدار بوون و سەرۆکایەتی شاندە کوردییەکەش جێگری سەرهەنگ عیزەت عەبدولعەزیز، یاوەر ئیبراهیم و یاوەر جەعفەری کەریمی بوون. [٦] ئەو رێکەوتنە لەژێر گوشاری سۆڤیەتدا ئیمزا کرا، هەر بەدوای ئەوەشدا بەشێك لە دیلەکانی لەشکر بە فەرمانی قازی ئازاد کرانو بەو جۆرەی کە عەبدوڵڵا پشدەری دەنووسێ کەسانێك کە: "..... کۆمەڵێك هۆشیاریی سیاسییان هەبوو، دەیانزانی ئازادکردنی دیلەکان بە ویست و خواستی رووسەکان، بەڕێوە چوو، ئەو سیاسەتی تووندو شلکردنە تەنیا بۆ ئەوان مانای هەیە کە .. ئەو سیاسەتە تاڵ و شیرینەیان تەنیا بۆ وەدەستهێنانی نەوتی باکوور پەیڕەو دەکرد."[٧]

ئەو هەنگاوانەی سۆڤیەت دوای رێکەوتننامەکەی نێوان قەوام ـ سادچیکۆف و بەدەستهێنانی جیاوکی نەوتی باکوور هەڵگیران و پشدەری دەڵێ کە ئیمزاکردنی ئەو رێکەوتننامەیەی (کە پێشتر باسمان کرد) بە فەرمانی رووسەکان جێبەجێکرا، دەنا دیمۆکراتەکان لەگەڵ ئاشتیدا نەبوون.[٨] لەشکری سوور لە خاکەلێوەی ساڵی (١٣٢٥)دا لە ئێران چووە دەرێو بۆ یەکەمین جار کوردەکان هەستیان کرد یارییەکی نوێ لە نێوان مۆسکۆ و تاراندا دەستی پێکردووە، کە لەوێدا هیچ شوێنێکیان بۆ کورد لەبەرچاو نەگرتووە. ئەو گومانەیان کاتێك زیاتر بوو کە لە ٨ی خاکەلێوەدا پیشەوەری بە رێنمایی کردنی رووسەکان رووەو تاران وەرێکەوت، تا لەگەڵ (قەوام ئەلسولتەنە) دا، وتووێژ بکەن. بەو شێوەیە روون بۆوە کە درەنگ یان زوو دەبێ قازی محەممەد بچێتە تاران، تا لە جێگەی سیستەمی "خودموختارییەکی رەها" کە مەودایەکی ئەوتۆی لەگەڵ سەربەخۆییدا نەبوو، مل بۆ سیستەمێکی خودموختاری سنووردار لەگەڵ کۆمەڵێك ئیختیاراتی دیاریکراوەوە بدا. بەو شێوەیە بۆ یەکەم جار لە تەمەنی کۆماردا دروشمەکانی پان کوردی و رێکەوتن رووەو کوردستانی گەورە وەلانران و دروشمی خودموختاری بۆ کوردستان و دیمۆکراسی بۆ ئێران هاتە گۆڕێ.

# پێوەندیی نێوان ئازەربایجانی خودموختار و کۆماری مهاباد

بۆ شارەزابوون لە هۆکارەکانی هاوکاریو پێوەندیی نێوان حکوومەتەکەی پیشەوەری و کۆماری مهاباد، دەبێ ئاماژە بەو هەلومەرجە هاوبەشە بکەین کە پێش راگەیاندنی مەوجوودیەتیان پێك هاتبوو. هەر دوو لایەنی کورد و ئازەری دەیانزانی کە خەباتکردنیان دژی دەوڵەتی ناوەندیی ئێران دەبێ هەماهەنگییەکی تێدا بێ، بۆ نموونە لە میانەی سەفەری دووهەمی شاندی کوردەکان بۆ باکۆ، باقرۆف دوای شیکردنەوەی ئەو بارودۆخەی دێتە پێشێ، راستەوخۆ باسی لە پێویستی هاوکاری کوردەکان و پیشەوەری کردبوو. لە سۆنگەی ئەو داواکارییەوە رووسەکان دوای پێکهاتنی حکوومەتی خودموختاری ئازەربایجان لە لایەن قازی محەممەدەوە شاندێکیان بۆ پیرۆزبایی گوتن ناردبووە لای پیشەوەری کە سەیفی قازی سەرۆکایەتیی دەکردو چەند ئەندامێکی دیکەی کۆمەڵەی لەگەڵ دابوو. نەجەف قولی پەسیان پێیوایە کە "... هەر لەو رێکەوتەوە کۆمەڵەی (ژ.ك)و فرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان ئیئتلافیان کردو یەکیان گرت." (٩)

وێدەچێ کە هەنگاوی بە پەلەی قازی سەبارەت بە ناردنی شاندێك بۆ تەورێز لە کاتی پێکهێنانی حکوومەتە خودموختارەکەی پیشەوەری، زیاتر هەوڵێك بووبێ بۆ ئەوەی هەڵوێستی ئازەرییەکان و دیدو تێڕوانینی فرقەی دیمۆکرات، سەبارەت بە بەرژەوەندی و چارەنووسی کوردەکان هەڵسەنگێنێ. لە هەنگاوی دواتردا قازی محەممەد پێنج کەسی بۆ ئەنجوومەنی خۆجێی ئازەربایجان رەوانە کرد، کە رۆڵی نوێنەرانی کەمینەی کوردەکانی ئازەربایجانیان دەگێڕا. دیرك کینان دەنووسێ کە "هەر زوو نوێنەرانی کورد لـێیان روون بۆوە کە رژێمی ئازەربایجان دەیهەوێ کوردەکان لە هەر جۆرە دەسەڵات و توانایەك کە هەیانە، بێبەش بکەن و ئەوانیش کە ئەوەیان دیت، بۆ مهاباد گەڕانەوە." (١٠)

ناڕەزایی نوێنەرانی کورد لەگەڵ دیدو تێڕوانینی پیشەوەری بۆ کێشەی کورد، کە کوردەکان کەمینەیەکی نەتەوەییان لە چوارچێوەی ئازەربایجاندا پێك دەهێنا، بووە هۆی دروستبوونی گیروگرفت لە نێوان تەورێز و مهاباد دا، کە لە ئاکامدا کوردەکان حکوومەتی خۆیان دامەزراند. یەکەمین هەوڵی سیاسیی کۆماری مهاباد مۆرکردنی رێکەوتننامەیەك بوو لەگەڵ رژێمەکەی پیشەوەری کە بێشك بە پێداگرتن و چاوەدێریکردنی رووسەکان مۆر کرا. مەیلی کوردەکان بۆ مۆرکردنی رێکەوتننامەیەك لەگەڵ پیشەوەری دا بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە

دەیانویست سەربەخۆیی بوونی خۆیان بە شێوەیەکی پراکتیکی بە ئازەرییەکان و رووسەکان بسەلمێنن، وێڕای ئەوانەش پێویستیی یەکێتی و هاوکاریکردنی نێوان ئەو دوو حکوومەتە و هەڵوێست گرتنێکی هاوبەش لە ئاست دەوڵەتی ناوەندیدا شتێك نەبوو کە لەبەرچاوی سەرانی مهابادو تەورێزو تەنانەت کاربەدەستانی سۆڤیەتیش ون بێ. بە تایبەتی کە چوونە دەرەوەی لەشکری سوور گڕو تینێکی زیاتری وەبەر ئەو پێوەندییانە دەنا. بەڵام هۆیەکی دیکەش بۆ یەکگرتنی تەورێزو مهاباد لە گۆڕێ دابوو، ئەویش دەست بەسەر داگرتنی دێهات و رێگاکانی ناوچە ئازەرینشینەکانی سەڵماس و خۆیو ورمێ و ماکۆ بوو. لە راستیشدا سەرهەڵدانی ناکۆکی لە نێوان دوو حکوومەتەکەی پیشەوەریو قازی محەممەد بۆ روون نەبوونی هێڵە سنوورییەکانی نێوانیان دەگەڕایەوە. فرقەی دیمۆکرات بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە گوایە زۆرینەی دانیشتووانی شارەکانی خۆی و سەڵماس و ورمێو میاندواو لە ئازەرییەکان پێك دێن و کوردەکان ژمارەیان لە یەهوودییەکان و مەسیحییەکانی ئەو شارانەش کەمترە، بۆیە دەبێ ئیدارەکردنی ئەو ناوچانە بدرێتە تەورێز، بەڵام کوردەکان پێیان وابوو کە هەموو ناوچەکانی رۆژئاوای گۆلی ورمێ بەشێکن لە کوردستان. لێرە دابوو کە رووداوێکی سەرنجراکێش روویدا. رووداوێك کە دەریخست خەڵکی ئازەربایجان لە بنەماوە هەستی پان تورکیستییان نییەو بۆ هەڵاتن لە دەست گوشارەکانی رژێمی کۆمۆنیستی پیشەوەری، وێڕای ئازەریبوونیشیان ئامادەن لە چوارچێوەی سنوورەکانی کۆماری مهاباد دا بژین، کە لەو سەردەمەدا روخسارێکی دیمۆکرات تری لە رژێمی دیمۆکراتەکانی تەورێز لەخۆی نیشان دابوو. لە راستیدا خەڵکی ورمێ رژێمی مهابادیان هاندا کە چارەنووسی شارەکە و ناوچەکانی دەوروبەری بە دەستەوە بگرێ، بەو شێوەیە زیادبوونی دەستدرێژی هۆزەکانی شکاك، هەرکی و مامەش بۆ دێهاتەکانی ئازەرنشین، هەر بەو هۆکارەوە گرێ دراوە. کۆچێرا بەو جۆرە بابەتەکە شی دەکاتەوە:

"بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەڕوان دەکرا، ئەعیان و گەورەکانی ئازەری مەیلێکیان بۆ چوونە نێو "کۆماری" ئازەربایجان نەبوو، ئەو کەسانە کە لە هەنگاوە بەناو پێشکەوتووخوازەکانی رێبەرانی تەورێز تۆقیبوون، پێیان باشتر بوو وابەستەی مهاباد بن، کە پارێزگاریی (محافظهکاری) رێبەرانی کۆماری مهاباد ئارامی و ئۆقرەیەکی دەدانێ، ئەو داوایەشیان لەگەڵ قازی محەممەد دا هێنایە گۆڕێ کاتێك بۆ سەردانی پیشەوەری چووبوو." (١١)

دوکتۆر ئیقبال وەزیری تەندروستیی کابینەکەی قەوام لە چاوپێکەوتنێکی بەفرانباری ساڵی (١٣٢٥) دا لەگەڵ هەواڵنێران پێ لەسەر ئەو مەسەلەیە دادەگرێتەوەو دەڵێ "دیمۆکراتەکان

(فرقەی دیمۆکرات) لە ورمیّ دا نفووزێکی ئەوتۆیان بەدەست نەهێنا، چونکە خەڵکەکە بە پشتیوانیی کوردەکانی دانیشتووی شارو ناوچەکانی دەوروبەری نەدەچوونە ژێرباری پروپاگەندەی دیمۆکراتەکان، دیمۆکراتەکانیش لە ترسی کوردەکانی نێو شارو دەوروبەری نەیاندەوێرا فشار بێننە سەر خەڵك، بەڵام لە دەست بەسەرداگرتن و تاڵانکردنی سەرو ماڵی خەڵکی خۆیان نەدەبوارد."[12]

لە ئاکامدا "هاشۆف" کۆنسولی سۆڤیەت لە ورمیّ ویستی وەك نێوبژیوانێك هەڵوێستی دوو لایەنی کورد و ئازەری لێك نزیك بکاتەوە، کە بەرهەمی ئەو هەوڵ و ماندوو بوونەش، پەیماننامەیەك بوو لە لایەن ڕێبەرانی هەردوو حکوومەتەکەوە مۆر کرا، ئیگلتۆن بەم شێوەیە خاڵە سەرەکییەکانی ئەو پەیماننامەیەی نووسیوە:

١ـ ئاڵوگۆڕی نوێنەری دیپلۆماسی لە کاتی پێویستدا.
٢ـ کاربەدەستانی دەوڵەتی لە هەر ناوچەیەکدا سەر بەو نەتەوەیە دەبن، کە زۆرینەی دانیشتووانی ناوچەکە پێك دێنیّ.
٣ـ پێکهێنانی لێژنەیەکی ئابووری هاوبەش لەژێر چاوەدێریی سەرانی هەر دوو حکوومەتەکە دا.
٤ـ یەکێتیی سەربازی و هاوکاریکردنی یەکتر لە کاتی پێویستدا.
٥ـ هەرچەشنە وتووێژ کردنێك لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا، دەبیّ بە ئاگاداری و ڕەزامەندیی هەردوو لا بیّ.
٦ـ هەردوو حکوومەت بۆ پێشخستنی زمان و کولتووری ئەوی دیکەیان، هەوڵ دەدەن.
٧ـ بە توندی خەبات لە دژی ئەو کەسانە دەکەن، کە دەیانەویّ یەکێتی و دۆستایەتیی هەر دوو نەتەوەی کورد و ئازەری تێك بدەن.[13]

مۆرکردنی ئەو پەیماننامەیە ناوەندنشینەکانی تووشی ترس و نیگەرانی کرد. ئاخر پیشەوەری و قازی محەممەد بیّ گویّ دانە تاران، وەك ڕێبەری دوو وڵاتی سەربەخۆ بڕیاریان دابوو، لە لایەکی دیکەشەوە هێشتا هێزەکانی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا مابوونەوە، بەستنی پەیمانی لەو چەشنە ئەگەری جیابوونەوەی ئازەربایجان و بەڕەسمی ناسینی ئەو دوو حکوومەتەی زێتر دەکرد.

ڕۆڵی سۆڤیەتەکان لە چارەسەرکردنی گیروگرفتی نێوان تورك و کورددا، بێجگە لەو هۆکارانەی کە باس کران، پاڵنەری دیکەشی هەبوو، سۆڤیەت بیری لە دروستکردنی بەرەیەکی هاوبەشی

نێوان دانیشتووانی ئازەربایجان دەکردەوە دوای ئەوەی کە هێزەکانی سۆڤیەت ئێران بەجێ دێڵن، تێبینیی ئەو خاڵەیان کردبوو کە کوردەکان لە جێگەی هاوکاریکردن لەگەڵ ئازەربایجاندا، لەوانەیە لەگەڵ کوردەکانی عێراق و تورکیە وەجموجووڵ کەون و لەو سیناریۆیەی کە سۆڤیەت ڕێوشوێنی بۆ دانابوو، دەست بکێشنەوە، کەواتە قازی محەممەد و حکوومەتەکەی دەبوو کە لەگەڵ سەرچاوەیەك کە بە نوێنگەی سیاسەتی یەکێتیی سۆڤیەت لە ئێران دادەنرا، پێوەندییەکی توندوتۆڵ دابمەزرێنێ، ئامانجی کۆتایی سۆڤیەت ئەوە بوو کە کۆماری کوردستان بە سیاسەتەکانی خۆی وابەستە بێڵێتەوە. بەستنی پەیمانێکی لەو جۆرەش نیشانەی دەروەست بوونی مهاباد لە جێبەجێ کردنی ئەو ویستە دابوو.

بەڵام با بزانین کاردانەوەی گرێدانی ئەو پەیماننامەیە لە تاراندا چ بوو؟ ڕێکخستن و مۆرکردنی پەیماننامەیەکی لەو چەشنە لە دیدی حکوومەتی ئێرانەوە، هەوڵی ئاشکرای سۆڤیەت بوو بۆ جیاکردنەوەی ئازەربایجان‌و بەپێی لێکدانەوەی ڕۆزفێڵت "خاڵەکانی ئەو پەیماننامەیە لە نێوەڕۆکی خۆیاندا نیشاندەری ئەو ڕاستییە بوون کە دوو ڕژێمە دیمۆکراتەکە خۆیان بە دوو وڵاتی سەربەخۆ دادەنێن کە مافیان هەیە نوێنەر ئاڵوگۆڕ بکەن و پەیماننامەش ببەستن."[١٤]

لە بارەی پەیماننامەکەشەوە دەبێ بگوترێ کە ئاشکرا بەپێی بەرژەوەندیی ئازەرییەکان ڕێکخرابوو، چونکە خاوەنداریەتیی زەوییەکان هەر لە دەستی حکوومەتەکەی پیشەوەری دا مایەوە، بەڵام لە ئاکامدا ئازەرییەکان نیشانیان دا کە بە نێوەڕۆکی پەیماننامەکە وەفادار نین‌و ئەگەر نەبێ لە دوو بواردا دژی پەیماننامەکە جووڵانەوە: سەرەتا لەو تێکهەڵچوون و پێکدادانەی نێوان کوردەکان لەگەڵ حکوومەتی ناوەندیدا، هیچ هاوکارییەکی کاریگەریان پێشکەش نەکردن، دووەم جاریش لە کاتی وتووێژکردن لەگەڵ ئێراندا لە بێ ئاگاداریی کوردەکان بەڕێوە چوو. ئەوە لە کاتێك دابوو کە لەشکری کوردەکان بە گشتی و بارزانییەکان و بەگزادەکانی فەیزوڵڵابەگی لە گەمارۆدانی پادگانی میاندواو لە لایەن فرقەی دیمۆکراتەوە، بەشدارییەکی چالاکانەیان هەبوو و هاوکاریی کاریگەریان پێشکەش بە فیداییەکانی دیمۆکرات کرد. نەجەف قولی پەسیان دەنووسێ هاوکاری و یارمەتیی کوردەکان بوو، وای کرد هێزەکانی پادگانی میاندواو نەتوانن ڕووەو شاهیندیژ پاشەکشە بکەن و ناچاربوون لە سەعات (١٠ی بەیانیی ٢٥ی سەرماوەزی ١٣٢٤) دا چەکەکانی خۆیان تەسلیمی دیمۆکراتەکان بکەن، هەروەها دەنووسێ لە میانەی گەمارۆدانەکەدا کە لە ڕۆژی (١٢ی سەرماوەزی ١٣٢٤) تا ٢٥ی هەمان مانگی خایاند، پارێزگاریکردنی پردی جەغەتوو لە ئەستۆی هێزە چەکدارەکانی کۆمەڵە بوو.[١٥]

هاوکاریی پڕبایەخی فەیزوڵڵابەگییەکانی نێو کۆمەڵە بۆ فیدایییەکانی دیمۆکرات، پادگانەکانی تکاب و ماینبلاغی لە ناوچەی ئەفشاردا خستە مەترسییەوەو نیشانیدا کوردەکان چ پێش مۆر کردنی پەیماننامەکەو چ دواتر لەو چوارچێوە دیاریکراوە دا کە سۆڤیەت دەستنیشانی کردبوو لەگەڵ پیشەوەری دا هاوکارییەکی ڕاست و پاکیان هەبوو. ئیگلتۆن باس لە ناڕەزایی و تۆرانی کوردەکان لە یەکێتیی سۆڤیەت سەبارەت بەو ڕۆڵەی کە لە بەرژەوەندیی ئازەرییەکان لە کاتی گرێدانی پەیماننامەکەدا گێڕای، دەکا و دەنووسێ کە قازی محەممەد هەوڵی هێورکردنەوەی ناڕازییەکانی دەدا.(١٦)

دوای دەرچوونی هێزەکانی سۆڤیەت لە خاکی ئێران، کۆماری مهاباد زیاتر لە پێشووش پاڵی وەرژێمەکەی پیشەوەری دا وێڕای مۆرکردنی پەیماننامەی دۆستایەتی لە نێوان تاران و تەورێزدا، کوردەکان هەروا پشتیان وەفرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان دابوو، دوای گفتوگۆکانی نێوان قازی محەممەد و حکوومەتی ناوەندی و ئەو ڕۆڵەی کە توودەییەکان لەو نێوەدا گێڕایان، پێوەندی حیزبی توودە لەگەڵ حیزبی دیمۆکرات گەرم بوو، ئەو پێوەندییەش بە چوونی کوردەکان بۆ نێو حیزبەکانی باڵی چەپ لە ئیئتلافی بەرەی پێشکەوتووی ئێران قایمتر بوو، ئاکامی ئەو ئیئتلافە ئەوە بوو کە کوردەکان و فرقەی دیمۆکرات و حیزبی توودە، هەڵوێستی خۆیان لێك نزیك کردەوە، تەنانەت دوای هەڵوەشاندنەوەی ئیئتلافی ناوبراویش لەسەر هاوکارییەکانی خۆیان بەردەوام بوون.

حوسێن مەکی لە ڕاپۆرتی ڕۆژی ١٣٢٥/٩/٥ بۆ (قەوام ئەلسولتەنە)دا دەنووسێ کە ئەندامانی شاخەی لوڕستانی حیزبی توودە لە مەلایر وێڕای هەماهەنگی کردن لەگەڵ کۆنسولگەری سۆڤیەت لە کرماشان و برازای قازی محەممەدو (غولام یەحیا) لە فرقەی دیمۆکرات گەڵاڵەیەکی هاوبەشیان بۆ پەرەپێدانی بزووتنەوەکەی ئازەربایجان لە نێو هۆزەکانی لوڕستان و تورك زمانەکانی هەمەدان داڕشتووە، بڕیار بوو کە هەزاران چەك و تەقەمەنی و بڕێك جلوبەرگ و هێزێکی پێویست لە قزڵباشە ئازەرییەکان بە هاوکاری ئەفسەرانی قەفقازی و دەست و پێوەندەکانی حیزبی دیمۆکرات لە شاری سنە بخرێنە خزمەت جێبەجێکردنی ئەو گەڵاڵەیە.(١٧)

بەهەر حاڵ هاوکاریی نێوان کوردەکان و ئازەرییەکان تا کۆتایی هەر بەردەوام بوو، دوای دەرچوونی هێزەکانی سۆڤیەت، حیزبی توودە ڕۆڵی پێوەندیی لە نێوان ئەو دوو حیزبە (حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و فرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان) دا وەئەستۆ گرت.

# بەندی هەشتەم

## چوونە دەری هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران‌و پێداچوونەوەی کوردەکان بە سیاسەتەکانیاندا

# قەوام ئەلسەلتەنە و چارەسەری ناکۆکییەکانی نێوان ئێران و سۆڤیەت

سەبارەت بە پچڕانی پێوەندیی سۆڤیەت لەگەڵ دوو حکوومەتە خودموختارەکەی تەورێزو مهاباد و نەمانی پارێزگاری کردنیان و مۆرکردنی ڕێکەوتننامەیەکی هاوکاری لەگەڵ حکوومەتەکەی (قەوام ئەلسەلتەنە) دا لەسەر بنەمای بەدەستهێنانی جیاوکی نەوتی باکوور، بیروڕای جۆراوجۆر هەیە، هاندەری سەرەکی و راستەقینەی ئەو هەنگاوەش بە شێوەی جۆراوجۆر لێك دراوەتەوە.

بەشێك لە لێکۆڵەران پێیانوایە سۆڤیەت دەیویست رێگە لە جێ پێ خۆشکردنی ئەمریکییەکان لە باکووری ئێراندا بگرێ و هاتنی شاندێکی سۆڤیەت بە سەرۆکایەتیی (سرگئی کافتارا دزە) لە ٢٤(ی خەرمانانی ١٣٢٣) دا بۆ ئێران، بە مەبەستی بەدەست هێنانی جیاوکی نەوتی باکوور، لە راستیدا کاردانەوەیەك بوو بەرامبەر مەیلی ئەمریکییەکان بۆ بەدەستهێنانی جیاوکێکی لەم شێوەیە، کە لە سەرەتاکانی هاوینی هەمان ساڵدا دەریان بڕیبوو. بەشێکی دیکەیان دەڵێن کە سۆڤیەت دوای شەڕ پێویستیی بە وزەیەکی سووتەمەنیی زێتر هەبووە، بۆ نۆژەنکردنەوەی کارگەکانی و بەپێی بۆچوونی بەشێکی دیکەشیان دەڵێن گوایە سۆڤیەت دەیویست لە رێگەی سوود وەرگرتن لە سەرچاوە نەوتییەکانی ئێران و باکۆ، لە بازاڕی جیهانیی نەوتدا بەربەرەکانیی ئینگلستان و ئەمریکا بکا.

جۆرج کینان Georg. F. kenan کارگێڕی سیاسیی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە مۆسکۆ، لە راپۆرتێکدا کە لە (٧ی نۆڤەمبەری ١٩٤٤)دا بۆ وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەی ناردوە، هاندەری سەرەکیی سۆڤیەت لە داواکردنی جیاوکی نەوتی باکووردا، بەرژەوەندیی ئابووری نازانێ و وەك هەنگاوێك بۆ بە دەستهێنانی ئاسایشی ناوچەکانی دەوروبەری خۆی (سۆڤیەت) لێکی دەداتەوەو دەنووسێ:

"کرملین بۆ پاراستنی ئاسایشی سۆڤیەت، ئەو مەسەلەیە کە نابێ هیچ زلهێزێکی دەرەکی شانسی بەدەست هێنانی جێ پێیەکی لە باکووری ئێراندا هەبێ، زۆر بە گرینگ دادەنێ، لەوانەشە کە بێجگە لە کۆنترۆڵ کردنی هەرچی زیاتری کاروباری سیاسیی و ئابووریی ئێران لە لایەن خودی سۆڤیەتەوە، رێگەی دیکە بۆ دڵنیابوون لەو مەسەلەیە شك نەبا."[1]

هەروەها نورەدین کیانووری، سەبارەت بەو پاڵنەرە کە سۆڤیەتەکانی هاندا داوای جیاوکی نەوتی باکوور بکەن، بەم شێوەیە دەنووسێ:

ساعد پەیماننامەی نەوتی باکووری کە پێشتر قەوام ئەلسەلتەنە لەگەڵ کۆمپانیا ئەمریکییەکان بەستبووی (بەڵام هەڵوەشێنرابۆوە)، نوێکردەوە، هەر بە رانەگەیەندراویش مایەوە، واتە ساعد جیاوکی تەواوی ناوچەکانی باکووری وڵاتی دا بە کۆمپانیا ئەمریکییەکان، کاتێك سۆڤیەت لەو پەیماننامەیە وەئاگا هاتەوە، "کافتارا دزە"ی وەك سەرۆکی شاندێك رەوانەی ئێران کردو داوازیاری بەدەستهێنانی نەوتی باکوور بوو، پاشان رووسەکان پێیان راگەیاندین کە ئەوان چاوەڕێ نەبوون جیاوکی نەوتی باکووریان پێ بدرێو لە بیری بەستنی پەیماننامەیەکدا نەبوون، بەڵام لە سیانەی شەڕدا هەستمان کرد کە لە داهاتوودا دوژمنی سەرەکیی ئێمە ئەمریکا دەبێ، جێگیر بوونی ئەمریکییەکانیش لە سنوورەکانی باکووری ئێران و تەنانەت دەریای خەزەریش خەتەرێکی گەورە دەبێ بۆ ئێمە، بۆ ئەوەی پێش بەو مەترسییە بگرین، ئەو پێشنیارەمان کرد.[٢]

ئەگەر یەکەمین هەنگاوی سۆڤیەت بۆ بەدەستهێنانی جیاوکی نەوتی باکوور و لە ژێر پاڵەپەستۆی ئەمان هۆکاردا کە لە "نێوەڕاستی"شەڕ دا هاتبووە پێش، هەڵێنرابایەوە، ئەو کات بانگەشەکەی کیانووری پەسند دەکرا، بەڵام راستییەکە ئەوەیە کە سۆڤیەت هەر لە سەرەتای هاتنی بۆ ناو خاکی ئێرانو رێك لە ( ٨ی خەرمانانی ١٣٢٠)واتە لە سەرەتاکانی شەڕدا، لە بیرخەرەوەیەکدا کە بۆ حکوومەتی ئێرانی نارد، داوای هاوکاریی ئێرانی کرد لەسەر بنەمای پەیماننامەی نێوان ئێرانو سۆڤیەت بۆ پەرەپێدانی کاری نەوت لە کەویری خوریان و بە هاوپەیمانەکانیشی نیشاندا کە نەك هەر ئامانجی ئابووری و سیاسیی دوورودرێژو ستراتیژی لە ئێراندا هەیە، بەڵکو دەیەوێ بەشی "شێر"یش لە ناوچە داگیرکراوەکانی باکووری ئێراندا بۆ خۆی مسۆگەر بکا.[٣]

بەڵام دەوڵەتی ئێران ناچار بوو "... ئەو مەسەلەیە وەبیر بهێنێتەوە کە لە رێکەوتنامەی نێوان ئێرانو سۆڤیەت باسێك لە جیاوکی نەوتی کەویری خوریان نەهاتۆتە گۆڕێ و ئەگەر مەبەست ئەو رێکەوتننانەی دیکەیە کە لە نێوان ئێران و سۆڤیەتدا بەستراون و لەگەڵ کەویری خوریان دەگونجێ، هەروەك چۆن زارەکی باسکراوە، هەر بڕیارێك لەو بوارە دا درابێ، لەبەر ئەوەی کە چەندین ساڵە بەجێهێڵراوەو کاری پێ نەکراوە، لەوانەیە لەگەڵ داواکارییە راستەقینەکاندا نەگونجێن. لەگەڵ ئەوەش دا کاربەدەستانی حکوومەتی ئێران ئامادەن لەگەڵ کاربەدەستانی یەکێتیی سۆڤیەت سەبارەت بە نەوتی کەویری خوریان و بەستنی پەیمانێك گفتوگۆ بکەن و بەرژەوەندیی هەردوو لا لە هەموو روویەکەوە دەستەبەر بکەن.[٤]

هەنگاوی رووسەکان بۆ دەستگرتن بەسەر سەرچاوەکانی ئێران لە سەرەتاکانی کارەوە نیشانی دەدا کە ئەوان پێش هەڵایسانی ئاگری شەڕ پیلانی قووڵیان بۆ بەدەستێهنانی بەرژەوەندییە سیاسیی‌و ئابوورییەکانیان داڕشتووە، ئێستا ئەگەر ئەو هەنگاوانە لەگەڵ تەکبیرەکانی پێش شەڕو جووڵاندنی هەستی نەتەوەیی کورد و ئازەرییەکان لە سەرەتاکانی شەڕو دوای شەڕ هەڵسەنگێنین، بۆمان روون دەبێتەوە کە گەلاڵەی جیاکردنەوەی ئازەربایجان و کوردستان و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی جیاوکی سەرچاوە نەوتییەکانی باکووری ئێران، دوو ئامانج بوون کە سۆڤیەت بۆ وەدیهێنانیان بە توندی هەوڵی دەدا، ئەوەی لە بانەمەڕی ١٣٢٥و لە رێکەوتننامەکەی نێوان قەوام ـ سادچیکۆف دا روویدا، لە راستیدا وەلانانی یەکێك لەو ئامانجانە بە خاتری پاراستنی ئامانجەکانی دیکە بوو.

ئەوەش راستە کە ئەمریکا سوودی لە دەستڕۆیشتوویی دەسەڵاتی خۆی لە ئێراندا وەرگرت‌و رێکەوتننامەی نەوتی لە نێوان کۆمپانیای ستاندارد ڤاکیۆم (Standard Vaccuum)[٥] و کابینەکەی ساعد دا بەست و گەیاندیشیە قۆناغەکانی کۆتایی، بەڵام هێشتا بۆ بە کردەوەیی کردنی، رێگەی درێژیان لەپێش بوو، بێجگە لەوە بەدەستهێنانی رەزامەندیی ئەنجوومەنیش پێویست بوو. لەوانەیە سەرانی ئێرانی پێیان وابووبێ کە بە قایم کردنی پێگە و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا، پێش لە فراوانخوازییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت دەگرن، بۆیە رووسەکان بێ درەنگ کردن لەو رێکەوتننامەیە هەڵبەزینەوەو یەکێك لە نوێنەرانی توودە رایگەیاند کە لە هەلومەرجی ئێستای جیهانیدا، ئیمتیازدان بە دەوڵەتە دەرەکییەکان لە بەرژەوەندیماندا نییە و پێویستە سەبر بگرین تا ئەو قەیرانە جیهانییە کۆتایی پێ دێ.[٦]

حیزبی توودە کە لە مانگی گەلاوێژدا لەگەڵ پێدانی جیاوکی نەوت بە کۆمپانیا ئەمریکی‌و ئینگلیزییەکان دژایەتیی کردبوو، دوای هاتنی شاندێکی رووس بە سەرکردایەتیی کافتارا دزە لە خەرمانانی (١٣٢٣) دا، راستەوخۆ داوای کرد جیاوکی نەوتی باکوور بدرێتە یەکێتیی سۆڤیەت. هاتنە گۆڕی کێشەی نەوت و هاتنی شاندە ئەمریکی و ئینگلیزییەکان لە سەرەتای هاوین و هاتنی شاندی رووسەکان لە کۆتاییەکانی ئەو وەرزەدا، جەنجاڵییەکی سەیری لە نێو خەڵك و رۆشنبیران بە گشتی و نوێنەرانی ئەنجوومەن بەتایبەتیدا دروستکرد. ئاکامی ئەو مەسەلەیە خۆی لە گەلاڵەی دوکتۆر موسەدەق دا دەدیتەوە کە پێشکەش بە ئەنجوومەن کردو لەسەر بنەمای ئەو گەلاڵەیە، گەلاڵەی بەناوبانگی رێگرتن لە پێدانی جیاوکی نەوت بە دەوڵەتێکی دەرەکی لە کاتی شەڕو لە سەردەمی ئامادەبوونی هێزە دەرەکییەکان لە ناو ئێراندا، لە لایەن ئەنجوومەنەوە پەسند کرا.

ڕێگرتن لە پێدانی جیاوکی نەوت بە دەوڵەتێکی دەرەکی لە کاتی شەڕو لە سەردەمی ئامادە بوونی هێزە دەرەکییەکان لە ناو ئێراندا، لە لایەن ئەنجوومەنەوە پەسند کرا. شاندی سۆڤیەت لە (٢٤ خەرمانانی ١٣٢٣) دا هاتە تاران و دوای ئەنجام دانی زنجیرە وتووێژێك لەگەڵ ساعد، لە ٢٥ی خەرماناندا بۆ ماوەی دوو هەفتە سەردانی باکووری ئێرانیان کردو لەو ماوەیەدا سەرۆك وەزیرانی ئێران داوایەکی سۆڤیەتی ڕەتکردەوە. ساعد لە وتاری ڕۆژی (٢٧)ی ڕەزبەردا بۆ نوێنەرانی ئەنجومەن، ڕایگەیاند: "لە میانەی وتووێژکردن لەگەڵ کۆمپانیای ئینگلیزی - ئەمریکی، بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی باڵای وڵات لە ئێستا و ئایندەدا، لە دانیشتنی (١١)ی خەرمانانی ئەنجومەنی وەزیراندا بڕیاردرا کە تا دوای ڕوون بوونەوەی بارودۆخی ئابووری و دراوی جیهان و جێگیربوونی ئاشتیی سەرتاسەری، باسکردن لە پێدانی هیچ جۆرە جیاوکێك بە هێزێکی دەرەکی، پێویست نییە. دوو حەوتوو دوای ئەو بڕیارە، ئاغای کافتارا دزە، جێگری کۆمیساری دەرەوەی دەوڵەتی سۆڤیەت، بۆ ئێران هاتووەو سەبارەت بە پێدانی جیاوکی نەوت لە بەشێك لە خاکی ئێراندا لەگەڵ من وتووێژی کردووە، سەبارەت بە وتووێژەکانی نێوانمان بە ڕوونکردنەوەی پێویستەوە لە دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی وەزیراندا قسەکراوەو، لەسەر بڕیارەکەی ١١ی خەرمانان لە هەر بارێك دا جەخت کراوەتەوە."(٧)

پەسند نەکردنی داوایەکەی سۆڤیەت، بووە هۆی خۆپێشاندانی توودەییەکان لە (٥ی خەزەڵوەری ١٣٢٣)و خوازیاری قبووڵ کردنی پێشنیارەکەی سۆڤیەت بوون و ئیحسان تەبەری وتارە بەناوبانگەکەی خۆی لە ژێر سەردێری "هاوسەنگی ئیجابی" دا نووسی کە لە ڕۆژنامەی "مەردوم" دا بڵاو بۆوە.(٨) لە ژێر گوشاری ڕووسەکاندا ساعد لە (١٨ی خەزەڵوەر، دەستی لە کار کێشایەوەو (سوهام ئەلسولتان بەیات) لە ٤ی سەرماوەزدا کابینەی خۆی پێك هێنا. لەو کاتەدا دوکتۆر موسەدەق ڕێبەری فراکسیۆنی کەمینەی ئەنجوومەنی چواردەهەم پێش ڕوونکردنەوەی زەروورەتی گرتنەبەری سیاسەتی (هاوسەنگی سلبی) لە ئاست (هاوسەنگی ئیجابی) دا، گەڵاڵەی ناسراوی پێ نەدانی جیاوکی نەوت بە بێگانەکانی لە کاتی داگیرکردندا خستە ڕوو، کە بەندەکانی بریتی بوون لە:

بەندی یەکەم: سەرۆك وەزیرو وەزیرو کەسانێك کە وەکالەتیان دەکەن یان هاوکارییان دەکەن، ناتوانن سەبارەت بە جیاوکی نەوت لەگەڵ هیچ یەك لە نوێنەری ڕەسمی و ناڕەسمیی وڵاتانی دراوسێو خەڵکانی دیکەش وتووێژێك بکەن کە کاریگەریی یاسایی هەیە، یان ڕێکەوتننامە مۆر بکەن.

بەندی دووهەم: سەرۆك وەزیرو وەزیرەکان دەتوانن سەبارەت بە فرۆشتنی نەوتو بەو شێوەیەی کە دەوڵەتی ئێران کانە نەوتەکانی خۆی دەردەهێنێ، یان بەڕێوەیان دەبا، وتووێژ بکەنو لە کاتی وتووێژکردندا ئەنجوومەنی شورای میللی ئاگادار بکەنەوە.

بەندی سێهەم: سەرپێچکەرانی ئەو بەندانەی سەرەوە، بە زیندانی کردن لە سێ ساڵ بۆ هەشت ساڵ و بێبەری کردنی هەمیشەیی لە خزمەتگوزارییە دەوڵەتییەکان، سزا دەدرێن.(٩)

ئەو گەلاڵەیە لە ١١ی سەرماوەزدا وێڕای دژایەتی کردنی توندی نوێنەرانی توودەیی، بە زۆرینەی دەنگ بڕیاری لەسەر دراو کافتارا دزە کە کارێکی لە ئێراندا نەمابوو، لە (١٨ی سەرماوەزی ١٣٢٣) بێ ئەوەی هیچی دەست کەوێ، ئێرانی بەجێ هێشت. لە ١٥ی ڕێبەندانی ١٣٢٤دا قەوام ئەلسەلتەنە بوو بە سەرۆك وەزیر، بە پێچەوانەی هاوشانەکانی پێشووی، وەجموجووڵ کەوت تا پێوەندییە ئاڵۆزەکانی ئێران و سۆڤیەت بێنێتەوە سەر ڕەواڵی خۆی و دوو کێشەی نەوت و جیاوکەکەی لەگەڵ کێشەی دەرچوونی لەشکری سوورو مەسەلەی ئازەربایجان چارەسەر بکا. هەر دوابەدوای بە دەستەوە گرتنی پۆستی سەرۆك وەزیراندا پەیامێکی بۆ ستالین ناردو کلۆپی توودەییەکانی لە ٢٠ی خەرمانانی ١٣٢٤ ئازاد کرد کە لە لایەن پۆلیسەوە دەستی بەسەر داگیرابوو. پاشان لە ٢٩ی ڕێبەندان دا سەردانێکی سۆڤیەتی کرد، هەرچەندە لەگەڵ ستالین دا نەگەیشتە هیچ ڕێکەوتنێك، بەڵام مەیدانی بۆ ڕێکەوتنێك لە داهاتوودا خۆشکرد. بە شێوەیەك کە دوای گەڕانەوەی بۆ تاران، لە ١٥ی فەروەردینی ١٣٢٥دا، لەگەڵ سادچیکۆف کە وەك نوێنەری باڵادەستی سۆڤیەت لە ئێراندا ڕێگەی پێ درابوو، ڕێکەوتننامەی (قەوام ـ ساوچیکۆف)ی مۆرکرد. قەوام ئەلسەلتەنە پێش ئەوەی ڕێکەوتننامەیەکی لەو چەشنە مۆر بکا، کۆمەڵێك هەنگاوی هەڵێنابۆوە، تا سۆڤیەت بۆ چارەسەر کردنی کێشەی ئازەربایجان ڕازی بکا. کورتکراوەی کردەوەکانی قەوام لەو سۆنگەیەوە بریتی بوون لە:

١ـ پێشان دانی ئیرادەی بەهێزی دەوڵەتی ئێران بە مەبەستی چارەسەرکردنی گیروگرفتی ئازەربایجان، پێش سەرۆك وەزیرایەتیی قەوام، ئێران سیاسەتی دوورکەوتنەوە لە سۆڤیەتی دەگرتەبەرو تەنیا چاوی لە ڕۆژئاوا بڕیبوو.

٢ـ وەلانانی هەموو نەیارانی ناسراوی سۆڤیەت و گرتنی مۆرە ئینگلیزەکانی وەك (سەید زیائەدینی تەباتەبایی، تیمسار حەسەن ئەرفەع، عەلی دەشتی، سالار سەعید سنەیی، جەماڵ ئیمامی)و کەسانی دیکەش.

٣ـ پێکهێنانی کەشوهەوایەکی ئارام و دابینکردنی ئاسایش بۆ حیزبی توودە و گرووپەکانی لایەنگری سیاسەتی سۆڤیەت، هەر لەو پێوەندییەشدا سێ وەزارەت سپێردرایە توودەییەکان، کەسایەتیی موزەفەر فەیرووز لە روخسارە دیارەکانی کۆمۆنیست وەك جێگری سەرۆك وەزیر هەڵبژێردرا.

٤ـ نزیك بوونەوە لە یەکێتیی سۆڤیەت، بەبێ گوێ دانە بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا و سەربەخۆ کارکردن لەو مەسەلەیە دا،

٥ـ بێشك قەوام توانی لە رووسەکان بگەیەنێ، کە بە ئازەربایجانێکی خودموختار، لە چوارچێوەیەکی دیایکراودا رازییە، بەمەرجێك سۆڤیەت لەشکری سوور لە خاکی ئێران بەرێتە دەرێ.

٦ـ قەوام توانی کە نیهادی سەرۆك وەزیری بکاتە سەنتەری سەرەکی دەسەڵاتی سیاسیی لە ئێراندا، وێڕای وەلانانی شاو لەشکرەکەی کە خوازیاری توندوتیژی بوون، کۆتایی بە ناکۆکی نێوان سەرۆك وەزیر لەگەڵ دەربارو شا دا هێنا.

بەهێزبوونی حیزبی توودە ئەو چاکەیەشی هەبووە کە پشکداربوونی چەپەکان لە دەسەڵاتدا، دیمۆکراتەکانی تەورێز و مهابادی سەبارەت بە حکوومەتی مەرکەزی، هێورتر دەکردەوەو گرینگییەکیشی دەدایە مەسەلەی هێنانە گۆڕێی ویستە ئابووری و کۆمەلایەتییەکانو لەوێشەوە، دروشمە نەتەوەییەکانی کەمڕەنگتر دەکردەوە. گاوین همبل و دوکتۆر باقر عاقلی روونی دەکەنەوە کە قەوام لە رازیکردنی رووسەکاندا سەرکەوتوو بوو، بەوەی کێشەی ئازەربایجان بە گرفتێکی نێوخۆیی ئێران دابنێن و لە بەرامبەریشدا نەوتی باکووریان بداتێ، [10]

حەوتوویەك پێش سەرۆك وەزیرایەتیی قەوام ئەلسەلتەنە، ئێران لە ئەنجوومەنی ئاسایش شکایەتیی لە سۆڤیەت کردبوو، لەو رێگەیەشەوە پشتیوانیی ئەمریکای مسۆگەر کردبوو، بەڵام دەبێ بزانین کە ئۆلتیماتۆمی نهێنیانەی ترۆفی بۆ ستالین و هەڕەشە لێ کردنی بە بەکارهێنانی چەکی ناوەکی، تاکە هۆکار نەبوو بۆ چوونە دەری هێزەکانی لەشکری سوور لە ئێران، هەروەها فەردوست دەڵێ کە ئەمریکییەکان پێشنیاریان بە شا کرد کە:

"... ئێران نوێنەرێك ڕەوانەی نەتەوە یەکگرتووەکان بکاو مەسەلەی پابەند نەبوونی رووسەکان بە جێبەجێکردنی بەڵێنەکانیان سەبارەت بە بەجێهێشتنی خاکی ئێران بهێنێتە گۆڕێ. محەممەد رەزا شا پێشوازی لەو پێشنیارە کردو (حوسێن عەلائی)ی بۆ رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان رەوانە کرد، بەو جۆرەی کە رۆژنامەکان نیشانیان دەدا، وتەکانی عەلائی سەرکەوتنی وەدەست هێناوە.

بەڵام لە راستیدا، رۆڵە سەرەکییەکە بۆ ئەمریکا دەگەڕایەوە، کە بەنهێنی بە ڕێکخراوە، گوێ لە مستەکانی خۆی دەگوت لەگەڵ هەڵوێستی ئێران دابن."(١١)

بەڵام حاشا لەو مەسەلەیە ناکرێ کە هەنگاوەکانی قەوام لە چەند بارەوە کاریگەر بوون. بۆ نموونە ئەو لە جیاتی دانی جیاوکی نەوتی باکوور، رەزامەندیی لەسەر هاوکاریی ئێران و سۆڤیەت لە چوارچێوەی کۆمپانیایەکی تێکەڵ، کە پشکی ٥١٪ی بۆ سۆڤیەتو ٤٩٪ی بۆ ئێران بێ کرد. لە لایەکی دیکەشەوە رووسەکانی رازیکرد کە یارمەتییەکانی خۆی لە فرقەی دیمۆکرات ببڕێ. ئەگەر رووسەکان تەنیا لەبەر مەترسیی چەکی ناوەکی ئەمریکا مەیدانەکەیان چۆل کردبا، بە لایەنی کەمەوە دەیانتوانی کوردەکان و ئازەرییەکان چەکدار بکەن. ئەوەی بایەخی کارەکەی قەوام زیاتر دەکا ئەوەیە کە ئەو بە پێ داگرتن لەسەر گەڵاڵە پێشنیارکراوەکەی دوکتۆر موسەدەق لە ساڵی (١٣٢٣)دا، جێبەجێکردنی رێکەوتننامە نەوتییەکەی لەگەڵ سۆڤیەتدا بە چوونە دەرەوەی لەشکری سوورو ئەنجوومەنی پازدەهەم، بەستەوە. مەسەلەیەك کە پێش چوونە دەری هێزەکانی لەشکری سوور بەو شێوەیە پێویست نەبوو. بەڵام رۆڵی بریتانیا لەو نێوەدا زۆر تێکدەرانە بوو، لەو رووەوە کە زلهێزەکەی جاران نەمابوو، تەنیا بایەخی بە پاراستنی سەرچاوە نەوتییەکانی خۆی دەدا لە باشووری ئێراندا. لەبەر ئەوەش کە توانای پاراستنی تەواوەتیی خاکی ئێرانی نەبوو، خۆی بۆ ئەگەری جیاکردنەوەی خووزستان ئامادەکردبوو. وەك ستیوارت دەنووسێ:

کاردل هاردل وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە کانوونی دووهەمی ١٩٤٣ دا بە رۆزڤێلتی راگەیاند لە کاتێکدا خۆی بۆ چوونە کۆنفرانسی تاران ئامادە دەکرد:

"ئەگەر رێگە بدرێ، رووداوەکان بێ ئەوەی هیچ لەمپەرێك پێشیان لێ بگرێ، رەوتی ئاسایی خۆیان بپێون، وا دێتە پێشچاو کە سۆڤیەت یان بریتانیا، یان هەردووکیان بەیەکەوە، کۆمەڵە هەنگاوێك هەڵێننەوە کە سەربەخۆیی ئێران بە توندی بخاتە ژێر مەترسییەوە، یان لەناوی بەرێ. بەرژەوەندییەکانی ئێمە وادەخوازێ کە هیچ زلهێزێکی دیکە لە کەنداوی فارسدا لە بەرامبەر دامەزراوە قەبەکانی نەوتی ئەمریکا لە عەرەبستاندا جێ پێی خۆی خۆش نەکا."(١٢)

هەڵوێستی بریتانیا لە هاوینی (١٣٢٥) داو ئەو ئاژاوەو پشێوییانەی کە لە کاتی پەرەسەندنی رێکەوتنەکانی نێوان حکوومەتی ناوەندی و ئازەربایجان و کوردستان، لە باشووری ئێراندا روویان دا، دەریان خست کە ئینگلیزەکان بەپێچەوانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تەنیا بیریان لە بەرژەوەندییە نەوتییەکانی خۆیان دەکردەوە، ناشیانەوێ لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت بەرەوڕوو ببنەوە. لەو پشێوی و ئاژاوانەی لە هاوینی (١٣٢٥)دا روویاندا، هۆزەکانی قەشقایی، بویر

ئەحمەدیو مەمسنی، خوازیاری سەربەخۆیی نێوخۆیی پارێزگای فارس بوون، عەرەبەکانی خووزستانیش بە ڕێبەرایەتیی کوڕەکەی شێخ خەزعەل کە بە شێخ مەهدی ناسرا بوو، یەکێتیی بچووکی خووزستانیان هێنایە گۆڕێ و داوای جۆرێك خودموختارییان کرد. هەرچەندە هۆزە عەرەبەکان لە لایەن لەشکری ۱۱۰ی ئەهواز سەرکوت کران، بەڵام ئاشکرا بوو کە ئەو ڕووداوانە دەستی ئینگلیزەکانی تێدایە. بەهەر حاڵ (قەوام ئەلسەڵتەنە) ئامادەیی خۆی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ پیشەوەری پێشاندا کە مافی ئازەرییەکان لە چوارچێوەی بەندی سێهەمی ڕێکەوتننامەی حەوت بەندیی نێوان قەوام و سادچیکۆف دا دەدرێ. لە بەندی سێهەمدا هاتبوو:

"سەبارەت بە ئازەربایجان، لەبەر ئەوەی کێشەیەکی نێوخۆیی ئێرانە، لە ڕێگەی ئاشتیخوازانەوە، بەپشتبەستن بە یاسا، بە ڕۆحێکی خێرخوازییەوە هەوڵی چاکسازی لە نێوان دەوڵەت و ئازەربایجاندا دەدرێ." (۱۳)

وتووێژەکانی نێوان نوێنەرانی ئازەرییەکان لەگەڵ قەوام دا، لە ۸ی خاکەلێوەی ۱۳۲۵ لە تاران دەستی پێکرد. هەرچەندە نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك، بەڵام وتووێژەکان کۆتاییان پێ نەهاتو بە سەفەری موزەفەر فەیروز بۆ ئازەربایجان لە ۲۸ی خاکەلێوەدا، درێژەی کێشاو نیمچە خودموختارییەکی بۆ ئازەربایجان لـێکەوتەوە. دوکتۆر عاقڵی لەو باوەڕە دایە کە قەوام بۆ ئەوەی ڕوخساری ئاشتیخوازانەی خۆی سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی ئازەربایجان بپارێزێ، توندوتیژی بەکارنەهێنا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مۆری پەسندکردنی لە گەڵاڵەی ویستەکانی پیشەوەری نەدا، کە لە سەربەخۆیی نێو خودموختاری ڕەهادا کورت دەکرانەوە.(۱٤) دەوڵەتی قەوام ئەنجوومەنی ئەیالەتیو ویلایەتی لە ئازەربایجاندا بە ڕەسمی ناساندو (دوکتۆر سەلاموللا جاویدی) وەك پارێزگاری ئەو پارێزگایە هەڵبژارد. نیهاد و وەزارەتەکانی فرقەی دیمۆکرات بە گۆڕانکارییەکی کەمەوە، بوون بە نیهادی دەوڵەتی ناوەندی، بەڵام مەسەلەی هێزی چەکداری دیمۆکراتەکان هەر بە هەڵواسراوی مایەوە.

بەو جۆرە فرقەی دیمۆکرات، بە شێوەیەکی کاتی دەستی لە جیاخوازی هەڵگرت و بنەمای یاسایی بۆ خودموختارییەکەی دامەزراند. ئێستا کوردەکان پێیان وابوو کە ئەگەر هەنگاوێکی لەم شێوەیە هەڵنەگرن دەستیان لە گۆزە دێتە دەرێو لە یارمەتییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت بێبەش دەمێننەوە.

# وتووێژەکانی نێوان قازی محەممەد و قەوام ئەلسەڵتەنە

دەرچوونی هێزەکانی لەشکری سوور لە سەرەتاکانی بەهاری ساڵی ١٣٢٥ی هەتاویداو دروست بوونی کەش و هەوایەکی گونجاو بۆ نزیکبوونەوەی زیاتر و لێك تێگەیشتنی نێوان فرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان و دەوڵەتی ئێران، قازی محەممەد و حیزبی دیمۆکراتی خستە نیگەرانییەوە. کرانەوەی دەرگای وتووێژی نێوان پیشەوەری و تاران کە بە هاندانو نێونجی کردنی رووسەکان بەڕێوە دەچوو، بە هیچ شێوەیەك بە دڵی کوردەکان نەبوو و بە سەرەتای گەڕانەوەی بارودۆخی جارانیان دەزانی، ئەوەش جێگەی مەترسی بوو. رەفتاری کوردەکان لە هەشتی خاکەلێوەدا واتە لە رۆژی دەست پێکردنی گفتوگۆکانی نێوان پیشەوەریو تاران تا شەشەمی پووشپەڕ کە قازی محەممەد هەر بۆ مەبەستێکی لەو جۆرە سەردانی تارانی کرد، ئەوەی پیشان دەدا کە کوردەکان مەیلی رێکەوتن لەگەڵ دەوڵەتی مەرکەزییان نییە، ئامادەش نین بچنە ژێر باری خودموختارییەکی سنووردار لە چوارچێوەی ئێراندا، هەر بەو هۆیەش دەستیان دایە زنجیرە کردەوەیەکی توندڕەوانە کە لەگەڵ هەلومەرجی نوێی ئەوکاتدا نەیدەخوێندەوە، ئەگەری بەدەست هێنانی ئیمتیازو بڕوای دەوڵەت ناوەندیی کەم دەکردەوە. گرێدانی پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ ئازەربایجان و هەوڵدان بۆ گرتنی پارێزگای کوردستان، نموونەی هەرە بەرچاوی ئەو هەنگاوە توندڕەوانەن. دیتمان کە سۆڤیەت چۆن پێشی بە داگیرکردنی ئەو ناوچەیە گرت. لەوانەیە بتوانین بڵێین کە قازی بە داگیرکردنی باشووری کوردستانی رۆژهەڵات، دەیویست کە بە دەستی پڕەوە، وتووێژەکان دەست پێ بکا، بە تایبەت کە دوای وتووێژە سەرەتاییەکانی قازی لەگەڵ قەوام دا، مەسەلەی گۆڕینی ناوچە کوردنشینەکان بۆ یەك پارێزگاو کردنی قازی محەممەد بە پارێزگار، هاتبووە گۆڕێ، کە لەبەر دژایەتی کردنی رووسەکان نەچووە قۆناغی کردەوەوەو وەك جەوهەری سەرپەڕاو مایەوە.

سەرەنجام دوو هۆکاری سەرەکی قازی محەممەدیان ناچار کرد کە رووەو تاران وەڕێ کەوێ. سەرەتا ئەوە کە دەیدی ئازەرییەکان بێ ئەوەی راوێژێك بە کوردەکان بکەن، لە وتووێژەکانی خۆیاندا لەگەڵ دەوڵەت، لە تاران و تەورێز، لە بارەی ئەوانیشەوە بڕیاریان داوە، ئەوەش رێك ئەوەی دەگەیاند کە کوردەکان دیسان بوونەوە بە کەمینەیەك لە چوارچێوەی ئازەربایجانێکی خودموختاردا، هۆیەکی دیکەش ئەوە بوو کە رووسەکان بەردەوام مهابادیان دەخستە ژێر

گوشارەوە کە لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا وتوویژ دەست پیبکەن. ئیدی لێرە بەدواوە تەکبیری خۆیان لە چوارچێوەی ئێرانیدا بکەن. بەڵام ئەو ئیمتیازانەی کە دوکتۆر سەلاموڵڵا جاوید بۆ کوردەکانی بە دەست هێنا بریتی بوون لە:

١ـ دەوڵەتی ئێران رێگە بەخوێندنی زمانی زگماکی کوردی تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی دەدا.

٢ـ هەڵبژاردنی محەممەد حوسێن خانی قازی وەك فەرمانداری مهابادو پەسندکردنی لە لایەن قەوامەوە.

٣ـ ئەگەر قەرار بێ رێکەوتنێك لە بارەی سیستەمی سەربازیی ئازەربایجان هەبێ، لەشکری کوردەکانیش دەگرێتەوە.

بەو پێیە لە روانگەی سۆڤیەت و پیشەوەری و دەوڵەتی ناوەندییەوە، کۆماری مهاباد دووبارە ببوو بە بەشێك لە ئازەربایجان هەرچەندە کۆچێرا گوتەنی "کوردەکان جۆرێك هەڵسوکەوتیان دەکرد، وەك ئەوەی هیچ نەبووبێ."(١٥)

ئەو سیاسەتەی کە قەوام پەیرەوی دەکرد، کوردەکانی زیاتر دەخستە حاڵەتی گۆشەگیرییەوەو ناچاری دەکردن واز لە توندڕەوییەکانیان بێنن، رەحیمی قازی لە بارەی هەڵسوکەوتی کوردەکان لە ئاست حکومەتەکەی قەوامدا دەنووسێ:

"دەوڵەتی ئێران نەیدەویست خواستی کوردەکان، لە ئازەربایجان جیاکاتەوە، بەڵگەشی دەهێناوە کە گوایە سنووری جوگرافیایی کۆماری مهاباد بەشێکە لە پارێزگای ئازەربایجان. لە وتووێژەکانی تارانیشدا قەوام ئامادە نەبوو وەك وەفدێکی سەربەخۆ پێشوازی لە کوردەکان بکا، بۆیە کوردەکان ناچاربوون لە ژمارەی نوێنەرەکانیان کەم بکەنەوەو لەگەڵ دەستەی نوێنەرایەتیی ئازەربایجاندا بچنە تاران، دوای ئەوەی کە موزەفەر فەیروز وەك سەرۆك شاندی نوێنەرانی دەوڵەت بۆ درێژەدان بە وتووێژەکان هاتە تەورێز، دیسان نەیویست بە جیاو راستەوخۆ وتووێژ لەگەڵ کوردەکان بکا."(١٦)

پێویستە بزانین کە لە خولی دووهەمی وتووێژەکانی شاندی ئازەری لە تاراندا چەند نوێنەرێکی قازی (نەك شاندێکی سەربەخۆ) لەگەڵ ئازەرییەکان سەفەریان کردبوو. (عەبدوڵڵا پشدەری) روونی دەکاتەوە کە چۆن قازی محەممەد لە ژێر گوشاری سۆڤیەت و پیشەوەری بەناچاری رازی

بوو وتووێژ لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا بکاو داواکانی پێشووی خۆی کە سەربەخۆیی خوازانە بوون، واز لـێ بێنێ، ئەو لەو بارەیەوە نووسیویەتی:

"لە کۆتایی مانگی (حوزەیرانی ١٩٤٤) دوای کوژانەوەی ئاگری شەڕ، وێڕای سەربازەکانی دیکەی کۆمار لە بەری سەردەشتەوە بۆ مهاباد هاتین، پاشان رووامان کردە دێهاتێك کە سەر بە مولکەکانی زێرۆبەگی هەرکی لە دەوروبەری ورمێ بوو، پاش دوو رۆژ قازی ئاماژەی بە مەسەلەی وتووێژکردن لەگەڵ رێژیمی تاران کردو گوتی ئێمە پێشوازی لە رێگە چارەی ئاشتییانە دەکەین بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، بێ ئەوەی پەنا بەرینە بەر شەڕ، هەر بەو هۆیەش سەردانی تاران دەکەین، تا داوای خودموختاری بکەین بۆ هەردوو نەتەوەی کوردو ئازەری. پاشان گوتی ئەگەر دەوڵەتی ناوەندی بەو ویستەی ئێمە رازی بێ، لەگەڵ ئەوەدا داوایەکی زۆر نییە (واتە خواستی سەرەکی ئێمە سەربەخۆیی تەواوە) بەڵام چونکە هەلومەرجی سیاسیی ئێستا وا پێویست دەکا ئێمەش بەوەندە رازی بین، چونکە تورکەکانی تەورێز کە ژمارەیان زیاترەو هێزەکانیشیان پترە پێی رازیبوون، بارودۆخی سیاسیی ناچارمان دەکا رێگەی وتووێژکردن لەگەڵ دەوڵەتدا هەڵبژێرینو بە خودموختاریش رازی بین، خۆ ئەگەر درێژە بە شەڕیش بدەین، هیچ کەس پشتیوانیمان لـێ ناکا. تەنانەت لەوانەیە دۆستەکانیشمان لـێ ببنە دوژمن. لە وتەکانی قازی ڕا دەرکەوت کە ئەو وتووێژانە بە سەریاندا سەپێنراوەو لەژێر فشاری سۆڤیەتدا جێبەجێ دەکرێن..."(١٧)

ئەو راستییانەی کە عەبدوڵڵا پشدەری باسیان لـێ دەکا، بانگەشەکانی رەحیمی قازی رەت دەکاتەوە کە گوایە، پێکدادانەکانی پێشمەرگەکان و یەکەکانی لەشکری ئێران لە قەهرئابادو ساڵح ئابادو پەرت و بڵاوبوونی چەند یەکەیەکی ئەو لەشکرە بووە هۆی ئەوەی کە قەوام، قازی محەممەد بۆ تاران داوەت بکا،. بە تەواوی روونە کە هەلومەرجی تازەو رێنوێنییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت بوو کە وای لە کوردەکان کرد بێنە ناو وتووێژەوە.(١٨)

تەنانەت لوئیس فاوست دەڵێ، بێ مەیل بوونی کوردەکان بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا، وای کرد وتووێژەکانی حکوومەت و تەورێزیش وەدرەنگی کەوێ.(١٩)

سەرەنجام قازی پێش ئەوەی بچێتە ورمێ، لە کۆتاییەکانی مانگی جۆزەرداندا ئاڵوگۆڕی بیروڕای لەگەڵ پیشەوەری و رووسەکان لە تەورێزدا کردبوو، بڕیاری دا لەگەڵ قەوام ئەلسەڵتەنە دا وتووێژ بکا، بەڵام لەبەر ئەوەی کە بە درێژایی پێنج مانگ حکوومەت کردن، بەردەوام

خەڵکی کوردی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی و نەتەوەی فارس هان دەدا، جۆش و خرۆشی سەربەخۆییخوازانە و ئارەزووی دامەزراندنی کوردستانی گەورەی خستبووە بیرو مێشکیانەوە، ئێستا دەبوو تێیان بگەیەنێ کە بە شێوەیەکی کاتی مانەوە لە چوارچێوەی ئێراندا پەسند بکەن‌و چاوەڕوانی داهاتوو بن، هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو لە کۆبوونەوەی هەزاران کەسی لە خەڵکی مهابادو هۆزەکان و لایەنگرانی حیزبی دیمۆکرات، سیاسەتی نوێی خۆی شیکردەوە، پێویستی کار پێکردن بەو سیاسەتەی لەو هەلومەرجەدا باسکرد:

"ئێمە کە ئەوڕۆ خودموختاری خوازراوی خۆمان بە دەست هێناوە، بۆ ئەوەی کە بە دەوڵەتی ناوەندی و سەرانسەری دنیا پیشان بدەین کە نیازمان پاکە، رادەگەیەنین کە ئەوەی کردوومانە، بۆ ئەو مەبەستە نەبووە کە دەست لە برایەتی خۆمان لەگەڵ فارسەکان هەڵگرین و ئینکاری ئێرانی بوونی خۆمان بکەین، ئەو کارانەی کە کردوومانە و دەیکەین، تەنیا بۆ دژایەتی لەگەڵ رژێمی دیکتاتۆری و زوڵم و جەوری دەوڵەتی تاران بووە... بەڵام ئەگەر لە سەراپای ئێراندا ئازادیو دیمۆکراسی دابین بکرێ، ئەوکات هیچ بەربەستێك نابێ لە پێش نەتەوەکانی ئێرانێ، کە دەستی یەکێتی و هاوکاری بۆ یەکتر درێژ بکەن‌و بە شێوەیەکی دڵسۆزانەو بەخۆشەویستی و شادی بە یەکەوە ژیان بەسەر نەبەن."[٢٠]

لە قسەکانی قازیدا دەردەکەوت کە ناسیۆنالیزمی جیاخوازی ئیدی جێگەی نابێتەوە، کوردەکان دەبێ زیاتر لەسەر مافە پیشەیی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان پێداگرن، لە هێنانە گۆڕی کێشەی نەتەوەیی و سیاسیی تا کاتی گونجاو دەست هەڵگرن، هەرچەندە ئەو ئاڵوگۆڕە لە سیاسەتی حیزبدا، بە دڵی ئەندامانی حیزب نەبوو، بەڵام هۆزەکان و خەڵکی ئاسایی بە گەرمییەوە پێشوازییان لـێ کردو پێیان وابوو بەم شێوەیە سەردەمی گوشاری ئابووریو دەستڕۆیشتوویی رووسەکان کۆتایی دێ.

قازی محەممەد لە رێکەوتی (٦ی پووشپەڕی ١٣٢٥) ١٩٤٦ز بە یاوەریی حاجی بابەشێخ، هەژارو چەند ئەندامێکی دیکەی حیزب، روویان لە تاران کردو لە فڕۆکەخانەی مهرئاباد لە لایەن لایەنگرانی حیزبی توودەو چەند خوێندکارێکی کوردی زانکۆ کە لە تاران نیشتەجێبوون پێشوازییان لـێ کرا، لە ویلای دەربەند مانەوە. رێبەری کوردەکان دوای چەند دانیشتنێك لەگەڵ قەوام ئەلسەڵتەنە دا، پێشنیارەکەی قەوامی پەسندکرد کە هەموو ناوچە کوردنشینەکان بکرێنە یەك پارێزگاو قازی بکرێ بە پارێزگارێکی دەسەڵات فراوان (وسیع الاختیار).

وادیار بوو کە قەوام جڵەوی وتووێژەکانی لەدەست دایەو دەیهەوێ کوردەکان و پیشەوەریو سۆڤیەت لێك دابڕێ و تێکیان بەردا. بەڵام قازی محەممەد بەپەسندکردنی پێشنیارەکەی قەوامو پەسندکردنی ئەوەی کە وەزارەتەکانی خۆی هەڵوەشێنێتەوە، دەیانگۆڕێ بۆ ئیداراتی جێگەی رەزامەندیی دەوڵەت، پیشانی دا کە لە هەلومەرجێکدا کە هاتنەدی دروشمە نەتەوەییو جیاخوازییەکان، ئەستەمە، بۆ بەدەستهێنانی مافە کۆمەڵایەتییەکان کە بۆ چاکسازی لە کۆمەڵی کوردیدا گرینگن، هەوڵ دەدا.

لەگەڵ ئەوەدا کە پێشنیارەکەی (قەوام) لە لایەن قازییەوە، پەسندکرا، بەڵام هەرگیز نەچووە قۆناغی جێبەجێکردنەوە، چونکە یەکێتیی سۆڤیەت بەتوندی دژایەتیی لەگەڵ دەکردو لە رێگەی باڵوێزی خۆی لە تاران بە نوێنەرایەتیی کوردەکانی راگەیاند کە پەسندکردنی ئەو پێشنیارە، واتە نەمانی یارمەتیی سیاسیی و سەربازیی سۆڤیەت بۆ کوردەکان.

قازی محەممەد پێش سەردانی بۆ تاران، دروشمی ناسراوی دیمۆکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستانی هەڵگرتبوو." لە چاوپێکەوتنەکانی خۆی لەگەڵ رۆژنامەنووساندا، کاتێك لە تاران بوو، باسی لە دوو ئامانجی سەرەکیی خۆی و حیزبی دیمۆکرات دەکرد کە بریتی بوون لە: ئامانجێکی گشتی و ئامانجێکی تایبەتی. ئامانجە گشتییەکە لە دیدی قازییەوە، ئازادی، دابینکردنی دیمۆکراسی و سەربەخۆیی ئێران بوو و ئامانجی تایبەتییەکەش بە دەستهێنانی دەسەڵاتێکی هاوشێوەی دەسەڵاتی ئەنجوومەنی ویلایەتی ئازەربایجان بۆ کوردەکان بوو.[٢١]

بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کوردەکان نەگەیشتنە رێکەوتنێکی گشتیی هەمە لایەنە، وەك ئەوەی لە نێوان ئازەرییەکان و دەوڵەتدا رووی دا، بە دەستی بەتاڵەوە بۆ مهاباد گەڕانەوە. قەوام لە وتووێژەکاندا بە کوردەکانی راگەیاند کە پێدانی خودموختاری بەنەتەوەکانی تورك و کورد لە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەو دا نییە، پێویستیی بە رەزامەندیی شا، وەزیرەکان هەیە و دەبێ لە پەرلەمانیش باسی لێ بکرێو وەك یاسایەك بدرێتە دەرەوە. ئەو ئاماژەیەی قەوامیش لە ئەنجامی پێداگرتنی کەسایەتییە ناسیۆنالیستەکان بوو کە لە مێژبوو باسیان لەو مەسەلەیە دەکرد.

بۆ نموونە دوکتۆر موسەدەق وەك رێبەری کەمینەی مەجلیس لە وتارێکی خۆیدا کە لە رێکەوتی ٢٨ی سەرماوەزی ١٣٢٤ ١٩٤٥ز دا پێشکەشیکرد، رایگەیاند کە رەفتارەکانی فرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان و دامەزراندنی سیستمێکی خودموختار لەو پارێزگایەدا، بە شێوەی یەك لایەنە، بەپێچەوانەی یاسای بنەڕەتییە، چونکە کاروباری لەوجۆرە پێویستە لە رێگەیەکی

یاسایی‌و بە گەڕانەوە بۆ بیروڕای گەل‌و لە ڕێگەی ڕیفراندۆمەوە، بێتە دی. پاشان دوکتۆر موسەدەق درێژەی بە قسەکانی‌دا و گوتی:

"... ناتوانین هیچ بڵێین ئەگەر وڵاتێك بەشێکی فیدراڵ بێ و بەشێکی دیکەی حکوومەتی ناوەندی بێ، ئەگەر بڕیاریش بێ هەر گۆڕانکارییەك لە یاسای بنەڕەتییدا روویدا، دەبێ لە لایەن بیروڕای گشتیی خەڵکەوە بێ."[22]

بەم شێوەیە کەمینەی ئەنجوومەن نیشانیان دابوو کە تا خودموختاریی کوردەکان و تورکەکان نەچێتە چوارچێوەیەکی یاساییەوە ڕەزامەندیی لەسەر دەرنابڕن. قسەکان موسەدەق لە لایەن ئەردەلان و نوێنەری کوردەکانی کرماشان و کوردستان لە ئەنجوومەندا پشتیوانی لێکرا.

عەبدوڵلا پشدەری وێڕای ئاماژەکردن بەو ڕاستییەی کە وتووێژەکانی تاران دەسکەوتێکی بەرچاوی نەبووە دەنووسێ کە ڕێکەوتنێك بەو شێوەی خوارەوە لە نێوانیاندا وەدەست هاتووە:

١ـ قەوام بەڵێنی بە شاندی نوێنەرایەتی کوردەکاندا، مەسەلەی خودموختاری لە پەرلەماندا، بڕیاری لەسەر دەدرێ، بۆ ئەوەی فۆرمێکی یاسایی بە خۆیەوە بگرێ.

٢ـ بڕیاردرا کە پێوەندیی هەردوولا لە ئاستێکی بەرزدا، بپارێزرێ، تا ئەو دەمەی بنەماو لایەنەکانی خودموختاری بە ڕێکەوتنی هەردوولا ئامادە دەکرێ، هەروەها بۆ دیاریکردنی سنووری جوگرافیایی کوردستان و ئازەربایجان هەنگاو هەڵێنێتەوە.

٣ـ بڕیاردرا خەرجی و گوژمە (هەزینە)ی کۆماری مهاباد و حکوومەتی ئازەربایجان لە بوودجەی دەوڵەتەوە دابینبکرێ، هەروەها دوو ئوتۆمۆبیلیشیان بە دیاری پێشکەش بە قازی محەممەد و حاجی بابە شێخ کرد.[23]

قەوام لە ناچارکردنی قازی محەممەد دا بۆ هاوکاریکردنی دەوڵەتی ناوەندی و هەروەها لە دڵنیاکردنیدا سەرکەوتوو بوو، هەر بۆیە قازی رازیبوو کە حیزبی دیمۆکرات بەرێتە نێو بەرەی حیزبە پێشکەوتووەکانی ئێران، ئەو بەرەیە لە ئیئتلافی چەند حیزبێکی وەك حیزبی دیمۆکراتی قەوام (کە لە ٩ی پووشپەڕی ١٣٢٥دا ١٩٤٦ز واتە ٣ڕۆژ پێش هاتنی قازی بۆ تاران دامەزرابوو)، حیزبی توودەی ئێران، حیزبی ئێران، فرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان و حیزبی سوسیالیستی جەنگەڵ پێك هاتبوو. ڕەحیمی قازی دەنووسی کە ئەهیار صالح سکرتێری گشتیی

حیزبی ئێران، بانگهێشتەکەی قازی محەممەدی بۆ بەشداریکردنی لە ئیئتلافی حیزبی پێشکەوتووەکانی ئێراندا قبووڵ کرد.[٢٤]

بە شێوەیەکی گشتی جیاوازیی بیروبۆچوون لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی مەرکەزیدا هەر وەکو خۆی مایەوە، بەندەکانی جێگەی ناکۆکی، پێ داگرتنی کوردەکان بوو لەسەر پاراستنی لەشکری خۆجێی و پێدانی خودموختاری، بەڵام بەهەر شێوەیەك، سەفەرەکەی قازی محەممەد بۆ تاران کاری کردە سەر تێڕوانینەکانیو بووە هۆی ئەوەی کە تا رادەیەکی زۆر دروشمە پان کوردییەکانی وەلاوە نێ. رێبەری کوردەکان لە تاران لەگەڵ گەورە پیاوانی کورد وەك ئاسف کوردستانی، ئەمانوڵڵاخانی ئەردەلان، خەلیل فەهیمی و دوکتۆر زەنگەنە دیدارو چاوپێکەوتنی کردو بەو جۆرەی کە رەحیمی قازی باسی دەکا، ئەوان قازییان لە هاوکاریکردن لەگەڵ کۆمۆنیستەکانی سۆڤیەت ئاگادار کردەوەو گوتیان کە:

"بەرژەوەندی وا دەخوازێ لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا هاوکاری بکەی، سەردانی شا بکەیو کێشە و گرفتەکانی کوردستانی لەگەڵ بێنیە گۆڕێ."[٢٥]

هەروەها لە تاراندا لەگەڵ شاو سەرانی ئەمریکی وەك ژەنەراڵ شوارتسکۆف و جورج ئالن باڵوێزی ئەو وڵاتە، دیدارو وتووێژی کرد، ئەمریکییەکان پێشنیاریان پێکرد کە سەردانی ئەمریکا بکا، بەڵام ئەو لە بارودۆخێکدا نەبوو کە ئەو پێشنیارە پەسند بکا. دواتر قازی و ئەمریکییەکان لەیەك نزیکتربوونەوەو لە تەورێز لەگەڵ لیسترسۆن کۆنسولی ئەمریکا لە تەورێز چەند چاوپێکەوتنێکی ئەنجامدا. دوگلاس باس لە ویستی قازی دەکا بۆ نزیکبوونەوە لە دنیای ئازاد، پێش سەفەرەکەشی بۆ تاران دەنووسێ:

"... ئەو لە دوایین مانگەکانی حوکمڕانیی خۆیدا بەردەوام لەگەڵ سرڤیسی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ناوچەکەدا پێوەندیی هەبوو. لە هەوڵی بەدەستهێنانی هاوکاریی ئەمریکا دابوو، تا خۆی لە شەڕو وابەستەیی بە رووسەکان ئازاد بکا..."[٢٦]

راستی و دروستیی بانگەشەکانی دوگلاس نەزانراوە، بەڵام ناتوانین حاشا لەوە بکەین کە ئەمریکییەکان هەوڵیان دەدا، وەك سەردەمی شەڕ لە چوارچێوەی گەڵاڵەیەکی هاوشێوەی گەڵاڵەی کۆمیسیۆنی سێ لایەنەی کەمایەتییەکانی تورك و عەرەب و کورد، لەسەر بنەمای ئەنجوومەنگەلێکی هاوشێوەی ئەنجوومەنەکانی ئەیالەتیو ویلایەتی ئێران بکەنە خاوەنی خودموختاری و بەو شێوەیە دەست لە کاروباری نێوخۆی ئێران وەردەن. ئامانجەکانی

کۆمیسیۆنی سێ لایەنە لە کاتی سەرۆك وەزیرایەتیی حەکیمی لە ساڵی (١٣٢٤) ١٩٤٥ز دا بەهۆی هەوڵو کۆششەکانی فراکسیۆنی کەمینەی ئەنجوومەن بە ڕێبەری دوکتۆر موسەدەق پەکی کەوتبوو. حکوومەتی ئەمریکا چەند ساڵ دواتر لە سەردەمی سەرۆك وەزیریی ڕەزم ئارادا هەوڵیدا بە شێوەیەکی دیکە ئەو گەڵاڵەیە لە ئەنجوومەندا بڕیاری لەسەر بدرێ، بەڵام ئەو جارەش موسەدەق بووە ڕێگرێك لەبەردەم پەسندکردنی دا. ئەو گەڵاڵەیە کە بە گەڵاڵەی ڕێکخراوی ئەنجوومەنی ئەیالەتیو ویلایەتییەکان نێودێر کرابوو، (هەر ئەو دادوەرە ئەمریکییەش واتە دوگلاس، خستبوویە بەردەم ڕەزم ئارا) گرینگییەکەی بەڕادەیەك زۆر بوو کە وەك یەکەمین گەڵاڵەی کابینەی ڕەزم ئارا، خرایە بەردەم پەرلمان. دوکتۆر موسەدەق وێڕای دژایەتی لەگەڵ ئەو گەڵاڵەیەدا دروستبوونی دەوڵەتە خودموختارەکانی بە دابەشبوونی ئێران بۆ چەند دەوڵەتی بچووکتر، لێکدایەوە، ڕۆڵی هێزێکی دەرەکی سەرمایەداریش لە نووسین و پێشنیارکردنی ئەو گەڵاڵەیە بۆ شای ئاشکرا کرد.[٢٧]

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە پێوەندیی ئەمریکییەکان لەگەڵ قازی دا، قازی لە سۆڤیەت دوور نەکردەوەو پێوەندییەکانیان هەروا بە پتەوی مایەوە. ڕێبەری کوردەکان کاتێك وەڵامی گەورە پیاوانی کوردی لە تاران دایەوە، کە لە هاوکاریکردن لەگەڵ سۆڤیەت ئاگاداریان کردبۆوە، گوتی:

"باش بزانن کە ئەمن کۆمۆنیست نیم و هیچ کەسیش ناتوانێ بەو گوناهە تاوانبارم کا، بەڵام ئەوە کە ئێمە لەگەڵ سۆڤیەتدا پێوەندیمان هەیە، بۆ خێرو بەرژەوەندیی میللەتی ستەم لێکراوی کوردە. سۆڤیەت وەك دۆستێکی نزیك و یاوەری خەڵکانی زەحمەتکێش و زوڵم لێکراو هاتۆتە مەیدانەوەو پشتیوانی بەهێزی ئێمەشە، ئامانجی ئێمەش لە دامەزراندنی حکوومەتێکی خودموختار لە کوردستاندا، جیابوونەوە لە ئێران نییە، ئێرانیش بە نیشتمانی خۆمان دەزانین، ئێمە بەو کارەمان دەمانەوێ خزمەت بە بڵاوبوونەوەی دیمۆکراسی و ئازادی لە سەراپای ئێراندا بکەین، ئێمە چاو لەو کارە ناپۆشین کە دەستمان پێ کردووە، بە نیوەچڵیش بەجێی ناهێڵین و ئاڵای ئازادی لەسەراسەری ئێراندا دەشەکێتەوە."[٢٨]

ڕێبەری کوردەکان بەو بانگەشانەو بە تەسلیم بوونی لە بەرامبەر ڕێنوێنییەکانی باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە پێوەندی لەگەڵ ولاوەنانی گەڵاڵەی پارێزگاری کوردستان و پارێزگاربوونی قازی، کە لە لایەن قەوامەوە پێی پێشنیارکرابوو، نیشانی دا کە جیابوونەوەی کۆماری مهاباد لە یەکێتیی سۆڤیەت بەو ئاسانییە نییەو ڕادەی وابەستەیی ئەو بە مۆسکۆوە، هەروا بەهێزە.

پاش کۆتاییهاتنی وتووێژەکانی تاران و سەرەڕای هەوڵ و کۆشش و پێداگرتنی وەزیرە توودەییەکانی ناو کابینە بۆ گەیشتنە ڕێکەوتنێك لە نێوان حکوومەت و کوردەکاندا، قازی محەممەد گەڕایەوە مهاباد. لە کاتێکدا تێبینی ئەو خاڵەشی کردبوو کە تاران دوای ڕێکەوتن لەگەڵ پیشەوەریدا قەیرانی ئازەربایجان، بە چارەسەرکراو دەزانێ. کێشەی کوردیش لە دیدی سەرانی حکوومەت گرینگییەکی ئەوتۆی نییەو لە ڕاستیشدا هەر لەو ساتەوە تا ڕووخانی کۆماری مهاباد لە (سەرماوەزی ١٣٢٥) ١٩٤٦ز دا کوردەکان هەر لەو دۆخەی جارانیاندا مانەوە.

قازی دوای گەڕانەوەی بۆ مهاباد، لە وتەیەکیدا بۆ لایەنگرانی حیزبی دیمۆکرات باسی لە پێویستیی پێداچوونەوە بە بیروبۆچوونەکانی حیزب لە پێوەندی لەگەڵ چۆنیەتی بەدەستهێنانی مافی کوردان و پەیڕەو کردنی سیاسەتی نوێ بۆ مانەوە لە شانۆی سیاسیی ئێران و دەورو هەبوونی کوردەکان لە هەلومەرجی نوێدا کرد. ئەو پێشبینییانەی کە قازی بۆ کوردەکان و ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی دیمۆکراتی وێنا کرد، لە زۆر لایەنەوە تا ئێستاش لە ڕێبازو پەیڕەوی سیاسیی کوردەکانی ئێران دا بەرچاو دەکەوێ.

ئەوەی قازی پێی گەیشتبوو، ئەنجامی تێپەڕین لە قۆناغێك بوو کە هەلومەرجێکی ناسروشتی حوکمی دەکرد بۆ قۆناغێك کە دەتوانین ناوی بنێین قۆناغی بڕیاردانی خەلکی کورد لە هەلومەرجێکی سروشتیدا، کە لەو هەلومەرجەدا کاریگەریی سیاسیی هێزە بێگانەکان لە کورتی دابوو. کۆمەڵە بڕیارێك لەلایەن کوردەکانەوە درا کە لەژێر سایەی واقعبینییەکی سیاسیی زۆرترەوە، وەدەست هاتبوو.

کوردەکانی ئێران لە یەکەم بزووتنەوەی سیاسیی خۆیاندا، بە مەبەستی سەرخستنی ناسیۆنالیزمی جیاخوازانەی کورد، هاوکاریی هەمە لایەنەو بێ قەید و مەرجی هێزێکی دەرەکییان کردبوو. غافڵ لەوەی کە هێزە بێگانەکان تەنیا بەدوای بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی خۆیانەوە بوون هەرگیز خزمەتێك بە خەلکی کورد ناکەن. ئەوە کوردەکانن کە لە هەر گۆشەیەکی دیکەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بن تەنیا لە ڕێگەی هاوکاریکردنی ئەوانەی کە ژیانیان لەگەڵدا دەبەنە سەر، دەتوانن بە مافەکانی خۆیان بگەن.

قازی محەممەد لە درێژەی وتەبێژییەکی خۆیدا بۆ خەلکی مهاباد لە کۆتاییەکانی (پووشپەڕی ١٣٢٥) ١٩٤٦زدا گوتی:

"بزانن کە هەمیشە بە شەڕو خوێنڕێژی ناگەینە ئەنجام، دەبێ کاروبارەکانی خۆمان بە پەنابردنە بەر ڕێگەچارەی سیاسیی، بەڕێوەبەرین. زۆر کات لە ڕێگەی ئاشتی و گفتوگۆوە ئامانج و خواستەکانت

بەرەو پێش دەبەی... قۆناغی شەڕ روو لە کۆتاییە. ئێستا کاتی کارزانی و زانست و هونەرە، دەبێ بەو چەکانە بچینە شەڕی دوژمنانمان. ئێمەی کورد لە خەباتی خۆماندا هەرگیز نیازی جیابوونەوە لە ئێرانمان نەبووەو تەنها ئامانجمان پاراستنی ئازادییەکانمان و پارێزگاریکردنی دیمۆکراسی بووە لە سەرانسەری ئێراندا." (١)

رۆزڤێلت کە لەو قۆناغەدا چاوی بە قازی محەممەد کەوتووە، سەبارەت بەو ئاڵوگۆڕە دەنووسێ:

"بەلانی کەمەوە لەو قۆناغەدا کە ئێمە باسی دەکەین، داواکارییەکانی میانەڕەوترن، خودموختاری لە چوارچێوەی وڵاتی ئێران دا. بە ئاشکرا دەیگوت کە ئەویش لەگەڵ ئەو رایەی کوردەکان دا کە پێیان وایە بەو حوکمەی لەگەڵ فارسەکان یەك نەژادن، هۆکارێك لە گۆڕێ نییە بۆ ئەوەی ئەو یەکێتییەیان لە نێوانیان دابێ، کە لە سەردەمی کۆنی پارس و مادەکاندا هەیانبووە." (٢)

لێرە بەدواوە شاهیدی بێ هێزیی پلەبەپلەی حکوومەتی مهاباد و زیادبوونی بزووتنەوەی سیاسیی و سەربازیی دەوڵەت و لەشکری شاهەنشاهی لە کوردستاندا دەبین. کەمبوونەوەی هاوکارییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت، ئاشکرابوونی ناڕەزایەتیی نێوخۆیی بە تایبەت لەلایەن هۆزەکانەوە، سەرەنجام بە زیادبوونی پلەبەپلەی فشاری دەوڵەتی ئێران، حکوومەتی مهاباد گەیشتە قۆناغێك کە دەکرا گورزی لـێ بوەشێنرێ.

دەوڵەتی ئێران کە لە (پووشپەڕی ١٣٢٥) ١٩٤٦زدا، تا رادەیەك روخساری لایەنێکی لە خۆی نیشان دابوو کە ئامادەی وتووێژە، ئێستا داوای لە مهاباد دەکرد تەنیا گوێ بگرێ، هەر بەو هۆیەش لە مانگی گەلاوێژ دا، شاندێکی سەربازیی بە سەرۆکایەتیی سەرهەنگ فەیرووزی لە سەنتەرەوە [لەوانەیە لە ریگەی سەقزەوە] چوونە ناو مهابادو بە قازییان راگەیاند کە ئەگەر خوازیاری خودموختارییە، پێویستە بەندی چەك داماڵینەکە پەسند بکا. قازی وەڵامی دانەوە کە لەتوانایدا نییە خەڵکی ناچار کا، تفەنگەکانیان بدەنەوە.

(عەبدوڵلا پشدەری) لەبارەی ورەی خەڵکی و بیروبۆچوونی قازی و دوایین ئومێدەکان بە سۆڤیەت دەنووسێ:

"ئەوەی کە تا رادەیەك خەڵکی ئومێدەوار کردبوو، بەڵێنەکانی قازی بوو کە هەمیشە دەیگوت - خودموختاریمان بەدەست هێناوە، حکوومەتی تاران بەڵێنی تەواوی بە ئێمە داوە، تازە ئەگەر بۆخۆشمان نەمانەوێ ئەوان پەشیمان نابنەوە، بەڵێنی خۆیان ژێر پێنانێن، خۆ ئەگەر پەشیمانیش بوونەوە دۆستی گەورەمان حکوومەتی سۆڤیەت، پشتیوانیمان لـێ دەکاو بە ئاسانی دەست لە کوردەکان بەرنادا." (٣)

وێ دەچێ سۆڤیەت بە پەیمان و بەڵێنەکانی خۆی، هەروا کوردەکانی لە نێو ئۆردوگاکەی خۆیدا هێشتۆتەوە. ئەو متمانە لە رادەبەدەرەی قازی محەممەدیش بە رووسەکان، بێجگە لە بێهێزیی سیاسیی قازی ناکرێ هیچ ناوێکی دیکەی لێ بنێین. لەشکری شاهەنشاهیش هاوتەریب لەگەڵ هەڵوێستەکانی حکوومەت رۆژ لە دوای رۆژ بەندەکانی رێکەوتننامەی قازی ـ رەزم ئارای لە گوندی "سەرا" پێشێل دەکردو بە بەردەوامی چەك و تەقەمەنیی بۆ سەربازگەکانی سەردەشت و بانە دەنارد. بەردەوامبوونی ئەو هەلومەرجە لە ئەنجامدا ئاڵۆزی و پشێوی لە نێوان بارزانییەکان کە پارێزەری باکووری جادەی سەقز بوون لەگەڵ سەربازەکانی لەشکر دا لێ کەوتەوەو زەمینەی تێکهەڵچوونێکی نوێی رەخساند. لێرەدا پێویستە ئاماژە بە بابەتێك بکەین کە هیچ یەك لە مێژوونووسان و سەرچاوەکانی تایبەت بە کۆماری مهاباد، گرینگییەکی ئەوتۆیان پێنەداوە. ئەویش هەبوونی قۆڵێکی توندڕەو و شەڕخواز لە حکوومەتەکەی قازی دا، کە وێڕای کەمبوونی لایەنگرانی ئەم قۆڵەش، دەیتوانی ئاگری شەڕ هەڵایسێنێ. لە روخسارە دیارەکانی ئەو قۆڵە دەتوانین زێرۆ بەگی هەرکی و مەلا مستەفای بارزانی نێو بەرین، کە تەنانەت دوای رووخانی کۆماری مهابادو خۆ بەدەستەوە دانی قازی لەگەڵ لەشکری شا شەڕیان کرد. قازی محەممەد و سەدری قازی لە ترسی کاردانەوەی توندو چاوەڕوان نەکراوی ئەو قۆڵە توندڕەوە، کەوتە تەکبیری وتووێژکردنی سەرلەنوێ لەگەڵ دەوڵەت و ئەفسەرانی لەشکرو تەمی ئەو خراپ لێك تێگەیشتنەش برەوێنەوە. یەحیا سادق وەزیری کە لەلایەن قەوام نیهادی سەرۆك وەزیرانەوە بەشداری ئەو وتووێژانەی کردووە، دەنووسێ:

"لە کۆتاییەکانی (هاوینی ١٣٢٥) ١٩٤٦ز دا قەوام ئەلسەڵتەنە، بانگهێشتی کردم و مەئمووریەتی پێ دام کە دوای راوێژکردن لەگەڵ سەرلەشکر رەزم ئارا، برۆمە کوردستان. لەو دیدارەی کە لەگەڵ رەزم ئارادا هەمبوو، مەسەلەی ناردنی چەكو تەقەمەنی هێنایە گۆڕێو گوتی لەشکر لەو بارەیەوە کەمترخەمی کردووە. ئەتۆش بەو حوکمەی کە کوردی دەبێ رێ لە ئاڵۆز بوونی بارودۆخەکە بگری. شاری سەقز بۆ ئەو وتووێژکردنە دەستنیشان کرابوو. بێجگە لە نوێنەرانی کۆماری مهاباد، سەدری قازی و دوو نوێنەری فرقەی دیمۆکراتی ئازەربایجان لەگەڵ شاندە کوردییەکە ئامادە ببوون. سەرەتا دیمۆکراتەکان چەند بەڵگەیەکیان خستە روو، کە پێشێل کردنی رێکەوتننامەکەی لەلایەن ئەفسەرانی لەشکری دەوڵەتەوە دەسەلماند. وتووێژەکان لە کەشێکی ئاڵۆزدا بەڕێوە دەچوون، چونکە ئەندامە سەربازییەکانی شاندی کوردی، بە توندی رەخنەیان لە رەفتاری ئەفسەرانی لەشکر دەگرت، ترسی بێ ئەنجام بوونی وتووێژەکان لە گۆڕێ دابوو، بەڵام سەدری قازی ئارامی کردنەوەو دیاربوو کە هەم سەدری قازیو هەم نوێنەرانی پیشەوەری خوازیاری ئاشتین، لە راستیدا دەتوانین بڵێین ئەو رێکەوتنەی لەو وتووێژانە دا وەدەست هات، لە سایەی هەوڵ و تەقەلاکانی سەدری قازی دابوو."[٤]

عەبدوڵلاّ پشدەریش دڵنیامان دەکاتەوە کە قازی لەو قۆناغەدا، خوازیاری شەڕ نەبووەو دەترسا کە شەڕ یان ئاژاوەیەکی چووکەش بەهانەی پێویست بۆ هەڵوەشاندنەوەی خودموختاری کوردەکان لە دەستی دەوڵەتی مەرکەزی نێ و سەدری قازییش هەوڵی دەدا کە گیروگرفتەکە بە شێوەیەکی هێمنانەو لە ڕێگەی ئاشتییەوە چارەسەر بکرێ.[٥] لەو سەردەمەدا قەوام ئەلسەڵتەنە قازی وەك فەرمانداری مهاباد دەستنیشان کردبوو.

لە سەرەتاکانی پاییزی ساڵی (١٣٢٥) ١٩٤٦ز دا ئەگەری گەڕانەوەی لەشکری سوورو گەیشتنی یارمەتییە کاریگەرییەکانی سۆڤیەت و بە یاسایی ناسینی خودموختاری کوردستان، لە گۆڕێدا نەمابوون لەگەڵ ئەوەی کە ڕۆژڤێلت گوتەنی حکوومەتەکەی قازی بنەماو پایەیەکی یاسایی نەبوو، بەڵام هەروەك پێشێ لەسەر پێی خۆی بوو. وەزیرانی کابینە وەك بەڕێوەبەری ئیدارەکانی ژێر فەرمانی خۆیان گۆڕابوونو (قازی)یش لە سەرۆکایەتیی کۆمارەوە ببوو بە ڕێبەری حیزبی دیمۆکرات.[٦] ئێستا هەلومەرجی رووخانی کۆمار لە هەموو ڕوویەکەوە ئامادە ببوو، بۆ شارەزا بوون لە هۆکارەکانی رووخان و هەڵوەشانی کۆماری مهاباد پێویستیمان بە شارەزایی لە شێوەی هەڵسوکەوت کردنی هێزە کاریگەرە سیاسییو کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەی کوردی لەگەڵ حکوومەتەکەی قازی دا هەیەو ناکرێ هەروەك لێکۆڵەرە ئورووپاییەکان بەوەندە دەست هەڵگرین کە گوایە نەمانی هاوکارییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت کۆتایی بە تەمەنی حکوومەتی کوردەکان هێنا، پەسند کردنی ئەو داوەری کردنە لە دوو لایەنەوە ڕێگەی ڕاستمان لـێ ون دەکا کە بریتین لە:

١ـ هۆکاری نێوخۆییەکانی رووخانی کۆمارو دژایەتییە نێوخۆییە روو لە گەشەسەندنەکانی نێو کۆمەڵی کوردی لەبەرامبەر کۆمار دا، وەبەرچاو ناگرێ.

٢ـ سەرنەکەوتنی حیزبی دیمۆکرات لە ورووژاندنو دروستکردنی هەستی ناسیۆنالیزمی کوردی لەنێو کوردەکانو مۆبیلیزە کردنی کۆمەڵگەی کوردی بەو ئاقارە دا، پشت گوێ دەخا.

بێ ئەوەی بمانەوێ ڕۆڵی سۆڤیەت لە پشتیوانی کردنی کۆماری مهاباد، کەم بایەخ لە قەڵەم بدەینو ئەو ڕاستییەش وەبەرچاو نەگرین کە هاوکاری نەکردنی سۆڤیەت بەو حکوومەتە یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی سەرنەکەوتنی کوردەکان بووە، کاتی ئەوەش هاتووە کە ئاوڕێکی زیاتر لە هۆکارە نێوخۆییەکانی شکستی بزووتنەوەی کوردەکان بدەینەوە.

ئەوا لێرەدا باسی هۆکارە نێوخۆیی و کاریگەرەکانی ناکام بوونی حیزبی دیمۆکرات دەکەین:

# پشتگیری نەکردنی هۆزەکانی کوردستان لە کۆماری مهاباد

هەڵکەوتی کۆمەڵگەی هۆزایەتیی کورد لەو رۆژانەدا، بەو شێوەیە نەبوو کە قازی محەممەد بە ئاسانی بتوانێ فەرمانڕەوایەتیی دڵخوازی خۆی بەسەردا جێگیر بکا. هۆزەکان بەردەوام بە چاوی پڕ لە گومانەوە دەیانڕوانییە سیاسەتەکانی قازی و پێوەندییەکانی لەگەڵ سۆڤیەت دا. قازی هیچ کات نەیتوانی لەکەشوهەوایەکی پڕ لە گەرم و گوڕی لێکگەیشتندا پێوەندییان لەگەڵ دامەزرێنێو پێوەندیی حکوومەتی مهاباد لەگەڵ هۆزەکاندا هەمیشە لەرزۆك بوو. هۆکاری ئەو مەسەلەیە چ بوو؟ بۆچی بۆ هۆزە کوردەکان، حکوومەتی ناوەندی، یان قازی گوتەنی فارسەکان لە پێشتر بوو تا دەوڵەتێکی کوردی؟

وەڵامی ئەو پرسیارانە بەو رادەیەش زەحمەت نییە. هۆزە کوردییەکان هەروەك هۆزەکانی دیکەی ئێرانو بە پەیڕەوی کردن لە سیاسەتی دێرینەی خۆیان دژایەتیی سیستمێکی سیاسیی نێوەندگەرایان دەکردو بە مەترسییەکیان دەزانی بۆ سەر ئازادی چالاکیی سیاسیی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان، جا هیچ جیاوازییەکی نەبوو ئەو سیستەمە کوردی بێ یان فارسی، چونکە هەر چۆنێك بێت دەبووایە دەستبەرداری شێوەی ژیانی نەریتی خۆیان بنو بە پێی پرۆگرامە نووسراوە ئابوورییەکانی ئەو حکوومەتە بجوولێنەوەو شاهیدی گواستنەوەی دەسەڵاتی سیاسییو کۆمەڵایەتی لە دەستی سەرۆك و ریش سپییەکانی هۆز بۆ لاوانی خوێندەوار بن.

لە سیستمێکی ئەوتۆدا ژنان لەگەڵ پیاوان یەکسان دەبن و هەروەك سەردەمی رەزاشا دەبێ لاوانی هۆزەکانیش، بچنە سەربازیو ئەوەش بە واتەی دەمەترسی کەوتنی هێزە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنان لە هۆز دابوو، بەو پێیە ئەو چارەنووسەی کە هۆزەکان لە کۆماری مهاباد دا چاوەڕێیان دەکرد، لەگەڵ ئەو ئەزموونەی کە لە سەردەمی رەزاشادا تاقیان کردبۆوە، جیاوازییەکی ئەوتۆی نەدەبوو، ئەو بەدگومانییەی هۆزەکان کاتێك زیاتر بوو کە قازی محەممەد بە هەموارکردنی بەهرەی ماڵکانەو ناردنی کوڕە سەرۆك هۆزەکان بۆ یەکێتیی سۆڤیەت بۆ خوێندن و پێکهێنانی لەشکرێکی کلاسیك، ئیرادەیەکی بەهێزو پشتیوانی پێویستیی خۆی بۆ چاکسازیی راستەقینە نیشان دا.

هۆزەکانی کورد هەر وەك هۆزەکانی دیکەی ئێران، دوای رووخانی رەزاشاو گەڕانەوەیان لە دوورخراوەیی، سەرلەنوێ درێژەیان بە ژیانی هۆزایەتیی خۆیان داو چەکداربوونەوە. لەو پێشبینییانەی کە رێبەرانی کورد سەبارەت بە داهاتوو، دەیانخستە روو، دەبوایە ئەوان دیسان

چەکەکانی خۆیان بدەنەوە بە لەشکری دەوڵەتی تازە پێکهاتووی کورد. دەوڵەتێک کە کۆمۆنیزمی سۆڤیەتیش پشتیوانیی لێ دەکرد، لانی کەم حکوومەتی پەهلەوی ئەو تایبەتمەندییە نێگەتیڤەی نەبوو.

بێجگە لەو هۆکارانە، هۆزەکان بەهۆی بێهێزبوونی ئابووری لەو سەردەمەداو بێ بەهرە بوونی زۆربەی سەرۆک هۆزەکان لە دەسەڵاتدا، بەرامبەر بە کۆماری مهاباد بێبڕوا بوون، بەڕاستی لە کۆمەڵگەیەکدا کە بەربەرەکانی کردنی نێوان تیرەو تایفە و کەسایەتییەکانی، یەکێك لە تایبەتمەندییە کۆن و هەمیشەییەکەی بووبێ، سپاردنی هەموو ئیمتیازو پلەو پایەیەك بە خەڵکی مهاباد لە کابینەی حکوومەت دا، چ کاردانەوەیەکی لەسەر سەرانی دیکەی کورد دادەنا؟

عەبدوڵلا پشدەری سەبارەت بەو سیاسەتەی قازی محەممەد دەنووسێ کە یەکێك لە کەموکوڕییە سەرەکییەکانی قازی محەممەدو کەسانی دەوروبەری، پشت بەستنی لە ڕادەبەدەریان بوو بە خەڵکی مهابادو ئەوە کە "قازی ڕێوشوێنی دۆستایەتی و هاوشاریەتیی گرتبووە بەرو خەڵکی مهابادی لە ئەوانی دیکە لە پێشتر دادەنا، لە کاتێکدا کە ئەو شێوە هەڵسوکەوت کردنە بۆ ڕێبەری میللەتێکی زوڵم لێکراوی وەك کورد، هیچ کەڵکی نەبوو، زۆریش بێ جێ بوو."(٧)

بەڵام پشدەری ئەوەی لەبیر کردووە کە ئەو هەنگاوەی قازی لە ناچارییەوە بووە، چونکە کۆماری مهاباد پەناگەیەکی باش و خەڵکێکی جێگەی باوەڕی جگە لە دانیشتووانی مهابادی نەبووەو نەی دەتوانی پشت بە خەڵکانی دیکە ببەستێ، ئەو داوەری کردنەی پشدەری کە بۆ خۆی یەکێك لە شاهیدان و چاودێرانی بارودۆخی کۆمار بووە، دەری دەخا کە ئەو سیاسەتەی قازی محەممەد جێگەی ڕەخنەی خەڵك بووە، بەڵام ئەو تا کۆتاییش گۆڕانکاریی تێدا پێك نەهێناوە.

هۆکارێکی دیکەی ناڕازی بوونی خەڵك لە ڕێکخستنی دیمۆکراتەکانن بۆ ڕۆڵی سۆڤیەت لە کاروباری کوردستان دا دەگەڕێتەوە، پێشتر دیتمان کە سەرانی گەورەی کورد وەك عەلی ئاغای میر ئەسعەدی دێبوکری، قەرەنی ئاغای مامەش و قاسم حاجی بایز ئاغا دوای گەڕانەوەیان لە سەردانی یەکەمی شاندی کورد لە ساڵی (١٣٢٠) ١٩٤١ز بۆ سۆڤیەت، سەبارەت بە ڕۆڵی سۆڤیەتو جێبەجێ کردنی بەڵێنەکانی، بە گومان و دوودڵ بوون، بەشداری نەکردنی ئەو کەسایەتییانەو کەسانی دیکەی وەك ئەوانیش لە سەردانی دووەمی شاندی کوردی بۆ باکو نیشانەی ناڕەزایەتیو بێ مەیلیی هۆزەکان بەرامبەر بە قازی محەممەدو حیزبی دیمۆکرات بوو. هەر بەو هۆیەش کاتێك قازی لە (خەزەڵوەری ١٣٢٤) ١٩٤٥ز دا سەرقاڵی ئامادەکاری بۆ کۆبوونەوەی سەرانی کورد بۆ مەبەستی لێکدانەوەی بارودۆخی ئازەربایجانو بڕیاردان لەبارەی

داهاتووی کوردستانەوە، بوو، ژمارەیەك لە سەرانی کورد لەو دانیشتنە دا بەشدارییان نەکرد. ڕۆژنامەی باختەر لەو بارەیەوە بەم شێوەیە دەنووسێ:

"مەلا خەلیل، شێخی مەنگوڕەکان و قەرەنی ئاغای مامەش لە کۆمیسیۆنی پێکهاتوو لە سەرانی کورد لە مهاباد بەشدارییان نەکردو قەرەنی ئاغا بە ئاشکرا رایگەیاند کە ئۆگرییەکی بەرامبەر بە سەربەخۆیی کوردستان نییەو بە نیشتمانی خۆی ئێران وەفادارە، هەروەها گوتبووی کە ئەمن کورد نیم."[٨]

تەنانەت ئەو سەرۆکانەی لە قازیش نزیك بوون وەك عومەرخانی شەریفی، مەیلی هاوکاری لەگەڵ حیزبی دیمۆکراتیان نەبوو، کاتێك قازی بڕیاری هێرش کردنە سەر پارێزگای کوردستانی دا، عومەرخانی شەریفی بە بیانووی ئەوەی کە گوایە ئەسپی سوارەکانی بۆ لەوەڕ بەرەڵا بوون، هاوکاری مهابادی نەکردو لەلایەکی دیکەشەوە بە شێوەی نهێنی پێوەندیی بە لەشکری ئێرانەوە کرت.

دوگلاس لە بیرەوەرییەکانیدا لەو بارەیەوە دەنووسێ:

"بە درێژایی ساڵی (١٩٤٦)، پێکدادان لە نێوان کوردەکان و لەشکری ئێراندا رووی دا کە هێندێکیان لە دیواندەرە روویان دا. ئەو کاتە مەلا مستەفا بارزانی بەشێکی زۆری لەشکری قازی محەممەدی دابین دەکرد. عومەرخانی شەریفی هێزێکی کەمی کۆکردەوە. بەڵام کاتێك کە لەشکر بە هەموو هێزێکەوە لە دیسامبری ١٩٤٦ (کانوونی یەکەمی)دا گەیشتە جێ، لەگەڵ دژایەتییەکی کەم رووبەڕوو بۆوە، هێزەکانی عومەرخان هیچ چەشنە بەرگرییەکیان نەکرد، لە راستیدا ئەو بەڵێنی دابوو کە بە دەوڵەتی ئێران وەفادار بمێنێتەوە، بیروڕای دژە سۆڤیەتی لەنێو زۆربەی کوردەکاندا بەهێز بوو."[٩]

ڕۆیشتنەوەی لەشکری سوور بووە هۆی ئەوەی کە زۆربەی سەرۆك هۆزەکان بەنهێنی لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی و لەشکری شا پێوەندی ببەستن و خۆبواردنی (قەوام ئەلسەڵتەنە) لە دانی خودموختاری بە حیزبی دیمۆکرات، ئەو حیزبەو قازیشی لەپێش چاوی هۆزەکان زیاتر لەجاران بێتوانا نیشان دا.

(عەبدوڵڵا پشدەری) پێیوایە سیاسەتی سۆڤیەت هۆکاری بەرەڵابوونی ئەو سەرۆکانەیە کە لایەنگری قازییان دەکرد:

"ئەو بەشە لە سەرۆك هۆزەکانی کوردستانی ئێران، کە هەر لە سەرەتاوە پێوەندییان بە ریزەکانی حیزبی دیمۆکراتەوە کردبوو و لەگەڵ کۆماری مهاباد دا هاوکارییان دەکرد، کاتێك

تێبینییان کرد کە حکوومەتی سۆڤیەت گوێ ناداتە کێشەی کورد و سەرقاڵی جێبەجێکردنی داواکانی تارانە، تا رادەیەك تووشی نائومێدی بوون و برِوایان بە کۆماری مهاباد کەم بۆوە، تا ئەو رادەیەی کە زۆربەیان بە نهێنی لەگەڵ حکوومەتی ئێران دەستیان تێکەڵ کرد."[10]

بۆ یەکەمین جار کەسانێکی وەك (عەبدوڵلا بایزیدی) سەرۆکی هۆزی مەنگورِو عەزیزی کورِی قەرەنی ئاغای مامەش و عومەرخانی شکاك، دەستیان بە رەخنە گرتن لە کۆماری مهاباد کردو لە بەرامبەری دا وەستان، بەڵام کاتێك قازی بە ئامادەکارییەکانی سەرکوت کردنی ئەو دوو هۆزەوە سەرگەرم بوو، پەنایان بردە بەر پشدەرییەکانی عێراق.[11]

عەبدوڵلا ئیلخانی زادە یەکێك لە سەرۆك هۆزەکانی دێبوکری و نەیاری سەرسەختی قازی لە نامەیەکی دا بۆ قەوام ئەلسەلتەنە لە رێکەوتی ۱۱ی خەزەڵوەری ۱۳۲۵ ۱۹٤٦ز دا بە وردی باس لە بارودۆخی ناوچەی دەسەلاتی کۆمارو ورەی هۆزەکان دەکا:

"بارودۆخی ناوچەی مهاباد بەو شێوەیە کە لە خوارەوە پێتان رادەگەیەنم، خەڵك و زۆربەی دانیشتووان لە بارودۆخی ئێستا نارِازین، وەك دەردەکەوێ لە سەدا نەوەدو نۆی نارِازییەو کارو کاسبیان لە رادەبەر لە ناخۆشی دایە، کاروباری دادپەروەری وەستاوە، هۆزەکان بێ هیچ هەڵبواردە (استپنأ) یەك نارِازین. بەشێکیان کە لە ناوچە سنوورییەکان جێگیرن، دژایەتیی خۆیان ئاشکرا کردووە، بەشێکیان خەریکی کات بەسەر بردن و رواڵەت سازین. بارودۆخی مهاباد لە رادەبەدەر لە پەرێشانی و بێ سەرەوبەرەیی دایە... هەرکاتێك سیاسەت رێگە بداو دەوڵەت بە باش بزانێ، هەلومەرجە بۆ یەکلاکردنەوەی مهاباد بە هاوکاریی هۆزە لەخۆبردووەکان زۆر گونجاو دەبێ، کە بە باشترین شێوەو لە بەرژەوەندیی دەوڵەتدا کۆتایی پێ دێ، بە لەبەرچاو گرتنی ورەی دانیشتووان، بارودۆخ بۆ راپەرِینێکی سەرتاسەری دژی هەلومەرجی تێکچووی مهاباد، زۆر ئامادەیە و بێجگە لە بارزانییەکان هیچ کەسێکی دیکە لەبەردەست دانییە."[12] هەرچەندە ئیلخانی زادە، بەهۆی هاوکاریکردنی توندو تۆڵی لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی دا سەبارەت بە نارەزایەتیی خەڵك زیادەرِەویی کردووە، دیارە ئەو نارەزایەتییەش هەبوو، بەڵام گورزی سەرەکی حەمە رەشید لە کۆماری وەشاند. ئەو لە سەردەمی راگەیاندنی کۆماری مهاباد دا، لەلایەن قازی محەممەدەوە بە فەرماندەی سوپای بۆکان هەڵبژێرابوو و گەیشتبوە پلەی ژەنەراڵی، لە پرِێکا بێ هیچ پێشینەیەك پشتی لە قازی کردو رووی کردە عێراق. حەمید موئمنی دەنووسێ کە حەمە رەشید هەر لە سەرەتاوە سیخورِی ئینگلیزەکان بووەو بە مەبەستی گورز وەشاندن هاتبووە نێو کۆماری مهابادەوە.[13]

هەروەها "پسیان"یش باس لە کۆمەڵە بەڵگەیەك دەکا کە لە شەڕەکانی ساڵی ١٣٢٣ ١٩٤٤ز دا، لە ئۆردووگاکەی حەمە رەشید وەدەست هاتبوو کە پێوەندیی ئەو کابرایەیان لەگەڵ بریتانیاو سۆڤیەت دەسەلماند. ستادی لەشکر بۆ ریسواکردنی ئەو خانە کوردە لەنێو دەست و پێوەندەکانیدا، کەڵکی زۆری لەو بەڵگانە وەرگرت.(١٤)

سەرەنجام حکوومەتی مهاباد بەو پێوەندییە گوماناوییەی حەمە رەشید لەگەڵ بریتانیای زانیو بۆ مهاباد بانگهێشتنیان کرد، بەڵام خانی کورد کە دەیزانی لەوێ نەخشەی کوشتنی داڕێژراوە، سەرپێچیی ئەو فەرمانەی کردو دوای ئەوەی دێهاتە سنوورییەکانی ئێرانی تاڵان کرد، چۆوە سەر موڵکەکانی خۆی لە پێنجوێنی عێراقو بەو شێوەیە کە پشدەری دەنووسێ "بڕێکی زۆر چەك و تەقەمەنی و شتوومەکی کۆماری مهابادی لەگەڵ خۆی دا بردە عێراق."(١٥)

پشدەری بریتانیا بە هۆکاری ئەو هەڵگەڕانەوەیەی حەمە رەشید دەزانێو دەنووسێ: "ئینگلیزەکان لە پێناو بەرژەوەندییەکانیان، بەجیا لێی نزیك بوونەوەو هەڵیان خەڵەتاندو لە کۆماری مهابادیان دوور کردەوە."(١٦)

حەمە رەشید کە شێخ مەحموود بە رێگر نێوی بردووە، لە سەروبەندی خۆماڵی کردنی نەوتی ئێران دا، کۆمپانیای نەوتی ئێران و ئینگلیز بڕە پارەیەکیان دابوویەو ئەویش لە بەرامبەر دا لە سەردەمی سەرۆك وەزیریی دوکتور موسەدەق دا، کوردستانی کردە مەڵبەندی ئاژاوەو پشێوی، بەڵام بە هۆشیاری وابەستەیی سەربازی ئێران لە بەغدا، کە ئەفسەرێکی نەتەوەیی بوو، هەروەها بە هاوکاری و رێنمایی کوردەکانی عێراق کە مەیلێکیان بە لای موسەدەق دا هەبوو، ئەو پیلانە هەڵوەشێنرایەوەو حەمە رەشید نەیتوانی بە نیەتی خۆی بگا.(١٧) بەهەرحاڵ بانگەشەکەی مسەوەر رەحمانی راست بێ یان نا، رۆڵی حەمە رەشید لە رۆژەکانی کۆتایی حکوومەتەکەی قازی دا، وەك رۆڵێکی دروست و پەسند نەدەهاتە پێش چاو.

بەو شێوەیە رەوتی هۆزایەتی لە مانگەکانی کۆتایی تەمەنی حکوومەتی قازی لە مهاباد دا، تەواو بە لای دەوڵەتی ناوەندیدا شکابۆوەو هێزی سەربازی ئەو حکوومەتە بە شێوەیەکی بەرچاو کەم بۆوە، بەڕادەیەك کە تاکە پارێزەری لە ساڵی ١٣٢٥ ١٩٤٦ز دا بارزانییەکان بوون کە ٨٠٠ تا ١٠٠٠ چەکداریان هەبوو، هێزە نیمچە سەربازییەکانی مهابادی و هۆزی گەورکیش مەترسییەکی ئەوتۆیان بۆسەر لەشکری شا نەمابوو. بێشك یەکێك لە هۆکارەکانی پاشگەزبوونەوەی قازی لە شەڕ لەگەڵ لەشکری شادا ڕەچاو کردنی ئەو راستییە بوو.

# هەڵوێستی دانیشتووانی پارێزگای کوردستان لە ئاست ڕووداوەکانی مهاباد دا

هۆکارێکی دیکەی ڕووخانی کۆماری مهاباد، هەڵوێستی نێگەتیڤی کوردەکانی پارێزگای کوردستان سەبارەت بە ڕووداوەکانی باکوور بوو. گەورە پیاوان و گەورە موڵکدارانی ئەو ناوچەیە، بەهۆی دەستێوەردانەکانی یەکێتیی سۆڤیەتو لە ترسی کۆمۆنیزم، بەو بارودۆخەی باکوور خۆشحاڵ نەبوون و هیچ کەسێك نەیدەویست چارەنووسی خۆی لەگەڵ باکوور لێك گرێ دا. ئەوە بۆ یەکەمین جار بوو کە جیاوازییە کولتووری و سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکانی نێوان کوردەکان و ئازەرییەکانن هەروەها کاریگەرییەکانی هەستی نەتەوایەتیی کوردەکانی دراوسێ، دەرفەتی بە فۆرم گرتنی پرۆسەیەکی سیاسیی لە باکووری کوردستانی ئێراندا دەداو کوردەکانی باشووری کوردستانی ئێرانیش، کە پێش ڕەزاشا بەسەر چارەنووسی خۆیاندا حاکمبوون، دەخست بەردەم دووڕیانی هەڵبژاردنێکی مێژوویی لە نێوان ناسیۆنالیزمی کوردی و ناسیۆنالیزمی ئێرانی. سروشتییە کە باشووری کوردستانی ئێران، بەلەبەرچاو گرتنی کۆمەڵە هۆکارێك نەیدەویست و نەیدەتوانی خۆی بخاتە بەردەم هەڵبژاردنێکی لەم جۆرە.

سەرەتا دەبێ بزانین کە لەشکری ئێران و دیپلۆماتەکانی ئینگلیز لەوێدا، لەمپەرێك بوون لەبەردەم پێکهاتنی کەشوهەوایەکی ئازاد بۆ بڕیاردانی خەڵکانی ئەو ناوچەیەو بێجگە لەوەش کە کوردەکانی باشوور ئۆگرییەکی تەواویان بە زمان و کولتووری کوردی هەبوو، بەڵام مەیلی ئێرانی بوونیشیان هەر لەدڵ دابوو. لە دیدی ئەوانەوە ئەو پێوەندییە هاوبەش و چەند هەزار ساڵەیە لەگەڵ میللەتانی دیکەی ئێرانی، کارێکی دژوارو ئەستەم بوو، هەروەها کێبەرکێ و ڕکەبەریی نێوان سەرانی باشوور لەگەڵ کەسایەتییەکانی باکوور دا کە پێشتر دەسەڵاتێکی کەمتریان هەبوو، دەبووە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی کە کوردەکانی باشوور لە ئاست سەروەری و باڵادەستیی کوردەکانی باکوور کە ئێستا جڵەوی ڕووداوەکانیان بە دەستەوەیە، سەردانەوێنن، بۆ نموونە کەسێکی وەك سەردار موعەزەم ئاسف کوردستانی، هەرگیز ڕازی نەبوو لەژێر دەستی قازی محەممەد، سەیفی قازیو زێرۆبەگی هەرکی دابێ، دڵنیاش نەبوو لەوەی کە ڕووسەکان، چۆن لەگەڵ کەسێکی وەك ئەو دا، کە گەورەترین موڵکداری کوردستانە، ڕەفتار دەکەن.

یەحیا سادق وەزیری، لەبارەی تێڕوانین و دیدی سەردار موعەزەم، لە ئاست کارەکانی قازیو ڕووداوەکانی باکوور دا دەنووسێ:

"لە ساڵی (١٣٢٥) ١٩٤٦ز دا، کاتێك لە بارەی کۆماری مهابادەوە، گفتوگۆ دەکرا، سەردار موعەزەم پێی گوتم کە لەو مەسەلەیەدا رووسەکان دەوری سەرەکی دەگێڕنو قازی نەك تووشی هەڵە بووە، بەڵکو بۆتە ئامرازێکی بەردەستیشیانو ئاکامەکانی ئەو کارەش بەو زووانە ئاشکرا دەبێ، هەر بەو پێیە ئێمە کوردەکانی باشوور نابێ بەشداری ئەو مەسەلەیە بکەین."[18]

هەرەمەکانی دەسەڵات لە کوردستانی باشوور زۆر بە جیددی پێشگیرییان لە بڵاوبوونەوەی زایەڵەی گۆڕانکارییەکانی باکوور لە باشووردا دەکرد، ڕۆژنامەی "ڕەهبەر" ئۆرگانی حیزبی توودە، فیۆدالەکانی پارێزگای کوردستانو لەسەرووی هەمووشیانەوە (فەرەجوڵڵا خانی ئاسف)، سەرداری موعەزەم و ڕوحانییەکان بە لەمپەرێك لەبەردەم گەیشتنی پەیامی بزووتنەوەی کوردەکانی باکوور بۆ باشووری کوردستان، دەناسێنێو دەنووسێ:

"دەسەڵاتە خۆجێیەکان (محلی) لە پارێزگای کوردستاندا یەکسەر تۆمەتی لایەنگری کردنی بزووتنەوەکەی باکووری دەخەنە پاڵ هەر کەسێك نارەزایەتیی خۆی دەربڕێو لە سنەشدا خەڵکانێك بە تاوانی هەبوونی بیروڕای ئازادیخوازانەو بەو ناوەی کە گوایە لایەنگری لە بزووتنەوەکی باکوور دەکەن، دەستە دەستە، لە زیندانەکان دەپەستێون."[19] ڕۆژنامەی "ڕەهبەر" لەشوێنێکی دیکەدا ئاسف وەك دیکتاتۆرێك دەناسێنێ کە لە سنەدا فەرمانڕەوایی خۆی سەپاندووەو لەگەڵ پەرە ئەستاندنی کولتوور و باشبوونی تەندروستی لە کوردستاندا دژایەتی دەکا[20] تەنانەت هۆزەکانی باشووریش بەو شێوەیە لەگەڵ کۆماری مهاباد نەکەوتن، وێڕای ئەوەی کە حیزبی دیمۆکرات هەوڵی دەدا کە لە ڕێگەی ناردنی نامە و پێناسی ئەندامەتی و پڕوپاگەندە کردن، سەرۆکەکانی باشوور بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. بەڵام سەرکەوتنێکی ئەوتۆی لەو بوارەدا بەدەست نەهێنا. حەمید موئمنی دەنووسێ کە دوای هەڵکردنی ئاڵای کۆماری مهاباد، لەلایەن مەحموود خانی دزڵی لە هەورامان، هۆزەکانی هەورامانی تەخت و لهۆن و جوانڕۆییەکان پێوەندییان بە حیزبی دیمۆکراتەوە کرد، بەڵام داواشیان لە مەحموود خان کرد کە سەبر بگرێت تا هەلومەرج بۆ کارو تێکۆشان گونجاو دەبێ.[21]

بەو شێوەیە باشووری کوردستان نیشانی دا کە ئامادەی وەرگرتنی ناسیۆنالیزمی کوردی نییەو تەنانەت هەبوونی حکوومەتێکی کوردی لە باکووری کوردستان، نابێتە هۆی هاندانو وەجووڵە خستنیان.

# دژایەتیی روحانییەکان و رێبەرانی ئایینی لەگەڵ کۆماری مهاباد دا

روحانییەکان وەك خوێندەوارە نەریتییەکانی کۆمەڵگەی کوردی، لە دەیەی دەیەم و بیستەمی هەتاوی دا، خاوەن پێگەیەکی جیاواز لە سەردەمی مەشرووتە بوون، ئەوان لە سەردەمی مەشرووتەدا جڵەوی فکری کۆمەڵی کوردییان لەبەر دەست دابوو، ئەو ژمارە کەمەی بازرگانە کوردەکانیش کە هەلومەرجی رووسیەو عوسمانییان دیتبوو و لەگەڵ بیروبۆچوونە نوێیەکان دا ئاشناییان هەبوو، وەك رەقیبێك بۆ روحانیەتی کوردی نەدەژمێردران.

دوای هاتنە سەرکاری رەزاشا روحانییەتی کوردی بەهۆی نەمانی رۆشنبیرە بێلایەنەکانەوە، پێگەیەکی باشی دەسکەوت، بەڵام دوای هەنگاونانی کۆمەڵی ئێرانی بەرەو سێکۆلاریزم‌و دەرکەوتنی خوێندکاران‌و قوتابیان، واتە لە دایکبوونی توێژی رۆشنبیرانی مۆدێرن، تا رادەیەك لە گرینگی روحانییەتی کەم کردەوە. راستە کە روحانییە کوردەکان وەك میراتگری کولتوور و زمانی کوردی دژایەتییەکی زۆریان لەگەڵ ستەمی میللی حکوومەتی رەزاشا دا کرد، بەڵام دامەزراندنی سیستمێکی کوردی لەلایەن قازی محەممەدەوە، بەهاوکاریی سۆڤیەت، هیچ جۆش و خرۆشێکی نەخستە نێویانەوە، بۆیە شاهیدی پێشوازیی بەرفرەوان‌و بەرچاوی روحانییەتی کوردی لە یەکەمین سیستمی کوردیدا نین و ئەو توێژە هەموو هێزو توانای خۆیان بۆ هاوکاری و بەرەوپێش بردنی ئەو سیستەمە بەخەرج نەدا. لە هیچ سەرچاوەیەکدا باس لە هاوکاریکردنی روحانییەکانی باشووری کوردستانی ئێران لەگەڵ کۆماری مهاباد دا نەکراوە.

لە رۆژنامەی رێبەر دا، روحانییەکانی باشوور، بە دوژمنایەتی و دژایەتی کردنی قازی و هاوکاری لەگەڵ فیۆدالەکان و دەوڵەتی ناوەندی تاوانبار دەکرێن‌و نازناوی "ئاخوندە ریاکارەکان و کاسەلێسی فیۆدالەکان"یان لــێ دەنرێ.[٢٢]

بەم شێوەیە لە هاوکاریی روحانییەکانی ئەو ناوچەیە لەگەڵ شا دا، دەتوانین بڵێین کە مەیلێکیان بۆ هاوکاری لەگەڵ یەکەمین حکوومەتی کوردیی خودموختار لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا نەبووە، لە بانگەوازەکەی (محەممەد ئەمین خوئی) روحانیی شیعەکان بۆ زانا ئایینییەکانی کوردستان بەمەبەستی ئامادەبوونیان لە مزگەوتی سوڵتانی کە لە رێبەندانی ١٣٢٥دا ١٩٤٧ لە تاران بوون، سەبارەت بە هەڵوێستی دژایەتی کردنیان لەگەڵ قازی محەممەد و فرقەی ئازەربایجان دا، ستایش کران و رێزیان لــێ گیرا.[٢٣]

گرنگترین روخساری دژ یان لانی کەم بێ هەست لە بەرامبەر حکوومەتەکەی قازی محەممەد لەنێو روحانییەکانی باشووردا ئایەتوڵڵا مەردوخ (شێخ محەممەد) لە دانیشتووانی سنە بوو کە لە سەردەمی مەشرووتە و ئاژاوەکەی سالار ئەلدەولە دا زۆر چالاك بوو. ئەو لە وتووێژێکیدا لەگەڵ هەواڵنێری رۆژنامەی "ئیتلاعات" لە رێکەوتی (١٦ی بەفرانباری ١٣٢٥) ١٩٤٦ دا لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە خەڵکی کوردستان سەبارەت بە رووداوەکانی رابردوو چ بیروبۆچوونێکیان هەیە گوتی:

"جووڵانەوەکەی قازی تەنیا لە مهاباد دا کاردانەوەی هەبوو، لە بەشەکانی دیکەدا کەس وەڵامی بانگەوازەکەی نەدانەوە، ئەو هۆکاری ئەو مەسەلەیەی بە پابەندبوونی گەلی کورد بە شایەتی "اطیعوا الله و اطیعوا الرسول و اولی الامر منکم" زانی و گوتی هەرچەندە بارودۆخی ئابووری و کولتووری کوردستان باش نییە، بەڵام ئێمە بە دەوڵەتی ئێران وەفادارین..." [٢٤]

ئاماژەکردنی مەردوخ بە هەستی ئایینی خەڵکی کوردو روونکردنەوەکەی دوگلاس، کە گوایە قازی دەیویست هەنگاوەکانی خۆی لەگەڵ ئایەتەکانی قورئان و فەرمووده ئایینییەکانیدا بگونجێنێ، سەلمێنەری ئەو راستییەیە کە رێفۆرمخوازیی رێبەری کوردەکان لەبەر خاتری پشت بەستن بە سۆڤیەت و پێ خۆشبوونی روحانییەکان و خەڵکی ئایینی نەبووە. بەڵام لە باکووردا مەلایەکان هاوکاریی کۆماری مهابادیان کرد. تۆماس بوا لە هەڵوێست و رۆڵی روحانییەکانی باکووری کوردستان سەبارەت بە رووداوەکانی مهاباد دەکۆڵێتەوەو ئاشکرای دەکا کە بەشێك لە رووحانییەکانی ئەو ناوچەیە لەگەڵ خودموختاریخوازەکان دابوون، کە دەتوانین ئاماژە بە حاجی بابە شێخ (هەڵبەتە ئەو سەید بوو)و شێخ حەسەنی بورهان، شێخ عەبدوڵڵا فەندی گەیلانی، پشکۆ، چەکۆو سەید ئەحمەدی بارزانی بکەین." [٢٥]
حاجی بابە شێخ و شێخ محەممەدی بورهان، هەردووکیان لە بنەماڵەی سەیدەکانی زەمبیل بوون کە لە بۆکاندا دەسترۆیشتوو بوون. یەکیان سەرۆك وەزیری کابینەکەی قازی و ئەوەی دیکەشیان بوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیمۆکرات، شێخ عەبدوڵڵا فەندی، دەگەڕایەوە بۆ خانەدانەکانی ساداتی شەمزینان و لە پێشەوایانی تەریقەتی نەقشبەندی بوو، کە هەرچەندە لەگەڵ قازی دا زۆر یەکیان نەدەگرتەوە، بەڵام دژایەتیشی نەکرد. ئەو چەند شێخەی دیکەش لە راستیدا لە روحانییەکانی کوردی عێراق بوون. بێجگە لەوانەی کە (بوا) ئاماژەی پێ کردوون، دەتوانین مەلاحوسێن مەجدی ناوبەرین کە لە حکوومەتەکەی قازی دا وەزیری داد بوو، ئەو مامۆستای ئایینیی قوتابخانە دینییەکانی مزگەوتی بازاڕ و مزگەوتی سووری مهاباد بوو، لە نێو خەڵکیش دا زۆر خۆشەویست بوو. [٢٦]

لە بەرهەمەکانی ئەو زانا ئایینییە دەتوانین وەرگێردراوەی کتێبەکانی مەنتق و فەلسەفەی سەبزەواری بۆ زمانی فارسی نێوبەرین، کە گوایە هێشتا چاپ نەکراون، گومان لەوە دا نییە کە ئەو دەستە لە

پیاوانی ئایینی کوردی لەگەڵ قازی محەممەد کەوتن، کە پێشینەی خەباتی نەتەوەییان هەبوو، ئامانج و پەیامەکانی بزووتنەوەکە بۆ ئەوان روون و ئاشکراو جێگەی بایەخێکی زیاتر بوو. هەروەها دەبێ بزانین کە ئەو کەسایەتییانەش هەروەك قازی محەممەد، لە دەست رۆیشتووترین و خۆش نێوترین و خۆشەویستترین رێبەرانی ئایینیی کوردبوون، لەوانەشە یەکێك لە هۆکارەکانی ئۆگریی خەڵکی مهاباد لە حکوومەتەکەی قازی بێجگە لە هەستی ناسیۆنالیستانەیان، تەبلیغات و چالاکییەکانی ئەو رێبەرە ئایینییانە بووبێ. بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا لە باکوورو مەڵبەندی لە دایکبوونی کۆمەڵەی (ژ.ك) چەند کەسانێك لەو روحانیانە هەبوون کە مەیلێکیان بۆ هاوئاهەنگی کردن لەگەڵ رەوتی نەتەوەیی کوردەکان لە خۆیان پیشان نەدەدا، تەنانەت بە شێوەی ناڕاستەوخۆ لە مەرگی قازی دا دەستیان هەبوو. رێژیمی شا لە کاتی دادگایی کردنی (قازی)دا، نامەیەکی بە ناوی خەڵکی کوردەوە نووسیبوو، کە تێیدا داوا لە دەوڵەت کرابوو، رێبەری کوردەکانو کەسانی دەوروپشتی، بە تاوانی جیاخوازی و بەدنێوکردنی میللەتی کورد ئیعدام بکەن و زۆربەی روحانییەکانی کوردی باکوور ئەو نامەیان ئیمزا کردبوو. بەو شێوەیە مۆری پەسندکردنیان لە مەرگی قازی دا. روخساری ئایینییە دیارەکان کە ئەو نامەیەیان ئیمزا کردبوو بریتین لە: مەلا خەلیل رێبەری پێشووی مەنگوڕەکان، مەلا سەدیق پێشنوێژی مزگەوتی عەباس ئاغای مهاباد، مەلا محەممەد دریکی، شێخ عەبدولڕەحیم باجەوەندو ژمارەیەکی دیکەش." (٢٧)

بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە روحانییە کوردەکان نە بە حکوومەتی ناوەندی وەفاداربوون و نە لەرامبەر بە ناسیۆنالیزمی کوردییش بێ مەیلبوون، هۆی هاوکاری نەکردنیان لەگەڵ حکوومەتەکەی قازی دا، بۆ دڵنیانەبوون و بەدگومانیان لە رۆڵی سۆڤیەت و هەوڵە رێفۆرمخوازەکانی قازی دەگەڕێتەوە. بە گشتی دەتوانین بڵێین کە هەموو رێبەرە ئایینییەکانی باشوورو بەشێکی بەرچاوی هاوتاکانیان لە باکووردا، لە رووداوەکانی کوردستاندا لایەنی دەوڵەتی ناوەندییان گرت. ئەگەر هەست بە بەرپرسایەتی کردنێك لە نێو روحانییەتی کوردی لە ئاست کۆماری مهاباد دا هەبووایە، بە دڵنیاییەوە دەسەڵاتە فراوانەکەیان، لە مۆبیلیزەکردنی خەڵکی ئایینپەروەری کوردستان کاریگەریی بێ وێنەی دەبوو. هەڵسوکەوتی پیاوانی ئایینی کورد، دەری خست کە کۆمەڵەی (ژ.ك) و حیزبی دیمۆکرات نەیانتوانیوە رایەڵکەیەکی یەکگرتوو لە رێبەرانی ئایینی بە ئاقاری ئامانجە نەتەوەییەکانی خۆیاندا بەرن و رێکیان بخەن. کاردانەوەی روحانییەت لە ئاست کێشەی کورد دا، نیشانی دا کە ئەوان وێڕای پاراستنی ئۆگریی خۆیان بە زمان و کولتووری کوردی واتە هەمان ناسیۆنالیزمی کولتووری کورد، توندڕەوییەکانی رێبەرانی ناسیۆنالیزمی سیاسی کوردیش، پەسند ناکەن. لە ئەنجامیشدا هەر ئەو کاردانەوەیەو هاوکاری نەکردنەی ئەو توێژە بە شێوەیەکی جیددی لەگەڵ مهاباد دابوو، کە دیتمان خەڵکی کورد بێجگە لە خەڵکی مهاباد، وەجووڵە نەکەوتنو بە دڵنیاییەوە روحانییەکان لە پێکهێنانی ئەو بارودۆخە دا کاریگەربوون.

# هەڵە و خاڵە لاوازەکانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان

بۆ شارەزا بوون لەگەڵ یەکێك لە گرنگترین و سەرەکیترین هۆکارە نێوخۆیەکانی رووخانی خێراو لە ناکاوی کۆماری مهاباد پێویستە هەڵوێست و چالاکییەکانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان تاوتوێ بکەین، بۆوەی تێبگەین کە بۆچی حیزبی دیمۆکرات بەو رادەیە لە یەکێتیی سۆڤیەت نزیك بۆوەو لەسەر سیاسەت و بەڵێنەکانی ئەو حکوومەتە مایەی دانا؟ بۆچی حیزب نەیتوانی بەرگرییەکی هەمەلایەنە لە نێوان کۆمەڵانی خەڵك رێك بخا، لەگەڵ ئەوەی کە لە مانگەکانی کۆتایی حکوومەت کردنی دا، دەیزانی کە سۆڤیەت پەیمان و بەڵێنەکانی جێبەجێ ناکا؟ بۆچی رێبەران و ئەندامانی ئەو حیزبە دوای گەڕانەوەی دەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندی بۆ کوردستان، دوای سێ ساڵ لە رووخانی کۆمارو بە هاوکاریی حیزبی توودە توانیان هێدی هێدی حیزبەکە رێك بخەنەوە؟

پشت بەستنی بێئەندازەی حیزبی دیمۆکرات بە یەکێتیی سۆڤیەت و لێکگرێدانی چارەنووسی ئێران بە چارەنووسی فرقەی دیمۆکرات و پیشەوەری، لە هەڵە سەرەکییەکانی ئەو حیزبە بوو. چونکە مەسەلەی کوردی تێکەڵ بە سیاسەتی ئاڵۆزو شاراوەی هێزێکی جیهانی دەکرد.

حیزبی دیمۆکرات لە جیاتی نزیك بوونەوە لەگەڵ ئێران و ئەو هێزانەی کە نوێنەرایەتی دەکرد، لە هەلومەرجێکدا داوای هاوکاری لە یەکێتیی سۆڤیەت کرد کە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی لە مەیدانەکانی سیاسەت و ئابووری ئێراندا، ئامادەییەکی ناشەرعی هەبوو، رێگەدانی سۆڤیەت بۆ دەستێوەردان لە کاروباری نێوخۆیی ئێران، بە مانای بانگهێشتن بوو تا لە نفووزی سیاسیی و دەسەڵاتدا پشکدار بن، لە جیاتی کورتکردنەوەی دەستی ئینگلیزە تاڵانچییەکان، رووسەکانیش کە لە رواڵەتدا، بەرگرییان لە چینی زەحمەتکێش دەکرد، کردە هاوبەشی ئینگلیزەکان. ئەوە هەمان ئەو سیاسەتەیە کە حیزبی توودەو فرقەی دیمۆکرات، بۆ وەدیهاتنی لەو سەردەمەدا هەوڵیان بۆ دەداو بە سیاسەتی هاوسەنگی ئیجابی ناسراوە. کیانوری پێیوایە ئەو سیاسەتە بۆ ئەو مەبەستە کاری لەسەر دەکرا، تا بەرژەوەندییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت لە باکووری ئێراندا، لە بەرامبەر رۆژئاوا بەگشتی و بریتانیان بە تایبەت بپارێزرێ. ئەو لەو بارەیەوە دەنووسێ:

"... خۆپیشاندان و کۆبوونەوەکانی ئێمە دژی حکوومەتی ساعد، بە هاتنی شاندی کافتار زادە جۆرە گونجانێکی لێکەوتەوە. ئەو گونجانە ئەنجامێکی خراپی هەبوو. ئەنجامەکە ئەوە بوو کە حیزبی توودە بۆوەی نەوت بە سۆڤیەت بدرێ خۆپێشاندنیان دەکرد، هەڵبەت لە رۆژنامە حیزبییەکانیشدا

هێندێك شت لەو بارەیەوە دەنووسرا. هێندێك لە وتارەکان باسی ئەوەیان دەکرد کە بۆ راگرتنی هاوسەنگیی نەوتی باشوور، دەبێ جیاوکی نەوتی باکوور بە یەکێتیی سۆڤیەت بدرێ، رێبەری حیزبی ئێمە لەو کاتەدا پێی وانەبوو کە بتوانێ جیاوکی نەوتی باشوور لە دەست ئینگلیزەکان دەربێنێ. ئەویش بەو هەموو هێزەی کە هەیانەو ئەمریکاش پشتیوانیی لە ئینگلیز دەکرد، بۆیە دەمانگوت پێویستە "هاوسەنگی ئیجابی" پێك بێنن.[٢٨]

لەگەڵ ئەوەی کە حیزبی دیمۆکرات حیزبێکی لیبراڵ بوو، بەڵام مامەڵە کردنی لەگەڵ کێشەی کوردو کێشەکانی ئێراندا، ئەو حیزبەی خستبووە نێو چوارچێوەی هاوکاریکردنی بێ چەند و چوونی یەکێتیی سۆڤیەت و پەسندکردنی سیاسەتەکانی. هەڵبەت تەوەری ئەو پێوەندییانە هەمان سیاسەتی راگرتنی "هاوسەنگی ئیجابی" بوو. بەڵام ئەو هاوکارییەش لەسەر بنەمای واقعبینییەکی سیاسیی دانەمەزرابوو. زیاتر لە وەدواکەوتن و پێڕەوی کردنێکی بێ ئەم لاو ئەو لای مۆسکۆ دەچوو. بۆ نموونە رێبەری حیزبی دیمۆکرات بێ ئەوەی ئەو زەرەرو زیانانەی رێکەوتننامەی نەوتی ئێران و سۆڤیەت یان هەمان رێکەوتننامەی ناسراو بە قەوام ـ ساوچیکۆف، لەبەرچاو گرێ، پەسندکردبوو و پشتیوانیی لە جێبەجێکردنی کرد. نووسەری وتاری مهاباد و قازییەکان باس لە چەند بەڵگەنامەیەك دەکا کە ئەفسەرانی لەشکری شا بەدەستیان هێنابوو و بەپێی ئەو بەڵگەنامانە، حکوومەتی مهاباد، بە پێدانی جیاوکی سەرچاوە نەوتییەکانی ئێران بە یەکێتیی سۆڤیەت بە رێژەی (٥١و ٤٠٪ )رازییە.[٢٩]

ئێستا کیانووری وەك پلەبەرزترین بەرپرسی حیزبی توودە لە رابردوودا دەڵێ کە گرتنەبەری سیاسەتی "هاوسەنگیی ئیجابی"و پێداگرتن لەسەر دانی جیاوکی نەوت بە سۆڤیەت لە هەڵەکانی ئەو حیزبە بووەو خراپ بەسەرمان دا شکاوەتەوە.[٣٠]

بۆیە دەبێ بپرسین ئەو هەموو بڕوایەی حیزبی دیمۆکرات بە سۆڤیەت لە چییەوە سەرچاوەی دەگرت؟

وەڵامەکە ئەوەیە کە حیزبی دیمۆکرات لە جێگەی گرتنەبەری رێوشوێنێك بۆ رێکخستن و کۆکردنەوەی خەڵك و ئاراستەکردنی تواناکانیان بەمەبەستی گەیشتن بە مافەکانیان لە هەلومەرجێکی پڕ لە ئاشتیدا، دەیویست بە پشتبەستن بە چەك و پشتیوانی دەرەکی دامەزراوێکی سیاسیی کورد پێك بێنێ. بەڵام ئەو توندڕەوییەی حیزب کە رێبەرێکی توندڕەوو "یۆتۆپیست" وەك قازی محەممەد تەوژمێکی دیکەی بەو رەوتە دابوو، لە ئاکامدا شکستێکی پڕ لە ئازاری لێکەوتەوە. ئێستا دوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ وەك ماجەراجوویەکی سیاسیی دێتە پێش چاو. دامەزراندنی لەشکری حیزبی، رەتکردنەوەی هەرچەشنە پێوەندی گرتنێکی خەڵکی کورد لەگەڵ نەتەوەکانی

دیکەی ئێران و لەبەرچاو نەگرتنی چارەنووسی مێژوویی ئەو نەتەوانە بەدرێژایی هەزاران ساڵ، بە دەستەوە نەدانی پێناسەیەکی یاسایی لە داوای کوردەکان، کە لەگەڵ هەلومەرجی کوردستان و یاسایی بنەڕەتیی ئێران لەو کاتەدا بگونجێ، پێداگرتن لەسەر بەدەستهێنانی جۆرێك خودموختاریی رەها کە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ سەربەخۆییدا نەبوو، هەموویان بیروبۆچوون و کردەوەکانی حیزبی دیمۆکرات تا چوونە دەرەوەی لەشکری سوور لە ئێران دابوون. بەڵام دوای رۆیشتنی رووسەکان رێبەرانی حیزب، بەرەبەرە ناچاربوون راستییەکان بسەلمێنن و دروشمی دیمۆکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستانیان بۆ یەکەمین جار هێنایە گۆڕێ.

دەستێوەردانی رووسەکان لە کاروباری کوردستاندا، بووە هۆی ئەوەی کە هێنانە گۆڕی کێشەی کورد، بەردەوام لەگەڵ یادەوەری مەترسیی کۆمۆنیزم و دابەشبوونی ئێراندا، یەك بگرنەوە، بەو مانایەی کە ئیدی کوردەکان بەبێ تاوانبارکردنیان بە هاوکاریی سۆڤیەت و جیاخوازی، نەیان دەتوانی قسەیەك لە مافەکانی خۆیان بکەن. ئاشکراشە کە رژێمی شا ئەو بیرۆکەیەی پەرە پێدا. نووسەرکانی کتێبی "هاوسێکانی باشووری سۆڤیەت" ئاماژە بەو خاڵە دەکەن کە کەمبوونەوەی بزووتنەوە سیاسییەکانی کورد و ئارامی و ئاسایشێکی رێژەیی کە دوای شکستی حیزبی دیمۆکرات لە کوردستاندا پێك هاتبوو، سەرچاوەکەی بۆ کەمبوونەوەی جووڵە و نفووزی دیپلۆمات و کۆنسوولەکانی رووس لە ئازەربایجان و کوردستان بەتایبەت دوای کوودەتای (٢٨ی گەلاوێژی ١٣٣٢)و هاتنە سەرکاری حکوومەتی زاهدی، دەگەڕێتەوە هەروەها ئەوەش پێشان دەدەن کە دەوڵەتی ئێران کۆنسولگەری سۆڤیەتی لە ورمێ داخست و سەفەری نوێنەرە بازرگانە رووسەکانی بۆ ئەو ناوچەیە تەنیا لە رێگەی وەرگرتنی ئیجازە نامەی تایبەتییەوە دەکرا.[٣١]

حیزبی دیمۆکرات نەك هەر بە هاوکاریی رووسەکان و پشتبەستنی بە دەوڵەتێکی کۆمۆنیستی، کێشەی کوردی هاوکات لەگەڵ دەمەترسی کەوتنی یەکێتیی خاکی ئێران، هێنایە گۆڕێ و بووە هۆی ئەوەی کە جیهانی دەرەوە، هەر بزووتنەوەیەکی کوردی ئێرانی لە داهاتوودا بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان، بە فیتی سۆڤیەت بزانێ، بەڵکو تووشی هەڵەیەکی دیکەش بوو کە لەوەی پێشێ کەمتر نەبوو، ئەویش ئەوەیە کە تەنانەت دوای سێ ساڵ رووخانی کۆماری مهاباد، لەبەر ئەوەی توانای چالاك کردنی نەبوو، دووبارە ناچار بۆوە پەنا بەرێتەوە بەر سیاسەتی سۆڤیەت و بە هاوکاری حیزبی توودە توانی خۆی رێك خاتەوە. کەریمی حیسامی دەنووسێ:

"دەبێ سەرنجی ئەو خاڵە بدەین کە حیزبی توودە بۆ سەرلەنوێ زیندووبوونەوەی حیزبی دیمۆکرات هاوکاریی کرد."[٣٢] بیژەن جەزنی ئاماژە بە رۆڵی حیزبی توودە لەو رووداوانەدا دەکاو دەنووسێ:

دیموکرات پێکهاتنەوەو پاشان حیزبی توودە...

"دووبارە لە ساڵی (١٣٢٦) (١٩٤٧) شانەکانی حیزبی دیموکرات پێکهاتنەوەو پاشان حیزبی توودە (بەپێچەوانەی ئازەربایجان) بەنێوی حیزبی دیموکرات لە کوردستاندا کاری دەکرد."[٣٣]

بەوشێوەیە حیزبی دیموکرات بەبێ ئەوەی دەرس لەخیانەتی رووسەکان لەگەڵ خەڵکی کورد وەرگرێ، دیسان رووی لە حیزبی توودەی ئێران و رەوتی چەپ کردەوە، بەو هاوکاریکردنەش بۆ جاری دووهەم شانسی هاوکاریکردن لەگەڵ رەوتە نەتەوەییەکانی ئێرانی لە دەستدا. رەوتێك کە ئێستا بە رێبەرایەتیی بەهێزێ دوکتور موسەدیق و لەچوارچێوەی سیاسەتی - هاوسەنگی سەلبی - (موازنە منفی) سەرقاڵی خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران و دەرکردنی ئینگلیزەکان بوو، هەر بەو هۆیەشە کە حیزبی دیموکرات لە سەرویەندی خەباتی خۆماڵیکردنی نەوت دا، تا رادەیەك بێدەنگی هەڵبژاردبوو و بۆ هاوکاریکردنی هێزە نەتەوەییەکانی ئێران و هاوکاری گەلی ئێران هەوڵێکی ئەوتۆی نەدا. چونکە پێی وابوو کە نەتەوە پەروەرەکان کاتێك دەسەڵاتی خۆیان جێگیر دەکەن، تەنیا ئامادەن هێندێك چاکسازیی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیی تایبەت لە کوردستاندا ئەنجام بدەن، مەسەلەیەك کە لەگەڵ دروشمە نەتەوەییەکانی ئەو حیزبە دا نەدەگونجا. ئیدی ئێستا وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە زۆر سەخت نییە کە بۆچی حیزبی دیموکرات لە جیاتی دامەزراندنی پێوەندییەکی نزیکتر لەگەڵ خەڵکدا، خەریکی پەیداکردنی هاوپەیمانەکانی بوو لە دەرەوەی کۆمەڵگەی کوردیدا. بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە حیزب بەو دروشمە ناسیۆنالیستییانەی خۆی، نەیتوانی دێهاتەکان و جوتیارانی کورد کە پێویستییان بە باشترکردنی هەلومەرجی ژیانیان هەبوو، لە دەوری خۆی کۆکاتەوە، لەوێوە حیزبی دیموکرات بەرهەمی تێفکرینی نەتەوەپەرستەکانی شارنشین و کوردستانی عێراق بوو، دروستکردنی پێوەندی لەگەڵ شارنشینەکاندا ئاسانتر بوو، کەمتر ئاوڕیان لە دێهاتییەکان و هۆزەکان دەدایەوە، لەبەر ئەوەی کە ئەو دوو گرووپە زۆرینەی دانیشتووانی کوردستانیان پێك دەهێنا، لە راستیدا حیزبی دیموکرات لە گەیاندنی پەیامی خۆی بۆ خەڵکی کورد دوچاری گیروگرفت ببوو. عەبدوڵڵا پشدەری کەموکوڕیی سەرەکیی حیزب بەو شێوەیە هەڵدەسەنگێنێ:

"حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە رادەی پێویست لە نێو چینی جووتیار و کرێکاردا چالاکیی نەبوو، بۆ رێکخستن و راکێشانیان بۆ مەیدانی خەباتی شۆڕشگێڕانە هەنگاوێکی هەڵ نەهێنابۆوە ئەگەر حیزبێکی سیاسیی بنەماو پایەیەکی بەهێزی لەنێو خەڵك دا نەبێ، هەرگیز ناتوانێ لەبەردە هەرەشە سەربازی و سیاسییەکانیدا بوەستێ و درێژە بەکاری خۆی بدا."[٣٤]

لە قسەکانی پشدەری ڕا دەردەکەوێ کە حیزبی دیموکرات کەرەسە و بەرژەوەندی پێویستی کۆکردنەوەی خەڵکدا کە بە ناچاری دەبووایە لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی ورد بۆ بەدەستهێ

دادپەروەریی کۆمەڵایەتیدا ڕێك بخرێن، لەبەردەست دانەبووە. بیژەن جەزنی، ئاماژە بەو مەسەلەیە دەکا کە زۆرینەی خەڵك لە ڕووداوەکانی مهاباد دا بەشدارییەکی بەرفراوانیان نەبووەو تەنیا "وردەبۆرژواکانی شارنشین هێزی سەرەکیی جووڵانەوەی دیمۆکرات بوون، هۆزەکان و جووتیاران ڕۆڵی سەرەکییان لەو بزووتنەوەیەدا نەبوو."(٣٥)

ئێستا ئەوەش دەزانین کە بۆچی حیزبی دیمۆکرات دوای ئەو گورزەی لە ساڵی ۱۳۲۵ ۱۹٤٦ز دا لە لایەن ڕێژیمی شاوە لێی درا، نەیتوانی زوو بە خۆیدا بێتەوەو بە ناچاری پێویستیی بە هاوکاری و پێوەندی گرتن لەگەڵ جووتیاران و وەلاوەنانی ئەو کەموکوڕییە دوای سەرلەنوێ بەخۆداچوونەوەی، بە ڕێنمایی حیزبی توودە هەبوو. کەریمی حیسامی وێڕای ئاماژەکردن بە سیاسەتی تازەی حیزب بۆ شێوەی ناڕاستەوخۆ بانگەشەکانی پشدەری و جەزنی وەڕاست دەگێڕێ، ئەو بەو شێوەیە باسی مەسەلەکە دەکا:

"ئەو جارەیان حیزبی دیمۆکرات خەباتی خۆی بە تەنها لە چوارچێوەی مەسەلەی نەتەوایەتیدا نەهێشتەوە، بەڵکو خەباتی میللی لەگەڵ خەبات بە دژی سیستمی خان خانی و لە نێوبردنی دیاردەی ئەرباب و ڕەعیەتی و ئازادیی جووتیاران لە چنگی زوڵم و زۆری مولکدارە گەورەکان (کە زۆربەیان سەر بە ڕێژیمی شا بوون)، هەماهەنگ کردو دەستی دایە چالاکیی سیاسیی و هۆشیارکردنەوەی دانیشتووانی دێهاتەکان و شێوەکانی حکوومەتی دیکتاتۆری پاشایەتی و سیاسەتی قۆرخکردنی مولکدارە خائینەکانی سەر بەو ڕژێمەی پێناساندن."(٣٦)

حیزبی دیمۆکرات پێی وابوو، کە خەڵکی کورد تەنیا لە ڕێگەی ناسیۆنالیزمی کوردو وەدیهاتنی امانجەکانی، بە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی دەگا، بەڵام ئەگەر ئەو بیروبۆچوونە ڕاست بووایە، بۆچی کوومەتی مهاباد، بێجگە لە خەڵکی مهاباد نەیتوانی هەستی دڵنیایی و هاوکاری کوردەکانی یکە بۆ لای خۆی ڕابکێشێ؟ ئەگەر هەستی هۆشیاربوونەوەی کورد لە نێو کوردەکانی ئێراندا بەو دەیە بەهێز بوو، کە ڕێبەرانی حیزبی وا لێکردبوو لەو پێناوەدا چەك هەڵگرن، بۆچی لایەنگری ووتنەوەیەکی خۆڕسك، لە ئاست دروشم و بانگەوازەکانی حیزبدا پێك نەهات؟ نەبوونی ودۆخێکی لەو جۆرە لە نێو کوردەکاندا، دەریخست کە کوردستانی ئێران لە قۆناغی یەکەمدا بۆ یشتن بە ماف و بەرژەوەندییەکانی پێویستیی بە چاکسازیی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەیەو ولەکانی ڕەزاخان بۆ سڕینەوەی فەرهەنگ و زمانی کوردی لە لایەن کوردەکانەوە بە مانای ینەوەی ئەو فەرهەنگ و زمانە لە لایەن کۆمەڵی ئێرانییەوە نەبووە.

کوردەکان بەپێچەوانەی قازی و ئەندامانی حیزبی دیمۆکرات، تاوانەکانی ڕەزاشاو ستەمە میللییەکەیان، نەخستۆتە سەرشانی کۆمەڵگەی ئێرانی، هەڵسوکەوت و کاردانەوەی خەڵکی کورد لە ئاست پان کوردیزمی حیزبی دیمۆکرات دا، بانگەشەکەی داریوش فرووهەر وەڕاست دەگێڕێ کە پێی وایە:

" لە ئێراندا بەپێچەوانەی عێراق، تورکیە و سووریە، ناسیۆنالیزمی کوردی هەر لەسەرەتاوە، لەسەر بنەمای جیاوازیی شوناسی نەتەوەیی و جیاوازیی میللەتی کورد لەگەڵ گەلانی دیکەی ئێراندا بنیادنەنرا، بەڵکو ئەو ناسیۆنالیزمە لە ئەنجامی بێبەشبوونی ئابووری و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی مافی یەکسان لەگەڵ هاووڵاتیانی دیکەی ئێرانییەوە، سەرچاوەی گرتووەو داواکردنی مافە نەتەوەییەکان زیاتر بەهانەیەك و ئامرازێکە بۆ بەدەستهێنانی مافە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، چونکە ئەگەر ئەو مامەڵە نادروستەی ڕژێمی شا ئەویش بۆ ماوەیەکی کورت لەبەرچاو نەگرین، ئەوا کوردەکانی ئێران بۆ نووسین و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی کوردی بە تەواوی ئازاد بوون."(٣٧)

ئەو دادوەری کردنە دروست و میانەڕەوەش لەگەڵ قسەکانی قازی محەممەد یەك دەگرێتەوە کە لە پووشپەڕی (١٣٢٥) ١٩٤٦ز دا کاتێك لە تاران بوو، لە وەڵامی پرسیارەکانی هەواڵنێری ڕۆژنامەی "ڕێبەر" دا دابوویەوە،:

"حیزبی دیمۆکرات ریشەی خۆی لە نێو نارەزایەتی و ستەمدیدەیی دێرینی میللەتی خەڵکی کورددا داکوتاوە، هەرچەندە پێشینەیەکی دوورو درێژتری هەیە، بەڵام لە راستیدا نۆ ساڵ بەر لە ئێستا بەو شێوە نوێیە بەکردەوە دەستی بە چالاکی کرد "کومیتەی ناوەندیی حیزب لە مهابادە"، نوێکردنەوەی چالاکییەکانی حیزبی ئێمە کاردانەوەیەك بوو لە بەرامبەر فشاری دەوڵەتە کۆنەپەرستەکانی پێش ئەو دەوڵەتەی ئێستا کە دەیانویست لەگەڵ هەر چەشنە بزووتنەوەیەکی لایەنگری ئازادی و سەربەخۆیی ئێران دا دژایەتی بکەن."(٣٨)

لە راستیدا پێداگرتنی قازی و حیزبی دیمۆکرات بۆ ئەنجامدانی چاکسازیی ئابووری و فەرهەنگی، دەیتوانی ببێتە بنەمایەکی یاسایی بۆ داوا سیاسییەکانی کورد لە داهاتوودا. بە واتایەکی دیکە هەنگاونان رووەو چاکسازیی ئابووری، زیاتر لە پروپاگەندەی نەتەوەییانە، کۆمەڵی کوردی دەگۆڕیو لانی کەم ئەو باشییەی هەبوو کە لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمی بریتانیادا، بەرەیەکی یەکگرتووی لە هەموو نەتەوە ئێرانییەکان لە بەرامبەر کۆلۆنیالیزمدا پێك دەهێناو فۆرمێکی تازەی لە یەکێتیی میللیی ئێران دەخستە روو.

ئاكامی هەرە گرینگی ڕووداوەكانی باكووری كوردستانی ئێران لە میانەی ساڵەكانی ١٣٢٠ ـ ١٣٢٥ی هەتاوی ١٩٤١-١٩٤٦ز دا، دەركەوتنی ناسیۆنالیزمی سیاسیی كورد لە ئێران دایە، تا پێش پێكهاتنی كۆمەڵەی ژ.ك و تێكهەڵچوونی لەگەڵ ڕووداوەكانی (١٣٢٥) ١٩٤٦ز هەتاویدا، دیاردەیەكیان بەنێوی ناسیۆنالیزمی كورد لە ئێران دانەبوو و جووڵانەوەكانی (شێخ عوبەیدوڵڵاو سمكۆ) وێڕای ئەوەی كە هێندێك ئامانجی سیاسییان هەبوو، بەڵام نە لە دەركەوتن و نە لە گەشەكردنیاندا، كاریگەری دیاردەیەكی ئەوتۆیان (ناسیۆنالیزمی كوردی)یان لەسەر نەبوو. زێدی لە دایكبوونی ناسیۆنالیزمی كوردی لە ئێراندا باكووری كوردستانی ئێران بوو. ئەو جیاوازیو تایبەتمەندییانەی كە لەچاو باشووردا لێی بەهرەمەندبوو، سەرەنجام زەمینەی لەدایكبوون و گەشەكردنی ئەو دیاردەیەی ڕەخساند. بەڵام دەركەوتنی ناسیۆنالیزمی كوردی بەنۆبەی خۆی، درێژكراوەی چەند دیاردەیەكی دیكەیە، كە لە ئەنجامی بێهێزی و بێتوانایی وڵات لە ساڵەكانی كۆتایی حكوومەتی قاجارەكان و سەرنەكەوتنی مەشرووتە و لە ڕاستیدا پاشەكشە و گۆشەگیریی ناسیۆنالیزمی ئێرانی لە سەردەمی ڕەزاشادا دەركەتبوون، كە گرنگترین ئەو دیاردانە بریتی بوون لە:

١ـ دەركەوتنی ڕاستییەك بە ناوی ستەمی میللی كە یەكێك لە ئەنجامەكانی حكوومەت كردنی ڕێژیمی ڕەزاشا بەسەر ئێران دابوو كە لە باكووری كوردستانی ئێران زیاتر و توندتر لە ناوچە كوردنشینەكانی دیكە هەستی پێدەكرا. ستەمی میللی لەو ئاواتەی ڕەزاشاوە سەرچاوەی دەگرت كە دەیویست فەرهەنگی كەمینەكان لەناو بەرێ‌و تاكە نەتەوەیەك بە فەرهەنگێكی یەكگرتوو و زمانێكی یەكگرتوو دروست بكاو بەرگێكی ڕۆژئاواییانەشی لەبەر بكا.

٢ـ دیكتاتۆریی ڕەزاشا بووە هۆی پچڕانی پێوەندیی كوردەكانی ئێران لەگەڵ ناسیۆنالیزمی ئێرانیدا، ئەگەر مەشرووتە لە سەردەمی پەهلەویدا، دەرفەتی گەشەكردنی پەیدا كردبا، ئیمكانی ئەوە هەبوو كە كوردەكان هەروا بە ئامانجەكانی وەفادار بمێننەوە، لە ڕاستیدا لە ئەنجامی پچڕانی پێوەندیی كوردەكان و ناسیۆنالیزمی ئێرانی، هەستی نەتەوەیی كورد گەشەی كرد.

٣ـ چالاكیی چڕوپڕی ناسیۆنالیستە كوردەكانی عێراق و توركیە بوو بە هەوێنێك بۆ گەشەكردنی ڕۆحی كوردیی كوردەكانی باكووری كوردستانی ئێران و دروستبوونی ناسیۆنالیزمی

کوردی لە ئێراندا، کوردەکانی دراوسێی ئێران، باکووری کوردستانی ئێران (وەك شوێن)و سەردەمی پێش رووخانی رەزاشایان (وەك کات) بۆ ناردن و گەشەپێکردنی ناسیۆنالیزم بۆ ئەو بەشەی کوردستان هەڵبژارد، ئەوەش نیشاندەری هەستیاربوونی هەلومەرجی کوردەکانی ئێران لەو سەردەمەداو دەرکەوتنی ستەمی میللی لە لایەن رێژیمی رەزاشاوەیە، دەنا ناسیۆنالیستە کوردەکان پێش سەردەمی پەهلەویش، چالاك و کارابوون، بەڵام هەرگیز هەستمان بەوە نەکرد، کە بەو شێوە ئاشکراو فراوانە لە نێو کوردەکانی باکووردا مایە دابنێن.

٤ـ هەبوونی یەکێتیی سۆڤیەت لە باکووری کوردستانی ئێراندا و ئەو گەلاڵانەی کە پێشتر بۆ جیاکردنەوەی ئازەربایجان ئامادەی کردبوو، دەرفەتێکی مێژوویی بێ وێنەی بۆ کۆمەڵەی (ژ.ك) رەخساند، تا سیستەمێکی سیاسیی لەسەر بنەمای بیروبۆچوونەکانی خۆی دابمەزرێنێ، کوردەکانو بە تایبەتی حیزبی دیمۆکرات ئەورۆ سەرنجی ئەو راستییە نادەن کە یارمەتیی سۆڤیەت بۆ لەدایکبوونی ئەو کۆمارە شتێکی کاتیو بە رێکەوت بووەو گەڕانەوە بۆ ئەو یادەوەرییەو پێداگرتن بۆ سەرلەنوێ زیندوو کردنەوەو ئامانجەکانی ئەو رووداوە یان بەشێکی ئامانجەکانی، دەبێتە هۆی دروستبوونی کۆسپ و تەگەرە لەسەر رێگەی بەشداریکردنی هەرچی زیاتری کوردەکان لە کاروباری ئێراندا.

٥ـ سەپاندنی قازی محەممەد، کەسایەتیی ئایینی و دەستڕۆیشتووی مهاباد، بەسەر کۆمەڵەی (ژ.ك) دا لە لایەن سۆڤیەتەوە، ئەویش لەبەر توندڕەوی و یۆتۆپیستییەکەی هەر لە سەرەتاوە ئەو حیزبەی رووەو خەباتی چەکدارانەو پشت بەستنی یەکلایەنە بە سۆڤیەت و پێشنیارکردنی جۆرێك خودموختاری رەها پاڵ پێوەنا کە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ سەربەخۆییدا نەبوو.

کۆماری مهاباد تا پێش لە دەرچوونی لەشکری سوور، رووەو جیاکردنەوەی کوردستان هەنگاوی دەنا، بەڵام دوای رۆیشتنە دەرەوەی لەشکری سوور، دروشمی دیمۆکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستانی هەڵگرت، تا ئێستاش حیزبی دیمۆکرات ئەو دروشمەی هەڵگرتوە، حکوومەتی خودموختاری کورد بەهۆی پێکهاتەی هۆزایەتیی کۆمەڵگەی کوردی نەیتوانی روخساری دەوڵەتێکی شۆڕشگێڕی پیشان بدا، بەڵام سەلماندی کە بۆ بەکردەوەیی کردنی چاکسازییەکانی جێگەی باوەڕی خۆی، لە کاتی هەبوونی هەلومەرجی گونجاودا، لەچاو حکوومەتە گەندەڵەکانی پەهەلەوی توانایەکی زیاتری هەیە، بەڵام هۆکارەکانی رووخانی کۆماری مهاباد دەبێ لە سێ خاڵ دا کورت بکەینەوە:

١ـ نەمانی یارمەتیی سۆڤیەت و پشتیوانی نەکردنی لە کوردەکان،

٢ـ دژایەتی کردنی هۆزەکان و کەسایەتییەکان و مولکدارە گەورەکانی کورد لە باشووری کوردستانی ئێران،

٣ـ لاوازی حیزبی دیمۆکرات لە پێکهێنانی پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵك و سنووردارکردنی بزووتنەوەکە بۆ باکوور، وای کرد کە چاکسازییەکی ئەوتۆ ئەنجام نەدرێ، بۆیە هەموو توانا و وزەی حیزب لە بلاوکردنەوەی هەستی نەتەوەییدا بەکاردەهێنرا، کە تەنیا لە مهاباد دا کرپارێکی جدیی هەبوو.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە دەرکەوتنی کۆماری مهاباد، بەهۆی رۆڵی نێگەتیڤی هێزێکی دەرەکی، یۆتۆپیخوازی لە رادەبەدەری رێبەرەکەی و پێشوازی نەکرانی گەرم و بەرچاوی هەرەمەکانی دەسەلاتی نەریتی کۆمەڵگەی کوردی لە ناسیۆنالیزمی کوردی، شکستی هێناو وەسەرپێ نەکەوت. بەلام لە بەرامبەردا، هەستی خودهوشیاری "کورد" بوونی لە نێو کوردەکان بەگشتی و قوتابیانی زانکۆو خوێندەوارانی کورد بە تایبەتیدا، راپەڕاندو لەو رووەوە، کوردستانی ئێران، هەلکەوتنێکی وەك کوردەکانی تورکیە و عێراقی بەدەست هێنا، جەوهەرو نێوەڕۆکی داواکانی کۆماری مهاباد دوای چوونەدەری رووسەکان و هێنانە گۆڕێی دروشمی دیمۆکراسی بۆ ئێرانو خودموختاری بۆ کوردستان، لە پشکداربوون لە دەسەلاتدا و بەدەستهێنانی خودموختارییەکی گونجاو، کورت دەکرێتەوە. هەرچەندە دەبوایە کە دەوڵەت و کۆمەڵی ئێرانی هەلێنابایەوە چەند هەنگاوێکیان رووەو سەرلەنوێ راکێشانی کوردەکان، بۆ نێو ناسیۆنالیزمی ئێرانی کە وەك پێویست نابێ هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ ناسیۆنالیزمی کوردیدا هەبێ، ، ئەو کارەش بە پێکهێنانی ئالوگۆڕو لە ژێرخانی ئابووری و کۆمەلایەتی لە ناوچە کوردنشینەکاندا دێتە دی و جێبەجێ دەبێ.

# پەراوێزەکان

## بەندی یەکەم:

١ـ کاروانێك لە شەهیدانی کوردستانی ئێران ـ کەریم حیسامی (سنە، روزبە، ١٩٧١) ل ١١ ـ ١٢

2- The Kurds – ARFA.HASSAN (London. Oxford university press 1968) PP68 – 69

٣ـ در آخرین روزهای رضا شاه ـ ریچارد استوارت، ترجمه کاوه بیات و عبدالرضا هوشنگ مرادی، چاپ دوم (تهران، معین، ١٢٧٠) ص ٣٢٢.

4- ARFA. Op. Cit... PP 69-70

٥ـ روزنامه رهبر ـ سال چهارم، ش ٧٦٥ ـ جمعه ٢١ تیرماه ١٣٢٥ ـ ص ١ و ٢.

٦ـ سازمان اسناد ملی ایران ـ سند شماره ٤٨ ـ ١١٢٠٠١

٧ـ خاطرات زندگی پرماجرای د. آسو "چهره مهاباد" به قلم دکتر آسو (قادر محمودزاده) ـــ مقدمـه و توضیح از پـدرام (زوزان) ـ (تهران، هور، ١٢٧٣) صص ١٢١ ـ ١٢٣.

٨ـ قاضی محمد، حمید رضا جلالی پور (تهران، انتشارات امیرکبیر، ١٣٦٩) صص ٢٢ ـ ٢٤ ARFA, op. cit – p27.

٩ـ خاطرات سیاسیی فرخ، سید مهدی فرخ با معتصم السلطنه، به اهتمام و تحریر پرویز لوشانی ـ ٣ جلـد ـ (انتشـارات سپهر، ١٣٤٧) ج ٢ـ ص ٩٧٩.

١٠ـ قاضی محمد ـ جلالی، صص ٢٣ ـ ٢٥/ خاطرات دکتر آسو، صص ١٢١ ـ ١٢٤

11- ARFA, op. cit – p71 .

12- The Kurdish Republic of 1964. William Eagleton. JR (London. Oxford .university press. 1963) pp23 – 24

١٣ـ قاضی محمد ـ حمید رضا جلالی پور، صص ٣٣ ـ ٣٤.

١٤ـ سازمان اسناد ملی ایران ـ سند شماره ٥٤ ـ ١١٢٠٠١.

١٥ـ سەرچاوەی پێشوو، سەنەدی ژمارە ٢٦ـ ١١٢٠٠١.

١٦ـ سەرچاوەی پێشوو، سەنەدی ژمارە ٩٨ ـ ١١٢٠٠١.

١٧ـ جنبش ملی کرد ـ کریس کوچرا، ترجمه ابراهیم یونسی (تهران، انتشارات نگاه، ١٣٧١) صص ١٩٦ ـ ٢٠٥.

١٨ـ سەرچاوەی پێشوو صص ٢٠٣ ـ ٢٠٥.

١٩ـ خاطرات و خاطرات، رحیم زهتاب فرد (تهران، وستیار، ١٣٧٣) صص ١٣٧ ـ ١٤١.

## بەندی دووهەم

١ـ جنبش ملی کرد ـ ص ٢٠٦

٢ـ قاضی محمد، محمدرضا جلالی پور ص ٢٧

٣ـ کاروانێك لە شەهیدانی کوردستان، کەریمی حیسامی، ل ١٠، ١١

٤ـ جنبش ملی کرد، کریس کۆچێرا، ص ۲۰۵ ـ ۲۰٦

٥ـ قاضی محمد، محمدرضا جلالی پور ص ۲۷.

٦ـ کاروانێك له شەهیدانی ... ل ۱۰.

۷ـ کردها و کردستان، درك کنان، ص ۱۱۹.

8- Eaglton. Op. cit – p34 .

۹ـ جنبش ملی کرد، ص ۲۰٦.

۱۰ـ روزنامه باختر (سەشنبه ۲۹ ابان، ۱۳۲٤) س ۲.

۱۱ـ مقاله روزولت ژیل کردها و کردستان، درك کنان، ص ۱۸۰.

12- Eaglton. Op. cit – p34 .

13- IBID.

۱٤ـ جنبشهای کرد له دیرباز تا کنون، نگارش و اقتباس م ـ کاردوخ، ۲ جلد (سوئد، Colmex، اسکاندیناوی، ۱۹۹۳) ج ۲ ـ ص ۲۰۹.

۱٥ـ قاضی محمد، حمیدرضا جلالی پور ـ ص ۲٦.

16- VALI. Op. cit –166 p.

۱۷ـ جنبش ملی کرد، ص ۲۰۷.

۱۸ـ مقاله روزولت ژیل تاریخ کرد و کردستان، ص ۱۸۰.

19- Eaglton. Op. cit – p35

۲۰ـ خاطرات دکتر آسو، دکتر قادر محمودزاده (آسو)، ص ۱۳۳.

21- Eaglton. Op. cit – p26.

۲۲ـ سازمان اسناد ملی ایران، سند شماره ۱۳۰ـ ۱۱۲۰۰ به تاریخ ۱۳۲۳/۹/۱٦.

۲۳ـ هەمان سەرچاوە ـ سند شماره ۱٥/۱٥۱۰ ـ ۱۱٦۰۰۷. گزارش فرماندار مهاباد برای وزارت کشور، تاریخ ۱۳۲٤/٤/۱٦.

۲٤ـ خاطرات دکتر آسو، ص ۱۳۳ ـ ۱۳٤.

۲٥ـ هەمان سەرچاوە، ل ۱۳٤ ـ ۱۳٥.

26- Strang lamds friendly people. William Orville Douglas (New or 12, Haper, 1951, p38 .

۲۷ـ گۆڤاری "اطلاعات"ی مانگانە، ژ (۲)، ٥ی خاکەلێوەی ۱۳۳۱، ساڵی پێنجەم، وتاری مهاباد و مەرگی قازییەکان، نووسینی سلێمان ج ٦٥.

۲۸ـ وتاری (کۆماری مهاباد و کوردەکان و کوردستان) درك کنان، آرضی بالد روزولت، ل ۱۸۲.

29- Eaglton. Op. cit – p39.

۳۰ـ کردها و کردستان، درك کنان ص ۱۲۰.

۳۱ـ مقاله جمهوری مهاباد، آرضی روزولت، ص ۱۸۲.

٣٢ـ جنبش ملی کرد، ل ٢٠٧.
٣٣ـ مجله تهران مصور ـ جمعه ٧ اردیبهشت ١٣٢٨ ش ١٤ ـ سال ٣٧، مقاله نگاهی به گـذشته حزب دمکرات.
34- ARFA, Op. cit, p86 .
35- Eaglton. Op. cit – p36.
٣٦ـ ایران و جنگ سرد، بحران آذربایجان، لوئیس فاوست، ترجمه کاوه بیات (تهران، دفتر مطالعات سیاسیی و بین المللی ـ ١٣٧٣)، ص ٥٢.
٣٧ـ هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕ.
38- Eaglton. Op. cit – p55.

٣٩ـ قاضی محمد، ص ٣٥.

40- Eaglton. Op. cit – p36.
41- Ibid, p36 .
42- Mahabad une Ēphēmére public, Kure independante – Bois, Thomas – larevue de lorient, n°29 (1964) – pp190 – 191 .
43- ARFA, Op. cit pp 78 – 79 .
44- Les Kurdesetle droit, rambout. Lucien (Paris, lecerf, 1947) pp 138 – 140 .
٤٥ـ اطلاعات سیاسیی ماهانه، ش ٥٨ دی ماه ١٣٣١ ـ مقاله هیوا یـا امیـد ـ تاریخچـه بـارزان از روز قیـام اکـراد بارزانی ـ نوشته مدحت شافع ـ صص ١٩ ـ ٢٥.

## بەندی سێهەم

١ـ یاداشتەکانم، عەبدوڵلا ئەحمەد رەسوڵی پشدەری، ج ١، ل ٤٦.
2- Eaglton, Op.cit, pp 44- 45 .
3- Ibid .

٤ـ یاداشتەکانم، ج ١، ل ٤٧.

5- Eaglton, Op.cit, pp 56- 58.

٦ـ یاداشتەکانم، ج ١، ل ٤٧.

7- Russia's South flank, Sorite operations in Iran, Turkey and Afghanistan, fredrich, A.proggerk publisher, 1963 – Cunther Nollan and Hans Jurgenwieh – translated by Victor Anderson p.29 .
8- Ibid .

٩ـ احزاب سیاسیی ایران بعد از شهریور ۱۳۲۰، ژیل کتاب مطبوعات ایران از شهریور ۱۳۲۰ تـا ۱۳۲٦، گـرد آورنـده دکتر حسن ابوترابیان (انتشارات اطلاعات) تهران، ۱۳٦٦، ص ۱۸٦.

۱۰ـ خاطرات نورالدین کیانوری (مؤسسه تحقیقاتی و انتشاراتی اطلاعات، تهران ۱۳۷۲، صـص ۱۲۸ ـ ۱۲۸و ۱٦۸ ـ ۱٦۹.

۱۱ـ مقاله روزولت ژیل کردها و کردستان، ص ۱۸٤.

12- Russia's South Flank, Op.cit, P35 .

13- Ibid, p30 .

۱٤ـ یاداشتەکانم، ج ۱، ل ٤۹ ـ ۵۰.

15- Mahabad, une Repunblique – Tomas Bois, Op.cit.., p197 .

16- Eagle ton, Op.cit – p102 .

17- ARFA Op.cit – p74 .

۱۸ـ یاداشتەکانم، ج ۱، ل ۵۰.

19- Eagleton, Op.cit. 58 .

۲۰ـ کاروانێك لە شەهیدانی ....، ل ۱۸.

۲۱ـ یاداشتەکانم، ج ۱، ل ۱۱۲.

۲۲ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

۲۳ـ مقاله روزولت، ژیل کرد و کردستان، ص ۱۸٤.

۲٤ـ گفتوگۆ لەگەڵ یەحیا سادق وەزیری، بەفرانباری ۱۳۷٤.

25- ARFA. Op.cit – pp 79 – 80/ Eagle ton, Op.cit – p 57 .

۲٦ـ مقاله روزولت، ص ۱۸۵.

۲۷ـ هەمان سەرچاوە،

۲۸ـ جنبش ملی کرد، ل ۲۰۹.

۲۹ـ هەمان سەرچاوە.

30- LA Revne Del Aterred'lslaw, Roundo, PIERRE, (No) 74, 1996, pp114 – 120 .

## بەندی چوارەم

1- Russia's South flank Op.cit – P30.

۲ـ در آخرین روزهای رضاشاه، ریچارد.ا.استوارت، ترجمه کاوه بیات و عبدالرضا هوشنگ مهدوی، چـاپ دوم (تهـران، معین، ۱۳۷۰) ص ۱۹.

3- Russia's South flank Op.cit – P30 .

٤ـ آخرین روزهای رضاشاه، ریچارد.ا.استوارت، ص ۳۰۳.

۵ـ کاروانێك لە شەهیدانی ...، کەریم حیسامی، ل ۱۱.

٦ـ آخرین روزهای رضاشاه، ریچارد.ا.استوارت، ص ۳۵۵.

٧ـ ایران و قدرتهای بزرگ در جنگ جهانی دوم ـ دکتر ایرج ژوقی (تهران، انتشارات پاژنگ، ١٣٦٨) چاپ دوم، ص ١٣٢.

٨ـ هەمان سەرچاوە، ل ١٣٢.

٩ـ سازمان اسناد ملی ایران، سند شماره ٢٤٠٠١٦١٢، ص ٣٢، تلگراف رمز شماره ٦٤٨، به تاریخ ١٣٢٢/٧/١٥.

١٠ـ جنبش ملی کرد ـ صص ١٩٨و ١٩٩و Eagleton. Op.cit. PP23-24.

١١ـ ایران و قدرتهای بزرگ در جنگ جهانی دوم، صص ١٤٠ ـ ١٤١.

١٢ـ جنبش ملی کرد ـ ص ١٩٩.

١٣ـ ایران و قدرتهای بزرگ در جنگ جهانی دوم ـ ص ٧٧.

14- Eagletonk Op.cit, PP23 – 24 .

15- Bois, Op.cit, P190 .

16- Russia's South flank, Op.cit.. P53 .

١٧ـ جنبش ملی کرد، ص ٢٨.

18- Bois, Op.cit, p191 .

19- Eagletonk Op.cit, PP43 – 45.

٢٠ـ کردها و کردستان، ص ١٢٨.

21- Eagletonk Op.cit, PP97 – 99.

٢٢ـ نخست وزیران ایران، ابراهیم صفایی، ج ١، صص ١٠٥ ـ ١٠٩.

23- Eagletonk Op.cit, PP97 .

٢٤ـ رقابت روسیه و غرب در ایران، جورج تروفسکی، ترجمه اسماعیل راین، (انتشارات جاویدان، تهران، ٢٥٣٦)، چاپ ٢، صص ٢٧٦، ٢٧٧.

٢٥ـ جنبش ملی کرد، ص ١٢٠.

٢٦ـ قازی محەمەد و مەسەلەی خودموختاری کوردستانی ئێران، د. رەحیمی قازی، (مەهاباد، تیشك، ١٣٥٩)، ل ٤٢.

٢٧ـ جنبش ملی کرد، ص ٢٢.

٢٨ـ یادداشتەکانم، عەبدوڵلا ئەحمەد رەسوولی پشدەری، ج ١، ل ٥٠ ـ ٥١.

٢٩ـ مقاله روزولت، ژیل کرد و کردستان، ص ١٨٦.

## بەندی پێنجەم

١ـ کردها و کردستان، درك کنیان، ص ١٣٣.

٢ـ روزنامه خبر، پنجشنبه، ٢٧ دی ماه ١٣٢٤، ص٢.

٣ـ مقاله روزولت، ص ١٨٧.

4- The Kurdish Republic, Eagleton, Op.cit. pp 60 -64 .

5- Ibid. p62 .

6- Ibid. p63 .

7- Ibid. pp63 – 69 .

٨ـ یادداشتەکانم، ئەحمەد ڕەسوولّی پشدەری، ج ١، صص ٥٤ ـ ٥٥.

٩ـ جنبش ملی کرد، ص ٢١٢و یادداشتەکانم، ل ٥٥، Eaglteton, Op.cit. p134.

## بەندی شەشەم

١ـ یادداشتەکانم، ج ١، ل ١١٢.

2- Eagleton, op.cit, pp87 – 100 .

٣ـ سازمان اسناد ملی ایران، سند شماره ١٨٥ ـ ١١٢٠٠١.

٤ـ هەمان سەرچاوە، سند شماره ١٣٠ ـ ١١٢٠٠١.

5- Eagleton, Op.cit. p100 .

٦ـ مصاحبه با یحیی صادق وزیری، بەفرانباری ١٣٧٤.

٧ـ مقاله روزولت، ژیل کرد و کردستان، ص ٢٠٠.

٨ـ روزنامه اطلاعات، شنبه ٢٨ دی ماه سال ١٣٢٥، اظهارات حاج بابا شیخ به خبرنگاران داخلی.

9- Eagleton. Op.citg. p101 .

10- Rambo, Op.cit. p103 .

١١ـ درباره مبارزات کردستان، حمید مؤمنی، (........) (تهران، شباهنگ ١٢٥٨) ص ٨٠.

١٢ـ یادداشتەکانم، ل ٧٢ و ٧٣.

١٣ـ روزنامه (باختر)، شماره یکشنبه ٩مهر ١٣٢٤، ص ٢، یادداشتەکانم ج ١، ل ٧٣.

١٤ـ خاطرات دکتر آسو، ص ١٤٩.

١٥ـ هەمان سەرچاوە، ل ١٥١.

١٦ـ مقاله روزولت، ص ١٩٩.

١٧ـ هەمان سەرچاوە، ل ١٩٦.

18- Bois, Op.cit, p 170 .

١٩ـ تاریخ سی ساله ایران، بیژن خونی، ٢ جلد، (بی جا، بی نا، بی تا) ج ١، صص ٣١ ـ ٣٢.

20- Douglas, Op.cit, p61 .

21- Bois, Op.cit, p 179.

22- Douglas, Op.cit, P62 .

٢٣ـ مجله تهران مصور، جمعه ٢٥ اسفند ماه ١٣٥٧، ش ٩، سال سی و شش، مقاله نصیحت قاضی محمد باشاه.

24- Les Kurdeset le Kurdistan, la Question National Kurde au Proche Orient, E erit par Quelques Eerivains, (paris, Maspero, 1978) p 179 .

٢٥ـ روزنامه اطلاعات، دوشنبه ١٦ دی ماه ١٣٢٥.

٢٦ـ روزنامه باختر، سەشنبه اول آبان ١٣٢٤، ش ٦٦٦، ص ٢.

27- Les Kurdes et le Kurdistan, op.cit, p179 .

٢٨ـ مقاله روزولت، ص ١٩٥.

٢٩ـ مصاحبه با یحیی صادق وزیری دی ماه ١٣٧٤.

٣٠ـ یادداشتەکانم، ل ٧٥ ـ ٧٧.

31- Russia's South Flank. Op.cit, P29 .

٣٢ـ سازمان اسناد ملی ایران، ژیل سند شماره ١٥٢١ ـ ١١٦٠٠٧، گزارش کنسولگری ایـران در سـلیمانیه بـه وزارت خارجه.

٣٣ـ هەمان سەرچاوە، هەمان سنە و یادداشتەکانم، ٤٠و ٤١.

٣٤ـ سازمان اسناد ملی ایران، ژیل سند شماره ١٤٠ ـ ١١٢٠٠١، راپۆرتی باڵوێزی ئێران لە بەغدا بۆ وەزارەتـی دەرەوە لە ڕێکەوتی ١٣٢٥/١/١٢و ناردنی ئەو بابەتانەی کە لە ڕۆژنامەی "الاخبار"ی چاپی بەغدا لەسـەر شۆڕشـی کوردەکـان نووسراوە.

٣٥ـ جنبش ملی کرد، ص ٢٠٣.

٣٦ـ مرگ بود بازگشت هم بود، نەجەف قولی پەسیان، (تهران، شرکت سهامی چاپ، ١٣٢٧) ص ١٦٠.

٣٧ـ یادداشتەکانم، ل ٦٤.

38- Eagleton .Op.cit, P92/ ARFA. Op.cit p98 .

٣٩ـ نامه رهبر ارگان مرکزی حزب توده ایران، سال چهارم، ش ٦٧٢، سەشنبه ١٨ تیرماه ١٣٢٥، ص ٦.

## بەندی حەوتەم

١ـ سازمان اسناد ملی ایران، ژیل سند، شماره ٩٣٢ و ٢٩٠٠٠.

٢ـ هەمان سەرچاوە، همان سنە.

٣ـ سازمان اسناد ملی ایران، ژیل سند شماره ٣٩٦ ـ ٢٩٠٠٠٢.

* هەنگ: یەکەیەکی سەربازیی ڕێژیمی شاهەنشاهی ئێران بوو.

٤ـ جنبش ملی کرد، ص ٢١٩.

٥ـ مرگ بود، بازگشت هم بود، صص ١٩١ ـ ١٩٢.

٦ـ همان مأخذ، صص ١٨٩، ١٩٠.

٧ـ یادداشتەکانم، ج ١، ل ٦٠و ٦١.

٨ـ هەمان سەرچاوە، ل ٦٤.
٩ـ مرگ بود، بازگشت هم بود، ص ١٥٧.
١٠ـ کردها و کردستان، ص ١٢٣.
١١ـ جنبش ملی کرد، ص ٢١٥.
١٢ـ روزنامه اطلاعات، شنبه ٢٨ دی ماه ١٣٢٥، مصاحبه دکتر اقبال در رضائیه.

13- Eagleton, Op.cit. P82 .

١٤ـ مقاله روزولت، صص ١٨٩، ١٩٠.
١٥ـ مرگ بود، بازگشت هم بود، صص ١٠٣و ١٠٦.

16- Eagleton, Op.cit. P82 .

١٧ـ سازمان اسناد ملی ایران، ژیل شماره ١٣٧، ٢١٣/٣٢١.

## بەندی هەشتەم

١ـ ایران و قدرتهای بزرگ در جنگ جهان دوم، ص ٢٢٤، برپایه گزارش جرج کنان. F.R.U.S 1944. Vol. 107, P470.
٢ـ خاطرات نورالدین کیانوری، ص ١٠٠.
٣ـ در آخرین روزهای رضاشاه، صص ٣٠٠ و ٣٠١.
٤ـ روزنامه اطلاعات، شماره ١٨ شهریور ١٣٢٠.

5- standard vacuum .

٦ـ مجله مذکرات مجلس شورای ملی، ش ١٣٠٨، ١٩ مرداد ماه ١٣٢٣، ص ٨٠٩.
٧ـ هەمان سەرچاوە، ش ١٣٣٠، تاریخ ٢٧ مهرماه ١٣٢٣، ص ١٣٩١.
٨ـ مردم برای روشنفکران، شماره ١٩ آبان ١٣٢٣، وتارەکەی گیری.
٩ـ صورت مذکرات مجلس شورای ملی، ش ١٣٣٦، ١١ی سەرماوەزی ١٣٢٣، صص ١٤٣٢ ـ ١٤٥٦.
١٠ـ سلسله پهلوی و نیروهای مذهبی به روایت تاریخ کمبریج، صص ٦٩ ـ ٧١ و نخست وزیران ایران از مشیرالدوله تا بختیار ١٢٨٥ ـ ١٣٧٥، دکتر باقر عاقلی، تهران، انتشارات جاویدان، ١٣٧٠، ص ٦١٤.
١١ـ خاطرات ارتشبد حسین فردوست، ٢ جلد، تهران اطلاعات، ١٣٧١ ص ١٤٨.
١٢ـ در آخرین روزهای رضاشاه، ص ٣٦٢ به نقل از FRUS, 1943, Vol.4, PP 321 and 331 – 35.
١٣ـ نخست وزیران ایران، ص ٦١٤.
١٤ـ هەمان سەرچاوە، ل ٦١٥.
١٥ـ جنبش ملی کرد، ص ٢١٧.
١٦ـ قازی محەمەدو مەسەلەی خودموختاری کوردستان، ل ١٢٠١١.

١٧ـ یادداشتەکانم، ج ١. ل ٦٦ ـ ٦٩.

١٨ـ قازی محەمەدو مەسەلەی خودموختاری، ل ١٤ ـ ١٧.

١٩ـ ایران و جنگ سرد، بحران آذربایجان، ص ١١.

٢٠ـ قازی محەمەدو مەسەلەی خودموختاری، ل ١٦ ـ ٢١.

٢١ـ نامه رهبر ارگان مرکزی حزب توده ایران، سال ٤، سەشنبه ١٨ تیرماه ١٣٢٥، ل ١ ـ ٦.

٢٢ـ روزنامه باختر، ٢٨ آذرماه ١٣٢٤، چهارشنبه، ص ٢.

٢٣ـ یادداشتەکانم، ل ٦٨، ٦٩.

٢٤ـ قازی محمد و مەسەلەی خودموختاری، ل ٣٨.

٢٥ـ هەمان سەرچاوە، ل ٢٩.

26- Douglas, Op.cit, PP 63 – 64 .

٢٧ـ زندگی سیاسیی رزم ارا، نوشته جعفر مهدی نیا، (تهران، گیتی، ١٣٦٣)، ل ٤٩.

٢٨ـ قازی محمد و مەسەلەی خودموختاری، ل ٣٠.

## بەندی نۆیەم

١ـ قازی محەمەدو مەسەلەی خودموختاری، ل ٣٠ ـ ٣٣.

٢ـ مقاله روزولت، ل ١٩٦.

٣ـ یادداشتەکانم، ج ١، ل ٧٠ ـ ٧٢.

٤ـ مصاحبه با یحیی صادق وزیری، دی‌ماه ١٣٧٤.

٥ـ یادداشتەکانم، ل ٧٢.

٦ـ مقاله روزولت، ص ١٩٤.

٧ـ یادداشتەکانم، ج ١، ل ١١١.

٨ـ روزنامه باختر، دووشەممە، ١٧ی خەزەڵوەری ١٣٢٤، ژمارە ٦٧١.

9- Douglas, Op.cit, p59 .

١٠ـ یادداشتەکانم، بەرگی یەکەم، ل ٧٥ ـ ٧٧.

١١ـ هەمان سەرچاوە.

١٢ـ سازمان اسناد ملی ایران، سەنەدی ژمارە ٩ ـ ٢٨ ـ ١١٢٠٠١.

١٣ـ درباره مبارزات کردستان، ص ٣٧.

١٤ـ رۆژنامەی اطلاعات، ژمارەی پێنج شەممە، ای رەشەمەی ١٣٢٥، وتاری نەجەف قولی پەسیان، لەژێرناوی: یەکساڵ بە بێدەنگی لە کوردستان دا شەڕ بوو.

١٥ـ یادداشتەکانم، بەرگی ١، ل ٧٧.

١٦ـ هەمان سەرچاوە.

۱۷ـ کهنه سرباز، خاطرات سیاسیی و نظامی سرهنگ غلام رضا منصور رحمانی، (تهران، مؤسسه فرهنگی رسا، ۱۳٦٦) چاپ اول، ل ۱۰۰، ۲۵۱۰۲۷۷.

۱۸ـ مصاحبه با یحیی صادق وزیری، دی‌ماه ۱۳۷٤.

۱۹ـ روزنامه رهبر، چوارشەممە، ٤ تیرماه ۱۳۲۵.

۲۰ـ هەمان سەرچاوە.

۲۱ـ درباره مبارزات کردستان، ص ۲۸.

۲۲ـ رۆژنامەی "رهبر" ئۆرگانی حیزبی توودەی ئێران، ژ ۷۳۵، سێشەممە، ۱۲ی جۆزەردانی ۱۳۲۵، نووسەری وتار ع.ج لە سنەوە.

۲۳ـ رۆژنامەی اطلاعات، سێ شەممە، ۱۵ی ڕێبەندانی ۱۳۲۵.

۲٤ـ هەمان سەرچاوە، ژمارە دووشەممە، بەفرانباری ۱۳۲۵.

25- Bois, Op,cit, PP 182 –183 .

۲٦ـ دانشمندان کرد در خدمت علم و دین ـ عبدالکریم مدرس، ترجمه احمد گوری نسب، (تهران، اگلاعات، ۱۳٦۹)، صص ۵۰۳ و ۵۰٤.

۲۷ـ باسێك لە مەڕ محاکەمەی پێشەوا قازی محەممەد. د.رەحیمی قازی، مەهاباد، تیشك، بەهاری ۱۳۵۹، بۆ ئاشنا بوون بە نێوەرۆکی ئەو نامەیە بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارەی ۵۰۹ ـ ۱۵ ـ ۱۱٦۰۰۷، لە سازمانی اسناد ملی ایران.

۲۸ـ خاطرات نورالدین کیانوری، ص ۱۰۰.

۲۹ـ اطلاعات ماهانه، ش ۲ (۵۰) اردیبهشت ـ ۱۳۳۱، مقاله مهاباد و قاچیها، نوشته سلیمان ـ ح.

۳۰ـ خاطرات کیانوری، ص ۱۰۱.

31- Russia's South Flank, Op.cit. P59 .

۳۲ـ کاروانێك لە شەهیدانی کوردستانی ئێران، ل ۳٦.

۳۳ـ تاریخ سی ساله ایران، جل ۱، ل ۳۲ ـ ۳۱.

۳٤ـ یادداشتەکانم، بەرگی یەکەم، ل ۱۱۳.

۳۵ـ تاریخ سی ساله ایران، ج ۱، ص ۳۱.

۳٦ـ کاروانێك لە شەهیدانی کوردستانی ئێران، ل ۳٦.

۳۷ـ مصاحبه با داریوش فروهر، ۳۱ی بانەمەڕی ۱۳۷۵.

۳۸ـ نامه رهبر ارگان مرکزی حزب توده ایران، سال چهارم، ش ۷٦۲ ـ سەشنبه، ۱۸ تیرماه ۱۳۲۵، ص ۱و ۲.